گەڕایەوە، یان گەڕانەوەی دەنگە ◊ تَأَوَّبَ: گەڕایەوە، یان سەرەتای شەو گەڕایەوە ◊ الأَوْبُ: پەلەکردن، با، هەور، کۆمەڵێك هەنگ ◊ الأَوْجُ: بەرزی ◊ دوورترین خاڵ لەمەداری مانگ لەزەوی ڕا ◊ لەحنێکی مۆسیقایە.

**آدَ**: دوولا هاتەوە ◊ آدَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەکوڵ کرد.

**أَوِدَ** أَوَداً: خوارو خێچ بوو ◊ الأَوِيد: هەست و شعور ◊ اسْتَأْوَرَ: ترسا، هەڵسڵەمییەوە، تەرمبوو، ◊ الأَرُ: عەیب و عار. ◊ الأُوَارُ: گەرمایی خۆر، گەرمایی ئاگر ◊ الأَوَارِيّ: ئادەمیزادێك زۆری تینوبێ. ◊ أورانس: یەکێکە لە نۆ ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆری ◊ الأُورطى: شادەماری سەرەکی لەجەستەی ئادەمیزاد ◊ الإِوَزّ: جۆرە باڵندەیەکە دەشوبهێتە مراوی ◊ الإِوَزِّي: زەویەکە زۆری باڵندەی ئیوەزە تێدابێ، ◊ أوزوريس: پەرستراوێکی میصرییە کۆنەکانە، پێیان وایە مردووەکانیان دەپارێزێ. ◊ الأَوْسُ: گورگ ◊ هۆزێکی قەحطانیشە ◊ الأُويس: هەربە مانا گورگە ◊ آفت البلاد أوفاً وآفةً: ولات توشی ئافەتی گرانی و نەخۆشی بوو.

**إِيفَ** الزرعُ: کشت و کاڵەکە توشی ئافەت بوو. ◊ الآفَةُ: ئەوشتەیە توشی هەرشتێك بێ لەکەڵکی بخا.

**آقَ** أَوقاً: بەهۆی قورسایی خۆیەوە خوار بۆتەوە، ◊ أَوَّقَهُ: زۆر بەنارەحەتی هەڵی گرت ◊ الأُوَاقِيّ: قەصەبی جۆلا کە داوە رایەڵەکانی پێدا رۆیشتون. ◊ الأَوْقُ: قورسایی، نەگبەتی. ◊ الأَوَقَةُ: پێرو کۆمەڵ. ◊ الأُوقَةُ: چاڵایی یە کە وەکوو بەلوعە ئاوی پێدا دەڕوا، هەروا شوێنی حەوانەوەی باڵندەیە لەسەر کێوان. ◊ الأُوقِيَّةُ: بەشێکە لەدوازدە بەشی ڕیطلی میصری.

**آلَ** إليه: گەڕایەوە بۆلای..

**أَوَّلَ** أوّلاً: پێش کەوت ◊ أَوَّلَ الكلامَ: قسەکانی شی کردنەوە، مەبەستی سەرەکی لە دەقەکە دیاری کرد ◊ تَأَوَّلَ الكلامُ: مانا راستەقینە شێراوەکەی لەدەقەکە دەرخست. ◊ الآلَة: ئامێری خۆشی و هەڵپەرکێ ◊ کۆڵەکەی خێوەت ◊ الآلاتيُّ: مۆسیقا ژەن ◊ دانەری لەحنەکانی مۆسیقا.

**الإيالُ**: قاپێکە شیری تێدا دەمەیەندرێ.

**آمَ** أوماً: تینوایەتی تینی بۆهێنا ◊ الأُمَةُ: هەرزانی و ساڵی هات و باراناوی و بەپیت. ◊ الأُوامُ: گەرمایی تینوایەتی.

**آنَ** أوناً: ژیانی خۆش بوو، ◊ أُوَنَتِ الحامل: ژنە دوگیانەکە ورگی بەرز بووە لەمنداڵبون نزیك بۆتەوە.

**آهَ** أوهاً وآهاً وآهةً: ئاهو ناڵەی کرد ◊ الآهَةُ: نەخۆشی ئاوڵەو سورێژە. ◊ الأَوَّاه: ئەوکەسەی زۆر لەخودا دەپاڕێتەوە.

**أَوَى** الجرحُ: برینەکە نزیکە چاك بێتەوە. ◊ تَأَوَّرَا: خەڵکەکە هەندێکیان پەنایان بردە بەرهەندێکیان ◊ استأوى فلاناً: داوای رەحم و بەزەیی هاتنەوەی لە فلانکەس کرد. ◊ المأوى: پەناو شوێنی داڵدە دان ◊ الأيَّابُ: ئاوگێڕ ئەوکەسەی زۆر ئاودەدا بەخەڵك. ◊ الآحُ: سپێنی هێلکە ◊ ئەوەی دەخورێ. **آدَ** أيداً: بەهێز بوو پتەو بوو.

**آيَدَهُ**: بەمانا (آدَ)یە ◊ (آيَدَ فلاناً) بەهێزی کرد پشتگیری کرد ◊ أَيَّدَهُ: پشتگیری کرد ◊ الإيادُ: هەرشتێك پشتگیری پێ بکرێ ◊ الأَيِّدُ: خاوەن هێزو توانا.

**الأَيْرُ**: ئەندامی نێرایەتی لەئادەمیزاددا ◊ آيار أو أيَّارُ: مانگی هەشتەمی سورەیانی یە مانگی پێنجەمی

رۆمی یە ٥ ایزیس: پەرستراوێکی میصرییە کۆنەکانە، مێردی (أوزوریس)ە.

**آسَ** أيساً: گەردنکەچ بوو ملی دا.

**أيِسَ** منه: لێی هیوا بڕاو بوو. ٥ آيَسَهُ: هیوا بڕاوی کرد. ٥ الآيِسَةُ: ئەوئافرەتەیە کە نەکەوێتە عادەی مانگانەی خۆیەوە. ٥ الإِيَاسُ: سیل ٥ هەروا کاتو رۆژگارێکی حەریجە لەژیانی ئادەمیزاددا.

**أَيْسَ**: ماناکەی پێچەوانەی مانای (لیس)یە.

**أَيْشِ**: لەرستەی (أی شیء) وەرگیراوە.

**آضَ** أيضاً: گەڕایەوە.

**أيِكَ** (أيكَ أيكاً) درەختەکە لقو پۆپو گەڵای زۆر بونو تێك چڕژان. ٥ إسْتَأيكَ الشجرُ: درەختەکە لقو پۆپو گەڵای زۆر بوو. ٥ الأَيْكَةُ: درەختێکی لقو پۆپ زۆر تێك چڕژاوە ٥ جۆرە درەختێکیشە.

**ایل**: لەزمانی عیبریدا ناوی خودایە. ٥ الأَيِّلُ: کەڵەکێوی، ٥ أيلول: مانگی دوانزەی سورەیانیو مانگی نۆی رۆمی یە. ٥ آمَتِ المرأة: ئەو ئافرەتە لەو وڵاتە جێ گیربوو.

**آمَ** المرأة: ئافرەتەکەی بە بێوەژنی مارەکرد.

**أيَمُ** الله: وشەیەکە بۆ سوێند بەکاردەهێندرێ. ٥ الأَيِّمُ: عازەب چ کوڕبێ چ کچ بێ، ٥ الْمَآيَمَةُ: ئافرەت بەبێوەژن کردن ٥ الْمُؤْيِمَةُ: ئافرەتی ساماندار بێ مێرد.

**آنَ**: کاتی هات ٥ الآنُ: ئەوکاتەی تێیدا ژیان بەسەر دەبەی.

**أَيَّهَ** بهِ: بانگی کرد، لێی توڕە بوو ٥ الأيوان: باڵەخانە، کۆشك. ٥ أيّا بالمكانِ: مایەوە، گیری خوارد لەوشوێنە. ٥ الآيَةُ: نیشانەو پەندو عیبرەت.

**أيُّ**: حەرفی شەرتە، حەرفی ئیستیفهامە، حەرفی مەوصولە. ٥ أيَّانَ: زەرفی زەمانی داهاتووە.




**البابا**: سەرکردەی کەنیشتەی کاثولیکی، ٥ **البابویة**: پلەو پایەی ئایینی پاپا. ٥ **البابوج**: پابوج ٥ **البـاذق**: گوشراوی تریّ کەکەمێك بکوڵێنریّو ببێتە سرکەو سەر خۆشکەر بێت.٥ **الباذنجان**: باینجان ٥ **البارود**: تێکەڵیەکە لە خوێی بارودو کبریت خەڵوز بۆ گوللە تۆپ و قومبولە بەکار دەهێنرێت ٥ **البازلت**: جۆرە بەردێکە زادەی بورکان‌و تەقینەوەکانی ناو زەوییە ٥ **الباسلیق**: رەگێکە لە قوڵدا بەسەر ماسولکەوەیە. ٥ **الباسور**: مایەسیری، ٥ **البالیة**: جۆرە رانواندنێکی شانۆییە، ٥ **البُؤبُؤ**: ئەصل و رەسەن، ناوەراستی شت، بیلبیلەی چاو. ٥ **البَأدَلَةُ**: گۆشتێکە لە نێوان گەردن‌و جوڵەمەدایە.

**بَأرَ** بَأراً: چاڵی هەڵکەند، بیری هەڵکەند، ٥ **ابتأرَ الشئ**: شتەکەی شاردەوە. ٥ **البُؤرَةُ**: چاڵ ٥ قوڵکە ئاگردان ٥ **البئر**: بیر ٥ **البئرُ** الإرتوازیة: بیری ئیرتیوازی. ٥ **البَأزُ**: بەمانا بازە.

**بَئِسَ** بَأساً: هەژاربوو، پێویستیاتی زۆربوو.

**بُؤس** بَأساً: بەهێزبوو ئازابوو.

**بِئسَ**: خراپ ٥ فیعلی ذەممە ٥ **أبأسَ**: خراپەی توش بوو، ٥ **إبتأسَ**: غەمناك بوو.

**البأسُ**: زەبرو زەنگی جەنگ، سزای بەشیدەت، ترس‌وبیم. ٥ **البَأساء**: ماندوبوون و نارەحەتی.

**بَأشَ** فلاناً بأشاً: فلانکەسی بەغافڵگیری کوشت. ٥ **تباطَ**: راکشا، لەسەر تەنیشت خۆی درێژکرد.

**بَؤُلَ**: زەعیف‌و بێ هێزبوو. ٥ **البَبُّ**: منداڵی قەڵەو، ٥ **البَبّانُ**: شتی یەکگرتوو، ٥ **البَبَّةُ**: ئەحمەق‌و تەمبەڵ ٥ **البَبرُ**: بەور، درندەیەکی گواندارو گۆشت خۆرە لە پێری پشیلەیە ٥ **البَبَغاء**: باڵندەیەکە.

**بَتّاً** بالمکان: مایەوە ٥ جێگیر بو لەو شوێنە.

**بتَّ** الشئ بتوتاً: ئەو شتە پچڕا ٥ **أبتَّ**: دابڕا، دواکەوت. ٥ **إنبَتَّ**: دابڕا، دواکەوت ٥ **تَبَتَّتَ**: کەل‌و پەلی ناوماڵی پێکەوە نا ٥ **البَتَّةَ**: شتێك بە جەختەوە ئەنجام بدریّ ٥ **بَتَرَه بتراً**: لەرەگ‌و ریشەوە بڕیەوە ٥ **أبترَ**: ناتەواو و پڕ کەم‌و کوڕیی بوو ٥ وەجاخ کوێر ٥ (إنبَتَرَ): دابڕا ٥ **الأبتَرُ**: کلك بڕاو، ماری کولە هۆیباب کلك کورتی ژەهراوی ٥ ئادەمیزادی وەجاخ کوێر ٥ **الباتر**: (سیف باتر): شمشێری بڕندە، ٥ **البَترُ**: لە نەشتەرگەریدا بریتیە لە بڕینی ئەندامێك یان بەشێك لە جەستە. ٥ **البتراء**: بۆ مێینە بەکاردەهێنرێت لە شوێنی (الأبتر) بۆ نێرینە ٥.

**بَتَعَ** في الأرض بتوعاً: دورکەوتەوە. ٥ **بَتَعَ العسل** بتعاً: هەنگینەکەی کرد بە سرکە. ٥ بَ... الأنسان: ئادەمیزادەکە درێژ بوو. ٥ **بَتِعَ فلان** عَلَيهِ بأمر: بەبێ راوێژکردن لەگەڵیدا ئیشەکەی برانەوە. ٥ **البتّاعُ**: فرۆشیاری سرکەی هەنگوین. ٥ **بتّکە**: بڕی دوولەتی کرد ٥ **إنبَتَكَ**: برایەوە ٥ دوو کەرت بوو، ٥ **الباتِكُ**: بڕندە، ٥ **البِتكَةُ**: بەشێك لەشتی بڕراو و کەرتبوو ٥ **بَتَلَهُ** بتلاً: بڕییەوە، کەرتی کردو لێکی جیاکردنەوە.

**بَتَلَ** بتلاً: ناوشانی پان بوون، ٥ **بتَّل الشيئ**: شتەکە بردرایەوە. ٥ **بتِّل الشيئَ**: شتەکەی بریەوە ٥ **إنبتَل (انقطع)**: لێبرا، دابرا، گۆشەگیر بوو. ٥ **البَتَلُ**: شتی دەگمەن و کەموێنە، ٥ **البتلاءُ**: عەزیمەتو سوربوون ٥ **البتلةُ**: بەکالاکەرەوە ٥ **البتول**: ئافرەتێك کچ بێو شوی نەکاو روبکاتە خودا پەرستی. ٥ **بَثّه بثاً**: بلاوی کردەوە ٥ **إنبَثّ**: بلاوبۆوە، بەحەوادا چوو ٥ **إستَبَثّهُ السِرّ**: داوای لێکرد کە نهێنیەکەی بۆ ئاشکرا بکات. ٥ **البَثّ**: حاڵو بارو دۆخ، خەمو خەفەتی گران.

**بَثِرَ** جلدهُ بَثراً: بلۆقو دومەڵی تەرو ئاودار لەپێستی پەیدا بوون ٥ **البَثر**: زیبکەو بلوقی ورد ورد ٥ **بَثِمَت الشَفَةُ**: گۆشتی لێوی نەستوربوو.

**بَثَعَ** الدَّمُ: رەنگی خوێنەکەی لە پێستەوە دیاربوو. ٥ **بَثِعَتِ اللثةُ**: پوکی نەستووربوو ٥ **بَثِعَ الجرحُ**: برینەکە خەریکە گۆشتەوەزون بینێتەوە.

**بَثَقَ** الماء بثوقاً: لەناکاو ئاوەکە هەڵقوڵیو سەر رێژی کرد. ٥ **بَثَقَ العينُ**: چاوەکە خێرا فرمێسکی رشتن. ٥ **إنبثق الأرض**: زەویەکە بەپیتو بەرەکەت بوو. ٥ **البَثَقُ**: شوێنی ئاو لێ رابەستن، ٥ **البَثْنَةُ**: زەوی نەرمەڵان و بەپیتو باش بۆ شت تێدا رواندن. ٥ **البَثْناءُ**: زەوی دەشتو نەرمەڵان. ٥ **البَثيُّ**: شایەرو ماستاوکەر ٥ **بَجبجَ الصبيُّ**: منداڵەکەی زیرکردەوە ٥ **تَبَجْبَجَ لَحْمُهُ**: گۆشتی جەستەی زۆربوو.

**بَجّهُ** بجاً: قەلاشتی شەقی کرد ٥ **بَجّهُ في المبارزة**: لە کێبڕکێدا بەسەریدا زاڵ بوو. ٥ **البجّةُ**: پەڵەی ناوچاو، خاڵی سوری ناوچاو.

**بَجِحَ** به بَجحاً: شادمان بوو پێی، شانازی پێوەکرد. ٥ **أبجَحَهُ**: کەیف خۆشی کرد.

**بَجَدَ** بالمكان بجوداً: لەو شوێنە مایەوە ٥ **البجادُ**: قوماشێکی خەت خەتە، ٥ **البَجدُ** من الناس: کۆمەڵە خەڵکێك ٥ **البَجْدةُ**: ساراو چۆڵەوانی، حەقیقەتی شتو نهێنیو ناوەرۆکی.

**بَجَرَ** بَجراً: گەدەی زل بوو، سکی هاوسا، ٥ **بَجِرَ**: لمئاوبوو کەچی تێری نەخواردەوە، ٥ **بَجِرَ عَن الأمر**: تەمبەڵی لەکارەکە کرد، ٥ **أبْجَرَ**: دوای هەژارییەکی کوشندە زۆر دەوڵەمەند بوو. ٥ **الأبجَرُ**: حەبلی کەشتی، ٥ **البجُرُ**: شەڕو نەگبەتی، سەرسوڕمان ٥ **البَجراءُ**: بۆ مێینە بەکاردەهێنرێ واتە ئافرەتێك ئاوی زۆر خواردبێتەوە ٥ **البجرةُ**: ناوك ٥ گرێی هەناو ٥ **البجيُّ**: ماڵو سامانی زۆر.

**بَجَسَ** الماء بجوساً: هەڵقوڵا ٥ **بَجَسَ الْماءَ**: ئاوەکەی هەڵقوڵاند ٥ **إنبَجَسَ**: ئاو هەڵقوڵا، ٥ **تَبَجَّسَ**: هەڵقوڵا ٥ **البجيسُ**: ئاوی زۆر ٥ **البَجَقَةُ**: باڵندەیەکی ئاوییە لە کەنار دەریاکاندا دەژی قاچ درێژو ملدرێژو دەنوك درێژە.

**بَجَلَ** بجلاً وبجولاً: جەستەی گەورەو زەبەلاح بوو.

**بَجُلَ** بجالة وبجولاً: رێزو حورمەتی زیادی کرد، ئاوداربوو بوو بەپیاو ماقوڵو کاربەدەست. ٥ **أبجلَهُ**: کەیف خۆشی کرد، ٥ **بَجّلَهُ**: بەگەورەی داناو رێزی لێ گرت ٥ **الأبجَلُ**: رەگێکە لەقاچی حوشترو ئەسپدایە. ٥ **البَجلةُ**: شێوەو روخسار جوانو ماقوڵ ٥ **البَجيلُ**: بەمانا (البجال)ە.

**بَجَمَ** بجماً وبجوماً: بەهۆی زمانگیرانەوە بێدەنگ بووبزمانی گیرا یان لە ترسو هەیبەتدا واقی ورماو قسەی پێ نەکرا ٥ **البَجْمُ**: کۆمەڵو دارو

دەستەی زۆر، ◊ بَجْبَجَ فلان: فلانكەس گوزەرانی خۆش بـوو ◊ البَجْبَـاجُ: شـتێكە پـانیو درێـژی وەكـوو یـەك وابـێ ◊ البَجْبَجـيُّ: كەسـێكە مەسـرەفو خـەرجی زۆربـێو مـاڵو حـاڵی بەرفراوان بێ ◊ البحبوحة: لەهەموو شتێك دا مەبەست ناوەراستو چاكو هەڵبـژێردراوە، ◊ باحت فلاناً بما عنده: چی لابوو بۆ فلانكەسی دەرخستو ئاشكرای كرد. ◊ البُحْتُ: پاڵفتەو بێ غەلو غەش ◊ البُحْتُرُ: كورتە باڵای تێكسمراو.

**بَحَثَ** الأرض وفيها بحثاً: زەوی هەڵكۆڵیو پشكنینی ئەنجام دا لەشت گەڕا ◊ بَحَثَ الشَّيْءَ: لەناو گڵو خۆڵ دا لەشت گەڕا هەوڵی دۆزینـەوەی شـتی دا ◊ البُحَاثَـةُ: ئەوگڵەیـە پـشكنینی تێـدا دەكـرێ بۆشـتە مەبەسـتەكە. ◊ البَحْـثُ: هەوڵـدانو تێكۆشـانە لـەبوارێكی تایبـەتیدا ◊ البُحْثَـةُ: یارییـەكی منداڵانـە ◊ البحوثُ: لـە پێڕۆیـان دا بـەو دەعبایانـە دەگـوترێ كەبەقاچـیان گـڵ هەڵدەدرنو بۆ دواخۆیان هەڵیدەدەن.◊ البَحيثُ: نهێنی ◊ بَحْثَرَ الشيءَ: شتەكەی پـەرتو بـڵاو كردەوە. تَبَحْثَرَ: پـەرتو بـڵاو بـووەو بەهـەوادا چوو.

**أَبَحَّ** الصياحُ: هاوارو قیرە قیڕ دەنگی گڕ كـردوە ◊ الأَبَحُّ: قەڵەوو بەخۆوە ◊ البُحَاحُ: دەنـگ گـڕیو دەنگ زڕی بەهۆی نەخۆشییەوە ◊ بَحْدَلَ: شانی باداو بەگورجی كەوتە ڕێ.

**بَحَرَ** الأرضَ: زەوییەكـەی هەڵـدڕی ◊ بَحِـرَ بَحَـراً: دەریای بینیو لـێی ترسا ◊ أَبْحَرَ الماءُ: ئاوەكـە وەكوو دەریا سوێر بـوو ◊ أَبْحَرَ فـلانٌ: فلانـكەس لـوتی سـوربووە، ◊ تَبَحَّـرَ فـلان في العلـم والمـال وغیرهما: فلانكـەس زانیاری زۆری پەیـدا كـرد، مـاڵو سـامانی زۆر بـوو ◊ اسـتَبحَرَ المكـانُ: شوێنەكە بـەرفراوان بـوو تـەخت بـوو كەنـدی تێـدا نـەما. ◊ البَـاحِرُ: ئەحمـەقو بـێ عـەقڵ هـەركاتێك قـسەبكا واقـی وڕبمێنـێ ◊ البـاحور: مـانگ ◊ گـەرمای بـەتینی تـەموز ◊ البَحَـارَةُ: میهنەی كەشتییەوانی. ◊ البَحَارُ: كەشتییەوان ◊ البحرُ: ئـاوی زۆر (دەریـا) ◊ البَحْرُ مـن الرجـال: پیـاوی بەخـشندە ◊ البَحْـرُ مـن الخیـل: ئەسـپی خۆشـڕەوو بەهەڵمـەتو بازهاوێـژ، ◊ البُحْـرانُ: گۆڕانكارییەكە لەنكاو بۆ نەخۆش پەیدا دەبێ ◊ البَحْرَةُ مـن الأرض: زەوی پـانو پـۆڕ ◊ البَحْرِيُّ: كەشتییەوانو هەرشتێك پەیوەنـدی بـەدەریاوە هـەبێ ◊ البُحَیْـرَةُ: دەریاچـە ◊ البَحِیرَةُ: حوشـتر، لەسـەردەمی نـەزانی دا ئەگـەر حوشـتر پێـنج سـكی بكردنایـە، گوێـچكەیان دەقەڵاشـتو بـەرەڵڵایان دەكـردو ئیـشیان پـێ نـەدەكرد، ◊ بَحْـشَلَ: سـەمای كـرد وەكـوو سـەمای زنـج. ◊ البَحْشَلُ: پیاوی رەش پێستی كەتەو ناشیرین.

بَخْـبَخ بَخْـبَخَةً: خۆی لەگەرما پاراست ◊ تَبَخْـبَخَ الحـرُّ: گـەرما تینـی كـەمبووە ◊ تَبَخْـبَخَ لحمـه: گۆشـتی زۆر بـوو داچـۆڕا. ◊ البَخْـبَاخُ: ئەوكەسەیە ورگی داچۆڕابێ.

البَخْتُ: شانس ◊ البُخْـاتُ: بەخێوكەری حوشـتری خۆراسـانی، ◊ البَخِیـتُ: بەختـەوەر ◊ بَخْـتَرَ في مَـشْیه: بـەفیزەوە رۆیـشت ◊ تَبَخْـتَرَ: بـەمانا (بَخْتَـرَ)یـە ◊ بَخْـدَجَ في مـشیته: لەرۆیـشتن دا قاچـەكانی پـان هاویـشتنو هـەنگاوی گـەورە گەورەی هەڵێنان. ◊ البَخْدَجُ: قەڵەوو گۆشتن.

**بَخَرَ** الماءَ: ئاوەكە هەڵمی كردو بەرز بـووە، ◊ بَخِـرَ الفَمُ: دەمی بۆنی ناخۆشی لێهات، ◊ بَخَّرَ الشَّيْءَ: بوخارەكـەی دەرهێنـا ◊ بـەبخور بۆگەنەكـەی لابرد. ◊ بَخَّرَ السائلَ: شلەمەنیەكەی بەكوڵانـدن كرد بەهەڵم. ◊ تَبَخَّرَ السائلُ: شلەمەنییەكە بوو

بەهەڵم. ٥ **الباخرة**: کەشتی گەورەو زەبەلاح ٥ **البُخارُ**: هەرشتێك لەشێوەی دوكەڵ دا بەرز بێتەوە لە شلەمەنی گەرم. ٥ **البَخْرُ**: هەوری تەنكە تەنكەی سپی ٥ **البَخَرُ**: بۆگەنی ناخۆشی دەم. ٥ **البُخورُ**: داری بوخورد ٥ **بخور مريم**: رووەكێكی بەتەمەنە ٥ **المَبْخَرَة**: هەرشتێك ببێتە هۆی دەم بۆگەن بوون.

**بَخَسَ** الكيلَ والميزانَ: تەرازوو بازیو گەزەدزی كرد ٥ **بَخَسَ فلاناً حقه**: مافی فلانكەسی نەدا لەحەقەكەی كەم كردەوە. ٥ **تباخَسَ القومُ**: خەڵكەكە هەركەسە لەعاست خۆیەوە مافی ئەوی تری خوارد ٥ **البَخْسُ**: كەمو داشكاندن لەنرخ.

**بَخَصَ** عينَهُ: چاوی هەڵكۆڵیو كوێری كرد.

**البَخَصُ**: گۆشتی قاچ ٥ بنی پەنجە.

**بَخَعَ** له بَخَعاً: گەردنكەچی بوو ٥ **بَخَعَ الوجدُ فلاناً**: عەشقو خۆشەویستی فلانكەسی نەخۆش خست. ٥ **بَخَعَ الأرضَ بالزراعة**: هەموو زەوی یەكەی بەكار هێنا بۆ كشتو كاڵو ساڵ بوێری نەكرد ٥ **بَخِقَتْ عينهُ**: چاوی كوێر بوو ٥ **بَخِقَتْ**: چاوی زۆر خراپ كوێركرا ٥ **أبْخَقَ عينَهُ**: چاوی كوێركرد.

**بَخِلَ** بَخَلاً وبُخْلاً: رژدو چرووك بوو، ٥ **بَخَّلَهُ**: تۆمەتباری كرد بەوە كەرژدو چرووكە ٥ **البَخَلُ**: رژدو چرووك ٥ **المَبْخَلَةُ**: ئەوشتەی ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ چرووكیو رژدی ٥ **بَخْنَقَ المرأة**: روبەندی بەئافرەتەكە دادایەوە ٥ **تَبَخْنَقَتْ**: بەروبەند دەمو چاوی خۆی داپۆشی. ٥ **البُخْنُقُ**: پارچە قوماشێكە ئافرەت دەمو چاوی خۆی پێ دادەپۆشێ.

**بَخَا** غضَبُهُ بخواً: رقو قاری نیشتەوە.

**بَدَأَ** بدءاً و بداءةً: پەیدابوو، دەستی پێكرد، دروست بوو. ٥ **بَدَأَ من مكان الى آخر**: لەشوێنێكەوە گواستیەوە بۆ شوێنێكی تر ٥ **بَدَأَ البئرَ**: بیرەكەی هەڵكەند ٥ **أبْدَأَ**: شتی سەیرو سەمەرەی هێنایە پێشێ ٥ منداڵەكە دوای كەوتنی ددانی حەوتساڵە ددانی هاتنەوە ٥ **بَدَّأَ الشيءَ**: شتەكەی پێش خست ٥ **البادِئُ**: راو بۆ چونی سەرتایی ٥ **البَدْأُ**: سەرەتای هەموو شتێك ٥ **البُدائي**: قۆناغی یەكەمی دروست بونو بەدی هاتن ٥ **البُدائية**: لە زانستی كۆمەڵناسی دا بریتییە لە قۆناغی یەكەم لە قۆناغەكانی دروستبون و وەدی هاتن. ٥ المبدأ: سەرەتای شت.

**بدح** بالسِّر: نهێنییەكەی ئاشكرا كرد ٥ **بدَّهُ بدّاً**: پەرتو بڵاوی كردەوە، دووری خستەوە.

**بَدَّ** بدَداً: لەبەر قەڵەویو گۆشتنی دورانی لێك دوور كەوتنەوە ٥ جەستەی زەبەلاح بوو. ٥ **أبَدَّ بينهم بالعطاء**: هەریەكەو بەشی خۆی پێ بەخشیو بۆی جیاكردنەوە ٥ **أبَدَّ يَدَهُ اليه**: دەستی یارمەتی بۆ درێژ كرد ٥ **إبْتَدَّ التوءمان أمُهُمَا**: ئەو دوانكە هەریەكەیان لەمەمكێكی دایكیان شیریان خوارد ٥ **تبادَّ القومُ**: ئەوقەومە دو دو بەرێگادا رۆیشتن، ٥ **تَبَدَّدَ**: بڵاوەیان لێ كرد ٥ **استَبَدَّ به**: بۆخۆی قۆرغ كرد، تاكرەوانە هەڵسوكەوتی كرد. ٥ **استَبَدَّ الأمر بفلان**: فلانكەس نەیتوانی كۆنترۆڵی ئیشەكە بكاو لەدەستی چوو ٥ **الأبَدُّ**: تەونكەر. ٥ **البادّ**: ناوڕان ئەوبەشەی ڕان كەلەكاتی سواری دا لەزینەكە دەكەوێ. ٥ **البِدادُ**: بەشو بار لەهەموو شتێك. ٥ **البُدُّ**: بەش لەهەر شتێك بێ ٥ قەرەبوو، ٥ **البَدُّ**: ماندوبوون ٥ بەشو بار لەهەرشتێك. ٥ **البَدَّة**: هێزو توانا. ٥ **البَديدُ**: هاوشانو بەرامبەر

٥ **التَّبْدِيدُ في القانون**: بەودەستکاری‌و تەصەروفانە دەگوترێ کە کابرای ماڵ بەندکراو ئەنجامی دا لەماڵە بەندکراوەکەدا پێش فرۆشتنی ماڵەکە بۆئەوەی خاوەن مافەکان هیچیان دەست نەکەوێ‌و بەمرادی خۆیان نەگەن.

**بَدَرَ** القَمَرُ بدراً: مانگ تەواو بوو، خشت بوو، گەیشتە شەوی چواردە. ٥ **أَبْدَرَ**: مانگی لێ هەڵهات ٥ بەمانگە شەو سەفەری کرد ٥ **ابتدر القومُ الشيءَ**: خەڵکەکە پەلەیان کرد بۆئەوەی بگەنە ئەو شتە ٥ **تبادر القومُ**: خەڵکەکە بەپەلە رۆیشتن‌و دەست پێشخەرییان کرد. ٥ **البادر**: مانگی شەوی چواردە. ٥ **لبيدَرَة**: ئامێرێکی ئاسنینی گەورەیە زێرەکەی کونی تێدان گەنمی تێ دەکرێ بۆ تۆو کردن.

**بدر**: کێوو دۆڵێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا ٥ **البدرُ**: مانگی شەوی چواردە، ٥ **البَدَرَى**: دەست پێشخەر. ٥ **البدرة**: کیسە باخەڵ، کیسە پارە، ٥ **البُدْرَة**: کوتراوو وردکراوێکە لەپێست دەدرێ بۆسارد بوونەوەو پتەوبوونەوەو جوانکردن‌و ئارایش دان ٥ **البَدْرِيُّ**: کەسێکە لەخزمەت پێغەمبەردا درودی خوای لەسەربێ هاوبەشی غەزای بەدری کردبێ ٥ **البَدْرُونُ**: ژێرزەمین، ٥ **البَيْدَرُ**: خەرمان ٥ **بدعَهُ بدعاً**: ئەوشتەی بەدی هێنا.

**بَدَعَ** البئر: بیرەکەی هەڵکەندو تەواوی کرد. ٥ **أَبْدَعَ**: شتێکی نایاب‌و سەرنج راکێشی هێنایە کایەوە، ٥ **أُبْدِعت حجّتُهُ**: بەڵگەکەی پوچ بووە ٥ **اِبْتَدَعَ**: بیدعەتی داهێنا ٥ **تَبَدَّعَ**: بیدعەی داهێنا، ٥ **اسْتَبْدَعَهُ**: بە شتی ناوازەو بێ وێنەی لەقەڵەم دا. ٥ **الابداع**: بەلای فەیلەسوفەکانەوە بەدیهێنانی شتە لەنەبوو. ٥ **البادعُ**: کاری جوان‌و عەنتیکە ٥ **البِدْعُ**: ئەوکارەی یەکەمجار ئەنجام دەدرێ ٥ **البِدْعُ**: پیاوی پیاوانەو ناودار ٥ **البِدْعَةُ**: بریتییە لە داهێنانی شتی تازە بابەت لەئایین دا یان لەشتی تردا، ٥ **البديعُ**: بەدیهێنەری دەست رەنگین ٥ **البديع**: جۆرە زانیارییەکە لەعیلمی بەلاغەو رەوانبێژی دا.

**بَدَلَ** بدلاً: جومۆزگەکانی ئازاریان دا، ٥ **بادَلَ الشَّيْءَ بغيره مبادلة وبدالاً**: فلان شتی گۆڕییەوە بەفلان شت ٥ **بَدَّلَ الشَّيْءَ**: شێوەی شتەکەی گۆڕی، ٥ **بَدَّلَ الشَّيْءَ شيئاً آخرَ**: ئەوشتەی خستە شوێنی شتێکی تر ٥ **تبادلا**: هەریەکە لەدوو مامەڵەکارەکان کالای خۆی وەرگرت. ٥ **تبدَّلَ**: گۆڕا، گۆڕانی بەسەردا هات ٥ **الأَبْدالُ**: دونیا نەویست‌و سۆفی‌و رەبەن ٥ **البَدَلُ من الشيء**: جێنشین‌و بارمتەو بارتەقاو بەهاو نرخ ٥ **البَدْلَةُ**: ئەو پۆشاکەیە بەرواڵەت بۆدەرەوەی ماڵ دەپۆشرێ. ٥ **البديلة**: جێنشین‌و بەرامبەرو نرخ، ٥ **التَّبَدُّلُ**: لەزاراوەی زانایانی گیانداری‌و پزیشکی دا گۆڕانی ماددەیەکە بۆ ماددەیەکی تر بەگۆڕانێکی کیمیائی‌و سروشتی.

**بَدَنَ** بدناً: قەڵەوبوو، ٥ **البَدَنُ**: ناوە بۆ جەستە جگە لەسەرو دەست‌و قاچ ٥ **البَدَنَةُ**: حوشتری قوربانی، ٥ **المِبْدانُ**: ئەوکەسەیە زوو بەرەو قەڵەوی بچێ بەبێ ئەوەی خواردنی زۆر بخوا. ٥ **البداهةُ**: سەرەتای شت ٥ هەرشتێك کەیەکەمجارو سەرەتا دەبیندرێ یان ئەنجام دەدرێ ٥ **البديهيةُ**: شتی سەلمێنراوو چەسپاو کەپێویست بەبەڵگە نەکا.

**بدا** بدوّاً وبداءً: دەرکەوت ٥ **أبدى الشَّيْءَ و بە**: شتەکەی ئاشکرا کرد ٥ **أبدى في منطقه**: قسەی

رەق‌و ناخۆشــی کــردن‌و لەسنووردەرچــوو. ٥ ابْتَدَی: چوو بۆ لادێ بەرەو سارا کەوتە ڕێ ٥ تبدی: ئاشکرابووە ، لەساراو چۆڵەوانی‌و لادێ دا مایەوە. ٥ البادي: نیشتەجێی لادێ و سارا ٥ البادية: مێینەی (البادي)یە چۆڵەوانیەکی پان‌و پۆرە ئاوو لەوەڕی تێدایە بۆ ئاژەڵ بەخێو کردن. ٥ البداة: قاچێك ٥ ڕای پەسندو باش، ٥ البداءُ: دەرکەوتنی ڕاو بۆچوونە، ٥ البداوة: ژیانی سارانشینی‌و گوندنشینی.

**البدو**: ساراو لادێ ٥ دانیشتوانی ساراو لادێ کان.

**بَذَأَ** بذءاً: قسەی ناشیرینی گوتن ٥ بَذَأَ الأَرْضَ: ڕەخنەی لەزەوییەکە گرت ٥ أبْذَأَ: قسەی ناشیرین‌و جوێن ئامێزی گێڕایەوە. ٥ بَاذَأَهُ بِذاءً ومباذأةً: جوێنی پێداو قسەی ناشیرینی ئاڕاستە کرد.

**البَذَج**: کۆڵ‌و بار.

**بَذَحَ** الجلد عن اللحم: پێستەکەی کەوڵ کرد. ٥ بَذَحَ الرأيَ: ڕایەکەی پەسەند کردو بڕیاری لەسەردا ٥ تَبَذَّحَ الرأيَ: ڕایەکەی پەسەند کردو بڕیاری لەسەردا.

**بَذَخَ** الجَبَل ونحوه بذوخاً: کێوەکە بەرز بوو بەرزایی یەکەی دەرکەوت ٥ بَذَخَ الرجلُ: ئەوپیاوە گەورەو ڕێزدار بوو ٥ باذَخَهُ: شانازی بەسەر دا کرد. ٥ بَذَّهُ بَذّاً: بەسەری دا زاڵ بوو، ٥ بَاذَّهُ: زاڵ بوو بەسەریا، پێشی کەوت.

**بَذَرَ** الحَبَّ بذراً: تۆوەکەی وەشاند بۆ کشت‌و کاڵ ٥ بَذَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی پەرت‌و بڵاو کردەوە ٥ بَذَرَ فلان: فلانکەس زۆری قسەکردو زیاد لەپێویست چەنەی دا ٥ بَذَّر المالَ: بەدەست بڵاوی پارەکەی خەرج کرد ٥ بَذَّرَ فلاناً: فلانکەسی بەتاڵی کردەوە ٥ تَبَذَّر الشيْءَ: ئەوشتە پەرت‌و بڵاو بووەوە. ٥ استَبْذَرَ السحابُ: هەورەکە زوو بارانەکەی باراند. ٥ البَذْرُ: هەر دەنکە تۆوێك لەزەوی دا بچێنرێ ٥ البَذُورُ: فیتنەو ئاشووبگێڕ، ٥ البُذَيْرَةُ: لەزانستی ڕووەکناسی دا بریتیە لەو دەنکە تۆمەی هێشتا کامڵ نەبووە ٥ البَيْذارُ: زۆر بڵێو چەقە چەناو. ٥ التِّبْذارةُ: ئەوکەسەیە بەنەزانی ماڵ‌و سامانی خۆی خەرج دەکا.

**بَذْرَقَ**: حەرەسیاتی گرت‌و پارێزگاری لێ کرد ٥ البَذْرَقَةُ: ئەو حەرەس‌و پارێزەرانەن کەبەچەکەوە پێش کاروان دەکەون، کرێی حەرەسی‌و پارێزگاری کردن وەردەگرن، ٥ ابْذَعَرَّتِ الخَيْلُ: ئەسپەکە کەوتە غاردان ٥ ابْذَقَرَّ القومُ: ئەوقەومە پەرش‌و بڵاو بونەوە ٥ بَذَلَهُ بذلاً: بەدڵ ئەوکارە خۆبەخشییەی ئەنجام دا..

**بَذَلَ** الثوبَ: لەکاتی ئیشکردن‌و خزمەتکردن دا ئەو پۆشاکەی پۆشی. ٥ ابْتَذَلَ الرجلُ: پیاوەکە بەدڵەی کار کردنی لەبەرکرد ٥ تبذّل الرجل: پیاوەکە وازی لەخۆشاردنەوەو خۆپەنادان هێنا ٥ اسْتَبْذَلَهُ: داوای بەخشینی لێ کرد ٥ البَذْلُ: بەخشین بەگوێرەی توانا ٥ البِذْلَةُ مِنَ الثياب: ئەو پۆشاکەیە بۆ ئیش لەبەردەکرێ.

**بَذَمَ** بذامةً وبذماً: پتەوو قایم بوو، ٥ بَذَمَ فلان: فلانکەس خۆ گربوو، ڕایەکەی پەسەند بوو.

**بذا** بذواً وبذاءً: ڕەوشتی خراپ بوو.

**بَرَأَ** الله الخلق براءً وبروءً: خودا بونەوەری دروست کردوە.

**بَرِئَ** المريضُ برءاً وبراءة: نەخۆشەکە چاکبۆوەو نەخۆشی یەکەی نەما ٥ بَرِئَ من فلان براءةً: لەفلانکەس دوور کەوتەوەو وازی لێ هێنا ٥ أبْرَأ فلان: فلانکەس کەوتە یەکەم ڕۆژی

مانگـەوە. ٥ أبْـرَأَ الله فلانـاً: خـودا شـيفای نەخۆشـی فلانكەسـی دا. ٥ أبْـرَأَ فـلان فلانـاً: فلانكـەس گـەردنی فلانـی لەقەرزەكـەی ئـازاد كرد. ٥ بارَأَ شريكه مباراة براءً: لەهاوبەشـەكەی جیابووە. ٥ تَبَرَّأَ من كذا: خۆی لێ رزگار كردو لێی دووركەوتەوە ٥ استَبْرَأَ من النجس والبول: خـۆی لەپیسایی‌و میـز پـاك كـردەوە، ٥ اسـتَبْرَأَ الـشَّيْءَ: توێژینـەوەی لەوشـتەدا كـردو ویـستی بگاتـە ئاكـام‌و راسـتی بۆدەربكـەوێ. ٥ البَـرَاءَةُ: بیـانوو نەهێـشتن‌و هەرِشـە لـێ كـردن ٥ براءة الأختراع: شـەهادەیەكە دەدرێ بەوانـەی داهێنـان ئـەنجام دەدەن‌و بەرهەمـــە داهێنراوەكانیـــان لەفەرمانگـەی تایبـەت تۆمـار دەكـەن. ٥ البُـرْأَةُ: كۆختـــە ٥ البرِيئـــة، البَرِيَّـــةُ: مـــەخلووقات دروسـتكراوەكان. ٥ بَـرْأَلَ الـديكُ: كەڵەشـێرەكە خـۆی گـیف كـردەوە ٥ بَـرْأَلَ الرجـلُ: پیاوەكـە خۆپـارێزی كـرد لەشـەڕو سـوورنەبوو لەسـەر تێوەگلان.٥ اَلْبُرائِلُ: پەڕو بۆڵی ملی كەڵەشێر.

بُرائِلُ الأرض: گیاو گژی زەوی.

اَلْبَــرْبَخُ: دەراوی ئـاوو ڕێـڕەوی، بەلوعـەی ئـاو لەسواڵەت‌و شتی تر.

بَرْبَـرَ التـيسُ أو الأسـدُ: نێرییەكـە یـان شـێرەكە لەكاتی رق هەڵسان دا دەنگـی لـێ بـەرزبووە. ٥ بَرْبَرَ فلان: كـابرا بـەدەنگی بـەرزو رق هەڵساوی قـسەی كـرد. ٥ البَرْبَـارُ: شـێر. ٥ البَرْبَــرُ: نەتەوەیەكە لـەناو چیاكانی بـاكوری ئـەفریقادا دەژین٥ البَـرْبَطُ: ئـامێرێكی مۆسیقایە٥ البُـرْتُ: شـەكری سـپی. ٥ البَـرْتُ — البُـرْتُ: چاوسـاغی شـارەزاو گـورج‌و گـۆڵ ٥ البُرْتُقـالُ: درەختێكـی بـچوكی هەمیـشە سـەوزە لـەپێری درەختـە سوێرییەكانە، ٥ البُرْثُن: چنگ‌و نینـۆكی درِنـدە یـان باڵنـدەی خـاوەن دەنـوك‌و نینـۆكی شـەڕانی لەجۆری بازو هەڵۆ. بَرَجَ بُرُجـاً: بـەرز بووەوە دەركەوت. ٥ أبْرَجَ: بورجی بنیات نا. ٥ أبْـرَجَ الله السماءَ: خودا ئاسمانی كردوە بەخاوەن بورج. ٥ تَبَرَّجَتِ السماءُ: ئاسمان بەئەستێرەكان رازایەوە. ٥ تبرجتِ المرأة: ئافرەتەكە جوانی‌و مەحاسینی خۆی بۆ بێگانـە دەرخـست ٥ الإِبْـرِيجُ: مەشكەی دۆ ٥ البارجة: كەشتی شەڕ ٥ البُرْجُ: قوللەو قەڵا ٥ خانوێك لەسەر شورای شـار دروست بكرێ. ٥ بُـرج المدينـة: روكـن‌و سـەنتەری شـار ٥ البَـرَجُ: جوانخـــاص روخـــساری جـــوان، ٥ البُرْجُـــدُ: پۆشـاكێكی خەتخـەتی ئەسـتورە وەكـوو جـاجم وایـە بـە كـەڵكی ئـەوەدێ بكـرێ بەچـادر، ٥ البُرْجـاسُ: هەدەفێكـە بەسـەری رمبـەوە یـان بەسەرداری ئاڵاوە ٥ البِرْجَاسُ: جۆرێكە لەزین ٥ البَرْجَلُ: پرگـار ٥ بَـرْجَمَ الكـلامُ: قـسەكە رەق‌و زبـر بـوو. ٥ البُرْجُمَـةُ: جـومگەی قامكـەكان، ٥ البرجوازيّـــة: چـــین‌و توێـــژێكی كۆمەڵگایـــە لەسەردەمی راپەڕینی ئـەوروپادا سـەری هەڵدا، ئەندامـەكانی پیـاو مـاقوڵو وەرزێرەكـان بـوون، دوایی ئەم توێژە بوونە پاڵپشت‌و دامەزرێنـەری یاسای پەرلەمانی ٥ پاشـان لەسـەدەی نۆزدەیـەم دا ئەوچـین‌و توێـژە بوونـە خـاوەنی كارگـەو ئامێری بەرهەمهێنان.

بَرِحَ بروحاً وبَرْحـاً: لەشـوێنی خـۆی لاچـو، ٥ بَـرِحَ الظبـي والطـائرُ: ئاسكەكە یـان باڵندەكـە لـەلای راستی بینەرەوە رۆیی بۆلای چەپی.

بَرِحَ الخفاءُ: نیشەكە رون بووەو تـەم‌و مـژی لەسـەر رەوییەوە. ٥ بَرِحَ مكانهُ: لەشوێنی خۆی لاچووو بـەجێی هێـشت. ٥ أبْـرَحَ بـه: زۆری ئەزیـەت دا، جاڕسی كرد ٥ أبْـرَحَ الـشَّيْءَ: رێـزی لـێ گـرت ٥ بَرَّحَ الله عنه: خودا چورتم‌و تـەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشی لەسەر لابرد. ٥ البارِحُ: گـرەی گـەرمای

هاوین ◊ رەشەبای گەرمی هاوین. ◊ **البارِحَةُ**: بۆ مێینەی (البارح)ە نزیکترین شەوی رابردو ◊ **البَرَاحُ**: پانتایی یەکە لەزەوی روتەن ◊ **البَرَحُ**: تەنگانەو سزای بەئێش و ئازار، ◊ **البُرَحاءُ**: چەرتەم و تەنگانەو ئازار ◊ **اَلْبَرِيحُ**: ماندوبون (التباريحُ) ناخۆشی جۆراو جۆر. ◊ **تباريح الهوى**: ئازاری عەشق و ئەوین.

**بَرَدَ** برداً وبروداً: پلەی گەرمی دابەزی ◊ بَرَدَ حقَّهُ علي فلان: مافی خۆی لەسەر فلان چەسپاند ◊ بَرَدَ: مرد، ساردبووە، گیانی تێدانەما، ◊ بَرَدَ السيف: شمشێرەکە کول بوو، نەیبڕی. ◊ بَرَدَ الشَّيْءَ: ساردی کرد، یان بەفری تێکەڵ کرد. ◊ بَرَد الخُبْزَ بالماء: نانەکەی بەئاو تەڕکرد، ◊ بَرَدَ اللَّيْلُ القوم وعليهم: خەڵکەکە سەرمای شەویان توش هات. ◊ بَرَدَ العينَ: چاوی رشت ◊ بُرِدَ القومُ: خەڵکەکە سەرمایان بوو، ◊ اَبْرَدَ: چوەوە کاتی فێنکی و سەرما ◊ اَبْرَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەساردی هێنا ◊ اَبْرَدَ خُبزَهُ: نانەکەی بەئاو تەڕکرد ◊ بَرَّدَ الشَّيْءَ: شتەکەی سارد کرد ◊ اِبْتَرَدَ: بەئاوی سارد خۆی شت ◊ ئاوی ساردی خواردەوە ◊ اِسْتَبْرَدَ عليه لسانه: زمانی لێ بەرەڵاکرد وەکوو برمەند. ◊ **الأبردان**: ئێوارەو بەیانی. ◊ **الباردُ**: ژیانی خۆشی و بێمەینەت. ◊ **الحرب الباردة**: جەنگی سارد، شەڕی پروپاگەندەو چاوو راو ◊ **البُرادةُ**: وردە ئاسن ◊ **البِرادةُ**: میهنەی ئاسن برینەوە. ◊ **البُرْدُ**: پۆشاکێکی خەتخەتە وەکوو جاجم ◊ **اَلْبَرَدُ**: تەرزە ◊ ئاوی بەستوو کەلەهەورەوە دێتەخوارەوە ◊ **البَرِدُ**: هەوری تەرزاوی، هەوری خاوەن تەرزە. ◊ **بَرَدَى**: چۆمێکە سەرچاوەکەی لەگوندی (الزَّبداني) هەڵدەقوڵێ، ◊ **البُرَداءُ**: لەرزو تای زۆر سەرما ئاوەر. ◊ **البُرْدَةُ**: پۆشاکێکی خەتخەتە وەکوو عەبا لەبەردەکرێ یان وەکوو جاجم بەخۆ دا دەدرێ، ◊ **البَرَدَةُ**: قەڵەوی. ◊ **البُرْدِيُّ**: جۆرە خورمایەکی بەسەندە. ◊ **البَرَّادةُ**: مێینەی (اَلْبَرَّادُ)ە ◊ مەکینەی ئاو سارد کردن (ثلاجة). ◊ **البَرودُ**: هەرشتێك فێنك کەرەوە بێ ◊ **المِبْرَدُ**: برمەند؛ ◊ **البَرْدعةُ**: کورتانی گوێدرێژ یان هێستر ◊ بَرْذَنَ الرجلُ: ئەو پیاوە سواری بارگیر بوو یان بوو بە خاوەنی بارگیر ◊ **البِرذَونُ**: ولاغە بەرزەیەکە جیا لە هێسترو ئەسپی عەرەبی بەکوردی پێی دەگوترێ بارگیر. **بَرَّ** حَجُّهُ براً: حەجەکەی وەرگیراو قبوڵ بوو. ◊ بَرَّ اليَمينُ: سوێندەکە راست بوو ◊ بَرَّ البَيْعُ: مامەڵەیەکی بێ غەل و غەش بوو، ◊ (بَرَّ فلان والديه) فلان زۆر چاکەی لەگەڵ باوك و دایکی داکرد ◊ بَرَّ فلانٌ: فلانکەس راستاڵ و بەخۆ چاراو بوو ◊ اَبَرَّ: بەوشکانی دا سەفەری کرد ◊ اَبَرَّ الرجلُ: پیاوەکە منداڵی زۆر بوون ◊ اَبَرَّ القومَ: بەسەر خەڵکەکەدا زاڵ بوو ◊ اَبَرَّ اللهُ يَمينه: خودا ئاواتەکانی دوعاکانی بۆهێنایەدی ◊ بَرَّر عَمَلَهُ: پاساوی بۆکارەکەی هێنایەوە، ◊ اِبْتَرَّ: لەهاوەلانی جیابووە، گۆشەگیر بوو. ◊ تَبارّوا: ئەوانە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان پێشبرکێیان کرد. ◊ **البَرُّ**: ئەو وشکانییەیە ئاو داینەپۆشیبێ، ◊ **البِرُّ**: خێرو چاکە ◊ **البُرُّ**: گەنم ◊ **البَرِّيةُ**: سارا، ◊ **البرير**: بەروبوومی داری ئەراك. ◊ **المَبَرَّة**: شوێنی چاکە کردن و بەهاناوە چونی لێقەوماوان.

**بَرَزَ** بروزاً: دەرکەوت و ئاشکرابوو ◊ بَرَزَ لە: بۆی تاق بووە بۆئەوەی زۆرانبازی و بەرامبەری لەگەڵ بکا. ◊ بَرَزَ فلان: دوای گێلی و نەفامی

تێگەیشتو عاقڵ بوو. ٥ بَرَزَ: چوو بۆ دەست بەناو گەیاندن. ٥ بَرَزَ الأرضُ: زەوییەکە بوو بەشوێنی دەست بەناو گەیاندن. ٥ بَرُزَت المرأة: ئافرەتەکە پۆشاکی بالاپۆشی وەلا ناو خۆی سفور کرد ٥ أبْرَزَ: بریاری سەفەرکردنی دا ٥ أبْرَزَ الکتابَ: کتێبەکەی بلاو کردەوە، ٥ بارَزَهُ مبارزة: بەشمشێرو شتی وا بەرامبەری کرد. ٥ بَرَّزَ: چوو بۆسەر ئاو.

بَرَّزَ الرجلُ: پیاوەکە بەسەر هاوەڵانی دا بالادەست بوو ٥ تبارَزا: هەریەکە لەو دوو کەسە لەگۆڕەپان دا کەوتنە بەرامبەری کردن ٥ تَبَرَّزَ: چوو بۆسەر ئاودەست ٥ البَرازُ: دەشتو سارایەکی بەرافراوانی بێدارو درەختو گژوگیا ٥ البَرزةُ: لوتکە شاخو دوندی کەژ ٥ البَریزةُ: ئەوشوێنەی کارەبای لێ وەردەگیرێ ٥ البَرزَخ: لەمپەرو پەردەی نێوان دووشت ٥ ئەوماوەیەی نێوان مردنو زیندو بوونەوە.

بَرَّسَ الأرض: زەوییەکەی کێڵاو شەندی کردەوە ٥ البُرسُ: لۆکە. ٥ البُرُستانة: غودەیەکە دەوری ملی کیسەی میزەڵدانی داوە.

بَرِشَ بَرَشاً وبُرْشةً: رەنگی جۆراو جۆرو خاڵخاڵە ٥ البُرْشُ: حەصیرێکی بچکۆلەیە لەپرۆی دارخوما دروست دەکرێ ٥ بَرْشَقَ اللحمَ: گۆشتەکەی کەرت کەرت کرد. ٥ إبْرَنْشَقَ: کەیف خۆشو تەڕدەماخ بوو. ٥ بَرْشَمَ في الشَّيءِ: ئەو شتەی خاڵخاڵ کرد ٥ البُراشِمُ: ئەوکەسەیە چاوی تیژ بێ. ٥ البِرْشامُ: بەرگێکە دەرمانی تێوە دەپێچرێ. ٥ البُرْشُمُ: سەرپۆش، لەچکە.

بَرِصَ بَرَصاً: بەڵەکی لەجەستەی پەیدا بو، ٥ بَرِصَ الأرضُ: زەوییەکە هەندی شوێنی گیاوگژەکەی خوراوەو پەڵە پەڵەبووە. ٥ أبْرَصَ اللهُ فلاناً: خودا فلانی توشی نەخۆشی بەڵەکی کرد ٥ بَرَصَ الرأسَ: سەری تاشی. ٥ البَرَص: سپیایەتیەکە لەپێست دا پەیدادەبێ لەبەر نەخۆشی بەک. ٥ البُرْصةُ: دەلاقەو کەلێنێکە لەهەوردا پەیدادەبێ لێوەی ئاسمان دەبینرێ ٥ البَریصُ: بریسکەو بریقە.

بَرَضَ الماءُ: ئاوەکە کەم بوو، هاتە دەرەوە بەکەمی. ٥ بَرَضَ النباتُ: گژوگیاکە چەکەرەی کرد ٥ أبْرَضَت الأرض: زەوییەکە گژوگیاکانی بەزۆری سەریان دەرهێناو لەخۆکەوتن. ٥ بَرَّضَ الرجلُ: پیاوەکە هەموو سامانی خۆی لەبەخشین دا خەرج کردو هیچی نەهێشتەوە. ٥ إبْتَرَضَ الماءُ: ئاوەکە کەم بوو، ٥ تَبَرَّضَ فلانٌ: فلانکەس کەمێکی پێداویستی ژیان بۆدابین بوو. ٥ تَبَرَّضَ الماءَ: کەم کەم ئاوەکەی هەڵێنجا ٥ تَبَرَّضَت الماشيةُ النباتَ: ئاژەڵەکە گژوگیاکەی بەناسکی خوارد، ٥ البارِضُ: گژوگیایەکە تازە دەڕسکێ ٥ البُراضُ: شتی کەم ٥ البُرْضةُ: ئەوشتە کەمەیە کەوردە وردە بەهەوڵدان دەست دەکەوێ.

بَرْطَلَ فلاناً: مێزەری لەسەر کرد، فێسو عەمامەی خستەسەری یان بەرتیلی پێدا. ٥ تَبَرْطَلَ: فێسی لەسەر کرد، بەرتیلی وەرگرت.

بَرْطَمَ الليلُ: شەو داهاتو جیهان زۆر تاریك بوو ٥ بَرْطَمَ فلاناً: فلانکەسی تورە کرد ٥ تَبَرْطَمَ: لەقسەکە توڕەبوو. ٥ البَرْطَمُ: ئەوکەسەیە لاڵ بێ، زمانی بگیرێ، قسەی بۆنەکرێ. ٥ البَرْطمانُ: قاپێکی گەورەیە لەشوشە یان لە سوالەت ورەباو شتی لەوجۆرەی تێدا هەڵدەگیرێ. ٥ البُرطُومُ: دینگە، پالو.

بَرَعَ بُروعاً: بەسەر هاوەڵەکانی دا بالادەست بوو، ٥ بَرَعَ الجَبَلَ: چووە سەر لوتکەی کەژەکە ٥ بَرَعَ

براعةً: بەسەر هاوەڵەكانی دا باڵا دەست بوو پێشیان كەوت. ◊ البارع (سعد البارع): ئەستێرەیەكە. ◊ البَرَاعَةُ: پیاوەتیو مەردایەتیو رەوشت جوانی تەواو ◊ بَرْعَمَ الشجرُ: درەختەكە چرۆی كرد ◊ البُرْعُمُ: میوەی درەخت لەناو توێكڵەكەی دا ◊ البُرعُومة: بەمانا تۆپەڵاكی كێو هاتووە.

**بَرَغَ** بَرَغاً: نازپەروەر بوو ژیانی خۆش بوو. ◊ البَرْغ: تف، لیك. ◊ البَرْغَثَةُ: رەنگێكە لەنێوان خاكیو رەش دا كەمێك سپی تێدایە. ◊ البُرْغُوثُ: مێشوولە، ◊ البَرْغَشُ: مێشوولەی گەزندە. ◊ بَرْغَلَ: لەزەوی نزیك ئاو دا نیشتەجێ بوو. ◊ البُرْغُلُ: ساوار، ◊ البِرْغِيلُ: زەوی نزیك ئاو.

**بَرَقَ** البَرْقُ بَرْقاً: چەخماخەو بریسكە دیاری دا. ◊ بَرَقَ السحابَةُ أو السماءُ: هەورە بریسكەی لێ دا. ◊ بَرَقَ الشَّيْءُ: درەوشایەوە، ◊ بَرِقَ بَرَقاً: ترساو واقی ورماو لە ترسان هیچی نەبینی. ◊ أَبْرَقَ: تیشكی بەرق لێیدا ◊ أَبْرَقَ فلانٌ البرقَ: فلانكەس بەرقی بینی ◊ أَبْرَقَتِ المرأة بوَجهها وبعينها: ئافرەتەكە بەروخسارو چاوی جوانیو بریسكەی لێ دەركەوت. ◊ بَرَّقَ بصره وبَصَرَه: چاوی تێبڕیو زۆری سەیركرد. ◊ بَرَّقَ فلانٌ: فلانكەس هەڕەشەی كردو وادەی شەڕی بەبەرامبەرەكەیدا ◊ بَرَّقَ: سەفەری دوورو درێژی ئەنجام دا ◊ الأبْرَق: شوێنێكی بەرداویو رەقەنو بێ گزوگیا ◊ الإبْرِيقُ: شمشێری بریسكەو ورشە دار، ◊ البارِقَةُ: مێینەی (الابارق)ە ◊ هەروەها بریسكەی چەكو شمشێرە ◊ البَرْقُ: روناكییەكە لەئاسمان دیاری دەدا بەهۆی تەقینەوەی كارەبایی لە هەوردا ◊ البَيْرَقُ: ئاڵاو عەلەم، ◊ البيرقدار: هەڵگری ئاڵا.

بَرْقَشَ الشَّيْءَ: ئەوشتەی بەجۆرەها رەنگ نەخشاند ◊ تَبَرْقَشَ: بەجۆرە هارەنگ رازاندرایەوە ◊ البِرْقِشُ: باڵندەیەكی بچوكە وەكوو چۆلەكەوایە پەڕەكانی سەرەوەیان خاكیو ناوەراستیان سورو خوارەوەیان رەشە. ◊ بَرْقَطَ فلان: فلانكەس لەسەر قاچی دانیشتو ئەژنۆی بڵاو كردنەوە. ◊ بَرْقَطَ الكلامَ: قسەكانی بەبێ سەروبەر گوتن. ◊ تَبَرْقَطَ: بەسەر پشتە ملیدا كەوت.

بَرْقَعَ وَجْهَهَا: بەقیناع دەمو چاوی خۆی داپۆشی. ◊ البُرْقُعُ: قیناعی ئافرەت یان هی ئاژەڵ ◊ المُبَرْقَعُ: ئەسپێكە هەموو دەمو چاوی سپی بێ ◊ البَرْقُوقُ: درەختێكە لەپێڕی گوڵدارەكانە، ◊ بَرْقَلَ: درۆی كرد، قسەی كردو كردەوەی لەگەڵ نەبوو.

**بَرَكَ** البَعِيرُ بروكاً وتَبْراكاً: وشترەكە بەسەر سینگی دا كەوت ◊ لەشوێنێك پیخی خواردو نەجوڵا ◊ بَرَكَ السماءُ: ئاسمان بارانەكەی بەردەوام بوو. ◊ بَرَكَ للقتال: چوكی دا دا بۆشەڕ، لەسەر ئەژنۆ هەڵتروشكا بۆ شەڕ. ◊ بَرَكَتِ المرأة: ئافرەتەكە كوڕی گەورەی هەیەو شوی كردەوە. ◊ أَبْرَكَ في عَدْوِه: لەرۆیشتن دا بەگورجی هەنگاوی هەڵێنا. ◊ أَبْرَكَ البَعيرَ: حوشترەكەی پیخ دا. ◊ بَرَّكَ فيه وعليه: دوعای خێرو بەرەكەتی بۆكرد ◊ اِبْتَرَكَ القوم في القتال وله: لەسەر چوك دانیشتن بۆ شەڕ ◊ اِبْتَرَكَ الدابَّةُ: ولاغەكە لەرۆیشتنوراكردن دا خۆی بەسەر لایەك دا دا، بەلاسەنگی غاری دا. ◊ ابتَرَكَ السماءُ: ئاسمان بەرەكەتی رشت ◊ تبارَكَ: بەرز بووە پیرۆز بوو، ◊ البَرْكُ: سینگ، ئەوشوێنەیە حوشتر لەكاتی پاڵكەوتن دا

دەیخاتە سەرزەوی ○ کۆمەڵە حوشتری زۆر ○ **البَرَكَةُ**: خێرو فەڕو گەشەو نەش‌و نما.
**حَبَّةُ البَرَكَة**: ڕەشکە ○ **البِرْكَةُ**: زەلکاو، ئەستێر، ئەستێڵ ○ **البُرْكَة**: باڵندەیەکی ئاوی یە شێوە مراوی یە ○ **البَريك**: پیرۆزو بەفەڕ ○ خورمای تەڕو تازە لەگەڵ ڕۆنەکەرەدا تێکەڵ دەکرێ‌و دەخورێ ○ **اَلْبَرِيكَةُ**: حەڵوا ○ **المَبْرَك**: شوێنی ییخ دانی حوشتر ○ **البَرْكَارُ**: پەرگاڵ ○ **البُرْكَانُ**: بریتیە لەشەقبونی توێکڵی زەوی‌و دەرپەڕینی ماددە تواوە غازو بوخارەکان لێیەوە ○ **بَرْكَعَ**: بەسەر ئەژنۆدا کەوت ○ **بَرْكَعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوەو پارچە پارچەی کرد ○ **اَلْبِرْكِعُ**: کورتە باڵا ○ **اَلْبَرْلَنْتُ**: بەرزترین‌و بەنرخترین جۆری ئەڵماس.
**بَرَمَ** الحَبْلَ: لەهەردو سەرەوە حەبلەکەی گرێدا ○ **بَرَمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی قایم‌و پتەو کرد ○ **بَرِمَ بِمَنْطِقِهِ**: زمانی گیراو قسەی پی نەکرا ○ **أبْرَم**: برمەی دروست کرد ○ **أبْرَمَ الحَبْلَ والشيئ**: حەبلەکەو شتەکەی پتەوو قایم کرد ○ **أبْرَمَ الحكمَ**: بڕیارەکەی پشت ڕاستکردەوە ○ **اَلْبَرَّامَة**: بەکوردی (بڕێنەی پی دەڵێن) ○ **البُرْمَة**: دیزەی بەردین ○ **اَلْبَرِيمُ**: هەرشتێك لەدەزووشتی تر○ **المِبْرَمُ**: تەشی ○ **المُبْرِمُ**: قورس ○ کەسێك قسەی پڕوپوچ بکا ○ **البَرْمائي**: گیانلبەر یان ڕوەك کەلەناو وشکانی‌و ئاودا بژیا ○ **البَرْنِيُّ**: جۆرێکی باشی خورمایە ○ **اَلْبَرْنِيَّةُ**: زەرفێکی دەم پانە ○ **البَرْنامجُ**: دەفتەری حیساب، یان تۆماری ئەوکاڵایەی لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەنێردرێ (مەنەفێس) ○ **البُرُنْزُ**: تێکەڵەیەکە لەمس‌و قەصدیر ○ **البُرْنُسُ**: هەرلیباسێك سەر کڵاوی پێوە لکێندرابێ ○ **البُرْنيطة**: پۆشاکی سەر لای فەرنگییەکان ○ **اَلْبَرْنيلي**: ڕەنگێکە لەتۆوی کەتان دروست دەکرێ ڕەسم‌و شتی وای پی چەور دەکرێ.
**بَرِهَ** الرَّجُلَ بَرَهاً: پیاوەکە جەستەی پڕکردوە دوای ئەوەی کەلاواز بوو بەنەخۆشی، لاشەی وەکوو خۆی لێ هاتەوە ○ **اَلْبُرْهَةُ**: ماوەیەکە لەزەمان ○ **بَرْهَمَ**: چاوی تێ بڕی بەبێ ئەوەی چاوی بتروکێنێ ○ **اَلْبَراهِمَةُ**: پێڕو تایەفەیەکی هێندین ○ **البَرْهَمَةُ والبُرْهمةَ**: چرۆی درەخت ○ **بَرْهَنَ**: بەڵگەی هێنایەوە لەسەرداواکەی ○ **البُرْهانُ**: بەڵگەی یەکالاکەرەوە ○ **بَرا القَلَمَ أو السَّهْمَ**: قەڵەمەکە یان سەرەتیرەکەی تاشی ○ **برا الله الشَّيْءَ**: خودا ئەوشتەی بەدی هێنا ○ **اَلْبُرَةُ**: ئەڵقەیەکی بچوکە لەزەرد یان لەشتێکی تر دروست دەکرێ لەلایەکی لوتی حوشتر دەکرێ بۆ ئەوەی ژێرباربێ ○ **البَرِيَّةُ**: بونەوەر، خەڵك ○ **البروتيستنتية**: ڕێبازێکی مەسیحی یە لەئاکامی جەم‌و جۆڵ‌و هەوڵدان بۆ چاکسازی لەئایینی مەسیحی دا سەری هەڵدا ○ **بَرْوَزَ** الصورة ونحوها: چوار چێوەی بۆ ڕەسمەکە دانا ○ **البُرُوفَةُ**: پراوە پێکردنی شتێك پێش ئەوەی بۆجەماوەر نمایش بکرێ ○ **البَرْوَقُ**: ئەو سەوزایی یە کە لەسەرەتادا زەوی دادەپۆشێ.
**بَرَيَ** العودَ أو الحَجَرَ ونحوهما: دارەکە یان بەردەکەی تاشی ○ **برَى القَلَمَ**: لایەکی قەڵەمەکەی دادا بۆ پێنووسین ○ **بَرَى السفرُ والجوعُ الانسان والجَمَلَ**: سەفەرو برسایەتی ئادەمیزادو حوشتری لاواز کرد ○ **بَارَى إمرأته**: لەگەڵ ژنەکەی ڕێك کەوتن کەلێك جیاببنەوە ○ **تبارى الرجلان**: دووپیاوەکە پێشبڕکێی یەکتریان کرد ○ **اَلْبَرَى**: گڵ‌و خۆڵ ○

مـەخلووقات ◊ البُـراء: هـەموو ئـەو وردەو خشتو خۆڵەی لـەناکامی تاشینو بڕینـەوەی شـت دەکەوێتـە خـوار ◊ البِرايَـةُ: دارتاشـی، سەنگتراشـی ◊ البَـرَّاءُ: ئەوکەسـەی کارەکـەی بڕینییە لەدارتاشی یان سەنگتراشی ◊ البَرّاءَةُ، اَلْبَرّايَـةُ: قەڵـەم دادەر ◊ المِبْـراةُ: قەڵـەم تـاش ◊

بَزْبَـزَ: لەڕۆیـشتندا پەلـەی کـرد ◊ تێشـکاو هـەڵهات ◊ بَزْبَـزَ الرَّجُـلَ: پیاوەکـەی بـەهێز ڕاپسکاوت ◊ بَزْبَزَ الشَّيءَ: ئەوشتەی چارەسەرکرد ◊ البُزابِزُ: تیژڕەو.

بَزَجَ بَزْجاً: خۆی هەڵکێشا ◊ بَزَجَ عليه: گێچەڵی پێ کـرد ◊ بَـزَجَ الـشَّيءَ: شـتەکەی جـوانکردو ڕازاندیـەوە ◊ تبـازج الـرجلان: ئـەو دووپیـاوە خۆیـان بۆیـەکتر هەڵکێـشا ◊ بَزَخَـه بَزْخـاً: لەسێبەندەی دا ◊ سێ بەندەی چاڵ کردو ناوکی دەرپەڕاند ◊ بَزَخَ الرَّجُلَ: ئابڕوی پیاوەکەی برد ◊ تبازخت المرأةُ: ئافرەتەکە سمتی دەرپەڕانـدن ◊ تبازَخَ عـن الأمـر: دواکەوت لەکارەکە ◊ البزَخُ: لبـەلانی نـزم ◊ البَـزْدَرَةُ: میهنـەی وەرزێـڕیو جوتیاری.

بَزَرَ الحَبَّ: تۆوەکەی وەشاند ◊ بَزَرَ فلانـاً بالعـصا: بەگۆچـان لەقلانکەسـی دا ◊ بَـزَّرَ الطعـامَ: خۆراکەکەی ڕازانـدەوە ◊ اَلْبـازور مـن الرجـال: پیـاوی گومانـاوی ◊ اَلْبَـزْرُ: ئـەوتۆوە کەبـەزەوی دەکرێ ◊ اَلْبَزْراءُ: ئافرەتێك زۆری منداڵ بووبن ◊ اَلْبِـزْرَةُ: هـەرتۆوێك لـەزەوی دا بـچێندرێ بـۆ زەراعەت ◊ اَلْبَزّارُ: تۆو فرۆش ◊ اَلْبَيْزارُ: جوتیار ◊ هەڵـگری بـازی ڕاو ◊ اَلْبَيْـزارةُ: ئـەوداره ئەستورەیە کەجل شۆر پۆشاکەکانی پێ دەکوتێ بۆ پاکبونـەوە ◊ اَلْمَبْـزُورُ: پیاوێکـە منـداڵی زۆر هـەبێ ◊ بَزَّ قرينه: بەسـەر بەرامبەرەکەیدا زاڵ بـووە بَـزَّ الـشَّيءَ: شـتەکەی دەرکێشا ◊ اَلْبِـزازة: کۆتاڵفرۆشی ◊ اَلْبَزُّ: جۆرێکە لە پۆشـاك ◊ البِـزُّ: گۆی مەمك.

بَزَغَ الصَبيُّ بَزاغـةً: منالەکە قسەخۆش بـوو ◊ بَـزَغَ الرجـلُ: ئـەوپیاوە بـوو بـە گـەورەو دەمڕاسـتی نەتەوەکـەی ◊ تَبَـزَّغَ الـشَّرُّ: شـەڕ بـەرپا بـوو ◊ بَزَغَـتْ الـسِّنُّ: ددانەکـە گۆشـتی پوکەکـەی هەڵاشتو دەرکەوت ◊ بَزَغَتِ الشمسُ أو القمرُ أو الـنجم: خـۆر یـان مـانگ یـان ئەسـتێرە لەئاسـۆ دەرکەوت ◊ بَزَغَ الطبيبُ الجلدَ بَزْغـاً: پزیـشکەکە پێستەکەی هەڵـدڕی ◊ ابْتَـزَغَ الربيـعُ: سـەرەتای بەهار پەیدابوو ◊ المِبْزَغُ: کێردی پزیشك.

بَزَقَ بَزْقاً وبُزاقاً: تفی لێ کـرد ◊ البُـزُقُ: ئـامێرێکی مۆسیقایە ◊ البُزاقُ: بەمانا (البُصاق) واتە: تف.

بَـزَلَ النـابُ: کەڵبەکە دەرکـەوت ◊ بَـزَلَ الرجـلُ: پیاوەکـە ئـەزموونی تـەواو بـوو، بـەنێو زۆر ئـەزمونو جـورتم دا تێپـەڕی ◊ بَـزَلَ الـشَّيءَ: شـتەکەی هەڵـدڕی ◊ بَـزَلَ الـشرابَ: کوبـە شەرابەکەی کون کـرد ◊ بَزَلَ الحاجَةَ: ئیشەکەی جێبـەجێ کـرد ◊ بَـزَلَ الـرأيُ والأمـر: کارەکـە سەری گرتو سەقامگیر بوو ◊ انْبَزَلَ: شەق بوو، قەڵشا، دڕا، دڕزی بـرد ◊ تَبَزَّلَ الشرابُ: کوپەکـە قەڵشاو دڕزی بـرد مەیەکـەی لـێ ڕژا ◊ البـازِلُ: ددان کـاتی ڕوانـی کەڵـەپوك دەردەکـەوێ ◊ البازِلةُ: برینێك لەپێست دەکرێو خوێنی لـێ دێ.

بَزَمَ القـولُ: قسەکە رەقو زبـر بـوو ◊ بَـزَمَ عليـه: بەددانی پێشەوە (کەڵبە)ی گەستی ◊ بَـزَمَ علـى الأمـر: لەسـەرکارەکە بـەردەوام بـوو سـوور بـوو لەسەرکردنی ◊ بَزَمَ بالعِـبْءِ: بەوئەرکـە قورسـە هەڵسا ◊ بَزَمَ الرَّجُـلَ بازمـةً: ڕۆژگـار ئـەوپیاوەی

توشی چورتمو نههامەتی کردوە ٥ البازِمَةُ: تەنگانەو چورتمو ناخۆشی ٥ البَزْمة: تەنگانەو ناخۆشی ٥ اَلْبَزیمُ: لقی شلکی دارخوما کەشتی پێ ببەسترێ.

**بَزا** بَزْواً: گوێی هەڵخستو سەرنجی دا ٥ بَزا الرجلُ: پیاوەکە سنگی دەرپەڕیوەو پشتی چاڵ بووە ٥ بَزا بَزْواناً: بازی دا، گوڕی بەست.

**بَزِيَ** بَزاً وبَزاءً: سنگی دەرپەڕیوە سکی بەناودا چووە ٥ تَبازَى الرجلُ: پیاوەکە هەنگاوەکانی فراوان کردن ٥ البازِي: پێڕی بازی بچوکە یان بازی مامناوەندی کەباڵیان مەیلەو کورتن ٥ اَلْبَزْو: هاوتا هاوشان.

بَسَأَ بالأمر: بەوکارە راهاتو فێری بوو.

**بَسْبَسَ**: خێرا رۆیی ٥ بَسْبَسَ بینهم: هەوڵی دا دوبەرەکی بخاتە نێوانیان ٥ البَسْبَسُ: سارای چۆڵو هۆڵ ٥ بَسْتَرَ اللبَنَ: شیرەکەی لەسەر رێبازی زانای فەرەنسی باستۆر تەعقیم کرد ٥ البُستَانُ: باغچەیەکە درەختە خورمای پەرت بڵاوی تیدان کەدەکرێ لەنێوان دارخورماکان دا کشتوکاڵ بکرێ ٥ البُستانِي: باخەوان ٥ البَستَنَة: زانیاری بەخێوکردنی باغو باغچەکانو چۆنیەتی وەبەرهێنانیان.

**بَسَرَ**: پەلەی کرد ٥ بَسَرَ بالشيء: بەوشتە دەستی پێکرد ٥ بَسَرَ فلان النَخْلَةَ بَسْراً: فلانکەس تەلقیحی دارخورماکەی کرد پێش ئەوەی کاتی بێ ٥ بَسَرَ النَّبَاتَ: گژوگیاکەی شین خواردو کرد ٥ بَسَرَ القَرْحَةَ: برینەکەی قەلاشتەوە پێش ئەوەی چاك بێتەوە ٥ بُسِرَ: توشی نەخۆشی مایەسیری بوو ٥ إبْتَسَرت الرَّجُلُ: قاچی تەزیو ئاڵ بووە ٥ إبْتَسَرَ بالشَّيْءِ: بەوشتە دەستی پێکرد ٥ ابْتَسَرَ الفاكهةَ: بەتەڕو ناسکی میوەکەی لێ کردەوە ٥ تَبَسَّرَ الرجلُ: قاچی تەزی ٥ تَبَسَّرَ النباتَ: زەوی هەڵکۆڵی بۆدەرهێنانی روەکەکە پێش ئەوەی بەناسایی سەردەربێنێ ٥ البَسْرُ: روگرژی ٥ البُسْرُ: خورما پێش ئەوەی پێبگاو شیرین ببێ ٥ البُسْرَةُ: تاکی (البُسْرَ) هەروا ناوە بۆ هەموو روەکێك کە تازە سەردەردێنێ ٥ المُبْسِرَةُ: بای وادە، بایەکە دەبێتە نیشانەی ئەوە کەباران بارین نزیکە.

**بَسَّ** الرَّجُلُ بَسَّاً: پیاوەکە داوای کردو هەوڵی داو تێکۆشا ٥ بَسَّ الشَّيْءَ: شتەکەی وردو خاش کرد ٥ بَسَّ عليه عَقارِبَهُ: دوژمنەکانی ناردنە سەر ٥ بَسَّ له من يَتَخَبَّرُ بِخَبَرِهِ: کەسێکی کردە جاسوس بەسەریەوە ٥ بَسَّ الرَّجُلَ: پیاوەکەی دەرکرد دوری خستەوە ٥ اِنْبَسَّ: رۆیی رابورد ٥ البَسُوسُ: شوان ٥ حوشترێ شیرنەدا ٥ البَسِيسُ: خۆراکی کەم ٥ البَسِيسَةُ: قاوت.

**بَسَطَ** الشَّيْءَ بَسْطاً: شتەکەی بڵاو کردەوە ٥ بَسَطَ يَدَهُ في الانفاق: دەست بڵاوی کرد ٥ بَسَطَ اللهُ الرزق: خودا رزقو رۆزی بۆبەندەکانی زۆرکرد ٥ بَسَطَ فلاناً: فلانکەسی کەیف خۆش کرد ٥ بَسَطَ العُذْرَ: پاساوو بیانوەکەی لێ قبوڵ کرد ٥ بَسَطَ لسانَهُ: زمانی کرایەوەو بەڕەوانی کەوتە ئاخاوتن ٥ بَسَطَ يَدَهُ: دەستی یارمەتیو بەخشندەیی بۆ ئاتاجان درێژکرد ٥ بَاسَطَهُ: دڵنەوایی کرد ٥ بَسَّطَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڵاو کردەوە ٥ اِنْبَسَطَ النهار: رۆژگار درێژبوون ٥ تَبَسَّطَ: بڵاوبووە ٥ البَاسِطُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ الباسِطة: قامەتی پیاو بەجۆرێك دەست هەڵبڕێ بۆ هەوا ٥ اَلْبَسَاطُ: زەوی پانو پۆڕ ٥ البِسَاط: هەرشتێك رابخرێو بڵاو بکرێتەوە ٥ البَسْطَةَ: زێدەو بەشی زۆر ٥

اَلبَسطَةَ مِـن النسـاء: ئـافرەتی جوان‌و نـەرم‌و ناسـك ◊ البَـسيطُ: پێـچەوانەی مورەكەبـە ◊ المُتَبَسِّطُ: روبـەری تـەخت‌و پـان‌و پـۆر ◊ بَـسَقَ الرجلُ: پیاوەكە ناوو شۆرەتی بلاوبووە ◊ بَسَقَ في الـشَّيءِ: لەوشـتەدا كـارا مـابوو لێـزان‌و كـار دروست بوو ◊ بَسَقَ عليه: بەسەریدا بـەرزبووە ◊ بَسَقَ فلان: ناوو شۆرەتی پیاوەتی بـەرز بـووە. ◊ الباسِقَةُ: هـەوری سپی‌و بـێ خـەوش‌و رەنـگ رون ◊ بُسَاقَةُ القمر: بەردە سیخرۆ.

بسلَ الطعامُ أو الشرابُ: خواردنەكە یـان شـەرابەكە گـۆڕانی بەسـەردا هـات‌و بەكـەڵكی خـواردن‌و خواردنەوە نـەهات، ◊ بَسَلَ فلانـاً: سەرزەنشتی فلانی كرد ◊ بَسَلَ الشَّيءَ: كەم كەم لێی وەرگرت ◊ بَـسُلَ بـسالاً وبَـسَالَةً: ئـازاو بەهەڵـمەت بـوو ◊ أبسَلَ الـشَّيءَ: شتەكەی قەدەغـە كـرد. ◊ أبـسَلَ فلانـاً للهلكـة: فلانكەسـی تەسـلیمی تێداچون‌و هیلاكەت كـرد ◊ أبـسَلَ فلانـاً لعملـه: ئیشەكەی بەفلانكـەس سـپاردو خستیە ئەستۆی. ◊ بَـسَّلَ وَجهَهُ: دەم‌و چاوی خۆی زۆرگـرژو مـۆن كـرد. ◊ تَبَسَّلَ الرجلُ: پیاوەكە ڕوی گرژ كـرد ◊ استَبسَلَ فـلانٌ: فلانكـەس پركێشی شـەڕی كـردو خـۆی خـستە نـاوی‌و گیـانی خـۆی بـۆمردن دانـا ◊ الباسِـلُ: شـێر ◊ شـیری ترشـاو ◊ سـركەی تـام گۆڕاو ◊ قسەی توندو زبری ناخۆش. ◊ اَلبَسِيلُ: پاشمـاوەی شـەراب كەلـەبنكی پـەرداخ دا بمێنێتەوەو شەوی بەسەردا تێپەڕێ.

بَسَمَ بَسْماً: زەردەخەنەی كـرد. ◊ بَسمَلَ: (بـسم الله الرحمن الرحيم)ی كرد ◊ أبسَنَ: شێوەو روخساری جوان بـوو. بَسَن: بـەمانا جوان دێ ◊ البَشتُ: كوڵە باڵ پەستەك. بَشَرَ به بَشراً: كـەیف خـۆش بوو ◊ بَشَرَ الأديم وغيره بشراً: پێستەكەی كـەوڵ كـرد ◊ قەلاشتییەوە. ◊ بَـشَرَ الـشارِبَ: سمێڵـی كورتكردنەوە ◊ بَشَرَ الجَرادُ الأرضَ: كولـە چـی رووەك لـەزەوی دا هـەبوو خـواردی. ◊ بَـشَرَ بالشيءِ: هیوای موژدەی لـێ كـرد. ◊ بَشُرَ بَشارَةً: جـوان‌و شـۆخ بـوو ◊ أبـشَرَ الرَجـلُ: پیاوەكـە كـەیفخۆش بـوو ◊ أبـشَرَ الناقـة: حوشـترەكەی بەكەڵ دا ◊ أبْشَرَ فلاناً: فلانكەسی كەیف خۆش كرد. ◊ أبـشَرَ الأديـمَ: پێستەكەی جوان كـرد. ◊ أبْشَرَ الرجلُ: پیاوەكە ئەزمونەكەی تەواو بـوو ◊ باشَـرَ زَوْجَـهُ مباشـرةً وبِشاراً: پێـستی لەپێـستی ژنەكـەی كـەوت ◊ لەگـەڵی جـوت بـوو ◊ باشَـرَ النعيمُ فلانـاً: كاریگـەریی نـازو نیعمـەت لەسـەر فلانكـەس دەركـەوت. ◊ بَـشَّرَتِ الـريحُ بالغيـث: بایەكە لەگەڵ خۆی دا هەورێكی بارانـاوی هێنـا ◊ بَـــشَّرَ فلانـــاً: هـــەواڵێكی دڵخۆشـــكەرەی بەفلانكەس راگەیانـد ◊ إبْـتَشَرَ الـشيءَ: تـوێكڵی لەشتەكە كردەوە، كەوڵی كرد، پێستەكەی لـێ دارنـی. ◊ تَبَشَّرَ: كـەیف خـۆش بـوو هەلهەلـەی كێشا. ◊ إستَبْشَرَ: كـەیف خـۆش بـوو ◊ البُشَارُ: (البُـشارُ مِـنَ النـاس) ئـادەمیزادی هـیچ‌و پـوچ‌و خوێڕی. ◊ البِشَارَةُ: هەواڵی دڵخۆشكەر ◊ بَشَائِرُ الـصبحُ: بەرەبـەیان‌و سـەرەتای رۆژبوونـەوە. ◊ البِشْرُ: گەشانەوەی روخسار. ◊ البَشَرُ: ئادەمیزاد. ◊ البَشَرَةُ: روی دەرەكی پێست ◊ البُشرى: موژدە، موژدانـە. ◊ البَشُورُ مِن الرياح: ئـەو بایەیـە كە مـوژدەی بـارانی پێیـە. ◊ التباشـير: تەباشـیری هـــەموو شـــتێك ســـەرەتاو نۆبەرەكەیـــەتی ◊ التَبْشِيرُ: بانگەوزایی بۆ ئایین.

بَشَّ وجهُهُ: دەم‌و چاوی جوان‌و گەش‌و روناك بوو، روخۆش بوو ◊ بَـشَّ لـه بخير: بەشی دا، خێـری پـێكرد. ◊ اَلبَـشِيشُ: دەم‌و چـاو، روخـسار.

**بَشِعَ** الطعامُ والكلامُ: خواردنەکە ناخۆش بوو قسەکە زبرو رەق بوو. ٥ **بَشِعَ الرجُلُ**: بۆنی دەمی گۆڕا، ٥ **بَشِعَ خُلُقُهُ**: رەوشتی ناشیرین بوو، دڵو دەرونی پیس بوو. ٥ **بَشِعَ وجْهُهُ**: روخسارو دیمەنی ناشیرین بوون. ٥ **بَشِعَ بالأمر**: بەکارەکە تەنگەتاوو جاڕس بوو. ٥ **بَشِعَ بعدوه**: هەڵمەتی بۆ دوژمنەکەی برد.

**بَشَقَ** بَشقاً: چاوی تیبری ٥ **بَشَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵگرت. ٥ **بَشَقَ فلاناً** بالعصا: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**بَشَكَ** فلانٌ: فلان درۆی کرد ٥ **بَشَكَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕی، لێکی کردەوە، ٥ **بَشَكَ الثوبَ**: قوماشەکەی درو بە دروانێکی خراپ، ٥ **بَشَكَ العَقَالَ**: عەگاڵەکەی کردەوە، شلی کردەوە. ٥ **بَشَكَ الكلامَ**: قسەکانی تێکەڵ بە درۆ کردن، ٥ **بَشَكَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تێکەڵ بە شتی ترکرد. ٥ **إبْتَشَكَ فلانٌ**: فلانکەس درۆی کرد.

**بَشِمَ** من الطعام بَشَماً: زۆری لەو خواردنە خوارد تالێی وەڕز بوو ٥ **البَشَامَةُ**: درەختێکی بۆنخۆش‌و تام خۆشە، سیواکی پێ دەکرێ، ٥ **الْبَشَمَلَةُ**: درەختێکی بەرداره، لەپێری دار گوڵەکانە ٥.

**بَصْبَصَ** الكلبُ: سەگەکە کلکی لەقاند ٥ **بَصْبَصَ** الرجلُ للمرأة: پیاوەکە فشەی بۆ ئافرەتەکە کردو دڵداری لەگەڵ دا ئەنجام دا. ٥ **البُصَابِصُ**: ئەسپێکی شێیە، ٥ **البَصْبَاصُ**: حوشتری قەد باریکی کزو لاواز.

**بَصُرَ** به: پێی زانی، دیتی، تێی روانی ٥ **تباصَرَ القومُ**: جەماوەرەکە یەکتریان بینی ٥ **تَبَصَّرَ**: تێفکری‌و لێی وردبوۆوە، ٥ **الباصِرُ**: چاوی تیژو بینا ٥ **البَصَرُ**: چاو، هێزی دیتن لەکاتی تێکەڵبوونی تاریکی‌و رووناکیدا ٥ **البَصْرُ**: بەردی سپی نەرم ٥ قوری لینج‌و بەرداوی. ٥ **البُصْرَةُ**: زەوی باشی گڵە سوور ٥ **البصيُ**: ناوێکە لەناوەکانی خودا ٥ کوێرو نابینا. ٥ **البَصيرةُ**: هێزی هەست پێکردن ٥ **المُبْصِرُ**: چاودێری‌و سەرپەرشتیاری‌و پارێزەری شت.

**بَصَّ** بَصيصاً وبَصّاً: درەوشاوەیە. ٥ **تَبَصْبَصَ الرجلُ**: پیاوەکە مەرایی کردن.

**بَصَعَ** الماءُ بَصْعاً: کەم کەم ئاوەکە پرژا. ٥ **البَصِيعُ**: عەرەقی چۆڕاو، عەرەقی زەنگوڵ زەنگوڵ.

**بَصَقَ** بَصْقاً: ئەوەی لەناو دەمیدابوو تفی کردەوە. ٥ **البُصَاقَةُ**: (بصاقة القمر) بەردە سیخرو ٥ **بَصَلَهُ** من ثيابه: روتی کردەوە ٥ **تَبَصَّلَ فلاناً**: فلانکەسی لەپۆشاك رووت کردەوە ٥.

**بَصَمَ** بَصْماً: بە سەرە پەنجەی مۆری کرد. ٥ **البُصْمُ**: چاوە قامك.

**البَصْوَةُ**: پشکۆ ئاگر. ٥ **الْبَضَابِضُ**: من الناس والحيوان: خاوەن هێزو توانا. ٥ **البَضْبَاضَةُ**: ئەوکەسەی جەستەی تێرو پڕو رەنگی پێستی صاف‌و بێگەرد بێ ٥.

**بَضَّ** البَدَنُ: بضاضة وبضوضة: جەستەی تێروپڕ بوو تەڕو ناسك‌و گەش بوو ٥ **بَضَّ عينُه**: فرمێسکی باراند. ٥ **بَضَضَ**: تەڕو تازە، پێستی ناسك‌و تێرو پڕ بوو. ٥ **البُضَاضُ**: پاشماوەی کەم لە ناو کەلە پیاڵەو حاجەتدا دەمێنێتەوە.

**بَضَعَ** الدمع بضعاً: فرمێسکەکە لەچاو تزاو قەتیس مان، هەڵنەوەرین، نەڕژان. ٥ **بَضَعَ اللحْمَ**: گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد. ٥ **بَضَّعَ الجِلْدَ**: پێستەکەی هەڵدڕی‌و شەقی کرد. ٥ **أبْضَعَ الشيئ**: شتەکەی کرد بە کاڵای بازرگانی. ٥

باضَعَ الزوجةَ: سەر جێی ژنەکەی خۆی کرد، لەگەڵی جووت بوو. ◊ استَبْضَعَ الشَيْئَ: شتەکەی کردە کاڵای بازرگانی ◊ الباضِعَةُ: برینێک پێستەکەی برابێ خوێنی لێنەیە. ◊ البِضاعَةُ: ئەو کاڵاو سامانەیە کە بازرگانی تێدا بکرێ ◊ البُضْعُ: هاوسەر گیری ◊ گرێبەستی مارەبڕین ◊ مارەیی ◊ بیلامانەی ئافرەت. ◊ البِضْعَةُ من اللحم: پارچە گۆشت ◊ المِبْضَعُ: مقەست.

**بَطَؤَ** بُطئاً: بە سستی رۆیی، تەمبەڵ بوو ◊ بَطْبَطَ البَطُ: مراوییەکە دەستی کرد بە قیرەو قاژە ◊ لەناو ئاوەکەدا خۆی نقوم کردو مەلەی کرد.

**بَطَحَ** الشيئَ بَطْحاً: شتەکەی بڵاو کردەوە. ◊ إنْبَطَحَ: فراوان بوو ◊ (إنْبَطَحَ فلان) بەرەو دەم راکشا، لەسەر سکی پاڵکەوت ◊ اسْتَبْطَحَ المكانُ: شوێنەکە بەرفراوان بوو، تەخت بوو. ◊ الأبْطَحُ: شیوی پان و پۆر کە لافاوی پێدا بڕواو هەندی زیخ و لم و بەردە وردە بەجێ بێڵێ ◊ البُطاحُ: بزرکاندن و وڕێنەیەکە لەئاکامی لەرزو تاوە لە نەخۆش دیاری دەدا. ◊ البَطْحَةُ: مەسافەیەکە بە ئەندازەی قامەتی ئادەمیزادی راکشاو. ◊ أبْطَخَ: کاڵەکی لەلا زۆر بوون ◊ کاڵەکی خوارد. ◊ تَبَطَّخَ: کاڵەکی خوارد ◊ البِطِّيخ: کاڵەک ◊ المَبْطَخَةُ: شوێنێ زۆری کاڵەك لێ بڕوێ.

**بَطِرَ** الشَيئَ: شتەکەی دڕاند، شەقی کرد ◊ بَطِرَ فلان بَطَراً: فلانکەس چوست و چالاك بوو، زێدە رەویکرد لە کەیف و شادیدا ◊ بَطِرَ النعمةَ: نازو نیعمەتەکانی بەکەم و بێ نرخ زانی و کوفرانی نیعمەتی کرد ◊ بَطِرَ الحَقَّ: حەق و راستییەکانی پاش گوێ خستن و پەسەندی نەکردن ◊ أبْطَرَه: کەیف خۆشی کرد ◊ البطرير: چەقە چەناوی دەمدرێژی بێ حەیا ◊ البَيْطَر: پزیشکی ئاژەڵ. ◊

الْبَطارية: پیل، باتری ◊ تَبَطْرَقَ: بە لارو لەنجەو مراوی ئاسا رۆیشت. ◊ البُطارِق: پیاوی درێژ داوەڵ. ◊ البطريق: لوت بەرزو لەخۆ رازی و بەفیز ◊ باڵندەی قەڵەو گۆشتن ◊ البَطْرَكُ: پێشەوای نەصرانییەکان.

**بَطَشَ** بە بَطْشاً: بەشێوەی توندو تیژ پرکێشی کردێ. ◊ بَطَشَ بالشَيئ: بە توندو تۆڵی گرتی ◊ بَطَشَ عليه: هەڵمەتی بردە سەر.

**بَطَّ** الدمل ونحوه: کوانەکەی دڕی، دومەڵەکەی دەرکرد. ◊ بَطَّطَ: بازرگانی بە مراوی کرد، مراوی کردنە کاڵای کڕین و فرۆشتن ◊ بَطَّطَ العَجينَ: هەویرەکەی پان کردەوە، ◊ البَطَّةُ: جۆرێکە لە پەلەوەر دەشوبهێتە مراوی وەڵێ لەو باڵ و ملی درێژترە ◊ البَطيطُ: درۆزن، سەرسوڕمان ◊ المِبَطُّ: ئەو کێردو چەقۆیە کە دومەڵی پێ شەق دەکرێ.

**بَطَلَ** الشَيْئُ بُطْلاً وبُطولاً وبُطلاناً: شتەکە بەفیڕۆ چوو، فەوتاو وەرنەگیرایەوە، ◊ بَطَلَ العامِلُ: کرێکارەکە بێ کار مایەوە ◊ بَطِلَ حديثه بطالَةً: قسەکانی قەشمەری و گاڵتە بوون. ◊ بَطُلَ بَطولَةً: ئازابوو، پاڵەوانییەتی نواند ◊ أبْطَلَ الشَيئ: شتەکەی پووچ کردەوە، ◊ بَطَّلَ العامِلَ: کرێکارەکەی لەکار خست ◊ تَبَطَّلَ: خۆی ئازاکرد، خۆی بە ئازاو ورە بەرز نیشان دا ◊ البُطْمُ: قەزوان.

**بَطَنَ** الشَيئ بطوناً: شتەکە نهێنی بوو ◊ بَطَنَ بَطْناً: سك ئێشەی تووش بوو. ◊ بَطِنَ: کەیفخۆش بوو، تەڕ دەماخ بوو، ماڵ و سامانی زۆر بوو دەوڵەمەند بوو. ◊ بَطُنَ: ورگی گەورە بوو ◊ أبْطَنَ الثوبَ: گیرفانی بۆ کراسەکە کرد ◊ بَطَّنَهُ: لەورگی دا، ◊ تَبَطَّنَ الواديَ والكلأ: چووە ناو شیوەکە ناو

پاوانەکەو پێیدا گەڕا ٥ اسْتَبْطَنَ أمره: نهێنی نیشی خۆی زانی. ٥ الباطنُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا، ٥ الباطن من کل شيئ: ناوەڕۆکی ئەوشتە ٥ الباطنة من الرجل: نهێنییەکانی پیاو. ٥ الباطنية: گروپێکن لە شیعە پێیان وایە شەریعەت ڕوی ئاشکراو دیوی نهێنی هەیە، بەتەئویل‌و ڕاستەو پاستەکردن دەزاندرێ. ٥ البِطانُ: پشتێنێکە لەسەر گۆشتی سک دەبەسترێ ٥ البطانة: دیوی ناوەوەی پۆشاک، پێچەوانەی دیوەکەی دەرەوەی ٥ البَطْنُ من کل شيئ: دیوی ناوەوەی شت ٥ البَطْنُ: سک نێشە. ٥ البِطْنَةُ: زۆر خواردن‌و گەدە پڕبوون لە خۆراک. ٥ البُطَينُ: مەنزڵێکە لە مەنزڵەکانی مانگ ٥ المِبْطان: ورگ زل ٥ زۆر خۆر. ٥ المُبَطَّنُ: ئەوەی گەدەی پچووک بێ.

**بَظِرَ** بَظَراً: لە ناوەڕاستی لێوی سەروی لوپەکی لێ هاتبێ.

**بَظَّ** العازف العود بظاً: کەمانچە ژەنەکە دەستی دایە کەمانچەکەی بۆئەوەی بیژەنێ. ٥ أبَظَّ فلانٌ: فلان قەڵەو بوو، ٥ بَظْواً وبُظُواً: گۆشتی گرت گۆشتن بوو.

البَعْبَعُ: لاسایی کردنەوەی ئاوە کەلە زەرفەکەی دێتەدەرەوە. ٥ بَعَثَهُ بَعْثاً وبِعْثَةً: بەتەنیایی ناردی.

**بَعَثَ** فلاناً من نومه: فلانکەسی بەخەبەر هێنا، لەخەو ڕاستی کردەوە. ٥ بَعَثَ الله الخلق بعد موتهم: پەروەردگار دوای مردن ئادەمیزادەکانی زیندوو کردنەوەو بڵاوەی پێکردن بۆ بەهەشت‌و دۆزەخ. ٥ بَعَثَ عليهم البلاءَ: بەڵای بەسەردا دان. ٥ انْبَعَثَ: هەڵساو ڕاپسکوت ٥ انْبَعَثَ لحاجته: بۆی ڕاپسکوت. ٥ الباعث: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا. ٥ بُعَاثُ: شوێنێکە لە نزیک شاری مەدینە، لەسەردەمی جاهیلیدا. دوا شەڕی نێوان ئەوس‌و خەزرەج لەو شوێنە کرا ٥ البَعْثُ: بوژانەوە، زیندو بوونەوە، ڕۆژی قیامەت‌و ژیانەوە. ٥ البَعْثُ: نێردراو، شاندو ڕەوانەکراو چ تاک بێ چ کۆ. ٥ بَعْثَرَ الشَّيْئَ: شتەکەی پەرت‌و بڵاوە پێکرد.

**بَعِجَ** البَطْنُ بعجاً: سکی هەڵدڕی‌و ڕیخۆڵەکانی دەرکەوت. ٥ بَعِجَ الأرض: زەوی هەڵدڕی ٥ إنْبَعَجَ: بەرفراوان بوو، ئەملاو ئەولای ئاوەڵا بوون ٥ شەق‌و پەق بوو. ٥ إنْبَعَجَ السحابُ: هەور بارانێکی زۆری باراند ٥ أبعَدَ الشَّيْئَ: شتەکەی دوور خستەوە. ٥ باعد بين الشيئين: دوو شتەکەی لێک دور خستنەوە ٥ استَبْعَدَ: دوور کەوتەوە، ٥ البُعْدُ: نێوان دووری شتێک لە شتێکی دیکە ٥ البعيد: دوور ٥ بَعَرَت الشاة والناقة بَعْراً: کشپلی کرد.

**بَعَرَ** الشَّيْئَ: کشپلی بێدادا، بۆی هاویشت. ٥ البعير: هەر حوشترێك بەکەڵکی سواری بێ، بەکەڵکی ناوسبوون بێ، ٥ بَعْزَقَهُ بعزقةً: لەشوێنی نەگونجاو لێکی بڵاوکردەوە، وردو هاڕی کرد. ٥ تَبَعْزَق: پەرت‌و بڵاوبۆوە.

**بَعَصَ** الشَّيْئ بعصاً: شتەکە تێکچوو، ٥ البُعْصُوصُ: لە ئادەمیزاددا ئێسقانێکی پچوکە لەنێوان دو[و] سمتیدا. ٥ بَعَضَهُ البَعُوضُ بعضاً: مێشوولە گەستی. ٥ بَعَضَ الشَّيْئَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد. ٥ بَعِضَ المكانُ بَعَضاً: شوێنەکە مێشوولەی زۆر بوو. ٥ بَعَّضَ الشَّيْئَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد. ٥ تَبَعَّضَ الشَّيْئُ: شتەکە کەرت کەرت بوو. ٥ البعوضُ: مێشولەو مێش‌و مەگەزی تری زیانبەخش.

بعظ الحيوان: گیانلەبەرەکەی سەر بڕی.

بعق الشيء بعقاً: زۆری ئاو پێداکرد ٥ بَعَقَ عن الشّيْءِ: پەردەی لەسەر هەڵماڵی ٥ بَعَقَ البئرَ: بیرەکەی هەڵکەند ٥ تَبَعَّقَ المطرُ: بە خوڕەم بارانەکە باری، ٥ الباعِقُ: بارانی ناوەختو چاوەڕوان نەکراو کەبە ڕێژنەو دڵۆپەی گەورە ببارێ ٥ البمكوكاء: پەکتر هێنانو بردنو شەڕو هەرا.

بَعَلَ بعلاً وبعولةً: هاوسەرگیری کرد، ژنی هێنا ٥ بَعَلَ عليه: فەرمانی پێکرد، لێی توڕەبوو ٥ باعَلَ مباعلة وبعالاً: ژنی هێنا، هاوسەری پەیداکرد ٥ تباعــل الزوجــان: ژنو مێردەکــە یــاریو دەستبازیان کرد. ٥ استَبْعَلَ: ژنی هێنا. ٥ البَعْلُ: مێرد ٥ ژن ٥ تەپۆلكەو بەرزایی زەوی کە ئاوی جۆگا نەیگرێتــەوە، ٥ بَعْــل: نــاوی بتێکــە عەرەبــەکان لەپێش هاتنی ئیسلامدا پەرستشیان بۆکردوە ٥ البَعْلَةُ: ژن ٥ خێزان. ٥ البَعِيمُ: پەیکەری لەدار تاشراو، پیاوێك زمانی تێکەڵو پێکەڵ بێو لە دەمــەدەمێو چــەلەحانێ دا تێبــشکێ، نــەتوانێ بەجوانی وەڵام بداتەوە.

بَغْــبَغَ النــائم: نوسـتووەکە پرخــە پرخــی هــات، هەناســەی لــە لوتیــەوە دا. ٥ بَغْــبَغَ في الســير: لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ بَغَتَهُ بَغْتاً وبَغْتَةً: لــەنکاو ڕوبــەڕوی بــووەو تــەریقی کــردەوە. ٥ البُغَــاثُ: باڵندەیەکــە ڕەنگــی بەڵەکــە قــەبارەی بچوکە لەپێری بــازو هەڵۆیــە بــەڵام لە فڕینــدا تەمبەڵە. ٥ تَبَغْدَدَ: خۆی گرد بە بەغدایی.

بَغَرَ الريحُ بغوراً: ڕەشەبا هــەڵیکردو بــاران بــاری. ٥ بَغَرَ الماءُ الأرضَ بَغْراً: ئاوەکە کەمێك زەوییەکەی پاراو کرد ٥ البَغَرُ: دەردێکە تینوایەتی زیاد دەکا ٥ البَغْرَةُ: کشتو کاڵ کەدوا باران بارین بکرێ.

بَغَزَ فلان الدابة: فلانکەس ئاوزەنگی لەوڵاخەکە دا.

بَغش الصبي إلى أمه: منداڵەکە گریا بــۆلای دایکیو هانای بۆ برد. ٥ البُغَاشَة: حەڵوایەکــە لــە ئــاردو ڕۆنو پەنیر یان قەشدە دروست دەکرێ.

بَغَــضَ الــشَّيْءَ بُغْــضاً: شــتەکەی بوغزانــدو ڕقــی لێبــوەوە ٥ أبْغَــضَهُ: ڕقــی لێ هەڵــسا، ناخۆشــی ویــست. ٥ تباغَضَ القــومُ: خەڵکەکــە هەنــدێکیان هەنــدێکیانی نــاخۆش ویــست. ٥ البَغْــضاءُ: ئەوپەڕی ڕقو قینو قاڕ.

البَغّــالُ: ئــەو کەســەی سەرپەرشــتی وڵاغ بکــا. ٥ البَغْلُ: هێستر؛ دایکی ماینەو باوکی گوێدرێژە، ٥ بَغَمَــت الظبيــة بُغامــاً وبُغومــاً: ئاسکەکە بــە دەنگێکی نەرم بۆ بێچووەکەی پاڕاندی.

بَغَمَ الحديث لفلان: قسەکەی بــۆ فــلان کــەس ڕوون نــەکردەوە ٥ البُغَــامُ: دەنگــی ئاســك ٥ پاڕانــدنی ئاسك.

البَغْــوُ: میــوە پــێش گەیــشتنی ٥ گوڵی درەختــی چقڵاوی.

بغى فلان بغياً: فلانکەس لە سنوور دەرچوو ٥ بغى الشّيْءَ بُغْيةً: داوای ئەوشتەی کرد، ٥ ابْتَغى الشّيْءَ: داوای شتەکەی کردو هــەوڵی دەســتەبەر کردنــی دا ٥ إنْــبَغَى: وا پێویــست بــوو، وا بــاش بــوو ٥ تَبَغّــى الــشَّيْءَ: زێــدەڕەوی کــرد لــە داواکردنــی شتەکە دا. ٥ الباغــة: مادەیــەکی صــەناعییە لــە وردەی ســـلیلۆزی کـــافور دروســـت دەکـــرێ، ٥ الباغي: ستەمکاری بەفیزو لوتبەرز، ٥ البَغْــيُ: ســتەم ٥ دەرچــوون لەیاســا ٥ البَغِــيُّ: ئــافرەتی داوێــن پــیس کــە لەشفرۆشــی بکــا. ٥ البُغْــيَةُ والبَغِيَّةُ: داخوازیو ئاوات.

بَقْبَــقَ الرجــلُ: پیاوەکــە زۆری قــسە کــرد.

**بَقَرَ** البطنَ ونحوه: ورگی هەڵدڕی. ◊ **بَقَرَت الفتنةُ القومَ**: فیتنەو ئاشووب ئەو هۆزەی پەرتو بڵاو کرد ◊ **بَقَرَ الأرضَ**: زەوییەکەی پشکنیو شوێنی ئاوەکەی دۆزییەوە. ◊ **بَقَرَ المسألةَ**: لە مەسەلەکەی کۆڵییەوە ◊ **بَقِرَ البطنُ**: سکی هەڵدڕا ◊ **تَبَقَّرَ في الکلام**: زۆری قسە کردنو زۆری درێژە پێدا. ◊ **تَبَقَّرَ في العلم والمال**: زانیاریو ماڵو سامانی خۆی پەرەپێدا، زۆری کرد. ◊ **البَقَرُ**: رەشە وڵاخ بەهەموو جۆرەکانییەوە بە ماڵیو کێوییەوە. ◊ **البَقّار**: بەخێوکاری رەشە وڵاخ. **البَقْسُ**: درەختێکە دەشوبهێتە درەختی ئاس.

**بَقَطَ** متاعَهُ بَقْطاً: کەلو پەلەکانی کۆکردنەوەو بەستنی. ◊ **بَقَطَ الرَّجُلَ**: باغێکی دا بە پیاوەکە بۆئەوەی بە سێیەك یان بە چوار یەك بەخێوی بکا. ◊ **اَلْبَقَطُ**: کەلو پەلی ناوماڵ ◊ کۆمەڵێك لە خەڵك. ◊ **البَقَطُ**: ئەو میوەیە لەکاتی رنینو چنینی درەختەکەدا هەڵدەوەریو دەکەوێتە سەر زەوی.

**بَقَعَهُ**: جەستەی پەڵە پەڵە کرد ◊ **تَبَقَّعَ**: پەڵە پەڵاوی بوو. ◊ **اَلْبَقَعُ**: بەڵەك ◊ بەردە سیخڕۆ. ◊ **الباقِعةُ**: بەڵای گەورە، زۆرزانو وریا ◊ **البقیع**: وڵاتێکی مەزراو بەر فراوانو درەختی جۆراو جۆری تێدا بێ.

**بَقَّ** المرأةُ: ئافرەتەکە منداڵی زۆر بوون ◊ **بَقَّ** المکانُ: شوێنەکە مێشوولەی زۆربوو. ◊ **بَقَّ** الجرابَ: کوندەکەی دڕی، چی تێدابوو دەری هێنا. ◊ **بَقَّ** الکلامَ: بە دەنگی بەرز قسەی کرد ◊ **بَقَّ** المالَ: ماڵو سامانەکەی بڵاوە پێکردو لەدەستی دا. ◊ **البَقاقُ**: کاڵای خراپی ناو ماڵ. ◊ **اَلْبَقُّ**: پانو پۆڕو بەرفراوان ◊ ئاشکراو عەیان ◊ مێشولەو هەر باڵندەیەکی لەو جۆرەبێ. ◊ **المِبَقُّ** من الرجال: پیاوی زۆر بڵێو چەقە چەناو. ◊ **المِبَقّةُ**: ژنی زۆر بڵێو چەقە چەناو.

**بَقَلَ** الماشیةَ: گژوگیای بۆ ئاژەڵەکان کۆکردەوە. ◊ **الباقلاء**: پاقلە ◊ **البَقّالُ**: بەقاڵ، سەوزەو میوە فرۆش. ◊ **اَلْبَقَمُ**: گیایەکی دەرمانییە پزیشك سوودی لێوەردەگرن.

**بقی** الشیءُ بقاءً: بەردەوام بوو جێگیربوو ◊ **أبْقی علی الشیءِ**: پارێزگاری شتەکەی کرد ◊ **الأبقی** بەردەوامو بەردەوام تر ◊ **الباقی**: بەردەوامو نەگۆڕاو ◊ **الباقیة**: ماوەو پەزمەندە ◊ **البَقِیّة**: پاشماوەی شت.

**بَكُؤَ** الرجُلُ بكاءةً وبُكْئاً: پیاوەکە قسەی کەم بوو، قسەی کەمی کرد.

**بَكبَكَ** الشیءُ: شتەکە هەژاندی.

**بَكَرَ** بكوراً: بەیانی زوو لەماڵ دەرچوو ◊ **بكرت الشجرةُ**: درەختەکە زوو بەری پێگەیاند. ◊ **إبْتَكَرَ**: زۆری لەخۆی کرد بەیانی زوو دەرچوو. ◊ **إبْتَكَرَت المرأةُ**: ئافرەتەکە یەکەم منداڵی کوڕ بوو. ◊ **الابكار**: سەرەتای بەیانی تاکاتی رۆژهەڵاتن. ◊ **الباكور، الباكورة**: نۆ نوخشەی میوە ◊ **البكارة**: پەردەی کچێنی ئافرەت پێش ئەوەی شوبکا. ◊ **اَلْبَكْرُ**: حوشتری تازە پێگەیشتوو جوانوە حوشتر، ◊ **اَلْبِكْرُ**: نۆبەرەی هەموو شتێك ◊ **البُكرةُ**: سەرەتای رۆژ.

**بَكَسَ** خصمَهُ: دوژمنەکەی خۆی بۆڕدا.

**بَكَشَ** العقدةَ: گرێکەی کردەوە.

**بَكَّ** الشیءَ بكّاً وبَكّةً: کوتاییو ونجڕ ونجڕی کرد، ◊ **اَلْبَاكُّ**: ئەحمەقو زۆر بڵێو چەقە چەناو.

**بَكَلَ** الشیءَ بَكْلاً: شتەکەی تێکەڵو پێکەڵ کرد، ◊ **تَبَكَّلَ في الكلام**: قسەکانی تێکەڵو پێکەڵ کردن

٥ أَلْبَكْـلُ: دەسکەوتی شەڕ. ٥ اَلْبِكْلَةُ: شێوەو روخسارو سەرو شکڵ.

**بَكِمَ** الرجل بَكَماً: پیاوەکە نەیتوانی قسە بکا، ٥ بَكُمَ بُكامةً: لە قسەکانی بڕییەوە.

**بَكَـىَ** بَكـىَ وبُكـاءً: دوو چاوی بەهۆی خەمەوە فرمێسکیان باراند ٥ تَبـاكى: خـۆی گریاند. ٥ بَلْبَلَ المتاعَ بلبلةً وبلبـالاً: کاڵاکەی پەرتو بڵاو کردەوەو تەفرو توناى کرد. ٥ بَلْبَلَ فلانـاً: فلان کەسـی خـستە نـاو خەفـەتو دڵـە راوکـێو پەژارەوە ٥ اَلْبَلْبَـالُ والْبَلْبَالَـةُ: ئەوپەڕی غەمو نارەحـەتیو دڵـە راوکـێ ٥ اَلْبُلْبُــلُ: بولبـول باڵندەیەکی پچوكو دەنگ خۆشە.

**بَلِتَ** الرجـلُ: پیاوەکە لە قسەکردن کەوت ٥ اَبْلَـتَ الرجـلُ: پیاوەکـە بەبەڵگـە دەم کـوتی کـردو نەیهێشت قسە بکا ٥ تَبَلْتَـعَ: خـۆی بـە لێزانو نەجیبو وەجاخزادەو قسە ماقوڵ زانی.

**بَلَـجَ** الـصبح بلوجـاً: بەیانیـدا، گزنگـی بـەیانی دەرکەوت ٥ بَلِجَ وَجْهُهُ بَلَجاً: لـە خۆشـیاندا دەمو چاوی گەشایەوە.

بَلِجَ صدرُهُ: سنگی فـراوان بـوو ٥ اَبْلَـجَ الحقُ: حـەق ئاشکرا بوو ٥ اَبْلَجتِ الـشمسُ: خـۆر دەرکـەوت ٥ اَلْبُلْجَةُ: روناکی خۆر لەکاتی گزنگی بەیاندا ٥

**بَلَحَ** بَلْحـاً وبلوحـاً: مانـدوو بـوو عـاجزبوو ٥ بَلَـحَ البئـرُ: ئاوەکـەی نـەما ٥ بَلِّـحَ: مانـدوو بـوو لەکارەکـە دابـڕا ٥ اَلْـبَلَحُ: بـەروبوومی خورمـا هەتا سـەوز بێو پێنەگەیشتبێ ٥ بَلِـخَ بَلَخـاً: فیزی نواند، خۆی بەزلزانی ٥ تَبَلَّخَ: تەکەببوری کرد ٥ تَبَلَّخَ: قەبە بوو، گۆشتی زۆر بوو.

**بَلَدَ** بالمكان بَلـوداً: ئـەو شـوێنەی کـردە نیشتمانو وڵاتی خۆی ٥ بَلِدَ بَلَداً: تێگەیـشتنی کـەم بـوو ٥ اَبْلَدَ: پاڵی لێدایەوە کارێکی بۆخۆی ئەنجام نەدا ٥ اَبْلَدَ فلاناً البَلَدَ: ئەو وڵاتـەی خـستە ئەسـتۆی فلان کەس ٥ بَلَّدَ: لەکارەکەیدا کەمتەرخەم بوو وازی لێ هێنا ٥ البَلَدُ والبَلْدَة: شوێنێکی سنوردار (شـارەوانی دیاربـێ) ٥ اَلْبَلَـدِیّ:: شارەسـتانی ٥ البلدیة: شارەوانی ٥ البلید: کەسێکە لە زیرەکی بێ بەش بێو کارو باری خۆی پـێ هەڵنەسـوڕێ ٥ بَلَدَحَ: ماندو کول بوو نەیزانی رێبازی راسـتی خۆی بگرێتـە بـەر ٥ اَلْبَلْـدَحُ: نـافرەتی قەڵەو زەبـەللاح ٥ بَلْـدَمَ: لەترسـان خوسـتی لـەخۆی بڕی ٥ بَلْوَرَهُ: کردی بـە بلورات ٥ مەسـەلەکە یـان فکرەو بۆچوونەکەی پاڵفتە کرد.

**اَلْبَلاّسُ**: پەلاس؛ جۆرە پۆشاکێکی زبری ئەسـتوورە ٥ اَلْبَلَسُ: جۆرە هەنجیرێکە ٥ اَلْـبُلُسُ: نیـسك ٥ اَلْبَلَـسَانُ: درەختێکـە گوڵێکی سـپی پـچوکی لـە شێوەی هێـشوو هەیـە ٥ بَلْـسَمَ: سـەری داخـست، دەمو چاوی گرژو مۆن بوو ٥ اَلْبُلْسُنُ: نیـسك ٥ اَلْبَلْشَفیة: رێبـازێکی شـیوعییە پێـی وایـە محاڵە کۆمـەڵگا یەکـسەر لـە یاسـای سـەرمایەدارییەوە بازبـدا بـۆ یاسـای شـیوعی، بـەڵکو پێویـستە قۆناغێکی گواستنەوە هەبێ.

**بَلَطَ** الدارَ بَلْطا: خانووەکەی رەصیف کـرد ٥ اَبْلَـطَ الرجـلُ: پیاوەکـە پـاڵی لێ دایـەوەو تەمبـەڵو تـەوەزەل بـوو ٥ اَبْلَـطَ الْمَطَـرُ الأرضَ: بارانەکـە زەوییەکەی شتەوە تەپو تـۆزی پێوە نەهێشت ٥ اَبْلَطَ اللُصُّ فلاناً: دزەکە هیچی بۆ فلان کـەس نەهێشتەوە هـەمووی بـرد ٥ بَـالَطَ فلانـاً: وازی لەفلانکەس هێناو هـەڵات ٥ بَلَّـطَ: لـە رۆیـشتندا ماندوو بوو ٥ تَبَالطوا بالـسیوف: بـەپێوە شـەڕە شمـشێریان کـردو بـەرەنگاری یـەکتر بونـەوە ٥ الـبَلاَطُ: جـۆرە بەردێکـە زەوی پـێ دادەپۆشـرێ دیـواری پـێ رێـك دەخـرێ دیکـۆری پـێ دەکـرێ ٥ الـبَلاَطُ: باڵـە خانـەی پاشـاو دارو دەسـتەکەی ٥

البَلَط: برمەند، ئاسنێکە ٥ اَلْبَلْطَة: جۆرە تەورێکە داروشتی لەوجۆرەی پێ دەبڕدرێ ٥ البلوط: دار بەڕو دار وێڵ ٥ بَلْطَحَ: لەسەر پشت لەسەر زەوی راکشا.

**بَلَعَ** الماء والريق – بَلعاً: ئاوەکەی خواردەوە، تفی قوت دا ٥ اَبْلَعَهُ الشيْئَ: وایکرد پیاوەکە شتەکە قوت بدات ٥ بَلَّعَ الشيبُ في رأسه: پیری لەسەرو ریشیدا دەرکەوت ٥ البالوعه: بەلوعەی ئاو ٥ اَلْبَلَعُ من الناس: زۆر خۆر ٥ البُلْعَةُ: قومە ئاو ٥ وەجبە دەرمان ٥ البَلوُعُ: حەبو دەرمانێك قوت بدرێ.

**بَلَغَ** الشجرُ: وەختی رنین‌و چنینی بەروبوومی درەختەکە هات ٥ (بَلَغَ الغلام) کوڕەکە بالغ بوو، پێگەیی ٥ بَلَغَ الأمر: کارەکە بە کۆتا گەیی ٥ بَلُغَ بلاغةً: زمانی رەوان بوو ٥ تَبالَغَ في كلامه: بەزۆر ویستی زمان رەوان بێ‌و وتەکانی بەلیغ بن ٥ البلاغ: پێ راگەیاندن ٥ البلاغة: ئەومیە مەبەستەکە جوان رابنوێنێ‌و قسەکانیش کاریگەربن ٥ البلوغ: بالقی ٥ پێگەیشتنی کۆئەندامی زاوزێ لە پیاوو ئافرەتدا ٥ البَلْغَمُ: بەلغەم بَلَقَ الباب: دەرگاکەی هەمموو کردەوە ٥ بَلَقَ الفرسُ ونحوه بَلَقاً وَبُلْقة: ئەسپەکە بەڵەك بوو توکی جەستەی پەڵەی رەش‌و سپی تێدان ٥ بَلِقَ الرجلُ: سەرسام بوو نەیزانی چی بکا ٥ إنبَلَقَ البابُ: دەرگاکە کرایەوە ٥ إبْلَوْلَقَ لَوْنُهُ: رەنگی بەڵەك بوو.

اَلْبَلَق: رەش‌و سپی لە رەنگدا ٥ بَلْقَعَ البَلَدُ: وڵات چۆڵ بوو هیچی تێدا نەما لە دیاردەی ئاوەدانی.

**بَلَّ** من مرضه: لەنەخۆشییەکەی چاك بۆوە ٥ بَلَّ الريحُ: بایەکە شەونمی لەگەڵ خۆی هێنا ٥ ابْتَلَّ: تەڕ بوو، فلان کەس لە نەخۆشییەکەی رەها بوو ٥ البالَّةُ: شەونم‌و خێرو فەڕ ٥ البُلاَلَةُ: شەونم ٥ اَلْبُلَّةُ: خێرو فەڕ ٥ تەندروستی خۆشگوزەرانی ٥ اَبْلَمَ الرجلُ: پیاوەکە بێ دەنگ بوو ٥ البِلامُ: لغاو ٥ اَلْبَلاّتة: (ئاتری گەرماو).

**بَلِهَ** بلهاً وبلاهةً: عەقڵی زەعیف‌و کەمە ٥ تَبالَهَ: خۆی بەبێ عەقڵ‌و گێل نیشاندا ٥ البلهارسيا: نەخۆشییەکە تووشی ئادەمیزادو ئاژەڵ دەبێ.

**بَلِيَ** الثوبُ وبلاءً: کراسەکەی (پۆشاکەکەی) رزی ٥ اَبْلى فلاناً: فلانکەسی بەتاقی کردەوە ٥ بَلّى الثوبَ: کراسەکەی کۆن کرد ٥ إبْتَلاهُ: بەتاقی کردەوەو ناسی ٥ البَلِيُّ: کەسێکە بەڵای گەورەی بەسەردا هاتبێ.

**اَلْبَمُّ**: ژێی ئەستوری عودو کەمان ٥ اُلْبَنَدُ: ئاڵای گەورە ٥ لەزاراوەی پاساناسان دا خاڵێکی تەواوو سەر بەخۆیە لەقانون ٥ اَلْبَنْدَرُ: شوێنی راوەستانی گەمیێ لەمینادا.

**بَنْدَقَ** الشَّيْئَ: ئەوشتەی کردە بوندوقیە ٥ البُنْدقي: زێری وڵاتی بوندەقە. البنسلين: دەرمانێکە ئاهێڵێ جەراثیم گەشەبکەن ٥ اَلْبِنْصَرُ: قامکی نێوان قامکی ناوەراست‌و قامکە بچکۆلە.

**بَنَقَ** عَمَلَهُ بَنْقاً: ئیش‌و کاری خۆی بەشێوەی رێك‌و پێك‌و پلان بەرێوەبرد ٥ تَبَنَّكَ بالمكان: لەوشوێنە نیشتەجێ بوو ٥ البَنْك: بانق ٥ بنكنوت: بریتییە لەوپارچە کاغەزانەی خەڵك مامەڵەیان پێدەکەن لەشوێنی زێرو زیو ٥ بَنَّنَ الماشية: ئاژەڵەکەی بەستەوە دایبەست بۆئەوەی قەڵەوبێ ٥ البنان: چاوە قامك ٥ البِنُّ: چینی بەزو پیو ٥ البُنُّ: دەنکی درەختێکە

کەلەحەبەشەو چەند شوێنێکی تر دەڕوێ ٥ بنی السفینة: کەشتی یەکەی دروست کرد ٥ بنی بزوجته: ژنەکەی گواستەوە لەگەڵیا چووە پەردەی زاواو بوکێنییەوە ٥ أبْنـی بزوجته: ژنەکەی گواستەوە ٥ اِبْتَنی الرجلُ: ئەوپیاوە کوڕی بوون ٥ إنـْبَنَی: خانوەکە دروست بوو ٥ تَبَنّيُ الجسمُ: جەستەی تێکسمڕاو گۆشتن بوو ٥ الإبن: منداڵی نێرینە ٥ إبن الحرب: پیاوی ئازا ٥ (ابن اللیل وابن الطریق): دزو جەردە ٥ (ابن السبیل): ڕێبوارو کاروانچی ٥ (ابن آوی) چەقەڵ ٥ البِنـاءُ: خانوو باڵەخانە ٥ البِنَایَةُ: وەستایی دیوار دانان ٥ خودی باڵەخانەو دیوارەکە ٥ البنتُ: کچ، منداڵی مێینە ٥ اَلْبَنَّاءُ: کەسێکە پیشەکەی وەستایی دیوارکردن بێ ٥ البُنْیان: دیوار، بناغەی دیوار ٥ البُنْیَة: دیوار، بناغەی دیوار، پێکهاتەی دیوار، ئەو پەیکەرەی خراوەتە سەریەك.

**بَهَا** بە بَهْـا وبُهـوءا: وەگری بوو پێوەی ڕاهات ٥ البهائیة: تاقمێکن درێژە پێدەری ڕێبازی (البابیە)ن لەسەردەستی میرزا حسێن کەنازناوی (بهاء الله)یە، دروست بوون ٥ بَهَتَهُ الشَّيْئُ بَهْتاً: شتەکە سەرسامی کرد ٥ بَهتَ فلاناً: بوختانی بۆ فلانکەس هەڵبەست ٥ بَهتَ الرجلُ بَهتاً: پیاوەکە بە بەڵگە بۆردراو ڕەنگی گۆڕا ٥ بُهِتَ الرجلُ: بۆر دراو بەبەڵگە سەری سوڕماو هیچی بۆنەگوترا ٥ البُهتُ والبُهتانُ: درۆی هەڵبەستراو ٥ اَلْبُهْتَةُ: ڕوخۆشیو جوان بەپیرەوە چون ٥ گای کێوی.

**بَهِجَ** الشَّيْئُ بهجا وبهجة: جوانو قەشەنگ بوو، کەیفخۆشو تەڕدەماخ بوو ٥ بَهَّجَ الشَّيْئَ: شتەکەی جوان کرد ٥ تَبَاهَجَ بفلان: بەروخۆشیو پێکەنینەوە پێشوازیی لەفلان کرد ٥ بَهْدَلَ فِي مشیته: بەگورجی ڕۆیی، گۆشتی سەر سنگی وەلەرزەکەوت ٥ البَهْدَلُ: بێچوی کەمتیار ٥ البَهْدَلَةُ: بناغەی مەمك.

**بَهَرَ** القمر النجومَ: مانگ بەڕوناکی خۆی ئەستێرەکانی داپۆشین ٥ بَهَرت فلانَةُ النساءَ: فلان ئافرەت لەجوانی دا باڵا دەست بوو بەسەر هەموو ئافرەتەکان دا. ٥ بُهِرَ: هەناسە بڕکێی پێکەوت بەهۆی ماندو بوونەوە ٥ أبْهَرَ: کەوتە نیوەڕۆ ٥ ژنێکی جوانو نەجیب زادەی مارەکرد ٥ اِبْتَهَرَ: هەناسە بڕکێی پێکەوت ٥ الأبْهَرُ: جۆرێکە لەپەڕی باڵندە ٥ الأبهران: دوشا ڕەگە دەماری سەرەکی خوێن کەخوێن دەبەن بۆ (أذین)ی لای ڕاستی دڵ ٥ البَهَارُ: هەرشتێك کەجوانو دەرەوشاوەبێ ٥ البُهَارُ: کوڵو بار ٥ زەرفێکە وەکوو مەسینە ٥ چۆلەکە بەهەشتی ٥ البَهْرُ: فەوتان ٥ سەرسوڕمان ٥ البُهْرُ: هەناسە بڕکێ لەبەر ماندوبون ٥ البَهْرَةُ: ئاشکرا ٥ البُهرَةُ: ناوەڕاستی شت ٥ البَهیَّةُ: ئافرەتی ڕەسەنو خانەدان ٥ بَهْرَجَ فلاناً: تاوانی خراپەکاری لەسەر فلانکەس لابرد ٥ تَبَهْرَجَ: بوو بە موباح بۆ هەموو کەس ٥ البَهْرَجُ: شوێنی گشتی یان شتی بەرەڵا بۆ هەموو کەس ٥ تَبَهْرَمَ: ڕەنگی گوڵە عوصفوری گرت ٥ بَهَزَهُ بَهْزاً: مستە کوڵەی لەسنگی دا.

**بَهَسَ** بَهْساً: ئازابوو، وەرەی بەرزبووە.٥ تَبَیْهَسَ: لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد ٥ البَیْهَسُ: شێر ٥ پیاوی ئازا.

**بَهَشَ** بَهْشاً: خۆی ئامادەکر بۆپێکەنین ٥ اِبْتَهَشَ: کەیف خۆش بوو ٥ تباهَشَ الرجلان: هەریەکە

لەو دوپیاوە کاکۆڵی یەکتریان گرت ٥ اَلبَهْش: روخساری گەشاوە.

بَهِصَ بَهصاً: تینوی بوو ٥ بَهْصَلَ الرجلَ: پیاوەکەی روت کرد ٥ بَهَضَهُ الحِمْلُ بَهْضاً: بارەکەی قورس بوو.

بَهَظَ: قورس و گران و ناخۆش بوو ٥ بَهَظَهُ بَهْظاً: بارەکەی گران بوو برستی لێ بری ٥ اَبْهَظَهُ الحِملُ: بارەکە قورس بوو برستی لێ بری.

بَهِقَ بَهَقاً: نەخۆشی بەڵەکی توشی پێستی بوو ٥ اَلْبُهَاقُ: نەخۆشییەکە رەنگی سروشتی پێست لادەباو پەڵەپەڵەی سپی تێدا دەردەکەون ٥ تَبَهْكَنَتِ المرأةُ فی مِشيتها: ئافرەتەکە بەنەسپایی و لەسەرەخۆ رۆیی ٥ اَلْبَهْكَنُ: لاوی تازەپێگەیشتوی جەستە نەرم و نیان ٥ بَهَلَهُ بَهْلاً: ئیهمالی کرد، وازی لێ هێنا ٥ بَهَلَهُ: نەفرینی لێ کرد. بَهَلَ الأرضَ: دوای ئەوەی زەوییەکەی تۆو کرد ئاوی تێکرت ٥ اِبْتَهَلَ الی الله: لەخودا پارایەوە، زۆری دوعا کردن ونوزایەوە ٥ اَلْبَهْلُ: شتی بەرەڵاکراو بێ شوان و سەرپەرشتیار ٥ البَهْلُولُ: پیاوماقوڵی رێزدار ٥ البهلوان: پاڵەوان و یاریزان لەجۆرە یارییەك دا وەکوو رۆیشتن بەسەر حەبلی رایەلکراودا ٥ اَبْهَمَ الأمر: کارەکە لێڵ و نادیار بوو ٥ تَبَهَّمَ علیه الأمر: ئیشەکەی لێ شێوا ٥ اِسْتَبْهَمَ الأمرُ: کارەکەی لێ شێوا ٥ الإبهامُ: قامکە گەورەی دەست و قاچ ٥ الأبْهَمُ: ئادەمیزادی بێدەنگ و کەم دوێ ٥ البَهْمَةُ: بەرخۆلە چ نێر چ مێ ٥ البُهْمَةُ: بەردی رەقی لوس و پتەو ٥ البَهِيمَةُ: هەموو گیانلەبەرێکی چوار پێ لەوشکانی و دەریادا جگە لەدرندە ٥ البَهْنَانَةُ: ئافرەتی قالب سووکی قسە خۆش و لەسەرەخۆ ٥ بَهْنَسَ فی مشيه: لارو لەنجەی کرد، خۆی بادا. بَهِيَ البَيْتُ: ماڵەکە خاڵی بوو. بَهُوَ بَهاءةً وبَهاءً: شوێنەکە بەرفراوان بوو ٥ اَبْهَى: جوان و قۆز بوو ٥ تباهى القومُ: خەڵکەکە شانازییان کردن. بَهْوَ البيت: پێش ماڵ ٥ بەردەرگا ٥ البها والبهاءُ: جوانی و شۆخی و شەنگی.

باءَ بالشیءِ والیه: شتەکەی گێرایەوە، گەڕانەوە، بۆ لای گەڕایەوە ٥ أباءَ فلاناً منزلاً: شوێن و جێگای بۆ فلان ئامادە کردو دایمەزراند ٥ أباءَ فلاناً بفلانٍ: لە تۆڵەی فلانەکەس دا فلان کوژرایەوە.

بَوَّأَ الرجلَ: پیاوەکە هاوسەری بۆ خۆی پەیدا کرد ٥ اَلْبَاءُ: مارەبڕین، گرێبەستی مارەبرین ٥ جوتبوون ٥ الباءَةُ: گرێبەستی مارە برین ٥ جوتبون ٥ البيئةُ: شوێن و دەوروبەر، حاڵ و وەزع ٥ المُبَاءَةُ: مەنزڵ و شوێنی حەوانەوە.

بَابَ لە بَوْباً: بوو بەدەرگەوانی ٥ البَابُ: دەرگا، ئەو شوێنەی لێوەی دەچیە ناوماڵ ٥ البابية: سەرو سەمەرە ٥ گروپێکی بەناو موسوڵمانن زۆر شتی تازە قەلاو بیدعەتیان خستۆتە ناو ئایینەکەیانەوە ٥ البَوَّابُ: دەرگەوان، پارێزەرو چاودێری دەرگا ٥ البَوَّابَةُ: دەرگای سەرەکی باڵەخانەو مزگەوت و ئەو جۆرە شتانە ٥ البُوتَقَةُ: بۆتە، ئەو ئامێرەیەی ئاڵتونی تێدا دەتوێننەوە. باثَهُ بوثاً: لێی کۆڵیەوە ٥ استباثه: دەریهێنا، خستیەڕو باجَ فلاناً بائجة: فلانکەس پروسکە لێیدا ٥ باجَ الشرُّ الناسَ: شەڕو نەگبەتی هەموو خەڵکی گرتەوە ٥ بَاجَ برجاً: دەرکەوت.

باحَ خصْمَهُ: بەرامبەرەکەی بۆڕداو بەسەری دا زاڵ بوو ٥ أباحَهُ: دەری خست ٥ حەلاڵی کردو رەهای

کرد ◊ الإباحية: رەهابوون لەسنووری یاساو رەوشت ◊ الباحة: گۆرەپان، پانتایی ◊ **باخَ** بَوخاً: هێدی بۆوە داسکنا ◊ **باخ** فلان: فلان ماندو بوو برستی لێ برا، رقو قینی نیشتەوە ◊ **باخ** اللحمُ: گۆشتەکە بۆنی کرد، بەکەڵکی خواردن نەما.

**البودقة**: بۆتەی لەقاڵب دانی ئاڵتون.

**البوذية**: ئاینێکی بەربڵاوە لەهیندوستانو خۆرهەڵاتی دووردا.

**بَارَ** الشَّيْءُ: شتەکە تێداچوو فەوتا ◊ **بار** العملُ: کارەکە جێی خۆی نەگرت ◊ **بَارَ** الشَّيْءَ: بەتاقی کردەوە. ◊ **البارياء**: حەصیر ◊ **البَوارُ**: زەوی بەیار نەکێڵدرابێو زەرع نەکرابێ ◊ **البُورُ**: زەوییەك بەکەڵکی هیچ نەیە ◊ **الباز**: جۆرێکە لەهەڵۆ بۆ راوکردن بەکاردەهێندرێ ◊ **باسَهُ** بَوْساً: ماچی کرد.

**بَاشَ** الرجلُ بَوْشاً: پیاوەکە هاوکاری دەنگە دەنگو هاتو هاواری کرد.

**بَاشَ** القَومُ: جەماوەرەکە زۆر بوو تێکیانەوە هاویشتو دەستیان کرد بەهاتو هاوارو قیرەو هەرا ◊ **بَوَّشُوا**: زۆربونو تێکەڵ بەیەکتر بون.

**بَاصَ** بَوْصاً: دورکەوتەوەو بەناخۆشی پێی گەیشت ◊ **باصَ** فلاناً: پێش فلانکەس کەوت ◊ **البَوْصُ**: رەنگو روخسار.

**بَاضَ** بَوْضاً: دەمو چاوی جوانو رازایەوە ◊ **باضَ** بالمكان: لەوشوێنە مایەوەو جێگیر بوو.

**بَاطَ** بَوْطاً: دوای دەسەڵاتداریو شکۆمەندیی زەلیلو داماو بوو.

**بَاعَ** الرجلُ بَوْعاً: پیاوەکە دەستی بڵاو کردەوە ◊ **بَاعَ** في سيره: لە رۆیشتنەکەی دا هەنگاوەکانی درێژ کردنەوە ◊ **بَاعَ** الشَّيْءَ: شتەکەی بەباڵ پێواو مەزندەی کرد ◊ **إنباعَ**: درێژ بووە ◊ **إنْبَاعَ الرجلُ**: پیاوەکە بازی هاویشت ◊ **تَبَوَّعَ**: درێژ بووە ◊ **الباعُ**: مەسافەی نێوان هەردو بەرەدەستەکە رایان دێری بۆراستو چەپ ◊ **الباعة**: بەردەم دەرگا، بەردەرگا ◊ **تَبَوَّعَ**: وروژاو هەڵچو، تورەبوو ◊ **تَبَوَّعَ الشَّرُّ**: شەڕو ئاژاوە کە بەربڵاو بوو زۆر شوێنی گرتەوە.

**البَوْغاءُ**: گڵو خۆڵ بەگشتی.

**بَاقَ** بَوْقاً وبُوقاً: فاسید بوو فەوتا ◊ گوم بوو ◊ **باقَتِ السفينةُ**: کەشتییەکە نقوم بوو ◊ **باق** الرجلُ: پیاوەکە درۆی کرد، فیتنەو ئاشوبی هێنایە ولاتەوە ◊ **باق** فلاناً وعليه: غەدری لەفلانکەس کرد ◊ **بَوَّقَ الكلامَ**: قسەکانی رازاندنەوە ◊ **تَبَوَّق** الرجلُ: پیاوەکە درۆی کرد ◊ **البائقة**: بەڵاو کارەسات ◊ شەڕو هەرا ◊ **الباقة**: دەسکێك لەگیاو گژ.

**البُوق**: ئامێرێکی کلۆرە فوی پێدادەکرێو دەنگی لێ دێ وەکوو سەشاڵو بلوێرو زورنا .. ◊ **البُوقَةُ**: تاوەبارانی بەخورەو لێزمە ◊ **البَوَّاقُ**: زورنا ژەن، کەرەناڵیدەر.

**بَاكَ** فلاناً بَوْكاً: خۆی تێهەڵخوشاندو پاڵەپەستۆی لەگەڵ کرد ◊ **بَاكَ** المتاعَ: کاڵاکەی کری ◊ **بَاكَ** بُنْدُقَةَ المِسْكِ: پارچە میسکەکەی لەناو دەستەکانی دا هەڵگلۆفت بۆنەوەی بۆنەکەی بڵاوبێتەوە ◊ **البوكة**: ئادەمیزادی قسەخۆش، قۆز.

**بال** بَوْلاً: میزی کرد ◊ **أبالَهُ**: میزی پێکرد ◊ **استبالَهُ**: میزی پێکرد ◊ **البالُ**: هیواو ئاوات ◊ پاچ ◊ ماسی سەرگەورە ◊ **البالة**: شریف یان گوێنییەکی گەورەیە بەپەستان لۆکەو پۆشاكو

شتی وای تێ دەهاخنن و بەتەڵ و قەید دەپێچرێتەوە.

**البَوْلُ**: میز ◊ **البُوَلَةُ**: کەسێك زۆر میز بکا ◊ **المَبْوَلَةُ**: هەرشتێك ببێتە هۆکاری میزکردنی زۆر ◊ **المِبْوَلَةُ**: ئەوشتەی میزی تێ دەکرێ ◊ **البُومَةُ**: کوندەبەبو ◊ **بانَهُ بَوْناً**: لەپیاوەتی مەردایەتی دا بەسەری دا باڵا دەست بوو ◊ **البانُ**: جۆرە درەختێکە قەدەکەی مام ناوەندیە نەرمو شلکە. ◊ **البَوْن والبُون**: نێوانی دوشت. ◊ باه فلاناً: نەفرینی لەفلانکەس کرد ◊ **الْبَاهُ**: مارەبڕین ◊ جوتبون ◊ **اَلْبُوهُ**: باڵندەیەکە لەکوندە بەبو بچوکترەو لەو دەچێ ◊ **البوهة من الرجال**: پیاوی لاوازی بەتەماع و ترزل.

**بَابَ** فلان بَيْباً: فلانکەس جۆگای هەڵکەند ◊ **البِيبُ**: جۆگای ئاو تا دەگاتە ئەستێرو حەوزەکە.

**بات** فلان: فلانکەس شەوی بەسەرداهات و مایەوە ◊ **بات فلانٌ**: فلانکەس ژنی هێنا ◊ **أباته**: شەو هێشتیەوە ئیزنی نەدا ◊ **بَيَّتَ البَيْتَ**: خانووی دروست کرد ◊ **بَيَّتَ القَوْمَ**: شەو لەناکاو هێرشی بۆ بردن و چووە سەریان زیانی پێگەیاندن ◊ **البَيَاتُ**: نیوەشەو ◊ **البَيْتُ**: خانوو ماڵ، شوێنی تێدا حەوانەوە ◊ تەختی ماڵ ◊ کەعبەی پیرۆز، (بيت الله) : مزگەوت (بيت الرجل) خێزانەکەی (بيت الشعر) شیعری خاوەن وەزن و قافیە کەپێك هاتبێ لەصەدرو عەجز (بيت القصيد) جوانترین دێڕی قەصیدە ◊ مەبەستی سەرەکی لەقسەو گفت و گۆ ◊ **البَيُّوتَةُ**: ئەوبردانەن کەناکەون ◊ **بَيَّعَ بالأمر**: بەنهێنی هەواڵی پێ گەیاند ◊ **البيحانُ**: ئەوکەسەی نهێنی خۆی دەدرکێنێ.

**باد** بيداً: تێداچوو ◊ **أباده**: لەناوی برد، فەوتاندی ◊ **البيداء**: سارا و چۆڵەوانی ◊ **البَيْدانَةُ**: کەرەکێوی ◊ **المُبيدُ**: فەوتێنەری جرو جانەوەر ◊ **البَيْدَرُ**: خەرمان، کۆمەڵە گەنمی سورکراو دوای گێرەکردن ◊ **البيدق**: شارەزاو چاوساغی رێبواران ◊ **البَيْرَقُ**: ئاڵای گەورە ◊ **البيروقراطية**: فەرمانڕەوایی کردن لەرێگەی فەرمانبەرە پلەو پایە بەرزەکانەوە ◊ **البيزرةُ**: پیشەی راهێنانی بازو هەڵۆ.

**بَاسَ** بَيْساً: تەکە ببوری بەسەر خەڵك دا کردو ئەزیەتی دان. ◊ باضت الدجاجة: مریشکەکە هێلکەی کرد.

**بَاضَ** السحاب: هەورەکە بارانی باراند ◊ **بَاضَ العودُ**: شوڕکە دارەکە وشك بوو ◊ **بَاضَ القَوْمَ**: چووە پەنای ئەو قەومەوە ◊ **أبَاضَ الشَّيْئُ**: شتەکە سپی بوو ◊ **أبْيَضَ الرجل والمرأةُ**: ژن و مێردەکە سپی پێست بوون ◊ **بَيَّضَ**: پۆشاکی سپی لەبەرکرد ◊ **بَيَّضَ الشَّيْئُ**: سپی کرد، شتەکەی بەرەنگی سپی بۆیەکرد ◊ **ابْيَضَّ**: سپی بوو ◊ **ابْيَاضَّ**: وردە وردە سپی بوو.

**الأَبْيَضُ**: ئەوشتەی رەنگی سپی تێدا بێ هەمووی سپی بێ ◊ **البياضُ**: رەنگی سپی ◊ شیر ◊ **البيضاءُ**: مێینەی (الأبيض)ە ◊ خۆر ◊ **البَيْضَةُ**: هێلکەی باڵندە ◊ کڵاو خودە ◊ **بَيْضَةَ الدار**: ناوەراستی خانوو ◊ **بَيْضَةَ الصيف**: گەرمای هاوین ◊ **البَيَّاضُ**: وەستای سپیکاری ◊ کەچ فرۆش ◊ هێلکە فرۆش.

**تَبَيْطَرَ**: بەزۆرە ملێ خۆی کردوە بە پزیشکی ئاژەڵ ◊ **البيطار**: پزیشکی ئاژەڵ ◊ **البَيْطَرةُ**: پیشەی بەیتەرکاری میهنەی پزیشکی ئاژەڵ.

**باع** عليه القاضي ضيعتَهُ: دادوەر ماڵی کابرای فرۆشت بەبێ ئەوەی رازی بێ ◊ **باع** علی بیع أخیه: خۆی خزاندە ناو مامەڵەی فرۆشیارو کڕیارەوە ◊ **اَبَاعَه**: شتەکەی راونواند بۆ فرۆشتن ◊ **ابتاعَهُ**: ماڵەکەی کڕی ◊ **تبایَعَا**: گرێبەستی فرۆشتنەکەیان مۆر کرد ◊ **البِیاعَةُ**: کاڵاو شتو مەك ◊ **البَیعُ**: گۆڕینەوەی ماڵی نرخدارە بەماڵی نرخدار ◊ **البِیْعَةُ**: عیبادەتخانەی مەسیحیەکان ◊ **البَیُّوعُ**: ئەوکەسەی باش بزانێ شت بفرۆشێ ◊ دەلاڵی فرۆشتن.

**باغَ** الدمُ بَیْغاً: خوێنەکە هەڵچوو هروژمی هێنا ◊ **تَبَیَّغَ الماءُ**: ئاوەکە بەتەوژم لەشوێنی هاتنەدەرەوەی فیچقەی کرد، هەڵقولا ◊ **تَبَیَّغَ اللبَنُ**: شیرەکەی زۆر بوو.

**بَیْقَرَ**: لەشوێنێکەوە گواستی یەوە بۆ شوێنێکی تر ◊ **بَیْقَرَ** المکانَ: ئەوشوێنەی کردە مەنزڵو شوێنی حەوانەوەی خۆی ◊ **البَیْقَرَةُ**: دیزەی گەورەو بەرفراوان ◊ **البَیْلَمُ**: وردەگیاو گژی ناو قەفەزاژو بیشەڵانو زۆنگاو.

**بانَ** منه وعنه: دورکەوتەوە، لێی جیا بووە ◊ **بانَ** الشیءُ بیاناً: شتەکە ئاشکرابووە رون بووە ◊ **بانَ** الشیءَ: شتەکەی ئاشکرا کردو رونی کردەوە ◊ **بانَ** الشیءَ بیناً: جیای کردەوە لێی دابڕی ◊ **أَبانَ إبْنَتَهُ**: کچەکەی خۆی بەشوودا ◊ **بایَنَهُ**: لێی جیابوووەوە جێی هێشت ◊ **بَیَّنَ**: ئاشکرابوو رون بووە ◊ **بَیَّنَ البِنتَ**: کچەکەی بەمێردا ◊ **تَبَیَّنَ الشیءُ**: ئاشکرا بوو رون بوو ◊ **تَبَیَّنَ الشیءَ**: لەشتەکە وردبووە ◊ **استبانَ**: دەرکەوتو رون بووە ◊ **البائنُ**: جۆرە تەڵاقدانێکە کەپیاوەکە ناتوانێ ژنەکەی بخاتەوە ژێر نیکاحی خۆی ◊ **البائنةُ**: ماڵو سامانێکە تایبەت دەکرێ بەیەکێ لەکوڕی ئەوماڵە ◊ **البَیَانُ**: بەڵگە ◊ دەمو قسەی رەوانو شیرین ◊ قسەو باسێ: کەحەقیقەتی وەزع رون بکاتەوە ◊ **البَیَانُ**: ئامێرێکی مۆسیقایە.

**بَیْنَ** بَیْنَ: حاڵەتێکە لەنێوان دووشت دا ◊ **البِیْنُ**: بۆشایی نێوان زەوی و ئەستێرەکان ◊ **البَیِّنُ**: رونو ئاشکرا ◊ زمانرەوانو قسەجوان.

**البَیِّنَةُ**: بەڵگەی رونو ئاشکرا.

**البَیُّ**: کەسێکە هەتیو مەجهبێو بێ ئەصڵو فەصڵ بێ.



**تَاتَأَ** تَأْتَأَةً: (پیتی) تێی لە قسەکانیدا زۆر دوبارە کردەوە بەهۆی هەبوونی عەیبێك لە زمانیدا ◊ **التأتاءُ**: کەسێکە لە قسەکردنیدا زۆر پیتی (ت) دوبارە بکاتەوە ◊ **أتْـأرَهُ البَـصَرَ**: چاوی بە دوادا گێڕا **تَأزَ** الجرحُ تَـأزاً: برینەکە گۆشتەوزونی هێنایەوە.

**تَئِقَ** الوِعـاءُ تَأقـاً: زەرفەکە پڕبوو ◊ **تَئِـقَ** الفرسُ: ئەسپەکە نیشاتی پەیداکرد ◊ **أتْـأقَ الوعـاءَ** ونحوە: زەرفەکەی پڕکرد ◊ **المِتْـأقُ**: ئادەمیزادی تووڕەو زوو هەڵچوو ئامادە بۆ شەڕ ◊ **التُّوامُ**: مرواری، صەدەف ◊ **التُّوامیە**: دوڕو مەرجان ◊ **التَّـوْءَمُ**: دوو لانە، منداڵێك لەگەڵ بـرای یـا خوشکی لەدایك بووبێ ◊ **المِتئامُ مـن النسـاءِ**: ئەو ئافرەتەیە کە هەموو جارێ بەسکێك دوو منداڵی ببن.

تبَّ فلانٌ: فلاٌنکەس تێدا چوو بە کوشت چوو فەوتا ◊ تَـبَّ: لاوازبـوو پیربـوو داهێـزا ◊ تَـبَّ الحمـارُ ونحـوە: گوێدرێژەکـە پـشتی جـەدو بـوو، برینـداربوو ◊ تَـبَّ الـشيءَ: شتەکەی بڕییـەوە کۆتایی پێ هێنا.

أتـبَ اللهُ قوّتَـهُ: خـودا هێـزو توانـای کـەمکردەوە زەعیفی کرد ◊ **تَبَّبَ المشاةُ الطريقَ**: ڕێبوارەکان ڕێگەکەیان تـەخت کـرد بـەهۆی زۆر پێدا هاتو چۆکردنەوە ◊ **استَتَبَّ الأمرُ**: ئیشەکە باری خۆی گـرتو ڕێـك کـەوتو دامـەزراو جێگیربـوو ◊ **التّابُوتُ**: ئەو یەغدانو سندوقەیە کە کەلوپەلی تێـدا هەڵـدەگیرێ سندوقێك لـە بـەرد یـا لـەدار دروستکراو لاشـەی مـردووی تێخـراوە ◊ **التِّبْـرُ**: وردە ئاڵتونو زێـو پێش ئـەوەی بتوێنرێتـەوەو بکرێ بە قاڵب یان خشڵ ◊ **التِّبْرِيزِ**: شت.

**تَبِعَ** الشيْءَ تبعاً: شـوێن شـتەکە کـەوت بـەدو ئـەودا هات ◊ **أتْبَعَـتِ الماشـيةُ** ونحوهـا: ئاژەڵەکـە بووبـە خاوەن بێچوو ◊ **أتْـبَعَ الـشيْءَ**: شـتەکەی کـردە تابیعو پەیوەست بە ئەوەوە ◊ **تابَعَ فـلان العَمَـلَ أو الكـلامَ**: فلاٌنکـەس سەرپەرشـتی کارەکـەی کرد ◊ **اتَّبَعَ الشَّيْءَ**: بـە دوی شتەکەدا ڕۆیشتو شوێن پێی هەڵگرت ◊ **اتَّبَعَ فلاناً بالـدين**: داوای قەرزەکەی لە فلاٌن کـردەوە ◊ **تَتَابَعـتِ الأشـياءُ**: شـتەکان بـە زنجـیرە بـەدووی یەکـدا هـاتن ◊ **إستَتْبَعَهُ**: داوای لێکـرد شـوێنی کـەوێ ◊ **التـابِعُ**: شـوێنکەوتوو، خزمـەتکار ◊ **التَّـابِعِيّ**: ئـەو کەسانەن بە موسوڵمانی هاوەڵانی پێغەمبـەریان دیتبنو بە موسوڵمانیش مردبن ◊ **التَّبْعُ**: شوێن کـەوتوو لاسـایی کـەرەوە ◊ **التُّـبَّعُ**: سـێبەر ◊ شاژنی هەنگ ◊ **التَّبِعِيَّـةُ**: ئەوەیـە شـتێك شـوێن کەوتووی شتێکی تربێ ◊ **التَّبْغُ**: توتن.

**تَبَلَ** فلاناً تبلاً: تۆڵەی لە فلاٌن کەس کردەوە ◊ **تَبـلَ الطعـامَ**: بـەهاراتو زەردە چـەوەو ئـەو جـۆرە شـتانەی لـە چێـشتەکە کـرد ◊ **التابِـلُ**: ئـەو دەرمـانو هـاڕاوەو تامانـەی تێکـەڵ بـە چێـشت دەکرێ ◊ **التَبّـالُ**: فرۆشیاری دەرمـانی کێـشتو زەردە چەوەو بەهارات.

**تَبِنَ**: تێگەیی و جوان لە کارەکانی وردبۆوە ◊ **تَـبَنَ** الماشيةَ تَبناً: کای کردە ئالفی ئاژەڵەکان ◊ **التَّبّانُ**: کا فرۆش ◊ **التُّبّـان**: دەرپێیـەکی کورتـە دەگاتـە

سەر ئەژنۆو شەرمگا دادەپۆشێ ٥ التِّبْنُ: کا ٥ وردکراوی لاسکی گەنمو جۆ ٥ التِّبْنِيُّ: کایی، رەنگ کایی ٥ اَلْمَتْبَنُ: کادێن ٥ التِّجَابُ: ئەوەی دەتوێنەوە لە بەردە زیو.

تَجَرَ: خەریکی کاری بازرگانیو ناڵو وێرە ٥ تاجَرَ فلان فلاناً: فلان بازرگانی لەگەڵ فلاندا کرد ٥ التاجر: ئەو کەسەیە خەریکی کاری بازرگانیو کڕینو فرۆشتنو شارەزایی باشی لەو بوارەدا هەبێ ٥ اَلْمَتْجَرُ: شوێنی بازاڕو بازرگانیکردن ٥

تَحْتُ: ژێر، پێچەوانەی (فوق) سەر ٥ تَحْتَحَهُ: جوڵاندی، ڕای وەشاند.٥ التَّحْتَحَةُ: دەنگی جموجوڵی ڕۆییشتن ٥ اَتحَفَهُ: دیاری پێدا، دیاری بۆ نارد ٥ التُّحْفَةُ: عەنتیکەو نایاب ٥ المتحف: مۆزەخانە.٥ التُّختة: سبورەی قوتابخانە.

تَخَّ العجين ونحوه: هەویرەکە هەڵات ٥ تَخَّ فلان: فلانکەس ئارەزووی خواردنی نەما ٥ التَّخُّ: هەویری ترشاو، هەویری شل.

تَخَذَ المالَ: ماڵو سامانی پێکەوە نا ٥ التَّخمُ: سنوورو بەرزینی نێوان دوو ملك دوو وڵات ٥ تُدْرُجُ: باڵندەیەکە لە پێڕی پەلەوەری مریشك ناسا لە وڵاتی فارس دا هەیە ٥ التُّدْرَةُ: بەرگریکردن ٥ تراجیدیا: تراژیدیا ٥ تراخوما: چاو هێشە.

تَرِبَ الشَّيْءُ تَرَباً: گڵی خستە سەر ٥ تَرِبَ تَرَباً: گڵو خۆڵی ڕێکەوت ٥ تَرِبَ الريحُ: بایەکە گڵو خۆڵی هێنا ٥ تَرِبَ فلان: فلان کەس هەزار کەوت ٥ تَتَرَّبَ: خۆی لە قوڕو خۆڵدا وەردا ٥ التَرائبُ: ئێسقانی سینگ ٥ التُّرابُ: زەوی نەرمەڵان ٥ التُربُ: گڵو خۆڵ ٥ لاسکی تەشی، ئەو شوێنەی ڕێسراوەکەی لەسەر هەڵدەکرێ ٥ التَرْباءُ: گڵو خۆڵ ٥ زەوی ٥ التُّرَبَةُ: گڵ ٥ سروشتی زەوی ٥ التُّرْبِيَّةُ: گەنمی سوور، گوڵە گەنم.

تَرْبَسَ البابَ: دەرگاکەی داخست ٥ التُّربِينُ: تۆربین، ئامێرێکە هەڵدەخولێ بۆنەوەی هێزی هەوا یان بوخار یان ئاوی بە تەوژم بگۆڕێ بۆ هێزێکی میکانیکی.٥ تَرَجَ تَرَجاً: خۆی پەنهان کرد ٥ تَرِجَ تَرَجاً: کارەکەی لێ ئاڵۆزبوو، ئیشەکەی لێ شێوا ٥ التُّرُجُ: نارنج ٥ تَرْجَمَ كلامَ غيره: لە زمانێکەوە ئاخاوتنی یەکێکی تری وەرگێڕا بۆسەر زمانێکی تر ٥ ترجَمَ لفلان: ژینامەی فلان کەسی نووسی، باسکرد ٥ التُّرْجمانُ: وەرگێڕ ٥ الترجَمَةُ: ژینامە.٥ تَرِحَ تَرَحاً: خەفەتبار بوو ٥ أتْرَحَهُ: خەفەتباری کرد ٥ اَلْمُتَرَّح: ژیانی کولە مەرگی ٥ تَرَّ الرجلُ: پیاوەکە خۆی دارشتو جەستەی پڕبووە، ئێسقانی تێراو بوو ٥ أتَرَّ العُضْوَ: ئەندامەکەی بڕیەوە ٥ التُّرُّ: بەنی تەناف ٥ تَرِزَ: وشك بووە چرچ بوو ٥ تَرَزَ فلان: فلان برسی بوو ٥ تَرِزَ اللحمُ تَرْزاً: گۆشتەکەی وشکەڵ بوو ٥ تَرِزَ الماءُ ترزاً: ئاوەکە بوو بە سەهۆڵ ٥ التُّراز والتُّراز: مردنی کتوپڕ ٥ التُّرْزِيُّ: خەیات، جل دروو ٥ التَّارِسُ: خاوەن تیر، تیر فرۆش ٥ التَّرَّسُ: تیرکەر ٥ التُّرْسُ: تیر ٥ التَّرسَةُ: سولەحفاتی دەریا ٥ المِتْراسُ: ئەو کۆسپو تەگەرانەن کە لەبەردەم پێشڕەوی دوژمن دادەنرێن ٥ المِتْرَسُ: ئەو شتەی لە ناوەوە دەرگای پێ دادەخرێ.٥ تَرُصَ الشَّيْءُ تراصةً: شتەکە قایم کراو زەبت کرا ٥ تَرَعَ الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد.٥ أتْرَعَ الاناءَ: قاپەکەی پڕکرد ٥ تَرَعَ البابَ: دەرگاکەی داخست ٥ تَتَرَّع: پەلەی کرد ٥ الأتْرَعُ من السيول: لافاوێك پڕاوپڕی شیوەکە بێ ٥ التُّرْعَةُ: دەمی جۆگا، لێواری جۆگەی ئاو.٥ تَرِفَ النبات: گیاو گژو رووەکەکە

تەرو تازەو ناسك بوو ٥ **أتـْرَف فـلانٌ:** فـلان سووربوو لەسەر بەغیو گومڕابوون و خراپەکاری. ٥ **أتـْرَف فلاناً:** نازو نیعمەتی بەسەر فلان دا رشتو بەناز پەروەردەیکرد. ٥ **أترَف النعمةُ فلاناً:** نازو نیعمەت وای لە فلان کەس کردووە لەخۆی بایی بێ. ٥ **تَتَرَّفَ:** کەوتە ناو نازو نیعمەتەوە. ٥ **التُرفَةُ:** نازو نیعمەت.

**التُرفاسُ:** زۆربەی جۆرەکانی کارگ.٥**تَرَقـاً فلاناً ترقاةً:** لەگەردنی فلانی دا ٥ **التَرْقُوَةُ:** بینە قاقا.

**تَـرَكَ** الـشَّيْءَ: شتەکەی وەلاناو وازی لێ هێنا ٥ **ترك فـلانٌ:** فلان کەس ئافرەتێکی کەس نەویستی مارەکرد ٥ **الـترك:** تاقمێکن لە مەغۆلەکان ٥ **التِرکَة:** میرات ٥ **التَّریکَة:** گەورە کچی قەیرەو خوازبێنی نەکراو ٥ **التَّرام:** شەمەندەفەر.

**التَرمُسُ:** درەختێکە دەنکە بەرێکی زۆر تاڵی هەیە ٥ جۆرە ترمزێکە شتی سارد یان گەرم بۆماوەیەك تێیدا هەڵدەگیرێ ٥ **التُرمُسَةُ:** ژێر زەمین، سەرداب.

**التُرْهَةُ:** ساراو چۆڵەوانی.

**تَرِيَ** تَرْياً: لە کارکردندا تەمبەڵو لەسەرە خۆبوو، تەمبەڵی کرد.

**تَسَعَ** القَوْمَ: بەهۆی خۆیەوە خەڵکەکەی کرد بە نۆکەس، ٥ **تَسَعَ الـشَّيْءَ:** نۆیەکی هەڵگرت ٥ **أتْسَعَ القومُ:** قەومەکە بوون بە نۆ ٥ **التاسوعاء:** رۆژی نۆیەمی مانگی موحەرەم. ٥ **التُّسْعُ:** بەشێك لەنۆ بەش، ٥ **التِسْعَةُ:** ژمارەی دوا ژمارە هەشتو پێش ژمارە (دە).

**تَعِبَ** تَعَباً: ماندوو بوو، برستی لێ برا، ٥ **تَعْتَعَ** فـلان فی کلامه: فلان کەس لە قسەکردندا زمانی گیرا ٥ **تَعْتَعَ** الشَّيْءَ: شتەکەی راتەکاند.

**تَعُسَ** تَعْساً: هەڵەنگوتو رەپەورو کەوتە سەر زەوی. ٥ **تَعَسَ** الله فلاناً: خودا فلان کەسی لەناوبردو فەوتاندی ٥ **التَّعْسُ:** شەڕو نەگبەتی ٥ **التَّعَلُ:** گەرمی قورگی هێڵنجاوی.

**اتْغَبَةُ:** عەیبداری کرد. ٥ **تغتغ** کلامَهُ: قسەکانی دووبارە کردنەوەو رونی نەکردنەوە.

**تَفَرَ** تُفُوراً: هەڵقوڵا، هەڵڕژا.

**تَفِئَ** تَفْئاً: رقی هەڵساو سوور بۆوە. ٥ **تَفْتَفَ:** چڵکن بوو دوای ئەوەی خاوێن بوو. ٥ **تَفِثَ** تَفَثاً: ریش تاشین و رۆن لەخۆدان و خۆ ئارایشدانی واز لێ هێنا، چڵکن بوو ٥ **التَّفَثُ:** ئەو حاڵ و وەزعەیە توشی ئیحرام بەستوی حەج دەبێ ٥ **أتـْفَحَهُ:** سێوێکی دایە ٥ **التُّفاحُ:** سێو (جۆرەکانی سێو زۆرن). ٥ **المَتْفَحَةُ:** باغی سێو.

**تَفَّ** تَفّاً: تفی کرد، تفی لێکرد: ٥ **التُّفُ:** چڵکی ژێر نینۆك ٥ **التِّفّـاف:** پیاوی خوێڕی و ناکەس بەچە.

**تَفَلَ** تفلاً: تفی کرد. ٥ **تَفِلَ** تَفَلاً: بۆنی جەستەی گۆڕا ٥ **أتْفَلَهُ:** بۆنی جەستەی گۆڕی. ٥ **التُّتْفُلُ والتُّتْفُلُ:** ڕێوی یان بێچووە رێوی. ٥ **المَتْفَلَةُ:** قاپێکە تفی تێدەکرێ ٥ **التُّفْنُ:** چڵك و دزوێنی.

**تَفِهَ** الرَّجُلُ: پیاوەکە هیچ و پوچ و ئەحمەق دەرچوو، بێ نرخ بوو. ٥ **تَفِهَ** الطعامُ: خواردنەکە بێ تام و لەززەت بوو.

**تَقُنَ** أرضَهُ: ئاوی لە زەوییەکەی گرت بۆئەوەی بەپیت بێ و خێرو فەڕبدا. ٥ **التَّقْنُ:** پیاوی عاقڵ و زیرەك.

**تكتَك** البطيخَ: پێی لە کاڵەکەکە ناو پلیشاندیەوە. ٥ **التکتیك:** شارەزایی لە دانانی پلانی شەڕ لەمەیدانی شەڕدا بۆ سوپاو هێزی چەکدار.

**استَتَكَّ التكّةَ** وبها: دوخێنی لە دەرپێکە هەڵکێشا. ٥ **استَتَكَّ بالحرير**: دوخێنی لە قوماشی حەریر دروست کرد. ٥ **المِتَكُّ**: ئەوشتەیە دوخێنی پێ لەدەرپێ هەڵدەکێشرێ. ٥ **التَکِیَّةُ**: خانوویەکە تایبەت دەکرێ بۆ کۆبوونەوەو زیکری دەرویشان. ٥ **التَّلَبُ**: خەساربوون و فەوتان و تێدا چوون ٥ **التولَبُ**: بێچووی ماکەری کێوی ئەگەر تەمەنی ساڵێك بێ.

**تَلْتَلَ** الشَّيْءَ: بە توندی شتەکەی راپسکاوت. ٥ **تَلْتَلَ** فلاناً: فلان کەسی خستە قەلەق و نارەحەتیەوە.

**تَلَدَ** الرجلُ بالمكان وفي القوم تلوداً: پیاوەکە مایەوە، جێگیر بوو، نیشتەجێ بوو. ٥ **أتْلَدَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بەخاوەن ماڵ و سامانێکی باش و رەسەن ٥ **التِّلادُ**: ماڵ و سامانی کۆنینەو رەسەن و ساغ و بێ عەیب. ٥ **التُّلْدُ**: بێچووی هەڵۆ.

**تَلِعَ** الرجلُ تَلعاً: پیاوەکە ملی درێژبوو، باڵای بەرزبوو ٥ **أتْلَعَ الرجلُ**: پیاوەکە ملی درێژکرد (أتْلَعَتْ المرأة الحسناء): ئافرەتە جوانەکە سەری بەرزکردەوە بۆئەوەی تەماشاکەران چاویان پێ بکەوێ ٥ **تَتَالَعَ في مَشْيِهِ**: لەرۆیشتن دا ملی درێژکردو سەری بەرزکردەوە. ٥ **تَتَلَّعَ للأمر**: کارەکەی دیاریکردو چووە بنج و بناوانی. ٥ **اسْتَتْلَعَ لِلْخَبَرِ**: چووە بنج و بناوانی هەواڵەکە. ٥ **التَّلْعَةُ**: تەپۆڵکە، ئەوەی لەزەوی بەرز بووبێتەوە، شوێنی هەڵڕژانی ئاو لە بەرزاییەوە بۆ نزمایی.

**التلغراف**: بروسکە.

**تَلَفَ** تَلَفاً: فەوتا، تێکچوو، لەکارکەوت ٥ **أتْلَفَهُ**: فەوتاندی، لەکاری خست.

**تَلَّ** الماءُ: ئاوەکە دڵۆپە دڵۆپە هاتە خوارەوە داچۆڕا. ٥ **تَلَّ فلاناً تلاً**: فلانکەس بە عەرزیداداو خستی، کوشتی ٥ رمەو روو بەسەر دەمدا خستی ٥ **تَلَّ** الناقةَ: حوشترەکەی پیخدا، ٥ **تَلَّ** الماءَ: ئاوەکەی دڵۆپە دڵۆپە پاڵاوت ٥ **تَلَّلَهُ**: خستی، کوشتی. ٥ **التلالُ**: گومڕا، ٥ **التَّلاَلَةُ**: گومڕایی: ٥ **التَّلُّ**: ئەو گردو گردۆڵکانەن کە لەئاستی رووبەری زەوی دەوروبەریان بەرزترین ٥ **التُّلَّى**: مەڕی سەربڕاو. ٥ **التلول**: هەرشتێك بەئاسانی کۆنترۆڵ نەکرێ. ٥ **المِتَلُّ**: بەهێزو توانا ٥ رمبی چەقێندراو ٥ **التِّلْمُ**: جوتیار، سەپان و وەرزێر ٥ **التلمود**: کۆمەڵێك تەعلیمات و داب و نەریتی ئاینی جولەکەیە کە دەماو دەم لە ماڵەکانیانەوە گێڕدراوەتەوە. ٥ **التِّلْمِيذُ**: قوتابی زانست ٥ قوتابی بچوك کەلە قوتابخانەکاندا دەرس دەخوێنن.

**تَلِهَ**: عەقڵی نەماوە ٥ **أتْلَهَ الشَّيْءَ**: شتەکەی فەوتاند، **أتْلَهَ فلاناً الشَّيْءَ**: شتەکەی لەبیر فلان کەس بردەوە لێی گوومکرد. ٥ **إتَّلَهَ**: سەرگەردان بوو دڵە راوکێی تووش بوو. ٥ **المَتْلَهُ**: بیابانی سامناك و فەوتێنەر.

**تلا** تُلُوّاً: شوێنی کەوت ٥ دواکەوت ٥ **تلا** الكتاب وغيره تلاوة: خوێندییەوە ٥ **تَلِيَ** تَلْيً: دواکەوت ٥ **أتلى فلاناً**: پێش فلان کەوت ٥ **أتلى فلاناً على فلان بحق**: فلان کەسی حەواڵەی سەر فلان کرد بۆ وەرگرتنی حەقەکەی. ٥ **تَلَّى**: راست بووە بۆ ئەنجامدانی نوێژ ٥ **تَلَّى الشَّيْءَ**: شوێن ئەوشتە کەوت. ٥ **تتالتِ الأمور والأشياء**: رووداوەکان بەشوێن یەکدا هاتن، شتەکان ریزبوون. ٥ **تَتَلَّى**: شوێنی کەوت ٥ ماڵ و سامانێکی زۆری پێکەوەنا. ٥ **استَتْلَى فلاناً**: داوای لە فلان کەس

كـرد شـوێنی بكـەوێ ٥ **التِّلْـوُ**: هەرشـتێك دوا شتێك بكەوێ ٥ **التَّلِيُّ**: كەسێك زۆر سوێند بخوا ٥ **التَّوالي**: سمتو پاشوو.

**أتـمَرَ الرطبُ**: بەرسيلەكە بووبـە خورمـای گـەییوو پێگەیشتوو. ٥ **أتـمَرَ فلانٌ**: فلان كـەس خورمـای زۆر بوو. ٥ **تَمّر الرطب**: خورمـا تەڕەكـەی وشك كـردەوە، مـشتاخی نایـەوە. ٥ **تَتَمَّـرَ**: خورمـای خوارد ٥ **تَتَمَّرَ اللحمَ**: گۆشتەكەی پارچە پارچە كرد. ٥ **التَّامِرُ**: خـاوەن خورمـا. ٥ **التَّمْـرُ**: بـەری دارخورما بە وشكەوەبوویی.

تمر الحناء: **گوڵە خەنە**. ٥ **التَّمّارُ**: خورما فرۆش.

**تَمَـكَ** الـسنامُ تَمْكـاً وتُمُوكـاً: **دوگـی حوشـترەكە بەرزبووە درێژبووە** ٥ **التامِكُ**: قەپوچكی دوگـی حوشتر: ٥ **التَّامُولُ**: روەكێكە وەكوو كولەكە.

**تَمَّ** تَمّاً وتَمَاماً: **تەواوبوو، پتەوو بـەهێزبوو** ٥ **أتَـمَّتِ الحَامِلُ**: ئافرەتـە سك پڕەكـە كـاتی منـداڵبوونی نزيـك بـووە ٥ **أتَـمَّ القمـرُ**: مـانگ بـوو بـەمانگی شەوی چواردە ٥ **أتَمَّ الشَّيْئَ**: شتەكەی تەواوكرد. ٥ **تَمَّمَ على الجريح**: برينـدارەكـەی كوشـت. ٥ **تَمَّمَ الـصبيّ**: نوشـتەو جـادووی بەسـەر منداڵەكـەوە كرد. ٥ **التَّتِمَـةُ**: تەواوكـەر، هـەر شـتێك شـتێكی تری پێ تەواوبێ. ٥ **التَّمَـامُ**: تـەواوی شـت ٥ **ليـل التمام**: درێژترين شەو لەساڵدا ٥ **التَّمَامة**: بـاقی مانـدەی شت.

**تَميم**: خێڵێكی عەرەبن لە خێڵەكانی وڵاتی نەجد. ٥ **التَّميمَـةُ**: نوشـتەو دوعايـە دەكرێتـە مـل بـۆ بەرگری لە چاوەزار.

**تَمِهَ** اللَّحْمُ واللبنُ ونحوهمـا تَمَهـاً وتَماهـةً: **گۆشـتەكە يان شيرەكە بۆگەنی كرد، كەڵكی نەما.**

**تَنَا** بالمكان: **لەو شوێنە مايەوە** ٥ **التانَبُولُ**: روەكێكە لەپێڕی فولفول، ٥ **التَّنْبَلُ**: تـەمبـەڵو تـەوەزەل.

٥ **تَنْتَلَ الرجلُ**: پياوەكە چڵكن بـوو ٥ **تَنْتَنَ**: وازی لـە دۆسـتەكانی هێنـا ٥ **التَّنْتَنَـةُ**: ئاشـقبەندێكە چـەند جـۆرێكی هەيـە ئافرەتـان بـۆ جـوانی بەسەر جلەكانياندا دەيدوورن. ٥ **التُّنُوج**: جۆرە درەختێكە لە پێڕی سنەوبەرەكان.

**تَـنَخَ** بالمكـان: **لـەو شـوێنە مايـەوە**، ٥ **تَـنِخَ تَنْخـاً**: تووشـی بـەدخۆراكی بـوو ٥ **التنـانير**: تـەنوور دروستكەر. ٥ **التنور**: فڕنی نان تێدا برژانـدن ٥ **التِّنْسُ**: ياری تێنس، ٥ **التُّنُوفَةُ**: ساراو بيابانێـك كـە بـێ ئـاوو بـێ هـاو دەنـگ بـێ، ٥ **التُّنكـةُ**: تەنەكـە، زەرفێكـە لـە صـەفيح ٥ **أتَـنَّ**: دوركەوتـەوە، ٥ **الـتِّنُّ**: هاوشـانو بەرامبـەر، ٥ **التِّنِنُ**: گيانلەبەرێكی ئەفسانەييە.

**التَّهَاتِـهُ**: هەرشـتێك بێبناغـەوتورەهات بـێ. ٥ **التَّيْهُورُ**: شەپۆلی بەرزبوەوەی دەريا.

**تَهِمَ** اللَّبنُ واللحـمُ تَهَمـاً: **گۆشـتەكە بۆگـەنی كـرد، شـيرەكە بزرِكـاو بـۆنی كـرد**، ٥ (**تَهِـمَ الرجـلُ**): پياوەكە بۆنی ناخۆشی لێهات ٥ **تَهِمَ الحرُّ**: گـەرما تاوی ساند ٥ **أتْهَمَ**: هاتە وڵاتی تيهامە ٥ **تِهَامَةُ**: زەوی وڵاتێكی نزماييە، كەوتۆتە نێوان كـەناری دەريـاو كێوەكـانی حيجـاز بـەلای يەمەنـدا، ٥ **التُّهْمَةُ**: شاری تيهامە ٥ گومان.

**تَابَ** توبَةً: **لەتاوان پەشيمان بۆوە** ٥ **استَتابَهُ**: داوای تۆبـەكردنی لێكـرد ٥ **التَّوْبَـةُ**: دان پيانـانو پەشيمان بوونەوەو وازهێنان لەتاوان.

**التوتياءُ**: بەردێكە دەهاڕدرێو دەكرێ بەكلو چاوی پێ دەرێژرێ ٥ **تَوَّجَهُ**: تاجی لەسەركرد ٥ **التائج**: خـاوەن تـاج ٥ **التَّـاجُ**: جـۆرە كڵاوێكـە دەخرێتـە سەری پاشاو مەليكەكان.

**التَّـاجِيّ**: شـارەگو دەمـاری تـاجی.

**تاجَ** له الشَيْءُ تَوْحاً: بۆی دەستەبەر بوو ٥ **تاوەرة**: جار لەدواجار بۆی گەڕایەوە ٥ **التورُ**: سەفیرو نمایندە لەنێو گەلو نەتەوەدا ٥ **التوراة**: نامەی ئاسمانی کەبۆ حەزرەتی موسا نێردراوەو تایبەتە بە بەنو ئیسرائیلییەوە.

**تاف** بَصَرُهُ توفاً: هەمیشە سەیری ئەوشتەی کرد ٥ **تاف** بصره عنه: چاوی لێ لاداو چیدی سەیری نەکرد ٥ **التافة**: عەیب ٥ زێدە ٥ پێویستی.

**تاقَ** تَوْقاً: حەزی لێکرد، سۆزی بۆبوو ٥ **تاق علیه**: سوربوو لەسەر ڕێكو پێك کردنی ئەوکارە ٥ **تاق منه**: لێی ترسا ٥ **تتوّق الی الشیئ**: حەزی لەوشتە کرد.

**التّالُ**: بێچووە هەنگ، پورە هەنگ ٥ **التُّولَةُ**: سیحرو جادو، مورووێکە ئافرەت بەکاری دەهێنێ بۆئەوەی لای مێردەکەی خۆشەویست ببێ ٥ **تَوَّمَ الصَّبِيُّ**: گوارەی لەگوێی منداڵەکە کرد ٥ **التَّوَمَةُ**: گوارەی گوڵ گەورە.

**تاهَ** فِي المفازة: ڕێگای لێ گووم بوو ٥ **تاهَ في الأرض**: بەناو زەوی دا ڕۆیی بەسەر گەردانی ٥ **تَوَّهَهُ**: ڕێگای لێ گووم کرد ٥ **التُّوُّ**: ساتێك لەشەو یان لە ڕۆژ.

**تَوِيَ** المالُ تَوىً: ماڵەکە بەفیڕۆچوو هیوای گەڕانەوەی لێ ناکرێ.

**تَوِيَ** الانسان: ئادەمیزادەکە لەناوچوو ٥ **المَتْواةُ**: شوێنی بەهیلاکچوونو فەوتان.

**تاحَ** له الشَيْءُ تَيْحاً: شتەکە بۆی دەستەبەربوو ٥ **تاح له الأمرُ**: بەسەر کارەکەی باڵا دەست بوو ٥ **التَّيَحانُ والتَّيَّحان من الرجال**: پیاوێکی وایە خۆ لەشت هەڵدەقورتێنێو لەناکاما تووشی بەڵاو کارەسات دەبێ ٥ **المِتْياحُ**: پیاوێ کە زۆر عەجولو جەو جوڵکەربێ، خۆ تێهەڵقووتێن بێ ٥ **التَيْدُ**: هێدیو هێمن ٥ **التَيْرُ**: نیرگە ٥ **التَّيارُ**: جەو جوڵێکی سەرانسەرییە لە ئاوی دەریا لوشەکاندا.

**تاز** تَيْزاً: توندو پتەو بوو ٥ **تاز فلاناً تیزاً**: بەسەر فلان کەسدا باڵا دەست بوو ٥ **تَيَّزَ في مشیته**: لە ڕۆیشتندا هەڵبەزو دابەزی کرد ٥ **تاس الجَدْيُ تَيْساً**: بێچوە بزنەکە بوو بە نێرییە قەرە ٥ **تَيَّسَ فَرَسَهُ**: جوانو ئەسپەکەی ڕاهێنا ٥ **التَّيْسُ**: نێرینەی بزنو ئاسكو حەیوانە کێوی ئەگەر تەمەنی لە ساڵێك تێپەڕی.

**تاعَ** الجَمَدُ: بەستەڵەكو سەهۆڵەکە توایەوەو ڕۆیی ٥ **تاع** السنبل: سونبولەکە هەندێکی وشك بووەو هەندێکی بەتەڕی مایەوە ٥ **تاع** الى الشئِ: حەزی لەوشتە کرد ٥ **تاع** الطریق: ڕێگاکەی بڕی ٥ **أتاعَ فلان**: فلانکەس ڕشایەوە ٥ **تَيَّعَ بالشيء**: شتەکەی بەدەست گرت.

**تتايَعَ** فلان: بە سوربوونەوە بەرەو پیری شەڕچوو حەزی لێ بوو ٥ **الأتْيَعُ**: ئەو کەسەی پەلەیکا بۆ ئەحمەقیو نەفامی ٥ **التَّيْعُ**: ئەو شلەمەنییەیە کەبەسەر زەویدا ڕەوان ببێ ٥ **التَّيعَةُ**: چل سەر بزنو مەڕ، ئەندازەی زەکات (نیصابی زەکات) ٥ **التَّيْفُودُ**: گرانەتا ئەخۆشییەکی گواستراوەیە.

**تیل**: ڕومکێکە لەپێڕی (الخبازیة)یە لە لاسکەکەی حەبلو گوێنی دروست دەکرێ ٥ **تام** تَيْماً: گۆشە گیربوو وازی لەخەڵك هێنا ٥ **أتامَ**: مەڕێکی سەربڕی ٥ **تَيَّمَهُ الهوى والحبیب**: عەشقو خۆشەویستیو دڵداری، عەقڵو هۆشی بردووە ٥ **التَّيْمُ**: کۆیلە ٥ **التَّيْماءُ**: سارای پانو پۆڕ ٥ **التَّيْمَةُ**: مەڕێك لەماڵەوە بەخێو بکرێو شیرەکەی لەماڵەوە بدۆشرێ ٥ نوشتەو مێروی شین بۆ دەفعی چاوەزار.

التين: هـەنجیر ٥ التَّيَّان: هـەنجیر فـرۆش ٥ المتانـة: زەوییەك هەنجیری زۆربێ.

تاه تَيْهاً وتيهاناً: فیزو لوتبەرزی نوانـد ٥ تـاه في الأرض: رێگـای لێ گوومبـوو، بەسـەرگەردانی رۆیشت ٥ تاهَ بَصَرُهُ عنه: چاوی لێ هەڵبوارد ٥

أتاهَهُ: رێگای لێ گووم کـرد ٥ تیّهـه نفسه: خۆی سەرگەردان کرد.

التِّيـهُ: سـاراو بیابانێـك نیـشانەی تێـدا نـەبن ٥ التَّيهان: من الرجال: پیاوی ئازاو چاو نەترس.

التيوقراطيـة: جۆرێکـە لەیاسـای بـەڕێوە بـردن کـە فەرمانڕەوا دەسەلاتی ئایینیو دونیایی هەبێ.



**الثُؤَباءُ:** باوێشك ٥ **ثَـأْثَـأ** الغضبَ: رق‌و کینه‌که‌ی نیشته‌وه ٥ **ثَأثَأ** مِنهُ: لێی ترسا ٥ **ثَئِدَت اللیلَةُ:** شه‌وه‌که‌ی سارد بـوو ٥ **الثَأدُ:** سه‌رما ٥ شـه‌ونم ٥ خـاك ٥ روه‌كـی تـه‌ڕو تـازه‌و ناسـك ٥ **الثَـأدَاءُ:** ئـافره‌تی گێـل‌و نه‌حمـه‌ق ٥ **الثَـأدَةُ:** ئـافره‌تی گۆشتن‌و قه‌ڵه‌و.

**ثَأرَ** القَتِيلَ وبِهِ ثَـأراً: تۆڵه‌ی كوژراوه‌كه‌ی ستاند ٥ **أثـأرَ:** فریـای تۆڵـه سـاندنه‌وه‌كه كـه‌وت ٥ **الثَائـِـر:** كه‌سێكه هه‌موو هه‌وڵ‌و تەقەلایه‌كی بخاته گه‌ڕ بۆ تۆڵه ستاندنه‌وه له بكوژ.

**ثَألَ** لَهُ المرضُ: نه‌خۆشی بالوكه‌ی توش بوو ٥ **تَثَألَـلَ** جَسَدُهُ: بالوكـه له‌سـه‌ر جه‌سـته‌ی ده‌ركـه‌وت ٥ **الثُؤلُولُ:** بالوكه.

**ثَأىَ** الخَرَزَ ثَأياً: میروه‌كه‌ی كون كرد ٥ **الثَأيُ والثَأى:** پێـوه چـوون لێـك هه‌ڵوه‌شـان ٥ **إثْبَـأجَّ الرَجُـلُ:** پیاوه‌كـه قه‌ڵـه‌وو كه‌تـه بـوو ٥ **ثَـبَّ** ثَبـاً: لـه سه‌رئه‌ژنۆ دانیشت ٥ **ثَبَتَ ثَبَاتاً وَثُبُوتاً:** جێگیر بوو.

**ثَبَتَ الأمرُ:** كارەكه راست ده‌رچوو چه‌سپا ٥ **أثْبَتَ الـشَّيْءَ:** ئـه‌و شـته‌ی بەتـه‌واوه‌تی زانـی راستییه‌كه‌ی پێكا ٥ **أثْبَتَ فلانـاً:** فلانـه‌كه‌سـی به‌ندكرد ٥ **ثَبَّتَ فلانـاً:** لـه‌كاتی ته‌نگانـه‌دا وره‌ی فلانكه‌سـی بـه‌رز كـردوه له‌سـه‌ر مه‌به‌سـت‌و ئامانجی خۆی جێگیری كـرد ٥ **تَثَبَّتَ فِي الأمرِ والرأي:** له‌سه‌ره‌خۆ بۆ كارەكـه چـوو ٥ **الثَبَـات:** له‌گڵ‌و گۆكه‌وتن ٥ **الثِبَاتُ:** ئه‌و حه‌بل‌و په‌تـه‌یـه بارو بارگه‌نه‌ی پـێ ده‌به‌سـترێ ٥ **الثَّبْتُ:** پیـاوی ئازای وره به‌رزو خۆڕاگرو چاونه‌ترس.

**ثَـبَجَ** الرجُـلُ ثَبجـاً وَثَبَجَـاً: پیاوه‌كه له‌سه‌ر نوكه په‌نجـه‌ی قاچـه‌كانی هه‌ڵتروشكا ٥ **ثَـبَجَ الكَـلاَمَ وَالخَطَّ:** قسه‌و نووسینه‌كانی تێكه‌ڵ‌و پێكه‌ڵ كرد ٥ **ثَـبِجَ ثَبَجَـاً:** ناوقـه‌دی ئه‌سـتور بـوو ٥ **الثَّـبَجُ:** ناوقه‌دی شت كه ئه‌سـتور بـێ‌و بـه‌رز بێتـه‌وه ٥ **إثْبَجَرَ الرَجُلُ:** پیاوه‌كه هه‌ڵسڵه‌مێیه‌وه.

**ثَبَرَ** فلان: فلانكه‌س فه‌وتاو له‌ناو چوو ٥ **ثَبَرَ الـشَّيْءَ:** شته‌كه‌ی له‌ناو برد ٥ **ثَبَـرَ عَـنِ الـشَّيْءِ:** لـه‌و شته حه‌بـسی كـردو نه‌یهێـشت ده‌سـتی بیگاتـێ ٥ **ثَبَـرَ الْبحـرُ:** ده‌ریـا شـه‌پۆلی هاویـشت ٥ **ثَبِـرَت علـى الأمـر:** بـه‌رده‌وام بـوو له‌سـه‌ر كاره‌كـه‌و وازی لێ نه‌هێنا ٥ **ثَابَروا فِي الحربِ:** تێكرا هێرشیان بـرد ٥ **الثُبْرَةُ:** جۆره گڵێكه وه‌كوو قسڵ وایه.

**ثَبَطَ** على الأمر ثَبْطاً: له‌سـه‌ری وه‌سـتاو نـه‌یتوانی چیدی هه‌نگاوبنێ ٥ **ثَبَّطَ فلاناً عَـنْ الـشَيءِ:** فلانه‌كه‌سـی ده‌سته‌وه‌سـان كـردو هێواشـی كـردوه ٥ **ثَبَقَـتِ الْعَـيْنُ ثَبْقـاً:** چاوه‌كه فرمێسكی هاتنـه خـوار ٥ **ثَـبَنَ فِي الثَـوبِ:** هه‌نـدێكی لـه كراسـه‌كه‌ی هه‌ڵدایـه‌وه به‌ده‌سـتی گرتـی‌و كـردی بـه به‌ركۆش‌و هه‌نـدێ شتی تێكرد ٥ **ثَـبَنَ الـشَّيْءَ:** شته‌كه‌ی كرده به‌ركۆشـه‌كه‌یه‌وه‌و هـه‌ڵی گـرت ٥ **أثْبَنَ فِي ثَوبِهِ:** لـه كراسـه‌كه‌ی به‌ركۆشی دروست كرد ٥ **الثِّبَانُ:** ئه‌و به‌شه‌ی لـه كراسـه‌كه ده‌كرێ بـه بـه‌ركۆش‌و شـتی تێـدا هه‌ڵـده‌گیرێ ٥ **الْمَثْبَنَـةُ:** كیـسه‌یه‌كه ئـافره‌ت ئاوێنـه‌و ئـامێری ئارایـشی خـۆی تێـدا هه‌ڵـده‌گرێ.

ثَبى الجمع أو الجيشَ: خەڵکەکە یان جەیشەکەی پۆل پۆل کرد ◊ ثَبى المالَ: پارێزگاری ماڵو سامانەکەی کردو کۆی کردەوە ◊ ثَبى الله النعمَ للشخص: پەروەردگار نازو نیعمەتی خۆی بەسەر ئەو شەخصەدا رشت ◊ الثُّبَةُ: کۆمەڵو پێرێك.

ثَتَمَ الخرزَ: مورووەکەی شکاندن ◊ إنثَتَمَ الرجلُ: پیاوەکە بە وتەی ناشیرین دەمی کرایەوە ◊ تَثَتَّمَ الثوبُ: کراسەکەی درا شیتاڵ شیتاڵ بوو ◊ تَثَتَّمَ اللحمُ: گۆشتەکە دارزاو هەڵوەری.

**ثَجْثَجَ** الماءُ: ئاوەکە رەوان بوو هەڵڕژایە خوارێ ◊ الثَّجاجُ: ئاوی بەخوڕەمو هەڵڕژاو لەبەرزاییەوە ◊ الثَّجَّةُ: باغو باخچەیەك حەوزی ئاوی تێدابێو شوێنی وای تێدابێ ئاویان تێدا پەزمەندە بکرێ ◊ الثجیج: لافاو.

ثَجِرَ الشیءُ ثَجَراً: شتەکە ئەستوورو پان بوو ◊ ثَجَّرَ الشَّیءَ: شتەکەی پان کردەوە ◊ الأثجَرُ: تیری ئەستوری بنك کورت ◊ الثَّجْرُ: شتی ئەستوورو پان (خەبەلۆسە) ◊ الثَّجِیرُ: تڵپەی هەرشتێك کە بگوشرێ وەکوو تڵپەشوکی ترێ.

**ثَجِلَ** ثَجَلاً: گەدەی گەورە بوو ◊ ثَجَمَهُ ثَجْماً: خێرا سەرفی کردو پالّی پێوە نا ◊ ثَجَمَ ثجماً: بەگورجی گەڕایەوە.

**ثَخْثَخَ**: دەنگی گڕبوو قرخەقرخی هات.

**ثَخُنَ**: ئەستورو رەقو نەکڵەوەت بوو ◊ أثخَنَ فی الأرض: زێدەرۆیی کرد لەشەڕکردن لەگەڵ دوژمنەکانی دا ◊ السَّخَنُ: لەش داهێزرانو تەمبەڵیو قونگرانی بەهۆی نوستنەوە یان ماندوبوونەوە یان نەخۆشی.

**ثَدَقَ** المطرُ: بارانەکە بە خوڕەم هەڵڕژاو باری ◊ ثَدَقَ الوادی: شێوەکە ئاوی پێدا جاری بوو ◊ ثَدَقَ الخَیْلَ: ئەسپەکەی بەرەڵا کرد ◊ ثَدَّمَ الابریقَ: چاپاڵێوی لەسەر مەسینەکە (قۆریەکە) دانا.

الثَّدامُ: چاپالێو (پاڵێوەر).

ثَدِنَ فلان: فلانکەس گۆشتی زۆر بوو قەڵەو بوو، قورس بوو.

**ثَدا** ثَدْواً، ثدواً: تەڕی کرد ئاورشێنی کرد ◊ ثَدَاه: خۆراکی پێدا، شیری مەمکی دەرخوارد دا ◊ الثَّدْیُ: بەرز بوونەوەی دو مەمکە لەسەر سینگی پیاو یان ژن ◊ ثَرَبَهُ ثَرْباً: سەرزەنشتی کردو بەتاوانەکانی لەکەداری کرد ◊ ثَرَبَ المریضَ: کراسو پۆشاکی لەبەر نەخۆشەکە داکەند ◊ الثَّرَبَ فلان: فلانکەس بەخششو عەطای کەم بوو ◊ اثْرَبَ فلاناً: لۆمەی فلانکەسی کرد ◊ ثَرَّبَ: شتەکەی لە کەڵك خستو تێکەڵ بەشتی تری کرد ◊ ثَرَّبَ فلاناً، وعلیه: لۆمەی فلانکەسی کرد بە تاوانەکانی لەکەداری کرد.

**ثَرْثَرَ** فی الشیء: شتەکەی زۆر تێك هەڵداو تێکەڵاوی کرد ◊ ثَرْثَرَ الشَّیءَ: شتەکەی تەفرو تونا کرد ◊ الثرثار: زۆر بڵێ ◊ ثَرَدَ الخُبْزَ ثرداً: نانەکەی کەرت کەرت کردو بەشورباو تەڕی کرد (نانەکەی تێکوشی).

ثَرَدَ الثوبَ: کراسەکەی لەخم هەڵکێشا ◊ ثرد المطرُ الأرض: بارانەکە کەم باری ◊ ثردت شفتُه: لێوی قەڵشت قەڵشت بوو.

الثرد: بارانی کەم نمە باران ◊ الثَّرِیدُ: تێکوشاو (نانی وردکراو بکرێتە ناو شورباوە).

المثردة: کاسەو قاپی تێکوشاو ◊ثَرَّ الطعنةَ: برینەکە خوێنی زۆر لێ هات ◊ ثَرَّ الشَّیءَ: شتەکەی وردکردو لەناوی برد ◊ ثَرَّ المکان: شوێنەکەی ناو رشین کرد ◊ الثَّرْعُلَةُ: پەرو پۆلی ملی کەڵەشێر ◊ ثَرَمَهُ ثَرْماً: بەدەمی کێشاو ددانی

الحَبَّ: دانەوێڵەکەی هاڕی کردی بە بروێش ٥ جَشَبَ شبابُهُ: کەنجییەتی خۆی بەڕی کرد.
جَشِبَ الرَّجُلُ: خواردنو خۆراکی زبرو کەمو کوڕ بوو ٥ الجَشُوبُ من النساء: ئافرەتی ناقۆڵای کەتە ٥ المِجْشابُ: جەستە گەورەی ناقۆڵا ٥ المِجْشَبُ: پیاوی کەتەو ئازا ٥ المُجَشَّبُ: ئادەمیزادی ژیان زبرو دەستکورت ٥ جَشَرَ عن أهله: لەخزمو خۆێشی خۆی دوورکەوتەوە ٥ جَشَرَ الشَّيْءَ: وازی لە شتەکە هێنا.
جَشِرَ الساحِلُ جَشَراً: قەراخ دەریاکە قوڕەکەی رەق هەڵهات ٥ جَشَرَهُ: وازی لێ هێنا ٥ جَشَرَ الاناءَ: قاپەکەی بەتاڵ کرد ٥ تَجَشَّرَ بَطْنُهُ: سکی هەڵاوسا ٥ الجاشِرِيَّةُ: نیوەڕۆ ٥ بەرە بەیان ٥ خواردنەوە لەبەرەبەیانیدا ٥ الجُشارُ: کۆکە، یان سینگ خورانو نیخە نیخ ٥ دەنگ گرِی ٥ الجَشَرُ: بەردێکی زبرە لە دەریادا لەچەوو صەدەف پێك دێ ٥ الجَشّارُ: خاوەنی ئاژەڵی وەها کە لەکێوو کەژ دەلەوەڕێن ٥ الجَشِيُّ: تیردان، کەشکۆڵ ٥ هەمبانە ٥ جەواڵو هۆڕی گەورە ٥ المِجْشَرُ: حەوزێك کە ئاوەکەی بەکەڵکی خواردنەوە نەیە لەبەر پیسو بۆخەڵی ٥
جَشَّ الحَبَّ: دانەوێڵەکەی کردە بروێش ٥ جَشَّ المكانَ: شوێنەکەی ماڵیو پاکی کردەوە.
الجَشَشُ: دەنگی گەورەو گر ٥ الجَشُّ: شوێنی رەقەڵانو بەرداوی ٥ الجَشُّ من الشَّيْءِ: ناوەڕاستی شت ٥ الجَشَّةُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد بەکۆمەڵ بەرەو شوێنێك دەڕۆن.
جَشِعَ جَشَعاً: تەماعی زۆر بوو هەڵپەی کرد ٥ تَجاشَعوا الشَّيْءَ: لەو شتە کۆبوونەوەو چەپاویان کرد ٥ تَجَشَّعَ عليه: زۆر بەخەمیەوە بوو سور بوو لەسەر ئەنجامدانی ٥ الجَشِعُ: ئەو کەسەیە ماڵو سامان کۆدەکاتەوە لێی نابەخشێ دڵی بروانادا شتێکی لێ زایە بکا ٥
جَشِمَ جَشْماً: قەڵەو بوو، قورس بوو ٥ جَشِمَ الأَمْرَ جَشْماً: بەنابەدڵ ئەو کارەی لە ئەستۆ گرت ٥ اجْشَمَهُ أمراً: کارێکی خستە سەرشانی ٥ الجُشْمُ: قورسایی.
جَشِنَ جَشَناً: قەڵەو بوو، زەبەللاح بوو.
جَصَّصَ البناءَ: باڵەخانەکەی کەچکاری کرد ٥ جَصَّصَ الاناءَ: قاپەکەی پڕکرد ٥ الجَصُّ: گەچ ٥ جۆرێکە لە کەرەسەی خانوو دروستکردن ٥ الجَصّاصُ: گەچکار، ئەو کەسەی گەچەکە بەرهەم دێنێ ٥ فرۆشیاری گەچ ٥ الجَصّاصَةُ: ئەو شوێنەی گەچی لێ بەکار دەهێندری.
جَضَّ فلان جَضّاً: فلانکەس بەشێوەی فیزەوە هاتوو چۆی کرد ٥ جَضَضَ: بازێکی توندی هاویشت.
جَعَبَ الجُعْبَةَ – جَعَبَ جَعْباً: تیردانی دروستکرد، پرێسکەی دروستکرد ٥ جَعَبَ فلاناً: فلانکەسی خستە سەر زەوی ٥ الجِعابَةُ: دروستکردنی تیردانو فیشەکدان حیرفەو میهنەی جوعبە دروستکردن ٥ الجُعْبُوبُ: کورتە باڵای ناشیرین، لاوازی بێ هێزی بێ خێرو فەڕ ٥ جَعْبَرَهُ: بەعەرزی دادا خستیە سەر زەوی ٥ الجَعْبَرِي: کورتە باڵای ناشیرینو نەکڵەوەت ٥ الجِعْثِنُ: قەدی درەختو رووەك.
جَعْجَعَ الرحى: ئاشەکە تەقە تەقی لێ هات ٥ چەقەنەی لێ دا ٥ جَعْجَعَ به: نارەحەتی کرد، جاڕزی کرد ٥ جَعْجَعَ الجذور: کوشتی یەکەی سەربڕی ٥ الجعجاعُ: شوێنی تەنگەبەرو ناخۆشو رەقەنو بەردەڵان ٥ بەندینخانە ٥ الجَعْجَعُ: شوێنی تەنگەبەرو ناخۆشو بەردەڵان، شوێنێك

لەزەوی چاڵ بووبێ ٥ **جَعَّدَ الشَّعْرَ** وغيه: مووەکانی کۆکردنەوە ٥ **الجَعْدُ**: خڕ، دەگوترێ: (وجه جَعْدٌ) دەمو چاوی خڕو کەم گۆشتە ٥ **الجَعْدَةُ**: دانەوێڵەیەکی خۆرسکە.

**جَعَرَ** جَعْراً: تەبیاتی وشك بووە ٥ **تجَعَّرَ**: حەبلەکەی لەپشتی خۆی شەتەك داو چووە ناو بیرەکە ٥ **جَعَارِ**: ناوی کەمتیارە ٥ **الجِعَارُ**: جەبلێکە کەسێك دەرواتە ناو بیر لە پشتێنی خۆی شەتەکی دەدا ٥ **الجَعْرُ**: قشپل ٥ گوو پیسایی، درندەی خاوەن چنگ ٥ **الجُعرور**: جۆرە خورمایەکی بچوکی بێ کەڵکە ٥ دەعبایەکی بچوکە.

**جَعَسَ** جَعْساً: دایهێنا، هێنایە کایەوە ٥ **الجَعَسُ**: زبڵو زاڵ سەرەنگیوێلك ٥ **الجَعيسُ**: کەتەو زەلام ٥ **الجُعْسُوسُ**: کولەبنەو ناشیرین ٥ بێ رەوشتو نەکڵەوەت ٥ **الجُعْشُمُ**: کورتە باڵای شانو مل قەوی گردەبڕ ٥ **الجَعْظُ**: کەتەو زەلام، لوتبەرزو خۆبەزلزان لەخۆرازیو لەخۆبایی بوو.

**جَعَّ** فلان جَعّاً: فلانکەس گڵی خوارد ٥ **جَعَّ فلاناً**: گڵی تێگرت گڵی پی دادا.

**جَعَفَ** فلاناً: فلانکەسی بە عەرزی دادا، مالی بەزەوی دا ٥ **اجتَعَفَ الشجرةَ**: درەختەکەی هەڵکەند ٥ **الجَعْفُ**: کەم ٥ **الجَعْفَرُ**: جەم، رووبار ٥ حوشترێك شیری زۆر بێ ٥ **الجَعْفَرِيَة**: تاقمێکن لەشیعەی ئیمامی، شوێنکەتووی جەعفەری صادقن.

**جَعَلَ**: (جَعَلَ اللهُ الشَّيْءَ): خودا ئەو شتەی دروستکرد ٥ **جعل للعامل**: بۆ کرێکارەکە کرێی دیاریکرد ٥ **جَعِلَ الغُلامُ**: منداڵەکە کورتە باڵاو قەڵەو دەرچوو ٥ **جَعَلَ فلاناً ولە**: کرێی بۆ فلانکەس دیاریکرد.

**اجْتَعَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دروست کرد ٥ **تجاعلوا الشَّيْءَ**: شتەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد ٥ **الجِعَالُ**: ئەوکرێو پاساوەیە لەبری کاروەردەگیرێ یان بەرتیلە ٥ **الجَعَالَةُ**: ئەو کرێیەیە یان بەرتیلە کە لەجیاتی کارکردن دەدرێ ٥ **الجُعَلُ**: گیانلەبەرێکە وەکوو خونفوساء لە شوێنی شێدارو نەاویدا دەژی ٥ **الجُعَلُ** من الناس: ئادەمیزادی کولەبنەی رەشو زۆر بڵێو نیزاعکار.

**جَعِمَ** الرجلُ جَعَماً: پیاوەکە تەماعکاربوو زۆری هەڵپەکرد ٥ **جَعِمَ** الى الطعام: ئارەزۆی بۆ خۆراکەکە پەرەی سەندو زۆری حەز لێ کرد ٥ **اجْعَمَ الشَّيْءَ**: ئەو شتەی لەبێخ دەرهێنا.

**الجُعامُ**: دەردێکە تووشی حوشتر دەبێ ٥ **الجِعْمِيُّ**: ئادەمیزادی بەتەماعو چاوبرسی ٥ **الجَعُومُ**: تەماعکار لەشتێك کە تەماعی تێا بەکار نایە ٥ **الجَيْعَمُ**: برسی ٥ چاو چنوکێك هەرچی ببینێ حەزی لێ دەکا بیخوا.٥ **جَعَا** البَعْرَ ونحوه: قشپلی کۆکردەوە تا بوو بە کۆمەڵێکی گەورە.

**الجَعْوُ**: قوڕ ٥ ئەوەی کۆبکرێتەوە لە قشپلو تەپاڵە تا دەبێتە کۆمەڵێك ٥ **الجَعْوَلُ**: بێچوی نەعامە ٥ **الجغرافية**: زانیارییەکە تێیدا لێکۆڵینەوە دەکرێ دەربارەی دیاردە سروشتییەکانی رووبەری زەوی

**جَفَأَ** الزَّبَدُ: کەفەکە بەرز بوو ٥ **جَفَأَ القِدْرُ**: مەنجەڵەکە لەکاتی کوڵین دا کەفەکەی فڕێ دا ٥ **جَفَأَ الرجلَ**: پیاوەکەی بەزەوی دا ٥ **جَفَأَ القِدْرَ**: مەنجەڵەکەی سەرە نقون کردو بەتاڵی کرد ٥ **جَفَأَ** البَقْلَ والشَّجَرَ جَفْئاً: لە بێخەوە رووەکەکانو درەختەکانی هەڵکەندنو فڕێی دان ٥ **جَفَأَ** البابَ: دەرگاکەی داخست ٥ **الجُفاءُ**: ئەو کەفو

خشتو خۆڵو خاشاکیه لافاو یان مەنجەڵ دەری دەدا ◊ جفجف الثوب الجديدُ ونحوه: کراسە تازەکە خزیو خشەی هات ◊ کراسەکە وشك بۆتەوە هەندێ شەی تێدا ماوە ◊ جَفجفَ الموكبُ: کاروانەکە بەرێ کەوت خرمەخرمی قاچەکانیان دەبیسترا ◊ جفجفَ الماشيةَ: ئاژەڵەکانی کۆکردنەوە ◊ تَجَفْجَفَ الطائر: باڵندەکە خۆی فش کردەوە ◊ بەسەر هێلکەکانی دا کرکەوتو باڵی بەسەردا هێنان.

**جَفَخَ**: بەخۆی نازیو تەکەبوری کرد ◊ جَافَخَهُ: خۆی بەسەردا بادا، شانازی بەسەردا کرد.

**جَفَرَ** جفوراً: وازی لەئاو فرێدان هێناو جیماعی بۆ نەکرا ◊ جَفَرَ من المرض: لەنەخۆشییەکەی رزگاری بوو چاکبۆوە ◊ اجْفَرَ عنه: وازی لێ هێنا تەرکی کرد ◊ اجْتَفَرَ: لە ئاو فرێدانو جیماعکردن کەوت ◊ اجتَفَرَ الجَفْرُ: خۆی دارشت قەڵەو بوو ◊ الجَفْرُ: کاریلە یان بەرخۆڵەکە پێ بگاو ورگی پان ببێ ◊ علم الجَفْر: زانیارییەکە دەربارەی پیتەکان لەروی مانایانەوەو ئاماژەکردنیان بۆرووداوی رۆژگار ◊ الجفير: تیردان، یان کەشکۆڵێك لەتیردان گەورەتربێ لە پێست یان لە دار دروستکرابێ ◊ المُجْفَرُ: ئەسپو حوشتری ورگ زل ◊ الجِفْسُ من الناس: پیاوی خراپو بەد.

**جَفَشَ** الناقةَ: بەسەری پەنجەکانی حوشترەکەی دۆشی.

**اجفَأظَّ** الجيفةُ: لاشەکە هاوسا. ◊ الجَفْظُ: حەبلی کەشتی. ◊ الجفيظ: کوژراوی هەڵاوساو.

**جَفَّ** الشَّيْءُ: وشك بووە.

**جَفَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی کۆکردەوە. ◊ اجْتَفَّ ما في الاناء: هەرچی لە قاپەکەدا بوو خواردییەوە. ◊ تَجَفَّفَ الطائر: باڵندەکە خۆی فش کردەوە ◊ بەسەر هێلکەکانی دا خۆی کرکردو باڵەکانی بەسەردا دان. ◊ التَّجْفَاف: ئەو شتەیە شەرکەر لەبەری دەکا وەکوو زری، ◊ الجُفَاف: ئەوەی وشك بێتەوە لەو شتانەی وشك دەکرێنەوە. ◊ الجُفَافَةُ: ئەو گیاو گژەی وەکوو حەشیشە وایەو بڵاو دەبێتەوە.

**الجفُّ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد. ◊ الجُفُّ: شتی کلۆر ◊ الجُفَّةُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ◊ دوڵچەی بچوك کە دیزەیەك پڕبکا. ◊ الجفيف: گیای وشکەوە بوو پۆشو پەڵاش.

**جَفَلَ** جفولاً: هەڵات، هەڵسلەمییەوە ◊ جَفِلَ الشَّعْرُ: قژەکە ژاکاو تێکچوون. ◊ جَفلَ الفيلُ: فیلەکە پیسایی خۆی توڕدا. ◊ جَفَلَ البحر السمكَ: دەریا ماسییەکانی هەڵدایە کەنار. ◊ جَفَلَ الريحُ السحابَ: با هەورەکانی رادان. ◊ جَفَلَ الطيرَ وغيره: باڵندەکەی تەرمەکرد. ◊ جَفَّلَهُ: دەری کرد ◊ رای ماڵی ◊ تَجَفَّلَ الديكُ: کەڵەشێرەکە خۆی فش کردەوە ◊ الأَجْفَلُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ◊ الجُفَالُ: زۆرینە لە هەموو شتێك.

**الجَفْلُ**: ترسنۆك: کەسێکە لە هەموو شتێك بترسێ ◊ هەوری باراناوی ◊ الجَفْلَةُ من الشجر: درەختێکە گەڵای زۆری بێ ◊ خوری بڕاوە. ◊ الجُفُولُ من النساء: پیرەژنو ئافرەتی بەساڵا چوو.

**جَفَنَ** الطعامَ جَفْناً: خۆراکەکەی خستە ناو تەشتەکەوە ◊ جَفَنَ: تەشت (سوێنە)ی دروستکرد ◊ الجَفْنُ: پێڵوی چاو ◊ جَفْنُ الماء: هەور. ◊ الجَفْنَةُ: تەشت، سوێنە ◊ بیری پچوك.

**جفا** فلان: فلانکەس تەبیاتی توندو تیژی بوو، رەوشتی ناشیرین بوو. ◊ جفا الشَّيْءُ عليه: شتەکەی

لەسەر قورس بوو. ٥ جفا الشَّيءُ: شتەکەی دوور خستەوە توڕی دا.

**جفي** البَقلَ: رووەکەکەی دورخستەوە. ٥ **أجفى الماشيةَ**: ئاژەڵەکانی لێ خوڕین بێ رەحمانە راوی نان. ٥ **تجافى في سجوده**: لەکاتی سوژدە بردندا قوڵەکانی لەکەلەکەو ورگی و لەرانی دورخستەوە. ٥ **استَجْفَاهُ**: بەوشک تەبیاتی لەقەڵەمدا. ٥ **الجُفَاءُ**: ئەو کەف و خشت و خاڵەیە مەنجەڵ یان لافاو بەملاو بەولای خۆیدا دەیهاوێ.

**جَلَبَ** جَلباً وَجَلَباً: هەراو هۆریای بەرپاکرد. ٥ **جَلَبَ الجُرحُ**: برینەکە گۆشتە وەزونی هێنایەوەو قەتماغەی بەست. ٥ **جَلَبَ عليه**: تاوانی کرد ٥ **جَلَبَ الشَّيءَ**: شتەکەی لە شوێنێکەوە گواستەوەو بۆ شوێنێکی تر ٥ **جَلَبَ على الفرس**: کەمێ ئەسپەکەی هێواش کردەوە بۆ ئەوەی بازبدا. ٥ **أَجْلَبَ الدمُ**: خوێنەکە وشک بووە ٥ **أجْلَبَ**: یارمەتی داو کۆمەکی پێ کرد. ٥ **جَلَّبَ القومُ والرعدُ والغيثُ**: خەڵکەکە، هەورەکە، بارانەکە: دەنگیان لێ هات. ٥ **تَجَلَّبَ**: بەشوێن لەوەری خۆشدا گەرا. ٥ **الجالبةُ**: بەڵاو کارەسات.

**الجَلَب**: جەلەب: کۆمەڵە خوشتر یان رەشە وڵاخ و مەرو زن کە دەبرێن بۆ فرۆشتن ٥ **الجُلُبَّانُ**: هەمبانەیەکە کیفێکە لە پێست دروست دەکرێ بۆ ئەوەی شمشێری ناو کالانی تێدا هەڵگیرێ ٥ **الجُلْبَةُ**: ئەو توێکڵەیە لەکاتی چاکبونەوەی بریندا دەکەوێتە سەر برینەکە ٥ **الجلوبَةُ**: هەرشتێك لە دەرەوەی وڵاتەوە بهێنرێ بۆ بازرگانی پێ کردن ٥ **الجَليبُ**: شتی هێنراو، ٥ **الجليبةُ**: شتی هێنراو. ٥ **جَلْبَبَهُ**: جیلبابی لەبەرکرد. ٥ **الجِلْبابُ**: کراس ٥ کراسی ناودامان، جزداشە ٥ سەرپۆش ٥ کەوا ٥ باڵتۆ ٥ عەبای ئافرەت.

**جَلْجَلَ** السحابُ وَالرَّعدُ: هەورەکە گرمەو لەرەی کرد.

**جَلْجَلَ** الفرسُ: ئەسپەکە حیلەی خۆش بوو گڕی تێدانەما.

**جَلْجَلَ** الشَّيءَ: شتەکەی جوڵاند لەئاکامی جوڵاندنەکەیدا دەنگێکی بەهێزی لێهات ٥ **الجُلاجِلُ**: دەنگی بەهێزی بێ گرێ و گۆڵ ٥ مناڵی روح سوکی وریا لەئیشی خۆیدا. ٥ **الجَلْجَالُ**: دەنگی بەهێز ٥ **الجُلْجُلانَ**: کونجی کە لە توێکڵەکەی دایەپێش دروێنەکردنی دانەوێڵەی گژنیژە ٥ ناخی دڵ. ٥ **الجُلْجُلُ**: زەنگی بچوك ٥ کاری گەورەو بچوك. ٥ **المُجَلْجِلُ**: پیاوی ئازاو رەکابەرو زیرەك و بەدەم و پل ٥ فەرمانڕەوای بەهێز ٥ پیاوی رێك و پێك و نەجیب زادە.

**جَلَحَ** الحيوانُ النبتَ والشجرَ جَلحاً: ئاژەڵەکە رووەکەکەی خوارد درەختەکەی خوارد ٥ سەرەتەرزەو سەرانسەرەکەی خوارد.

**جَلِحَ** اليومُ: رۆژەکە سامناك بوو زۆر ناخۆش و پڕ کارەسات بوو. ٥ **جَالَحَهُ**: بەر بەرەکانی کرد لێی هەڵگەڕایەوە ٥ **جَلَّحَ في الأمر**: لەوکارەدا هەرای خۆی پەسەند دەکاو بەقسەی کەسی تر ناکا ٥ لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو. ٥ **الأجْلَحُ**: ئاژەڵی کۆڵ؛ حەیوانێك شاخی نەبێ ٥ بانێك سیاجی نەبێ ٥ **الإجْلِيحُ من النبت**: ئەو گیاو گژەیە سەرەکەی خورابێ. ٥ **الجُلاَحُ**: لافاوی بەهێز کە هەموو شتێك رادەماڵێ. ٥ **الجَلْحَاءُ**: ئاژەڵی کۆڵ (بێ شاخ) ٥ گوندێك شورەی نەبێ زەوی بێ درەخت، ٥ **المِجْلاحُ**: ساڵێکی گرانی کە هیچ ماڵ و سامانێك ناهێڵێ.

**جَلَخَ** الشَّيءَ: شتەکەی درێژکردەوە ٥ **اجْلَخَّ**: بێ هێز بوو، ئێسقانی جەستەی پۆڵکان توانای هەڵسانی نیە ٥ **الجُلاَخُ**: لافاوی شت رادەر ٥ شیوی قوڵ. ٥

اَلجَلَخُ: بەردە هەسان ٥ الجِلخُ: دەنگی ئاو خورەخورِی ئاو.

جلَدَ به الأرض: پێستەکەی بەزەوی کێشا. ٥ جَلِدَت الأرض: زەوییەکە سەهۆڵبەندانی تێدا پەیدا بوو.

جَلَدَهُ بالسیف: بەشمشێر لێی دا ٥ جَلَّدَ النبیحةَ: کوشتییەکەی کەوڵکرد ٥ پێستەکەی لێ داماڵی. ٥ الأجْلَدُ: زەوی رەقو سەخت.

الجِلدُ: پێست، ٥ الجَلَدُ: شتێکە لە پەرۆو پاڵ دروست دەکرێ لەسەر شێوەی بێچوە حوشتر حوشترەکەی پێ هەڵدەخەڵەتێنن بۆ ئەوەی شیر بدا. ٥ الجِلدَةَ: پارچەیەك لە پێست. ٥ جَلَدَة الرجل: هۆزو عەشیرەتی پیاو. ٥ الجَلّاد: جەلاب؛ ئەو یاساوڵو دەستو پێوەندانەن کە هەڵدەستن بەکاری لێدانو کوشتنی ئەوانەی دژی ناغاکەیانن ٥ المِجْلادُ: شورك، گورز ٥ پارچەیەك پێست یان پەرو کە ئافرەتی شینو شەپۆرکەر پێی لەخۆدەدا. ٥ المُجَلَّدُ: جەستەی بێ گۆشت ٥ إجلَوَّذَ: تێپەڕیو کاتی دواکەوتنی بارینی باران بەردەوام بوو. ٥ إجلوَّذَ بە السیرُ: رۆیشتنەکەی بەشێوەی خێرایی بەردەوام بوو.

جَلَزَ الشَّئَ: شتەکەی پێچایەوەو توندی کرد. ٥ جَلوَزَ الشرطيُ: پۆلیسەکە بەهێواشی هاتو چۆی کرد. ٥ الجِلازُ: هەرشتێك بەسەر شتێکی تردا خوار بکرێتەوەو تێوەی بپێچرێ. ٥ الجِلوَزُ: پیاوی کەتەو ئازا: درەختی بندوق ٥ پۆلیس. ٥ اَلمَجَلوزُ: پیاوی گۆشتنو شانو مل قەوی ٥ راپەسەندو ئاقڵ.

جَلَسَ جلوساً: دانیشت ٥ جَلَسَ الشَّئُ: شتەکە مایەوە. ٥ جَالَسَهُ: لەگەڵی دانیشت ٥ تجالَسُوا: خەڵکەکە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان دانیشتن. ٥ إستَجلَسَهُ: داوای لێکرد دابنیشێ. ٥

الجِلسُ: هاونشین، گێلی تێنەگەیشتوو. ٥ اَلجَلسَةُ: یەك دانیشتن، کۆبوونەوەی کۆمەڵێك خەڵك بۆ قسەکردنو بریاردان لەسەر پرۆژەیەك ٥ اَلجَلَسَةُ: کەسێك زۆر دانیشتبێ ٥ الجِلسِيُ: دەوروبەری گلێنەی چاو. ٥ اَلجُلَّسَانُ: گوڵی سپی، یان گوڵی هەڵوریو. ٥ الجِلّیسُ: هاونیشین ٥ زۆر دانیشتو. ٥ اَلمجلِس: شوێنی دانیشتن.٥ جَلَطَ الرجلُ جَلطاً: درۆی کرد ٥ سوێندی خوارد. ٥ جَلَطَ الشَّئَ عن الشَّئَ: شتەکەی لەو شتە داماڵی، روتی کرد ٥ کوشتی یەکەی کەوڵ کرد ٥ سەری تاشی ٥ تَجلَطَ الدمُ: خوێنەکە لەنێو دەمارەکاندا یان لە دەرەوە خەست بووە. ٥ اَلجُلطَةُ: باقی ماندەی ماست لەقاپدا ٥ پارچەیەك لەخوێن.٥ جَلَعَ جلوعاً: بێ شەرمو حەیابوو قسەی ناشیرینی کرد. ٥ جَلِعَ الشَّئَ: شتەکەی دەرخست، ئاشکرای کرد. ٥ جَالَعَ فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس کرد بەشێوەی ناشیرین ولامی دایەوە. ٥ تجالَعُوا: بەمانا کێشەیان تێکەوتو یەکتریان بەجوێن داشت ٥ اَلجَلیعُ من النساء: ئەو ژنەیە لەلای مێردەکەی خۆ دانەپۆشێ ٥ جَلَفَهُ جَلفاً: بەمانا راماڵینو رادان دێ.

جَلَفَ الذبیحةَ: کوشتییەکەی گرو پێستەکەی کەند. ٥ جَلَفَ الجُلاَفَ: سەری کۆڵینەو کۆپەکەی لابرد. ٥ اجْلَفَ الرجلُ: پیاوەکە سەرقاپی کۆڵینەو کوپەکەی دوور خستەوە. ٥ الجالِفَة: ئەو ساڵەیە ماڵو سامان بفەوتێنێ ٥ برینێك گۆشتەکە بدرێو نەگاتە ناوەوە. ٥ الجُلفَةُ: ئەو شتەیە سپی کرابێ کەوڵ کرابێ توێکڵی لێ کرابێتەوە. ٥ اَلجِلیفُ من الرجال: پیاوی چروك، ٥ جَلفَطَ السفینةَ: لەوحەی کەشتییەکەی لێك

بەستن‌و درزەکانی بەقیرۆشتی واپرکردەوە ◊ **اَلْجَلْفَـقُ**: ئـەو ئاسـن‌و دارەیـە لـەملاو لـەولای پەیـژەو قالدرمـە دەچەسـپێنرێن بـۆ ئـەوەی کەسیان لێ بەرنەبێتەوە (محەجەرە).

**جَلَقَ** الـشَّيْءَ جَلقاً: پەردەی لەسەر لادا ◊ **تَجَلَّقَ**: پێکـەنی بـەجۆرێك کـە دوا خرێـی نـاودەمی دەرکـەوت. ◊ **الجُلاّقـَـةُ**: تۆزقالێـك، ◊ **الجِلِّـقُ**: دانەوێلەیەکـە وەکـوو گـەنم وایـە ◊ **اَلْجَوَالِـقُ**: جەوال، ◊ **اَلْمَنْجَلِيـقُ**: مەنجەنیق ئـامرێکی شـەڕە بەردی پێ هەلدەدرێ بۆ شوێنی دوور.

**جَلَّ** الدابّةَ: جلی خستە سەرپشتی ولاغەکە. ◊ **جَلَّ** جلالاً وجَلالَةً: گەورەو شکۆ مەنـد بـوو، ◊ **أجَـلَّ** فلاناً: فلانی بەگەورە داناو رێـزی لـێگرت ◊ **أجَـلَّ الشَّيْءَ**: گشتگیری کـرد ◊ هـەموانی بـوو ◊ **جَلَـلَ** الدابَّةَ: جلی لە ولاغەکرد. ◊ **تَجالَّ فلان**: فلانکەس کەوتە سالەوە پیربـوو. ◊ **تَجَالَّ فلاناً**: فلانکەسـی بەگەورە داناو رێزی لێ گـرت. ◊ **تَجَلَّلَ** بـە: خـۆی پێ داپۆشی ◊ (تَجَلَّلَ الـشَّيْءَ) زۆربـەی شـتـەکەی وەرگـرت ◊ **إجـلال**: خـاترو خـوایش، ◊ **الجالـةُ**: کۆمەلـە خەلـکێك کـە تـازە هاتبنـە ولاتێـك ◊ **الجَـلاَلُ**: بـەمانا خـاترو خـوایش دێ ◊ **الجُـلالُ**: زۆرینـەی هـەموو شـتێك.◊ **الجُـلُّ**: سـەرجل‌و پەشمەك‌و خێمەیە کە ولاغی پێ دادەپۆشرێ.

**الجِـلُّ**: گـەورەو مـەزن ◊ پێـچەوانەی (الـدِقّ) دێ ◊ **الجَلَـلُ**: شـتی گـەورەو کـاری مـەزن‌و پـیرۆز ◊ **الْجِلَّـةُ**: ئامێرێکـە بـۆ خورمـا لێکردنـەوە. ◊ **اَلْجُلَّی**: کاری ناخۆش‌و چورتم‌و تەنگانەو بەلای گەورە ◊ **اَلْجَلاَلَـةُ** مـن الماشیة: ئەومیـە قـشپل‌و شیاکە بخوا. ◊ **الجليل**: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خـودا ◊ **اَلْجَلْمَـدَةُ** مـن الأرض: زەوی بـەردەلان ◊ **الجِلْمَـاقُ**: ئـەو سـپرەو چـەرمەیە کـەوانی پـێ بپێچرێ، ◊ **اَلْجَلْمَـقُ**: خێـوەت، ◊ **اَلْجُلْنَـارُ**: گـولی درەختی هەنار.

**جَلَهَ** الـشَّيْءَ: شتەکەی ئاشکرا کرد. ◊ **جَلَـهَ** العَمَامَـةَ: میزەرەکەی لە پێشە سەری بـەرزکردەوە. ◊ **جَلِهَ** جَلَهـاً: ناوچـەوانی پـان‌و گـەورە بـوو ◊ **الأجْلَـهُ**: کەلەگای بێ شاخ. ◊ **اَلْجَلْهَةُ**: بەردی گەورەی خڕ ◊ **اَلْجِليهَـــةُ**: خورمــا ناوکەکـەی دەرهاتبـێ‌و بەماست یا بەرۆن تێکەل بکرێ.

**جَلْهَزَ**: چاو پۆشی لەو شتە کردو شاردیەوە.

**الجُلاَهِقُ**: قوری خڕی لوسکراوی سواوە، کەلاگلێنـە، ◊ **اَلْجَلْهَـمُ**: رووەکێکـە لـە پێـڕی نەبگەکانـە. ◊ **الجُلْهُمُ**: بەردی گەورە تاوێرە بەرد.

**جلا** القومُ عن الوطن ومنه: خەلکەکە لە برسان یان لەترسان نیشتمانیان جێ هێشت ◊ **جلا** الأمـرُ: کارەکە ئاشکرا بوو دەرکەوت. ◊ **جلا** فـلان عينـه: فلانکـەس چـاوی خـۆی رشـتن.◊ **جَـلا** النحـلَ: دوکەلی بەسەر هەنگەلانەکەدا کـرد قـانگی دان بۆ ئەوەی هەنگوێنەکە ببڕێ.

**جَلا** الـسيفَ: مشت‌و مالی کرد ◊ **جلا** الزوجُ عروسـه: زاواکە سەیری بوکەکەی کرد بـەرازاوەیی. ◊ **جلا** الأمْرَ: شتەکەی ئاشکراکرد.

**جَلَـــي** الـسيفَ والفـضة: ژەنـگ‌و چلـکەکەی لێ کردنەوەو مشت‌و مـالی کـردن. ◊ **جليت الـسماءُ جَلِّي**: ئاسمان هەساو بوو ◊ **أجْلى القومُ عن المكان** ومنـه: خەلـکەکە لـەو شـوێنە دەربـەڕین لـە ترسان یا لە بەر قات‌و قـڕی. ◊ **أجْلَى الناسُ عـن الـشَّيْءَ**: خەلـکەکە لـەو کارەسـات‌و چـورتمە رزگاریان بوو. ◊ **أجْلَى عنه الْهَمَّ**: خەم‌و خەفەتی لەدل دەرهاویشت.

**جَلَّي** الفرسُ: لەرەبازیدا ئەسپەکە پێش کـەوت. ◊ **جلِي** ببصره: چاوی تیژی‌و سەیری کـرد ◊ **جَلَّي**

عن نفسه: بیرو رای خۆی دەربڕی. ٥ اجْتَلَى القومُ عن الموضع: ئەو نەتەوە لەو شوێنە دەرچوون و بلاوەیان لێکرد. اجتلى الشَّيْءَ: سەیری شتەکەی کرد. ٥ اجتلى العروسَ بَعْلُها: مێردەکە سەیری ژنەکەی خۆی کرد لەکاتێکا رازێنرابۆوە. ٥ اجْتَلَى السَّيْفَ: شمشێرەکەی مشت و مال کرد. ٥ اجتلى العمامة عن رأسه: مێزەرەکەی لەسەری کردەوە. ٥ تَجَلَّى الصقرُ: هەڵۆکە چاوی نوقاندن و پاشان کردنیەوە ٥ اجْلَوْلَى: لەولاتێکەوە رۆیی بۆ ولاتێکی تر. ٥ الأجلى: روخسار جوان ٥ الجالية: ئەو کەسانەی لەولاتی خۆیان دەرچوون و کەوتوونە ولاتێکی تر. ٥ الجَلاءُ: کاری ئاشکرا ٥ شایەت و بەڵگە لەدادگادا ٥ کلە سوبحانی ٥ الجِلاءُ: کل (کلە سوبحانی) ٥ الجِلْوَةُ: رازاندنەوەی بوک ٥ الجَلِيَّةُ: هەواڵی راست، راستی رووداو. ٥ المَجَالي: شوێنی روتانەوەی سەر ئەو شوێنەی لەسەر تووکی پێوە نەمابێ.

**جَمِئَ** على فلان: رقی لەفلانکەس هەڵسا ٥ تَجَمَّأَ القومُ: قەوم و خوێش کۆبوونەوە. ٥ تجمأ على الشَّيْءَ: خۆی بەسەر شتەکە دا داو دایپۆشی. ٥ المُجَمَّأُ ((فرس مُجَمَّأٌ)): ئەسپێکە پەڵەسپی ناوچاوانی درێژە. ٥ الجُمْبازُ: جۆرە یارییەکی وەرزشە. ٥ جمجم فلان: فلانکەس قسەکەی خۆی رون نەکردەوە هەرمینگە مینگی بوو. ٥ جمجم كَلامَهُ: قسەکانی بە توێکڵ کردن. ٥ جمجم فلاناً: فلانکەسی بەهیلاك برد. ٥ الجُمْجُمَةُ: ئێسقانی سەر کە مێشکی لەخۆ گرتووە. ٥ جَمَحَ الفَرَسُ: ئەسپەکە سەرکەش بوو بەویستی خاوەنەکەی رەوی نەکرد، ٥ جَمَحَ الرجلُ: پیاوەکە هەر بەقسەی خۆی کرد ٥ جَمَحَتِ السفينةُ: کەشتییەکە لەرێرەوی خۆی لایداو کەشتییەوانەکان نەیان توانی کۆنترۆڵی بکەن. ٥ جَمَحَتِ المفازَةُ بالقوم: بیابان و سارایە کە بەهۆی دووری و بەرفراوانییەوە ئەو هۆزەی بەهیلاك برد. ٥ جَمَحَتِ المرأةُ من زوجها: ژنەکە لەماڵەوە بەرق هەڵساوی هاتە دەرەوەو رۆیشتەوە بۆ ماڵی باوانی ٥ الجُمَاحُ: تیروکەوانی بێ سەرەتیر، ٥ الجُمَحْلُ: گیانلەبەری ناو صەدەف. ٥ جَمَخَ جَمْخاً: لوتبەرزی نواندو خۆی بەمزلزانی و شانازی کرد ٥ جَمَخَ الصَّبِيَ: منداڵەکە بازی هاویشت. ٥ جَمَخَ الخيلَ: ئەسپەکەی تاودا تۆپەکەی هاویشت. ٥ جَمَخَهُ: شانازی بەسەردا کرد. ٥ جَمَدَ الماءُ والسائلُ: ئاوەکە بەستی شلەمەنییەکە رەق بوو ٥ جَمَدَتْ عينه: چاوی بێ فرمێسك بوو ٥ جَمَدت الناقةُ أوالشاةُ: حوشترەکە یان مەڕەکە شیری کەم بوو ٥ جَمُدَتِ الأرضُ: زەوییەکە بارانی لێ نەباری. ٥ جَمدت السَّنةُ: ساڵەکە بێ باران بوو ٥ جَمُدَ فلان: فلانکەس دەس قوچاو بوو ٥ جَمُدَ حق فلان: مافی فلان چەسپا. ٥ الجامِدُ: سنووری نێوان دوو پارچە زەوی یان دوو خانوو، ٥ الجَمْدُ: سەهۆڵ. ٥ الجَمَدُ: بەمانا (الجَمْدُ) دێ ٥ الجُمُدُ: گردۆڵکەی رەق و سەخت لە زەوی، ٥ جُمَادي: یەکێکە لەمانگە عەرەبییەکان دوو مانگ هەن ناویان (جمادی)یە (جمادی یەکەم)و (جمادی دووەم). ٥ الجُمَّادُ: (سیف جُمَّادٌ): شمشێرێکی برندەیە. ٥ جَمَرَ الفرسُ: بە پێوەندەوە ئەسپەکە بازی دا. ٥ أجْمَرَ القومُ: قەوم و خوێش کۆبونەوە. ٥ أجْمَرَ ثوبَهُ: پۆشاکەکەی گوڵاو پژێن کرد. ٥ أجْمَرَت المرأةُ: ئافرەتەکە قژەکانی لەپاشە سەری داکۆکردەوەو

لەدواوە توند بەستیو بەری نەدانەوە. ٥ أجْمَرَ الأمرُ بنی فلان: ئەو کارە هەموو خێڵی فلانی گرتەوە. ٥ أجْمَرَ الخَیْلَ: ئەسپەکەی لاوازکرد وای لێ کرد ورگی بچوك بووە. ٥ جَمَّرَ القومُ: خزمو خۆیش کۆبوونەوە. ٥ جَمَّرَ الحاجُ: حاجی رەجمی شەیتانیان کرد. ٥ جَمَّرَ الشَّیْئَ: شتەکەی کۆ کردەوە. ٥ جَمَّرَ اللَحْمَ أو الخُبْزَ: گۆشتەکە یان نانەکەی خستەسەر پشکۆ ئاگر. ٥ جَمَّرَ الثوبَ: کراسەکەی بوخار پژێن کرد. ٥ تَجَمَّرَ القومُ: خزمو قەوم کۆبونەوە. ٥ تَجمَّرَ الجَیْشُ: سوپاکە لەبەرەی جەنگدا قەتیس ما. ٥ استَجْمَرَ القومُ: قەومەکە کۆبوونەوە. ٥ استَجْمَرَ الرجلُ: پیاوەکە بە بەرد خۆی پاك کردەوە. ٥ الجَمَارُ: کۆمەڵو جەلەب جەلەب ٥ الجَمْرَةُ: پشکۆ ئاگر ٥ الجُمَارُ: ناوەرۆکی دارخورما ٥ الجَمْیُ: کۆمەڵگای گەلو نەتەوە ٥ ابن جمیر: شەوی زۆر تاریك ٥ مانگی یەکشەوەی ون. ٥ الجمیرة: زولف کە دەهۆندرێتەوە. ٥ المِجْمَرُ: مقەلی، ئاگردان ٥ المُجْمَرَ: بخور؛ بخورد. ٥ الجمرك: گومرگ وشەیەکی (تورکی)یە.

**جَمَزَ** الفرسُ: ئەسپەکە بە گورگە لوقە رۆیی، ٥ جَمَزَ الانسانُ: بەپەلە رۆیی. ٥ جَمَزَ فلان في الأرض: رۆیی بەناو زەویدا. ٥ جَمَزَ فلان بە: گاڵتەی پێکرد. ٥ الجُمْزُ: باقی ماندەی لاسکی هێشوە خورما، ٥ الجَمَّازُ من الدواب: ولاغی خۆشڕۆو بەرابەر. ٥ الجُمَّازَةُ: جبەیەکە لەخوری دروستکرابێ قۆڵەکانی تەسك بن ٥ الجَمَّازَةُ: نامێرێکە بۆ سواربوونو شت گواستنەوە لە شێوەی عەرەبانەدا ٥ الجُمَّیْزُ: جۆرە درەختێکە میوەکەی دەشوبهێتە هەنجیر.٥ جَمَسَ النَبْتُ: رووەکە ناسکیو تازەییەکەی نەماو رەق بوو ٥ الجاموس: گامێش ٥ الجُمْسَةُ: خورمای وشك ٥ خورمای تازە پێگەیشتووی کەشیرین نەبووبێو نەرمیش نەبووبێ ٥ جَمَشَ رأسَهُ: سەری خۆی تاشی ٥ جَمَشَتْ النورةُ الشَّعْرَ: داڕووەکە مووەکانی هەموو لێکردنەوە. ٥ جَمَشَ الضرعَ: بەسەری پەنجە گوانەکەی دۆشی. ٥ جَمَشَ المرأة: دڵداری لەگەڵ ئافرەتەکە کرد ٥ الجَمُوشُ: داروی مولێکردنەوە ٥ الجَمیشُ: داروی روتێنەرەوە ٥ شوێنێك گیای لێ نەڕوێ.

**جَمَعَ** المتفرق: شتەکانی کۆکردنەوە. ٥ جمع الله القلوبَ: خودا دڵەکانی یەکدیگیرکردن ٥ جَمَعَ القومُ لاعدائهم: ئەو قەومە خۆیان حازر کرد بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن ٥ جَمَعَ أمْرَهُ: بڕیاری لەسەر کاری خۆیدا. ٥ جَمَعَ علیه ثیابَهُ: پۆشاکەکەی لەبەرکرد. ٥ اجْمَعَ القومُ: خەڵکەکە یەکیان گرتو رای خۆیان کرد بەیەك. ٥ اجمع المُتَفَرِقَ: شتە بڵاوبووەکانی کۆکردەوە. ٥ أجمع الأمْرَ: کارەکەی توندو تۆڵو پتەو کرد ٥ اجْمَعَ الأمر وعلیە: بڕیاری لەسەردا نیازی خۆی یەکالا بکاتەوە ٥ أجْمَعَ الشَّیْئَ: شتەکەی حازر کرد ٥ أجْمَعَ فلاناً: فلانکەسی وەگری خۆی کرد. ٥ أجْمَعَ المطر الأرض: بارانەکە بەسەر زەویدا باریو ئاو رەوان بوو ٥ جَامَعَ المرأةَ: کاری سەرجێی لەگەڵ ژنەکەدا کرد. ٥ جَمَّعَ الناسُ: خەڵکەکە ئامادەی ئەنجامدانی نوێژو مەراسیمی جومعە بوون. ٥ جَمَّعَ المتفَرقَ: شتە بڵاوەکانی کۆکردەوە. ٥ اِجْتَمع الرجلُ: ریشی پڕبووە، گەیشتە توێەڵاکی گەنجییەتی. ٥ اجتَمَعَ الماشي: پیادەکە پەلەی کرد لە رۆیشتندا ٥ تَجَمَّعَ: هەندێ لەشتەکان پاڵیان دایە پاڵ شتەکانی تر. ٥ استجمعَ السیلُ: لافاوەکە لەهەموو لایەکەوە کۆ بووەوە ٥

**استجمعَ للجري أو الوثوب**: خۆی گیفداو خۆی ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن یان بۆ بازدان ◊ **استجمع لـه أمـره**: هـەموو کـارە دڵخۆشـکەرەکانی بـۆ دەسـتەبەر بـوو ◊ **الاجماعُ**: یەکـدیگیربوون‌و ڕێککـەوتنی کۆمـەڵێکی تایبـەتی یـان هـەموو کـەس لەسـەر کـارێکی تایبـەتی، ◊ **الاجتمـاع**: زانـستی کۆمەڵایـەتی ◊ **الجامِعُ**: ناوێکـە لـەناوە جوانەکانی خودا ◊ مزگەوتێك کەنوێژی هەینی تێدا ئەنجام بدرێ ◊ **کلام جامع**: دەق‌و قسەیەکە وشـەکانی کـەم‌و ماناکـانی جـوان‌و زۆرن ◊ **الجامعة**: زنجیرێکە دەست‌و مل پێکەوە دەبەستێ ◊ کۆمـەڵێك کۆلێـژو پـەیمانگای خوێنـدن‌و زانستین ئاداب‌و زانیاریـان تێدا دەخوێنـدرێ‌و دەگوترێتەوە. ◊ **قدر جامعة**: مەنجەڵی گـەورە ◊ **الجَمَاعَةُ**: ژمارەی زۆر لە ئادەمیزاد لـە درەخـت‌و رووەك ◊ **الجماعيَّة**: لەزاراوەی ئـابوری سیاسیدا، بریتییـە لـە رێبـازێکی سۆشیالیـستی، **الجَمْـعُ**: کۆمـەڵ، کۆبووەکـان ◊ سـوپا ◊ **الجُمْعَـةُ والجُمُعَـةُ والجُمَعَةُ**: رۆژی هـەینی ◊ **الجُمَاعُ مـن کـل شـيئ**: بنکەو سەرجەمـسەری هـەموو لق‌و پۆپـەکان ◊ **الْجَمعِيَّةَ**: کۆمەڵێك یەکدەگرن بـۆ مەبەسـتێکی تایبەتی‌و بیرو هزرێکی هاوبەش لە نێوانیاندا ◊ **جميـع الـسلاح**: کۆکـەرەوەی چـەك ◊ **الْمُجْتَمَـعُ**: شوێنی کۆبوونەوە ◊ **المَجْمَعُ**: شوێنی کۆبوونـەوە ◊ **المجمـوع**: کـۆ ◊ ئاکـامی لێکـدانی چـەند ژمارەیەك.◊ **جَمَلَ** الـشَّيْئَ جَمْـلاً: لەشتە بڵاوە بووەکان ئەوەی کۆ کردۆتەوە. ◊ **جَمَـلَ الـشَّحْمَ**: بەزو پیوەکەی توانـدەوە. ◊ **جَمَلَ جَمالاً**: شـێوەو روخساری جوان بـوو ◊ **أجْمَـلَ**: حوشـترەکانی زۆر بـون ◊ **أجْمَـلَ الـشَّحْمَ**: بەزوپیوەکـەی توانـدەوە◊ **أجْمَلَ الحساب**: ژمارەکـانی حیـسابی کـۆکردەوە◊ **أجْمَـلَ الکـلامَ**: قـسەکەی بـەکورتی رانوانـدو شتەکەی دەربـڕی، ◊ **جَامَلَـهُ**: بـەجوانی هـەڵس‌و کـەوتی لەگەڵـداکردو بـەپیر داخوازییەکانیـەوە چـوو ◊ **جَمَّلَـهُ**: جـوانی کـردو ئارایـشیدا ◊ **جَمَّـلَ الأمـيرُ الجـيشَ**: فـەرمانڕەوا سـوپاکەی لەبـەرەی شەڕهێـشتەوە ◊ **اسْـتَجْمَلَ الـشيئ**: شـتەکەی بەجوان لەقەڵەمدا. ◊ **الجامِـلُ**: جەڵەبـە حوشـتر لەگەڵ شوان‌و بارو بارگەنەکەیدا. ◊ **رجل جامل**: پیـاوێکی خـاوەن حوشـتر. ◊ **الجَمَـالُ**: بـەلای فەیلەسـوفەکانەوە صـیفەتێکە لـە شـتەکاندا دەبینـدرێ‌و دڵخـۆش دەکـاو رەزامەنـدی وەدی دێنێ. ◊ **الجُمَالُ**: کەسێك شتێك زۆر جوان بێ لـە جوانیـدا بێ وێنەبێ◊ **الجَمَلُ**: حوشتری گـەورە ◊ **الجَمَلُ**: حـەبلی ئەستور، جۆرە ماسی یەکـە. ◊ **الجُمَلُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد. ◊ **الجُمْلانَةُ**: بولبـول. ◊ **اَلْجُمْلَةُ**: لەلای زانایانی بەلاغـەو نەحوییـەکان رستەیەکە موسنەدو موسنەدو ئیلـەیهی تێدابێ موبتـەداو خەبـەری لـەخۆگرتبێ. ◊ **الجَمَلُـونُ**: هەڵاشـێکی کەوانەییـە لـە شـێوەی دوگـی حوشـتردایە. ◊ **الجَمَـالُ**: خـاوەنی حوشـتر، شـوانی حوشتر، ◊ **الجُمَّـالُ**: زۆر زۆر جـوان‌و قەشـەنگ. ◊ **اَلْجُمَّـلُ**: حـەبلی ئەسـتور. ◊ **الجُمَّيْـلُ**: بولبـول. ◊ **الجَمُولُ**: ئافرەتی قەڵەوو گۆشـتن ◊ **اَلْمُجْمَـلُ مـن الکلام**:رستەی کورت◊ جَمَّ جموماً: کۆبووەوە، زۆر بوو ◊ جَمَّ الفرسُ: ئەسپەکە پشویداو حەسایەوە هێـزی پەیـداکردەوە. ◊ جَـمَّ العظـمُ: گۆشـتی زۆربـوو ◊ جَـمَّ الرجـلُ جَمَّـتِ المـرأة: گۆشـتیان زۆربـوو قەڵـەو بـوون ◊ جَـمَّ الکـبشُ والنعجـةُ ونحوهمـا: بەرانەکـە یـان نێریەکـە کـۆڵ بـوون؛ شاخیان نـەبوو ◊ جَـمَّ البنـاءُ: باڵەخانەکـە بـەبێ بارکۆن‌و سوێبان بوو◊ جَمَّ الـسَّطحُ: سـەربانەکە بەبێ سیاج‌و شورا بوو ◊ **أجَمَّ الفراق**: کـاتی لێـك جیابوونـەوە هـات. ◊ **جَمَّـمَ النبـاتُ**: روەکەکـە

لەخۆکەوتو پەڵو پۆی کردن. ٥ جَمَّعَت المرأة: ئافرەتەکــە قــژەکانی کۆکردنــەوەو کــورتی کردنـەوە بـۆ ئـەوەی وەکـوو پیـاو بـچێ. ٥ جَمَّمَ الإناءَ والمِكيالَ: قاپەکەو پێوەرەکەی پـڕ کـرد. ٥ تَجَمَّمَ النبت: ڕوەکەکە لەخۆکەوتو پەڵو پۆیی کـردن. ٥ اسـتجمَّ: کۆبـووە، زۆر بـوو. ٥ اَلْجَمَامُ: پشودان‌و ئستیراحەت. ٥ الجُمَامُ: پڕکردنی قـاپو مەنجـەڵو شـتی وا ٥ الجَـمُّ: زۆرینـە زۆر لـە هـەموو شـتێك ٥ الجَمَـمُ: زۆرو کۆبـووەوە لـە هـەموو شـتێك ٥ الجَمَـاءُ: هێلکـەی سـەر، کاسـە سەر، ٥ اَلْجُمَّانِي: کۆبـووەوەی قـژی پێشەسەر ٥ اَلْجَمُومُ: زۆرو کۆبووەوە لە هەموو شتێك، گیـاو گژی زۆر، ٥ اَلْجَمِيمُ: زۆرو کۆبـوەوە لـە هـەموو شتێك.

اَلْجُمَّ: شـوێنی ڕاوەسـتانی ئـاو ٥ سـنگ ٥ اَلْجُمَّـانُ لوئلـوء: دەنکـە مـورو لـەزیو دروسـت دەکـرێ لەسەر شێوەی لوئلوء ٥ جَمْهَرَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی کـۆ کـردەوە ٥ جَمْهَـرَ الکـلامَ: قـسەکەی کـورت کردەوە. ٥ الجُمَاهِرُ: کەتەو زەبەلاح، ٥ الجُمْهُورُ من کل شيئ: زۆرینـە ٥ لـەو جـەوی کۆمـەڵ بـوو، زوربـەی جـەماوەر، ٥ الجمهوريـة: دەوڵەتێکـە حـاکمێکی هەڵبـژێراو لەلایـەن گەلـەوە یـان لەلایـەن پەرلەمانـەوە بـەڕێوەی دەبـا بـۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

جَنَـأَ جُنـوءاً: خـۆی کـۆم کـردەوەو مـەیلان بـوو ٥ جَنِئَ: (جَنَأً) شـانەکانی بەسەرسـنگی دا دەڕوانـن پشتی کۆم بۆتەوە. ٥ الأجْنَأُ: پشت کوڕ ٥ المُجنَـأُ: تـیرو کـەوان. ٥ اَلْمُجْنَـأَةُ: چـاڵی گـۆڕ، گۆڕیـچە ٥ جَنَبَ الریحُ جنوباً: هەوا لە باشورەوە هاتووە یان بـەرەو باشـوور دەچـێ. ٥ جَنَـبَ الیـە جنبـاً: ئـارەزووی کـردو حـەزی لێ بـوو دیـدەنی بکـا. ٥

جَنَـبَ الـشَّيْءَ: لێـی دوورکەوتـەوە ٥ دووری خـستەوە ٥ پـاڵی پێوەنـا، لاتەنیـشتی هـەنگاوت، خـاترو خوایـشی نـەگرت ڕێـزی لێنـەنا. ٥ جَنَـبَ البعيرَ: لاتەنیشتی حوشترەکەی داخ کـرد. ٥ جنب الأرض: بـە کـەرتو یـان بـە ماڵمـاڵ زەوییەکـەی ڕێك خستو تەختی کـرد. ٥ جَنَبَ فلانـاً الـشَّيْءَ: دووری خـستەوە ٥ جَنِـبَ جنبـاً: دوورکەوتـەوە ٥ هاواری لاکەلەکەی کـرد ٥ جَنَبَ فلان: فلانکـەس لەشی پیس بـوو. ٥ جَنُبَ جنابة: دوورکەوتـەوە ٥ نزیك بووە ٥ لەشی پیس بوو ٥ (جُنِبَ): هاواری لاکەلەکـەی کـرد ٥ ڕەشـەبا لێـی دا بـای وەشـت تێکیـدا ٥ أجْنَبَ فلانـاً الـشَّيْءَ: ئـەو شتانەی لـە فلانکـەس دوور خـستەوە. ٥ جانَبَـهُ: لایـەنگیری ئـەوی کـرد، ٥ جَنَّـبَ فلانـاً الـشَّيْءَ: شـتەکەی لەفلانکـەس دوور خـستەوە. ٥ اجتَنَـبَ: لەشـی پیس بوو. ٥ اجتنبَ الشَّيْءَ: لێی دوور کەوتـەوە ٥ تَجَنَّبَ: لەشی پیس بـوو. ٥ تَجَنَّـبَ الـشَّيْءَ: لـە شتەکە دوور کەوتەوە ٥ اسْتَجْنَبَ: لەشـی پـیس بـوو. ٥ الأجْنَـبُ: بێگانـە لـە خزمایـەتی دا، یـان لەزێدو نیشتماندا ٥ شتێك ڕام نەبێ. ٥ الأجْنَبِـي: بێگانە، دەرەکی ٥ الجانب: لاتەنیـشتی ئـادەمیزادو هـی تـریش ٥ اَلْجَنَـاب: دەوروبـەر، ٥ الجُنَـابُ: نەخۆشـی ٥ الجَنَـابُ: دژایـەتی‌و ئـاژاوەو دڵ ئـازاردان ٥ اَلْجَنَابَـةُ: لـەش پیـسی، حاڵەتێک بەسەر پیاوو ئـافرەت دا دێ لـەناکامی جوتبـون یان ئاوهاتنـەوە بـەبێ جوتبـوون ٥ جـار الجُنُـب: ئەو جیرانەی ماڵی بەماڵی تۆوە نووسابێ.

الجُنُـبُ: دوور ٥ جـار الجُنُـب: هـاوڕێی سـەفەرت ٥ الجَنْبَـةُ مـن الـشَّيْءَ: لایـەنی شـتەکە ٥ نزیـكو ئـەملاو ئـەولای شـتەکە ٥ الجَنَبَـةُ: لای شـتو نزیکـی شـت. ٥ الجُنَبَـةُ: ئـەو کەسـەیە خـۆی لەخەڵـکی تـر دەپـارێزێ. ٥ الجُنَّـابُ: هـاوڕێی

هەمئاهەنگو هاودەم. ٥ **الجَنُوبُ**: لای پێچەوانەی باکور واتە: باشور ٥ بایەك كە لەولایەوە بێ. ٥ **الجَنِيبُ**: ئەو ئەسپەی بۆ فەراغ ڕێ کێش دەکرێ. ٥ **الجُنَّابُ**: لغاو شل‌و سەرنەرم ٥ **الْجَنِيبةُ**: ولاخی کێشکراو ٥ لابار بەتەنیشتی حوشترەوە ٥ **الْمَجْنَبُ**: خێرو شەڕی زۆر. ٥ **الْمِجْنَبُ**: بەمانا (اَلْمَجْنَب) دێ ٥ **اَلْجَنَبَةُ من الجيش**: لایەکی سوپا ٥ **تَجَنَّثَ**: خۆی پاڵ خێزانی تردا، خۆی کردە کوڕو ئەوەی خەڵکی تر.

**الجِنْثُ**: لوغەتێکە لە وشەی (جِنس) ٥ یان جۆرە زەمان لاڵییەکە، ٥ **الجُنْثيُّ**: ئاسنگەر ٥ حوشتر خنکێن٥ زرێ، شمشێر٥ **اَلْجُنْجُنُ والْجِنْجِنُ**: ئێسقانی سنگ، ٥ **اَلْجُنْجُون**: بەمانا (الجُنجُنُ) دێ.٥ **جَنَحَ**: خواربۆوە دەگوترێ: (جنح اليه وجنح له) بەلای ئەویدا تاشی، قسەی ئەوی پەسندکرد ٥ شوێن ئەو کەوت. ٥ **جَنَحَت السفينةُ**: کەشتییەکە کەیشتە تەنکاو شانی داداو بەزەوییەوە نووساو لەقوڕچەقی ٥ **جَنَحَ الطائرُ**: باڵندەکە باڵەکانی لێك دان. ٥ **جَنَحَ الرجلُ**: پیاوەکە پابەندی فەرمان بوو. ٥ **جَنح الليل**: شەو ڕاشکا بەرەو کۆتایی ڕۆیی. ٥ **جَنَحَ الحيوان في سيره**: ئاژەڵەکە لەکاتی ڕۆیشتندا بەهۆی پەلەو خێرا ڕۆیشتنەوە ملی بۆ پێشەوە درێژکرد. ٥ **جَنَحَ على الشَّيَ**: ڕوی لەشتەکە کرد٥ **جَنَحَ أن يأكل كذا**: بەلایەوە تاوان بوو ئەو شتە ئاوا بخوا. ٥ **جَنَحَ الطائر جَنحاً**: لەشەقەی باڵی داو فڕی ٥ باڵی خۆی شکاندنەوەو لێکی دان. ٥ **أجْنَحَ الشَّيَ**: شتەکەی خوار کردەوە. ٥ **جَنَّحَهُ**: باڵی بۆ دروست کردن. ٥ **إجتَنَحَ الانسان**: پەراسوی شکان. ٥ **اجْتَنَحَ الرجل على رحله**: پیاوەکە لەسەر ولاغەکەی هەردوك ئانیشکی دادان ٥ **اجْتَنَحَ في السجود**: قورسایی خۆی خستە سەر لەپی دەستی‌و ئانیشکی لەزەوی بەرزکردەوەو لەکەلەکەی خۆی دووری خستنەوە ٥ **اسْتَجْنَحَ الليلُ**: شەوداهات. ٥ **الجانِحَةُ**: پەراسووە کورتەکان کە لەسنگەوە نزیکن. ٥ **الجَنَاحُ**: باڵ (ئەو ئەندامەی باڵندە پێی دەفڕێ ٥ دوو باڵ ٥ قۆڵ ٥ بن هەنگڵ ٥ لاتەنیشت ٥ **الجُنَاحُ**: تاوان ٥ مەیل کردن بۆ تاوان‌و گوناه ٥ هەڵگرتنی خەم‌و خەفەت ٥ **الجَناحِيةَ**: پیرێکن لە شیعە توندڕەوەکان٥ **الجِنحُ**: لا ٥ ئەملاو ئەولا ٥ چاودێری ٥ بەشێك لەشەو ٥ تاریکی شەو ٥ دەوروبەری ڕێگا. ٥ **الجُنحُ**: تاریکی شەو. ٥ **الجُنْحَةُ**: تاوانێکە شیاوی ئەوەیە ئەوەی ئەنجامی داوە سزا بدرێ.٥ **جَنَّدَ الجُنودَ**: سەربازەکانی کۆکردەوە ٥ **تَجَنَّدَ**: سەربازی دامەزاندن ٥ سەربازی پەیداکردن. ٥ **الجُنَاديّ**: قوماشێك کە لە دیوار بدرێ‌و دیواری پێ داپۆشرێ ٥ هەرشتێك ڕاخەربێ یان پێخەف بێ.٥ **اَلْجُنْدُ**: سەربازی، یارمەتیدەرو دەست‌و پێوەند، ٥ **اَلْجَنَدُ**: زەوی ڕەقەڵان‌و سەخت ٥ **الْجُنْدِيُّ**: یەك سەرباز. ٥ **الجُنْدِيةُ**: یاسای سوپا. ٥ **اَلْجُنْدُبُ**: جۆرە کوللەیەکە دەنگی (سیرە سیرێ) لێ دێ‌و بازدەهاوێ‌و دەفڕێ، ٥ **أم جُنْدُب**: بەلاو کارەسات، ستەم‌و تاوان ٥ **جَنْدَرَ الثوبُ**: پۆشاکەکە ڕەونەقی جارانی بۆ هاتەوە لە ئوتوی دا، مشت‌و ماڵی کردەوە. ٥ **جَنْدَرَ الكتابَ**: بەقەڵەم بەسەر وشەکاڵ‌و کوژاوەکاندا هاتەوە تۆخی کردنەوە بۆ ئەوەی بخوێندرێنەوە. ٥ **الجَنْدَرَةُ**: ئامێرێکی دارینەیە پۆشاکی پێ لە وتوو دەدرێ‌و چرچ‌و لۆچی پێراست دەکرێتەوە. ٥ **الجُنَادِلُ**: شتی گەورەو پتەوو بەهێز.( **جَنَزَ الشَّيَ**: شتەکەی شاردەوە.٥ **جَنَزَ الميتَ**: مردووەکەی خستەسەر

دارمـــەیت. ◊ الجِنـــازَة: دارمـــەیت ◊ مـــردو ◊ یـــان دارمەیتو مردووەکەو ئەوانەی لەگەڵی دا دەچن بۆ سەر قەبرانو کفنو دفنی دەکەن ◊ الجَنَـائِزِيّ: ئـەو کەسەی لەپێش جەنازەکەوە دەڕواو قورئان یان ذیکـرو تەهلیلـە دەخوێنـێ. ◊ جَنَـسَتِ الرُّطَبَـةُ: خورماکـە هـەمووی تێکـڕا گـەیی. ◊ تَجَانَـساً: لەرەگەزدا خۆیان وەکوو یەك لێکـرد. ◊ الجِنَـاسُ: لەزاراوەی بەلاغیانـدا ئەوەیـە دوو وشـەیان دوو رستە لەهەموو پیتەکانیاندا یان لە زۆربەیان دا وەکوو یەك بچنو مانایان جوودابێ.

**الجِنْسُ**: بنەماو رەگەزو جۆر ◊ الجِنسِيَّةُ: صیفەتێکە بـە ئـادەمیزادەوە دەلکـێ لـە روی پەیوەنـدیو گەڕانەوەی بۆ نەتەوەو گەلێك. ◊ الجَنِيسُ: شـتی رەسەنو ساغلەم.

**جَنَفَ**، جنـف: لا خواربـوو، ستەمی کـرد ◊ أجْنَـفَ فلاناً: لە بڕیارەکەی فلان دا ستەمی بـەدیکرد. ◊ جانَفَ القَـوْمَ: خـۆی لـە گەلەکـەی تـەرە کـردو لێیان دوور کەوتـەوە. ◊ تَجانَفَ: لایـدا، لـە ڕێگـای راست کلابوو ◊ تَجانَفَ عنه: لێی لادا، ◊ تَجـانَفَ في مِشيَتِه: لە رۆیشتنـدا خـۆی باداو فیـزی کـرد. ◊ الأجْنَفُ: کەتەو زەبەللاح ◊ الْمِجْنَفُ: ستەمکار ◊ جَنَقَهُ: بـە قۆچـەقاینی بـە (مەنجـەنیق) بـەردی تێگـرت ئـاگر بـارانی کـرد.◊ ألجَنَـقُ: ئەوانـەی سـەروکاری مەنجـەنیق دەکـەن ◊ الْمِنْجَنِيـقُ: (المِنْجَلِيق): مەنجەنیق.

**الجُنْكُ**: تـەنبور، ئامێرێکی گۆرانیو مۆسیقایە.◊ جَـنَّ اللیـلُ: شـەو تـاریکیی هێنـا ◊ جَـنَّ علیـه، جَـنَّ ألـشَّيْءَ: شـتەکەی داپۆشـی ◊ جَـنَّ المَیِّـتَ: مردوەکەی کفن کرد ◊ جُنَّ بِهِ وِمنه: سـەری لێـی سوڕماو سـەرنجی راکێشا ◊ أجَـنَّ المرأة جَنِيناً: ئافرەتەکە منداڵی کەوتە سکەوە. ◊ أجَنَّ المَيِّتَ: مردوەکـەی داپۆشـی ◊ أجَـنَّ اللهُ فلانـاً: خـودا عـەقڵو ئـاوەزی لەفلانکـەس سـتاندەوە. ◊ أجَـنَّ الـشَّيْءَ صَـدْرَهُ: شـتەکەی لـە سـنگی خـۆی دا شـاردەوە. ◊ اجْـتَنَّ: خـۆی حەشـاردا. ◊ تَجَـانَّ وتَجانَنَ: خۆی بە شێت نیشاندا ◊ اسْتَجَنَّ: خۆی حەشاردا، ویستی خۆی حەشاربدا. ◊ ألتَّجْنِينُ: شێوە قسەی جندۆکە، ئەوەی جندۆکە دەیڵێن ◊ الْجانُّ: جندۆکە ◊ الْجَنَـانُ: لـە هـەموو شـتێکدا ناو سکیەتی ◊ دڵ ◊ جنان اللیل: تـاریکی شـەوی زۆر تاریـك.◊ الجِـنُّ: پێچەوانـەی ئـادەمیزاد کـە رەگەزی جندۆکە دەگرێتـەوە ◊ الجِـنّ مـن کـل شـيئ: سـەرەتاو دەسـتە گـوڵی شـت ◊ نیـشاتو هێزی شت. ◊ جِنّ النبات: گوڵو چرۆی رووەك. ◊ الْجَنَنُ: پەردە، گۆڕ، کفن ◊ شێردراوە ◊ مردو، الْجَنَّةُ: باخو بێستان ◊ بەمەرجێ درەختی تێدا بێ ◊ بەتایبەتی درەختـی خورمـاو داری مێـو ◊ بەهەشـت ◊ الجِنَّـةُ: شـێتی ◊ الجُنُـون: نـەمانی عەقڵو ئاوەز، یان نەخۆشیو شێوانی عـەقڵ. ◊ الْجَـنِينُ: گـۆڕ ◊ شـتی حەشـاردراوو داپۆشـراو ◊ منـداڵ لـەو کاتەیـدا کـە لەسـکی دایکیایـەتی ◊ المِجَـنُّ: مەتـەڵ ◊ الْمَجَنَّـةُ: شێتی ◊ شوێنی خـۆ حەشاردان ◊ زەوییەك جندۆکەی زۆری هەبێ، ◊ المجنون: شێت، کەسێك عەقڵی لەدەست دابێ، ◊ الْمَجْنُونَةُ: دارخورمای زۆر بەرزو قوچ.

**جَنَي** جنایة: تـاوانی ئەنجامـدا ◊ جنـی الـذنبَ علـی فـــلان: کێـشی کـرد بۆئەنجامـدانی تـاوانو خراپـەکاری. ◊ جَنَــی الثَمَـرَةَ ونحـوه: میوەکـەی چنی. ◊ جَنَـی جَنـيٍ: پشتی دەرپـەڕیو سنگی چووە ناوەوە ◊ أجْنَی الثَّمَرُ: کاتی چنینی میوەکە هـات. ◊ أجْنَـی الـشجَرُ: درەختەکـە میـوەی پەیـدابوو، میوە چن دەستی کرد بە میوە چنین. ◊ أجْنَی

الله الماشية: پەروەردگار گیاو گژی بۆ ئاژەڵەکان رواند. ٥ اجتنى العَسَلَ: هەنگوینەکەی کۆکردەوە. ٥ اجتنى ماءَ المطرِ: چووە سەر ئاوی بارانەکەو لێی خواردەوە. ٥ تَجَنَّى عليه: دەست درێژی کردە سەر، ٥ الجاني: ئەوکەسەیە خورما موتوربە دەکا ٥ کاسبکار. ٥ الْجَنَى: هەر بەروبومێك لە درەخت لێبکرێتەوە ٥ الجِنَايَة: لە زاراوەی قانوندا بە تاوانێك دەگوترێ شیاوی سزادان بێ.٥ الْجَنِيُّ: هەر میوەیەك کە تازە لە درەختەکە چنرابێ. ٥ الجاهِبُ: ئاشکرا.٥ الجَهْبُ: دەمو چاوی گرژو ناشیرینو رەزا قورس. ٥ الْمِجْهَبُ: بێ حەیاو ئابرو تکاو، ٥ الجِهْبَازُ: رەخنە گری شارەزاو لێزان ٥ الْجَهْبَلُ: سەر گەورە ٥ بە ساڵاچوو.

**جَهَثَ** جَهْثاً: ترسو رق هەڵسان یان کەیفخۆشیو تەڕ دەماخی وای لێکرد سەنگینی خۆی لە دەستدا.٥ جَهْجَهَ الأبطالُ: پاڵەوانەکان لە مەیدانی جەنگدا دەستیان کرد بە هەلهەلە کێشان چەهچەهە. ٥ جَهْجَهَ بالسبعِ: چەقەی لە درندەکە کرد بۆئەوەی وازبێنێ ٥ جَهْجَهَ الرَّجُلَ: پیاوەکەی لە هەموو شتێك گێڕایەوە.

**جَهَدَ** جَهْداً: تێکۆشا بەگرنگی جیدییەت ٥ جَهَدَ بفلان: فلانکەسی بە تاقی کردەوە. ٥ جَهَدَ فلاناً: فلانکەس نارەحەتی تووش بوو ٥ بە جەختەوە داوای لێکردو ئیلحاحی لێکرد. ٥ جَهَدَ المرضُ أو التعبُ أو الحبُّ: نەخۆشی یان ماندو بوون یان دڵداری لاوازی کرد. ٥ جَهَدَ اللَّبنَ: ماستەکەی کردە ماستاوو هەموو رۆنو چەورییەکەی لێگرت. ٥ جَهَدَ الطعامَ: حەزی لە خواردنەکە کرد ٥ جَهَدَ المالَ:ماڵەکەی دابەش کرد هەموی تەخشانو پەخشان کرد. ٥ جُهِدَ الناسُ: خەڵکەکە توشی قاتو قڕی بوون. ٥ أجْهَدَ: کەوتە نێو ناخۆشیو کارەساتەوە ٥ بوو بە خاوەنی ولاغێکی زەعیفو لاواز. ٥ أجْهَدَتِ الأرضُ: زەوییەکە فشەڵ بوو ٥ أجْهَدَ الشَّيْئُ: شتەکە تێکەڵاو بوو. ٥ أجْهَدَ الشيبُ فيه: خێرا پیربوو، پیری بە خێرایی بە جەستەیدا بڵاوبۆوە. ٥ أجْهَدَ فلان في الأمرِ: فلانکەس لە ئیشەکەدا ئیحتیاتی کرد. ٥ أجْهَدَ الدابةَ: ولاخەکەی ماندو کرد ٥ أجْهَدَ مالَهُ: ماڵو سامانەکەی دابەش کردو هەمووی سەرف کرد. ٥ أجْهَدَ الطعامُ: ئارەزوی خواردنەکەی کرد. ٥ جاهَدَ العدوَّ: شەڕی لەگەڵ دوژمن کرد. ٥ اجْتَهَدَ: ئەوی لە توانایدا بوو ئەنجامی داو درێغی نەکرد. ٥ الاجتهاد: لە زاراوەی فوقەهاو شەرع زانانـدا هەوڵدانو توێژینەوەی شەرعزانە، لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنی بەڵگەو دەقەکانە بۆئەوەی بگاتە ئەوەی رای بۆ دروست بێ لەسەر بڕیارێك دەربارەی قەضییەیەکی شەرعی. ٥ الْجَهَادُ: زەوی دەشتاییو تەخت جا گیاو گژی لێ روابێ یان نا ٥ الجِهَادُ: لە زاراوەی شەرع زانانـدا بریتییە لە شەڕکردنو بەگژا چوونەوەی ئەو ناموسوڵمانانەی کە لە ئەهلی زیممە نین.

**الْجَهْدُ**: ماندو بوونو ناخۆشی ٥ الْمُجْتَهِدُ: ئەو شەرع زانەیە کە هەرچی توانای خۆی هەیە ئاراستەی مەسەلەیەکی دەکا بۆئەوەی بڕیارێکی لەسەر بدا لەگەڵ شەرعی خودادا بگونجێ ٥ المجهود: وزەو توانای بەکارهێنراو.

**جَهَرَ** الشَّيْئَ: شتەکە دەرکەوت ٥ دەری خست، ئاشکرای کرد. ٥ جَهَرَ بالكلامِ ونحوه: قسەکەی راگەیاند ٥ جَهَرَ الشَّيْئَ: بەبێ پەردە چاوی پێکەوت ٥ جَهَرَ الشَّيْئُ فلاناً: ئەوشتە لەپێش چاوی فلانکەس زۆر گەورەبوو ٥ روخسارو

جوانی سەرنجی راکێشا ٥ **جَهَرَ فلان البِئرَ**: فلانکەس بیرەکەی لە قوڕو لیتە پاك کردەوە ٥ ئاوی لێ هەڵێنجا ٥ **جَهَرَ السِّقَاءَ**: مەشکەکەی هەژاند ٥ **جَهَرَ فلان**: فلانکەس جەستەی رێكو پێك بوو خۆی داڕشت ٥ **أجْهَرَ**: رایگەیاند، دەری خست. ٥ **أجْهَرَ بالكلام**: قسەکەی دەرخست، ئاشکرای کرد. ٥ **أجْهَرَ فلان**: فلانکەس بە دەنگ گەورە ناسراوە ٥ یان منداڵی جوانی بوون. ٥ **جَهْوَرَ فلان**: فلانکەس دەنگی بەرزکردەوە. ٥ **جَهْوَرَ الحديث**: قسەکەی ئاشکرا کرد. ٥ **اجْتَهَرَ الشَّيْءَ**: بەبێ پەردە شتەکەی بینی. ٥ **الجِهَارُ**: بە ئاشکراو عەلەنی. ٥ **الجَهْرُ**: ماوەیێك لە رۆژگار ٥ ساڵێکی تەواو. ٥ **جُهْرُ الرجلِ**: شێوەو روخساری پیاوەکە ٥ **الجَهْرَاءُ من الأرض**: زەوییەکی پانو پۆڕو بێ دارو درەخت بێ گردو شیوو دڕکە شاخ ٥ **الجَهْرَةُ**: ئەوەی ئاشکراو دیار بێ ٥ بێ پەردەو داپۆشەر بێ ٥ **الْجَهْوَرُ**: پیاوی ئازاو چاو نەترس. ٥ **الجَهِيُّ**: دەروشاوە ٥ **الجَهِيرُ من اللبن**: ئەو ماستەی لەگەڵ ئاوەکە تێکەڵ نەبووبێ بە کلۆیی مابێتەوە. ٥ **المِجْهَارُ**: ئەو کەسەی سروشتی وابێ بە دەنگی بەرز قسە بکا ٥ **المِجْهَرُ**: میکرۆسکۆب.

**جَهَزَ** علی الجریح: پەلەی کرد لە کوشتنی بریندارەکەو زوو لەناوی برد. ٥ **جَهَّزَهُ**: جیازییەکەی بۆ ئامادەکرد ٥ **تَجَهَّزَ للأمر**: خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد. ٥ **الْجَهَازُ**: پێداویستی کاروانو بارو بارگەنە ٥ **الْجَهِيزَةُ**: گورگ ٥ ورچ، بێچوە ورچ. ٥ **جَهَشَتْ نَفْسُهُ**: جولایەوەو خەریك بوو لە پرمەی گریان بدا. ٥ **جَهَشَ** الصبی الی أمه: منالەکە بۆلای دایکی روانیو لە پرمەی گریانی دا ٥ **جَهَشَ** الی القوم: هات بۆلای قەومەکە. ٥ **جَهَشَ** من الشَّيْءِ: لەشتەکە هەڵات. ٥ **جَهِشَ الصبیُّ الی أمه**: منداڵەکە دایکی بینیو خەریك بوو بگری. ٥ **أجْهَشَ**: ویستی بگری ٥ **أجْهَشَتْ الیه نفسُهُ**: هێڵنجی هاتیو رشایەوە. ٥ **أجْهَشَ فلاناً عن الأمر**: پەلەی لەفلان کرد. ٥ **الْجَهْشَةُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ فرمێسك کە لەکاتی گریاندا هەڵدەوەرن.

**جَهَضَ** فلاناً: بەسەر فلاندا سەرکەوت ٥ **أجهضت الحاملُ**: ئافرەتەکە منداڵەکەی بە ناکامی لەبار خۆی برد ٥ **اجْهَضَ الجارحَ عن صیده**: تاژییەکەی لەنێچیرەکە دوور خستەوە. ٥ **اجْهَضَ عن مکانه**: شتەکەی لەشوێنی خۆی جوڵاندو لای برد. ٥ **اجْهَضَ عن الأمر**: پەلەی کرد لەکارەکە ٥ **جاهَضَهُ عنه**: داکۆکی لێکردو نەیهێشت بچێ بۆلای ٥ **الإجْهَاضُ**: لەبارچوونی زارۆکە لە منداڵدان بێتە دەرەوە پێش ئەوەی تەمەنی زارۆکەکە بگاتە چوار مانگ. ٥ **الجاهِضَةُ**: جاشەکەری تەمەن یەك ساڵ. ٥ **الجَهَاضُ**: میوەی درەختی ئیراك. ٥ **الْجِهْضُ**: منداڵی لەبارچوو. ٥ **الجَهَاضَةُ**: حوشتری پیر. ٥ **المِجْهَاضُ**: ئەو ئافرەتەی منداڵی بۆ رانەوەستێ ٥ **تَجَهْضَمَ**: خۆی رانواندو تەکەببوری کردو خۆی بەزل زانی. ٥ **الْجَهْضَمُ**: کەسێك دەموچاو گەورەو خڕو قەد ئەستوورو کەتەبێ.

**جَهِلَ** فلان علی غیره: فلانکەس رەفتاری ناشیرینی لەگەڵ فلانکەس کرد ٥ **جَهِلَ الشَّيْءَ وبه**: شتەکەی نەزانی، بەشتەکەی نەزانی ٥ **جَهِلَ الحقَّ**: حەقی بە زایەدا ٥ **أجْهَلَهُ**: وای لێکرد نەزانو نەفام بێ. ٥ **جَهَّلَهُ**: بە نەفامی لەقەڵەمدا، نیسبەتیدا بۆ نەزانی ٥ **تَجَاهَلَ**: خۆی بە نەزان نیشاندا هەرچەندە نەزان نەبوو. ٥ **إسْتَجْهَلَهُ**: بەنەفامی لەقەڵەم دا ٥ **استجهلَ الریحُ الغُصْنَ**: بایەکە لقو پۆپی درەختەکەی جوڵاندەوە. ٥ **الْجَاهِلُ**: شێر. ٥

الجاهلية: ئەو سەردەمو رۆژگارەی عەرەبە پێش هاتنی ئیسلام ٥ الجَهْلُ: لەزاراوەی زانا کەلامییەکاندا ئەوەیە بڕوات بە شتێك بێ بە پێچەوانەی واقیعەکەی ٥ الْجَيْهَلُ: دارێکە (کۆلەوەژێکە) پشکۆ ئاگری پێ تێکەڵ دەدرێن ٥ بەردی گەورە. ٥ الجَيْهَلَةُ: دارێکە پشکۆ ئاگری پێ تێك هەڵدەدرێن. ٥ المِجْهالُ: حوشترێکە بە هێواشی بڕوا. ٥ الْمَجْهَلُ: سارایەك نیشانەی رێگاو بانی تێدا نەبێ ٥ الْمَجْهَلَةُ: ئەوەیە پاڵ بە ئادەمیزادەوە بنێ بۆنەفامیو نەزانی ٥ جَهَمَهُ جَهْماً: بە دەمو چاوێکی ناشیرینەوە پێشوازی لێ کرد قسەی رەقی پێ گوت.

جَهُمَ: دەمو چاوی گرژ بوو، روی ترش کرد ٥ أجْهَمَتِ السَّماءُ: ئاسمان هەورێکی بێ بارانی پێوەیە. ٥ إجْتَهَمَ: کەوتە ناو تاریکایی کۆتایی شەوەوە ٥ تَجَهَّمَ الأملُ فلاناً: هیواو ئاوات فلانی نەگرتەوە، ئاواتەکەی نەهاتە دی. ٥ الجَهامُ: هەورێك بارانی پێوە نەبێ ٥ الْجَهْمَةُ: مەنجەڵی گەورە. ٥ الجُهْمَةُ: تاریکایی کۆتایی شەو. ٥ الجَهْمِيَّةُ: پێڕێکن لە خەواریجەکان لە مورجیئەکان کە رێڕەوی جەهمی کوری صفوانن. ٥ الجَهُومُ من الرجال: پیاوی لاوازی بێ دەسەلات. ٥ الْجَيْهُمان: زەعفەران.

جَهَنَ جُهوناً: نزیك بووە ٥ پێی گەیشت. ٥ الجُهانَةُ: کەنیزەکی گەنج ٥ الْجَهَنُ: روو گرژی. ٥ الْجُهْنَةُ: تاریکی کۆتایی شەو. ٥ جُهَيْنَةُ: هۆزێکن لە خێڵی قوضاعە ٥ الْجِهْنَامُ: چاڵی قوڵ ٥ بیرێك زۆر قوڵ بێ.٥ جَهَنَّمُ: ناوێکە لە ناوی ئەو شوێنەی خودا تاوانبارانی تێدا سزا دەدا واتە: دۆزەخ. ٥ جَهَنَّمِيَّةُ: گوڵە جەهەنەمی؛ ٥ جَهِيَتِ السماءُ جَهيً: ئاسمان ساو بوو.

جَهِي البَيْتُ:خانووەکە وێران بوو. ٥ جَهِي فلان: فلان کەس سەری روتایەوەو توکی پێوە نەما. ٥ أجْهَى الطريقُ: رێگەکە ئاشکرا بوو، ٥ أجْهَى الخِباءُ: ماڵەکە ٥ خێمەکە، رەشماڵەکە، بێ پەردە بوو. ٥ أجْهَى فلان عليه: فلانکەس رژدو چروك بوو. ٥ أجْهَتِ المرأة على زوجها: ئافرەتەکە نەزۆك بوو منداڵی لە سکی نەکەوت. ٥ أجْهَى الطريقَ والبَيْتَ: رێگاکەی رون کردەوە ماڵەکەی بۆ دیاری کرد. ٥ جاهاه: شانازی بەسەردا کرد. ٥ جَهَّى الشجَّةَ: برینەکەی گەورەکرد. ٥ الجَهْوَةُ: تەپۆڵکە، گرد.

جَابَ الطيرُ جوباً: باڵندەکە کەوتە خوار. ٥ جاب فلان الشَّيْءَ: فلانکەس شتەکەی بڕییەوە ٥ ناوەڕاستەکەی بڕییەوە، کونی تێکرد. ٥ جاب النَّعْلَ: نەعلەکەی دارشت. ٥ جاب الصخرةَ: بەردەکەی تاشی ٥ جاب الأرض: بەناو زەوییەکەدا رۆیشت ٥ جاب الخبرُ البلادَ: هەواڵەکە بەناو وڵاتدا بڵاوی کرد. ٥ جاب الظلامَ: چووە ناو تاریکاییەوە. ٥ أجابَ فلان فلاناً: فلان وەڵامی پرسیارەکانی فلانی دایەوە ٥ أجابَ طَلَبَهُ: داواکەی قبوڵ کرد ٥ جَوَّبَ القمرُ: مانگ دونیای روناك کردەوە ٥ دەرکەوت.

جَوَّبَ الشَّيْءَ: شتەکەی ناو بۆش کرد ٥ جَوَّبَ المطرُ الأرض: بارانەکە هەندێ لە زەوی گرتەوەو هەندێکی نەگرتەوە ٥ اجتابَ الشَّيْءَ: شتەکەی کون کرد، ٥ اجتاب البئرَ: بیرەکەی هەڵکەند. ٥ اجتاب القميصَ: کراسەکەی لەبەر کرد ٥ اجتاب الظلام: چووە ناو تاریکییەوە. ٥ انجاب: هەڵقڵیشا، دولەت بوو بڕایەوە. ٥ انجاب السحابُ: هەورەکە لاچوو. ٥ انجاب الظلام: تاریکی لاچوو نەما، دونیا روناك بوو.٥ استجاب لە:

گوێبیستی فەرمانەکەی بوو داواکەی جێبەجێ کرد ٥ اَلْجَابَةُ: وەڵام، ٥ الجواب: وەڵامی پرسیار، بە پیرەوە هاتنی داخوازی، رەدکردنەوەی داوا، ٥ اَلْجَوْبُ: کراسێکە ئافرەت لەبەری دەکا ٥ الجَوبَةُ: کەڵو کەلێن لە هەوردا یان لە کێودا ٥ هەروا هەر چاڵو دۆڵێکی بەر فراوان ٥ دەشتایی روتەنی نێوان دوو کێو ٥ کۆڵانی نێوان دوو خانوو ٥ المِجْوَابُ: ئاسنی بڕندە شتی تری پێ ببڕدرێتەوە ٥ ئامێری شت کون کردن ٥ برین.

المِجْوَبُ: ئاسنێك شتی پێ ببڕدرێتەوە.

**جَوِثَ** جَوَثاً: سکی لە سەرەوە گەورە بوو.

**جاحَ** فلان: فلانکەس ماڵو سامانی خزمەکانی فەوتا ٥ وازی لە بەڵگە هێنانەوە هێنا شتی تری رەچاو کرد. ٥ جاحت الجائحةُ المالَ: بەڵاکە ماڵو سامانەکەی فەوتاندو لە بێخ دەری هێنا ٥ أجاحَت الجائحةُ المالَ: بەڵاکە ماڵو سامانەکەی فەوتاند. ٥ جَوَّحَ رجلَهُ: قاچی روت کرد پێخواس بوو. ٥ الأَجْوَحُ: پانو پۆڕ لە هەموو شتێك، ٥ الجائحةُ: بەڵاو کارەسات کە توشی ماڵو سامانی پیاو دەبێو لەناوی دەبا.٥ الجُوحُ: کاڵەکە شامی. ٥ اَلْجَوْحَةُ: کارەساتو بەڵای ئاسمانی. ٥ اَلْمِجْوَحُ: ئەو کەسەی پێویستی بە هەموو شتێك بێ.

**جَاخَ** السیلُ الوادي جاخە: لافاوەکە قەراخو بیجاغی شیوەکەی دادڕی. ٥ جَوَّخَ السیلُ فلاناً: لافاوەکە فلانکەسی لەناو برد، کوشتی. ٥ تجوخت البئرُ: بیرەکە تێك روخا. ٥ تجوخت القرحةُ: دومەڵەکە بە چەقۆ شەقی برد. ٥ الجوخ: خوێدان، تورەکەیەکە لە خوری رەنگ کراو دەچندرێ.

جادَ الرجلُ: کاری باشی کرد قسەی چاکی کردن، ٥ جاد الفرسُ: ئەسپی چاك بوو. ٥ جاد الفرسُ في عَدْوِهِ: ئەسپەکە تیژرەو بوو ٥ جاد فلان جوداً: فلانکەس سەخاوەتی نواند، ماڵی بەخشی. ٥ جاد بنفسه: نزیك بوو گیانی دەرچێ، بمرێ. ٥ جاد المطر: باران زۆر باری. ٥ جاد العینُ: چاوەکە فرمێسکی زۆر ڕشت. ٥ جاد المطرُ الأرضَ: باران لەو زەوییە باری، ٥ جاد الهوی فلاناً: سۆزو دڵداری فلانکەسی ئەخۆش خست، ٥ جاد النعاسُ فلاناً: وەنەوز بەسەر فلاندا زاڵ بوو.

**جِیدَ** فلان جواداً: فلانکەس تینووی بوو. ٥ جِیدَ من العطشِ: لە تینواندا بە هیلاك چوو، خەریك بوو بمرێ ٥ أجَادَ: کاری باشی ئەنجامدا، قسەی چاکی کرد، ٥ أجاد فلان: فلانکەس بوو بە خاوەنی ئەسپی چاك ٥ أجاد فلاناً: بە سەخی سروشتی لە قەڵەم دا. ٥ أجاد فلاناً النقد والثیاب: پارەی باش، قوماشی باشی دابە فلانکەس. ٥ أجْوَدَ: کاری باشی کرد، قسەی چاکی کرد ٥ أجْوَدَ الشَّيْءَ وفیه: شتەکەی بە باشی ئەنجامدا. ٥ جَوَّدَ الشَّيْءَ: شتەکەی چاك کرد. ٥ تَجَوَّدَ في العمل: دەست رەنگینی لە کارەکەیدا کرد. ٥ تَجَوَّدَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵبژاردو داوای کرد شتێکی باش بێ. ٥ استجاد الفَرَسَ: هیوای خواست ئەسپەکەی ئەسپی رەسەن بێ ٥ استجاد فلاناً: داوای بەخششو دەسمەندی لێکرد. ٥ التجاوید: بارانی زۆر. ٥ الجادِيُّ: زەعفەران. ٥ الجَوَادُ: ئەسپی رەسەن.

**الجَوْدُ**: بارانی زۆر ٥ الجُودُ: بەڵای زانایانی ئەخلاقەوە رەوشتێکە خاوەنەکەی هەڵدەنێ بۆ بەخشینی ئەو شتەی پێویستە ببەخشرێ بەبێ بارتەقا. ٥ الجَوْدَةُ: چاكو باش ٥ باش ماڵی بوون.

**جَارَ** جَوْراً: داوای ئەوەی کرد پەنا بدرێ، ئەهێڵدرێ دەستی دوژمنی بگاتێ. ٥ جار

الطريقُ: ڕێگاکەی نەدییەوە. ٥ جار الأرض: گژو گیاو رووەکی زەوییەکە زۆر بەرز بووەوە. ٥ جار عن القصد والطريق: لە مەبەستو ڕێگا کلا بوو، لایدا. ٥ جار في حکمە: لە بڕیارەکەی ستەمی کرد، ناحەقی کرد ٥ أجَارَهُ: پەنای داو پاراستی، نەیهێشت دەستی دوژمنی بگاتێ ٥ أجار الله من عذابە: خودا لە سزای خۆی پاراستی. ٥ جاور المسجدَ: لە مزگەوتدا مایەوە بۆ خودا پەرستی بە مەبەستی (اعتکاف). ٥ جاور المدينة أو مكة: لە مەدینەدا یا لە مەککە دا مایەوە. ٥ جَوَّرَ البناءَ: بیناکەی روخاند. ٥ جَوَّرَ فلاناً: فلانکەسی بە زەویدا دا، کوشتی. ٥ اجتَوَر القومُ: ئەو خێڵە هەندێکیان بوونە هاوسێی هەندێکیان. ٥ تَجَوَّرَ على فِراشِه: کابرا لەسەر نوێنی خۆی ڕاکشا، پاڵ کەوت. ٥ تَجَوَّرَ خِباءُ الليل: تاریکایی شەو لاچوو نەما. ٥ استَجَارَ بفلان: پەنای بۆ فلانکەس برد، ٥ استَجَارَ فلاناً: داوای لە فلانکەس کرد کە پەنای بداو ترسی دوژمنی لێ برەوێنێتەوە.

الجار: هاوسێ؛ ٥ ألْجَوَارُ: ناوی زۆرو قوڵ ٥ هەروا دەوروبەری خانوو. ٥ الجِوارُ: عەهدو بەڵێنو ئەمان.

ألْجَوْرُ: ستەم، ٥ الجورُ: شتی رەقو پتەو ٥ ألْجَوَار: زەوی کێڵ، جوتیار، ئەو کەسەی هەمیشە خەریکی باخو بێستان بێو ئیشیان تێدا بکا. ٥ جَوْرِيَهُ: گۆزەویی لەبێ کرد.

جاز العقدُ وغيرُهُ: گرێبەستەکە پەسەند بوو، ٥ جَازَ المَوْضِعَ وبه: ئەو شوێنەی بڕیو پێیدا ڕۆیی‌و تەی کرد. ٥ جاز بفلان المَوْضِعَ: ڕابەرایەتی فلانی کرد تا ئەو مەودایەی بڕی ٥ اجازَ الشَّيْءَ: ڕێگەی بە شتەکەی داو بە جائیزی دانا ٥ أجاز الموضِعَ: ئەو شوێنەی بڕی‌و پێیدا تێپەڕی ٥ أجاز فلاناً الموضع: ڕابەرایەتی فلانی کرد تا ئەو مەودایەی بڕی ٥ أجاز العَقْدَ: گرێ بەستەکەی مۆر کردو پێی ڕازی بوو ٥ أجاز المعلمُ تلميذَهُ: مامۆستاکە بڕوا نامەکەی دا بە قوتابییەکەی‌و ڕێگەی دا زانیاری لێ ڕیوایەت بکا ٥ جاوز عن ذنبه: چاوپۆشی لە تاوانەکەی کردو لێی خۆش بوو ٥ جَوَّزَ لهم دوابَهُمْ: یەکە یەکە ئاژەڵەکانی بۆ پەڕاندنەوە ٥ جَوَّزَ الدراهِمَ: پارەکەی قبوڵ کرد هەرچەند کەمو کوڕیشیان تێدا بوو ٥ جَوَّزَ لهم الدواب: ئاژەڵەکانی بۆ ناودان ٥ اجتاز: تێپەڕی ٥ تجاوز عن الشَّيْءَ: چاو پۆشی لەشتەکە کرد ٥ تجاوَزَ عن الرجل: لە پیاوەکە خۆش بوو ٥ تجاوز في الشَّيْءَ: زێدە ڕۆیی لەشتەکەدا کرد ٥ تجوَّزَ في الصلاة: نوێژەکەی کەم کردەوەو درێژەی پێ نەدا ٥ تجوَّزَ في الكلام: قسەکانی بە توێکڵەوە کردن ٥ تجوَّزَ الدراهمَ: دیرهەمەکانی قبوڵ کردن هەرچەندە تەزویریشیان تێدا بوو ٥ استجاز فلاناً: داوای لە فلان کرد ڕێگەی پێ بدا ڕیوایەتی لێوە بگێڕێتەوە ٥ الجائزة: ئەو بڕە ئاوەیە ڕێبوار لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ لەم قۆناغ بۆ ئەو قۆناغ یان لەم بیرە ئاوەوە تا دەگاتە بیرە ئاوێکی تر ٥ جامە ئاوێك ٥ بەخششو ڕێز لێنان ٥ الجَوَازُ: ئەو ئاوەیە کشتوکاڵ یان ئاژەڵ دەیخواتەوە ٥ ئەو ئاوەیە ڕێبوار بۆ پێداویستی ڕێگا لەگەڵ خۆی دەیبات.

جواز السفر: پێناسەو بەڵگە نامەیەکە دەوڵەت دەیدا بە هاوڵاتیان بۆئەوەی بتوانن سەفەر بکەن بۆ دەرەوەی وڵات هەرکاتێ حەزیان لێ بوو ٥ ألْجَوْزُ من كل شيءٍ: ناوەڕاستی ٥ جوز الهند: دەنکی نەرجیل ٥ الجوزاء: بورجێکە لە بورجەکانی ئاسمان ٥ الجوزة: تاکی گوێز ٥ جامێك

ـاو ٥ ئـەو ئەنـدازە ئـاوەی ڕێبـوار لەگـەڵ خـۆی هەڵی دەگرێ بۆ پێویستی ڕێگا لـە کانییەکـەوە بۆ کانیاوێکی تر ٥ جۆرێکە لە ترێ زەردە.

**الجيـز**: قـەراخی شیو ٥ شـوێنی قـەومو زێـدو نیشتمانیان ٥ **مجازة النهر**: پردی سەر ڕوبار ٥ **أرض جازة**: زەوییەك داری گوێزی زۆری لێ بێ ٥ **المجيـز**: سەرپەرشتیار، وەکوو وەلی‌و وەصی ٥ مامۆستایەك ئیجازەیدا بە قوتابیەکەی.

**جـاسَ**: ڕارا بوو، هاموشۆی بەناودا کرد، پێیدا بڵاو بوونەوە ٥ **جاسَ الشَّيْئَ**: ویستی وردە وردە شتەکە بە دەست بێنێ ٥ پێی لێنا ٥ **اجْتَاسَ**: هاتۆچۆی کرد ٥ **الجوسق**: باڵەخانەی بچوك ٥ قەڵاو شورا.

**جَاشَ** جَوْشاً: هەموو شەو نەوەستاو ڕۆیی ٥ **تجوّش فـلان**: فلانکەس کەمێك لاواز بوو ٥ **الجَـوْشُ**: سـینگ ٥ ناوەڕاسـت ٥ بەشـی زۆری شـەو ٥ **الجُوش**: سینگ ٥ **الْجَوْشَنُ**: سینگ، زرێ.

**جَاعَ**: برسی بوو ٥ **جاع الحَيُّ**: زیندەوەرەکە ناو سکی بەتاڵ بوو ٥ **جائع القِدر**: برسی‌و هەژار ٥ **أجاعَهُ**: خۆراکی لێ قەدەغە کرد ٥ **تَجَوَّعَ**: بە ئەنقەست خۆی بە برسی کردن دا یان خۆی برسی کرد ٥ **اسْتَجَاعَ**: سات دوا سات خەریکی خواردن بوو هەمیشە دەمی دەجوڵا ٥ **الجوعُ**: برسییەتی ٥ **الْمَجاعَةُ**: ساڵی بێ بارانی‌و قات‌و قڕی ٥ **جافَـهُ جَوْفـاً**: لەناو سکی دا، نـاو سکی هەنگاوت.

**جاف** الصيدَ: ناو سکی نێچیرەکەی هەنگاوت گوللەکە چووە نـاو سکییەوەو ئـەم دیـواو دیوی نـەکرد ٥ **جاف الدواءُ فلانـاً**: دەرمانەکە چووە نـاو سکی فلانکەسـەوە ٥ **أجَـافَ البـابَ**: دەرگاکـەی پێـوە دایەوە ٥ **جَوَّفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ناو کلۆر کرد ٥ **إجْتافَهُ**: چووە ناو بۆشایی جەستەیەوە ٥ **تَجَوَّفَ الشَّيْئَ**: چووە ناو کلۆرایی جەستەیەوە ٥ **اسْتَجَافَ**: بەر فراوان بوو ٥ **اسْتَجَافَ الشَّيْئَ**: شتەکە هاتە دەستی بە کلۆری.

**الأجْوَفـان**: گـەدەو شـەرمگا ٥ **التجويـف**: ئـەو بۆشـاییەیە دەکەوێتـە نـاو شـتەوە ٥ **الجـائف**: ڕەگێکـە بـە باسـك‌و قـوڵی ئـادەمیزاددا دەڕوا تـا دەگاتە غوضروف شان ٥ **الجائفة**: عەیبی گەورە ٥ **الْجُـوافُ**: نەخۆشی سکچوونە کە هۆکارەکەی نەزانـدرێ ٥ **الجُوَافة**: جۆرە ماسییەکە، گۆشتەکەی زۆر باش نییە.٥ **الجَوْفُ** من كل شـيء: کلۆرایی‌و ناوسکیەتی ٥ **الجَوْفُ** من الليل: سێیەکی کۆتایی شەو ٥ **الجوف** من الأرض: ناوسکی زەوی، چاڵی قوڵ‌و پان، شیوو دۆڵ ٥ **المجَوَّفُ**: زۆر کلۆر.

**جَوِقَ** جَوَقاً: ملی ئەستور بوو ٥ **جَوِقَ** الوجهُ: دەم‌و چاوی خوار بوو ٥ **جَوَّقَ القومُ عليه**: قەومەکە دەنگیان بەسەردا بەرز کردەوەو هەریەکە لەلای خۆیـەوە دەینەڕانـد بەسـەریا ٥ **جَـوَّقَ القـومَ**: قەومەکەی کۆکردەوە ٥ **الْجَـوْقُ**: کۆمـەڵێك لـە ئـادەمیزاد ٥ **الْمُجَـوَّقُ**: ئەوەیـە کاکیلـەکانی خواربن.

**جَالَ** التُرابُ: تەپ‌و تۆز بەرز بوووەوە ٥ **جَالَ** النطاقُ: پشتێنەکەی دەجوڵێ، دەخزێ لەبەر گەورەیی‌و پانی ٥ **جَـالَ في الأرض**: بـە زەویـدا سوڕایەوە بەبێ ئەوەی لە شوێنێك نیشتەجێ بێ ٥ **جـال بـسيفه**: شمـشێرەکەی هەڵـسوڕاندو بـە دەوری خۆیدا خولی دا ٥ **جـال الامرُ في نفسـه**: کارەکە سەقامگیر نـەبوو، لـە دڵیا هـاتو چـوو ٥ **جـال الشَّيْئَ** من غيره: شتەکەی هەڵبـژارد ٥ **أجالَ القومُ الرأي فيما بينهم**: خەڵـکەکە لـەناو خۆیانـدا بۆچوونەکەیان لێك دایەوەو چەندو چونیان تێدا

**حَزَمَ** الشَّيْ: شتەکەی کردە کۆمەڵ کۆمەڵ یان باوەش باوەشی کرد ◊ **حَزَمَ** أمره أو رأيه: ئیش‌و کاری خۆی رێك‌و پێك کرد یان راوو بۆچونی خۆی رونکردەوە ◊ **أحْزَمَهُ**: پیاوەکە پشتێنی بۆ دروستکرد ◊ **حَزَّمَهُ**: پشتێنەکەی توند کرد ◊ **إحْتَزَمَ الرجلُ**: پشتێنی لە ناوقەدی خۆی بەست.

**تَحَزَّمَ في أمره**: بە وەرەی بەرزو بتمانە بەخۆ تەصەروفی کرد ◊ **الحِزامُ**: هەرشتێك لە پشت ببەسترێ ◊ **حِزَامُ الطريق**: ناوەڕاستی رێگەو نیشانەی رێگە ◊ **الحَزَمُ**: ئازارو هەست کردن بە گرێ‌و گیرییەك لە سنگدا ◊ **الحُزمةُ**: هەرشتێك باقە باقە بکرێ‌و ببەسترێ ◊ **الحُزُمّةُ**: کورتە بالای تێکسمڕاوی گۆشتن ◊ **الحَزيمُ**: ناوقەدی بالا، شوێنی بەستنی پشتێن.

**حَزَنَ** الأمْرُ فلاناً: ئەو کارە فلانکەسی غەمبار کرد ◊ **حَزِنَ الرجلُ**: پیاوەکە خەفەتبار بوو ◊ **احْزَنَ فلان**: چووە ناو خەم‌و خەفەتەوە ◊ سواری ولاخی چەموش‌و هاربوو ◊ **حَزَّنَ القارِئُ في قراءَتِهِ**: خوێنەرەکە دەنگی خۆی لە خوێندنەوەکەدا باریك کردەوە ◊ **حَزَّنَ الأمرُ فلاناً**: کارەکە فلانی غەمبار کرد ◊ **اَلْحُزانَةُ**: کەسو کاری پیاو ئەوانەی هەمیشە لە هەوڵی پێگەیاندن‌و بەخێوکردنیان دایەو بۆیان غەمبارە ◊ **الحَزْنُ** من الدّواب: ئەو ولاغەیە ژێر بار نەبێ ◊ **الحَزْنُ** من الناس: ئەو ئادەمیزادەیە مامەڵەی زبرو توندو تیژبێ ◊ **حَزَا الشّيَ**: بە گۆترە شتەکەی مەزندە کرد ◊ **الحازِي**: کولە وەنانی‌و فالگرەوە.

**حَسَبَ** المالَ: ماڵەکەی ژماردو سەر ژمێری کرد ◊ مەزندەی کرد.

**حَسِبَ**: پێستی سپی بوو بەهۆی نەخۆشییەوە ◊ **حَسِبَ الشّيْءَ كذا**: گومانی وابرد کە ئەوشتە وایە.

**حَسُبَ** الانسانُ: خۆی‌و باوك‌و باپیری خاوەن رێزبوون ◊ **احْسَبَ الشَّيْءَ فلاناً**: ئەوەندەی شت دا بەفلان تا گوتی بەسمەو هیچی ترم ناوێ ◊ **حاسَبَهُ**: توێژینەوەی حیسابی لەگەڵدا کرد. ◊ **حَسَّبَ فلان**: فلانکەس بەخششی زۆری دا بە فلان. ◊ **احْتَسَبَ الأمْرَ**: گومانی بۆ کارەکە بردو وای زانی وەهایە. ◊ **احْتَسَبَ بە**: گرنگی پێدا. ◊ **احْتَسَبَ الأجْر على الله**: پاداشی خۆی لای خودا ویست، ◊ **احْتَسَبَ فلان وَلَدَه**: فلانکەس لە ئاستی رووداوی مردنی کوڕەکەی خۆگربوو ویستی خودا پاداشی بداتەوە. ◊ **تحاسَبا**: هەریەك لە هاوبەشەکان حیسابی خۆی لەگەڵ ئەوی تریان کرد. ◊ **تَحَسَّبَ الأمْرَ**: هەوڵی دا بزانێ کارەکە چۆنەو چییە. ◊ **الحِسَابُ**: هەژماردن ◊ شتی زۆرو کافی ◊ **يوم الحساب**: رۆژی قیامەت. ◊ **علم الحساب**: زانستی ژمارە. ◊ **الحساب الجاري**: لە زاراوەی ئابوریدا رێککەوتنێکە لەنێوان دوو کەسدا کە مامەڵەی هەمیشەییان هەبێ. ◊ **حَسْبُكَ هذا**: ئەوەت بەسە، هەوڵی شتی تر مەدە ◊ پێی قنیات بکە. ◊ **حَسْبُكَ** من شرٍّ سَماعُهُ: کیفایەتە بیستنی شەڕ کە ببیستی ئیتر یەکسەر لێی بێزار دەبی. ◊ **اَلْحَسَبُ**: حَسَبُ الشّيْ: ئەندازەی شت‌و ژمارەی شت ◊ **اَلْحَسَبُ**: ئەو بە هاوسەروەری‌و رێزدارییە کە پیاو پاڵ باوك‌و باپیرو بنەماڵەی خۆی دەدا. ◊ **اَلْحُسْبَانُ**: ژماردن ◊ تەگبیری تۆکمەو ورد، هەڵسوڕانی رێك‌و پێك‌و هاتوچۆی بێ دواکەوتن‌و بێ خەلەل ◊ **الحَسيبُ**: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا ◊ ژمێریار. ◊ **اَلْمُحْتَسِبُ**: ئەو کەسەبووە کە

سەروکاری فەرمانگەی (الحسبە)ی کردوە ◊ حَسْبَلَ: وتی: (حسبی الله).

**حَسْحَسَ** للشَّيْءَ: ئازاری چەشتو هێشانی ئەو ئازارەی دەرخست. ◊ حَسْحَسَ اللَّحْمَ ونحوهُ: گۆشتەکەی خستە سەر پشکۆ بۆئەوەی ببرژێ. ◊ تَحَسْحَسَ للقيام: هەوڵیدا بکەوێتە جمو جوڵ. ◊ المُسْحَاسُ من الرجال: کەسێکە گورجو گۆڵو بە راپەڕ بێ. ◊ حَسَدَهُ حَسَداً: ئاواتی خواست ئەو خێرو خۆشییەی لای فڵانە لەو دەرچێو بێ بۆلای ئەم ◊ أحْسَدَهُ: کابرای بە حەسودو بەخیل زانی. ◊ تَحاسداً: هەریەك لەو دووانە حەسوودی بەوی تریان برد ◊ الحسود: ئەو کەسەی بە سروشت حەسوود بێ، چ پیاو بێ چ ژن. ◊ ألحَسْنَلُ: پیرۆیەکی بچکۆلەیە قاچی زۆرن دەعبای پچوك دەخوا.

**حَسَرَ** الشَّيْءُ حسوراً: شتەکە دەرکەوت، ئاشکرا بوو. ◊ حَسَرَ الغُصْنَ: لقە دارەکەی سپی کرد توێکڵەکەی لێ داماڵی. ◊ حَسَرَ القوم: ئەو قەومە داوایان لە فڵانکەس کرد ئەویش چی هەبوو پێی دانو هیچی نەمایەوە. ◊ حَسَرَ الدابةَ: وڵاغەکەی هێندە ماندوو کرد کزو کۆڵەوار بوو. ◊ حَسَرَ الشَّيْءَ عن الشَّيْءِ: ئەوشتەی لەسەر ئەوشتە لاداو دەری خست ◊ حَسرت الجارية خمارها عن وجهها: کەنیزەکەکە سەرپۆشەکەی لەسەر رووی خۆی لادا.

حَسِرَ فلان حَسَراً: فڵانکەس خەفەتی خواردو دڵگران بوو. ◊ حَسِرَ على الشَّيْءِ: پەرۆشی شتەکەی بوو ◊ أحْسَرَ الدابَّةَ: وڵاغەکەی لێ خوڕی هەتا ماندوی کرد. ◊ حَسَّرَ الطيْرُ: باڵندەکە پەڕو باڵی هەڵوەرین. ◊ حَسَّرَ الطيرَ: پەڕو باڵی باڵندەکەی لێ کردنەوە. ◊ حَسَرَ الحيوانَ: وڵاغەکەی ماندوکرد. ◊ حَسَرَ فلاناً: فڵانکەسی خستە ناو خەمو خەفەتەوە یان سوکایەتی پێ کردو ئەزیەتی دا. ◊ إنْحَسَرَ: دەرکەوت کەشف بوو. ◊ انحَسَرَ الماء عن الساحل: ئاوی دەریاکە کشایەوە زەوییەکە دەرکەوت. ◊ انحَسَرَ الطيرُ: باڵندەکە پەڕو باڵی کۆنی هەڵوەرینو پەڕو باڵی تازەی دەرکردن. ◊ تَحَسَّرَ الشَّعْرُ: مووەکانی هەڵوەرین. ◊ تَحَسَّرَ الطيْرُ: پەڕو باڵی فڕێ دان. ◊ تَحَسَّرَت فلانةُ: فڵان ئافرەت روبەندی لەسەر روخساری خۆی لادا. ◊ تَحَسَّرَ على الشَّيْءِ: خەفەتی بۆ شتەکە خواردو پەرۆشی بوو.

الحاسر من الجنود: ئەوەیە زرێ پۆشی و شتی لەوجۆرەی نەبێ ◊ الحسار: گیایەکی سەوزی تەمەن درێژە بەسەر زەوی دا بڵاو دەبێتەوە ◊ الحَسْرَةُ: ئاهو خەفەت خواردنی زۆر. ◊ المُحْسَرُ: دەرخستنی ئەو شوێنانەیە لە جەستەی ئافرەت کە هەوەس دەجولێنن.

**حَسَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی لە بێخ دەرهێنا، ◊ حَسَّ رأس الذبيحة: سەری کوشتییەکەی خستە سەر ئاگرو دوایی کەوڵی کرد ◊ حَسَّ فلاناً: فڵانکەسی کوشت بەوە سەری هەڵکەند ◊ حَسَّ الشَّيْءَ وبه: بەیەکێك لە هەستەکانی دەرکی بە شتەکە کرد. ◊ أحَسَّ الشَّيْءَ وبه: بەشتەکەی زانیو هەستی پێکرد ◊ انْحَسَّ: بڕایەوەو هەڵوەری ◊ تَحَسَّسَ الخبرَ: هەوڵیدا بنجو بناوانی هەواڵەکە بزانێ ◊ تَحَسَّسَ للقوم: هەوڵیدا زانیاریو چۆنیەتی روداویان بۆ کۆبکاتەوە. ◊ ألحَسَّاسُ: شوێن دەست، شوێن ◊ الحُسَاسُ: وردەی شت ◊ وردە باران، وردە بەرد، وردە نان.

الحسُّ: هەست کردن بەشت بەیەکێ لە هەستەکان ◊ دەنگی نزم ◊ المَحَسَّة: هەڵپروکێنەر ◊ المِحَسَّةُ: رنەك؛ ◊ المَحْسُوسُ: ئەوشتەی هەستی پێ دەکرێ بەیەکێ لە پێنج هەستەکان.

**حَسَفَ** الشَّيْ: شتەکەی سپی کرد، توێکڵی لێ کردەوە.

حسفَ التَمْر: خورماکەی لە خشتو خۆڵەکەی پاك کردەوە.

حسفَ علیه: رقو کینەی لێ پەیدا کرد.

حُسِفَ فلان: فلانکەس رەزیل بوو روخا حەیای چوو لادرا.

حُسَافَةُ: شتەکەی لە خشتو خۆڵو پرژو پاڵ پاك کردەوە.

حَسَّفَ شاربَهُ: سمێڵی تاشین.

اَنحَسَفَ: وردو پەت بوو، ٥ تَحَسَّفَ فلان: فلانکەس هەرچی هاتە بەردەستی خواردی، هیچی نەهێشتەوە. ٥ الحُسَافُ: خشتو خۆڵو پرژو پاڵی هەموو شتێك ٥ الحَسَفُ: چقڵ. ٥ الحَسِيفَةُ: رقو کینە ٥ دوژمنایەتی.

حسكَ رأسُه: قژی سەری زۆر گشتو گرژبوون. ٥ حَسِكت الدابَّةُ: حەیوانەکە گیا حەسەکەی کرۆشت. ٥ حَسِكَ علیه: رقی لێ هەڵگرت. ٥ أحسَكَ الدابَّةَ: ئالیكو جۆی دا بە ولاغەکە. ٥ حَسَّكَ فلان: فلانکەس بەخیل بوو رژدو چروك بوو. ٥ الحُسَاكَةُ: رقو کینو دوژمنایەتی.

الحَسَكُ: گیایێکە بەرێکی زبرو گرناویو چقلاوی هەیە لە خوری مەرو کوڵکی حوشترەوە دەهاڵێ، وەکوو پەیکوڵ وەهایە.

حَسَكُ السَّعدان: بەری زبرو گرناوی گیا سەعدانە. ٥ الحُسَاكَةُ والحَسِيكَةُ: ئەو ئاڵفو ئالیکەیە ئاژەڵ دەیکرۆژێ وەکوو جۆ.

**حَسَلَ** من الشَّیْ: لەشتەکە پوخلاوات بنژێلو شتە خراپو پوچەکانی هێشتەوە. ٥ حَسَلَ بفلان: بەشی خراپی بۆ فلان دانا ٥ حَسَّلَ بنفسه: ملی لە خوێڕیەتی ناو کەمتەرخەمی لە کارەکەیدا کرد. ٥ المُسَالَةُ: شتی خراپو بێ خێر لە هەموو شتێك ٥ بڕوێشی جۆو شتی لەو جۆرە.

الحَسْلُ: نەبقی کاڵ، دەنکە نەبقی نەگەییشتوو.

الحِسْلُ: بێچوی سوسەمار کاتێ سەری لە هێلکە دەجروکێ، ٥ الحَسِيلُ: پروپوچو شتی خراپ لەهەر شتێك بێ ٥ گۆلەکەی ماڵی ٥ الحَسِيلَةُ: تاکی (الحَسِيل)ە ٥ بەمانا پروپوچو خوێڕی دێ.

**حُسِمَ** فلان: فلانکەس بەردەوام بوو لەسەر کار. ٥ حُسِمَ الشَّيْ: شتەکەی بڕیەوە کۆتایی بە کارەکە هێنا ٥ حَسَمَ العرق: رەگەکەی بڕیو داخی کرد بۆئەوەی خوێنی لێ نەیە. ٥ حَسَمَت الأم طفلها: دایکەکە منداڵەکەی لە شیر بڕییەوە. ٥ الحَاسِمُ: یەکالا کەرەوە ٥ الحُسَامُ: شمشێری بڕندە ٥ الحُسُومُ: بەدبەختی ٥ المَحْسَمَةُ: ئەوشتەیە کارەکان یەکالا دەکاتەوە ٥ المحسوم: شتی یەکالا کراوە.

**حَسُنَ** حُسْناً: جوان بوو ٥ أحسَنَ: شتێکی کرد جوانو پەسند بوو. ٥ أحْسَنَ الشَّيْءَ: جوان ئەوشتەی دروست کرد. ٥ احسن بە والیە: کارێکی جوانی ئەنجامدا، ٥ حاسَنَهُ: مامەڵەی جوانی لەگەڵدا کرد. ٥ حاسَنَ به الناسَ: بە جوانییەکەی شانازی بەسەر خەڵکدا کرد. ٥ حَسَّنَ الشَّيْءَ: شتەکەی جوانکرد ٥ تَحَسَّنَ: خۆی جوانکردو روخساری خۆی ئارایش دا. ٥ اسْتَحْسَنَهُ: بەجوانو باشی لەقەڵەم دا. ٥ الحُسَّانُ: پیاوێك کاری باشی زۆر بێ. ٥ الحُسَّانُ: شتی زۆر جوان.

الحُسْنُ: جوانی ٥ هەر پەیڕەوو پرۆگرامێك کە بچێتە دڵی خەڵکەوە، ٥ الحُسْنیان: سەرکەوتنو شەهید بوون لە رێگەی خوادا ٥ الحَسَنَةُ: چاکە ٥ المُحْسِنَةُ: ئەوەی شت باش دەکا، بەلای باشی دا کاری تێ دەکا.

حَسَا الطائرُ الماءَ حَسْواً: باڵندەکە بە دەندوکی پەلاماری خواردنەکەیدا. ٥ احساه الحَسَاءَ: شورباوی بەدەمدا کرد. ٥ احتَسَى الحساءَ ونحوه: شۆرباکەی لرف دا. ٥ احتَسَى ما في نفسه: هەڵپیشکنی بزانی چی لە دڵدایە.

ألحَسَا: شۆرباوو شتی لەوجۆرە ٥ پەڵو، حەڵوا، ٥ ألحَسْوُ: کورتو کەم خایەن ٥ الحُسْوَة: پڕ بەدەم پەڵو یان حەڵوا، شتی کەم.

حَسَّ الحِسَّى: پارو پارو پەڵوەکە، حەڵواکەی خوارد. ٥ احْتَسَى الحِسَّى: پارو پارو پەڵوەکە، حەڵواکەی خوارد.

الحِسَى: دەشتایی زەوی کە ئاوی تێدا رادەوەستێ ٥ حَشأَهُ بالعصا أو السوط حَشْأً: بە گۆچان بە قامچی لە کەدەو لەلا کەلەکەی دا.

حَشَأ النارَ: ئاگرەکەی هەڵگیرساند. ٥ أحْشَبَهُ: رقی هەڵسان. ٥ إحْتَشَبوا: کۆبونەوە. ٥ الحَشيبُ من الثياب: قوماشی ئەستور ٥ حَشْحَشُوا: ویستی رایەڕێ بکەوێتە جمو جوڵ ٥ حَشْحَشَتِ النار: ئاگرەکە سوتاندی.

حَشَدَ القومَ حَشْداً: قەومەکەی کۆکردەوە ٥ أحْشَدوا: خەڵکەکە کۆبوونەوە بۆ کارێک. ٥ احْتَشَدَ القومُ على الأمر: قەومەکە لەبارەی کارەکە کۆبوونەوەو هەموویان هاریکاری یەکتری دەکەن. ٥ الحاشِدُ: تێکۆشەرو هەوڵدەر ٥ الحَشَادُ: ئەو شوێنانەیە بە کەمێک باران لافاویان لێ هەڵدەستێ.

الحَشْدُ من الناس: گروپو کۆمەڵ.

ألحَشْدُ من الرجال: ئەو پیاوەیە چی لە توانادا بێ بۆ یارمەتیدانی خەڵك درێغی ناکا.

الحَشْدُ من الأمكنة: ئەو شوێنەیە بەکەمێک باران لافاوی لێ هەڵدەستێ.

ألحَشْدُ من العيون: ئەو چاوەیە هەمیشە فرمێسك دەرێژێ.

ألمَحشُود: قسە رۆییشتوو.

حشرهم حَشْراً: کۆی کردنەوەو راپێچی کردن.

حَشَرَ الجدبُ الماشيةَ: قاتو قڕی مەڕو ماڵاتی بە قڕداو هەمووی لەناو بردن. ٥ حَشِرَ الشَّيْءُ: شتەکە لینج بوو ٥ حَشَرَهُ: کۆی کردەوە همنێکی خستنە پاڵ هێندێکیان. ٥ تَحَشَّرَ: کۆبونەوە. ٥ الحاشِرُ: ناوێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری ئیسلام.

الحَشْرُ: کۆبونەوە ٥ کۆبونەوەی ئادەمیزادەکان لە رۆژی قیامەتدا. ٥ ألحَشَرَةُ: زیندەوەرێك لە گیاندارانی سەر زەوی وەکوو قالۆچەو دوپشکو مشكو ژیشكو ئەو جۆرە حەیوانانە ٥ ألمَحْشَرُ: شوێنی کۆکردنەوەی ئادەمیزاد بەهەر شێوەیەك بێ ٥ ألمَحْشَرَة: ئەو گیاو گژەیە کە دوای دروێنە دەمێنێتەوە لە پەریزەکەدا.

حَشْرَجَ: هەناسەکەی لە قورگی دا هاتوو چۆی کرد.

ألحَشْرَجُ: کونێکە لە کێو ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە ئاوەکە صاف دەبێ.

حَشَّ الشَّيْءُ حَشّاً: شتەکە تەڕایی نەماو وشك بوو ٥ حَشَّتِ اليدُ ونحوها: دەستەکە شەلە پەتە بوو وشك بوو.

حَشَّ الحشيشَ: گیا حەشیشەکەی دروەوەو کۆی کردەوە.

حَشَّ الماشية: گیای بۆ ئاژەڵەکان هاویشت.

حَشَّ النارَ: سوتەمەنی بۆ ئاگرەکە کۆکردەوە، تێکی وەردا بۆئەوەی خۆش ببێو بڵێسە بسێنێ.

حَشَّ الحربَ: ئاگری شەڕەکەی هەڵکرد ٥ أحَشَّ المكانُ: ئەو شوێنە گیاو گژی تێدا روا. ٥ أحَشَّ الكلأ: وەختی دروێنەی گیاکە هات. ٥ أحَشَّ فلاناً:

يارمەتی فلانکەسی دا بۆ درونەوەی گیایەکەو کۆکردنەوەی ٥ **أَحَشَّ اللهُ يَدَهُ**: خودا دەستی وشك کرد ٥ **أَحَشَّت الحامِلُ الجنينَ**: ئافرەتەکە منداڵەکەی لەبار چوو. ٥ **احتَشَّ الحَشيشَ**: گیایەکەی درویّنە کرد. ٥ **احتَشَّ للنارِ**: سوتەمەنی بۆ ئاگرەکە کۆکردەوە. ٥ **الأُحشُوشُ**: کۆرپەلەی وشکەوەبوو لەسکی دایکی دا، ٥ **الحُشاشَةُ**: باقی ماندەی گیان لە نەخۆشدا ٥ **الحُشَّةُ**: تەپۆلکەی گەورە کە حەشیشەی لەسەر بروێ، ٥ **الحَشّاشُ**: درویّنەکەری گیا حەشیشە ٥ **الحُشّاشُ**: داس، ماراغان، ئامێرێکە گیاو گژی پێ دەدروێتەوە. ٥ **الحَشّاشون**: پێرێکن لە شیعەی ئیسماعیلی، ٥ **الحَشيشُ**: گیاو گژی وشك بوو کە بتوانرێ کۆبکرێتەوەو بکرێ بە لەوەڕ بۆ ئاژەڵ ٥ **الحَشيشَةُ**: باقەو گورزەیەك لە گیاو حەشیشە. ٥ **المِحَشُّ**: داسی درونەوەی گیاوگژ ٥ مقاشو کۆڵەوەژی ئاگر تێك وەردان ٥ **مِحَشُّ الكتيبة**: پیاوی ئازاو چاو نەترس ٥ **المِحَشَّةُ**: بەمانا (المِحَشُّ) دێ ٥ گۆچانێك یان دارێکی درێژ کە گەڵای درەختی پێ بوەرێنێ.

**حَشَفَ** حَشْفاً: وشك بوو چرچ بوو وێك هاتەوە ٥ **حَشَفَ النخلُ**: خورماکە خراپ بوو دەنکەکانی وشکەڵ بوون. ٥ **تحَشّفَ فلان**: فلانکەس پۆشاکی رزیوو دڕاوی لەبەرکرد. ٥ **إستَحْشَفَ الأنفُ**: ناو لوتی وشك بوو جەمو جوڵی خۆی بەئاسانی بۆ ناگرێ.

**الحَشَفُ** من التمر: خورمای وشکەڵو خراپ.

**الحَشفُ**: خراپو بێ کەڵك ٥ **الحَشَفَةُ**: ئەوەی دوای سوننەتکردنی ئالەتی نێرینە دەردەکەوێ ٥.

**حَشَكَ** القومُ حشوكاً: خەڵکەکە کۆبونەوە ٥ **حَشَكَ** فلان الناقةَ: فلانکەس حوشترەکەی نەدۆشی بۆئەوەی شیر لە گوانەکانیدا کۆبێتەوە. ٥ **حَشَكَ الحيوان** حَشَكاً: ئاژەڵەکە جۆی کرۆشت. ٥ **احْشَكَ الدابةَ**: ئالیكو جۆی دا بە ئاژەڵەکە. ٥ **الحِشاك**: دەمبێن، لولە دارێکە لە دەمی بێچوی ئاژەڵ دەکرێ بۆئەوەی نەتوانێ لە گوانی دایکی شیر بخوا ٥ **الحَشَكَةُ**: تاوە بارانو شتی لەوجۆرە. ٥ **الحَشَكَةُ**: کۆمەڵی ئادەمیزاد ٥ **الحَشيكَةُ**: جۆ ٥.

**حَشَمَ** فلان حُشُوماً: فلانکەس بەخۆیدا شکایەوەو شەرمی کرد. ٥ **حَشَمَ** منه: شەرمی لێکرد ٥ **حَشَمَ** فلاناً حَشْماً: ئەزیەتی داو قسەی وای لە روداکرد پێی ناخۆش بێ ٥ **حَشِمَ** حَشَماً: خەجاڵەت بوو ٥ رقی هەڵسا. ٥ **حَشَمَهُ**: رقی هەڵساند. ٥ **احتَشَمَ**: شەرمی کرد ٥ لە ژیانیدا رێبازێکی مامناوەندی گرتە بەر. ٥ **احتَشَمَ بأمره**: گرنگی بە کارەکەی دا. ٥ **تحَشَّمَ منه**: شەرمی لێکرد. ٥ **تحَشَّمَ الشَيْءَ**: خۆی لە شتەکە پاراستو خۆی لێ دوور خستەوە. ٥ **الحَشَمُ**: داروو دەستەو تاقمی کەسێك کە بۆ هەموو کارێك گوێ لە مستی بن لە خۆشیو ناخۆشیدا هاریکارو هەماهەنگی بن. ٥ **الحِشْمَةُ**: حەیاو شەرم ٥ رێبازی مام ناوەندیو میانەڕەوی. ٥ **الحُشوم**: درزو چرچو لۆچ ٥ **الحَشِيمُ**: ئادەمیزادی بەحەیاو رەزانو بەخۆ چاراو ٥ شکۆمەندو رێزگیراو.

**حَشِنَ** الوعاء ونحوه: قاپەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد بەهۆی چەوری ئەو ماستەی پێوەی نووساوە. ٥ **أحشَنَ الوِعاءَ ونحوه**: باری بە شتنی مەنجەڵەکەوە نەگرت گوێی بە شتنی نەدا تا بۆگەنی کرد. ٥ **حاشَنَهُ**: جنێوی پێداو قسەی ناشیرینی ئاراستە کرد. ٥ **الحِشانُ**: قاپێك کە بۆنی گۆڕابێ ٥ **الحِشْنَةُ**: کینەو رقو قار. ٥ **الحَشْوَرُ من الدواب**:

زینــدەوەری قــەبارە گــەورەو زەبــەللاح، ٥ اَلْحَشْوَرَةُ: پیرە ژنی قسە خۆش.

حـشا فلانـاً: زەبرەکـەی ئاڕاسـتەی ریخۆڵـەی فـلان کرد.

حشي فلان: ناوسکی ئازاری لێ پەیدا بوو ٥ حُشِيَ فلان غيظاً وكبراً: فلانکەس پڕبوو لە قین و قار. ٥ حَشَّىَ الكتابَ: پەراوێزی بۆ کتێبەکە کرد. ٥ حَشَّى الثوبَ: پـەراوێزی بـۆ کراسـەکە دروست کرد. ٥ احْتَشى: پڕبوو. ٥ انْحَشى: دەنگێ تێکەڵ بـە دەنگـی تـر بـێ ٥ تَحَشَّتِ المرأةُ: ئافرەتەکـە فەروە یا ئیسفنجی خستە سەر سمتی بۆئـەوەی وا بزانرێ سمتی گەورەن. ٥ الحاشيةُ: لە هـەموو شتێـك، قـەراغ و بیجـاغ و دەوروبـەری ئـەملاو ئەولا.

الحشا: ئەوەی ژێر پەردە ئەو دیو پێـستی سك کـە هـەموو ناوسـك دەگرێتـەوە بەجـەرگ و سـپڵ و ریخۆڵـە و ئـەو شـتانەوە ٥ الحَشاةُ: زەوی رەش و سوتە مـەڕۆ کـە هیـچ خێـرو بێرێـکی لێ پەیـدا نەبێ.

اَلْحَشْوُ: نـاواخن. ٥ اَلْحَشْوُ مـن الابـل: حوشـتری بچوك ٥ الحُشْوَةُ: هەرچی لەناو سکدا بێ جگە لە بـەزو پیـو. ٥ الحُشْوَةُ مـن الـشاة: ناوسـکی مەڕەکەیە. ٥ الحُشْوَةُ من النـاس: خـوێڕی هـەتیو مـچە ٥ اَلْحَشِيُّ: ئەوکەسـەی ئـازاری ناوسـکی هـەبێ ٥ شـتی وشـك بـوو، پـوش و پـەلاش ٥ اَلْحَشِيَّةُ: راخـەرو لێفـەی نـاودار ٥ دەرپێیـەکی کورتە لە فەروە یان لە ئیسفنج دروست دەکرێ ئـافرەت لـە پێـی دەکـا بۆئـەوەی سمتـی گۆشـتن دیاربن.

حصأ من الماء: تێر ئاو بوو. ٥ أحصأه: تێر ئاوی کرد.

حَصَبَهُ حَصْباً: بەردە ورکەو شتی وای تێگرت.

حَصِبَ المكان: شوێنەکەی بە بەردە وردکە راخست بەردە وردکـەی لـە شـوێنەکە رۆکـردن و بـلاوی کردنـەوەو تـەختی کـردن. ٥ حَـصَبَ النـارَ بالحَـصَب: بـەردی گۆگردی فرێدانە نـاو ئاگرەکە بۆئـەوەی خـۆش ببێ و بڵێسەی زیاد بکا ٥ یان دەستە چیلەی تـێ فرێـدان بۆئـەوەی زیـاتر بڵێـسەی زیـاد بکـا. ٥ حَصِبَ الطفـل: منداڵەکـە سورێژەی لێ هـاتن. ٥ احْصَبَ فلاناً عن كذا: فلانکەسـی لەوشوێنە یـان لەوشتە دورخستەوە. ٥ حَصَّبَ المكانَ: شوێنەکەی بـە بـەردە وردە فـەرش کـرد. ٥ حُصِّبَ الطفـل: منداڵەکـە سـورێژەی گـرت ٥ تحاصَـبا: بـەردە وردکەیان بە یەکتردادا ٥ تَحَصَّبَ الطيُ: باڵندەکە لـە لانـەی دەرچـوو بۆئـەوەی دانەوێڵـەی دەسـت بکـەوێ. ٥ الحاصِبُ: شـوێنی بـەردە وردکـاوی ٥ الحِصَابُ: شوێنی شەیتان رەجم کردن. ٥ اَلْحَصَبُ: بـەردە وردکـە ٥ داری سـوتاندن ٥ اَلْحَـصْبَاء: بەردە وردکە. ٥ اَلْحَصْبَةُ: بـەمانا (اَلْحَـصْباء) دێ ٥ سـورێژە (کۆکـەو هەلامـەت و لـەرزو تـای لەگەڵدایـە). ٥ اَلْمَحْصَبَةُ: دەگوترێ: (أرض محصبة): زەوییـەکی بـەردە وردکاوییـە زۆری بـەردە وردکـە لێ هەیە ٥ المحصب: شوێنی شەیتان ڕەجمکردن.

حَصْحَصَ: بەشێوەیەك ڕۆیشت وەکوو پێوەندی لە پێدابێ.

حَـصْحَصَ الـشَّيْ: شـتەکە دوای نادیـاری نامەعلوومی رون بووەوە.

حَصْحَصَ بفـلان: بـە فلانکەسـەوە نووسـاو وازی لێ نەهێنا.

حَـصْحَصَ الـشَّيْ: شـتەکەی جوڵانـدو ئەمـدیوو ئەودیوی کرد.

حصْحَصَ الـشيء في الـشَّيْ: شتەکەی جوڵانـد تالـەناو شتەکەی تردا جێگیربوو.

حَصْحَصَ البعير بصدره الأرضَ: حوشترەكە بەسنگی زەوییەكەی تەخت كرد تالەسەری بیخ بخواو پاڵبكەوێ. ◊ تَحَصْحَصَ الوبَرُ ونحوه: كوڵكەكە روتایەوەو بڵاوبووەوە. ◊ الحَصْحَاصُ: گڵ ◊ الحُصْحُصُ والحُصْحُوصُ: ئەو پیاوەی زۆر بەدوای شت دا بگەڕێو شت ورد بكاتەوە.

حَصَدَ الزرْعَ والنباتَ: گیاو دەغڵەكەی بەداس دروێنەكرد. ◊ حَصَدَ القومَ بالسیف: خەڵكەكەی بە شمشێر كوشتو قاره بڕی كردن. ◊ حَصِدَ الحَبْلُ: حەبلەكەی توند باداو گشتی كرد، ◊ أحْصَدَ الزرعَ: كشتوكاڵەكە كاتی دروێنەی هاتووە. ◊ أحصَدَ الحبلَ: حەبلەكەی گشت باداوە زۆر بەپتەوی دروستی كردووە. ◊ اُحْتَصَدَ الزرعَ ونحوه: بەمانا (حَصَدَهُ) دێ. ◊ اسْتَحْصَدَ: توندوپتەوی كرد. ◊ الحَصَادُ: بەمانا (الحَصْدُ)دێ ◊ الحَصْداءُ من الشجر: ئەو درەختەیە گەڵای زۆربێ. ◊ الحَصِيدُ: كشتوكاڵی درواوە ◊ حصائد الألسنة: قسەو باسێك كە بێ ماناو سودو قازانج بێ ◊ المِحْصَدُ: داسو ماراغان ◊ ئامێری دروێنە، ◊ المُحْصَدُ: بیرو بۆ چونی راستو دروست.

حَصَرَ الإخليلُ: بۆری میزی یان بۆری هاتنەوە دەرەوەی شیری تەنگە بەربووە. ◊ حَصَرَ فلاناً: تەنگی بەفلان هەڵچنی ◊ حَصَرَ الشيءَ: شتەكەی سەر ژمێر كرد. ◊ حَصِرَ فلان حَصَراً: فلانكەس سنگی توندبوو ◊ بەخیلو رژدبوو، ◊ حَصِرَ القاريءُ: قورئان خوێنەكە زمانی گیراو وشەكانی بۆ دەرنەبڕان ◊ حَصِرَ بالسرِّ: نهێنی یەكانی شاردەوە ◊ حُصِرَ فلان: فلانكەس توشی گرفت بوو، پیسایی بۆ نەكرا. ◊ أحْصَرَ فلاناً: فلانكەسی بەند كرد. ◊ أحْصَرَهُ المرضُ وأحْصَرَهُ الخوف: نەخۆشی یان ترسو بیم رێگەی بەردەوامبوونی لەسەر كارەكەی لێ گرت ◊ أُحْصِرَ فلان: فلانكەس توشی گیرانی ریخۆڵە بوو ◊ حاصَرَهُ: دەورەی داو هەموو لایەكی لێ گرتو نەیهێشت لە شوێنی خۆی دەربچێ. ◊ الحِصَارُ: پەتو زنجیری بەستنەوەی وڵاخ ◊ ئەو شوێنەی ئادەمیزادی تێدا بەند دەكرێ ◊ الحَصْرُ: واتە: كورت هەڵێنان ئیثباتی حوكم بۆشتەكەو لادانی لەشتی تر ◊ الحُصْرُ: میز گیرانو پیسایی گیران. ◊ الحَصُورُ: دەستو دەمو داوێنپاك. ◊ الحَصِيرُ: بێ چكڵدانەو تەنگەتیزەو تورە ◊ الحَصِيرَةُ: حەسیر راخەری چنراو ◊ المحصورة: زەوی پەرژینكراو. ◊ حَضْرَمَ فلان: كابرا رژدو چروك بوو.

حصّ الشعْرَ حصّاً: مووەكانی تاشین. ◊ حَصَّ الشيءَ: شتەكەی رۆیاند. ◊ حَصِصَ الشَّعْرُ: قژەكانی هەڵوەرین ◊ حَصَّ الطائِرُ وحَصَّ جناحهُ: باڵندەكە پەروباڵی تەنك بوون هەڵوەرین ◊ أحَصَّهُ: بەشی خۆی پێ دا. ◊ حَاصَّهُ وحِصاصاً: شتەكەی بەش بەش كرد هەركەسە بەشی خۆی برد. ◊ حَصْحَصَ الشيءُ: شتەكە دەركەوتو رون بووەوە. ◊ حَصْحَصَ الشيءَ: شتەكەی بەش بەش كرد. ◊ إنْحَصَّ: روت بۆوە تووكو قژی هەڵوەرین. ◊ تَحاصُّوا الشيءَ: شتەكەیان كردە چەند بەشێك. ◊ تَحَصَّصَ فلان: قژی روتایەوە. ◊ الأحَصُّ: پیاوێك كە قژی زیاد نەكا، ◊ الحاصَّةُ: نەخۆشییەكە دەبێتە هۆی قژ هەڵوەرین. ◊ الحصّاصة: ئەو تولەی بەمێوەكەوە دەمێنێ پاشی بڕینی.

الحِصُّ: بەشو بار، ◊ الحَصِيصَةُ: ئەو توكو كوڵكو موومیە دوای تاشینو هەڵكەندن كۆبكرێتەوە، ◊ حَصُفَ الشيءُ حصافةً: شتەكە پتەوو تۆكمە بوو كەمو كورتی تێدا نەبوو ◊ أحْصَفَ الفرسُ ونحوه: ئەسپەكە بازی بە هێزی هاویشت ◊ أحْصَفَ

الشيءَ: شتەکەی پتەوکرد ٥ أحْصَفَ الحَرُّ فلاناً: گەرما کاری کردە سەرفلان‌و زیبکەی لە پێست‌و جەستەدا پەیداکردن. ٥ أحْصَفَ الشَّيءَ عن كذا: شتەکەی لەوە دوور خستەوە. ٥ استحْصَفَ القومُ: قەوم‌و خوێش کۆبونەوە. ٥ استحْصَفَ عليه الزمانُ: رۆژگار لەگەڵ فلان دا توندو تیژ بوو.

الحصفُ: گرویی وشك ٥ زیبکەی بچوك.

**حَصَلَ** الشَّيءُ حصولاً: شتەکە مایەوە پەیدا بوو. ٥ حَصَلَ عليه كذا: ئەوەی لەسەر چەسپاو پێویست بوو. ٥ أحْصَلَ النَّخْلُ: خورماکە ئاڵ‌و بۆڵی لێ پەیدا بوو یان زۆر خورمای خراپ‌و پوچی تێکەڵاو بوو. ٥ حَصَّلَ الشَّيْءَ والأمْرَ: شتەکەی یا کارەکەی لە وانی تر جیا کردەوە، ٥ حَصَّلَ: کۆی کردەوە ٥ حَصَّلَ العلم: زانیاری بەدەست هێنا. ٥ حَصَّلَ المالَ: ماڵ‌و سامانی کۆکردەوە. ٥ حَصَّلَ الكلامَ: رستەکەی بردەوە سەربنج‌و بناوان. ٥ تَحَصَّلَ الشَّيْءُ: شتەکە کۆبوەوەو چەسپا ٥ ألْحَاصِلُ: ئەو زێڕە پاڵفتەکراوەیە کەلە بەردی کانەکان جیاکراوەتەوە ٥ حاصِلُ الموضوع: پوختەی باسەکە. ٥ الحُصَالةُ مِنَ الحَبِّ: پاڵفتەکراوی گەنم‌و جۆو ئەو جۆرە شتانە. ٥ الحُصَالة: کیسەی پارە ٥ قاصەی پارە ٥ کیسە باخەڵ.

ألْحَصَلُ: خورمای ئاڵ‌و بۆڵ تێکەوتوو ٥ الحصيل: ماڵ‌و سامانی بەدەست هاتوو یاهەرشتێکی تر پەیدا کرابێ ٥ ألْمُحَصِّلُ: ئەو کەسەیە گڵی کانەکە دەردێنێ ٥ هەروا ئەو کەسەیە زیوەکە لە گڵ‌و بەردی کانەکە جیا دەکاتەوە ٥ ألْمِحْصَلُ: بێژینگ، ٥ ألْمَحْصُولُ: بەمانا (الحاصل) دێ ٥ باقی ماندەی شت ٥ پاڵفتە کراوی شت.

**حَصَمَ** الشَّيءَ حَصْماً: شتەکەی ورد کردەوە. ٥ انْحَصَمَ العودُ: شورکە دارەکە شکا. ٥ ألْحَصِيمُ: بەردە وردە. ٥ المحصَمَةُ: دەسکەوان.

**حَصُنَ** المكانُ حَصَانةً: شوێنەکە پارێزراو بوو، پتەوبوو. ٥ حَصُنت المرأةُ حِصْناً وحصانةً: ئافرەتەکە داوێن پاك بوو ٥ شوی کرد ٥ أحْصَنَ الرجلُ: پیاوەکە ژنی هێنا ٥ أحْصَنَ الفرسُ: ماینەکە جوان‌و ئەسپی بوو ٥ أحْصَنَ الشَّيْءَ: شتەکەی پاراست. ٥ حَصَّنَ الشَّيْءَ: بەمانا (أحْصَنَهُ)دێ. ٥ تَحَصَّنَ: پارێزگارو قەڵاو شورەی بۆ دروست کرد بۆ ئەوەی بیپارێزێ. ٥ تَحَصَّنَ بالحصنِ: خۆی بەشوراو قەڵاکە پاراست. ٥ تحصَّنت المرأةُ: ئافرەتەکە داوێنپاك بوو. ٥ الحاصنُ والحاصنةُ من النساء: ئافرەتی داوێنپاك یان خاوەن مێرد. ٥ الحِصانُ: ئەسپ.

الحِصْنُ: قەڵا، سەنگەر، ٥ ألْحَصِينُ: شوێنی قایم‌و پتەو. ٥ المحْصَنُ: قەڵا.

حَصَاهُ حصواً: مەنعی کرد.

**ألْحَصْوُ**: ژان یا پێچ کە بەریخۆڵە دا دێن. ٥ حَصِيَت الأرْضُ حصىً: زەوییەکە بەردە وردەی زۆربوون.

**حُصِيَ** الرجلُ: پیاوەکە توشی ئەوە بوو بەرد بکەوێتە میزەڵدانیەوە ٥ أحْصى الشَّيْءَ: ئەندازەی شتەکەی زانی ٥ حَصَّى الشَّيْ: شتەکەی پاراست. ٥ تَحَصَّى: خۆی پاراست. ٥ إسْتَحْصَى: عەقڵ‌و ئارەزوی تەواو بوو پێگەیی.

**ألْحَصَى**: بەردە وردە ٥ ژمارەی زۆر. ٥ الحُصاة: تاك لەبەردە وردە ٥ میز خەستبوونەوە لە میزەڵدان دا تاوای لێ دێ وادەزانی بەردە وردەیە ٥ حصاةُ اللسان: زمانپاراوی. ٥ الحَصيُّ: پیاوی عاقڵمەند. ٥ ألْمَحْصَاةُ: بەردەڵان.

حَضَأت النارُ حَضْئاً: ئاگرەکە هەڵگیرساو بڵێسەی سەند.

**حَضَأَ** النارَ: ئاگرەکەی داگیرساندو خۆشیکرد. ٥ **حَضَأَ** الحوادثُ الهمومَ: رووداوەکان خەمو خەفەتیان هێنا. ٥ **احتَضَأَ النارَ**: بەمانا (حَضَأها) دێ. ٥ **الحِضَاءُ**: بڵێسەی ئاگر. ٥ **الحَضِيءُ**: زۆر سپی، ٥ **المِحْضَأ**: مقاش، کۆڵەوەژ.

**حَضَبَ** النارَ حَضْباً: دارو چیلکەی خستە ناو ئاگرەکە بۆ ئەوەی زیاتر بڵێسە بسێنێ ٥ **تَحَضَّبَ الرجل**: ئەو پیاوە رێگای ناخۆش و هەڵدێرو پڕ کەندو لەندی گرتە بەر لەبەر نزیکی، ٥ **اَلْحَضَبُ**: داری سوتاندن ٥ سوتەمەنی.

**حَضَجَ** عن الطريق: لەرێگاکە لای دا ٥ **حَضَجَ** بالشَّيءِ الأرضَ: شتەکەی بەزەوی کێشا. ٥ **حَضَجَ** بفلان الأرضَ: فلانکەسی بەزەوی دا داو خستی. ٥ **حَضَّجَ** كلامَهُ وبه وفيه: قسەکەی کورت کردەوە ٥ **انْحَضَجَ البَعِيرُ وغيرُهُ**: حوشترەکە یان ولاغەکە لەسەر لا کەوت پیخی خوارد ٥ **انْحَضَجَ على الشيءِ**: بەسەر شتەکەدا بلاوکرایەوە.

**الحِضْجُ**: ئەوەیە بە زەوییەوە بنوسێ ٥ ئەو قوڕو لیتەیە بەبنکی حەوزی ئاوەوە دەنووسێ ٥ **المِحْضاجُ**: دارێکە بەئەندازەی کلکە پاچو بچوکتر جل شۆر کە جل دەشوا بەوداره لە جلەکان دەدا بۆ ئەوەی زوو چڵکەکەیان لێ بێتەوە.

**حَضَرَ** فلان حَضارةً: فلان لەئاوەدانی دا نیشتەجێ بوو ٥ بوو بەشارستانی. ٥ **حَضَرَ** الغائبُ حضوراً: پیاوە نادیارەکە هاتەوە، گەڕایەوە. ٥ **حَضَرَ** الشيءُ والأمرُ: شتەکە هات، پەیدا بوو. ٥ **حَضَرَتِ الصلاةُ**: کاتی نوێژ هات. ٥ **حَضَرَ** عن فلان: لە جیاتی فلانکەس ئەم ئامادە بوو. ٥ **حَضَرَ** المَجْلِسَ ونحوه: ئامادەی ئەنجومەنو کۆبونەوەکە بوو. ٥ **حَضَرَ الأمرُ بخيرٍ**: راوو بۆ چوونی جوانی دەربارەی هەبوو. ٥ **أحْضَرَ الفرسُ أو الرجلُ**: ئەسپەکە یان پیاوەکە لەکاتی رۆیشتن دا بازی دا ٥ **أحْضَرَ الشيءَ**: شتەکەی هێنا ئامادەی کرد. ٥ **أحْضَرَ الشيءَ فلاناً**: بەفلانکەس شتەکەی هێنا. ٥ **أحْضَرَ ذِهنَهُ للأمرِ**: سەرنجی راکێشا بۆ لای کارەکە. ٥ **حاضَرَ القومَ**: لەگەڵ قەومەکە دانیشت و دەرسی دا دان، قسەی بۆ کردن. ٥ **حاضَرَ خصْمَهُ**: لەگەڵ بەرامبەرەکەی دا دانیشت و ئەژنۆیان پێکەوە نان و دەستیان کرد بەدەمە دەمێ. ٥ **حَضَّرَ الشَّيْءَ**: ئامادەی کرد ٥ **حَضَّرَ الدرسَ**: وانەکەی لە ذیهنی خۆی دا ئامادە کرد. ٥ **احْتَضَرَ المكانَ**: لەو شوێنە دا نیشتەجێ بوو. ٥ **احْتُضِرَ**: کەوتە گیانەلاوەوە. ٥ **تَحَضَّرَ**: ئامادەبوو ٥ رەوشت و داب و نەریتی شارستانیانی هەڵگرت ٥ **استحضَرَهُ**: داوای ئامادەبوونی کرد. ٥ **استَحْضَرَ الفَرَسَ**: بازی بەئەسپەکەدا. ٥ **استَحْضَرَ فلان المسائلَ والمعاني**: فلان مەسەلەو زانیارییەکانی بیر خۆی هێنایەوە. ٥ **حاضر البديهة**: زوو لەشت حاڵی دەبێ. ٥ الحاضرة: قەومێکی دانیشتوو لە ئاوەدانی یەك دا. ٥ **حاضرة الشيءِ**: نزیك بەو شتە ٥ **الحِضار**: جۆرێکە لە رۆیشتنی ولاخ، جۆرە رەوتێکە. ٥ **الحِضار من الأبلِ**: حوشتری بە هێزو خۆشرەو ٥ **اَلْحِضارة**: نیشتەجێ بوون لە ئاوەدانی و شاردا.

**الحَضَرُ**: شارو گوندو شارۆچکە ٥ **اَلحُضْرُ**: رۆیشتنی بەباز. ٥ **الحَضْرَةُ**: حازربوون ٥ **اَلْحضيرةُ**: پێرێك لەقەومو خوێش، یان گرووپێك کە خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردبێ ٥ پێشەنگای سوپا ٥ **المِحْضار**: ئەوەیە هەنگاوی بەهێز بهاوێ، ٥ **محاضير العرب**: خێڵێکن لە عەرەب بۆ رۆیشتن بەناو بانگ بوون ٥ **اَلْمَحْضَرُ**: شوێنی شت لێ دەرهێنان ٥ ئەو

خێڵو هۆبەن دەچنە سەر ئاوێك و لێ ی دەمێننەوە ٥ پەڕە کاغەزێکە ڕوداوێکی تێدا دەنووسرێ لەکۆتایی دا چەند کەسێك واژۆی دەکەن ٥ اَلْمُحضِرُ: کاربە دەستێکە سەرەنجامی بڕیاری دادوەر بڵاو دەکاتەوە ٥ المحضور من الأشیاء: ئەو شتەیە زوو تێك بچێو بفەوتێ. ٥ حَضْرَمَ في کلامه: لەنگیو زمانخواری بەقسەکانیەوە دیار بوو. ٥ حَضْرَمَ الشَّيءَ: شتەکەی تێکەڵاو کرد. ٥ الْحَضْرَميُّ: هەر کەسێك خەڵکی (حضرموت) بێ. ٥ حَضَّهُ على الأمر حضاً: هەڵینا بۆ کردنی کارەکەی ٥ حَضَّضَهُ على الأمر: هەڵی ناو بەجەختەوە داوای لێ کرد کارەکە بکا. ٥ تَحاضُّوا: ئەو کۆمەڵە یەکتریان هەڵنا بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

**الحَضَضُ**: هیچ ٥ الحَضِيضُ: چاڵو زلکاو ٥ هەر شوێنێك لەزەوی کەنزم بێ ٥ الْحَضِيضَةُ: ئەوەی لەتوانا دابێ ٥ حَضَنَهُ حَضْناً وحضانةً: خستیە ژێر چاودێری و ژێر باڵی خۆیەوە ٥ الحاضِنة: دایەن ٥ ئەو ئافرەتەی لە شوێنی باوكو دایك ئەرکی بەخێو کردنی زارۆك لە ئەستۆ دەگرێ.

**الحِضْنُ**: باوەش، سینگ تا دەگاتە خوار ناوکەوە. ٥ الحِضْنُ من کل شيء: ئەملاو ئەو لای شتە.

**حضا** النارَ حَضْواً: ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

**حَطَأ** به الأرضَ حَطْأً: بەزەوی داداو خستی. ٥ حَطَأ الرَّجُلَ: بەبەری دەستی پانەوپان بەپشتی پیاوەکەی کێشا. ٥ حَطَأ الشَّيءَ وبه: شتەکەی پاڵ پێوە ناو هاویشتی، شتەکەی لەولاداو داکۆکی لێ کرد ٥ الْحِطْءُ: پاشماوەی ناو لەبنکی پەرداخو قاپ دا ٥ الحَطِيءُ من الناس: هەتیو مچە ٥ الْحُطَيْئَةُ: پیاوی کورتە باڵا ٥ پیاوی ڕوخسار ناشیرین.

**حَطَبَ** حطْباً: داری سوتاندنی کۆکردنەوە. ٥ حَطَبَ في حبل فلان: یارمەتی فلانی داو کەوتە سەر بیرو باوەڕی ئەو. ٥ حَطَبَ علینا بخیر: هەوڵی خێرو خۆشی بۆ داین. ٥ حَطَبَ العِنَبَ: وشکەڵو بێزوڵەکانی لە دار میوەکە کردەوە ٥ حاطب لیل: ئەوکەسەی گوێ نەداتێ هەرچی بەسەرزاری دابێ بیڵێ. ٥ حَطِبَ المکانُ حَطَباً: ئەو شوێنە دا ری زۆر بوو. ٥ احْطَبَ المکانُ: بەمانا (حَطَبَ) دێ. ٥ احْطَبَ الکَرْمُ: داری میوەکە شیاوی ئەوەیە بکرێتە داری سوتاندن. ٥ احْتَطَبَ الْحَطَبَ: داری سوتاندنی کۆکردنەوە. ٥ احتَطَبَ المطرُ الزرعَ: بارانەکە کشتو کاڵەکەی لە بێخ دەرهێنا. ٥ اسْتَحْطَبَ الکَرْمُ: تولە میوەکان وشك بوونو شیاوی ئەوەن ببڕدرێنو بکرێنە سوتەمەنی. ٥ الحِطابُ: ئەو تولە میوانەن کە ساڵانە لەدارە میوەکە دەبڕدرێ پێی دەڵێن:مێولاك. ٥ الحَطَبُ: هەرچی وشك بووبێ لەلقو پۆپی درەختو تولە مێوو کشتو کاڵ ٥ الْحَطّابُ: دار گرد کەرەوە، دار فرۆش، ٥ المِحْطَبُ: بیور، تەور ٥ حَطْحَطَ في عمله أو مَشْیه: پەلەی کرد لەکارەکەی دایان لەڕۆیشتن دا یان کەوتە خوار، بەربۆوە. ٥ حَطَرَهُ حَطْراً: خستی، کێشای بەزەوی دا. ٥ حَطَرَهُ بالنبل: تیری پێوە نان، تیرە بارانی کرد. ٥ الحاطورة: بڕندە ٥ حَطَّ فلان حَطاً: فلانکەس دابەزی نیشتەجێ بوو.

**حَطَّ** السِّعْرُ: نرخ دابەزی کاڵا هەرزان بوو. ٥ حَطَّ في عرض فلان: تانەی لە ناموسی فلان دا لە ڕێزو نرخی داشکاند سوکایەتی پێ کرد. ٥ حَطَّ الوجهُ: دەمو چاوی زیبکەیان دەردان. ٥ حَطَّ الشَّيءَ: شتەکەی داگرت ٥ الحِطابُ: ئەو تولە مێوانەن کەساڵانە لە دارە مێوەکە دەبڕدرێ

پـێی دەڵـێن: مێـولاك. ٥ حَـطَّ وِزرَه: تـاوانـی لێ داگرتو له كۆڵی دامـاڵین. ٥ حَطَّ السِعْرَ: نرخـی هەرزان كـرد. ٥ حَـطَّ الـدَّيْنَ: قەرزەكەی لەسـەر لابرد. ٥ حَـطَّ الـشَّيْءَ: شتـەكەی دانـا. ٥ إِحْتَطَّهُ: دابەزیو سەرەوژێر بۆوە ٥ اسْتَحَطَّ فلاناً وِزرَهُ: لـه تاوانــەكانی فلانــی كــەم كــردەوە. ٥ الحُطــائط: ئــادەمیزادی بــچوكو كورتــه بــالاّ ٥ الحَطــاط: رۆنەكەرە ٥ زیبكەی دەمو چاو. ٥ الحُطـاطُ: بـۆنی نـاخۆش. ٥ الحَطاطـةُ: كـەنیزەكی بـچوك. ٥ الحِطَّـة: داوای لێخۆشـبون لــەتاوان ٥ الحَطُــوطُ: شــوێنی دابەزین ٥ قەقیانه. ٥ المَطِیطُ: بەمانا (الحطـائط) دێ ٥ الحَطِیطَـةُ: ئـەو بـڕە پارەیـەی لـە كۆتـایی حیسابكردن دا چاو پۆشی لێ دەكرێو دەكرێتـه سەماح، ٥ اَلْمَحَطُّ: شوێنی دابەزینو تێدا مانەوە ٥ المحطــوط: شمــشێری تیــژ ٥ اَلْمَحْطُوطَــةُ: كــه نیزەیەكی قەدو بالاّ جوانو شۆخو شەنگ.

**حَطَمَ** الشيءَ حَطماً: شتەكەی شكاند ٥ حَطَمَ الأسدُ الماشیةَ: شێرەكه ئاژەڵەكەی تێك شكاند. ٥ حَطَمَ الناسُ بعضهم بَعْـضاً: خەڵكەكه پاڵه پەستۆیان كـردو هەندێـكیان ئەزیـەتی هەنـدێـكیان دا. ٥ حَطَمَ حَطَمـاً: بـەهۆی نەخۆشـی یـان پیری كزو لاواز بوو. ٥ حَطَمَت الدابةُ: ئاژەڵەكه توشی سەم قڵیشان بوو. ٥ أَحطَمَت الأرضُ: زەوییەكه وشكەڵو پـرژو پـاڵی زۆر بـوو. ٥ انْـحَطَمَ النـاس علیـه: خەڵكەكه گەله كۆمەكیان لەسەر كرد. ٥ تَحَطَّمَت الأرضُ: زەوییەكــه هــەڵوەری بــە هــۆی زۆر وشـكبوونەوەی. ٥ تَحَطَّـمَ البـیض عــن الفـراخ: هێلكەكــه پــیس بــوو بێــچووی لێ هاتــەدەر بێچوەكه سەری له هێلكه جووقا. ٥ الحاطوم مـن السنین: ساڵی قاتو قڕی و گرانـی. ٥ الحاطوم مـن الماء: ئاوی خۆشو گوارا ٥ الحُطامُ مـن كـل شيء: ئەوەی هەڵدەوەرێو وشكەڵ دەبێ.

**اَلْحَطَـمُ**: دەردێـكه توشی قاچـی ولاّخ دەبـێ، سمـی دەقەڵشێو ناتوانێ بڕوا. ٥ اَلحَطَمُ: شوانی توندو تیژو دڵڕەق لەگەڵ ئاژەڵەكانی دا. ٥ الحُطَـمُ مـن الجبل: دەربەندی كێو ٥ الحُطَمُ: زۆر خۆرێك كه تێـر نـەخوا. ٥ الحُطَمَـةُ والحُطَّمَـةُ: ساڵێـكی قـاتو قڕیو گرانـی. ٥ اَلْحِطْمَـةُ: كوێن، بـەرد شكێن، ٥ اَلْحُطَمَةُ: شوانی توندو تیژ لەگەڵ ئاژەڵەكانی دا. ٥ اَلْحُطَمَةُ من الأبل والغنم: ئەو حەیوانو ئاژەڵانەن كه بەقاچەكانیان گیاو گەڵا وردو خـاش دەكـەن گێـرەی دەكـەنو دەیخـۆن ٥ الحُطَمِیَّـةُ مـن الـدروع: زرێی پتەوو پانو پۆڕ كـه شمـشێر بـشكێنێ. ٥ اَلْحَطِیمُ: ئەو پوشو پەلاشەیە كە ساڵی بەسـەردا دێتەوەو وشك وورد بووە ٥. إِحْطَوْطَى: بای كرد.

**الحَطا**: ئەسپێی گەورە. ٥ اَلْحَطْواءُ مـن الغـنم: ئـاژەڵی سوور.

**حَظِبَ** حَظَباً: گۆشتی گـرتو قەڵەو بـوو ٥ اَلحُظُبُ مـن الرجـال: كورتـه بـالاّو ورگ زل ٥ رەوشـت زبرو توندو تیژو بێ جیكڵدانه.

**حَظَرَ** الرجلُ: پیاوەكه ئامادە باشی خـۆی وەرگـرت شوێنی بۆ ئاژەڵەكانی بنیات نا بۆ ئەوەی تێیـدا بحەوێنەوە ٥ حَظَـرَ علیـه: دەسـت بەسـتی كـردو قورومتێنــەی لەســەر دانــا ٥ حَظَــرَ الــشَّيْءَ: شــتەكەی لێ قەدەغــه كــرد ٥ حَظَــرَ الماشِــیَةَ: ئاژەڵەكـەی بەنـد كـرد، لـە نـاو گـەورە كـه نەیهێشت بڕواته دەرەوە. ٥ أَحظَرَ: زۆرو شوێنی حەوانەوەی بۆ كەسانی دیكه دروست دەكرد. ٥ حَظَّـرَ: زیـادەڕەوی كـرد لـەدابینكردنی شـوێنی حەوانـەوە بـۆ غـەیری خـۆی. ٥ احْتَظَرَ: شـوێنی حەوانـەوەی بـۆ خـۆی بنیـات نـا. ٥ الحِظَارُ: هـەر

شتێك بكەوێتە نێوان دوو شتەوە، پەرژینو
شورای باخ ◊ زەوی شورا بۆ كراو. ◊ المحظيرة:
تەویلەو ئاغەڵو گەوڕ ◊ مشتاخی خورما.

**حَظَّ** حظاً: شانسی باشی هەبوو ◊ **الحَظُّ**: بەشو بار ◊ بەختو شانس، ◊ **الحَظِيُّ**: بە خت دار.

**حَظَلَ** فلان حظلاناً: لەبەر ئازار یان لەبەر رقو كینە قاچی نەبوو بڕوا، واتە: لە رقا یا لەبەر ئازار قاچی عەرزی نەدەگرت. ◊ **حَظَلَ فلاناً حَظْلاً**: مەنعی فلانی كردو نەیهێشت بە ئامانجی خۆی بگا. ◊ **حَظَلَ علیه**: تەنگی پێ هەڵچنی. ◊ **حَظِلَ فلان حَظَلاً**: فلان رژدو چروك بوو.

**حَظَا** فلان حظواً: فلانكەس كەمێك رۆیشت.

**حَظِيَ** عند الناس حُظْوَةً: لای خەڵكی رێزی پەیدا كرد ◊ **أحظاه**: پلەو پایەی بەرز كردەوەو لە خۆی نزیك كردەوە. ◊ **أحظاه بكذا**: پیاوەتی لەگەڵ كرد بەوەی ئەوەی بۆ ئەنجام دا. ◊ **أحظى فلاناً على فلان**: فلانكەسی بەسەر فلانكەس دا پاساو دایەوە زیاتر رویدا بە ئەویان ◊ **احتظَى**: پلەو پایەی بەرزبووە. ◊ **الحِظَةُ**: پلەو پایەو رێز ◊ **الحُظْوَةُ والحُظْوَةُ**: تیرو كەوانێكی بچوكە بە ئەندازەی باسكی ئادەمیزاد منداڵ بەكاری دەهێنن بۆ فێر بوونی تفەنگو تیر هاویشتن. ◊ **الحَظِيَّةُ- الحَظِيَّةُ**: ئەو ئافرەتەیە لە هی تر خۆشەویست تربێ.

**حَفَأَهُ** حَفْئاً: گوللەی پێوە ئاو خستی.

**حَفَّأَ** به الأرض: لەسەر زەوی تەختی كرد.

**الحَفَأ**: گیا بەرەدایە ◊ رومكێكە گەڵاكانی پانن لە رۆژگاری كۆن دا بۆ نووسین بەكار هاتووە.

**حفحف** دەنگی لێوە هات.

**حفحف** الرجل: پیاوەكە گوزەرانی تەنگ بوو.

**حَفَدَ** الرجل ونحوه: پیاوەكە پەلەی كرد لەكارەكە داو زو رایپەڕاند. ◊ **أحفَدَ الدابَّةَ**: وڵاغەكەی تاودا بۆ خێرا رۆیشتنو هەنگاونانی خێرا. ◊ **الحافِدُ**: یارمەتیدەر ◊ خزمەتچی ◊ كوڕی كوڕ، كوڕی كچ واتە: منداڵی منداڵ، ◊ **الحفید**: كوڕی كوڕ، كوری كچ. ◊ **حَفَرَتْ أسنانُه حَفْراً**: ددانی خراپ بوون بنكیان كرمۆڵ بوو.

**حَفَرَ** عن الشيَ: لەناو زەوییەكە دەستی كرد بەهەڵكۆڵینو بەدوا داچونو پشكنین بۆ ئەوەی شتەكە بدۆزێتەوە دەری بێنێ ◊ **حَفَرَ ثَرى فلان**: دەربارەی فلانكەس توێژینەوەی ئەنجام دا بزانێ پیاوێكی چۆنەو چیە. ◊ **حَفَرَ الشَّيَ**: چاڵێكی لەشتەكە كرد، ◊ **حَفَرَ** المرض ونحوه فلاناً: نەخۆشی فلانی لاوازی كرد. ◊ **أحفَرَ فلان**: فلانكەس ئیشی لە چاڵەكە دا كرد بەپاچو قوڵنگ. ◊ **أحفَرَ الصبي والحیوان**: منداڵەكە ددانی حەوت ساڵەی كەوتن ◊ **حافَرَ**: زێدەرەوی كرد لە هەڵكەندن دا ◊ **احتَفَرَ بكذا**: بەوشتە زەوی هەڵكۆڵی. ◊ **احتَفَرَ عن الشيء**: بەمانا (حَفَرَ) دێ. ◊ **احتَفَرَ الشيءَ**: شتەكەی هەڵكۆڵی. ◊ **تَحَفَّرَ السیلُ**: لافاوەكە زەوی دا دڕی. ◊ **تَحَفَّرَ البئرُ**: بیرەكە ئەملا و ئەولای دا خورانو لەسەرەوە بۆ خوارەوە دیوارەكانی (قەراخەكانی) دا ڕوخان. ◊ **الحافِرُ من الدواب**: سمی ئاژەڵو وڵاخ ◊ **الحِفارةُ**: پیشەی هەڵكۆڵین. ◊ **الحَفْرُ**: ئەو شتەی چاڵ كرابێ ◊ بیرێك زیاد لە ئەندازەی خۆی پان كرابێ ◊ **الحفراة**: قوڵنگ و پاچو شتی لەو جۆرە ◊ **الحُفْرَة**: چاڵ. ◊ **الحَفَّار**: كەسێكە پیشەی زەوی چاڵ كردن بێ، بەزۆری بۆ گۆڕ هەڵكەن بەكاردێ ◊ **المِحْفَارة**: ئامێرێكە بەزەوی دا دەڕواتە خوار بەكاری دەهێنن بۆ دۆزینەوەی نەوتو شتیوا◊

**الحفيرُ**: بیرێکە زیاد لە ئەندازە پان کرابێ ٥ گۆڕ. ٥ **الحَفيرَةُ**: بەمانا (الحفيرُ) دێ ٥ هەروا بەو ئامێرەش دەگوترێ کە بەکاری دەهێنن بۆ دۆزینەوەی ئاسار. ٥ **المِحفَارُ**: بێڵ و خاکەناز ٥ هەروا هەرشتێك زەوی پێ هەڵکۆڵدرێ. ٥ **حَفَرَهُ حَفراً**: لەدواوە پاڵی پێوە نا، جا بە هاویشتن یان بە ڕۆیشتن و ڕادان.

**حَفَزَ** فلانا بالرمح: لە فلانکەسی دا بەرمب، ٥ **حافَزَهُ**: لێی نزیك کەوتەوەو ئەژنۆی بە ئەژنۆوەنا. ٥ **تَحَفَّزَ في جلسته**: لە دانیشتنەکەی دا ملی خۆی قیت کردبوەوە ترسێکی هەبوو، دڵنیا نەبوو ٥.

**حَفَشَ** الفرسُ: ئەسپەکە کەوتە ڕۆیشتن و جوان ڕۆیی. ٥ **حَفَشَت السماءُ**: ئاسمان تاوە بارانێکی بە خوڕەمی باراندو وەستایەوە. ٥ **حَفَشَ في الأمر**: گرنگی بەکارەکەدا. ٥ **حَفَش المطرُ الأرضَ**: باران ڕوەکەکەی لە زەوی وەدەرنا. ٥ **حَفَشَ لفلان الودَّ**: خۆشەویستی و ئیخلاصی خۆی بۆ نواند. ٥ **حَفَشَ السيلُ الوادي**: لافاوەکە لە دۆڵەکە دا کۆبوەوە و پڕی کرد.٥ **الحِفْشُ**: خانووی خراپ (قوخێلکە) کە هەلاش و زەوی لێك نزیك بن ٥ **أحفاش الأرض**: سوسەمارو قالۆنچە.

**حَفَصَ** الشيءَ حفصاً: کۆی کردەوە. ٥ **حَفَصَ من يده**: لە دەستی فڕێ دا. ٥ **الحُفَاصَةُ**: هەر شتێك کۆ بکرێتەوە. ٥ **الحَفصُ**: خانووی بچوك ٥ تورەکەیەك لە پێست دروستکرابێ ٥ بێچوە شێر، ٥ **حَفصَةُ**: کەمتیار، هەڵۆ. ٥ **المِحفَصَةُ**: تورەکەی دروستکراو لە پێست (هەمبانە).

**حَفَضَ** العود حفضاً: شورکەکەی چەماندەوە. ٥ **حَفَضَ الشيءَ**: شتەکەی فڕێ دا. ٥ **الحَفَضُ**: کەل و پەلی ناو ماڵ ٥ **الحَفيضَةُ**: شانەکە هەنگ بنیاتی دەنێ و هەنگوینی تێدا دروست دەکا.

**حَفِظَ** الشيءَ حِفظاً: شتەکەی پاراست و چاودێری کرد. ٥ **حَفِظَ المالَ**: ماڵەکەی پاراست ٥ **أحفَظَهُ**: ڕقی هەڵساند. ٥ **حافظ على الشيءِ محافظة وحِفاظاً**: چاودێری شتەکەی کردو پارێزگاری لێ کردو، بەردەوام بوو لەسەر ئەنجامدانی ٥ **حَفَّظَهُ العِلمَ والكلامَ**: وای لێ کرد زانستەکە لە بەربکاو قسەکان لە دڵی خۆی دا جێ بکاتەوەو لەبیری نەچێتەوە. ٥ **احتَفَظَ الشيءَ لنفسه**: ڕشتەکەی تایبەت کرد بەخۆیەوە. ٥ **تَحَفَّظَ عن الشيء ومنه**: خۆی لە شتەکە پاراست. ٥ **تَحَفَّظَ بالشيء**: گرنگی بە شتەکەدا. ٥ **تَحَفَّظَ الكتابَ**: ماوەو وزەیەکی زۆری خەرج کرد بۆ ئەوەی بەش دوا بەش کتێبەکە لەبەر بکا. ٥ **تَحَفَّظَ عليه**: پاراستی. ٥ **استَحفَظَهُ الشيءَ**: داوای لێ کرد ئەو شتە پارێزگاری بکا. ٥ **استَحفَظَهُ لە**: کردیە ئەمیندار بەسەریەوەو بەئەمانەت لای دانا. ٥ **الحافِظُ**: حەرەس و چاودێر ٥ **الحافِظَةُ**: هێزو توانایە کە ئادەمیزاد دەتوانێ بەهۆیەوە ئەوەی هێزی وەهمی دەرکی دەکا لە مەعانی ئەو لەبەری بکاو کاتی پێویست بەسەر ڕوبەری مێشکی دا بێنەوە، پێشی دەگوترێ (الذاكرة) ٥ **الحِفْظَةُ**: ڕق هەڵسان ٥ خاوەن غیرەت و پیاوەتی و ناموس و شەرەف بۆ ئافرەتی خزم و عەشیرەتی. ٥ **الحفيظ**: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا ٥ ئەمیندارو کار بەدەستی دەستپاك ٥ **الحَفيظَةُ**: ڕق و تورەیی ٥ دەمارگیری ٥ ترس و خۆپارێزی ٥ **المِحفَظَةُ**: کیسە باخەڵ بۆ پارە، یان جانتا بۆ کتێبی قوتابخانەو جل و بەرگ و شتی لەو جۆرە.

**حَفَّ** الطعامُ: کێشتەکە وشك بوو چەور نەبوو، ٥ **حَفَّ شَعْرُهُ أو رأسُهُ**: موی ڕیشی یان قژی سەری ژاکاو پەرش و بلاو بوو لەبەرئەوەی ڕۆنی لێ

نەدابوون. ٥ حَفَّ السمعُ: زۆربەی بیستنی لە دەست دا. ٥ حَفَّ الشَّيءَ حفيفاً: دەنگێکی لێ هات وەکوو دەنگی باڵی باڵندە ٥ حَفَّ الشَّيءَ حَفاً وحفافاً: بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە ٥ حفَّ شَعْرَهُ ولحيتە وشاربه: مووەکانی جەستەیو ریشیو سمێڵی تاشین. ٥ حَفَّت المرأةُ وجْهَهَا: ئافرەتەکە گەندەمووو مووی دەمو چاوی هەڵگرتن. ٥ حَفَّتْهُ الحاجه: ئاتاجی توش هات. ٥ أحَفَّ رأسَهُ: ماوەیەکی زۆر رۆنی لە قژی سەری نەدا. ٥ أحَفَّ الحيوانَ: ئاژەڵەکەی رۆیاند تا دەنگی رۆیشت. ٥ أحَفَّ الثَّوبَ: قوماشەکەی چنی. ٥ أحَفَّ فلاناً: بەخراپە باسی فلانکەسی کرد. ٥ حَفَّفَ فلان: فلانکەس ماڵو سامانی کەم بووە ژیانی زبرو نا خۆش بووە ٥ حَفَّفَ المرأةُ وجْهَهَا: ئافرەتەکە زێدەرەوی کرد لەدەمو چاو هەڵگرتنو خۆ ئارایش کردن دا. ٥ حَفَّفَ الثوبَ: قوماشەکەی چنی. ٥ احتفَّ النبتَ: روەکەکەی پارچە پارچە کرد. ٥ احتفَّ الطعامَ: خواردنەکەی خوارد. ٥ استحفَّ الشَّيءَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد. ٥ الحافُّ: ئەو شتەیە دەوری شتێکی تر بدا؛ ٥ الحِفَافُ: (حفاف الشيء): ئەو شتەیە کە دەورەی شتەکەی داوەو لە ئامێزی گرتووە ٥ حِفَافا الشيء: دولای شتەکە ٥ الحُفَافَةُ: ئەو توکو قژەیە کەلەسەرو ریشی چەورنەکراو هەڵدەوەرێ.

الحَفُّ: شەپیتەی جولا.

الحَفَفُ: پێداویستی ٥ الحَفَّافُ: ئەو کەسەی دەمو چاو هەڵدەگرێ، سەروریش دەتاشێ ٥ گۆشتی ژێر چۆڵەمە. ٥ الحَفَّانُ: زیندەوەری بچکۆلە ٥ الحُفَّةُ: ئەوەی لە شتێکی تر کرابێتەوە ٥ مەکوکی جوڵا ٥ الحِفَّةُ: دارێکە وەکوو شمشێر جولابەکاری دێنێ بۆشە بێتە پێوەدان. ٥ الحَفيفُ من النبات والكلأ: گیاوو لەوەڕی وشک. ٥ المِحَفَّةُ: کەژاوەیەکە گومبەزی نەبێ ئافرەت دەچێتە ناویەوە لە کاتێک دا کەلەسەر پشتی حوشترەکە ئەو کەژاوە قایم کراوە. ٥ اَلْمَحفُوفُ: کە سێکە ژیانی زبرو تەنگ بێ هەژارو ئاتاج بێ.

حَفَلَ الدمعُ: فرمیسکەکە زۆر بوون. ٥ حَفَلَ السماء: ئاسمان بارانەکەی زۆر بە خوڕەم بوو. ٥ حَفَلَ الشيءُ بالشَّيِ: ئەو شتە بەو شتە پڕ بوو ٥ حَفَلَ فلان اللبن في الضرع: فلانکەس شیرەکەی لە گوانی ئاژەڵەکە کۆکردەوە ٥ حَفَّلَ الناقة: حوشترەکەی چەند ڕۆژێک نە دۆشی بۆ ئەوەی شیرەکە لە گوانەکانی دا کۆ ببێتەوە. ٥ حَفَّلَ الشَّيءَ: شتەکەی دەرخست جوانیەکانی ئاشکرا کردن. ٥ حَفَّلَ الجاريةَ: کەنیزەکەکەی رازاندەوە. ٥ إحْتفَلَ الشيءُ: شتەکە کۆبووەوە ٥ إحْتفَلَ بالأمر: گرنگی بەکارەکەدا. ٥ إحْتفَلَ بفلان: رێزی فلانکەسی گرتو گرنگی پێ دا. ٥ تَحَفَّلَت المرأةُ: ئافرەتەکە خۆی جوان کرد. ٥ الحافلة: بارهەڵگرێکی درێژە بە گازو بەنزین دەڕوا.

الحَفلُ: کۆمەڵی زۆر گردبووەوە ٥ الحَفْلَةُ: جوانی، رازاندنەوە ٥ ئاهەنگ گێڕان، بەخێر هاتن ٥ الحَفيلُ: زۆر ٥ المُحْتَفَلُ: شوێنی ئاهەنگ گێڕانو کۆبونەوە. ٥ المَحْفِلُ: شوێنی کۆبوونەوە ٥ ئەنجومەن.

حَفَنَ الشَّيءَ حَفْناً: بەبەری دەستی گرتی، ٥ حَفَنَ: بەهەردو دەستی شتەکەی بادا ٥ حَفَنَ الماءَ على رأسه: بە مست ئاوی کرد بەسەری خۆی دا.

حَفِنَ حَفَناً: کە رۆیشت قاچی وەرسوڕاند وەکوو ئەوەی گلیان پێ هەڵکەنێ. ٥ احْتَفَنَ من الشَّيءِ: زۆری لەو شتەکرد، هەڵگرت، خوارد... ٥ أحتَفَنَ الشيءَ: بۆ خۆی هەڵگرت، تایبەتی کرد

بەخۆیەوە. ◊ أحتَفَنَ الشَجرةَ: درەختەکەی لە ڕیشەوە هەڵکەند. ◊ إحتفَنَ فلاناً: دەستی خستە ژێر ڕەفیجکیەوەو حەوای دا. ◊ الحُفنةُ والحَفنَةُ: لوێچێك یان مستێك لەهەر شتێك بێ ◊ حفاه وحفا بە: ڕێزی گرت.

**حفا** شاربَهُ: سمێڵی زۆر کورت کردەوە.

**حفي** حفاً: بە پێخواسی بەبێ ئەوەی نەعل یا خوففی لەپێدا بێ ڕۆیشت ◊ حَفِيت القدمُ والخفُّ والحافر: پێستی قاچی بەرە قاچی بەرەسمی لەبەر زۆر لەسەر ڕۆیشتن تەنك بوو.

**حَفِيَ** اليه في الوصيه: لەوەسییەتنامەکەی دا زیاد لەبەشی خۆی بۆ دیاری کرد. ◊ احفى فلان: فلانکەس بەری سمی ئاژەڵەکەی تەنك بوو بە هۆی زۆر لەسەر ڕۆیشتنەوە. ◊ أحفىَ الشَيْءَ: شتەکەی ڕیشە کێش کرد ◊ احفى فلاناً: فلانکەسی وا لێ کرد نە خوففی هەبێ نەنەعل ◊ حافاه: کێشەی لەگەڵ کردو کەوتە نیزاعەوە لەگەڵی. ◊ اِحتفى: بە پێخواسی ڕۆیی ◊ اِحتفى الشیئَ: شتەکەی لەزەوی دەرکێشا، هەڵی کەند ◊ تَحَفَّى بفلان: ئاهەنگی بۆ فلانکەس گێڕا. ◊ تحفّى اليه في الوصيه: لە وەسێتنامەکەی دا بەشی زۆری بۆ دانا.◊ اَلحفا: ڕۆیشتن بەبێ نەعلو بەبێ خوفف واتە: بە پێخواسی ◊ الحَفِيّ: زاناو لێکۆڵەرەوە.◊ حَقَبَ الشيءُ حَقَباً: شتەکە گیری خوارد دوا کەوت ◊ حَقَبَ عطاء فلان: بەخششی فلان دواکەوت. ◊ حقبَ أمر الناس: ئیش و کاری خەڵك دواکەوت. ◊ حَقِبَ المعدنُ: کانەکە هیچی تێدا نەبوو. ◊ حَقِبَ الحیوان: حەیوانەکە میزی گیرا ◊ احقَبَ الرجلَ أو المزاد والمتاعَ: لە دوا خۆیەوە پیاوەکەی سواری وڵاخ کرد ◊ تێشوو کالاکەی خستە پاشکۆی خۆیەوە. ◊ احتَقَبَ الشيءَ: شتەکەی خستە پاشکۆی خۆی ◊ احتقبَ الأثمَ: تاوانی ئەنجام دا. ◊ استَحقَبَ الشیءَ: بەمانا (احتَقَبَهُ) دێ. ◊ الأحقَبُ: کەرە کێوی ئەگەر بەرورگی پەڵەی سپی تێدا بن. ◊ الحاقبُ: ئەوەی پیسایی بۆ نەکرێ، قەبزبێ. ◊ الحِقابُ: ئەو سپییەتیەیە کەلە بنکی نینۆك دا دیارە ◊.

**الحَقَبُ**: ئەو حەبلەیە کە کورتانی وڵاخی پێ لەوڵاخەکە قایم دەکرێ.

**الحُقبُ** والحُقُبُ: زەمانی دورو درێژ هەشتا ساڵو زیاتر ◊ الحِقبَةُ من الدهر: ماوەیەکی دیاری نەکراو ◊ یان ساڵێکە، ◊ الحقیبة: جانتا: صندوق ئەو شتەی پێداویستی و تێشووی تێدەکرێ.

**حَقَدَ** علیه: لەدڵی خۆی دا ڕقی لێ بوو قاروکینی لێ خواردەوە.◊ حَقِدَ المطرُ والسماءُ حَقداً: باران نەباری ئاسمان بارانی نەباراند. ◊ حَقِدَ المعدنُ: کانەکە هیچی لێ پەیدا نەبوو. ◊ أحقَدَ فلان: هەوڵی دا لە کانەکەدا شتێك بدۆزێتەوە هیچی دەست نەکەوت. ◊ أحقَدَ فلاناً: فلانکەسی واڵێ کرد لە دڵ دا کین و ڕق هەڵبگرێ. ◊ تحاقدوا: ئەو کۆمەڵە هەریەکەیان ڕقی لەوی تریانە.

**الحِقدُ**: ڕق و کین لەدڵ دا پەزمەندە کردنو چاوەڕوان کردنی هەڵکەوتنی هەل بۆ تۆڵە کردنەوە.◊ تحاقَرَ: خۆی بە بچوك ناساندو نیشان دا. ◊ اَلمُحَقَّرَةُ: ئەو شتەی داوای سوکایەتی دەکاو بانگەشەی بۆ دەکا.◊ اَلحَقَطَةُ: ئافرەتی کورتە باڵا، جەستە بچوکی قیژە قیژکەر.

**حَقَفَ** الحیوانُ: ئاژەڵەکە لەناو لمبەلان دا پاڵکەوت ◊ أحقَوقَفَ الشیءُ: شتەکە کەوانەیی بووەوە ◊ اَلمحقَفُ: ئەو کەسەیە واز لە خواردنو خواردنەوە دێنێ مان دەگرێ.

**حَقَّ** العقدة: گرێیەکەی توند کرد. ◊ حَقَّ فلاناً: بەسەر فلانکەس دا باڵا دەست بوو. ◊ حَقَّ الطَّریقَ: چووە

ناوەڕاستی ڕێگا ٥ ناوەڕاستی ڕێگای گرتە بەر. ٥ حَقَّ: بەڕاستی زانیو شوێنی کەوت. ٥ حُقَّ: بەمانا (حَقَّ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾. ٥ أحَقَّ فلان: فلان گوتی ئەوە حەقە ٥ أحَقَّ الأمرَ: کارەکەی چەسپاند ٥ حَاقَّهُ مُحاقَّةً وحقاقاً: کێشەیان تێکەوت هەریەکێ لەوان داوای مافی خۆی کردو پێی وابوو لەسەر حەقە ٥ حَقَّقَ الأمرَ: کاری چەسپاندو بەڕاستی گێڕا ٥ حَقَّقَ الشَّيءَ والأمرَ: شتەکەی پتەو کردو باشباش قایمی کرد. ٥ حَقَّقَ الثوبَ: قوماشەکەی باش چنیو چاك پتەوی کرد. ٥ حَقَّقَ مع فلان في قضية: قسەکانی لێ وەرگرتو نووسینی

احْتَقَّ الأمر والشيءَ: کارەکەی پتەو کرد بناوانی شتەکەی شێلا. ٥ احْتَقَّ الطعنةَ: زەبرێکی کوشندەی لێ دا خەنجەرێکی وەشاندو کاریگەربوو. ٥ أحتقَّ الصيدَ: تفەنگێکی چاکی بەنێچیرەکەوە ناو کوشتی. ٥ انْحَقَّتِ العقدة: گرێیەکە چاك توند بوو. ٥ تَحَاقّاً: کێشەیان تێکەوتو هەریەکەیان لافی ئەوەی لێ دا مافی خوراوەو حەق بەئەوە. ٥ تَحَقَّقَ الأمرُ: کارەکە بەڕاست گەڕاو ڕوی دا. ٥ أستَحَقَّ الشَّيءَ والأمرَ: شتەکەی بە پێویست زانیو کارەکەی بە واجب دانا. ٥ استَحَقَّ الأثمَ: شیاوی سزای تاوانەکەیە. ٥ الحاقُّ: (حاق کل شيء:) ناوەڕاستی ئەوشتە ٥ اَلحاقَّةُ: بەلاو کارەسات ٥ بەزۆری بۆ ڕۆژی قیامەتو دونیا وێرانبون بەکاردەهێنرێ.

الحقُّ: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا.

الحِقُّ من الأبل: حوشترێکە سێ ساڵەی تەواو کردبێو چوبێتە ساڵی چوارەمەوە ٥ الحقاني: ئەوەی بە حەقگۆو حەقخوازو ناو دەبرێ. ٥ الحِقَّةُ: بەش ٥ الحَقيقُ: شیاو گونجاو ٥ الحقيقة: شتی ثابتو چەسپاو بەلای لوغەوییەکانەوە ٥ حقيقة الشَّيءِ: کرۆكو بالّفتەی شت. ٥ حقيقة الأمر: دڵنیایی لە چۆنیەتی کارەکە. ٥ حقيقة الرجل: ئەوەی لەسەری پێویستە پارێزگاری لێ بکاو بیپارێزی. ٥ المحقوق: بەمانا (حقيق) دێ ٥ ئەو کەسەیە حەقی لەسەر چەسپابێ.

احْقَلَ الزرعُ: کشتو کاڵەکە جۆراو جۆر بوو. ٥ أحقَلَت الأرضُ: زەوییەکە بوو بە شوێنی کشتو کاڵو وەبەرهات. ٥ حاقَلَهُ: کشتو کاڵەکەی پێ فرۆشت پێش ئەوەی پێ بگا.

اَلحَقْلُ: زەوی کشتو کاڵی پانو پۆڕو بەرفراوان کەزرعاتی تێدا بکرێو دیمەنێکی دڵڕفێن بنوێنێ.

حقل البترول: ئەو شوێنەی کە نەوتی لێ دەردەهێندرێ.

حقل التجارب: ئەو شوێنەی ئەزمونی تێدا ئەنجام دەدرێو وەکوو تاقیگە بەکاردێ.

المحصولات الحقلية: بەروبوومی زەوی ٥ اَلحَقْلَةُ: بەشێك لە دێبەرو زەوی کشتیاری. ٥ اَلمَحْقَلَةُ: زەوی کشتوکاڵی. ٥ اَلحِقْلِدُ: بەدرەفتارو ڕەزاگران. ٥ اَلحَقَلَّدُ: ڕژدو چروك ٥ بێ هێزو زەبون ٥ تاوانبار ٥ ڕقو کینە. ٥ اَلحَلِيمُ: قولینچکی چاو بەلای گوێچکەدا.

حَقَنَ الماءَ واللبن في القربة حَقْناً: ئاوەکە یان شیرەماستەکەی لەکوندەکە یان لە مەشکەکەدا هەڵگرت ٥ حَقَنَ بولَهُ: میزی خۆی ڕاگرتو نەیکرد. ٥ حقن دم فلان: نەیهێشت خوێنی فلان برژێ. ٥ حَقَنَ ماء وَجْهِهِ: بێ ئاتاجی کردو لە سوالکردن ڕزگاری کرد. ٥ حَقَنَ اللبن في القِربة: ماستەکەی کردە مەشکەکەوەو هەژاندی بۆ ئەوەی ڕۆنەکەی لێ بگرێ. ٥ حَقَنَ فلاناً: لە ڕێگەی دەرزییەوە دەرمانی کردە جەستەی فلان کەسەوە.

احْتَقَن: كۆبۆوەو حەبس بوو ٥ إحْتَقَنَ العُضْوُ: خوێن يان ناو لە ئەندامێكی لە شی دا كۆبوەوەو هاوسا ٥ احْتَقَنَ المريضُ: نەخۆشەكە میزی گیراو بە حوقنە میزەكەی لێ دەرهێندرا. ٥ الحاقِنُ: ئەو كەسەیە میزی گیرابێ‌و لە میزەڵدانی دا كۆبوبێتەوە ٥ الحُقْنَةُ: حوقنە كردن ٥ دەرمانێكە پێش حوقنەكەیا لەگەڵ حوقنەكە دەكرێتە جەستەی نەخۆشەكەوە ٥ المِحْقَانُ: میز گیراو؛ ئەو كەسەیە میزی دەگیرێ. ٥ اَلمِحْقَنُ: ئامێری حوقنە كردن. ٥ المِحْقَنَةُ: ئامێری حوقنە كردن، ٥ حَقَاه حقواً: لەكەلەكەی دا.

**حَقِيَ** حقاً: كەلەكەی ئازاری پەیدا كرد.

حُقِيَ حقاً: ئازاری كەلەكەی بوو ٥ الحِقاءُ: دەرپێ یان دوخینی دەرپێ ٥ ئازارێكە لە سك دا بەهۆی گۆشت خواردنەوە پەیدا دەبێ.

**اَلْحَقْوُ**: كەلەكە ٥ بەرپشتێن ٥ حَقْوا الثَّنِيَةِ: ئەملاو ئەولای رێگەی كەژ. ٥ حَقْو الجبل: تۆقەسەری كێو ٥ دۆخین.

**حَكَأَ** العُقْدَةَ حَكْأً: زۆر بە توندی گرێی دا، گرێكەی توند كرد ٥ احْتَكَأَ الأمر في نفسه: كارەكە لەلای چەسپاو هیچ گومانی تێدا نەما ٥ إحْتَكأ العقدة: گرێكەی زۆر توند كرد. ٥ اَلْحُكَأَةُ: قۆڕی، سەرمازەڵەی گەورە. ٥ حَكَرَهُ حَكْراً: ستەمی لێ كردو كاڵاكەی لێ كەم كردەوە.

**حَكَرَ** السِّلَعَ: كاڵاكانی كۆكردەوە بۆ ئەوەی بۆ خۆی بەنارەزۆی بیانفرۆشێ ٥ حَكَرَ فلان حكراً: زۆری گیرە گیر كردو هەوڵی دا مەبەستەكەی خۆی بسەپێنێ. ٥ حَكَرَ برأيه: هەرراو بۆ چونی خۆی بەلاوە پەسەند بوو تا كرموی كرد. ٥ حاكرة: كێشەی لەگەڵ دا كرد. ٥ تَحَكَّرَ فلان على الشَّيْءِ: خەفەتی بۆ ئەو شتە خوارد. ٥ الحاكورة: زەوییەكە لە نزیك گوندو شار تایبەت دەكرێ بە ناشتنی درەخت. ٥ الحُكْرُ: شتی كەم، ٥ الحكـر: زەوی وەقف كراو لەسەر شتێك، ٥ اَلْحَكَرُ: هەرشتێك هەڵبگیرێ بەمەبەستی گران فرۆشتن ٥ اَلْحُكْرَةُ: شت شاردنەوەو هەڵگرتن بۆ ئەوەی بەگران بیفرۆشێ.

**حَكَشَ** حكشاً: وێك هاتەوە. ٥ حَكَشَ الشَّيْءَ: شتەكەی كۆكردەوە ٥ حَكَشَ فلاناً: ستەمی لە فلانكەس كرد ٥ حَكَشَ حَكشاً: زۆر گێرە گیری كرد.

**حَكَّ** الشَّيْءَ بالشَّيْءِ وعلى الشيْء حَكّاً: قەبارەیەكی بەسەر قەبارەیەكی تر هێناو برد لێكی خشاندن ٥ حَكَّ فلاناً جِسمُهُ: داوای لە فلانكەس كرد جەستەی بۆ بخورێنێ ٥ حَكَّ الشَّيْءَ: شتەكەی سپی كرد توێكڵەكەی لێ كردەوە. ٥ حاكَّهُ مُحاكَّةً وحِكاكاً: یەكتریان خوراند ٥ پێشبركێیان كرد لە خۆ خوراندن دا. ٥ إحْتَكَّ الجسمُ: لەشی خورا، حەزی لە خوراندن بوو. ٥ إحْتكَّ بالشَّيْءِ: بەشتەكە خۆی خوراند ٥ تَحاكَّا: هەردوكیان خۆیان بەیەكترەوە ناو یەكتریان خوراند. ٥ تَحَكَّكَت العقربُ بالأفعى: دوپشك بەهانە بەمار دەگرێ ٥ اسْتَحَكَّ فلاناً جسمُهُ: فلانكەس جەستەی خورا ٥ حەزی لە خواردن كرد. ٥ الحالُّ: ئەو كەسەیە زۆر ئیلحاح دەكا لەداوا كاریدا، ٥ اَلْحَاكَّةُ: ددان ٥ الحِكَاكُ: دەگوترێ: (هو حكاك شَرٍ) حەزی لەشەڕەو هەوڵ دەدا هەڵیگیرسێنێ. ٥ الحُكَاكَةُ: وردەو پرژو پاڵ كەلەكاتی خوراندندا هەڵدەوەرن.

**اَلْحِكُّ**: گومان ٥ اَلْحَكَكُ: بەردێكی نەرمی سپییە ٥ الحكاكات: گومان‌و وەسوەسە. ٥ اَلْحِكَّةُ: گومان ٥ هۆی پەیدا بوونی خرو لە جەستەدا. ٥ الحُكَيْكَةُ: مەتەڵ‌و لوغزو موعەمما. ٥ اَلْمِحَكُّ:

هەرشتێك خۆتی پێ بخورێنی بەرد بێ یان دار بێ.

**حَكَلَ** علیه الأمرُ حَكْلاً: كارەكەی لێ چەواشە بوو ٥ **حَكَلَ فِي مشیه**: قونگرانیو تەمبەڵی كرد لەرۆیشتندا ٥ **حَكَلَ فلان بالعصا**: بەگۆچان فلانكەس لێی دا. ٥ **أحْكَلَ علیه الأمر**: بەمانا (حَكَلَ) دێ. ٥ **أحْكَلَ علیهم**: شەڕی پێ فرۆشتن، شەڕی هاویشتنێ. ٥ **تَحْكّلَ**: لە نەزانیدا ڕۆچوو زۆری خۆبێ عەقڵ كرد. ٥ **الأحْكَلُ**: گیانداری بێ زمان ٥ حەیوانات ٥ گیاندارێك كەدەنگی نەبیستری وەكوو مێرو ٥ **الحاكِلُ**: مەزندەكار، ٥ **اَلْحُكْلَةُ**: ئەوەیە كابرا نەتوانێ مەبەستی خۆی دەربڕێ.

**حَكَمَ** بالأمر حُكْماً: بڕیاری دا، دەگوترێ: (حكم له، حكم علیه وحكم بینهما). ٥ **حَكَمَ الفرسَ**: لغاوی ئەسپەكەی واڵێ كرد ئەسپەكە سەرنەرم بێ. ٥ **حَكَمَ فلاناً**: نەیهێشت فلانكەس ئەوەی دەیویست بەدەستی بێنێ. ٥ **أحْكَمَ الفَرَسَ**: لغاوێكی وای لەدەمی ئەسپەكە كرد سەرنەرم بێ. ٥ **أحْكَمَ فلاناً عن الأمر**: فلانكەسی كردە كارامە لەكارەكە دا. ٥ **أحْكَمَ التجارِبُ فلاناً**: ئەزموونو تەجرەبە فلانكەسی كرد بەحەكیمو عاقڵمەندو لێزان. ٥ **احْتَكَمَ الخصمان الى الحاكم**: دوو كێشە كارەكە كێشەكەیان بردە لای دادوەر. ٥ **احْتَكَمَ فِي الشَّیْئِ والأمر**: بەئارەزووی خۆی هەڵسو كەوتی لەشتەكەدا كرد ٥ **احتكم فِي أمر فلان**: بەئارەزووی خۆی سەرو كاری ئیشی فلانی كرد. ٥ **تَحَكَّمَ**: بەگوێرەی ڕای خۆی كاری كردو گوێی نەدایە قسەكەی. ٥ **تَحَكَّمَ الحروریة من الخوارج**: حەرەوورییە خەواریجەكان وتیان: حوكم هەر بۆ خودایەو بڕیاری عەمری كوڕی ئەبو لعاصو ئەبو موسای ئەشعەری بایەخیان نیە. ٥ **استَحْكَمَ علیه الشَّیْئ**: شتەكەی لێ تێك چوو. ٥ **الحاكم**: دادوەر. ٥

**الحُكْمُ**: زانیاریو تێگەیشتنو فیقە زانین.

**اَلْحَكَمُ**: ناوێكە لە ناوە جوانەكانی خودا ٥ بەمانا دادوەریش هاتووە ٥ **اَلْحِكْمَةُ**: زانینی گەورەترینو نایابترین شت بە باشترین زانیاری ٥ وشەی كەمو مانای زۆر، ٥ **اَلْحَكَمَةُ**: لغاو؛ ئاسنێكە دەكرێتە دەمی ئەسپ بۆ ئەوەی بەئاسانی بەدەست بێ ٥ **اَلْحَكیمُ**: ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا ٥ هەروا بەكەسێكیش دەگوترێ: كە خاوەنی حیكمەت بێ ٥ بەفەیلەسوفیش دەگوترێ ٥ بۆ پزیشكیش بەكار دەهێنرێ ٥ **اَلْمُحْكَمُ**: شتی چاكۆ دروست كراوو ڕێكو پێك ٥ **اَلْمَحْكَمَةُ**: دادگا ٥ دەزگایەكە كە كێشەی خەڵك یەكالا دەكاتەوە ٥ شوێنی كۆبوونەوەی دادوەرەكان.

حَاكَاهُ: لاسایی ئەوی كردەوە ٥ **الحكایة**: بەسەرهاتو چیرۆك جا واقیع بێ یان خەیاڵی بێ ٥ **اَلْحَكَّاءُ**: حیكایەتخوان.

**اَلْحَكِيّ** من النساء: ئافرەتی فیتنەو چەقەچەناو.

**حَلأَ** الْجِلْدَ حَلْئاً: پێستەكەی كەوڵ كرد. ٥ **حَلأ فلاناً**: لەفلانكەسی داوە. ٥ **حَلأه بالسوط وبالسیف**: بەقەمچی بەشمشێر كوشتی.

**حَلِئَ** الأدیمُ حَلأً: پێستەكە موی تێدا پەیدا بوو. ٥ **حَلِئَتِ الشَّفَةُ**: لێوەكە زیبكەی لێ هاتن ٥ زیبكەی لەلێو هاتن. ٥ **التَّحْلیُ**: موی پێست ٥ چڵكی پێست ٥ ڕەشایی پێست. ٥ **التَّحْلِئَةُ**: بەمانا (التَّحْلیُ) دێ. ٥ **الْحُلاَءَةُ**: توێكڵی پێست ئەوەی بەهۆی دەباغكردنەوە لێی دەبێتەوە.

**اَلْحَلأ**: ئەو زیبكەو دومەڵە بچكۆلانەن كە لەسەر لێوی ئادەمیزاد دوا نەخۆشی پەیدا دەبن.٥

اَلْحَلوءُ: بەردێکە وردەو هەڵوەریوەکەی چاوی پێ دەرێژرێ بۆ ئەوەی ئازاری نەمێنێ. ٥ اَلْمِحْلَاةُ: ئامێرێکە پێستی پێ سپی دەکرێ.

حَلَبَ القَوْمُ حَلْباً وحُلوباً: قەوەو خوێش لەهەموو لایەك کۆبوونەوە. ٥ حَلَبَ الشاةَ ونحوها حَلْباً: هەرچی شیرێکی لە گوانی مەڕەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی. ٥ حَلَبَ فلاناً: شیری بۆ فلانکەس دۆشی. ٥ حَلَبَ فلاناً الشاةَ: مەڕەکەی دا بەفلان بۆ ئەوەی بیدۆشێ. ٥ أَحْلَبَ القومُ: لە هەموو لایەکەوە خەڵك گرد بوونەوە بۆ شەڕ یان بۆ شتی تر. ٥ أَحْلَبَ أَهْلَهُ: لەکێوو لەوەڕگاوە شیرەکەی دۆشی‌و ناردی بۆ خزمەکانی. ٥ أَحْلَبَ فلاناً الشاةَ ونحوها: مەڕەکەی دا بەفلان بۆ ئەوەی بۆ خۆی بیدۆشێ. ٥ حَالَبَهُ: بێشبڕکێیان کرد لە شیردۆشیندا ٥ یارمەتی دا بۆ شیردۆشین. ٥ تَحَلَّبَ المائعُ: شلەمەنییەکە ڕەوان بوو ٥ استَحْلَبَ القومُ: قەوەو خویش کۆبونەوە بۆ هاوکاریکاری کردن. ٥ اِسْتَحْلَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی دۆشی ویستی شلەمەنیەکەی دەربێنێ ٥ هێنایە دەرێ‌و هەڵی مژی. ٥ الحالِبُ: یەکێك لەو دوو بۆریانەوە کە لەگورچیلەوە میز دەهێنن بۆ میزەڵدان. ٥ حوالب (حوالب البئر): سەرچاوەی ئاوی بیرەکە. ٥ حوالب العیون: سەرچاوەی ئاوی چاو. ٥ الحِلابُ: شیر. ٥ حَلَبُ العصیر: شەراب ٥ هەروا لەباسی تالآن‌و دەسکەوتدا بەمانا بەهەرم دێ. ٥ الْحَلْبَاءُ: خاوەن شیر ٥ شیردەر ٥ دەگوترێ: (شاة حلباءُ).

اَلْحَلَبَةُ: ڕەوە ئەسپ لەهەموو لایەکەوە کۆدەکرێنەوە بۆ پێشبڕکێ ٥ هەروا ناوە بۆ گۆڕەپانی پێشبڕکێکە ٥ حَلَبَتَان: بەیانی‌و ئێوارە. ٥ اَلْحُلْبَةُ: ڕوەکێکە دەخورێ‌و دەشکرێتە دەرمان، (ك: حُلبّ). ٥ اَلْحَلَّابُ: کەسێکە کاری ئاژەڵ دۆشین بێ ٥ اَلْحَلُوبُ: ئاژەڵی شیر دەر، ٥ الحلیبُ: شیری دۆشراو ٥ شەرابی وەرگیراو لە خورما ٥ اَلْمَحْلَبُ: درەختێکە بەرێکی هەیە بۆ دروستکردنی بۆنی خۆش بەکار دەهێندرێ ٥ اَلْمِحْلَبُ: ئەو مەنجەڵ‌و سەتڵەی شیری تێدا دەدۆشرێ. ٥ الْحُلَابِسُ: شێر ٥ پیاوی ئازا. ٥ اَلْحَلْبَسُ: بەمانا (الحلابس) دێ.

حَلَتَ الجلیدُ حَلْتاً: بەستەڵەکەکە توایەوە. ٥ حَلَتَ الصُّوفَ: خوریەکەی هەڵکەند لە پێستی خاراو. ٥ حَلَتَ دَیْنَهُ: قەرزەکە دایەوە. ٥ حَلَتَ فلاناً کذا سوطاً: ئەوەندە شوڕك‌و قەمچی لەفلانکەس وەشاند. ٥ اَلْحُلَاتَةُ: (حُلاتَةُ الصّوف) ٥ بنەشەو پتکەپتکەی خوری. ٥ اَلْحُلْتِیتُ: صەمغێکی ڕاتنجییە لەبواری پزیشکی دا بەکار دەهێندرێ. ٥ اَلْحَلِیتُ: ئەو سیخوارەیە کە شەوانی سارد دەکەوێتە سەرزەوی.

حَلَجَ القُطْن حَلْجاً: لۆکەکەی لە پرزو پاڵ‌و توێکڵ‌و خشت‌و خاڵەکەی پاك کردەوە ٥ لۆکەکەی لەچیکەنەدا، ٥ حَلَجَ الخُبْزَةَ: نانەکەی خشت کرد. ٥ الحِلاجَةُ: پیشەی هەلاجی کردن. ٥ الحَلَّاجُ: کەسێکە پیشەی حەلاجی بکا. ٥ اَلْحَلُوجُ: هەورە تریشقە. ٥ المِحْلَاجُ: ئامێری هەلاجی ٥ تیروك؛ دارێکە نانی پێ پان دەکرێتەوە ٥ گوێدرێژی بچوك، (ك: مَحَالِجَ).

حَلْحَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەشوێنی خۆی جوڵاندو گواستییەوە. ٥ تَحَلْحَلَ: شتەکەی جوڵاو لەشوێنی خۆی لاچو.

حَلَزَ الأدیمَ وغیره حَلْزاً: پێستەکەی سپی کرد. ٥ حَلِزَ حَلَزاً: لەخەفەتا دڵی ئازاری پێ گەیی. ٥ احْتَلَزَ حَقَّهُ: مافی خۆی وەرگرت. ٥ تَحَلَّزَ الشَّيْءُ: شتەکە مایەوە. ٥ تَحَلَّزَ القلبُ عند الحزن: لەکاتی

خـەم خواردنـدا دڵـی ئـازاری پـێ گـەیی دڵـی گوشرا. ٥ تَحَلَّزَ فلان للأمر: فلانكەس خۆی بۆ كارەكە ئامادە كردو قۆڵی لێ هەڵماڵین. ٥ اَلْحِلِزُ: كوندەبەبو ٥ كورتە باڵا ٥ پیاوی رژدو چروك ٥ بەدرەوشت. ٥ اَلْحَلَزُونُ: پیرۆیەكە لەتەویلەو پشتیرا دەژی ٥ گیاندارێـكی ئاوییـە لـەناو صـەدەفەكەی خـۆیدا دەژی ٥ هەنـدێ لـەو گیاندارانـە بەكـەڵكی خواردنیش دێ. ٥ اَلْحَلَزُونـي: ئـەوەی پـاڵ دەدرێ بۆلای حەلـەزون. ٥ حَلَسَتِ السماءُ حَلْساً: ئاسمـان بارانێـكی وردی بـەردەوامی بارانـد. ٥ حَلَسَتِ الدابَّةُ: سەرجلی لەپشتی وڵاخەكە كرد.

حَلِـسَ فـلان: لەبەرامبـەر هاوشـانەكەیدا خۆراگربوو. ٥ حَلِسَ بالـشَّيْءَ: شـەیدای شتەكە بوو خـۆی پێوەگرت ٥ أحْلَسَتِ السَّماءُ: بەمانا (حَلَسَ) دێ. ٥ أحْلَسَتِ الأرضُ: گژو گیاكەی راساو زەوییەكـەی داپۆشـی. ٥ أحْلَسَ فلانـاً: وادەو بـەڵێنی تـەواوی دایـە. ٥ أحْلَسَ فلاناً في البيع: زیانی لەفلانكەس دا لەمامەڵەدا. ٥ أحْلَسَ فلاناً علـى الأمـر: فلانكەسـی هـەڵنا بـۆ ئـەوكارە. ٥ حالَـسَهُ: پێـوەی نووسـاو لـەكۆڵی نـەبووەوە ٥ تَحَلَّسَ لـه: دەورەی دا ٥ اسْتَحْلَسَ الليـلَ بـالظلام: تاریكایی شەو پـەرەی سـەندو تـەواو دونیا تاریك بوو.

اَلْحَلْسُ: وادەو بەڵێنی تەواو.

اَلْحِلْسُ: هـەر پارچـە قوماشێـك لـەژێر زینو لـەژێر كورتانـەوە لـە پـشتی وڵاخ بكـرێ ٥ هـەروا هەرشتێـك لـەماڵا لـەژێر فەرشـی بـەنرخو ئـەو جـۆرە شـانە رابخـرێ وەكـوو حەصـیرو بـەڕە ٥ اَلْحُلَيْسُ: (ام حُلَيْس) كونیەی دێڵەكەرە.

حَلِـطَ حَلَطاً: رقـی هەڵسا ٥ لەسوێند خـواردن دا زێدەڕۆیی كرد ٥ أحْلَـطَ فـلان: فلانكەس چووە خانوێكی خەتەرناكەوە زەحمەتە بتوانێ ژیانی تێدا بەسەربەرێ. ٥ أحْلَـطَ بالمكـان: لـەو شوێنـە مایـەوە. ٥ أحْلَـطَ فلاناً: رقـی فلانـی هەڵساند. ٥ اِحْتَلَـطَ علیه: رقی لێ هەڵسا ٥ (احتلط منـه) لێـی وەڕز بوو.

حَلَفَ حَلِفاً وحَلْفاً: سوێندی خوارد.

حَلُفَ الشَّيْءُ: تیژبوو ٥ برنده بـوو ٥ أحْلَفَـت الأرضُ: زەوی (حـەلف)ی روانـد؛ رووەكێـكە وەكـوو لـقو پـرژی خورمـا وەهایـە لـەزەلكاوو دەم ئـاودا دەڕوێ، بـەكوردی پێـی دەگوترێ (قەفـەزاژ). ٥ أحْلَـفَ فلانـاً: داوای لێ كـرد سـوێندی بۆبخـوا. ٥ حَالَفَـهُ مُحالَفَـةً وحِلافـاً: پـەیمانی لەگـەڵ بەسـت ٥ تَحالفوا: یەكیان گرتو بوونە هاوپەیمانی یەكتر. ٥ استَحْلَفَهُ: سوێندی دا.

اَلْحَلَـفُ: قەفـەزاژ؛ رووەكێـكە پـەلكـەكانی وەكـوو پـەلكی دارخورمـا وایـە، لـەزەلكاوو گـەڕاودا دەڕوێ.

اَلْحِلْفُ: پـەیمان بەسـتن لەسـەر هاریكاری كردنـی یەكتر، ٥ اَلْحُلَفاءُ: بەمانا (اَلْحَلَف) دێ ٥ هـەروەها ناوە بۆ كـەنیزەكی خـراپو ناشیرین، ٥ اَلْحَلِفَةُ: زەوییـەك گیاقەفـەزاژی لێ بـڕوێ یـان زۆری لێ بـڕوێ. ٥ اَلْحَـلاَّفُ: كەسێـك زۆر سـوێند بخـوا ٥ اَلْحَلِيـفُ: یارمەتیـدەرو هەمئاهـەنگ، ٥ حلیـف اللسان: زمان تیژو چەقە چەناو.

حَلَقَ الضَّرْعُ: گوانەكە لەبەر ئـەوەی شیری كـەم تێدایـە هەڵكشاوەتەوە ٥ دەگوترێ: (حَلَـقَ لـبن الضرع): شیری گوانەكە چۆوە یان كەم بوو.

حَلَقَ فلاناً حَلْقاً: لەگـەردنی فلانـی دا ٥ حَلَقَ الإناءَ: گۆزەكەی پڕكرد تا گەیشتە ملی. ٥ حَلَـقَ الـشَّيْءَ: شتەكەی سپی كرد توێكڵو مـووی لێ داماڵی. ٥ حَلَـقَ الـرأسَ: سـەری تاشـیو مـووی سـەری لێ كردنەوە. ٥ حلقت الماشية: مەڕو ماڵاتەكە بەسەر

گیاو گژەکەدا هاتن هەموویان خوارد. ٥ حَلَقَ القومُ أعداءَهُمْ: قەومەکە هەموو دوژمنەکانیان لەناو بردن.

حلّق القمَرُ: مانگ خەرمانەی داوە ٥ حَلَّقَ البسرُ: هێشوە خورماکە دوبەش لەسێ بەشی بوو بەخورمای گەییو. ٥ حَلَّقَ الضرعُ: گوانەکە پڕبوو لەشیرو هەڵاوسا. ٥ حَلَّقَ الطائر: باڵندەکە لەهەوادا زۆر بەرز بووەو سوڕایەوە. ٥ حَلَّقَ ببصره الى كذا: چاوی گێڕاو چاوی بەرزکردەوە بۆلای. ٥ حَلَّقَ ماء البئر: ئاوی بیرەکە داکەوتو کەم بوو ڕۆچوو. ٥ حَلَّقَتْ عَيْنُ البَعِيرِ: چاوی حوشترەکە بەقوڵا چوو. ٥ حَلَّقَ الشَّعْرَ: زیدەرەوی کرد لەتاشینی مووی ڕیش‌و سمێڵی. ٥ حَلَّقَ الشَّيْءَ: شتەکەی والێکرد بازنەیی بێ. ٥ احْتَلَقَ الرجلُ: پیاوەکە مووی خۆی تاشین. ٥ تَحَلَّقَ القومُ: خەڵکەکە بەشێوەی بازنەیی دانیشتن. ٥ تَحَلَّقَ القمرُ: مانگ خشت بوو بوو بە مانگی چواردە. ٥ اَلْحَالِقُ: شوێنی بەرز ٥ هەوای نێوان ئاسمان‌و زەوی. ٥ اَلْحَالِقُ من الرجال: ئەو پیاوەیە ببێتە هۆی نەگبەتی بۆ هۆزەکەی. ٥ الحالق من السيوف: شمشێری بڕندەو تیژ. ٥ اَلْحَالِقَةُ: پچڕاندنی صیلەی ڕەحم ٥ ستەمکاری ٥ قسەی خراپ‌و فیتنە جۆ ٥ ساڵی قات‌و قڕی کە هیچ نەهێڵێ ٥ مردن. ٥ الحالوقُ: مردن. ٥ حَلاَّقِ: مردن ٥ ناوە بۆ مردن. ٥ الحِلاقُ: دوورخستنەوەی کوڵک‌و مووە لەسەر. ٥ الحُلاقَةُ: ئەو موانەی کە لەدوای تاشینی سەرو ڕیش دەکەونە سەر زەوی. ٥ الحِلاقَةُ: پیشەی سەرتاشی.

الْحَلْقُ: گەردن ٥ گەرو.

الحَلَقُ: حوشتری داخکراو بەداخی کەوانەیی ٥ گوارە. ٥ اَلْحَلَقَةُ: هەر شتێك کەوانەیی بێ ٥ حَلَقَةُ الباب: ئەو ئەڵقە کەوانەییەی کە بە دەرگاوەیە بۆ لێدان ٥ الْحَلاَّقُ: صیغەی موبالەغەیە ٥ یان ئەو کەسەی پیشەی سەرتاشینە. ٥ اَلْمِحْلَقُ: موس ٥ گوێزان ٥ بەرگی زبر. ٥ اَلْمَحْلَقُ: شوێنی سەرتاشینە بۆ ئیحرام شکاندن، لەمینا. ٥ اَلْمُحَلَّقُ من الشياه: مەڕو بزنی لەڕو لاواز. ٥ الحُلقامَةُ: هێشوە خورما کە ئاڵ‌و بۆڵی تێکەوی زیاد لەدوو بەش لەسێ بەشی گەیبێ. ٥ الحُلقومُ: گەرو.

حَلَكَ حَلْكاً وحُلْكَةً: زۆر ڕەش بوو ٥ اسْتَحْلَكَ: ڕەشاییەکەی زۆر بوو وەکوو شتی سوتاو.

اَلْحَالِكُ: شتی زۆر ڕەش. ٥ اَلْحُلْكَةُ: زۆر ڕەش.

حَلَّ الشَّيءَ حلالاً: شتەکە ڕەواو حەڵاڵ بوو.٥ حَلَّت المرأةُ: ئافرەتەکە بۆ ئەوە دەبێ مارەبکرێ ٥ حَلَّ الْمُحْرِمُ: حاجی ئیحرامەکەی شکاند، ٥ حَلَّ الدين حلولاً: قەرزەکە وەختی دانەوەی هات‌و واجب بوو. ٥ حَلَّ غضب الله: ڕق‌و قاری خودا نازڵ بوو. ٥ حَلَّ العُقْدَةَ: گرێ کوێرکەکەی کردەوە ٥ حل الجامِدَ: سەهۆڵەکەی تواندەوە، شتە ڕەقبووەکەی شل کردەوە، تواندییەوە. ٥ حَلَّ الكلامَ المنظومَ: دەقە هۆنراوەکەی کرد بە پەخشان. ٥ حَلَّ المكانَ وبه: لەو شوێنەدا مایەوە نیشتەجێ بوو، ٥ حللت البيتَ: لەو خانوەدا نیشتەجێ بوم. ٥ أحَلَّ: لەئیحرام بەستن ڕزگاری بوو ٥ أحَلَّ الشَّيْءَ: شتەکەی حەڵاڵ کرد ٥ حَالَّهُ: لەگەڵیا دابەزی، پێکەوە نیشتەجێ بوون. ٥ حَلَّلَ العُقْدَةَ: گرێکەی کردەوە. ٥ حَلَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی گێڕایەوە بۆ حاڵی پێشووی ٥ حَلَّل نفسية فلان: دەروونی فلانکەسی شی کردەوە ٥ نهێنییەکانی ناو دەروونی کابرای ئاشکرا کردن. ٥ حَلَّلَ اليمينَ: کەفارەتی سوێندەکەی دا. ٥ حَلَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی حەڵاڵ کرد. ٥ احتل المكانَ وبه:

تێیدا نیشتەجێ بوو. ◦ احتلت دولةٌ بلادَ أخرى: دەوڵەتێك وڵاتێكی تری داگیركرد. ◦ انحَلَّتِ العُقْدَةُ: گرێكە كرایەوە.◦تَحَلَّلَ من يمينه وفيها: لەگوناهی سوێندەكەی رزگاری بوو. ◦ اسْتَحَلَّ الشَّيْءَ: شتەكەی بەحەڵاڵ دانا. ◦ اِسْتَحَلَّ فلاناً الشَّيْءَ: داوای لەكابراكە كرد ئەو شتەی بۆ حەڵاڵ بكا. ◦ الإحتلال: داگیركردنی وڵاتێك یان هەندێكی لەلایەن وڵاتێكی ترەوە. ◦ الإحليل: كۆی وانێكی ئادەمیزادی نێرینە ◦ كۆی مەمك شوێنی لێ هاتنە دەرەوەی شیر ◦ كۆی گوان، ◦ التَّحِلَّةُ: (تحِلَّةُ اليمين) كەفارەتی سوێند ◦ اَلْحَلاَلُ: شتی حەڵاڵ ◦ شتێك كە یاساغ نەبێ. ◦ الحِلاَلُ: ئامێرێكە ئافرەت سواری دەبێ.◦اُلْحَلَلُ: شلیەكە لەقاچی وڵاخدا پەیدا دەبێ رەگی قاچی شل دەبێ.◦الحِلُّ: شتی رەواو حەڵاڵ ◦ شوێنێك كە لەدەرەوەی حەرەم بێ.◦اَلْحَلُّ: رۆنی كونجی كە پێشی دەگوترێ (شَيْرَج). ◦ اَلْحُلاَّنُ: كارەكێوی ◦ هەرشتێك منداڵدانی دایكی هەڵبدرێ‌و بێتە سەردونیا. ◦ حُلاَّنُ اليمين: كەفارەتی سوێند ◦ اَلْحَلَّةُ: زەنبیلەیەكی گەورەیە خواردەمەنی تێ دەكرێ ◦ اَلْحِلَّةُ: خانووی هاووڵاتیان ◦ دیوەخانی خەڵك ◦ كۆمەڵێك خانووی نیشتەجێ بوون ◦ اَلْحُلَّةُ: پۆشاكی تازەو باش‌و ئەستور، یان تەنك ◦ هەروا پۆشاكێكە ناواخنی هەبێ ◦ مذهب الحُلُول: ئەو بیرو باوەڕو بۆچونەیە كە دەڵێن: خودا لەهەموو شتێكدا هەیە. ◦ الحُلُولِيَّة: پیرێكن لە سۆفی‌و پێیان وایە خودا لە هەموو شتێكدا هەیە. ◦ اَلْحَلِيلُ: پێچەوانەی یاساغە ◦ دراوسێ.

**المِحْلال**: (مكان محلال): شوێنێكە خەڵكی زۆر بۆ بچێ. ◦ اَلْمَحَلُّ: شوێنی كار ◦ اَلْمَحِلُّ: ئەو شوێنەیە دەبێتە شوێنی نیشتەمەنی. ◦ مَحِلُّ الدين: كاتی دانەوەی قەرز. ◦ مَحِلُّ الهدي: رۆژی قوربانی ◦ اَلْمُحَلِّلُ: شتی كەم ◦ شوێنێك خەڵكی زۆر بۆ بچێ ◦ اَلْمُحَلِّلُ: ئەو پیاوەی ژنی سێ بەسێ تەڵاقدراوی لێ مارە بكرێ بۆ ئەوەی تەڵاقی بداتەوە ئەمجار مێردە كۆنەكەی مارەی بكاتەوە، بەكوردی (مارە بەجاش)ی پێ دەگوترێ ◦ اَلْمَحَلَّةُ: شوێنی نیشتەجێ بوونی نەتەوە ◦ گەڕەك‌و هۆبە. ◦ اَلْمُحِلَّةُ: خانوێك یان دو خانوو كە بەیەكەوە بن.◦**حَلَمَ** حُلْماً وحُلُماً: خەوی بینی ◦ منداڵەكە باڵغ بوو لەتەمەنی منداڵی تێپەڕی. ◦ حَلَمَ به وعنه: خەوی پێوە بینی ◦ حَلَمَ الجلْدَ: پرزو باڵ‌و كرمۆڵی لە پێستەكە داماڵی. ◦ حَلِمَ البَعِيرُ: حوشترەكە گەنەی زۆر پێوە بوون. ◦ حَلُمَ حِلْماً: رقی نیشتەوەو هاتەوە سەرخۆ ◦ لێ بوردەیی پەیڕەوكرد ◦ أحْلِمَ: منداڵی لەسەرخۆو ئاقڵی بوون. ◦ حَلَّمَهُ الرضاع والأكلُ: شیرو خۆراك قەڵەوی كرد. ◦ حَلَمَ القِربةَ: كوندەكەی پڕكرد لەئاو. ◦ حَلَّمَ فلاناً: فلانكەسی والێكرد لەسەرەخۆبێ. ◦ احْتَلَمَ: بەمانا (حَلَمَ) دێ ◦ هەروا بەمانای ئەوەش دێ منداڵەكە باڵغ بوو. ◦ تَحَالَمَ: بەرواڵەت خۆی بەلەسەرەخۆ نیشان دا. ◦ تَحَلَّمَ: بەزۆر لەسەرخۆیی‌و بارقوڵی بەسەر خۆی دا هێنا ◦ بەدرۆ وتی خەونم دیوە. ◦ الحالوم: لۆرك یان فرۆ ◦ یان شیریژ ◦ اَلْحُلاَّمُ: كارێلەو بەرخۆلە، ئەو بێچوەی شیری دایكی بخوا. ◦ اَلْحَلَمُ: گەنەو ئەسپێی بچوك یان گەورە. ◦ اَلْحُلْمُ: ئەو شتەیە ئادەمیزاد لەخەودا دەیبینێ.

**الحِلْمُ**: لەسەرخۆیی‌و دان بەخۆداگرتن ◦ عەقڵ‌و ئاوەز ◦ اَلْحَلَمَةُ: گەنەی گەورە یان بچوك.

**حلا** الشَّيْءَ حَلاوةً: شتەكە شیرین بوو.◦

**حَلَتِ الفاكِهَةُ**: میوەکە پێگەیی‌و خۆش بوو. ٥ **حلا الشَّيْءُ له فِي عینه**: شتەکەی بەلەزەت بوو جوان بوو. ٥ **حلا من فلان**: فرسەتی لەفلانکەس هێنا. ٥ **حَلاَ المرأةَ حَلْواً**: خشڵی دا بەئافرەتەکە. ٥ **حلا فلاناً الشَّيْءَ وبالشَّيْءِ حَلْواً**: شتەکەی دا بەفلانکەس.

**حَلِيَ** الشَّيْءُ: شتەکەی بەشیرین دانا. ٥ **أحْلَى الشَّيْءَ**: شتەکەی شیرین کرد ٥ **احلی المکانَ**: شوێنەکەی بەلاوە خۆش بوو تێیدا مایەوە. ٥ **حالاه**: بەخۆشی حسێب کردو خاتری گرت نەگینا وانەبوو. ٥ **حَلَّى الطعامَ**: خواردنەکەی شیرین کرد ٥ **تَحَلَّى**: شیرین زوبانی لێ داو وانەبوو. ٥ **تَحَلَّى الشَّيْءَ**: شتەکەی بەشیرین لەقەڵەمدا. ٥ **احْلَوْلَى الشَّيْءُ**: شیرین‌و جوان بوو. ٥ **احلَوْلَى فلان الجاریةَ**: کەنیزەکەی بەردڵ کەوت‌و پێی جوان بوو.

**اَلْحَلَى**: تێمیسک‌و زیبکە، کە لەدەمی منداڵ دێن. ٥ **حلاوة القفا**: ناوەڕاستی پشتەمل. ٥ **اَلْحَلْواءُ**: حەڵوا، (ك: حَـلاوَى). ٥ **اَلْحَلْوَى**: هەر خواردەمەنییەك شەکر یان هەنگوینی تێکەڵ بکرێ ٥ **اَلْحُلْوانُ**: کرێی دەڵاڵ ٥ بەرتیل. ٥ **اَلْحُلْوانِيّ**: حەڵوافرۆش ٥ حەڵوا دروستکەر ٥ حەڵواچی. ٥ **اَلْحُلْوُ**: شتی زۆر شیرین. ٥ **اَلْحَلِيُّ**: شتی باش‌و زۆر شیرین. ٥ **اَلْمَحْلَى**: شوێنێکە حەڵوای تێدا دروست دەکرێ یان لێی دەخورێ.

**حَلَى** المرأةَ حَلْياً: خشڵی بۆ ئافرەتەکە کرد. ٥ **حَلِيَتْ الجاریةُ حَلْياً**: کەنیزەکەکە بوو بەخاوەن خشڵ ٥ یان کەنیزەکەکە خشڵی پۆشی ٥ یان سوودی لەخشڵ بینی. ٥ **حَلِیت الشجرة**: درەختەکە گەڵای کرد، میوەی وەبەر هێنا. ٥ **حَلَّى الجاریَةَ**: خشڵی بۆ کەنیزەکەکە هێنا بۆ ئەوە بیپۆشێ ٥ **حَلَّى السَّيْفَ**: شمشێرەکەی خشڵ دار کرد. ٥ **حَلَّى فلاناً**: وەصفی فلانکەسی لەدڵی کەسانی دیکەدا شیرین کرد. ٥ **حَلَّى الشَّيْءَ فِي عین فلان**: شتەکەی لەپێش چاوی فلانکەس جوان کرد. ٥ **تَحلَّى بالفضیلة**: بوو بەخاوەنی ڕەوشتی جوان.

**اَلْحَلَى**: تێمیسک‌و زیبکە، کە لەدەمی منداڵ دێن. ٥ **الحِلاَءُ (حلاء السیف)**: ڕازاندنەوەی شمشێر.

**اَلْحَلْيُ**: ئەوشتانەی دەکرێن بەخشڵ‌و خۆی پێ دەڕازێندرێتەوە، وەکوو مت‌و میروو بەردی بەنرخ‌و پارچە زێڕو زیو.

**حَمَأَ** البئرَ حَمْئاً: قوڕی بنکی بیرەکەی دەرهێنا.

**حَمِئَ** الماءُ حَمَأً: ئاوەکە قوڕی زۆری تێدا بوو ئاوەکە لیڵ بوو بۆنی ئاوەکە گۆڕا. **حَمِئَ** فلان علی فلان: فلانکەس ڕقی لە فلان هەڵسا. ٥ **أحْمَأَ البِئْرَ**: بیرەکەی قوڕاو کرد، قوڕی کردە بیرەکەوە. ٥ **اَلْحَمْأَةُ**: قوڕو لیتە. ٥ **اَلْحَمَأُ**: قوڕە ڕەش‌و گوڕاوو بۆگەن ٥ **اَلْحَمِئُ**: پیاوی چاو پیس. ٥ **حَمَّأَهُ الله علیه حمئاً**: خودا بەسەریا ڕشت‌و زاڵی کرد.

**حَمِتَ** الجوز وغیره حَمْتاً: گوێزەکە پوچەڵ بوو تامی گۆڕا. **حَمِتَ** التَّمرُ: خورماکە زۆر شیرین بوو. **حَمُتَ** الیوم حموتةً: گەرماکەی تاوی سەندو ڕۆژێکی گەرم بوو. **حَمُتَ** الشَّيْءُ: شتەکەی گەییشتە کۆتایی‌و باش بەرهەم هات. ٥ **تَحَمَّتَ لَوْنُهُ**: ڕەنگەکەی پاڵفتە بوو. ٥ **الحَمِیتُ**: زێدەڕۆو توندو تیژ لە هەموو شتێکدا. ٥ **الحمیتُ**: هیزە؛ ڕۆنی یان هەنگوین یان زەیتی تێدەکرێ.

**حَمْحَمَ** الفَرَسُ والبرذون: ئەسپەکە دەنگێکی لێوە هات لەخوار حیلاندنەوە بوو. ٥ **تَحَمْحَمَ الشَّيْءُ**: شتەکە ڕەش داگیرسا ٥ ڕەش بوو. ٥ **الحَمَاحِمُ**: گیایەکی بۆنخۆشە. ٥ **الحُمَاحِمُ**: بۆیەکی ڕەشە.

**الحَمْحَم**: شتی رەش لە هەموو شتێك ٥ روەکێکی ساڵانەیە تام خۆش و بۆنخۆشە. ٥ **حَمِدَه حَمْداً**: سوپاسی کرد.

**حَمِدَ** فلاناً: پاداشی فلانکەسی دایەوەو ئەرکی خۆی بەجی هێنا.

**حَمِدَ** الشَّيْءَ: لەشتەکە رازی بوو بەدڵی بوو ٥ لەکردەوەی فلان رازی بوو رێڕەوی بەپەسەند زانی. ٥ **حَمَّدَ فلاناً**: چەند جارێك و پەیتا پەیتا سوپاسی فلانکەسی کرد. ٥ **تَحَمَّدَ**: بەزۆر ملیّ و بەتەکلیف سوپاسی کرد. ٥ **تَحامَدوا**: قەومەکەی هەریەکەیان سوپاسگوزاری یەکتر بوون. ٥ **اِسْتَحْمَدَ الى الناس**: داوای لە خەڵکەکە کرد سوپاسی بکەن. ٥ **حَمادِ**: سوپاسگوزاری بۆ ئەو.

**الحمدُ**: باسکردن و وەصف کردن بەچاکەو لەسەر چاکە. ٥ **المَحْمَدَةُ**: ئەو کردارو گوفتارەیە کە دەبنە هۆی سوپاسگوزاری.

**حَمْدَلَ**: ئەلحەمدو لیلای گوت.

**حَمِرَ** الشَّيْءَ حمراً: شتەکەی سپی کرد توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**حَمَرَ** الرأسَ والشَّعَرَ والصوف: سەری تاشی ٥ مووەکەی بڕییەوە ٥ خورییەکەی برینگ کرد.

**حَمِرَ** الفرسُ ونحوه: بەهۆی جۆخواردنی زۆرەوە ئەسپەکە توشی ئینتەلا بوو بۆنی دەمی گۆڕا (جۆگرتی). ٥ **حَمِرَت الدابَّةُ**: ئاژەڵەکە بەهۆی قەڵەوی زۆر گێژ بووە ٥ وەکوو گوێدرێژی لێهاتووە. ٥ **حَمِرَ** فلان: فلانکەس رقی هەڵساو سوور بۆوە. ٥ **أَحْمَرَ الرجلُ**: پیاوەکە منداڵی سوورە پێستی بوو. ٥ **حَمَّرَ فلاناً**: بەفلانکەسی گوت ئەی گوێدرێژ. ٥ **حَمَّرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی سوورکرد بەرەنگی سور. ٥ **حَمَّرَ اللَّحْمَ**: گۆشتەکەی بەرۆن سوورکردەوە تا سوور هەڵگەڕا. ٥ **اِحْمارَّ الشَّيْءُ**: شتەکە وردە وردە سور بوو. ٥ **احْمَرَّ**: سوربوو. ٥ **احمرَّ البأسُ**: توندو تیژی و ناخۆشی پەرەی سەند. ٥ **الأَحْمَرُ من الأشياء**: ئەوەیە رەنگی سوربێ ٥ زێڕ ٥ زەعفەران. ٥ **الموت الأحمر**: مردنێك بەکوشتن بێ ٥ یان مردنێکی وا ئەخۆشەکە زۆر بەگیانەڵاوە بێ. ٥ **الأحمران**: زێڕو زەعفەران ٥ گۆشت و عەرەق ٥ نان و گۆشت. ٥ **الحامِرَةُ**: خاوەنی گوێدرێژ. ٥ **الحِمارُ**: گوێدرێژ ٥ دارێکە لە پێشی کەژاوە، سواربووەکە دەستی پێ دەگرێ ٥ یان ئەو بنکە دارەیە ئاسنی لەسەر مشت و ماڵ دەکرێ ٥ لەزانیاری وەرزشدا بەوداره دەگوترێ ٥ دوو کەس هەڵی دەگرن و بازی بەسەردا دەدرێ. ٥ **حِمارُ الزرد**: جۆرە کەرەکێوییەکی رەنگ خەتخەتە. ٥ **الحِمَّارَةُ**: ماکەر ٥ بەردی گەورە کە دەخرێتە قەراخی حەوز بۆ ئەوەی ئاوەکە نەڕوا ٥ یان ئەو بەردەیە دەکرێتە کۆختەی راوکەر ٥ دارێکە لە پێشی کەژاوە دەدرێ بۆ ئەوەی سوارەکە دەستی پێ بگرێ ٥ لەقاچیشدا نێوان قاپە رەقەو پەنجەیە. ٥ **الحَمارَّةُ**: (حَمارَّةُ القَيْظِ) وَحَمارَّتُهُ: توندی گەرما.

**الحُمَرُ**: خورمای هیندی ٥ جۆرێکە لە چۆلەکە ٥ گۆڕ.

**الحَمَرُ**: گەدە تێکچوون و ئینتلا کردنێکە توشی ئاژەڵ و وڵاخ دەبێ، بەهۆی زۆر خواردنی جۆوە ٥ **الحمراء**: لەبزن ئەوەیە یەك رەنگبێ ٥ لەژنیش ئەوەی پێستی سپی بێ ٥ رەگەزی ناعەرەب کە بەزۆری رەنگیان سورو سپییە. ٥ **ابن الحمراء**: ئەو کەسەیە دایکی عەرەب نەبێ ٥ چەقی گەرمای نیوەڕۆ ٥ ساڵی گرانی و قات و قڕی. ٥ **حُمْراء الشدقين**: ئەو ئافرەتەی لەبەر پیری و کۆنەساڵی ددانەکانی کەوتبن و پوکەکانی دیاربن. ٥ **حمراء النَّعم**: ئاژەڵە باشەکان ٥ حوشترە رەسەنەکان. ٥

**حَمراء العِجَان**: وشەیەکە عەرەب بۆ زەمکردنی ناحەزیان دەیڵێن. ٥ **اَلْحُمْرَةُ**: رەنگی سور ٥ نەخۆشی سورێژە ٥ نەخۆشییەکی پێستەو دەتەنێتەوە ٥ ٥ **اَلْحِمَّرُ**: لە هەموو شتێك توخ‌و بەهێزەکەیەتی ٥ **اَلْحَمَّارُ**: خاوەنی گوێدرێژ ٥ یان ئەو کەسەی گوێدرێژەکان بەخێو دەکاو سەرو کاریان دەکا. ٥ **اَلْحَمَّارَةُ**: ئەو ئەسپەی هەنگاوی وەکوو هەنگاوی گوێدرێژ دەهاوێ. ٥ **اَلْحُمُّرُ**: جۆرێکە لە چۆلەکە، یان قومری. ٥ **اَلْحُمَيْرَاءُ**: سورکەڵە ٥ بچوككراوەی (الحمراء)ە ٥ وەصفێکیشە بۆ دایکی موسوڵمانان خاتوو عائیشە ٥ **اَلْمُحَمِّرَةُ**: تاقمێکن لەخورەمییەکان کە ئاڵاو دوروشمیان سوور بووە، دژی ئاڵاو دروشمی رەش یان سپی بوون. ٥ **اَلْيَحْمُورُ**: بەمانا (الأحمر) دێ ٥ ئاژەڵێکی شیردەری کاوێژکارە لە پێری حەیوانە کێوییە ٥ کەرەکێوی. ٥ **اَلْحُمَارِسُ**: شێر ٥ بەهێزو توانا ٥ ئازاو چاو نەترس.

**حَمَزَ** الشرابُ حَمْزاً: شەرابەکە زۆر تیژو کەسکون بوو.

**حَمَزَ** اللبنُ والرمان ونحوهما: ماستەکە یان هەنارەکە ترش بوون.

**حَمَزَ** الهَمُّ: خەم‌و خەفەتەکەی زۆر توند بوون.

**حَمَزَ** الفؤادُ: دڵ‌و دەروونی قایم‌و پتەو بوو.

**حَمَزَ** الشَّيْءَ: شتەکەی وەرگرت‌و لەخۆی گرت شاردییەوە.

**حَمَزَ** النَّصْلَ: تیرەکەی تیژ کرد.

**حَمَزَ** الشرابُ اللسانَ: شەرابەکە زمانی گەست، کەسکون بوو.

**حَمَزَ** الكلمةُ فؤادَه: قسەکە کاری لە دڵ‌و دەروونی کرد.

**حَمَزَ** الدواءُ الجرحَ: دەرمانەکە برینەکەی هێواش کردەوەو هاوساوییەکەی نەهێشت.

**حَمُزَ** الرجلُ حَمازةً: پیاوەکە خۆڕاگرو وره بەرزبوو ٥ دەگوترێ: (حَمُزَ فُؤادُهُ): ٥ **اَلْحَمْزَةُ**: شێر لەڕوانگەی ئازایەتی‌و جەربەزەییەوە. ٥ **اَلْحَمُوزُ**: بەو کەسە دەگوترێ زۆر بەخەمەوە بێ بۆ ئەو کارو بارەی لێی بەرپرسیارە. ٥ **اَلْحَمِيزُ**: ئەو کەسەی زۆر زیرەك‌و لێهاتوو بێ.

**حَمَسَ** اللَّحْمَ ونحوه حَمْساً: گۆشتەکەی سورکردەوە.

**حَمَسَ** فلاناً: فلانکەسی تەرەکرد.

**حَمَسَ** حَمْساً: رەق بوو پتەو بوو.

**حَمِسَ** الشَّرُّ والوغى: شەڕو گێرەوەژەکان زۆر توند بوو.

**حَمِسَ** الرجل في الدين: پیاوەکە زێدەڕۆیی کرد لە بواری ئاییندا.

**حَمِسَ** بالشَّيْءِ: خوی بەشتەکەوە گرت‌و وەگری بوو ٥ **حَمُسَ حَمَاسَةً**: ئازابوو ٥ **أَحْمَسَهُ**: رقی هەڵسان. ٥ **حَمَّسَ الحِمِّصَ**: نۆکەکەی سورکردەوە. ٥ **حَمَّسَ الدواءَ**: دەرمانەکەی خستە سەر ئاگر بۆ ماوەیەکی کەم. ٥ **حَمَّسَ فلاناً**: رقی فلانکەسی هەڵساند. ٥ **اِحْتَمَسَ الديكان أو القرنان**: دوو کەڵەشێرەکە یان دوو هاوشانەکە هێرشیان بۆ یەکتر هێناو پێك هەڵپرژان، شەڕیان کرد. ٥ **تَحَامَسَ القومُ**: قەومەکە لێك توڕە بون‌و قسەی ناخۆش‌و جوێنیان بەیەکتر گووت‌و بوو بەشەڕیان. ٥ **تَحَمَّسَ الأمر رغيه**: کارەکە قورس بوو ئاڵۆزاو حەلکردنی زەحمەت بوو. ٥ **تَحَمَّسَ فلان**: فلانکەس پەنای بردو داوای کۆمەکی کرد. ٥ **تَحَمَّسَ فلان للأمر**: فلانکەس بۆکارەکە امادە باشی‌و سوربوونی خۆی هەیە بۆ ئەنجامدانی‌و حەزی لێیەو کەسانی دیکەش بانگەوازی دەکا بۆ ئەنجامدانی. ٥ **الحَمَاسُ والحماسَةُ**: ئازایەتی‌و سوربوون لەسەر شت ٥ داکۆکی کردن ٥

بەرەنگاربوونەوە. ٥ اَلْحُمْشَةُ: حەرامبوون. ٥ اَلْحَمَشَةُ: گیانداریکی ناو دەریایە لە پیری سولەحفاتەکانە. ٥ اَلْحَمِيسُ: تەندور.

**حَمَشَ** الناس حَمْشاً: خەلکەکەی کۆکردەوە.

**حَمَشَ** فلاناً حَمْشاً وحَمْشَةً: رقی هەلساندو تورەی کرد.

**حَمَشَ** القومَ: بەرق و تورەییەوە خەلکەکەی پیش خۆی دان.

**حَمِشَ** الرجلُ حَمَشاً: پیاوەکە قاچی باریك بوون ٥.

**حَمِشَت** اللثة: پوکەکە گۆشتن نییە ٥ یان تەنك و جوانە.

**حَمِشَ** فلان حَمَشاً: فلانکەس رقی هەلساو تورە بوو.

**حَمِشَ** الشرُّ: شەرەکە پەرەی ساندو گەرم بوو. ٥ حَمُشَتْ قوائم الدابة: قاچی حەیوانەکە باریك بوو ٥ أَحْمَشَ النارَ: ئاگرەکەی هەلگیرساندو داری پیوەنان و خۆشی کرد. ٥ أَحْمَشَ الشحْمَ وغيره: بەئاگر بەزەکەی تواندەوە خەریك بوو بسوتێ. ٥ أَحْمَشَ الشرَّ: شەرەکەی هەلگیرساند. ٥ أَحْمَشَ القومَ: قەومەکەی هەلنا بۆ شەرکردن. ٥ تَحَمَّشَ فلان: فلانکەس رقی هەلسا. ٥ تَحَمَّشَ بنوفلان لفلان: هۆزی فلان لەسەر فلانکەسیان کردەوە. ٥ اِسْتَحْمَشَ: رقی هەلسا.

**حَمَصَ** الوَرَمُ حَمصاً وحُموصاً: هاوساویەکە فش بۆوە.

**حَمَصَ** الجُرحُ: برینەکە هاوساوییەکەی نیشتەوە.

**حَمَصَ** الغلامُ: مندالەکە بۆ خۆی چووە سەر جۆلانەکەو لێ نیشت بەبێ ئەوەی کەسێك یارمەتی بدا.٥ حَمَصَ العرق عن الجسم: ئارەق بەجەستەیەوە نەما.

**حَمَصَ** الدواءُ الجُرحَ: دەرمانەکە برینەکەی سارێژکرد.

**حَمَصَ** القذاة: پوشکەکەی لەچاو دەرهێنا بەهێدی.

**حَمَّصَ**: لەکاتی نیوەرۆدا ئاسکی نێچیر کرد. ٥ حَمَّصَ الحَبَّ: دانەوێلەکەی سور کردەوە. ٥ إنْحَمَصَ الوَرَمُ: هاوساوییەکەی نیشتەوە. ٥ اِنْحَمَصَ الجرحُ: برینەکە هاوساوی نەما. ٥ اِنْحَمَصَ الانسان أو الحيوان: ئادەمیزادەکە یان حەیوانەکە کزبوو گۆشتی پێوەنەما. ٥ اِنْحَمَصَت الجرادة: کوللە گەلای درەختی سەلی خواردو سوور هەلگەڕا. ٥ تَحَمَّصَ اللَّحمُ: گۆشتەکە وشك بۆوە ئاوی پێوە نەما چرچ بوو. ٥ اَلْحِمَّصُ والحِمِصُ: نۆك. ٥ الحِمَّصانِ: نۆك فرۆش. ٥ اَلْمِحْمَصَةُ: ئامێری شت سورکردنەوە.

**حَمَضَت** الماشيةُ: ئاژەلەکە شتی مزرو ترشی خوارد.

**حَمُضَ** عنه: حەزی لە خواردنی نەبوو.

**حَمُضَ** اللَّبَنُ والفاكهةُ حموضةً: شیرەکە یان میوەکە ترش بوو. ٥ أَحْمَضَ المكانُ: ئەو شوێنە شتی ترش (لەوەڕی) مزرو ترشی لێبوو. ٥ أَحْمَضَ القوم: هۆزەکە لەناو خۆیاندا قسەی خۆش و پێکەنین ئامێزیان بۆیەکتر کردو درێژەیان پێ دا. ٥ أَحْمَضَ الماشيةَ: خۆراکی ترشی دەرخواردی ئاژەلەکان دا. ٥ أَحْمَضَ الشَّيْءَ: شتەکەی ترش کرد. ٥ حَمَّضَ فلان في الشَّيْءَ: فلانکەس لەشتەکەی کەم کردەوە. ٥ حَمَّضَ الشَّيْءَ: واتە: (أَحْمَضَهُ). ٥ حَمَّضَ الصورةَ: وێنەکەی خستە ناو حەوزی ترشەلۆکەوە، بۆ ئەوەی وێنەکە بەرونی دەرکەوێ. ٥ تَحَمَّضَ الراعي: شوانەکە ئاژەلەکانی لە لەوەڕگای شیرینەوە گواستەوە بۆ لەوەڕگای ترش. ٥ تَحَمَّضَ فلان: فلانکەس لە حالێکەوە چووە حالێکی ترەوە. ر اِسْتَحْمَضَ اللَّبَنُ: شیرەکە دەرەنگ مەیی. ٥ الحامِضُ: هەر خواردنێك تیژو ترش بێ زمان بگەزێ، وەکوو سرکەو ماستی ترش. ٥ الحُمَاضُ: حالەتێکە لە جەستەدا ماددە ترشەکان زیادەکەن و قەلەویات کەم دەبنەوە.

٥ اَلحَمْـضُ: هـەر روەك و گیـاو گژێـك تـرش یـا سوێربێ فەدی هەبێ و زۆر رەگی دانـەکوتابێ ٥ الحُمَّـاضُ: گیـاو گـژی تـرش تـام. ٥ اَلحَمِـیضُ: شوێنێك کە زۆر لەوەڕی ترش تامی تێدابێ بـۆ ئـاژەڵ ٥ اَلمَحْمَضُ وَالمُحْمَضُ: لەوەڕگایـەك زۆری لەوەڕی ترش تێدابێ.

**حَمَطَ** الكَرْمَ: درەختێکی لەنزیك میوەکە رواند بۆ ئەوەی سێبەر لەمێوەکە بکا. ٥ الحَمَاطُ: درەختێکە دەشوبهێتە درەختی هەنجیر مارحەز دەکا تێیدا ژیان بەسەر بەرێ ٥ دەرەختی هەنجیرە کێویلە.

**حَمِقَ** فلان حَمَقاً: ریشی تەنك بوو ٥ عـەقڵی سوك بوو.

**حَمُقَ** حَمْقـاً وحَمَاقَـةً: عـەقڵی کـەم بـوو ٥ کـرداری ئەحمەقی ئەنجام دان.

**حَمُقَ** السوقُ: بازاڕ وەستاو کـڕین و فرۆشـتن کـەم بوو. ٥ أَحْمَقَ: منداڵێکی ئەحمـەقی بـوو. ٥ أَحْمَقَ بە: بەئەحمـەق نـاوی بـرد، ڕەوشـتی ئەحمـەقی پاڵدا. ٥ أَحْمَقَ فلاناً: بەئەحمـەق فلانکەسـی هاتـە بەرچاو. ٥ حَامَقَهُ: لەئەحمەقی‌دا هاوبەشی کـرد. ٥ حَمَّقَهُ: نیسبەتی دا بۆ ئەحمـەق و بەئەحمـەقی لەقەڵەمـدا ٥ وەکوو ئەحمـەق مامەڵەی لەگـەڵ کـرد. ٥ اِنْـحَمَقَ: بـەمانا (حَمُـقَ) دێ ٥ بـەبێ لێوردبونەوە ملی نا. ٥ اِحْمَقَ الثوبُ: کراسـەکەی ڕزی. ٥ تَحَامَقَ: لافی ئەحمـەقیی لێدا. ٥ تَحَمَّقَ: بەزۆرە ملی ڕەوشتی ئەحمەقی بەسـەر خۆی‌دا هێنـا. ٥ اسْتَحْمَقَ: بـەمانا (حَمُـقَ) دێ. ٥ اسْتَحْمَقَ فلانـاً: ئەحمـەقیی فێـری فـلان کـرد، ڕەوشـتی ناپیاوانـەی لـەلا شـیرین کـرد. ٥ الأُحمُوقَـةُ: ئـەو ڕەوشتانەی لەیەکێك دیاری دەدەن و بەڕەوشتی ئەحمەقانـە پێناسـە دەکـرێن. ٥ الأَحْمَـقُ: ئـەو کەسـەیە زۆر ڕەوشـتی ئەحمـەقی لێ ڕوبـدەن. ٥ الحَمَـاقُ والحُمَـاقُ: ئاوڵـە کـە لـەمنادەمیزاد دێ و بەجەستەدا بڵاو دەبێتـەوە. ٥ الحَمْقَاءُ: مێینـەی (الأحمق)ە ٥ (والبَقْلَةُ الحَمْقَاءُ): پێـكول. ٥ الحَمرقَةُ: ئـەو کەسـەیە لەئەحمـەقی دا گەیـشتێتە ئەوپەڕی. ٥ المِحْمَاقُ: ئەو ئافرەتەیە هەر منداڵی ئەحمـەقی بـبن، ٥ اَلمُحْمِقَـاتُ اللیـالی: ئـەو شەوانەیە هەمیشە مانگیان تێدا هەڵبێ.

**حَمَكَ** الدلیل حَمْکاً: بەجوانی ڕێبوارانی شارەزایی کردن.

**اَلحَمَكُ**: ئەو شارەزایانەن کە لەسارادا ڕەهنومایی خەڵکی ئەشارەزا دەکەن ٥

**حملت المرأة جنینها وبه**: ئافرەتەکە حامیلە بوو ٥ حَمَلَتِ الشجرةُ: درەختەکە میوەی گرت.

**حَمَلَ** علیه في الحرب: هێرشی بۆ برد.

**حَمَلَ** الحِمْلَ علی ظهر الدابة: بارەکـەی خستە سەرپشتی وڵاخەکە.

**حَمَلَ** الشيْءَ علی الشَّيْءِ: شتەکەی پەیوەست کرد بەو شتەوە.

**حَمَلَ** فلاناً علی الامر: فلانکەسـی هـەڵنا بـۆ کردنی ئەوکارە.

**حَمَلَ** علیه الحِقْدَ: ڕق و کینەی بۆ لەدڵدا خواردەوە.

**حَمَلَ** الغضب: ڕقەکەی دەرخست.

**حَمَلَ** علیه ذنبه: تاوانەکەی خستە سەر.

**حَمَلَ** فلاناً: وڵاغێکی سواری دا بەفلان بۆ ئەوەی سواری بێ. ٥ أَحْمَلَتِ المرأة والناقةُ: ئافرەتەکە بێ ئەوەی مێردی هەبێ مەمکەکانی شیریان تێهات ٥ حوشترەکە بێ ئەوە کەڵ بگرێ شیری لێ پەیدا بوو ٥ زۆری سك و زا کردن. ٥ أحْمَلَ فلاناً الحِمْلَ: یارمەتی فلانکەسـی‌دا بۆ کـۆڵ هەڵگرتنەکەی. ٥ حَمَّلَهُ الشيءَ والأمرَ: داوای لێکرد ئەوە هەڵگرێ. ٥ اِحْتَمَلَ الأمرُ أن یکون هکذا: پێدەچێ کارەکە ئاوابێ. ٥ اِحْتَمَلَ ماکان

منه: چاو پۆشی لێکردو لێی خۆش بوو. ٥ احْتَمَلَ فلان الصنيعةَ: فلانکەس سوپاسگوزاری کردەوەکەی بوو. ٥ احْتَمَلَ الغضبُ فلاناً: رق هەڵسان فلانکەسی والێکرد ئاگای لە خۆ نەمێنێ و نەزانێ چی بکا. ٥ أُحْتُمِلَ: کە رقی هەڵسا سور بووە رەنگی گۆڕا. ٥ تَحامَلَ على فلان: ستەمی لە فلانکەس کرد ٥ شتێکی وای داوا لێ کرد لە تاقەتیا نەبێ ئەنجامی بدا ٥ تَحامَلَ الشَّيْءَ وفيه ريه: داوای لێکرد ئەو کارە بکا وێڕای ناخۆشی و قورسی کارەکە. ٥ تَحامَلَ الزمانُ عن فلان: رۆژگار روی لەفلان وەرگێڕا. ٥ تَحامَلَ الرجلان الشَّيْءَ: دوو پیاوەکە بەنۆرە کۆڵەکەیان هەڵگرت و بارمەتی یەکتریان دا. ٥ تَحَمَّلَ القومُ: هۆزەکە رەویان کرد. ٥ تَحَمَّلَ فلان: فلانکەس خۆراگرو وره بەرزو ئازا بوو. ٥ تَحَمَّلَ الحَمالَةَ: کۆڵەکەی لەکۆڵ دا. ٥ تَحَمَّلَ الأمرَ: کارەکەی لەئەستۆگرت بەنارەحەتی چووە ژێری. ٥ تَحَمَّلَ شهادةَ فلان: لەجیاتی فلانکەس شایەتی دا واتە شایەتییەکەی لێ وەرگرت و ئەمجار چوو شایەتییەکەی دا. ٥ استَحْمَلَ فلان: فلانکەس هەڵی گرت. ٥ استَحْمَلَ فلاناً: داوای لەفلانکەس کرد شتەکەی بۆ هەڵگرێ. ٥ استَحْمَلَ فلاناً نَفْسَهُ: هەموو کارو بارو پێداویستی خۆی خستە ئەستۆی فلانکەس خۆی. ٥ الحامِلَةُ: مێینەی (الحَامِل) ٥ زەنبیلەو بەچنەو قەرتاڵە کە تریی تێدا هەڵدەگیرێ ٥ مەکوکی جۆلا ٥ حاملة الطائرات: کەشتی گەورەی زەبەللاح کە لە دەریادا فڕۆکەی لەسەر دەنیشێتەوە هەروا زرێپۆش و تۆپ و چەکی تریش هەڵدەگرێ ٥ لەناو دەریادا دەبێتە فڕۆکەخانەو سەباز خانە، (ك: حَوَامِل). ٥ الحوامِلُ: قاچ ٥ قاچەکان. ٥ الحاملة من القدم والذراع: رەگەکانی قاچ و دەستە. ٥ الحَمَالُ: خوێن و غەرامە، کە کەسانی دیکە لەئەستۆی خۆیانی دەگرن. ٥ الحُمالَةُ: کرێی هەڵگرتنی کۆڵ. ٥ الحَمالَةُ: ئەڵقەی شمشێرو شتی لەو جۆرە کە پێی هەڵدەواسرێ.

**الحِمْلُ**: ئەوەی بەکۆڵ هەڵدەگیرێ ٥ کەژاوە ٥ ئەو حوشترەی کەژاوەکەی لێ باردەکرێ ٥ لەزاراوەی (ریاضیات)دا بریتییە لە قەبارمیەك یان قورساییەك کە هەڵدەگیرێ یان رادەکێشرێ بەهۆی ئامێرێکەوە.

**اَلْحَمَلُ**: بەرخۆلە، بورجێکە لەئاسمان لە بورجە بەهارییەکانە. ٥ اَلْحُمْلان: ئەو ولاخەیە دیارییەکانی لێ دەنرێ کە دەبرێن بۆ شوێنێکی تر ٥ کرێی حەماڵ. ٥ الحِمْلَةُ والحُمْلَةُ: گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. ٥ اَلْحَمُولُ: پیاوی لەسەرخۆو هێدیو خۆراگرو پشودرێژ. ٥ اَلْحَمِيلُ: منداڵی بێ ئازو فرێدراو کە کەسانی دیکە هەڵی دەگرنەوەو بەخێوی دەکەن ٥ اَلْمَحْمِلُ: کەژاوە ٥ دووتای بار کە بەسەر پشتی ولاخەکەوە بێ ٥ زەنبیلەو بەرچنە کە تریی تێ دەکرێ.

**حَمْلَجَ** الحَبْلَ: جەبلەکەی زۆر توند بادا.

**اَلْحِمْلاجُ**: حەبلی گشت بادراو ٥ موشەدەمەی مزگەرو ئاسنگەر شاخی گاو ئاسك.

**حَمْلَقَ**: چاوی کردنەوە ٥ زۆر بەوردی سەیری کرد. ٥ حِمْلاقُ العين وحِمْلِقُها: ئەو شوێنانەی کل رەشی دەکا لەچاو ٥ لە دیوی پێلوەکانی چاوەوە.

**حَمَّ** التنورَ ونحوه حَمّاً: تەندورەکەی هەڵگیرساند.

**حَمَّ** الماءَ ونحوه: ئاوەکەی گەرم کرد.

**حَمَّ** الشحمَ ونحوه: پیوەکەی تواندەوە.

**حَمَّ** الأمرُ فلاناً: کارەکە گرنگی دا بەفلان.

**حَمَّ** الماءُ ونحوه: ئاوەکە گەرم بوو.

حَمَّ الشَّيْءَ: شتەکە رەش داگیرسا. ○ حُمَّتْ الجرةُ: دیزەکە سوتا.

حُمَّ حُماماً: تای لێ هات.

حُمَّ الأمر: کارەکە جێبەجێ بوو.

حُمَّ لفلان: بۆ فلانکەس وامەزندە کراوە. ○ أحَمَّتِ الأرضُ: لەرزو تا لەو ولاتە بلاو بۆوە. ○ أحَمَّ الشَّيْءُ: شتەکە نزیك بوو ئامادە بوو. ○ أحَمَّ الماءَ ونحوه: ئاوەکەی گەرم کرد. ○ أحَمَّ الطفلَ ونحوه: منداڵەکەی بەئاوی گەرم شت. ○ أحَمَّ الله فلاناً: خودا فلانکەسی توشی لەرزو تاکرد. ○ أحَمَّ الله كذا: خودا ئەوەی بڕیارداو ئەنجامی دا. ○ حَامَّ فلاناً: فلانکەسی نزیك کردەوە ○ داوای لێکرد. ○ حَمَّمَت الأرضُ: گیاو گژەکە لەسەوزاییەوە بەرەو رەشی رۆیی. ○ حَمَّمَ الغُلامُ: کوڕەکە ریشی هات. ○ حَمَّمَ الفرخُ: بێچوە پەلەوەرەکە بەرو باڵی لێ روان. ○ حَمَّمَ الماءَ ونحوه: گەرمی کرد ○ کوڵاندی. ○ حَمَّمَ الرجلَ: دەمو چاوی پیاوەکەی بەخەڵوز رەش کرد. ○ احْتَمَّ لفلان: لەبەر فلانکەس رقی هەڵسا. ○ تَحَمَّمَ: رەش هەڵگیرسا. ○ استَحَمَّ: چووە گەرماوەوە خۆی شت. ○ الحامَّةُ: کەسانی تایبەتی لەخزمو کەسو کارو کوڕونەوە ○ حوشتری باش. ○ الحَمَامُ: کۆتر.

الحِمَامُ: قەزاو قەدەری مردن. ○ الحُمَامُ: لەرزو تای هەموو ئاژەڵو ولاغێك. ○ الحَمَامَةُ: تاکی (الحَمَام)ە بۆ کوتری نێرو مێ بەکاردێ.

الحَمُّ: بەزو پیوی تواوە ○ پاشماوەی بەزو پیوی تواوە.

حَمُّ الظهيرة: توندی گەرمای نیوەڕۆ.○ حَمُّ الشَّيْءِ: زوربەی شت ○ جا هەر شتێك بێ.

الحُمَمُ: خەڵوز ○ خۆڵەمێش ○ هەر شتێك بەئاگر سوتابێ ○ الحُمَّى: نەخۆشییەکە جەستەی پێ گەرم دەبێو چەند جۆرێکی هەیە ○ (تیفو، تیفوس، الدق، الصفراء، القرمزية). ○ الحَمَّامُ: ئەو شوێنەی خۆی لێ دەشۆی ○ شوێنی خۆ لێ شتن. ○ الحَمَّامِيُّ: خاوەنی گەرماو ○ ئاتری گەرماو. ○ الحَمَّةُ: هەر سەرچاوەیەك ئاوەکەی گەرم بێو لەزەوی هەڵقوڵێ، خەڵك بە مەبەستی شیفاو چاکبوونەوە لە نەخۆشی خۆی لێ بشۆن. ○ الحُمَّةُ: تا ○ رەنگێکە لە نێوان بۆرو شێدا. ○ الحِمَّةُ: مردن. ○ الحَمِيمُ: پشکۆ ئاگر ○ گەرمای نیوەڕۆ ○ بارانێك دوای گەرمای زۆر بباریێ ○ ئاوی کوڵاتو ○ الحميمُ بالحاجة: ئەو کەسەی کارەکەی دەخرێتە ئەستۆ. ○ الحَمِيمَةُ: مێینەی (الحميم)ە، ئاوی کوڵاتو ○ شیری گەرم ○ حوشتری رەسەنو چاك، (ك: حَمَائِم). ○ المُحَمُّ: قاپێکی بچوکە لە مسو حەوجۆشو شتی وا دروست دەکرێ بۆ ئاوتێدا گەرمکردن بەکار دەهێندرێ.

المَحَمَّةُ: زەوییەکە لەرزو تای تێدا بڵاو بوبێتەوە. ○ طعام مَحَمَّةٌ: هەر کەسێك بیخوا تای لێ دێ. ○ المُستَحَمُّ: گەرماو. ○ اليَحْمُومُ: هەرشتێك زۆر گەرم بێ ○ نبت يحموم: روەکێکی تێر ئاوە کە لەسەوزییا رەش هەڵگەڕابێ. ○ الحُمْنَانُ: مەیمونی بچکۆلە ○ جۆرێکە لەترێی طائیف رەشی مەیلەو سورە، بۆڵەکەی گەورەو دەنکی ئاوی بچوك. ○ الحُمْنَنَةُ: زەوییەکە مەیمونی بچوکی زۆربێ. ○ حَمَت الشَّمسُ أو النارُ حُمواً: گەرمییەکە پەرەی سەند.

حَمَى المريضَ: ئەو شتانەی زیانی بۆ نەخۆشەکە هەیە لێی قەدەغە کرد.○حَمَى الشَّيْءَ فلاناً حَمْياً وحِمايةً: ئەو شتەی لەفلانکەس مەنع کردو لێی دوور خستەوە ○ حَمِيَتْ الشمسُ والنار والحديد حمياً وحُمواً وحَمَياً: گەرم بوو.

حَمِيَ الوطيسُ: شەڕ گەرم بوو.

**حَمِـيَ** الفَـرَسُ: ئەسـپەكە لەشـى گـەرم داهـاتو عارەقى كرد.

**حَمِيَ** عليه: رقى لێ هەڵسا. ٥ **حَمِيَ مِـن الـشَّيْءِ حَمِيـةً**: بێـزى نـەهات لـەو شـتە ئـەنجام بـدا. ٥ **أحْمَـى الـشَّيْءَ**: شـتەكەى گـەرم كـرد. ٥ **أَحْمَـى المكـان**: شوێنەكەى وا لێ كـرد پـارێزراو بـێ كـەس نـەتوانێ توخنى بكەوێ. ٥ **حامى عنه مُحاماةً وحِمَاءً**: داكۆكى لێ كـرد. ٥ **حـامى ضَـيْفَهُ**: پێـشوازى گـەرمى لـە مێوانەكـەى كـرد. ٥ **احْتَمَـى فِي الحـرب**: لەشـەڕدا خۆى پاراست ٥ خۆى پـەنادا. ٥ **أحْتَمى المريضُ مما يضره**: نەخۆشـەكە خـۆى پاراسـت لـەو شـتانەى زيانى پـێ دەگەيـەنن. ٥ **احتمـى مـن فـلان**: خـۆى لەفلانكەس پاراست ٥ (وبِهِ) پەناى بۆ فلان برد. ٥ **تَحاماه**: خۆى لێ پاراست. ٥ **الحامي من الابل**: ئـەو حوشترەيە لاى خاوەنەكەى بمێنێتەوە تا دەجار سك دەكا، ٥ **الحاميـة**: مێينـەى (الحـامي)يـە ٥ ئـەو پيـاوەى لەشـەڕدا پارێزگـارى هاوەڵـەكانى دەكـا ٥ كۆمەڵێـك سـەرباز كـە پارێزگـارى ئەفەرێـك يـان شارێك دەكەن.

**حما** المرأةِ: باوكى يان مێردى ئافرەتەكە، هەروا خزمو كەسو كارى مێردى ژن.

**حما** الرجلِ: خـەزورى پياوەكە ٥ هـەروا خزمـى ژنەكـە بەنيسبەت مێردەكەيەوە.

**الحِمى**: پاوان ئەو شوێنەى لەوەرگايەو تايبەتە بـە يەكێـــكەوە يـــان بەبنەماڵەيەكـــەوە ٥ شـــتى پارێزراو. ٥ **الحُمَةُ**: ژەهـرى جانەوەرێـكى پێوە بدا ٥ يان بگەزێ ٥ جـزوى دوپشكو زەرگەتـەو ژەنگە سورەو ئەو شتانە. ٥ **حُمَةُ البرد**: جەنگـەى سەرماو سۆڵ.

**حَمْوُ** الشمس: گەرمى خۆر.

**حَمْوُ** المرأةِ: خزمى ژن بەهۆى مێردەكەيەوە.

**حَمْوُ** الرجل: خزمى پياو بەهۆى ژنەكەيەوە. ٥ **حُمُوُّ الألَـم**: ئـەو پـەڕى ئـازارو ئەندێـشە. ٥ **الحِمْيَـةُ**: كەمخۆرى ٥ كەمكردنـەوە لـەو خواردنانـەى كـە زيانبەخشن. ٥ **الحَمِيُّ**: نەخۆش كە خواردنى زيان بەخشى لێ قەدەغـە كرابـێ. ٥ **حَمْيًا**: بـۆ هـەموو شتێك هـەرەتى هێـزو توانـاو تونـدو تيژييـەتى بۆ گەنج هەرەتى لاوەتى هێزو تواناى.

**الحَمِيَّةُ**: دەمارگيرى ٥ پارێزگارى لە ئايينو شـەرەفـو نـاموس. ٥ **المحـامي**: پـارێزەر كـە لـەدادگادا داكوكى لەيەكێ لـە دوو كێشە كارەكان دەكا. ٥ **المحاماة**: پێشەى پـارێزەريى. ٥ **المُحْمِيُّ**: شـير. ٥ **تَحْمِيـر**: بـەزوبانى حيميـەرى قـسەى كـرد ٥ رەوشتى ناشيرين بوو.

**حَنَأَ** المكان حَنْأً: شوێنەكە سـەوز بـوو گيـاوو گژى وەخۆ كەوتو راساو تێك هاڵا. ٥ **حَنَّأ لِحْيَتَهُ أو رأسهُ**: ريـشى يـا سـەرى بەخەنـەرەنگ كـرد. ٥ **الحِنـاءُ**: درەختێــكە گـەڵاو قـەدى وەكـوو هـى هەنارواىـە، گوڵێـكى سـپى دەردەكا لـە شـێوەى هێـشوودا لـە گەڵاكـەى خەنـەى سـور بەرهـەم دەهێندرێ.

**حَنِبَ** الفرسُ حَنَباً: ئەسـپەكە قاچـى خـوار بـوون ٥ نێوان قاچەكانى پان بوو ٥ **حَنَّبَ الفرسُ**: بـەمانا (حَنِبَ) دێ. ٥ **حَنَّبَ الكِبرُ فلاناً**: پـيرى فلانكەسـى چـۆماندۆتەوە پـشتى كـۆم بۆتـەوە. ٥ **تَحَنَّـبَ**: پـشتى كـۆم بـۆوە (تَحَنَّـبَ عليـه) بـەزەيى پێـدا هاتەوە. ٥ **حَنْبَلَ**: لوبياى خوارد ٥ فەروەى كۆنو رزيـوى لەبـەركرد. ٥ **تَحَنْبَـلَ**: سـەرى تەقانـد ٥ چووە سەر رێبازى ئەحمەدى كورى حەنبەل. ٥ **الحُنَابِـلُ**: ژنـى ئەسـتوورو پتـەو يـان حـەبلى ئەستوورو قايم. ٥ **الحَنْبَلُ**: كورتـە بـاڵاى ورگ زل ٥ عەباو فـەروەى كۆنو رزيـو. ٥ **الحَنْبَلِيُّ**: ئـەو

کەسەی شوێن ڕێبازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکەوێ. ٥ الحانوت: دوکانی مەی فرۆشی ٥ دوکانی بازرگانی، ٥ اَلْحَنْتَفُ: کوللەی پاککراو بۆ چێشت لێنان. ٥ اَلْحَنْتُوف: ئەو کەسەی ڕیشی هەڵدەکەنێ. ٥ اَلْحُنْتُمُ: هەموو ڕەش و سەوزێك ٥ سواڵەتی ڕەش ٥ جەرڕەی سەوز ٥ هەوری ڕەش.

**حَنَثَ** فِي يمِينه: لە سوێند خواردنەکەیدا ڕاستی نەکرد (سوێندی بەدرۆ خوارد).٥ **حَنَثَ**: لەحەق لایداو شتی باطلو پوچی پەیڕەو کرد. ٥ **أحْنَثَهُ**: وای لێ کرد سوێندی لێ بکەوێ. ٥ **حَنَّثَهُ**: سوێندی لێ خست. ٥ **تَحَنَّثَ**: خودا پەرستی کرد ٥ کارێکی کرد تاوانی سوێندی لێ نەکەوێ.

**اَلْحِنْثُ**: تاوان ٥ **اَلْحُماثُ**: تاوانکار ٥ شوێنی تاوان. ٥ **حَنَجَتْ لَه حَاجَةٌ حَنْجاً**: کارێکی بۆ هاتە پێشەوە.

**حَنَجَ** الشَّيْءَ: شتەکەی لادا لەڕێبازی خۆی ٥. **حَنَجَ** كلامَهُ: قسەکەی خۆی گۆڕی.

**احْنَجَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لا دا.٥ **احْنَجَ فلان**: فلانکەس سەیری دواخۆیەوە کرد سەری و سنگی وەر سوڕاند بۆ ئاوڕدانەوەکەی.

**إِحْتَنَجَ الشَّيْءُ**: بەمانا (أحْنَجَ) دێ.

**حَنْجَرَت عَيْنُهُ**: چاوی قوڵ بون ٥ بەقوڵاچون.

**حَنْجَرَ** الحيوانَ: ئاژەڵەکەی سەربڕی.

**اَلْحَنْجَرَةُ**: گەرو ٥ بۆڕی هەناسەدان لە ئاستی مل.

**اَلْحُنْجُورُ**: بەمانا (اَلْحَنْجَرَةُ) دێ ٥ سندوقی بچوك ٥ شوشەی عەترو شتی لەوجۆرە.

**اَلْحَنَاجِلُ**: کورتە باڵای تێکسمڕاو.

**اَلْحِنجِلُ** من النساء: ئافرەتی کەتەی ناشیرین و دەمەوەر.

**اَلْحُنْدُرَةُ**: گلێنەی چاو، دەگوترێ: (هو على حندرة عينه).

**اَلْحُنْدُورَةُ**: بەمانا (الحُنْدُرَةُ) دێ.٥ **تَحَنْدَسَ الرجلُ**: زەعیف بوو کەوت ٥ (تحندس الليلُ) شەوەکە تاریك بوو.

**الحِنْدِسُ**: تاریکی شەو ٥ شەوی زۆرتاریك.٥ **الحَنادِسُ**: سێ شەوی کۆتایی مانگن (٢٨، ٢٩، ٣٠).

**اَلْحَنْدَقُوقُ**: پیاوی درێژی شل و شێواو ٥ پیاوی ئەحمەق ٥ گیاییەکە ساڵانەیە لەکێوو دەشت دەڕوێ و ئالفێکی باشە بۆ وڵاخ و ئاژەڵ ٥ ناوێکی تری هەیە پێی دەڵێن: (الدُّرَقُ).

**حَنَذَ** الحَرُّ حَنْذاً: گەرما تاوی ساند.٥ **حَنَذَ** لە: ئاوی کەم کردەوەو شەرابی زۆر کرد.٥ **حَنَذَ** العِجْلَ وغيره حَنْذاً وتَحْناذاً: گوێلکەڵەکەی سورکردەوە بەم جۆرە بیخاتە ناو ئاگرەوە، یان بیخاتە ناو شتێکەوە بەئاگر گەرم بوبێ.٥ **حَنَذَ** الشمسُ الشَّيْءَ: خۆر شتەکەی سوتاندو برژاند.٥ **حَنَذَ** الفَرَسَ حَنْذاً: بازی بە ئەسپەکە داو چەند مەودایەکی پێ بڕی ٥ ئەمجار لەبەر خۆرەتاو جلێکی بەئەسپەکەدادا بۆ ئەوەی عەرەق بکا.

**اسْتَحْنَذَ**: لەبەر خۆرەتاو ڕاکشاو بەتانی و لێفەی بەسەری دادا بۆ ئەوە عەرەق بکاتەوە.

**حَنَاذ**: ناوێکی خۆرە.

**الحُنْذَةُ**: گەرمایی توندو بەهێز.

**الحِنْذِيان**: ئادەمیزادی جنێو فرۆشی زمان پیس.

**اَلْحَنِيذُ**: ئاوی گەرم ٥ گۆشتی برژاو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَبِثَ أن جَاء بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾.

**حَنَرَ** الحنيرةَ حَنْراً: تاقە کەوانەییەکەی دروست کرد ٥ قەوسی بێ ژێی دروست کرد ٥ ئامێری خاوکردنەوەی لۆکەی دروستکرد ٥ هەروا (حَنَر) ناوە بۆ هەرشتێك کەم بێتەوە.

**حَنِسَ** حَنَساً: لەناو جەنگەی گۆڕەپانی جەنگدا ڕاوەستاو سەنگەری بەرنەدا.

**الحَنَسُ**: ئەوکەسانەی زۆر خۆڵەماڵی حەرامو کاری نابەجێ دەپارێزن.

**الحَوَنسُ**: کەسێك کەس نەتوانێ پڕ بەچاو سەیری بکاو کەس نەتوانێ ستەمی لێ بکا ٥ ئەگەر لەشوێنی خۆی جوڵا کەس نەوێرێ لەهەڵوێستی خۆی وەیگێڕێ.

**حَنَشَهُ** (الحَنَشُ) حنشاً: پێوەی دا گەستی.

**حَنَشَهُ**: لێی خوڕی دەری کرد ٥ دەگوترێ: (حَنَشَ الصیدَ) نێچیرەکەی راوکرد.

**حَنَشَ** فلاناً: فلاّنکەسی هەڵخەڵەتاند.

**حُنِشَ**: لەحەسەبو نەسەبی کەم کردەوە.

**أحْنَشَهُ** عن الأمر: پەلەی لێ کرد.

**الحَنَشُ**: ماری گەورەی رەش ٥ رەشماری گەورە کە ژەهراوی نەبێ ٥ هەروا پیرۆیەك سەری لەسەری مار بچێ.

**المُحَنَّشُ**: کەسێك زۆر کاسب بێو هەمیشە لەهەوڵی کاسبی ماڵ کۆکردنەوەدا بێ.

**حَنَطَ** الزرعُ حُنوطاً: کشتوکاڵەکە پێگەیی.

**حَنِطَ** فلان: هەناسەی قوڵی هەڵکێشا.

**حَنِطَ** الادیمُ: پێستەکە سور بوو (هو حانِطٌ).

**حَنِطَ** الرجلُ حنطاً: پیاوەکە ریشی گەورە بوو پڕبوو، (هو أحنط).

**أحْنَطَ الزَّرْعُ** وغیره: بەمانا (حَنَطَ) دێ.

**أحْنَطَ المَیِّتَ**: مردووەکەی تەحنیط کرد ٥ بۆنی خۆشی بەمردووەکە کرد.

**حَنَّطَ** المیتَ: بەمانا (أحْنَطَهُ) دێ.

**تَحَنَّطَ** مِن الحنطة: گەنمی خوارد.

**اسْتَحْنَطَ** فلان: فلاّنکەس پەلاماری مردنی داو دونیای بەلاوە هیچو پوچ بوو.

**الحانِطُ**: بەروبوومی درەختی غەضا ٥ خاوەن گەنم ٥ کەسێك گەنمی زۆر هەبێ ٥ (رجل حانِط) پیاوێکە کشتوکاڵەکەی کاتی دروێنەی هاتووە ٥ (أحمر حانط) سورێکی مەیلەو رەش.

**الحِناطُ**: هەر بۆنێکی خۆش تێکەڵ بکرێ بۆ کفنو جەستەی مردوو وەکوو (میسکو صەندەلو عەنبەرو کافور..)

**الحِناطَةُ**: پیشەی عەلافی (گەنمو جۆ فرۆشی).

**الحِنْطَةُ**: گەنم، (ك: حِنَطَ).

**الحِنطِيُّ**: ئەو کەسەی زۆر گەنم دەخوا ٥ کەسێك گەنم رەنگ بێ.

**الحَنّاطُ**: گەنم فرۆش ٥ ئەو کەسەی مردو تەحنیط دەکا.

**الحَنُوطُ**: بەمانا (الحِناطُ) دێ.

**الحَنُوطِيُّ**: ئەو کەسەیە کەرەسەی تەحنیط کردنی مردو دەفرۆشێ ٥ هەروا ئەو کەسەی هەڵدەستێ بەکفنو دفنکردنی مردوو.

**التَّحْنیطُ**: بریتییە لە هێشتنەوەی جەستەی مردوو لەسەر حاڵەتی خۆی، بەوە لە مادەی نەرمو پێستو پەردەکان بپارێزرێو ناوسکی بەمادەی تایبەتی پاك بکرێتەوە.

**الحَنْظَلُ**: رووەکێکە بەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوەو پەل دەهاوێ ٥ بەرەکەی لە قەبارەی رەنگی پرتەقاڵ دایە، ناوکەکەی زۆر زۆر تاڵە.

**حَنَفَ** عن الشَّيْءِ حنفاً: لەشتەکە لایدا.

**حَنِفَ** الرجلُ حَنَفاً: قاچی خوار بوون رویان لەناوەوە کرد ٥ **حَنَّفَهُ**: وای لێکرد قاچی خوارو فەیزەن بن ٥ **تَحَنَّفَ**: وازی لەبتپەرستی هێناو موسوڵمان بوو دەستیکرد بەخودا پەرستی ٥ چووە سەر رێبازی ئەبو حەنیفە. ٥ **تَحَنَّفَ الی الشَّيْءِ**: مەیلی بۆ لای ئەو شتە بوو ٥ رووی لەو کرد. ٥ **الحَنْفاءُ**: کەوان ٥ موس ٥ دەعبای حیرباء ٥ ئافرەتی کەنیزەك دەمێ تەمبەڵو دەمێ بەنیشات ٥ سولەحفاتی ئاو (کیسەڵی

ناوی) ◊ ماسییەکی دەریاییە ناوی (أحْوم)ە. ◊ **الحَنَفِيُّ**: شوێنکەوتەی مەزهەبی ئەبو حەنیفە. ◊ **اَلْحَنِيفُ**: ئەو کەسەیە لەسەر لایدابێ بۆ کاری خێرو باش ◊ ئەو کەسەی لەسەر ئایینی ئیسلام بێ و لێی لانەدا ◊ ئەو کەسەی حەجی مالی خودای کردبێ، (ك: حنفاء). ◊ **الحنفاء**: پێڕێکی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام بوون لە ناخەوە دژی بتپەرستی بوون ◊ **الحنيفية**: نەتەوەی ئیسلام دەگوترێ: (ملة حنيفية) ◊ جۆرێکە لە شمشێر کە نیسبەت دەدرێن بۆلای ئەحنەفی کوری قەیس، چونکە ئەو یەکەم کەس بووە لەناو عەرەبدا شمشێری داهێنا.

**حَنِقَ** عليه حَنَقاً: رقی لێ هەڵسا ◊ **أحْنَقَ**: بەمانا رق لێبوونی بەردەوامە. ◊ **احْنَقَ الصُلْبُ**: پشتی نووسا بەسکیەوە. ◊ **أحْنَقَ السنامُ**: دوگی حوشترەکە لەرو لاواز بوو ◊ بەمانا قەڵەو بوونی دوگیش دێ واتە: دومانای دژبەیەکی هەیە. ◊ **أحْنَقَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە بڵاو بۆوە. ◊ **أحْنَقَ فلاناً**: رقی فلانکەسی هەڵساند.

**اَلْحَنِقُ**: قەڵەو، ◊ **حَنَكت اَلأُمُّ الصَّبِيَّ حَنْكاً**: دایکەکە مەلاشووی منداڵەکەی هەڵدایەوە.

**حَنَكَ** فلان الدابَّةَ: فلانکەس ولاغەکەی لغاوکرد.

**حنك** التجارب الرجلَ حَنْكاً وحَنَكاً: ئەزموون و تەجرەبە ئەو پیاوەیان قاڵ کردو لەبۆتەیان دا.

**حَنَكَ** الشَّيْءَ: لەشتەکە حالی بوو ◊ شتەکەی پتەو کرد. ◊ **أحْنَكَتْهُ التجاربُ**: ئەزموون و تەجرەبە لەبۆتەیان داوە. ◊ **احْتَنَكَ فلاناً عن الأمر**: فلانکەسی لەکارەکە گێڕایەوە. ◊ **حَنَكَت السِنُّ والتجاربُ فلاناً**: تەمەن و ئەزموون فلانکەسی قاڵ کرد. ◊ **إحتَنَكَ الدابَّةَ**: پەتی لە لغاوی ولاخەکردو رایکێشا بە حەبلەکە. ◊ **احْتَنَكَ التجاربُ الجلَ**: بەمانا(حنكته)دێ. ◊ **احتَنَكَ الرجُلُ**: پیاوەکە بوو بەحەکیم و داناو پیاوی خاوەن ئەزموون. ◊ **احْتَنَكَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا. ◊ **احْتَنَكَ فلاناً**: بەسەر فلانکەسدا زاڵ بوو وەدوی خۆی خست ◊ **إسْتَحْنَكَ الشجرُ**: درەختەکە بەرەگ و ریشەوە هەڵکەندرا. ◊ **اَلْحانِكُ**: رەش. ◊ **الحِناكُ**: ئەو دەزووەی ئەوپەتەی دەمی ولاخی پێ دەبەسترێ.

**اَلْحَنَكُ**: مەلاشو ◊ دەندوکی باڵندە ◊ کۆمەڵە رێبوارێک لا بدەنە شارێک و ماوەیێ تێیدا بمێننەوە.

**اَلْحُنْكُ**: ئەزموون و تێگەیشتن لەکاروبار.

**الحُنُكُ**: پیاوی ئاقڵ و لێزان و خاوەن ئەزموون و قاڵبوو. ◊ **اَلْحَنِيكُ**: پیرەمێردی خاوەن ئەزموون ◊ ئادەمیزادی زۆر خۆر. ◊ **اَلْمِحْنَكُ**: بەمانا (اَلْحِناك) دێ. ◊ **حَنْكَلَ في المشي**: لەرۆیشتندا تەمبەڵی کردو هەنگاوی قورسی هاویشتن. ◊ **اَلْحُنْكُلُ**: کورتە باڵا ◊ ئادەمیزادی وشک و روگرژ ◊ پیاوی خوێڕی و بێ ئەمەك، ◊ **اَلْحَنْكَلَةُ من النساء**: ئافرەتی ناشیرینی قولەرەش ◊ ئافرەتی وشک تەبیات و مرو مۆچ.

**حَنَّ** حنيناً: ناڵاندی ◊ کورکاندی ◊ باڕاندی ◊ بۆڕاندی ◊ **حَنَّت الرياحُ**: رەشەباکە دەنگی لێ هات وەکوو دەنگی حوشتر دەرچوو. ◊ **حَنَّت القوسُ**: کەوانەکە دەنگی لێهات لەکاتی هاویشتندا. ◊ **حَنَّ** العودُ: عودو کەمانەکە بەهۆی پەنجە لێدانەوە دەنگی لێوەهات. ◊ **حَنَّ** الرجلُ: پیاوەکە هاواری کرد یا لەخۆشییا یا لەتاو ئازار.

**حَنَّ** اليه: ئارەزوی دیداری کرد.

**حَنَّ** عليه: بەزەیی پێدا هاتەوە. ◊ **أحَنَّ فلان القوسَ**: فلانکەس وای کرد کەوانەکە دەنگی لێبێ. ◊ **حَنَّنَ الشَّجرُ**: درەختەکە گوڵوکی دەرکرد. ◊ **تَحانَّ**

قوم: ئەو نەتەوە هەندێکیان ئارەزوی دیەدەنی یەکتر دەکەن. ٥ تَحَنَّنَ علیه: بەزەیی پێدا هاتەوە. ٥ اسْتَحَنَّ الی الشَّیْئ: حەزی لەو شتەکرد. ٥ استحنَّ الشوقُ فلاناً: سۆزو خۆشەویستی فلانکەسی خستە کەیف خۆشیو هەڵپەرکێوە. ٥ التَّحْنَانُ: شەوقو ئارەزۆی زۆر. ٥ الحانَّة: حوشتر ٥ اَلْحَنَّانُ: خاوەن مەحەمو بەزەیی ٥ صیفەتێکە لە سیفەتەکانی خودا ٥ کەسێک چاکە لەگەڵ کەسێک بکا کە ئەو روی لێ وەرگێرابێ ٥ تیر بەناو پەنجەکانتا هەڵیسورێنی دەنگی لێوەبێ ٥ رێگەی راست. ٥ اَلْحَنَّانَةُ: ئافرەتێک سۆزی هەڵسێ بۆ دیتنی منداڵەکەی یان یادی مێردە کۆنەکەی بکاتەوەو بۆی بکورکێنێ. ٥ اَلْحِنَّةُ: دڵنەرمی. ٥ اَلْحَنُونُ: ئەو بێوەژنەی لەبەر خاتری بەخێوکردنی منداڵە وردیلەکانی شودەکا بە پیاوێکی تر بۆ ئەوەی ژێواریان دابین بکا ٥ رەشەبایەک لورەی بێ وەکوو دەنگی حوشتر. ٥ اَلْحَنِینُ: حەزو ئارەزۆ.

**حَنَا** علیه حُنُواً: سۆزی بۆی هەبوو.

**حَنَا** الشَّیْئَ: شتەکەی دولا هێنایەوە.

**حَنَی** العود وغَیْرَهُ حَنیاً وحِنایةً: خواری کردەوە ٥ توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**حَنَی** ید الرجل: دەستی فلانکەسی چەماندەوە.

**حنی** القوسَ: کەوانەکەی دروست کرد. ٥ **أحنی علیه**: بەمانا (حنا) دێ. ٥ انْحَنَی: کۆمایەوە. ٥ **تَحَنَّیْ**: بەمانا (اِنْحَنی) هاتووە. ٥ **تَحَنَّیْ علی فلان**: سۆزو خۆشەویستی بۆ فلانکەس دەرخست. ٥ **الأحْنی**: پشت کور ٥ **الحاناةُ**: عەرەقخانە ٥ شوێنی عەرەق خواردنەوە (بار). ٥ (اَلْحَانی)یە ٥ عەرەق. ٥ **الحَانِيُّ**: خاو منی حانوت.

**الحِنْوُ**: هەرشتێک خواربێو سوچو گۆشەی تێدابێ. ٥ **اَلْحَنْواءُ من الغنم**: ئەو مەڕو بزنەیە ملی خوار بوبێتەوە ٥ هەروا بەحوشتری پشت کوڕ. ٥ **اَلْحَنِیَّةُ**: کەوان ٥ **الحَوَانی**: درێژترین پەراسوو. ٥ **اَلْمَحْنِیَةُ من الوادي**: لێژایی‌و چاڵایی دۆڵ. ٥ **اَلْمُنْحَنَی**: لێژایی دۆڵ یان نزمایی رێگە.

**حَابَ** حوباً: تاوانبار بوو. ٥ **أحْوَابَ اِحْوابا**: هەڵخلیسکا بۆ ناو زلکاوی تاوان. ٥ **حَوَّبَ فلان**: فلانکەس ماڵو سامانەکەی فەوتاو دوایی دەوڵەمەند بوو. ٥ **تَحَوَّبَ**: وازی لەتاوان هێنا ٥ دەستی کرد بەخوداپەرستی بۆ ئەوەی تاوانەکانی پێشوی بشواتەوە. ٥ **تحوَّبَ من القبیح**: شەرمی هات لەتاوانکردن. ٥ **تحوَّبَ من الشَّیْئ**: لەو شتە دڵی ئازاری پێگەیی‌و خەفەتبار بوو. ٥ **تحوَّبَ في دعائه**: لە پاڕانەوەکەیدا زۆر لالایەوە. ٥ **تحوَّبت الأم علی ولدها**: دایک سۆزی بۆ منداڵەکەی بوو.

**اَلْحَوْبُ**: وەحشەتو خەفەت.

**الحُوبُ**: تاوان ٥ بەهیلاکچوونو فەوتان. ٥ **اَلْحَوْبَاءُ**: نەفس. ٥ **اَلْحَوْبَةُ**: تاوانی ئەزیەتدانی باوکو دایک ٥ تاوان بەگشتی ٥ پێداویستی ٥ غەمو نارەحەتی. ٥ **الحُوبة**: تاوان ٥ خزم بەهۆی دایکەوە، ئافرەت یا پیاوی زەعیفو لاواز.

**حاتَ** الطائر علی الشَّیْئ: باڵندەکە بەدەوری فلان شتدا سوڕایەوە. ٥ **حَاوِتَةُ**: چاووڕاوی لێکردو فێڵی لێکرد. ٥ **الحَاِتتُ**: ئەو کەسەیە زۆر لۆمەکاربێ.

**اَلْحُوتُ**: ماسی بچوک بێ یان گەورە ٥ جۆرە گیانلەبەرێکی شیردەرییشە ٥ هەروا ناوی بورجێکە لە بورجەکانی ئاسمان. ٥ **اَلْحُوتَاءُ**:

ئەوەیە کەلەکەی ئەستور بوبن و گۆشتەکەیان داچۆڕابێ.

**حَوْتَكَ** الرجلُ: پیاوەکە ڕۆیشت بەڕۆیشتنی کورتە باڵا، لاسایی کورتەباڵای کردەوە.٥ **اَلْحَوْتَكُ**: ئادەمیزادی کورتە باڵاو کزو کۆڵەوار. ٥ **أحاثَهُ**: جولاندی و لێکی جیاکردەوە. ٥ **أحاثَ الخَیلُ الأرْضَ**: ئەسپەکان زەوییەکەیان کوتاو گڵەکەیان وردکرد. ٥ **أحاثَ فلانٌ الأرْضَ**: فلان گڵ و خۆڵی زەوییەکەی سەروناو کردو بەناوی دا گەڕا بزانێ چی تێدایە. ٥ **اسْتَحَاثَهُ**: ویستی دەری بێنێ ٥ بەناو گڵ و خۆڵەکەی دا گەڕا بزانێ شتەکەی لێی گوم بووە بیدۆزێتەوە. ٥ **استحاثَ فلانٌ الأرضَ**: فلانکەس گڵەکەی سەروناو کرد.

**حاثَ** باثَ: پەرت و بلاو.٥حَوْثَ: بەمانا (حَیْثُ) دێ.٥**اَلْحَوْثُ**: جەرگ و دەوروبەری، ریشەی جەرگ.٥حَوثَ بَوثَ: پەرت و بلاو. ٥ **اَلْحَوْثاءُ**: جەرگ و دەوروبەری. ٥ **اَلْحَوْثَكُ**: ئەو گیاندارەیە چ ئادەمی چ گیانلەبەری تر درێژییەکەی مام ناوەندی بێ.

**حَاجَ** حَوْجاً: پێویستی هەبوو ٥ هەژار بوو. ٥ **أحْوَجَ إحْواجاً**: هەژار کەوت. ٥ **أحْوَجَ فلاناً الی کذا**: وای لە فلان کرد موحتاج بێ. ٥ **اِحْتاجَ**: پێداویستی هەبوو ٥ **تَحَوَّجَ**: داوای پێداویستی کرد ٥ **الحائجُ**: ئاتاج و هەژار. ٥ **الحائِجَةُ**: مێینەی (الحائج)٥**الحَوْجُ**: پێداویستی ٥ بێوەیی و سەلامەتی. ٥ **الحَوْجاءُ**: پێداویستی ٥ **المُحَوْجَبُ**: بڕۆ پان و گەورە. ٥ **اَلْحَوْجَلَةُ**: گۆزەی بنك ئەستور، یان گۆزەی بچوکی دەم بلاو.

**حادَ** عنه حَوْداً: مەیلی کرد.٥حَاوَدَتْهُ الحُمّیٰ مُحاودةً: ئاو بەناو لەرزو تای بۆ دێتەوە ٥ **حاود في الأمر**: لەکارەکە بووەو تێی فکری.

**حاذَ** علیه حَوْذاً: پاراستی (حَاذَ الشَّيْءَ) شتەکەی پاراست ٥ بەسەریدا زاڵ بوو.٥حاذ الدوابَ: ئاژەڵەکەی بەتوندی لێ خوڕی. ٥ **احْوَذَ**: پەلەی کرد ٥ **احْوَذَ الدواب**: بەتوندی ئاژەڵەکەی ئاژووت. ٥ **أحْوَذَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کۆکردەوە، خستیە پەنایەك. ٥ **احوذ القصیدة**: چامە شیعرەکەی جوان و پتەو رێك خست. ٥ **استحوذ علی الشَّيْءَ**: بەسەر شتەکەدا بالا دەست بوو. ٥ **استحوذ علیه الشیطان**: شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو. ٥ **الأحوذی**: ئەو کەسەی قۆڵ بۆ کارکردن هەڵدەکا، ئیشەکە لەئەستۆی دەگرێ و بەجوانی ئەنجامی دەدا؛ یان خێرا ئەنجامی دەدا ٥ زاناو لێزان لەکاردا. ٥ **اَلْحَاذُ**: بەناو پشتیوان ٥ **الحِواذُ**: دووریی. ٥ **الحوذان**: ڕووەکێکە لەڕووەکە دوو فاقەکان، گوڵەکانی جوانن، زۆر جۆری هەیە ٥ **اَلْحُوذِيُّ**: دەرپەڕێنەر ٥ هەڵئەر بۆ ڕۆیشتن ٥ شۆفێری عەرەبانە. ٥ **اَلْحَوِيذُ**: بەمانا (الأحوذی) دێ.

**حارَ** حَوْراً وحُؤوراً: گەڕایەوە.٥حار الشَّيْءُ: شتەکە کەم بوو.٥حار بعد ماکار: کەمی کرد دوای ئەوەی زیاد بوو.٥حار الماءُ في الغدیر: ئاوەکە لە زەلکاوەکەدا هاتوو چۆی کرد.٥حار في أمره: لەکارەکەیدا سەری لێ شێوا.٥حار الثوب: پۆشاکەکەی شت و سپی کردەوە. ٥ **حَوِرَت العَیْنُ حَوَراً**: سپیایی چاوی زۆر سپی و ڕەشایییەکەی زۆر ڕەش ٥ **أحارَ الجوابَ**: وەڵامەکەی ڕەتکردەوە (دەنگەکەی دایەوە). ٥ **حاوره مُحاورةً وحواراً**: وەڵامی دایەوە ٥ گفتوگۆی لەگەڵ کرد. ٥ **حَوَّرَ الدَّقیقَ أو الثوبَ**: ئاردەکە یان کراسەکەی سپی کردەوە. ٥ **حَوَّرَ الأدیمَ**: چەرمەکەی بەڕەنگی سور ڕەنگ کرد. ٥ **حَوَّرَ القُرصَ**: شتە

بازنەییەکـەی هەڵخولانـد. ٥ حَـوِّر الدابَّـةَ: ئاژەڵەکەی بەداخی کەوانـەیی داخکـرد. ٥ حَوِّر الخُبْزةَ: نانەکـەی پـانکردەوەو ئامادەی کـرد بـۆ ئەوەی بیخاتە سەر ئاگرەکە بۆ ئەوەی ببرژێ. ٥ حَوَّر الشَّيْئَ: شتەکەی گێڕایەوە. ٥ حَوَّر الله فلاناً: خـودا فلانکەسـی گێڕایـەوە بـۆ حاڵـەتی دەسـتکورتیو بـێ هێـزیو کـەمو کـورِی. ٥ حَـوَّرَ فلان الكلامَ: فلانکەس قسەکەی گۆڕی. ٥ تَحاوروا: گفتوگۆیان کرد ٥ إِحْوَرَّ: بۆ موطاوعەی (حَوَّرَهُ) هاتووە ٥ یان سپیایی چاویو رەشاییەکەی زیاد لـە ئاساییە (چـاوگەورە). ٥ اسـتَحَارَهُ: بەقسەی هێنا ٥ دەمی پێکردەوە. ٥ الأحْوَرَيُّ: سپی نـەرم. ٥ الْحـائِرُ: سـەرلێ شـێواو ٥ لاوازو بێهێـز. ٥ الحائِرَةُ: بۆ مێینـەی (الحـائر) بـەکاردێ. ٥ الحُوارُ: بێچوی حوشتر لەو کاتەوە لەدایکی دەبێتەوە تـا لەشیر دەبڕێتەوە. ٥ الحِوارُ: گفتو گۆیەکە ئـەنجام دەدرێ لەنێوان دوکەس یان زیاتر لەبواری شانۆدا. ٥ الحَوَارِيُ: ئەوەی پۆشاك سپی دەکاتـەوە ٥ ئـەوەی پـاكو بـێ خـەوشو هەڵبـژێراوە ٥ الحواریـون: یارمەتیدەرانی حەزرەتی عیسا بوون.

الحُورُ: کەمیو فەوتان ٥ پەتاڵو پوچ.

الحَـوَرُ: سـپیاتی سـپێنەی چـاوو رەشـایەتی رەشێنەکەی ٥ سێیەم ئەستێرەی کلکی (بنـات النَّعْش)٥ دەکەوێتـە تەنیـشت (نـەعش) ٥ الحَوْراءُ مـن النـساء: ئـەو ئافرەتانـەی سـپی پێـستن مەبەست ئەوە نیە کە سپێنەی چاوی زۆر سپی بـێ. ٥ الحُورِیـة: کـچێکی ئەفـسانەییە خـەیاڵ دروسـتی کـردووە، لـە نـاو دەریـاو چـۆمو جەنگەڵاندا دەبیندرێ ٥ ئافرەتی جوانی زۆر ناسـكو قـۆز ٥ الحَـوِیرُ: دوژمنایـەتی ٥ وەڵام ٥ الْمُحَارُ: مەرجیع. ٥ المَحارَةُ: ئەو شوێنەی دەنـگ بداتـەوە ٥ صـەدەفو مـرواری. ٥ المحـارَةُ مـن الأذن: دیـوی نـاوەوەی گوێـچکە ٥ داخـی حوشـتر داخکـردن ٥ قروێلکـی شـان (حـەوزی شـان) ئـەو قوڵکـە ئێـسقانەی کـە سـەری شـانی تێـدا دێـوو دەچـێ ٥ حـەوزی ران ئـەو چاڵە ئێـسقانەی سـەر ئێسقانی رانی تێدایە ٥ ڕاڕەوی هەناسـە بـۆ نزیـك کە پو ٥ ئامێرێکە لەو ئامێرانـەی دیـوارو دەرگـاو پەنجەرەی پێ بۆیە دەکرێ ٥ ئامێرێکە بیناى پێ بۆیـاخ دەکـرێ. ٥ المِحْـوَرُ: دار یـان ئاسنێـکە بەکرەکـەی لەسـەر هەڵـدەخولێ ٥ تـیرۆك یـان کۆڵـەوەزی نانـەوا ٥ وتـوو ٥ لـەزانیاری ئەندازیاریـدا بریتییـە لـە هێڵێـکی راست کـە هـەردوك لای کورەکـە دەگرێتـەوە، ٥ المُحْـورةُ: وەڵام.

حَاز فلان: فلانکەس بەهێواشی رۆیی.

حاز الشَّيْئَ: ئەو شتەی بۆ خۆی هەڵگرت پێی بـڕا بۆ ئەو دەرچوو .

حَـاز الـدوابَ حَـوزاً: ئاژەڵـەکانی لەسـەرخۆ لێخـوڕی ٥ بردنـی بـۆ سـەر نـاو بـۆ نـاو خواردنـەوە. ٥ حَـوَّزَ الـدوابَ الى المـاء: بـەمانا (حازها) دێ. ٥ حَوَّزَ الأمْرَ: کارەکـەی توندو تۆڵ کرد. ٥ إحْتَازَهُ: شـتەکەی بۆخـۆی دانـاو بـەخۆی بڕا ٥ بەرئەو کەوت ٥ إنْحازَ: بـۆ مـوطاوعـەی (حَـزَهُ) هـاتووە ٥ هـەروا بـەمانا پـاڵی پێـوەدا لەگەڵی کۆ بووە ٥ انحازَ القومُ: ئەو هۆزە شـوێنی خۆیان واز لێهێنا بۆ کەسانی دیکە. ٥ انحاز علی الـشَّيْئَ: بەسـەر ئـەو شـتەدا کۆمایـەوە خـۆی بەسـەردادا. ٥ انحازَ عنه: لێـی لادا. ٥ تَحاوزوا في الحرب: هەریـەك لە لایەنـەکانی شەڕ لـەوێ تـر کەنارگیر بوو لێك دووركەوتنـەوە. ٥ تَحَوَّزَ: بـۆ موطاوعەی (حَوَّزه) هاتووە. ٥ تَحَوَّزَ الرَّجُلُ: ئـەو پیـاوە ویـستی هەڵـسێو بەنارەحـەتی راسـت بـووە ٥ تَحوَّزَ عنـه: لێـی تەکیـەوە ٥ اسْـتَحَازَهُ:

ـستیه لای خۆیو بۆ خۆی داناو كردی بەهی خۆی. ◊ الأحوَزُ: لێخوڕی لەسەرە خۆو هێدی. ◊ الأحْوَزِيُّ: ئەو كەسەی بەڕێكو پێكی كارەكانی بەڕێوە دەبا ◊ كاراما لەئیشو كاردا. ◊ الاحياز: پاڵدان بەشتێكەوە ◊ سیاسەتی وڵاتانی (عدم الأنحياز) لەسەردەمی تازەدا بریتییە لەوەی نە بەلای غەرب یان شەرقدا خۆیان ساغ بكەنەوە.

**الْحَوْزُ**: لەسەرە خۆیی ◊ كەم تاكورت ◊ مڵكایەتی.

**الحوزُ** من الأرضين: ئەو پارچە زەوییەی ئادەمیزاد بۆ خۆی قۆرغی بكاو سنورەكانی دیاری بكاو خاوەنیەتی بكا ◊ سروشت بەچاكو خراپیەوە. ◊ الحَـوْزاءُ: ناحیەو هەرێم ◊ حَـوْزَةُ الـسَّلام: سنووری ئاشتیو ناوچەكانی ◊ الْحـوزی: ئەو كەسەیە بەتەنیا دانیشێو كەس لەگەڵیا نەبێو تێكەڵاوی كەس نەكا ◊ یان كەسێكە كارو بار جوان بەڕێوە بەرێ. ◊ الحُوَيْزاء: ئەوەیە زەخیرەو بژێو لەهاوەڵەكەی پەنهان بكا. ◊ الحیازة: (حیازة الرجل) ئەوەی لەژێر دەستی پیاوا بێ لەزەویو ماڵو سامان. ◊ اَلْحَيِّزُ: هەموو كۆمەڵە شتێك كە پێكەوە بگونجێنو كۆببنەوە .

**حاس** الغارةُ: هەڵمەتو هێرشەكە بەربڵاو بوو.

**حاس** الرجلُ: پیاوەكە ئازاو بەجەرگ بوو نەترسا.

**حاس** الأمْر فلاناً: شتەكە كارەكە لەسەر فلانكەس كاریگەر بوو.

**حـاس** الـذئب الغَـنَمَ: گورگ كەوتە ناو مەڕو بزنەكانەوەو پەرتەوازەی كردن ◊ كارەساتێكی گەورەیان توش بوو. ◊ حاست الفتنة فلاناً: فیتنەو ئاشوب چووە ناو دڵی فلانەوەو تێكی دا.

**حَـوِسَ** حَوَساً: ئازابوو خۆگربوو، ◊ حاوَسَت المرأة الرجالَ: ئافرەتەكە تێكەڵاوی پیاوان بوو چووە ناویانەوە. ◊ تَحَوَّسَ في الكلام: خۆی ئامادەكرد بۆ قسەكردنو هێزو توانای دایە خۆی ◊ ڕاوەستاو تەمبەڵی نواند. ◊ استَحْوَسَ: خۆی خافڵاندو تەمبەڵی نواند.

**الأحْوَسِيّ**: بەردەوامو هەمیشەیی ◊ دەگوترێ: (غیث أحوسي) بارانێكی بەردەوامەو هەڵی ناپڕوكێنێ. ◊ حاسَتْهُمُ الخطوبُ الحُوَّسُ: ئەو بەڵاو كارەساتانە كە توشی گەلو نەتەوەیەك دەبێو بڕستیان لێ دەبڕێ ◊ پەخەی گرتن. ◊ الحُواسَةُ: خزمایەتیو خوێنگری ◊ هێرشو پەلامار ◊ دەسكەوتی شەڕ ◊ پێداویستی ◊ كۆمەڵێك لەخەڵكی جیا. ◊ الحُواسُ: ئەو كەسەی لەشەڕا بانگی ئەمو ئەو دەكاو دەڵێ: هۆی فلان هۆی فیسار كەس.

**حَاشَ** الدَوَابَّ حَوْشاً: ئاژەڵەكانی كۆكردنەوەو لێی خوڕین.

**حاشَ** القومُ الصَّيدَ: خەڵكەكە نێچیرەكانیان هێنانو بردیانن بۆ ئەوەی بیانگرن.

**حـاشَ** اللّـصُّ ونحـوه: دزەكەی گرتو نەیهێشت بەحەرام بكا. ◊ حَاوَشَهُ على الأمر: هەڵی نا بۆ كارەكە. ◊ حاوشَ الرجلُ البقَ أو المطرَ: پیاوەكە خۆی لە هەورە بروسكەكە یان بارانەكە كەنار گیركرد. ◊ حَـوَّشَ المـالَ ونحـوه: ماڵو سامانی كۆكردەوەو پەزمەندەی كرد. ◊ احْتَـوَشَ القـومُ الصَّيْدَ: خەڵكەكە نێچیرەكانیان هێنانو بردن بۆ ئەوەی بیانگرن. ◊ احْتَـوَشَ القـوم الـشَّيْءَ: خەڵكەكە شتەكەیان خستە ناو خۆیانەوەو دەوریاندا. ◊ إنـْحَاشَ عَنْـهُ ومِنْـهُ: لێی دوور كەوتەوە ◊ تَحاوشـوا الـشَّيْءَ بَيْـنَهُمْ: شتەكەیان خستە نێو خۆیانەوەو دەوریاندا. ◊ تَحَوَّشَ منه: شەرمی لێكرد ◊ (تحوَّش عنه): لێی دوور كەوتەوە. ◊ تَحَوَّشَت فلانَةُ من زوجها: فلان ئافرەت بێ مێرد بوو، بوو بە بێوەژن. ◊ الحـائش: كۆمەڵێك درەختی دار خورما یان درەختی

تـر. ٥ اَلْحُواشَـةُ: پێداویـستی ٥ هەرشتێـك شەرمی لێبكرێ ٥ تاوان بێ یان نا.

الْحَوْشُ: حەوشەی ماڵ.

الحُـوْشُ: حوشتری هـارو جـەموش. ٥ الْحُوشِـيُّ مـن الكلام: قسەو وشـەی غـەریبو کـەم بیـستراو. ٥ الحوشـيّ مـن الليـالي: شـەوی تاریـكو نوتـەك ٥ دەگوترێ: (رجـل حوشـيٌ): پیاوێـكە تێـكەڵاوی كـەس ناكـاو تەریكـە. ٥ اَلْمَحَـاشُ: ئامێرو كەرەستەی نـاو مـاڵ. ٥ الْحَوْشَبُ: زەنگی وڵاخ ئەو شوێنەی سمو ئێسقانی قاچی بەیەك دەگەن ٥ یان خودی ئێسقانی قاچی كە لەگەڵ سمـی دا بەیـەك دەگـەن ٥ بۆشـایی سـم ٥ كەروێشكی نێـر ٥ گۆلـك ٥ قـەدبارێكو ورگ بـچكۆلە ٥ یـان ورگ زلو كەلەكـە هەڵاوساو ٥ كۆمەڵێك ئادەمیزاد.

حَاصَ الثوبَ ونحوه: كراسەكەی دوریی.

حـاص بـين الـشيئين: نێوانی دوشتەكەی تەسك كردەوە.

حاصَ حولهُ: دەورەی داو پاراستی.

حَوِص الرجل يحوَصُ حوصاً: قولنچكی چاوی ئـەو پیـاوە چوك بـون هـەر دەڵێ قولینچكە چاوی دوراون ٥ هەروا بـەمانا ئـەوەش دێ ٥ چاوێـكی لەوی تری پچوكتر بێ ٥ حَاوَصَهُ: بەقولینچكی چاوی سەیری كرد تیلەی چاوی دایە. ٥ احْتَاصَ في الأمر: لەكارەكەدا ئیحتیاتی كـرد. ٥ الحِواصُ: دەرزیو سـوژن یـان شتێـكی تـری لـەو جـۆرە كەشتی پێ بدروێ.

الْحَوْصُ: هەڵوەشـاندنـەوە، روخانـدنـەوە،٥ الحِيَاصَةُ: قەیاسـەو بەرتەنگـەی (وڵاخ ئـەو حەبلـەی كورتـانو بـاری پـێ لـە وڵاخ قـایم دەكـرێ). ٥ حَوْصَلَ الطائر: باڵندەكە چكلدانەی پـڕ كـرد لـە خۆراك. ٥ حَوْصَلَ الانسان وغيره: ئادەمیزاد خوار وركی زل بـوو ٥ اَلحَوْصَـلُ للطـيرِ: هەڵاوسـانی چـیكلدانەیەتی خـواردنی تێـدا كـۆ دەبێتـەوە پێش ئەوەی خواردنەكە بچێتە مەعیدەیەوە. ٥ حَوْصَـلَ الـدار: گەنجینـەی خـانوو. ٥ حَوْصَـلُ الحوض: بنكی حەوز كـە ئـاوی تێدا راوەستێ. ٥ الحَوْصَلُ من الشاة: ئەو ئاژەڵو حەیوانەیە وركی لەژور ناوكییەوە زل بـێ ٥ الحَوْصَلَةُ: بـۆ باڵنـدە بـەمانا (الحَوْصَـل) دێ ٥ بـۆ ئـادەمیزاد لـەخوار ناوكییـەوە گـەدەی زل بنوێنـێ ٥ صـندوقە پچكۆلەیەكە پارەو شتی وای تێدا هەڵدەگیرێ.

حَاضَ الماءَ حَوْضاً: ئاوەكەی كۆكردەوەو دەورەی دا.

حَـوَّضَ: حـەوزی دروست كـرد ٥ احتـاضَ: حـەوزی دروست كرد. ٥ استحوض فلان: بـەمانا (احتـاض) دێ ٥ (استحوضَ الماءُ) ئاوەكە كۆ بۆوە.

اَلْحَوْضُ: شوێنی كۆبونەوەی ئـاو ٥ (الحَوْضُ من الأذن): كركراگـەی گـوێ ٥ پارچـەیەك لـەزەوی سنوردار ٥ زرعاتو باخی پەرژینكراو.

حَـوْض البحـر: ئـەو وڵاتو شارانەی دەكەونـە سـەر لێواری دەریا.

حَوْض النهـر: ئـەو زەویو زارەی بـەناوی روبارەكە ئـاو دەدرێو بـەناویا تێپـەڕ دەبـێ ٥ اَلْمُحَـوَّضُ: ئەستێرۆكە بەدەوری بنكی دارخورماو درەختی تـردا دەكـرێو ئـاوی تێـدەكرێ بـۆ ئـەوەی درەختەكە تێر ئاو ببێ.

حـاط القـومُ بالبلـد حَياطـةً: خەڵـكە دەورەی شارەكەیان دا.

حاط الصَّبيُّ: منداڵەكە بەتی چاوەزاری لە پشتی بەست.

حـاط الـشَّيْءَ: شتەكەی پارێزگاری كـردو بـەڵێنی داچی لە بەرژەوەندی شتەكەدابێ بیكاو زیانی لێ دوور بخاتـەوە. ٥ أحَاطَ الحائِطَ: دیـواری دانـا، دیواری رابەست. ٥ أحاط القومُ بالبلد: خەڵكەكە

دەورەی شارەکەیاندا. ٥ أحاط بالأمر: لەھەمموو لایەکــەوە گرنگــی بەکارەکــە داو کــونترۆڵی کرد ٥ أحَاطَ الشَّيْئَ: دەورەی شتەکەیدا ٥ أحِيطَ بفلان: فەوتانو تێیدا چوونی فلانکەس نزیك بوو.

احِيطَ بالشر: تێداچوو فەوتا ٥ حاوَطَهُ: گفتوگۆی لەگەڵ کرد لەسەر کارێك بۆ ئەوەی رازی بکا. ٥ حَوَّطَ حائطا: دیواری رابەست ٥ (حَوَّط كرمَهُ) پەرژینی بۆ درەختی مێوەکەی کرد. ٥ حَوَّط حول الشَّيْئَ: شتەکەی بەچوار دەوری شتەکەدا کۆمەڵ کردو بۆی کردە شورا. ٥ حَوَّطَ الشَّيْئَ: شتەکەی چاودێری کردو پەیمانی دا پارێزگاری بکاو چی لەبەرژەوەندی ئەودایە ئەنجامی بدا. ٥ إحْتَـاطَ: لــە کاروبــاری خــۆی دا زۆر وردبینــیو لێــکۆڵینەوەی ئەنجامــدا ٥ تَحَوَّطَــهُ: پارێزگــاری شــتەکەی کــرد ٥ اَلتَّحْوِيطَــةُ: دەزوی دورەنــگو بــادراو (رەنگــی ســورو رەش) ٥ مــیرووی تێــدەکرێو بــۆ چــاوەزار لــە پــشت دەبەسترێ ٥ هەروا بەمانا نوشتەو جادوش دێ.

٥ الحائِطُ: دیوار ٥ شورای باخ، ٥ الحُوَاطَةُ: ژورێــك بۆ هەڵگرتنو پاراستنی گەنمو جۆو دانەوێڵە.

الحَــوْطُ: دەزوێــکی رەنگــاو رەنگــە (ســورو رەش) مــیروی شــینی پــێ دەهۆندرێتــەوە هەرشــکڵی مانگی یەکشەوەی لەزیو دارێــژراوی تێدەکرێو لــە پــشت دەبەســترێ بــۆ دەفعــی چــاوەزار. ٥ اَلحَوْطَةُ: بەمانا ئیحتیات دێ. ٥ اَلحوطَةُ: پارییەکە پاریکــەرەکان تێیــدا بــەدەوری یــەکتردا دەخولێنــەوە. ٥ اَلحُــوَّاطُ: راگــر ٥ اَلحَيْطَــةُ: ئیحتیات ٥ سۆزو بەزەیی ٥ الْحَيِّطُ: دەگوترێ: (رجــل حَــيِّطٌ) پیاوێــکە زۆر چــاودێری مــاڵو منــداڵی خــۆی دەکــا. ٥ اَلمَحَـاطُ: ئـەو شـوێنەی دەبێتە دەوروبەری ماڵو سامان، واتە: پەرژین. ٥ اَلْمُحِيطُ: دەریا لووش.

حَافَ فلان الشَّيْئَ حَوْفـاً: فلانکەس لەسەر لێواری شــتەکە بــوو. ٥ حَوَّفَــهُ: خــستیە ســەر لێــواری شتەکە.

حَـافَ البَـاتُ المكـان: روەکی لەدەوری شوێنەکە روانــد. ٥ تَحَــوَّفَ الــشَّيْئَ: قــەراغی شــتەکەی گرت ٥ یان لە قەراغەوە گرتی.

اَلحَافَةُ: لایەنو کەنار.

اَلْحَوْفُ: لایەنو قەراغ ٥ پۆشاکێــك منــداڵ لەبــەری دەکا بێ قۆڵ وەکوو سوخمە.

حَــوْفَزَ الــصَّبيَّ: منداڵەکــەی خــستە ســەر پەنجــەی قاچیو بەقاچی بەرزی کردەوە.

حَاقَ البَيْـتَ ونحـوه حَوْقـاً: ماڵەکەی ماڵی. ٥ حَوَّق عليــه: قــسەکانی لێ خــوارو خــێچو تێــکەڵو پێــکەڵ کردن. ٥ حَوَّق راسَـهُ: ناوەڕاستی سـەری تاشیو ئەوی تری هێشتەوە. ٥ احتـاق مالــه مــن ورائــه: ماڵەکــەی زەوت کــرد. ٥ الْحَرَاقَــةُ: ماڵماڵین ٥ جادە ماڵین.

اَلحَوْقُ: کۆمەڵی زۆرو قەرەباڵغی.

اَلحُوقُ: چوار چێوەی شت کە بەکەوانەیی دەوری شت دەدەن. ٥ اَلمِحْوَقَةُ: گەسك.

حَوْقَلَ حَوْقلةً وحِيقالاً: هەردوو دەستی خۆی خستنە سەر کەلەکــەی، ســەر ســێ بەنــدەی ٥ بــەخێرایی رۆیــی خەریکبوو رۆیشتنەکەی بگاتە راکردن ٥ ماندوبوو.

حَوْقَلَ فلان: وتی: (لاحول ولا قوة الا بالله).

حَوْقَلَ الشَّيْئَ أو فلاناً: پاڵی پێوەنا ٥ هەڵی نا.

اَلحَوْقَلُ: ئادەمیزادی بەتەمەنی ماندو. ٥ اَلحَوْقَلَةُ: دیزەو گۆزەی مل درێژ کە ئاو فرۆش بەکاری دێنێ.

**حاك** الشَّيْءُ في صدره أو قلبه: شتەکە لە مێشکی دا یان لە دڵی دا چەسپاو جێگیربوو یان بەمانا دەنەدەنەو خوراندن دێ.

**حاك** الثوبَ حياكةً: قوماشەکەی چنی.

**حاك** المطرُ الروضَ: بارانەکە گەشەی بەگوڵو رەوەکی باغەکەدا ٥ تحوَّك بالثوب: پۆشاکەکەی لەسێ بەندەیەوە هێنا بۆ پێشی ئەژنۆیو لەسەر سێچکانی دانیشت، واتە خۆی کەمەندکێش کرد.

**اَلحوكُ**: نموونەی وێنە ٥ دەگوترێ: (هذا على حوك ذاك) ئەوە لەسەر شێوەی ئەومیە. ٥ اَلْحَوَكَةُ: دەگوترێ: (هم ناس ليس عليهم حوكة هؤلاء القوم) ئەوانە کەسانێکن لەو هۆزو خێڵە ناچن. ٥ الحياكة: جۆلایی. ٥ اَلْمَحَوكَةُ: شەرو هەرا.

**حال** الشَّيْءُ حولاً: ساڵێك بەسەر ئەوشتەدا تێپەڕی.

**حال** الحولُ: ساڵەکە تەواو بوو.

**حال** الشَّيْءُ: شتەکە گۆڕا .

**حال** في ظهر دابته: بازی داو لەسەر پشتی وڵاغەکەی وەستا.

**حال** عن العهد: لە پەیمانی خۆی پەشیمان بۆوە.

**حال** الشيء بين الشيئين حولاً وحيلولةً: ناوانی کردن ٥ بوو بە پەردەو حائیل لەنێوان ئەو دو شتەدا. ٥ حالت النَّخْلَةُ حُئُولاً: درەختی خورماکە ساڵێك بەری گرتو ساڵێك بەری نەگرت. ٥ حَالَتِ الناقةُ: حوشترە مێینەکە کەڵ درا بەڵام ئاوس نەبوو. ٥ حَولَت عينه أو طرفه: چاوی خێل بوو، چاوەکەی توشی فیچی بوو. ٥ أحْوَلَ: ساڵێك بەسەری دا تێپەڕی ٥ دەگوترێ: (أحْوَلَ الصَّبيُّ): منداڵەکە ساڵێکی تەواو کرد. ٥ أحْوَلَت الدارُ: خانووەکە رۆژگاری زۆری بەسەردا تێپەڕیو گۆڕانکاری تێکەوت. ٥ أحْوَلَ بالمكان: ساڵێك لەو شوێنە مایەوە. ٥ أحْوَلَت المرأة أو الناقةُ: ئافرەتەکە لەدوا کچ کوڕی بوو ٥ یان حوشترەکە دوای بێچوی مێینە بێچوی نێری بوو. ٥ أحْوَلَ عَيْنَهُ ٥ چاوی خێلکرد. ٥ أحَالَ: ساڵێکی تەواوی بەسەردا تێپەڕی. ٥ أحال الدارُ: خانووەکە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتو ساڵانێکی زۆری بەسەردا تێپەڕی ٥ دانیشتوانەکەی چەند ساڵو عەیامێکە لێی دوور کەوتوونەوە. ٥ أحَالَ الشَّيْءُ الرجلُ: شتەکە یان پیاوەکە لەحاڵێکەوە چووە سەر حاڵێکی تر. ٥ أحال بالمكان: ساڵێك لەو شوێنە مایەوە. ٥ أحال الرجلُ: ئەو پیاوە حوشترەکانی ئاوس نابنو نەزۆکن ٥ قسەکانی دژ بەیەکنو هیچی بەسەر هیچەوە نیە.

**احالَ عليه بالكلام**: بەقسە روی تێ کردوو دەستی کرد بە ئاخاوتن لەگەڵیدا ٥ أحَالَ في ظهر دابته وعليه: بازی دایە سەرپشتی وڵاغەکەیو جێگیر بوو. ٥ أحالَ الغريمَ: خاوەن قەرزەکەی رەوانەی سەرپەکێکی تر کرد. ٥ أحَالَ الشَّيْءَ: شتەکەی گواستەوە. ٥ احال العمل الى فلان: کارەکەی بەفڵان سپارد. ٥ أحال القاضي القضية الى محكمة الجنايات: قازی روداوو کێشەکەی رەوانەی دادگای تاوانەکان کرد. ٥ حَوَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی گۆڕی یان گواستیەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ حَوَّلَ فلان الشَّيْءَ الى غيره: فڵانکەس شتەکەی نارد بۆ لای یەکێکی تر. ٥ حَوَّلَ الأرْضَ: زەوییەکەی ساڵە ناساڵێك کێڵا بۆ ئەوەی خاکەکەی بەهێزبێ. ٥ حَوَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی لە حاڵێکەوە گۆڕی بۆ حاڵێکی تر. ٥ احتولَهُ القومُ: خەڵکەکە فڵانیان خستە ناو خۆیانەوە. ٥ احتال الشَّيْءُ: ساڵێك بەسەر ئەو شتەدا رۆیی. ٥ احتال فلان: فڵانکەس ویستی بەفێڵو تەڵەکەبازی فڵان

شتی دەست بکەوێ. ◊ **اِحْتَالَ الأرْضُ**: زەوییەکە بارانی لێ نەباری.

**احتال علیه بالدین**: قەرزەکەی حەواڵەی ئەستۆی ئەو کرد. ◊ **تَحَوَّلَ**: لە شوێنێکەوە گواستییەوە بۆ شوێنێکی تر ◊ یان لەحاڵو وەزعێکەوە کەوتە حاڵو وەزعێکی ترەوە. ◊ **تَحَوَّلَ عن الشَّیْئِ**: لەو شتە وازی هێنا چووە سەرکارێکی تر. ◊ **استحال الکلامَ**: کەلامەکەی لەماناى خۆی لاداو مانایەکی تری لێ هەڵهێنجا. ◊ **استحال الشَّیْئُ**: شتەکە حەواڵەکرا. ◊ **الإحتِیال**: هەڵخەڵەتاندن جەریمەیەکی یاسایە ◊ بریتییە لەوەی کەسێك بیەوێ بەناڕەوا ماڵی کەسێکی تر بخوا. ◊ **التحاویل**: ئافرەتێکە ساڵە ناساڵێك منداڵی ببێ ◊ هەروا بەزەوییەك دەگوترێ ساڵە ناساڵێك بکێڵدرێو تۆو بکرێ. ◊ **الحائل**: ئەو شتەی گۆڕان پەیدا دەکا ◊ **الحالُ**: ئەوکاتەی کەتێیدای. ◊ **حال الدهر**: گۆڕانکاری زەمانە ◊ **حال الانسان**: هەموو کارو بارێکی تایبەتی ئادەمیزاد چ مادی چ مەعنەوی. ◊ **الحال فی الطبیعة**: چۆنیەتێکی زوو بەسەر چووە ◊ **الحال فی النحو**: حاڵ لەمزاراوەی نەحوییاندا بریتییە لەزەمانی هەنووکەیی‌و کاتی قسەکردنەکە ◊ **الحَوَالُ**: دەوروبەری شت، ◊ **حَوَالُ الدهر**: گۆڕانکاری رۆژگارو بەڵاو کارەساتی. ◊ **اَلحَوَلَةُ**: ئەوەیە خاوەنی قەرز لەقەرزدارێکەوە بگوێزێتەوە بۆ سەر قەرزدارێکی تر ◊ گواستنەوەی ئاو لە چۆمێکەوە بۆ روبارێکیتر ◊ شایەتیدان ◊ بەرعۆدەبوون ◊ چەکێکە یان کومپیالەیەکە پارەی پێ دەگوێزرێتەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. ◊ **اَلحَوالیّ وَالحُوَالی من الرجال**: ئەوکەسەیە زۆر فێڵبازو فوڵبڕبێ.

**اَلحَوَلُ**: جەو جوڵو هاتو چۆ ◊ ساڵ.

**اَلحُوَلُ**: لەمپەرو پەردەی نێوان دوشت ◊ پیاوی فێڵبازو فوڵبڕ.

**اَلحـوَلُ**: زیرەکـی‌و لێهاتوویی‌و کارامایی لەئەنجامدانی کاردا ◊ ئەو کەندڕو جۆگە هەڵکەندراوەیە کە بەڕیز ئەمامە خورمای تێدا دەنێژرێ ◊ دەگوترێ: (هذا من حِوَل الدهر) ئەمە لەکارەسەیرو عەجایەبەکانی رۆژگارە.

**اَلحُوَلُ**: پەردەو لەمپەر لەنێوان دوشتدا ◊ خێڵی‌و قیچی لە ئاراستەکردنی نیگای دوو چاودا. ◊ **اَلحِوَلاءُ**: ئەو پەردەی بێچوە حوشتر لەناو سکی دایکی دا لەناوی دایە ◊ وەکوو مەشیمە بۆ زاروك لەسکی ئافرەتدا ◊ ئەو ئاوەیە کە لەپێش سەردەرهاتنی زارۆك لەسکی دایکی دەرژێتەدەر. ◊ **اَلحُـوَلاءُ**: (حُوَلاء الدهر) سەیرو سەمەرەی رۆژگار. ◊ **الحُوَلَةُ من الرجال**: ئەو پیاوەیە زۆر کارامابێ لە فێڵبازی‌و فوڵبڕی دا ◊ **اَلحَـوَلِیُّ**: هەرشتێك ساڵێکی بەسەردا تێپەڕێ گیانلەبەربێ یان روەك بێ، ◊ **الحُوَّالُ**: قەناتێکی بچکۆلەیە ئاوی لێ دەگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر. ◊ **اَلحُوَّلُ**: ئەو پیاوەی خێرا دەگۆڕێو هەر رۆژەی لەسەر هەوایەکە ◊ پیاوی فێڵبازی فوڵبڕ. ◊ **اَلحِیالُ**: پەتێکە سەرێکی لەپەتی بەرسنگی حوشتر دەبەسترێو سەرەکەی تری بەپالوەکەیەوە قایم دەکرێ ◊ پێشی شت ◊ **اَلحَیّالُ**: فێڵبازو سیاسەتمەدار. ◊ **اَلحیّلُ**: ئەو کەسەی حەواڵەکەی بۆسەر دەنێردرێ ◊ ئەوکەسەی حەواڵەکەی بۆ دەکرێ ◊ بەهەردووکیان ◊ **اَلمُحَالُ**: ئەوشتەی نەگونجێ ببێ ◊ **المَحَالَةُ**: فێڵو چاوبەست لێ کردن ◊ شتێك لەشێوەی ئاعوور ئاوی پێ هەڵدەهێنجندرێ. ◊ **المِحْوَالُ من الرجال**: ئەو

کەسەیە لەقسەکردندا پشت بەقسەی پێش خۆیەوە ببەستێ‌و قسەی خەڵك بجوێتەوە. ٥ اَلْحُوَلُ: نامێرێکە بەرزو نزمی کارەبای پێ کۆنترۆڵ دەکرێ. ٥ اَلْمُحِيلُ: ئەو کەسەی منداڵی نابێ (نەزۆك). ٥ المستحيلُ: شتی بەتاڵ‌و پوچ ٥ شتێك هەبوونی یان پەیدابوونی محاڵ بێ.

**حام** حول الشَّئَ: بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوەو دەوریدا ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (من حام حول الحمى يوشك أن يقع فيه) کەسێك لەتاوان نزیك ببێتەوە لەوانەیە تێی بکەوێ.

**حام** الشَّئَ: هەوڵی بۆ ئەو شتەداو ویستی بەدەستی بێنێ.

**حام** على قرابته: سۆزی بۆ خزمەکانی نواندو یارمەتی دان.

**حام** الحيوانُ: گیانلەبەرەکە تینووی بوو، (ك: حوائم، حُوَّم). ٥ حَوَّمَ في الأمر: زۆر لەکارەکە ورد بووەو زۆری تێ روانی.

**اَلْحَوْمُ**: جەڵەبە حوشتری فەرەباڵغ.

**اَلْحُوْمُ**: شەرابی کۆن. ٥ اَلْحَوْمَةُ من البحر والماء والرَّمْلِ: زۆرینەو بەشی هەرە زۆری ٥ لەشەڕو جەنگا بەشوێنی ترسناکی ناو شەڕەکە دەگوترێ. ٥ الحَوْمَاتَة: زەوی رەقی تەخت ٥ الحَوْمَـلُ: لەهەموو شتێکدا بەسەرەتاکەی دەگوترێ ٥ لافاوێك ئاوەکەی قوڕاو نەبێ ٥ هەوری رەشی باراناوی ٥ تَحَوَّنَ: زەلیل بوو هیلاك بوو. ٥ الحانَةُ: دوکانی عەرەق فرۆشتن.

**حَوى** الشَّئَ حوايةً: بەسەر شتەکەدا زاڵ بوو کردییە ملکی خۆ.

**حَوِيَ** الشَّئُ حوى وحُوَّةً: ئەوشتە سەوزی تێکەڵ رەشاییەکەی بوو ٥ یان رەشی تێکەڵی سورییەکەی بوو. ٥ حَوِيتِ شفة الرجل: لێوی پیاوەکە لە سوری دا مەیلەو رەش بوون.

**حَوِيَ** النباتُ: گژو گیاکە لەسەوزیدا خۆی بەرەش نواند ٥ حَوِّيَ الشَّئَ: شتەکەی وێك هاتەوە ٥ حَوِّيَ الشَّئَ: شتەکەی وەرگرت. ٥ احتوى الشَّئَ وعليه: لەخۆی گرت جێی کردەوە. ٥ تَحَوِّيَ: خۆی کۆکردەوەو پاپۆکەی بەست ٥ الحاوِي: ئەو کەسەی مار بەخێو دەکاو پشی پشییان دەکا ٥ پیاوێك کاری سەر سوڕهێنەر ئەنجام بدا. ٥ الحاوِياء: ریخۆڵە ٥ ناوسك. ٥ اَلْحِواءُ: ئەو شوێنەی شتی تێ دەکرێ وەکوو گەنجینە ٥ کادێن ٥ هۆبەو مەنزڵی رشماڵ نشین.

**اَلْحُـوُّ**: مێروە سورە ٥ مێروی سلێمان (مێروە سلێمانە). ٥ حَوّاءُ: دایە حەوا. ٥ اَلْحُوَّةُ: رەنگێکە لەرەنگی ژەنگی ئاسن دەکا. ٥ حُوَّةُ الوادی: ئەمبەرو ئەو بەری شیو. ٥ اَلْحَوِيُّ: خڕی‌و کەوانەیی ٥ بۆ هەرشتێك بێ ٥ حەوزی بچوکی ناو بۆ حوشتر. ٥ اَلْحَوِيَّةُ: پۆشاکێکە ناواخنی هەیە دەکرێتە سەرپشتی حوشتر ئافرەت لەسەرییەوە سوار دەبێ ٥ پەرۆیەکە لەسەر سەر دادەنرێت کاتێ قاپێك یان شتێکی تر دەخەیتە سەر سەرت ٥ زەوی رەق‌و روتەن کە بە بەرد یان بەخشتی کاڵ‌و قوڕ شورای بۆ دەکرێ. ٥ حاويةُ البطن: ریخۆڵەو جەرگو سی. ٥ اَلْحَيَّةُ: مار ٥ ئەمیش چەند جۆرێکی هەیە. ٥ المحتوى: هۆبەو رەشماڵ نشین کە لەسەر ئاوێك کۆدەبنەوە.

**حَيْثُ**: زەرفی مەکانەو ئیضافەدەکرێ بۆلای رستە.
٥ **اَلْمَحْوَاةُ**: (**أرضٌ مَحواةٌ**) زەوی ماراوی کە زۆری مار لێبن.

**حَاجَ** حَيْجاً: هەژار کەوت.

**اَلْحَاجُ**: رووەکێکی چقلاوییە سەوزییەکەی زۆر درێژە دەکێشێ و رەگەکانی زۆر بەزەویدا دەڕۆنە خوار ٥ **حَيْجَمَ الرجل**: پیاوەکە بەسرتە قسەی کردو لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی بوو.

**حادَ** عن الشَّيْءِ حَيْداً وحَيَداناً: لەشتەکەی لادا ٥ **أحاده عن الشَّيْءِ**: لەو شتەی لاداو دوری خستەوە. ٥ **حايَدَهُ مُحايدةً وحِياداً**: وازی لێ هێناو روی لێ وەرگێڕا ٥ وازی لە دژایەتی ئەو هێنا. ٥ **الحِيادُ**: ئەوەیە بێ لایەن بێ پشتگیری هیچ لایەکی کێشەکە نەکەی. ٥ **الحِياد الا يجابي**: لەسیاسەتی نێو دەوڵەتی دا ئەوەیە وڵاتێک هاوکاری یەکێک لەو دەوڵەتە دژە بەیەکەکان نەکاو لەگەڵ باقی دەوڵەتەکانی تردا هاوکارو هاوسۆز بێ بۆ بەرقەرار بوونی ئاشتەوایی گشتی.

**اَلْحَيْدُ**: ئەوەی لە ئەملاو ئەولای شت هەڵتۆقێتەوە.

**اَلْحَيَدُ**: ناخۆ بوونی زارۆکە لەسکی دایکی داو بەئاسانی نەیەتە دەرەوە. ٥ **الحَيَدى**: رۆیشتنی بەتەکەبوورو لارو لەنجە ٥ **الحَيَدانُ**: ئەو بەردو زەیخەیە لەکاتی رۆیشتندا لەژێر پێی وڵاخ دەردەپەڕێ. ٥ **الحَيْدَةُ**: روانینی بەرق و کینەوە ٥ **اَلْحَيِّدُ**: گوێدرێژی زۆر سرک و تەڕ دەماخ. ٥ **اَلْمَحِيدُ**: ناچار.

**حَارَ** بَصَرُهُ حَيْراً وحَيرةً وحَيراناً: تەماشای شتەکەی کردو چاوی نەیتوانی لێی بڕوانێ ٥ چاوی لێی هەڵبەزییەوە.

**حار فلان**: فلانکەس ڕێی لێ گوم بوو ٥ (**حار في الأمر**) لەو کارەدا سەری لێ تێکچوو.٥ **حار الماءُ**: ئاوەکە کۆبوەو هەڵخولا ٥ **حَيَّرَهُ**: خستیە سەر لێ شێوانەوە. ٥ **تَحَيَّرَ**: کەوتە سەر لێ شێواوییەوە. ٥ **تَحَيَّرَ السحابُ**: هەورەکە لەشوێنی خۆی وەستاو بارانی باراند. ٥ **تَحَيَّرَ الماءُ**: بەمانا (حار الماء) دێ. ٥ **تَحَيَّرَ المكان والاناء بالماء**: شوێنەکە پڕ بوو لەئاو. ٥ **استحار الرَّجُلُ أو الماء في المكان**: بەمانا (حارَ) دێ. ٥ **استحير الشرابُ**: بەخۆشی شەرابەکەی بۆ قوت چوو. ٥ **الحائِرُ**: کەسێک سەرگەردان بێ ٥ شوێنێک ئەملاو ئەولای بەرزبێ و ئاوی تێدا بووەستێ ٥ باغ و بێستان. ٥ **الحارَةُ**: بەرو بەرماڵ ٥ ئاوچەیەک نزیک بێ لەماڵەوە. ٥ **الحاري**: دەگوترێ: (لا آتيه حاري الدهر) قەت نایەمە لای. ٥ **الحِيرَةُ**: سەرگەردانی و ڕاڕایی ٥ زەوی سەوزو پڕ دانەوێڵە ٥ **اَلْحَيَّرُ**: هەور لەگەڵ باران پەیدا ببێ و نەرمونێتەوە. ٥ **اَلْمَحَارَةُ**: دیوی ناوەوەی مەلاشوو. ٥ **اَلْمُسْتَحِيُّ**: ڕێگەیەک لەسارایەک دابێ و نیشانەی دیارنەبێ و سەری لێ دەرنەکرێ. ٥ **اَلْمُسْتَحِيرَةُ**: پیلۆی چاو کە گۆشت و چەوری زۆربێ. ٥ **تَحَيَّزَ الرجلُ**: پیاوەکە ویستی هەڵسێ و زۆر بەزەحمەت بوو هەڵسانەکەی. ٥ **تَحَيَّزَ اليهم**: پاڵی بەوانەوە داو چووە سەر بیرو بڕوای ئەوان.

**حَاسَ** الحَيْسَ حيساً: تریتی خورماو کەشکی دروست کرد.٥ **حاس** الشَّيْءَ بغيره: ئەوشتەی تێکەڵاوی شتی ترکرد.

**حَيَّسَ الحَيْسَ**: تریتی خورماو کەشکی دروست کرد.

**الحَيْسُ**: خورماو کەشک و رۆن تێکەڵ بەیەک دەکرێن و دەکوترێن و دەشێلدرێن دەکرێتە قاوت.

**حاشَ** حَيْشاً: ترسا ◊ وەكوو ترسنۆك رۆیشت.

**حاش** الوادي: دۆڵەكە درێژ بووە.

**حاش** فلاناً: فلانكەسی ترساند. ◊ **تَحَيَّشَتْ نَفْسُهُ**: نەفسی لێی تۆراو پێش چاوی كەوت.

**اَلْحَيْشُ**: كۆمەڵ. ◊ **اَلْحَيْشانُ**: پیاوی زۆر ترسنۆك.

**حاصَ** عنه: لای داو لەرێگە دوركەوتەوە.

**حاصَ** القومُ: خەڵكەكە كەوتنە هاتو چۆ دەگەڕان ڕێگای هەڵاتن بدۆزنەوە. ◊ **حَايَصَهُ**: چاوو راوی لێكرد ویستی بەسەریدا زاڵ بوو. ◊ **حايَصَ الموتَ**: سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆ لەمردن رزگار بكا. ◊ **إحاصَ**: لایداو دوور كەوتەوە.

**حاص** باص: تەنگانەو نارەحەتی.

**حَيْصَ** بَيْصَ: تەنگانەو نارەحەتی ◊ **الحُيُوصُ**: چەمووش ◊ **اَلْمُحِيصُ**: چارەو پەنا.

**حاضت المرأةُ**: ئافرەتەكە بێ نوێژ بوو كەوتە عادەتی مانگانەیەوە ◊ **حاضت شجرةُ السَّمُر**: شتێك لە درەختی سەمورە هاتە خوارێ وەكوو خوێن سورە. ◊ **حاض السيلُ**: لافاوەكە هەڵسا. ◊ **حَيَّضَ الماءَ**: ئاوەكەی بەرداو وەكوو لافاوی لێكرد. ◊ **تَحيَّضت المرأةُ**: بەمانا (حاضت) دێ ◊ رۆژانی عادەی مانگانە ئافرەتەكە وازی لە ئەنجامدانی نوێژو رۆژو هێناو چاوەڕوانی كۆتایی هاتنی خوێنی حەیزەكەی كرد ◊ خۆی بە لەحەیزكەوتوو لەقەڵەمدا ◊ هەڵسو كەوتی وای كرد كە كەوتۆتەوە عادەی مانگانەوە. ◊ **اُسْتُحِيضَتْ المرأة**: ئافرەتەكە دوای تێپەڕبوونی ماوەی عادەتی مانگانەی خوێنەكەی نەوەستاو هەر بەردەوام بوو. ◊ **الحِيَاضُ**: خوێنی حەیز.

**الحَيْضُ**: ئەو خوێنەی مانگانە چەند رۆژێكی دیاریكراو بەشێوەیەكی سروشتی لەرەحەمی ئافرەتەوە دێتە خوار. ◊ **اَلْحِيضَةُ**: ئەو پاچە پەڕۆیەیە ئافرەت بەخۆیەوە هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی خوێنەكە لە جەستەیەوە نەچێ‌و بڵاو نەبێتەوە.

**حافَ** عليه حَيْفاً: ستەمی كرد.

**حافَ** الأبُ: باوكەكە خۆشەویستی‌و رێزی بۆ منداڵێك لە منداڵەكانی لەوانی تر زیاتر دەربڕی ◊ گرنگی بە منداڵێكی زیاتر لەوانی تردا ◊ **تَحَيَّفَ الشَّيْءَ**: وردە وردە لەقەراخ‌و بیجاخی شتەكەی گرت‌و لێی كەمكردەوە ◊ **الحائف** (**حائف الجبل**): قەراخی كێو بنارو دامێنی كێو.

**الحافُ**: رەگێكی سەوزە لەژێر زوبانەوەیە. ◊ **اَلْحَائِفَةُ من كل شيئ**: لایەن‌و ئەملاو ئەولای شت.

**الحَيْفُ**: تیژایی بەرد، ◊ **اَلْحِيفَةُ**: تیژكەرەوەیەكە سەرمتیرو سەرە رمی پێ تیژ دەكرێتەوە. ◊ **الحِيفة من الشَّيْءِ**: لایەن‌و قەراخ‌و ئەملاو ئەولای شت.

**حاقَ** به الشَّيْءُ حَيْقاً وحيوقاً وحَيَقاناً:

**حاق** به الأمر: كارەكەی لەسەر پێویست بوو.

**حاق** فيه السيفُ: شمشێر كاری لێكرد.

**حاق** الشَّيْءَ: شتەكەی هەنوو وزۆری دەست رێ خست. ◊ **أحاق به الشَّيْءُ**: بەمانا (حاق) دێ ◊ **حَايَقَهُ**: حەسوودی پێ بردو رقی لێ بوو. ◊ **إحْتَاقَ على الشَّيْءِ**: ئیحتیاتی كرد بۆ ئەوشتە.

**اَلْحَاقُ** حاق الجوع: برسیایەتی زۆر ◊ ئەوپەڕی برسییەتی.

**اَلْحَيْقُ**: ئەوەی دێتەوە رێی ئادەمیزاد لەخراپەكانی. ◊ **اَلْحَيْقَرُ**: لاواز یان نارەسەن‌و بنەچە خوێڕی.

**حَاكَ** في كذا حَيْكاً: شوێنكەی لێكرد، كاریگەریی لێ كرد.◊ **حاك المُدْيَةُ**: كێردەكە بڕی.

**حــاك** في مــشيته حَيَــكاناً: لــه رۆییشتنەكەیدا لارو لەنجەی كرد خۆی بادا ○ بەتوندی پێی لەزەویداو عەرزەكەی كوتایەوە.

**حاك** الثوبَ: قوماشەكەی چنی ○ **أحاك فيه السيفَ**: بەمانا (حاك) دێ، واتە: شمشێر كاری تێكرد. ○ **إحْتَاكَ بثوبِهِ**: بە كراسەكەی خۆی كەمەندكێش كرد واتە: قاچیو پشتی پێكەوە بەستن. ○ **تَحَايَكَ**: بەلارو لەنجە هات.

**حَالَ** الماءُ حيلاً: ئاوەكە لەناو شێوەكەدا كۆ بۆوە. ○ **تَحَايَلَ على الرجل أو الشَّيْئَ**: فێڵی لە پیاوەكە كردو بەسیاسەت لەگەڵی دا هەڵسو كەوتی كرد بۆ ئەوەی لێی بەمراد بگا. ○ **تَحَيَّلَ**: فێڵو فەجەری بەكار هێنا بەئەنجامدانی كارەكانی.

**اَلْحَيْلُ**: ئاوی كۆ بووەوە لەناو شێوەكەدا، ○ **اَلْحَيْلَةُ**: جەڵەبە مەڕو بزن ○ بەردی بەربۆوە لەكێوەوە بۆ دامێنیو هێندە كۆببنەوە تا زۆر دەبنو دەبێتە بەردەڵان.

**حَانَ** الأمْرُ: كاتی ئیشەكە نزیك بۆتەوە ○ **أحانَ**: زۆر مایەوە. ○ **أحان الشَّيْئَ**: شتەكەی فەوتاندو لە ناوی برد. ○ **أحْيَنَ القومُ**: گەلەكە كاتی ئەوەی هاتووە بەمافی خۆی بگا. ○ **أحْيَنَ الابلُ**: حوشترەكە كاتی ئەوەی هاتووە بدۆشرێ یان باری لێ بنرێ. ○ **أحْيَنَ بالمكان**: چەند ماوەیەك لەو شوێنە مایەوە. ○ **حَايَنَهُ مُحَايَنَةً وحِيَاناً**: مامەڵەی لەگەڵ كرد ساڵ لە دوای ساڵ. ○ **حَيَّنَهُ**: كاتێكی بۆ دیاری كرد. ○ **حَيَّنَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانكەسی هیدایەت دا بۆ ڕێی ڕاست. ○ **الحائنة**: مێینەی (الحائن)ە ○ بەمانا بەلای كوشندە دێ.

**اَلْحِيْنُ**: ماوەیەك لەزەمەن كەم یا زۆر.

**اَلْحَــيْنُ**: هــیلاكو تێداچــون ○ بــەلاو ناخۆشی ○ **اَلْحِينَةُ**: بەمانا كات دێ.

**حَيِيَ** حياةً وحيواناً: گەشەی كرد.○ **حَيِيَ القومُ**: قەومەكە وەزعو حاڵیان باش بوو.○ **حَيِيَ الطريقُ**: ڕێگاكە ئاشكرا بوو.○ **حَيِيَ** من القبح حياءً: نەفسی لەشتی خراپو ناشرین هەڵە نگوتو پێی ناخۆش بوو.○ **حَيِيَ** من الرجل: شەرمی لەپیاوەكە كرد. ○ **أحيا القومُ**: زاوو زێیان زۆر بوو ○ وەزعو حاڵی ئاژەڵەكانیان باش بوو. ○ **أحيا اللهُ فلاناً**: خودا فلانكەسی زیندوو كرد. ○ **أحيا اللهُ الأرْضَ**: خودا ڕووەكو گژو گیای لەزەوی دەرهێنا ○ **أحيا الرائدُ الأرْضَ**: كابرا زەوییەكەی بینی گژو گیاكەی لەوپەڕی گەشەو سەوزیدا بوو. ○ **أحيا فلان الليلَ**: فلانكەس شەو نەنوست هەر خەریكی خودا پەرستی بوو. ○ **حَيَّاهُ اللهُ**: خودا هێشتیەوە.

**حيّا** اللهُ القومَ بِحَيَاً: خودا بەهانای ئەو قەومەوە هاتو بارانی بۆ باراندن.

**حَيَّ** فلان فلاناً: فلانكەس دوعای بۆ فلان كرد بەتەمەنی درێژو تەندروستی باش.

**حَيّا** الخَمسين: لەتەمەنی (٥٠) ساڵی نزیك بۆوە. ○ **حايا القومُ بعضهم بعضاً**: ئەو خەڵكە دوعایان بۆ یەكتر كرد بەتەمەنی درێژو تەندروستی.

**حيّا** النّارَ بالنفخ: ئاگرەكەی بەفو لێكردن هەڵگیرساندەوە.

**حَيَّا** الصَّبِيَّ: خۆراكی دا بەمنداڵەكە. ○ **تَحَايَا القومُ**: خەڵكەكە دوعای تەمەن درێژیو تەندروستیان بۆ یەكتر كرد. ○ **تَحَيَّا منه**: خۆی لێ شاردەوە. ○ **استحيا الأسيرَ**: دیلەكەی هێشتەوە نەیكوشت ○ **استحيا فلان فلاناً**: فلان شەرمی لە فلان كرد ○ دەگوترێ: (استحيا منه واستحاه). ○ **التحية**: سەلام.

**الحَيَا**: هەرزانیو باران. ○ **اَلْحَيَاءُ**: شەرمو شكۆ (الحياءُ) بۆ ئاژەڵ بە (زێی) دەگوترێ. ○ **الحياةُ**: گەشە كردنو مانەوە بەزیندوویی ○ لەزاراوەی زانستی

زینـدەوەرزانی دا (حیـاة) بریتییـە لـە کۆمەڵێـك دیـاردە کـە لەگیانلەبـەرو رووەكو درەختـدا دەبینـدرێو جیایـان دەکاتـەوە لـە (جـەمادات). ٥ الحايی: خاوەنی مار ٥ مار بەخێوکەر. ٥ الحَيَوانُ: زیندوویی‌و ژیان. حَيَّ على كذا: حازربەو وەرە بۆ ئەنجامـدانی فلانکار ٥ وەکـوو (حـي علـى الصلاة حي على الفلاح).



الخاتون: ئافرەتی شەریف و رەسەن ◊ شوێنی موراقەبەو خودا پەرستی صۆفیەکان ◊ خَبَأَهُ خَبْأً: پەنهانی کرد ◊ پاراستی ◊ أَخْبَأَهُ: بەمانا (خَبَأَهُ) دێ ◊ خَبَّأَهُ: بەمانا (خَبَأَهُ) دێ ◊ خابَأَهُ: کەوتە مونازەعەو بەبەریەك دا هەڵگوتن و بەڵگە هێنانەوە بەمەبەستی بۆردانی یەکتری ◊ إِخْتَبَأَ: خۆی حەشاردا ◊ إِخْتَبَأَ لَهُ خَبِيئاً: شتێکی لێ هەڵەوگێڕو موعامماکرد ◊ تَخَبَّأَ خِبَاءً: مەلجەئو پەناگای بۆخۆی دروست کرد ◊ الخابِيَة: کوندەی ئاو، دێمکە، جەوەندە ◊ الخَبْءُ: پەزمەندە، پەزمەندەکراوو شێراوە ◊ الخِبَاءُ: رەشماڵ (خانووی لەکوڵك و مودروستکراو)، خێوەت کە کۆڵەکەی ژێر دەدرێ ◊ اَلْخُبَأَةُ: هەڵگیراوو پەزمەندەکراو ◊ الخُبَأَةُ: ئافرەتێکە گۆشەگیر ◊ دەگوترێ: (إمرأة خُبَأَةٌ) ئافرەتێکە لەماڵەوە خزاوەو خۆی دەشێرێتەوەو دەرناکەوێ ◊ اَلْخَبِيءُ: بەمانا (اَلْخُبَأَةُ) دێ بەشتێکیش دەگوترێ: کرابێتە موعەمماو بەپرسیار ئاراستەی یەکێکی تر بکرێ ◊ اَلْخَبِيئَةُ: بەمانا (اَلْخُبَأَةُ) دێ ◊ اَلْمَخْبَأُ: پەناگایەکە ئادەمیزاد لەترسی هێرشی ئاسمانی پەنای بۆدەبا ◊ اَلْمُخْتَبَأَةُ: ئافرەتێکە کەمژاوەنشین و شوی نەکردبێ.

خَبَّ الفرسُ: ئەسپەکە لەراکردن دا جارێك دەست و پاشوی راست و جەڵێك هی چەپی بەیەکەوە هەڵدەهێنێ ◊ خَبَّ فلان في الأمر: فلانکەس لەکارەکەی دا پەلەی کرد ◊ خَبَّ النبات: رووەکەکە بەرزبۆوەو درێژ بوو ◊ خَبَّ البحرُ خَبّاً وخِباباً: دەریا تێکیەوە هاویشت و شەپۆلەکانی توند بوون ◊ خَبَّ خِبّاً: فێڵ و فەجەری کردو لەکارەکەی دا غەشی کرد ◊ أَخَبَّ الدابةَ: وڵاخەکەی والێکرد لەرۆین دا خێرابێ ◊ خَبَّبَهُ: فێڵی لێ کردو توشی فەسادی کرد ◊ إِخْتَبَّ: پەلەی کرد ◊ اَلْخابُّ: دەشتێکە لەنێوان دوو تەپۆڵکە دا کەمقاچکی تێدا هەبێ ◊ رێگای لەبەلان ◊ اَلْخَبُّ: پەرۆیەکی درێژکۆڵەیە وەکوو فەقیانە وایە لەپۆشاکەکە دەردەهێندرێ قۆڵ و مەچەکی پێ دەبەسترێ ◊ توێکڵی درەخت ◊ شوێنی نادیارو پەناو قوژبن ◊ الخَبَّةُ: پارچە پەرۆیەکی درێژکۆڵەیە وەکوو فەقیانە مەچەکی خۆتی پێ دەبەستی ◊ اَلْخِبَّةُ: بەمانا (الخَبَّةُ) دێ ◊ اَلْخُبَّةُ: ناو شیوو دۆڵ ◊ زەوییەکی مام ناوەندی نەزۆر بەپیت نەزۆر خراپ و بێ خێر ◊ شوێنێکە ئاوی تێدا کۆببێتەوەو بەدەوری دا گیاو گژ بڕوێ ◊ اَلْخَبِيبُ: ناوی شیوو چاڵایی یەکەی ◊ چاڵی درێژوتەسك ◊ الخَبِيبَةُ: بەمانا (الخَبَّةُ) دێ ◊ قوڵایی شیوو دۆڵ ◊ بەشێك لەگۆشت ◊ هەرپارچە گۆشتێك کۆببێتەوەو درێژبێ ◊ خَبِتَ المكان خبتاً: زەوییەکە تەخت بوو پەستێورایەوە ◊ خَبِتَ ذِكْرُهُ: ناوی گوم بوو ◊ أَخْبَتَ: شوێنی چاڵی ویست ◊ هەوڵی دا بچێتە جێگای نزمایی و بەرفراوان ◊ دایبەزاند ◊ خۆی بەکەم زانی و تەواضوعی نواند ◊ أَخْبَتَ اليه: دڵنیا بوو ◊ اَلْخَبْتُ من الأرض: ئەوەیە زەوییەکە

نزمو بەرفراوان بێ ٥ اَلْخَبْثَةُ: تەوازوعو خۆ بەکەم زانین.

خَبُثَ الشَّيْئُ خُبْثاً وخَبَاثَةً: شتەکە فاسیدو بێ کەڵكو خراپ بوو ٥ خَبُثَ فلان: فلان رەوشتی ناشیرینی لێ پەیدا بوو، هەڵسو کەوتی ناشیرینی کردن ٥ خَبُثَتْ نفسه: دەروونی تێکچو شێوا ٥ أَخْبَثَ الشَّيْئَ: بەمانا (خَبُثَ) دێ ٥ أَخْبَثَ فلان: فلانکەس کاری ناشیرینی ئەنجام دا ٥ هاوەڵو منداڵو کەسوکاری خراپ بوون ٥ منداڵی رەوشت ناشیرینی لێ کەوتنەوە ٥ أَخْبَثَ فلاناً: فلانکەسی فێری رەوشتی ناشیرین کرد ٥ أَخْبَثَ فلان القولَ: فلانکەس قسەی ناشیرینی گوتن ٥ شتی ناشیرینی پاڵ داو بەخراپی لەقەڵەم دا.

تَخَابَثَ: بەرواڵەت و ظاهیری خۆی بەخراپ نیشان دا ٥ اِسْتَخْبَثَهُ: بەپیسو خراپی دانا ٥ الأَخْبَثَان: میزو گو ٥ خَبَاثِ: شێوە جنێوێکە ئاراستەی ئافرەت دەکرێ ٥ الْخَبِيثُ: کەسێك رەوشتی ناشیرینی زۆربێ ٥ خُبَثُ: بەشێوەی جنێو ئاراستەی پیاو دەکرێ ٥ اَلْخَبَثُ: ئەوچڵكو ژەنگەیە کەبەهۆی ئاگرو گەرمکردنی زێرو کوتانەوە لەئاسن دەبێتەوە ٥ الخِبْثَةُ: حەرامو یاساغ ٥ اَلْمَخْبَثَةُ: مەفسەدەو گەندەڵی ٥ پیسو بۆخەڵێ ٥ خَبْخَبَ الشَّيْئَ: شتەکە کشاو شێواو تێکچوو ٥ خَبْخَبَ فلان: فلانکەس سکی شل بوو سکی چوو.

خَبْخَبَ من الظهيرة: وازی لەرۆیشتنی نیوەڕۆژان هێناو لەسێبەردا مایەوە ٥ تَخَبْخَبَ: بەمانا (خَبْخَبَ) دێ.

خَبَرَ الشَّيْئَ: شتەکەی بەتاقی کردەوە لەبۆتەی دا ٥ هەواڵەکەی لەسەر حەقیقەتی خۆی زانی ٥ خَبَّرَ الطعامَ: خواردنەکەی چەور کرد ٥ خَبَّرَ الأرضَ: زەوییەکەی کێڵا ٥ خَبِرَت الأرضُ: زەوییەکە گڵی زۆر بوو ٥ خَبِرَ الشَّيْئَ: شتەکەی زانی، هەواڵو کرۆکی شتەکەی زانی ٥ خَبُرَت الناقةُ خبوراً: حوشترەکە شیری زۆربوو ٥ خَبُرَ الرجلُ: پیاوەکە بوو بەپسپۆڕ.

خَبَرَ الأَمْرَ: لەنیشەکەی کۆڵییەوەو سەروناوی کرد ٥ أَخْبَرَهُ بكذا: هەواڵی دایە ٥ اخْتَبَرَ الناقةَ: حوشترەکەی بەشیر زۆری دەست کەوت ٥ خابَرَهُ: کشتوکاڵی بەشێوەی موخابەرەکرد ٥ هەواڵەکانیان ئاڵو گۆڕکردو روداوەکانیان بۆیەکتر باس کرد ٥ خَبَّرَهُ بكذا: هەواڵی بەو روداوە پێدا ٥ اخْتَبَرَ الشَّيْئَ: شتەکەی بەتاقی کردەوە ٥ تَخَبَّرَ الخَبَرَ: دەربارەی هەواڵەکە پرسیاری لێ کرد ٥ تَخَبَّرَ الشَّيْئَ: شتەکەی وەکوو حەقیقەتی خۆی ناسی ٥ اِسْتَخْبَرَهُ: پرسیاری لێ کرد دەربارەی هەواڵەکەو داوای لێ کرد بۆی باس بکا ٥ الأخباري: مێژوو نووس ٥ الخابور: رەوەکێکە گوڵێکی زەردی جوانی هەیە، بۆنی خۆشە ٥ اَلْخَبَارُ: گڵی زۆر کەبە ڕەگو بنکی درەختەوە دەبێ ٥ اَلْخَبَار من الأرض: ئەو زەوییەی نەرمەلان بێو قاچی ولاخی تێ بچەقێ.

اَلْخَبَرُ: ئەوەی دەگێردرێتەوە یان دەنووسرێتەوە ٥ هەواڵێکە خۆی لەخۆی دا وێدە چێ راست بێ وێدەچێ درۆبێ ٥ اَلْخِبْرُ: کشتو کاڵ کردن بەشێوەی موخابەرە ٥ حوشتری بەشیر ٥ الخَبْرُ: دڵۆپە ئاوو تکەی ئاو لەشاخو کەژدا ٥ کشتو کاڵ ٥ درەختی سیدرو دار سیواكو ئەو گیاوگژەی کەبەدەورییان دا رواوە ٥ اَلْخَبْرَاءُ:

دەشتێك كە درەختی سیدرو ئەراكی لێ بڕوێ ٥ اَلْخُبْرَةُ: ئەوشتەی پێشكەشی میوان دەكرێ لەپسكیتو چاو ئاوو شتی وەها ٥ الخُبُورُ: ئەو هەواڵەی لاتەو ئاگات لێیە ٥ الخبیر: ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا، واتە ئاگاداری هەموو شتێك لەوەی بووەو لەوەی دەبێ ٥ لێزانو ئەهلی كار ٥ ئاگاداری شت بەهۆی زانایی تایبەتی خۆیەوە ٥ المُخْبِرُ: هەواڵدەر، جوتیار، گیاوگز، كوڵكو موو، كەفی دەمی حوشتر ٥ اَلْخَبیرَةُ: مەڕێك كۆمەڵێك بیكڕنو سەری ببڕنو گۆشتەكەی لەنێو خۆیان دا دابەش بكەن هەركەسە بەگوێرەی پارەی خۆی ٥ خوری چاكو پەسەند ٥ المخابرة: ئەوەیە خاوەن زەوی زەوییەكەی دەدا بەسەپانێك زەوییەكە بكاتە كشتو كاڵو بەشێكی دیاریكراو وەكو سێیەكو چواریەك بۆخاوەن زەویو ئەوی تری بۆ سەپانەكە بێ ٥ اَلمِخْبارُ: ئامێرێكی تاقیكردنەوەیە، بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی بەكاری دەهێنن ٥ الْمَخْبَرُ: پێچەوانەی دیمەنە ٥ المُخْبِرُ: هەواڵ نێری ڕۆژنامەو ئاژانسەكانی دەنگو باس ٥ اَلْمَخْبَرانِیُّ: كەسێكە بەباشەو چاكە ناوی بلاوبێتەوە ٥ اَلْمِخْبَرَةُ: ئامێرێكە بۆ بەتاقی كردنەوەی شوحنەی كارەبا بەكاردەهێندرێ ٥ اَلْمُخْتَبَرُ: تاقیگە، ئەوشوێنەی ئەزموونەزانستیەكانی تێدا ئەنجام دەدرێ.

**خَبَزَ** الخُبزَ خَبزاً:نانی كرد ٥ **خَبَزَ القومَ**: نانی دەرخواردی خەڵكەكەدا ٥ **خَبَزَ البعیرُ الأرضَ**: حوشترەكە خێراخێرا قاچی بەزەوی دەكێشا، پێ كۆلی كرد ٥ **خَبَزَ فُلانٌ الشیَ**: فلان بەدەست لەوشتەی دا لێدانێكی توند ٥ **خَبَزَ فلان الدابةَ**: فلانكەس وڵاخەكەی بەتوندی لێ خوڕی ٥ **خَبِزَ** خَبزاً: گوشتی شل بوو تەندروستی تێك چوو ٥ **اختَبَزَ الخُبْزَ**: نانی كرد ٥ **اِنْخَبَزَ المكانُ**: شوێنەكە نزم بوو ٥ **تَخَبَّزَهُ**: بەقاچی لێی دا بەر پێلەقەی دا ٥ **الخابِزُ**: نانەوا، نان فرۆش ٥ **الخُبازی**: ڕووەكێكە لەپێڕی (الخُبازیة) ٥ **الخِبازَةُ**: پێشەی نانەوایی ٥ **الخَبّازُ**: نانكەر، نانەوا ٥ **الخُبّازُ**: ڕووەكی خوبازی.

**الخُبْزُ**:نانو كولێرەو لەواشەو خەپلە ٥ **اَلْمَخْبَزُ**: شوێنی نانكردن، نانەوەخانە.

**خَبَسَ** الشَیَ خبساً:شتەكەی گرت، هەڵیگرت، بووبەدەسكەوتی.

**خَبَسَ** فلاناً حَقَهُ أو مالَهُ:ستەمی لەفلان كردو بەنارەوا ماڵەكەی برد ٥ **اختَبَسَ فلاناً حَقَهُ**: مافی فلانی داگیركردو ماڵەكەی برد ٥ **تَخَبَّسَ الشیئ**: بەمانا (إختَبَسَهُ) دێ.

الخُباساءُ:دەسكەوتو ماڵی تالانی ٥ **الخُباشَةُ**: ئەو خۆراكو شتانەیە كۆدەكرێتەوە ٥ كۆمەڵێكی پێكهاتە لەچەند هۆزو نەتەوەیەكی جیاجیا ٥ **خَبَصَهُ خَبْصاً**: تێكەڵاوی كرد، تێكی هەڵدا ٥ **خَبَّصَ** الخَبیصَ: حەڵوای دروست كرد ٥ **اختَبَصَ**: كردی بەحەڵوا، حەڵوای خوارد ٥ **اختَبَصَ الضَّیْفُ**: میوانەكە داوای حەڵوای كرد ٥ **تَخَبَّصَ**: كردی بەحەڵوا ٥ **اَلْخَبیصُ**: حەڵوای دروستكراو لەدۆشاوی خورماو ڕۆن ٥ **الخَبیصَةُ**: پارچە حەڵوایەك ٥ **المِخْبَصَةُ**: ئەوقاپەی حەڵواكەی تێدا تێك هەڵدەدرێ.

**خَبَطَ** خَبْطاً:چۆنی بۆلوا ڕاكشاو نوست، گوێی بەوەنەدا ئاخۆ شوێنەكە گونجاوە یان نا ٥ **خَبَطَ** علی الباب: لەدەرگای دا ٥ **خَبَطَ فلاناً**: بەتوندی لەفلانی دا ٥ **خَبَطَ اللیلَ**: بەنەشارەزایی بەشەو ڕۆیشت، ملی ڕێگای گرتەبەر ٥ **خَبَطَ فلاناً**: بەبێ

ئەوەی بیناسێ، خزمایەتیو کەسایەتیان بەسەریەکەوە هەبێ داوای پیاوەتی لەفلان کرد ◊ خَبَطَ فیهم بخیر: سودی پێگەیاند ◊ خَبَطَ الشیطان فلاناً: شەیتان دەستی لەفلان وەشاند ◊ توشی شێتیو فێوپەرکەمی کرد ◊ خَبَطَ البعیرَ: بەداغ حوشترەکەی نیشانەکرد ◊ خَبَطَ القَومَ بسیفه: بەشمشێر کەوتە وێزەی ئەوخەڵکە ◊ خَبَطَ الشجرةَ: لەدرەختەکەی دا بۆئەوەی گەڵاکەی هەڵوەرێ ◊ خُبِطَ فلان: فلان توشی نەخۆشی بوو، هەڵامەتی گرت ◊ اختَبَطَت البلاد: فیتنەوئاشوب کەوتە ناو وڵاتەوە ◊ اختَبَطَ الشجرةَ: بەمانا (خَبَطَها) دێ ◊ تَخَبَّطَت البلاد: فیتنەو ئاشووب کەوتە وڵاتەوە، وڵات شێوا ◊ تَخَبَّطَ الشیئَ: شتەکەی ژێرپێدا ◊ تَخَبَّطَ الشیطانُ فلاناً: شەیتان دەستی لەفلان وەشاند شێتی کرد ◊ اَلْخَابِطُ: سەر سوڕانو گێژی ◊ هەروا بەمانا حوشتریش دێ ◊ الخَبَاطُ: تەپو تۆز ◊ الخِبَاط: داخو نیشانە لەسەردەمو چاو ◊ داخ لەسەر ڕان ◊ الخُبَاطُ: فێو پەرکەم ◊ هەڵامەت ◊ الخَبَّاطُ: بێچوی ماسی کنعەد (جۆرە ماسییەکە) ◊ الخَبَطُ: ئەوگەڵاو گوڵەی لەدرەخت دەکەوێتە خوارەوە ◊ الخَبْطُ: ئاوێکی کەم کەلەبنکی حەوزدا دەمێنێتەوە ◊ الخَبْطَةُ: جاوگە یەکجار دەگەیەنێ ◊ هەڵامەت ◊ جۆر جۆرەی ئاو کەلە زلکاوو چاڵایی دا مابێتەوە یان لەبنکی بەرمیلو شتی وادا ◊ شتی کەم ◊ بارانی بەرفراوانو فەترمورد ◊ اَلْخُبطَةُ: باقی ماندەی ئاو لەچاڵایی یان بنکی بەرمیلو شتی وادا.

الخُبُوطُ: پێ بەزەوی دادان ◊ اَلْخَبِیطُ: شیر پێش ئەوەی بکرێ بەماست، کە هەوێنی تێ بکرێ بۆ ئەوەی ببێتە ماست ◊ حەوزێک نەسپ پێکوڵی لەسەر لێوارەکەی کردبێو تێکی ڕوخاندبێ ◊ حەوزی بچوک ◊ ئاوی کەم لە چاڵاییو بنکی حەوزدا بمێنێتەوە ◊ المِخْبَطُ: ئەو شتەی گەڵای پێ دەوەرێنن ◊ اَلْمِخْبَطَةُ: بەمانا (اَلْمِخْبَط) دێ.

خَبَعَ الصَّبِيّ خُبُوعاً: منداڵەکە هەناسەی لێ برا ◊ هیند گریا هەنسکی هەڵدان ◊ خَبَعَ بالمکان خَبْعاً: لەو شوێنە مایەوە ◊ خَبَعَ في المکان: چووە ناو ئەو شوێنە ◊ خَبَعَ الشَّيَ: شتەکەی شاردەوە ◊ اَلْخُبَعَةُ: پارچەیەك لۆکە.

خَبِقَ فلاناً خَبْقاً: فلانی لەپێش چاوی خۆی پچوك کردەوە ◊ تَخَبَّقَ: بەرز بووە.

اَلْخَبَقَّةُ: زەوی پانو پۆڕ ◊ الخِبِيقُ: درێژ (جا چ بۆ ئادەمیزاد یان گیانلەبەری تر بەکاربێ) باز هاوێژو هەنگاو پانو درێژو خۆشڕەو ◊ الخِبِقَّى: ڕۆیشتنی خێرا ◊ ئاژەڵی خۆشڕەو ◊ هەنگاو درێژو پان ◊ اَلْخِبِقَّاءُ: ئافرەتی بەدڕەوشت ◊ اَلْخِبِقَّةُ: ئاژەڵی خۆشڕەو ◊ گیانلەبەری باز هاوێژ ◊ گیانلەبەری کورت چ نێر چ مێ.

خَبَلَ: کەمتەرخەمیکرد ◊ دەگوترێ: (خَبَلَ عن فعل أبیه) لە ئیشەکەی باوکی دا کەمو کورتی هێنا، نەیتوانی وەکوو ئەو بکا.

خَبَلَ الانسانَ أو الحیوانَ: ئەندامێکی ئادەمیزادەکە، یان هی حەیوانەکەی لەکار خست ◊ خَبَلَ فلاناً: فلانکەسی شێتو شەیداکرد ◊ عەقڵی برد ◊ خَبَلَ فلاناً عن کذا: فلانکەسی لەوکارە مەنع کرد ◊ خَبِلَ خَبَلاً وخبالاً: شێتی کرد ◊ عەقڵو هۆشی برد ◊ ئەندامێکی جەستەی لەکار خست، بریەوە ◊ خَبِلَت یَدُه: دەستی توشی شەلەل بوو ◊ أخْبَلَهُ: حوشترێکی دایە بۆ ئەوەی سودی لێ وەربگرێ ◊ خَبَّلَهُ:

بەمانا (خَبَلَهُ) دێ ٥ اخْتَبَلَ: بەمانا (خَبِلَ) دێ ٥ اخْتَبَلَ الدابَّةُ: ولاخەکە لەشوێنی خۆی نەیتوانی بوەستێ ٥ اخْتَبَلَ فلاناً: فلانکەسی شێت کرد ٥ أُخْتُبِلَ: شێت بوو ٥ تَخَبَّلَ: بەمانا (خَبِلَ) دێ ٥ اسْتَخْبَلَهُ ناقَةً: حوشترێکی بەئەمانەت لێ وەرگرت ٥ الخابلان: شەوو رۆژ ٥ الخَبَالُ: کەمو کوڕی ٥ تێدا چونو فەوتان ٥ ژەهری کوشندە ٥ کێمو زوخاوی دۆزەخییان.

**الخَبْلُ**: بڕین ٥ فیتنەو ئاشوب ٥ الخُبْلُ: نەمانو تێکچونی عەقڵ ٥ سەر لێ شێوانو سەرگەردانی ٥ اَلْخَبَلُ: ئادەمیزاد ٥ جندۆکە ٥ بڕین ٥ مەشکەو کوندە ٥ کوندەی پڕ ئاو ٥ باڵندەیەك شەو بخوێنێ، وەکوو کوندەبوو ٥ اَلْخُبْلَةُ: نەمانو تێکچونی ئەندامێك یان نەمانی عەقڵو هۆش.

**الخُبُولُ**: بەمانا (اَلْخَبْلَةُ) دێ.

**خَبَنَ**: وێکی هێنایەوەو دروی ٥ خَبَنَ الشَّيءَ: شتەکەی شاردەوە ٥ بەری دایەوە ٥ خَبَنَ الطعامَ: خۆراکەکەی هەڵگرت بۆ کاتی قاتو قڕی ٥ اَخْبَنَ: لەژێر دەرپێکەیدا شتی شاردەوە ٥ الخَبْنُ: لە عیلمی عەروزدا بریتییە لە لابردنی پیتی دووەم کە بزوێنی نەبێ لە تەفعیلەدا ٥ اَلْخُبْنَةُ: لە کراسو دەرپێ بەو بەشەیان دەگوترێ بەسەر یەکدا هێندرابێتەوەو دوورابێ ٥ هەروا ئەو شتەی ئادەمیزاد لەکۆشی دا یان لە بنهەنگڵی دا هەڵی گرێ ٥ تورەکە یان قاپێکە شتی تێ دەکرێو هەڵدەگیرێ، لەکۆڵ دەدرێ ٥ الخُبَنُ: بۆ پیاو بەکەسێك دەگوترێ تێکسمراوو کوڵەبنە بێ.

**خَبَتِ** النارُ خَبْواً وخُبُوّاً: ئاگرەکە دامرکاو بڵێسەی نەما ٥ خَبَتَ الحربُ: شەڕ کوژایەوە ٥ أَخْبَى: ڕەشماڵی دروست کرد.٥ أَخْبَى خِباءً: ڕەشماڵی دروستکردو هەڵی دا ٥ أَخْبَى الكِساءَ: قوماشەکەی کرد بە خێمەو ڕەشماڵ ٥ أَخْبَى النارَ: ئاگرەکەی کوژاندەوە ٥ خَبَّى خِباءً وكِساءً: ڕەشماڵی دروست کرد ٥ اسْتَخْبَى خِباءً: ڕەشماڵی هەڵداو چووە ناوی ٥ خَتَأَه خَتْئاً: مەنعی کرد ٥ گێڕایەوەو نەیهێشت ٥ اخْتَتَأَ: چەوسایەوە ٥ زەلیل بوو ٥ لەترسی شتێك ڕەنگی گۆڕا ٥ اِخْتَتَأَ لفلانٍ: خۆی لەفلان شاردەوە لەترسا یان لە شەرما نەیویست فلان کەس ببینێ ٥ اخْتَتَأَ الشَّيءَ: شتەکەی ڕفاند ٥ اَلْمُخْتَتِئَةُ: دوورو درێژ.

**خَتَّ** خَتّاً: خوێڕی بوو، بەدرەوشت بوو ٥ خَتَّ فلاناً خَتّاً: بەرمب لەفلانی دا، لێکدان لێکدان بەرمب لێی دا ٥ خَتَّ خَتّاً: جەستەی تێکچوو ٥ اخْتَتَّ: گەردنکەچ بوو، کەناوی باوکیان هێنا شەرمی بەخۆی داهات ٥ أَخَتَّ القولُ فلاناً: قسەکەی فلانکەسی خەجاڵەت کرد ئەزیەتی داو بێ دەنگی کرد ٥ أَخَتَّ حظَّ فلانٍ: بەشی فلانکەسی پوچ کرد ٥ خَتَّرَتْ نَفْسُهُ: نەفسی خۆی هیچو پوچ کرد.

**خَتَرَ** فلاناً: ستەمی لەفلان کەس کرد ستەمێکی زۆر ٥ خَتِرَ خَتَراً: جەستەی خاوو خلیچك بوو بێهێزو لاواز بوو، جا یان بەهۆی نەخۆشی یان مەی خواردنەوە یان دەرمان ٥ خَتَّرَهُ الشرابُ وغیره: شەرابەکە باری تەندورستی شێواندو لەپەلو پۆی خست ٥ تَخَتَّرَ: جەستەی تێکچو خاو بۆوە ٥ تەمبەڵو لاواز بوو ٥ زیهنی شێوا شتی تێکەڵو پێکەڵ کرد ٥ بەشێوەی تەمبەڵو بێهێز کەوتە ڕۆیشتن.

خَتَعَ ختعاً وختوعاً:هەلات.٥ خَتَعَ في الأرض: رۆیشتو لەولات دوور کەوتەوە ٥ خَتَعَ علی القوم: هێرشی کردە سەر خەڵکەکە ٥ بەمەبەستەوە بەتاریکی شەو کەوتەڕێ ٥ اَنْخَتَعَ في الأرض: بەمانا (خَتَعَ) دێ ٥ اَلْخَتِعُ: ئەو شارەزاو چاوساغەیە کە هەرگیز لەڕێگاو رۆیشتندا دانامێنێو رێگای لێ هەڵە نابێ ٥ اَلْخَتِیعُ: بەلاو کارەسات ٥ اَلْخَتَعَةُ: پێستۆکێکە تیر هاویژ لەپەنجەی دەکا لەکاتی تیر هاویشتندا ٥ اَلْخَوْتَعُ: بەمانا (الخَتِعُ) دێ ٥ بێچووی کەروێشك ٥ جۆرێکە لە مێشی گەورە مێشە سەگی پێ دەگوترێ ٥ اَلْخَوْتَعَةُ: پیاوی کورتە باڵا ٥ خَثْعَرَ: پوچایەوە ٥ توایەوە ٥ اَلْخَیْثَعُورُ: هەرشتێك گۆڕانی بەسەردا بێو زوو بپوکێتەوەو لەسەر شێوازێك بەردەوام نەبێ ٥ تراویلکەیەك زوو زوو بپوکێتەوە ٥ خَتَلَهُ خَتلاً وخَتَلاناً: فێڵی لێ کردو بەبێ ئاگایی لەخشتەی برد ٥ (ختله في الحرب) لەشەڕا فێڵی لێکردو لەشوێنێکەوە هێرشی بۆ کرد چاوەڕوان نەدەکرا لەوێوە پەلامار بدا ٥ خَاتَلَهُ: بەمانا (خَتَلَهُ) دێ ٥ فێڵی لێکردو چاووراوی کرد ٥ اخْتَتَلَ: گوێی هەڵخست گوێی کلۆرکرد بۆ ئەوەی قسەی خەڵکی تر ببیستێ ٥ تخاتلوا: فێڵیان لەیەکتر کرد.

اَلْخَتْلُ:ئەو شوێنەی پیلانی تێدا دادەڕێژرێ ٥ کونە کەروێشك ٥ اَلْخَوْتَلُ من الرجال: ئەو کەسەیە عاقڵمەندو زەریف بێ.

خَتَمَ النحل ختماً وختاماً:هەنگەکە شانە هەنگوینەکانی پڕکرد لە هەنگوین ٥ خَتَمَ علی الطعام والشراب: سەری قاپو مەنجەڵو زەرفو تورەکەی خۆراکەکەی بەستو دایپۆشێ بۆ ئەوەی پیس نەبێو شتی تێ نەچێ.٥ خَتَمَ علی فمه:قسەی لێ قەدەغەکرد ٥ خَتَمَ علی قلبه: وای لێ کرد لەشت تێنەگا ٥ خَتَمَ الشَّيْءَ وعليه: شتەکەی چاپ کرد ٥ مۆری کرد ئیمزای کرد ٥ خَتَمَ بابه علی فلان: روی لەفلانکەس وەرگێڕاو پشتی تێکرد ٥ خَتَمَ الزَّرْعَ وعليه: دوای کێڵانو تۆو کردن یەکەمجار گشتوکاڵەکەی ئاودا ٥ خَتَّمَهُ: شتەکەی مۆر کرد، لۆکی کرد، ئیمزای کرد ٥ خَتَّمَ صاحِبَهُ: ئەنگوستیلەی لەقامکی هاوەڵەکەی کرد ٥ اخْتَتَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی تەواو کرد ٥ تَخَتَّمَ: ئەنگوستیلەی لەقامك کرد ٥ دەگوترێ: (تَخَتَّمَ به) ٥ تَخَتَّمَ بعمامته: مێزەرەکەی خۆی کرد بە پەردەو لەمپەر ٥ تَخَتَّمَ بأمره: کارەکەی ئەوی شاردەوە ٥ تَخَتَّمَ عن الشَّيْءِ: خۆی لە شتەکە غافڵکردو لێی بێدەنگ بوو.

الخاتَمُ:ئەو شتەی مۆری پێ دەکەی ٥ ئەڵقەیەکە دەکرێتە پەنجەوە ٥ الخاتِمُ: بەمانا (الخاتَم) دێ ٥ کچێنیو دەست لێنەدراوی ٥ الخاتِمَةُ من کل شيئ: سەرەنجامو کۆتایی شتەکە ٥ الخاتیام: بەمانا (الخاتام) دێ ٥ الخِتامُ: قوڕ یا مێو کەدەمی کۆڵەسە هەنگی پێ دەگیرێ.

اَلْخَتْمُ:شوێنی مۆر ٥ شوێنەکەی مۆر ٥ دەمەکۆڵەسی هەنگ ٥ زارکی کۆڵەسی مێشە هەنگوین ٥ اَلْخَتَمُ: بەمانا (الخاتام) دێ ٥ بەمانا سەرمۆردێ ٥ لۆککراو سەر قەپاتکراو ٥ اَلْخَیْتامُ: بەمانا (الخاتام) دێ ٥ بەمانا نۆبەرەو تازە پەیدابوو دێ ٥ بەمانا کچێنی دێ ٥ اَلْمُخَتَّمُ مِن الخيل: ئەو ئەسپەیە نێوان سمیو زەنگی مووەکانی سپیبن ٥ اَلْمَخْتُومُ: پێوەر وەکوو قسناغو ربەو تەنەکەو تەغارو عەربە.

**خَتَنَ** خُتونا وختونةً: هاوسەرگیری ئەنجامدا ٥ ژنی هێنا ٥ **خَتَنَ** الصَّبِيَّ خَتْناً وخِتاناً: منداڵەکەی خەتەنەکرد ٥ **خاتَنَ فُلاناً**: ژنی بۆ فلان هێنا ٥ **اِخْتَتَنَ الصَّبِيُّ**: منداڵەکە خەتەنەکرا ٥ **الخِتانُ**: ئەو شوێنەی لەهێنی نێرو وانێکی مێینە دەبڕدرێ ٥ **الخِتانَةُ**: پیشەی خەتەنە سوران.

**اَلخَتَنُ**: باوك و برای خێزان ٥ مێردی کچ مێردی خوشك واتە: زاوا ٥ **خَتاخَتْواً**: ترساو دڵشکاو بوو بەهۆی نەخۆشی و خەم و خەفەتەوە.

**ختا** الليلُ: تاریکایی شەوەکە زۆر پەرەی سەند ٥ **ختا** العقابُ وغیره: هەڵۆکە یان هەر باڵندەیەکی تر کەوت **ختا** فلاناً عن الأمر: فلانکەسی لەکارەکە مەنع کرد **ختا** الثوبَ: پرژی قوماشەکەی بادا، لولی دا ٥ **أختى**: کاڵاکانی یەك لەدوایەك فرۆشت ٥ **إختتى**: بەمانا (ختا) هاتووە ٥ **الختيُّ**: زەبرەلێدانی زۆرو یەك لەدو یەك.

**خَثَّهُ**: کۆی کردەوە ٥ پینەی کردو چاکی کردەوە ٥ **اَلخُثُّ**: کەف و خشتوخاکی لافاو پاش نیشتنەوەی لافاوەکە و شکبوونەوەی ٥ **اَلخُثُّ**: گورزمەیەك لەشۆرکی شکاوە ئاگری پێ گوێزراوەتەوە (دەستە چیلە) ٥ **اَلخُثَّةُ**: بەمانا (اَلخُثَّةُ) دێ.

**خَثَرَ** اللبنُ ونحوه: شیرەکە مەیی و توندبوو ٥ **خَثَرَ** نفسُهُ: دەروونی شکاو رەنجا ٥ باری دەروونی تێك شکا ٥ **خَثَرَ** فلان: فلانکەس هەستی بەبێ تاقەتیکردو تەندورستی تێکچوو ٥ **خَثُرَ اللَّبنُ**: شیرەکە مەیی، بزرکاو توند بوو ٥ **أخثرَ فلان**: بەمانا (خَثَرَ) دێ ٥ **أخثرَ الزُّبدَ**: رۆنە کەرەکەی واز لێهێنا نەیتواندەوە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە ٥ **خَثَّرَ اللَّبَنَ**: شیرەکەی مەیاند ٥ بزرکاندی ٥ **التَّخَثُّرُ التاجي**: خەستبوونەوەی خوێن لەناو دەمارەکانی جەستەی دا بەهۆی نەخۆشی ٥ **اَلخُثار من كل شيئ**: بەرماوەو پاشەڕۆکی هەموو شتێکە ٥ **الخُثارَةُ**: بەمانا (الخثار) دێ ٥ **اَلخُثارِمُ**: لێو ئەستور ٥ رەشبین ٥ **الخُثْرِمَةُ**: نەرمانی لا لوت کە ئەستور بێ ٥ کەوانەیی ناوەڕاستی لێوی سەرو. **خَثْعَمَهُ**: بەخوێن رەنگیکرد ٥ خوێنی تێهەڵسوو ٥ **خَثْعَمَ القومُ**: پەیمانیان بەیەکدا کەپشتی یەکتر بگرن دەست لێك بەرنەدەن ٥ **تَخَثْعَمَ**: بەخوێن خۆی رەنگ کرد.

**خَثِمَ** خَثَماً: پان بووە ٥ لوتی پان بووە ٥ **خَثَّمَهُ**: پانی کردەوە.

**خَثَى** البقرُ أو الفيلُ خَثْياً: مانگاکەیان فیلەکە ناوسکی خۆی دانا ٥ توڕاندی ٥ هەرچی ڕیخی لەسکی دا هەبوو هەمووی دەردا ٥ **أخثى**: تەپاڵەی داگیرساند ئاگری بەتەپاڵە کردەوە.

**اَلخَثْوُ**: خوار ناوك کە داکەوێ وشك ببێ ٥ **اَلخَثْواءُ**: ئافرەتێك لای خواروی گەدەی داکەوێ و شل ببێ.

**اَلخِثيُ**: ڕیخ و پیسایی رەشە وڵاخ و فیل.

**خَجَأَ** خَجْواً: دڵشکاو تێك شکاو بوو ٥ **خَجَا الليلُ**: شەوەکە رۆیی و کۆتایی هات. **خَجَأ** فلاناً: خَجْئاً: لە فلانکەسی دا تێی سرەواند ٥ **خَجِئَ خَجَأً**: قسەی ناشیرین و جنێوی دان ٥ شەرمیکرد ٥ **أخجَأهُ**: زۆری داوا لێکرد تاوای لێکرد بێتاقەت ببێ ٥ **تَخاجَأتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە سمتی خۆی دەرپەڕاند ٥ **تَخاجَأ فلان**: بەهێواشی و مەیلەو خۆ بادان ڕیشت ٥ **اَلخُجَأةُ**: ئادەمیزادی قەڵەوی قونگران ٥ ئەحمەق و خراپ راڕاو بێ بەهەڵێن.

**خَجَّ** خُجوجاً: وێك هاتەوە نوشتایەوە ٥ **خَجَّ** برجلە: لە ڕۆیشتنا تەپو تۆزی بەرپاکرد ٥ **خَجَّ الشَّیْءَ**: پاڵی بەشتەکەوە نا ٥ **خَجَّ الشَّیْءَ**: شتەکەی شەق کرد ٥ **خَجَّ العودَ**: دارەکەی قلیشاند ٥ **اختَجَّ في سیرِه**: بەخێراییو پێچاو پێچ ڕۆیشت ٥ **اَلْخَجِیجُ**: (خجیج الریح) دەنگی ڕەشەبا ٥ **خَجْخَجَ**: خۆی شاردەوە ٥ **خَجْخَجَ الریحُ**: ڕەشەباکە بەشێوەی پێچاو پێچو گێژەڵۆکەیی ڕۆیی ٥ **اَلْخَجْخَاجَةُ**: ئەحمەقو گێل ٥ **خَجِلَ خَجَلاً وخَجْلَةً**: شەرمی کردو بەخۆی دا شکایەوە.

**خَجِلَ** الحَیْوانُ: گیانلەبەرەکە واقی وڕماو حەوقو بوو نەیزانی بەچ لایەك دا بڕوا ٥ **خَجِلَ** فلان بأمره: فلان بەکارەکەیەوە زۆر ماندوو بوو بۆی ئەنجام نادرێ نازانێ چی بکا.

**خَجِلَ** فلان: فلان دڵنارەحەتو جارِز بوو ٥ تەڕ دەماخ بوو ، کەیف خۆش بوو.

**خَجِلَ** النباتُ: گیاو گژەکە چڕو پڕو تێك چڕژا ٥ دەگوترێ: **خَجِلَ** الوادی: دۆڵەکە بەگیاوو گژی زۆر ڕازایەوە ٥ **خَجِلَ** بالحِملِ: بارەکەی قورسو گران بوو ٥ **خَجِلَ** علی فرسه: لەسەر ئەسپەکە نەیتوانی دامەزراو بێ چونکە بچکۆلەبوو زینەکەی بۆ پڕنەکرا ٥ **خَجِلَ** الثوبُ ونحوه: کراسەکەی لەبەر پانو بۆڕی چاك چاك لە جەستەی دا دەگەڕا ٥ **أخْجَلَ الثوبَ ونحوه**: کراسەکەی درێژکرد یان پانی کرد تا بەتەواوی لەبەریا بگەڕێ ٥ **خَجْلَـهُ**: وای لێکرد تەریق بێتەوە ٥ **اَلْخَوْجَلَی**: ڕۆیشتنی ئافرەتە بەلارو لەنجە.

**خَدَبَ** خَدْباً: درۆیکرد ٥ **خَدَبَ فلاناً**: پێستو گۆشتی فلانکەسی هەڵدڕی ٥ **خَدِبَ الشَّیْءَ** خَدَباً: شتەکە درێژو پان بوو ٥ دەگوترێ: (خَدِبَتِ الضربَةَ أو الطعنة وخدبت الدرعُ).

**خَدِبَ** اللسانُ: زمان درێژ بوو ٥ **خَدِبَ** السیفُ: شمشێرەکە بڕی ٥ **خَدِبَ** فلان: فلانکەس خوارو خێچ بوو هەر بەهەواو هەوەسی خۆی دەڕوا بەگوێی کەس ناکا (هو أخدب وهی خدباء) ٥ **تَخَدَّبَ**: بەمانا (خَدِب) دێ ٥ **تَخَدَّبَ فلان**: فلان بەڕۆیشتنی مام ناوەندی ڕۆیی ٥ **الخِدَبُّ**: گەورەو دڵڕەق ٥ کەتەو زەبەللاح لە هەموو شتێك.

**الْخَیْدَبَـةُ**: ڕێگای ئاشکرا (ك: خیادِبَ) ٥ ڕێبازو دابو نەریتو پەیڕەوو پرۆگرام.

**خَدَجَ** خِداجاً: کەم بوو کەمی کرد ٥ **خَدَجَ** الحامِلُ: ئافرەتە دووگیانەکە سکەکەی لەبار چوو پێش ئەوەی کامڵ ببێ ٥ **خَدَجَ الزند**: چەرخەکە ئاگری لێ دەرنەچوو ٥ **أخدجتِ الحامِلُ**: بەمانا (خدجت) دێ ٥ **أخدجت الشتوةُ**: زستانەکە بارانی کەم بوو ٥ **أخْدَجَ الشَّیْءَ**: شتەکەی کەم کردەوە ٥ **أخدَجَ أمْرَهُ**: کارەکەی بەباشی بنیەست نەکرد ٥ **خَدَّجَتِ الحامِلُ**: بەمانا (خَدَجَتْ) دێ ٥ **الخَدیجُ**: لقی ڕوەکێك یان ئەندامی جەستەی گیانلەبەرێك کە ناکامڵ بێ.

**المِخْدَاجُ**: ئافرەتێکە منداڵی بۆ ڕانەوەستێ ٥ پێش ئەوەی سکەکەی کامڵ بێ لەبەری بچێ.

**خَدَّ** الأرضَ: زەوییەکەی هەڵکەند ٥ **خَدَّ** السیلُ الأرضَ وفي الأرضِ: لافاوەکە زەوی دادڕی ٥ **خَدَّ** جِسمَهُ بنابه: بەکەڵبەی پێستی هەڵدڕی ٥ **خَدَّ** البعیرَ: لا شەویلەی حوشترەکەی داخ کرد ٥ **خَدَّ** الفرسُ الأرضَ بحوافره: ئەسپەکە بەسمەکانی شوێنی لە زەوییەکە کرد ٥ **خادَّهُ**: بەربەرەکانی کرد لە ئیشەکەی دا ٥ **خَدَّدَ لَحْمَ الفرس**: گۆشتی ئەسپەکەی لەڕولاواز کرد ٥ دەگوترێ: **خَدَّدَه**

النقرُ وسوءُ الحال: هەژاری و باری نالەبار لەرو لاوازی کرد.

خَدَّ السَّيْرُ لحمَ الفرس: رۆیشتن گۆشتی ئەسپەکەی لاواز کرد ◊ تَخادّا: بەرامبەر یەک وەستان ◊ تَخَدَّدَ لَحْمُهُ: بەمانا (خَدَّدَ) دێ ◊ تَخَدَّدَ القومُ: خەڵکەکە بوون بەچەند تاقم و پێرێک ◊ الأخدود: کەندری درێژو قوڵ ◊ الخدُّ: کوڵم لا رومەت ◊ هەروا ناوە بۆ لایەنێکی شت ◊ خدُّ الهودج: لاتای کەژاوە ◊ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێک خەڵک ◊ الخُدَّةُ: کوڵم ◊ کەندری درێژ ◊ چاڵ ◊ المِخَدُّ: کەڵبە ◊ المِخَدَّةُ: سەرین، بالیف کە لەکاتی نوستندا لارومەتی دەخرێتە سەر ◊ ئاسنێکە زەوی پێ هەڵدەدرێ وەکوو پێمەرە.

خَدَرَ خَدَراً: خۆی شاردەوە ◊ خۆی تاقەت کردو، خۆی حەشاردا ◊ خَدَرَ بالمكان: لەو شوێنە مایەوە ◊ سەری لێشیوا ◊ لە گەڵە رەوەکە دواکەوت ◊ خَدَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی شاردەوە ◊ خَدَرَ الهودجَ: پەردەی بەسەر کەژاوەکەدا دا ◊ خَدَرَ المرأةَ: ئافرەتەکەی خستە ناو کەژاوەوەو پارێزگاری کردو پێداویستییەکانی بۆ دابین کرد ◊ خَدِرَ خَدَراً: لەش داهێزان و بێ هێزی سواری سەروملی بوو ◊ خَدِرَ اليوم: ئەمڕۆ گەرماکەی توند بوو بای نەسیم و شەماڵی تێدا هەڵنەبوو ◊ خَدِرَ الليلُ والمكانُ: شەوەکە تاریک بوو شوێنەکە تاریک بوو ◊ (هو خَدِرٌ وأخدر) ◊ اخْدَرَ: لەناو کەژاوەدا مایەوە ◊ أخْدَرَ: کەوتە ناو شەوەوە ◊ هەروا باران داپۆشی ◊ أخْدَرَ بالمكان: لەو شوێنە مایەوە ◊ دەگوترێ: (أخدر في أهله) ◊ أخْدَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی شاردەوە ◊ دەگوترێ: أخدر المرأةَ: لەناو کەژاوەکەدا ئافرەتەکەی هێشتەوە ◊ خَدَّرَهُ: داپۆشی ◊ دەگوترێ: (خدَّر المرأة) ئافرەتەکەی لەناو کەژاوەکەدا هێشتەوە ◊ خَدَّرَ الهَوْدَجَ: کەژاوەکەی داپۆشی ◊ خَدَّرَت الظبيةُ ولدها: ئاسکەکە بێچووەکەی شاردەوە ◊ خَدَّرَهُ: دای هێزان تێکی شکاند ◊ خَدَّرَتْهُ المقاعِدُ: دانیشتن قاچی گۆج و ئیفلیج کرد ◊ إخْتَدَرَ: خۆی شاردەوە ◊ اخْتَدَرَت المرأةُ: ئافرەتەکە کەژاوە نشین بوو ◊ تَخَدَّرَ: خۆی حەشاردا ◊ تَخَدَّرَت المرأةُ: ئافرەتەکە خۆی خستە کەژاوەوە ◊ باری تەندروستی تێکچوو لەشی داهێزا ◊ الأُخْدُورُ: کەژاوە ◊ (ك: أخادير) ◊ التخدير الكوكاييني: لەکار خستنی هەستەکان بەهۆی کۆکایینەوە ◊ الخُدارِيُّ: رەش و تاریک ◊ الخِدْرُ: هەرشتێک تۆ بگرێتە خۆی لەخێوەت و خانوو ◊ پەردەیەکە بۆ ئافرەت لە گۆشەیەکی هۆڵدا دادەدرێتەوە ◊ لانەی شێر ◊ الخَدَرُ: شوێنی تاریک و چەواشە ◊ هەور ◊ باران ◊ لەزاراوەی فەلسەفەدا لە دەستدانی هەست بەگشتی یان شوێنێکی تایبەتی ◊ الخُدْرَةُ: شەوی تاریک ◊ الخَدَرَةُ: دەنکە خورمای نەگەییو کە بکەوێتە خوار ◊ هەروا ناوە بۆ ئەو دەنکە خورمایەی ناوەکەی رەش بووبێ و بۆگەنی کردبێ ◊ الخُدْرَةُ: باران ؛ دڵۆپە باران ◊ اَلْمُخَدِّرُ: دەرمانێکە بەکار هێنانی بۆ ئادەمیزادو حەیوانات بەناگایی لێ زەوت دەکا، وای لێدەکا وەعیی نەمێنێ.

خَدَشَ الجِلْدَ: پێستی جەستەی رنی دایماڵی ◊ خادش فلان فلاناً مخادشةً وخداشاً: هەریەکە لەو دوو کەسە پێستی ئەوی تریانی دارنی ◊ خَدَّشَهُ: پێستی رنی پێستەکەی داماڵی ◊ الْخَدْشُ: شوێنەکەی رنین و داماڵینی پێست ◊ الخُدُوشُ:

كــيّج ٥ مــيّش ٥ ريــوى ٥ أَلْمُخــادِشُ: پشيله.٥أَلْمُخدِشُ پشيله ٥ باريكايى مل.

**خَدَعُ** خدعا: حـالّو ومزعـى گۆڕا ٥ هـمر رۆژه لـه حالّيكدايه ٥ **خـدع فـلان**: فلانكـمس رهوشـتى تـرى پـهيرهوكرد بمنـهخلاقو رهوشـتى تـر پهروهرده بوو ٥ **خادع الرأي**: همرساتهو رايهكى ههيهو ههرگيز لهسهر راو بۆچونيّكى تايبهتى پايهدار نابىّ ٥ **خَدَعَ الضَّبُّ**: سوسهمار چووه ناو كونى خۆيهوه ٥ **خَدَعَ الظَّبْيُ**: ئاسكهكه چووه ناو كولانهكهى خۆى ٥ **خَدَعَ الثَّعْلَبُ**: ريّوييهكه فۆرتو پيّچى كردن ٥ **خَدَعت الشمسُ**: خۆر ئاوا بوو ٥ **خَدَعت العينُ**: چاوهكه بهقولّداچوو، يان خهوى لىّ نهكهوت ٥ **خَدَعَ الشَّيْئُ**: شتهكه خراپ بوو كهلّكى نهما ٥ **خَدَعَ الطعامُ**: بۆگهنى كرد ٥ **خَدَعت السوقُ**: بازارِ كهوتو كرِينو فرۆشتن كهمه ٥ **خَدَعَ الرجلُ**: پياوهكه مالّو سامانى كهم بوو.٥ــ ع الزمانُ: وهرزهكه بارانى كهم بوو ٥ **خَدَع فلاناً خَدْعاً وخُدْعة**: ئهوهى بۆ فلانى دهرخست پيّچهوانهى ئهوه بوو كه لهناو دلّى دابوو ويستى بهبىّ ئهوهى بهخۆى بزانىّ زهبريّكى ليّدا ٥ **خَدَعَ الشَّيْئَ خَدْعاً**: شتهكهى شاردهوهو ونى كرد ٥ **خَدَع الدابةَ**: ولاغهكهى بهستهوهو هيچ لهوهرو ئالفى نهدايه ٥ **خَدَع الثَّوْبَ**: قوماشهكهى نوشتاندهوه ٥ **أخْدَعَهُ**: شاردييهوهو پهنهانى كرد ٥ **أخْدَعَ فلاناً**: فلانكهسى ههلّنا بۆ فيّلّكردنو چاوراو ٥ **خادعه مُخادَعةً**: بهمانا (خَدَعه) دىّ ٥ **خدَّعَهُ**: بهمانا (خَدَعَهُ) دىّ ٥ **خدَّعَهُ**: بهمانا (خَدَعَهُ) دىّ ٥ **إنْخَدَعَ**: فيّلّى ليّكرا ههلّخهلّهتيّندرا ٥ **إنْخدَعَ الشَّيْئُ**: شتهكه خۆى حهشارداو لهبهرچاو گوم بوو ٥ **انخدع السوقُ**: بازارِ كهوت ٥ كرِينو فرۆشتنى تيّدا نهما ٥ **تخادعَا**: ههريهكه لهو دوانه فيّلّيان لهيهكتر كرد ٥ **تخادع فلان**: فلان واى نيشاندا فيّلّى ليّكراوه.

**تَخدَّعَ**: فيّلّكردنى بهسهر خۆيدا هيّنا.

**الأخْدَعُ**: رهگى لامل ٥ **الخادع من الطريق**: ئهو ريّگهيهيه ههنديّ ديارهو ههنديّكى كويّر بۆتهوه ٥ **الخادعة**: دهرگاى بچوك كه دهبيّته بهشيّك له دهرگاى گهوره ٥ ژورى بچكۆله لهناو خانوودا.٥**الخَدِعُ**: زۆر فيّلّبازو پاشقولگر ٥ **الخُدَعَةُ**: فيّلّو پيلان ٥ **ألخَدْعَةُ**: يهكجار فيّلّكردن ٥ **الخُدَعة**: زۆر فيّلّباز ٥ **الخَيْدَعُ**: زۆر فيّلّباز ٥ **أَلْمُخَدَّعُ**: ئهو كهسهى زۆرى فيّلّ ليّكرابىّو چهقاوه سوو بوبىّ ٥ **أَلْمِخْدَعُ**: ژوور لهناو خانوودا ٥ گهنجينه.

**خَدَفَ** خدفا: رۆييشت بهخيّرايى بهههنگاوى كورت ٥ كهوته نازو نيعمهتهوه ٥ **خَدَفَ الشَّيْئَ**: شتهكهى بريهوه ٥ **خَدَفَ الثوبَ**: قوماشهكهى برىو پارچه پارچهى كرد ٥ **اخْتَدَفَهُ**: بهمانا (خدفَهُ) دىّ ٥ ههروا بهمانا رفاندن دىّ ٥ **أَلْخَدَفُ**: سهرنشينانى ناوكهشتى ٥ كلكى كهشتى كه بههۆى ئهو كلكهوه ريّرِهوى كهشتييهكه ديارى دهكرىّ ٥ **الخِدْفَةُ**: پارچهى شت ٥ كۆمهلّيّك له ئادهميزاد.

**خَدِلَ**: پرِ بوو ، تهواو بوو ، بالّغ بوو ٥ **ألخَدْلُ**: تيّرو پرو تهواوو بيّكهمو كورى.٥ خَدْلَج ئادهميزادى دهستو پهلو قلو قاچ ئهستورو گۆشتن ٥ **خَدَمَهُ خدمةً**: پيّداويستى ئهوى دابين كرد ٥ **أخْدَمَهُ**: خزمهتكارى بۆ دانا ٥ **خدَّمَهُ**: بهمانا (أخْدَمَهُ) دىّ ٥ **خَدَّم البعير**: پيّوهندى لهقاچى حوشترهكه كرد ٥ **تخَدَّمَ خادماً**: خزمهتكارى راگرت ٥ **اخْتَدَم**: خزمهتى خۆى

کرد ٥ اِختَدَم فلاناً: داوای لەفلانکەس کرد خزمەتی بکا ٥ اِستَخدَمَهُ: کردی بەخزمەتکار ٥ اَلخادِمُ: ئەو کەسەی زۆر خزمەت بکا ٥ اَلخَدمَةُ: ساتێك لەشەو یان لە ڕۆژ ٥ اَلخَدَمَةُ: ئەلقەیەکی پتەوی ئاسنە دەکرێتە قاچی حوشترەوە ٥ شوورای قایمو پتەو ٥ کۆڕو کۆمەڵ ٥ الخَدُومُ: زۆر خزمەتچی ٥ اَلمَخدَمُ: ئەو کەسەی زۆری خزمەتکار هەبنو دەوڵەمەندبێ ٥ شوێنی تێکردنی حەلقەو خرخاڵ لەقاچی ئافرەت یان هی حوشتر ٥ اَلمُختَدَمُ: کەسێك ئیشی ئەوە بێ خزمەتکار پێشکەش بەکەسانی تر بکا ٥ اَلمُخَدَّمَةُ: شوێنی ئەلقە یان پێوەند لە قاچدا ٥ واتە: باریکایی قاچ پشت قاپە ڕەقە بۆ ئادەمیو پشت زەنگ بۆ وڵاخ ٥ اَلمُستَخدم: ئەو کەسەی لەفەرمانگەیەکی دەوڵەت کاربکا بەموچەیەك.

**اَلخِدنُ**: دۆستو برادەر ٥ هاوەڵ ٥ دۆستی دڵداریو نهێنی چ پیاو بێ چ ئافرەت بێ ٥ اَلخُدنَةُ: ئەو کەسەی دۆستو هاوڕێی زۆر دەگرێ ٥ الخِدیو: ناز ناوی فەرمانڕەوای میصر بووە لەژێر دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکانداو ئەو سەردەمانەی ڕابردو تا سەردەمی کۆماریی.

**خَذَأَ** خَذاءً: گەردن کەچ بوو ژێر بار بوو ٥ خَذِئَ لە خَذءاً وخذوءاً وخَذاءةً: بەمانا (خذأ) دێ ٥ اَخذَأَهُ: زەلیلو گەردنکەچی کرد ٥ اِستَخذأ لە: بەمانا (خذئ) دێ. **خَذَّ** خَرج خذاً: برینەکەی کێمو زوخاوی لەبەر ڕۆیی ٥ اَخَذَّ الجرحُ: بەمانا (خذَّ) دێ ٥ خَذرَفَ الحیوانُ: گیانلەبەرەکە پەلەی کرد ٥ قاچی کەوانەیی کرد ٥ تَخَذرَفَ الثوبُ: قوماشەکە درا ٥ اَلخُذرُفَةُ: پارچەیەك لەقوماش ٥ الخذروف: دەسکی دەستاڕ.

**خَذَعَ** اللحم خَذعاً: گۆشتەکەی پارچە پارچەی کردو ئەنجن ئەنجنی کرد.

**خَذَعَهُ**: بەمانا (خَذَعَهُ) دێ ٥ خَذَعَ الشَّیءَ: ئەملاو ئەولای شتەکەی بڕی.

**خَذَّعَ** الشجرة: لقو پۆپی درەختەکەی بڕین ٥ تَخَذَّعَ اللحمَ ونحوه: گۆشتەکە یا شتێکی تری لەو جۆرە ئەنجن ئەنجن کرد بەبێ ئەوەی پارچە پارچەی بکا ٥ خِذَعٌ: پەرتو بڵاو ٥ اَلخِذعَةُ: پارچە گۆشتێك یان شتێکی تری لەو جۆرە ٥ اَلمُخَذَّعُ: بڕاو. اَلمِخذَعة: کێرد (ك: مخاذع)ە ٥ خَذَفَت الدَّابَّةُ خذفاً وخذفاناً: وڵاخەکە پەلەی کرد لە ڕۆیشتنەکەیدا بەردو چەوی لەژێر قاچی دەرپەڕین.

**خَذَفَ** بالحصی: بە پەلەپیتکە بەردۆچکەی هاویشتن ٥ خَذَفَ الشَّیءَ: شتەکەی بڕییەوە (هەر وەهی خذوف) ٥ المِخذَفَةُ: قۆچەقانی ٥ دار لاستیك ٥ ئامێرێکە منداڵ بەردوچکەی پێ دەگرێتە باڵندە.

**خَذَقَ** خذقاً: جیقنەی فڕێدا ٥ خَذَقَ الدابَّةَ: لەوڵاخەکەیەوە ژەنی بۆ ئەوەی باش بڕوا ٥ وڵاخەکە بەهۆی تێوە ژەنینەوە باش ڕۆیی.

**خَذَلَ**: جیا بووەوە ٥ گۆشەگیر بوو ٥ لاکەوت ٥ هەڵبڕاو تەرمبوو ٥ خَذَلَ فلاناً وعنه: دەستی لەفلانکەس بەرداو چیدی پشتی ناگرێو یارمەتی نادا ٥ ڕیسوای کرد ٥ خَذَلَهُ الله: خودا ڕیسوای کرد لەلۆمەو چاو بەرەوژێری نەیپاراست ٥ اَخذَلَت الظبیة ونحوها: ئاسکەکە بەسەر بێچووەکەیەوە مایەوە ٥ خَذَّلَهُ: هەڵینا بۆ ئەوەی نەچێ بۆ شەڕو فەشەل بێنێ ٥ خَذَّل عنه أصحابَه: هاوەڵەکانی وا لێکردن ڕیسوای بکەن ٥ تَخاذَلَت الظبیةُ: بەمانا (أخذلت)

دێ ◊ تخاذل القوم: هەندێ لەخەڵکەکە هەندێکی تریانی ریسواکرد ◊ تخاذلت رجلاه: قاچەکانی بێهێز بوونو رۆیینی بۆ ناکرێ ◊ اَلْخُذَلَةُ: کەسێك زۆر خەڵك ریسوا بکا ◊ اَلْخَذُولُ: دوگیانێکە کەزانی هاتێ لەشوێنی خۆی نەمێنێ لەتاوان ئەم دیوو ئەو دیوبکا.

**خَذَمَ** الحيوان ونحوه: پەلەی کرد خێرا رۆیشت ◊ خَذَم الصقرُ: هەڵۆکە بەدەندوك لەکوشتییەکەی دا ◊ خَذَم الشَّئَ خَذماً: شتەکەی بەخێرایی پارچە پارچەی کرد ◊ خَذِم: خێرا رۆییشت، دەگوترێ: (خذِم الفرسُ) ◊ خَذِم فلان: فلانکەس دڵپاكو بەخشندەبوو خێرخوایە ◊ خَذِم السیفُ: شمشێرەکە برندە بوو ◊ خَذِم فلان خَذَماً: فلانکەس دابرا، هەواڵی نەما، دیارنەما ◊ أخذَمَ: دانی بەزەلیلیو ژێر باری خۆی دانا ◊ داسەکنا ◊ اخذَمَ الشراب: مەیەکە سەرخۆشکەر بوو سەرخۆشیکرد ◊ خَذَّمَهُ: پارچە پارچەیکرد ◊ بڕی ◊ خَذَّم أذنَهُ: گوێچکەی بڕی ◊ تخذَّم فلان: فلانکەس دابڕاو هەواڵی نەما ◊ تخذَّمَ الشجرةَ: درەختەکەی بڕییەوە ◊ الخُذامَةُ: پارچەیەك لەشت ◊ الخذماءُ: (شاة خذماء) مەڕێك قەراخی گوێچکەی بڕابێ ◊ المِخْذَمُ: شمشێری برندە ◊ خذا خُذُوّاً: شلو شەوێل بوو ◊ خذا لَحمُهُ: گۆشتی جەستەی توندو پڕ بوو.

**خذی** خذًی: بەمانا (خذا) دێ ◊ خذِی الرجلُ: پیاوەکە زەعیفو بێ وەج بوو.◊ أخذاه: ژێرباری کرد ◊ زەلیلو داماوی کرد.◊ اَلْخَذَا: شۆڕ بوونەوەی گوێچکەیە بەسەر لاڕومەتدا ◊ کرمێکە لەگەڵ پیسایی ئاژەڵدا دێتەدەر ◊ الخُذاوِيَّةُ من الآذان: گوێچکە سوك.

**خَرِئَ**: پیسایی کرد.◊ اَلْخُرْءُ: ریخو قشپل، پیسایی ئادەمیزاد ◊ اَلْمَخْرَأَةُ: شوێنی پیسایکردن، ئاودەست ◊ اَلْمَخْرُوءَة: بەمانا (المَخرَأة) دێ.

**خَرَبَ** خَرْباً: بوو بەدزو جەردە ◊ خَرَبَ الشَّئَ: شتەکەی کونکرد دڕاندی ◊ خَرَبَ دینه: ئایینی خۆی شێواند شكو گومانی تێدا پەیداکرد ◊ خَرَبَ الشَّئَ: شتەکەی سەقەت کرد بێ سودی کرد لەکاری خست ◊ خَرَب فلاناً: لەکلۆتی دا ◊ خَرَبَ الشَّئَ خرباً وخرابةً: شتەکەی دزی ◊ خَرِبَ خرباً وخراباً: شتەکە لەکار کەوتو سودی نەما ◊ خَرِبَ المكان: شوێنەکە چۆڵ بوو کەسی تێدانەما ◊ خَرِبَ الحیوانُ: ئاژەڵەکە گوێچکەی هەڵدڕا ◊ (هو أخرب وهی خرباءُ) ◊ أخْرَبَهُ: وێرانی کرد ◊ أخربه فلاناً: فلانکەسی بەدز هاتە بەرچاو ◊ خَرَّبَهُ: بەمانا (أخْرَبَهُ) دێ.

**خَرَّبَ** المزادة ونحوها: دەسکی بۆ تێشودانەکە دروست کرد ◊ استخرَبَ: بەمانا (خَرِبَ) دێ ◊ دەگوترێ: (استخرب فلان): فلانکەس بەهۆی کارەساتێکەوە تێك شکاو نەهامەتی بەسەردا هات.◊ الخَرابَةُ: کونی پانو پۆڕی کەوانەیی ◊ خَرابَةُ الأبرة: کونی دەرزی.

**خُرابَةُ** الوَرِك: سەری ئێسقانی ران لەناو قەپۆڵکی حەوزی دا ◊ الخُرْبُ: تورەکەیەکە شوان تێشووی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ◊ (زاراوەیەکی زانایانی عەوروزە) ◊ الخَرْبُ: بەمانا (الخَرْب) دێ ◊ شوێنێك درەختی (غەضای) لێ بڕوێ ◊ الخَرَبُ: کەوانەیەکە لەسەروی ورگی ئەسپەوەیە ◊ توکی خوار ئەژنۆی ئەسپ ◊ نێرینەی حوبارا ◊ الخَرْبُ: قەراخی کێو؛ دەرەوەی سنوری کێو ◊ الخَرْباءُ من المعز:

ئەو بزنەیە گوێچکەی هەڵدڕابێ ○ **اَلْخَرِبَانُ:** ترسنۆك ○ **الخَرِبَةُ:** بێزینك ○ عەیبو لەککە ○ شەرمگا ○ هەڵە ○ حەیاچون ○ قسەی ناشیرین ○ **اَلْخُرْبَةُ:** کونی گەورەو کەوانەیی ○ **خُرْبَةُ المزادة:** قلفەی تێشودانی شوان ○ سەرهەنێسقانی ران ○ **الخِرْبَةُ:** شوێنی وێرانە؛ کاولەکۆن ○ **اَلْخَرَبَةُ:** بەڵاو کارەسات ○ تاوان ○ عەیب ○ **اَلْخَرِبَةُ:** شوێنی وێرانە، کاولەکۆن ○ **اَلْخَرُّوبُ:** خرنوك ○ روەکێکە بەخۆیو بەبەرەکەشی دەگوترێ: خرنوك ○ بەرێکی درێژکۆڵەی هەیە لەشێوەی گورچیلەدایە ○ بەرەکەی تفتە، لەگەڵ زەردێنەی هێلکەدا دەکرێتە دەرمانی چاو ئێشە بۆ زۆر دەرمانی تریش بەکاردەهێندرێ، بەرەکەی دەخورێ، ئالفێکی باشیشە بۆ ئاژەڵ ○ **الخَرُّوبة:** (لەزاراوەی ئاڵتونچیەکاندا) دەنکە دانەوێڵەیەکە زێڕی پێ دەکێشرێ ○ **الخِرِّبُ:** کاڵەك لە پەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (دوو خەربوز بەدەستێك هەڵناگیرێ) ○ **خَرْبَشَ الشَّيْءَ:** شتەکەی تێکدا لەکەڵکی خست ○ یان شتەکەی قایمو قۆڵو رێكو پێك نەکرد ○ **الخِرْبَاشُ:** تێکەڵیو پێکەڵیو هەراو هۆریا ‹ **خَرْبَصَ الأشياءَ:** شتەکانی لێك هەڵاوارد ○ **خَرْبَصَ الدابَةُ الزرعَ:** وڵاخەکە زۆری لەکشتوکاڵەکە خوارد هیچی نەهێشتەوە ○ **خَرْبَقَ في مشيه خربقةً وخِرْباقاً:** پەلەی کرد لە رۆیشتندا ○ **خَرْبَقَ النبتُ:** گژو گیاکە تێك هاڵا ○ **خَرْبَقَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بڕییەوە ○ **اخْرَنْبَقَ:** بەزەوییەوە نووساو جوڵەی بۆ نەکرا ○ **الخِرْباق:** ئافرەتی درێژی کەتەو زەبەللاح ○ ئافرەتی خۆشڕۆ ○ **الخِرِيقُ:** حەوزێکە ئاوی تێدا کۆ دەکرێتەوە ○ تەنکی گەورە.

**خَرَتَ** الطريقُ بـه الى كـذا: رێگاکە بەرەو ئەوێی برد.

**خَرَأَ** الشَّيْءَ: شتەکەی شەق کرد دایدڕی ○ کونی کرد ○ **خَرَتَ** الأرضَ: رێگاو کونو قوژبنی زەوی شارەزا بوو.○ **الخرتُ:** کون؛ کونی بچکۆلە ○ **أخرات المفاوز:** رێچکەو تولەرێی چۆڵەوانیو کێوو کەژ ○ **الخُرْتُ:** کونو کەلەبەر ○ سەگو گورگی گورجو گۆڵ ○ **الخُرْتَةُ:** کون ○ ئەڵقەو قوڵفە، (سەرە قەیاسەو گوریس) ○ **الخِرِيت:** چاوساغی شارەزا بەرێگای بیابان ○ لێزان لەکاروباردا ○ **اَلْمَخْرَتُ:** رێگای راستو ئاشکرا ○ **خَرِفَت المرأة خرفاً:** ئافرەتەکە هەردوو کەلەکەی قەڵەو قش بوونو گۆشتی شۆڕبووەوەو شل بوو ○ **الخِرثاء:** مێرولەیەکی مەیلەو سوورە ○ **الخُرثِيُّ:** شتومەکی ناوماڵ ○ یان خراپترینو بێ کەڵك ترین شتی ناوماڵ ○ قسەی پڕو پوچ.

**خَرَجَ:** لە شوێنی خۆی چووە دەر یان لەو بارو دۆخەی تێیدا بوو ڕزگاری بوو ○ **خَرَجَ** من الأمر أو الشدة: لەوکارە یان لەو ناخۆشییە رزگاری بوو ○ **خَرَجَ** على السلطان: لەپاشا قاچاخ بوو ○ **خَرَجَ** في العلم: لەزانیاری دا پێشکەوت ○ **خَرَجَ** السحابُ: هەورەکە بەرفراوان بوو بڵاو بووەوە ○ **خَرِجَ** خرجاً: بوو بە دورەنگ ○ رەنگاو رەنگ ○ **خَرِجَ** العام: ساڵەکە هەندێکی هەرزانیو هەندێکی گرانی بوو ○ **خَرِجَ** النعام: نوعامە بەڵەك بوو هەندێکی رەشو هەندێکی سپی ○ **خَرِجَ** الشاة: مەڕەکە کەلەکەو قاچەکانی سپیو باقی جەستەی رەش ○ **أخْرَجَ فلان:** فلانکەس خەراجو سەپانانەی خۆی دا ○ نوعامەیەکی بەڵەکی گرت ○ **اخرجت الراعيه:** مەڕەکە هەندێ لەپاوانەکەی خواردو

هەندێکی جێ هێشت ◊ أخـرَجَ النـاسُ: خەڵکەکە ساڵێکیان بەسەردا تێپەڕی نیوەی هەرزانیو نیوەی گرانی بوو ◊ أخرج الحديثَ: فرمایشتەکەی پێغەمبەری بەڕشتەی ڕاستو دروستەوە ریوایەت کرد ◊ أخـرج الشَّيْءَ: شتەکەی دەرکرد ◊ أخرج الرواية أو المسرحية: لەسەر شاشە یان لەسەر شانۆ بەشێوەی فەنی مەسرەحییەکەی رانواند ◊ خَرَّجَهُ في العلم والصّناعة: فێری زانیاریو پیشە سازی کردو کارامای کردو زانیاری پێدا ◊ قوتابییەکەی پێگەیاند ◊ خَرَّجَ خَيْلَهُ: ئەسپو وڵاخەکەی رامکرد ◊ خَرَّجَ الأرضَ: زەوییەکەی خەرساندو خەراجو عوشری بۆ دیاری کرد ◊ خَرَّجَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەدوو رەنگ رەنگ کرد ◊ خَرَّجَ الغلامُ لوحَهُ: قوتابییەکە لەوحەکەی هەندێکی رەنگ کردو هەندێکی رەنگ نەکرد ◊ خَرَّجَ فلان عمله: فلانکەس کارەکانی جۆراو جۆرکردن ◊ اخْتَرَجَ: شتەکە دوو رەنگ بوو ◊ اخترج الشَّيْءَ: شتەکەی دەرخست، دەری هێنا ◊ اخترج فلاناً: داوای لەفلان کرد بێتە دەر بۆلای.

تَخارج القومُ: هەریەکێ لەو خەڵکە بە ئەندازەی هاوەڵەکەی بژێوی دابین کردو هاوبەشی لەکۆمەکییەکەدا کرد ◊ اخْتَرَجَ الشركاءُ: هەریەکێ لەهاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بۆ هاوەڵەکەی بە فرۆشتن دیاریکرد ◊ تَخَرَّجَ في فن كذا: لەو فەننەدا دەرچوو، فێری بوو ◊ إِخْرَجَّ النعامُ: نوعامەکە بەڵەك بوو ◊ إِخْراجَّ النعامُ: نوعامەکە بەڵەك بوو ◊ استخرجَهُ: داوای لێکرد بێتە دەر بۆلای ◊ استخرجَ الشَّيْءَ من المعدن: شتەکەی لەکانزاکە دەرهێناو لەقورو تەپو تۆز پاکی کردەوە ◊ أُستُخرِجَتِ الأرضُ: زەوییەکە چاکرا بۆ کشتوکاڵو رواندن ◊ اَلتَّخريجُ:

یارییەکی منداڵی عەرەبە ◊ الخارجِيّ: ئەوشتەی بەسەر هاوو وێنەکانی دا باڵادەست بێ ◊ کەسێك ببێتە گەورەو بنەماو وەجاخزادە نەبێ ◊ کەسێك لەپاشاو فرمانڕەوا یاخی ببێ، یان بەگوێی نەکا ◊ هەروا ناوە بۆ تاکی خەواریجەکان ◊ وزارة الخارجية: دامو دەزگایەکە کارو باری دەرەوەی وڵات جێبەجێ دەکا ◊ الخَراجُ: ئەو بەرو بوومەیە لەزەوی کشتوکاڵی دەردەهێندرێ ◊ الخَرَاجُ: باجو گومرگو سەرانەو مەرانەو ئەم شتانەش دەگرێتەوە ◊ البلاد الخراجية: ئەو وڵاتەیە سوپای ئیسلام بەناشتی دەستی بەسەردا گرتووە.

اَلخَرْجُ: ئەوشتەی لەزەویو شتی تر وەبەرهەم دێو دەبێتە واریدات. خَرجُ السحاب ئەو بارانەیە بەهێواشی لەهەور دێتە خوارەوە ◊ هەروا وشەی. اَلخَرجُ: پێچەوانەی (الدخل) دێ ◊ گومرگو باجی ساڵانە.

الخُرْجُ: خوێدانو تورەکەو جەواڵە بچکۆلەیەکە لە مو یان لەچەرم دروست دەکرێ دوتایە بەئەم دیوو ئەودیوی پشتی وڵاخدا شۆڕدەکرێتەوەو شتی تێ دەکرێ تێرەو هۆرپشی پێ دەگوترێ ◊ الخُرَجَةُ: کەسێك زۆر لەماڵ دەربچێتە دەرەوە ◊ الخُروجُ: ملدرێژ ◊ الخَوارِجُ: پێڕێکن لەپێڕە ئیسلامییەکان ◊ اَلمَخْرَجُ: شوێنی لێ هاتنە دەرەوەی شت. خَرْخَرَ الماءُ: ئاوەکە خورە خوڕی دێ ◊ خَرْخَرَ النائم: خەوتۆکە پرخەپرخی دێ ◊ پرخەی هات ◊ تَخَرْخَرَ بطنُهُ: سکی چوو، سکی قوڕە قوڕی لێ هات ◊ تخرخر الرجل: پیاوەکە لەبەر بێ هێزی لاژە لاژیەتی ◊ تخرخرت المرأةُ: ئافرەتەکە دوای قەڵەوی زەعیفو لاواز بوو ◊ اَلخِرْخِرُ: حوشتری شیر زۆر ◊ پیاوی ژیان نەرمو نۆڵ ◊ الخُرْخور: بەمانا (الخِرخَرُ) دێ.

**خَرِدَ** خَرداً بێ دەنگییەکەی درێژەی کێشا.٥ **خرِدت اللؤلؤةُ**:مرواریەکە بەکون تێنەکراوی مایەوە ٥ **خرِدت الفتاة**: ئافرەتەکە بەکچی مایەوەو بوو بەقەیرەو شوی نەکرد.٥ **خَرِد** فلان:فلآنکەس زۆر بەشەرمو حەیا بوو.٥ **خَرِد** صوته:دەنگی نزمو لەسەرە خۆ بوو نیشانەی شەرمی پێوە بوو ٥ بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا ٥ **اخرد الرجل الی اللهو**: پیاوەکە بەلای لەهوو لەعەبدا چوو حەزی لەوە بوو ٥ **تخرَّدَت الجارية**: بەمانا (خَرِدَتْ) دێ.٥ **الخُرْدَةُ**:هەرمالێك وردو پارچە پارچەبێ.٥ **الخَرُودُ**:ئافرەتی بەزەوقو زیندو گەشەدار ٥ کچی دەست لێ نەدراو ٥ **الخريد**: بەمانا (اَلْخَرُود) دێ ٥ **الخريدةُ**: بەمانا (الخريد) دێ، هەروەها دەنکە لولوئی کون نەکراو ٥ **اَلْخُرْدِيقُ**: شورباوی بەگۆشتەوە ٥ **خَرْدَلَتِ النخلةُ**: دراخورماکە زۆری لەبەرەکەی بەنەکاملی هەڵوەراندو ئەوی مایەوە دەنکەکانی گەورە بوون ٥ **خَرْدَلَ اللحمَ**: گۆشتەکەی پارچە پارچەکردو لێکی جیاکردەوە ٥ **خردلَ الطعامَ**: خوراکە باشەکەی خوارد ئەوی دی وەلانا ٥ **خردَلَ فلاناً**: فلآنکەسی بەعەردی داداو رەمی کرد ٥ **الخَرْدلُ**: گیایەکە لە حەقلو دەورو بەری رێگاکاندا دەروێ تۆوەکەی بۆ دەرمان بەکاردێ ٥ **الخُرْدُلَةُ**: هەرئەندامێکی جەستە کە گۆشتن بێ ٥ **خُرْذُلٌ**: بەمانا (خَرْدَل) دێ.

**خَرَّ** الماءُ والريحُ:ئاوەکە خورەی هات٥ رەشەباکە وژەی هات.٥ **خَرَّ** البناءُ خَرّاً وخُروراً:بیناکە روخاو هارەی کرد.٥ **خَرَّ** الشَّيْءَ:شتەکە کەوتە خوارێ.٥ **خَرَّ** ساجداً:کەوتە سوژدە.

**خَرَّ** فلانٌ:فلآنکەس کەوتە نازو نیعمەتەوە ٥ مرد ٥ تێپەرِی.

**خَرَّ** فلان علی فلان:فلآنکەس هێرشی کردە سەر فلان.

**خَرَّ** القومُ:خەلْکەکە لەشوێنێکەوە کواستیانەوە بۆ شوێنێکی تر.

**خَرَّ** الماءُ الأرض خرّاً:لافاوەکە زەوییەکەی هەڵدڕیو پێیدارۆیی ٥ **أخَرَّهُ**: خستیە خوارێ ٥ **انْخَرَّ**: کەوتە خوار ٥ **انْخَرَّ الرجلُ**: پیاوەکە شلو شێواو شلەپەتە بوو ٥ **الخرّارَةُ**: سەرچاوەی کانی ٥ دارێکی بچکۆلەیە مندالْ پەتێك لەسەرێکیانی دەخا، سەرەکەی تری پەتەکە دەگرێو هەڵیدەخولێنێ دەنگێکی لێدێ

**الخُرُّ**:بنکی گوێچکە، گەروی بەرداشی ئاش ئەو شوێنەی لە دۆێلەکەوە گەنمەکەی تێدەرژێ ٥ زەوییەك لافاو هەڵیدڕیبێ.

**اَلْخَرِيرُ**:دەنگێکە پەیدا دەبێ لەتیژ رۆیشتنی ئاو یان لەبالْی بالْندەی کەخێرا دەفرێ ٥ شوێنی نزمایی نێوان دوو گردۆلْکە ٥ **الخِرِّيانُ**: ترسنۆك.

**خَرَزَ** الجلد وغوه:پێستەکەی دروەوە.

**خَرِزَ** خَرَزاً:کاری خۆی قاییمو پتەو کرد ٥ **خَرَّزَهُ**: بەراوێزی چنی، بەمیروو شیرازە چنی کرد ٥ **الخِرازة**: پیشەی مێرو هۆنینەوە ٥ **اَلْخَرّازُ**: میرو دروستکەر ٥ زیندرو ئەوکەسەی چەرم دەدروێ ٥ **الخَرَزَة**: میروی ملوانکەو تەزبیح.

**اَلْخُرْزَةُ**:هەموو کونێكو پەتێك کە لەچەرم بێ ٥ **اَلْمِخْراز**: ئەو شتەی پێستی پێ دەدورێتەوە (درێوشە).

**خَرِسَ** النُّفَساء خَرْساً:خۆراکی خورسەی بۆ ئافرەتە زەیستانەکە دروستکرد خۆراکی خورسە خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەیستان لێ دەنرێ ٥ خۆراکی خورسەی دەرخوارد دا.

**خَرِسَ** خَرَساً:زمانی گیراو قسەی بۆ نەکرا ٥ **خَرِسَتِ الكتيبةُ**: هێزە سەربازەکە زۆر بەویقارو

لەسەرەخۆبون دەنگی تەقەو ڕەقەو بگرەو بردەیان نەبوو.

**خَرَسَ اللبنُ**: شیرەکە خەست بوو کەرۆیان کردە ناوشتی ترەوە خوڕەی نەهات.

**خَرَسَ السحابُ**: هەورەکە گرمەو بروسکەی نەبوو.

**خَرَسَ الماءُ**: ئاوەکە لەڕۆیشتنی دا خوڕەی نەهات.

**خَرَسَ الجبلُ**: کێوەکە دەنگی نەدایەوە ◊ **خَرَسَت الأرضُ**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات.

**خَرَسَ فلان** بەکوپە ئاوی خواردەوە ◊ شەونەنوست بێدار بوو ◊ **أخرست الأرضُ**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات ◊ **أخرَسَ الله فلاناً**: خودا فلانکەسی توشی کەڕیی کرد ◊ **خَرَّسَ على النفساء**: حەڵوای بۆ ئافرەتە زەیستانەکە کرد ◊ **تخرست المرأةُ**: ئافرەتەکە حەڵوای بۆ خۆی دروست کرد ◊ لە پەندی پێشینانداهاتووە ◊ **استخرسَت الأرض**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات ◊ **الخِراسُ**: خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەیستان دروست دەکرێ ◊ یان بەبۆنەی منداڵبوونەوە دروست دەکرێو خەڵکی بۆ بانگ دەکرێ ◊ **الخَرَّاسُ**: کوپەو کۆڵینە دروست کەر وەستای کۆڵینەو کوپە ◊ فرۆشیاری کوپەو کۆڵینە ◊ عەرەق دروستکەر.

**الخُرْسُ**: کوپەی گەورە ، کۆڵینە.

**الخُرْسُ**: بەمانا (الْخِراس) دێ.

**الخَرْسُ**: بەمانا (الخَرَس) دێ ◊ زەوییەك بەکەڵکی کشتوکاڵ بێ ◊ **الخَرْسَاءُ**: ماری گەورە ◊ بەڵاو کارەسات.

**الخُرْسَةُ**: ئەو خواردەمەنییە بۆ ئافرەتی زەیستان دروست دەکرێ ، حەڵواو شیرینی بۆ ئافرەتێك تازە منداڵی بووبێ ◊ **الخَرُوسُ من النساء**: ئەو ئافرەتەیە لەدوای ئەوەی منداڵی دەبێ حەڵوای بۆ دروست دەکرێ بۆ ئەوەی تا چەند ڕۆژێك ئەو خواردنە شیرین تامەبخوا ◊ ئافرەتێك یەکەمجار بێ منداڵی ببێ ◊ ئافرەتێك شیری کەم بێ ◊ **تَخَرْسَنَ**: هاتە خوراسان، لە خوراساندا مایەوە ◊ داب و نەریتی دنیشتوانی ئەهلی خوراسانی وەرگرت ◊ **الخَرْسانة**: چیمەنتوو بەردو چەوو لم و ئاو تێکەڵ دەکرێ بەزۆری بۆ بناغەی بینا بەکاردەهێندرێ، وادەبێ شیشی تێکەڵ دەکرێ.

**خَرَشَ** من الشَّيْءِ خَرشاً: لەشتەکەی وەرگرت.

**خَرَشَ لأهله**: کاروکاسبی بۆ ماڵ و منداڵی خۆی کرد.

**خَرَشَ الجَسَدَ**: پێستی لەشی ڕنی و ڕوشاندی بەنینۆك.

**خَرَشَ البعيرَ**: حوشترەکەی بەگۆچان بۆلای خۆی کێشکرد.

**خَرَشَ الغُصْنَ**: لقەدارەکەی بە قەلاَنگ داهێناو لەخۆی نزیك کردەوە.

**خَرَشَ الدابَّةَ**: وڵاخەکەی داخ کرد.

**خَرَّشَ الذُّبابُ فلاناً**: مێشەکە، زەردەواڵەکە فلانکەسی گەست ◊ **خارَشَهُ مُخارَشَةً**: جەستەی یەکتریان ڕوشاند ◊ **خَرَّشَ الزرعُ**: سەرێکی دەنکە میوەکە لەگوڵەکەی دەرکەوت ◊ **خَرَّشَ الجَسَدَ**: بەمانا (خَرَشَهُ) دێ ◊ **اخْتَرَشَ لأهلِه**: کاسبی بۆ ماڵ و منداڵی کرد ◊ **اخْتَرَشَ الجَسَدَ**: بەمانا (خَرَشَهُ) دێ ◊ **اِخْتَرَشَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وەرگرت و بەدەستی هێنا ◊ **تَخارَشَت الكلاب والسنانير**: سەگەکان پشیلەکان یەکتریان شڕو وڕ کرد ◊ **الخِراشُ**: داخێکە لاکێشەیە پێستی ئاژەڵی پێ داخ دەکرێ ◊ **اَلْخُراشَةُ**: ئەو وردەو پرژو پاڵەی لەکاتی بڕینەوەو شکاندنی شتدا دەکەوێتە خوار.

**الخُرْشُ**: شتی پرو پوچی ناوماڵ؛ کەل‌و پەلی بێ نرخ‌و لەکارکەوتووی ناوماڵ ٥ پیاوێک لەترسان یا لەبرسان خەوی کەم بێ ٥ یان ئەرکی سەرشانی بێ ئەونەنوێ حەرەسی شتێك بێ.

**الخُرَشُ**: شتی خراپ‌و بێ نرخی ناماڵ.

**الخِرْشاءُ**: توێکڵی سەرەوەی هێلکە توێکڵە تەنکەکە ٥ توێژی مار ٥ سەرتۆێژی ماست‌و شیر ٥ مێوو کەرەشانی هەنگوێن یان ئەو هەنگانەی لەناو هەنگوینەکەدا مردون ٥ **خِرشاء الصدرِ**: ئەو بەڵغەم‌و لینجاییە کە لەسینگ دێتەدەر ٥ تەپ‌و تۆز ٥ **اَلْخَرَشَةُ**: مێش ٥ **اَلْمِخْرَاشُ**: دارێکە پێستی پێ نیشانە دەکرێ ٥ گۆچان (دارێکە لایەکی کەوانەیی دادێندرێ ٥ **الِخْرَشُ**: بەمانا (اَلْمِخْرَاشِ) دێ ٥ **المِخْرَشَةُ**: بەمانا (المِخْراش) دێ ٥ **خَرْشَبَ عَمَلَهُ**: ئێشەکەی باش ئەنجام نەدا.

**الخُرْشُبُ**: درێژو قەڵەو ٥ **خَرْشَفَ القوم**: خەڵکەکە کەوتنە جم‌و جوڵ‌و هەراو هۆریا ٥ **الخِرْشافُ**: زەوی رەقەڵان‌و پتەو کە نەتواندرێ رۆیشتنی لەسەر بکرێ ٥ **الخَرْشَفَةُ**: بەمانا (الخرشاف) دێ ٥ **اَلخُرشُوفُ**: روەکێکی وەرزانەیە گوڵەکەی ئونبوبییە بەرەکەی بەگەڵا داپۆشراوە دەکوڵێندرێ دەخورێ ٥ **خَرْشَمَ الرجلُ**: پیاوەکە دەم‌و چاوی دزێوبوو ٥ **اخرَنْشَمَ**: خۆی بەزلزانی‌و لەدڵی خۆی دا خۆی پێ پەسەند بوو ٥ ڕەنگی گۆڕاو گۆشتی پێوەنەما ٥ **الخِرْشِمُ**: (جبل خِرشم) کێوێکی وشك‌و رەق‌و تەق ٥ **الخِرْشِمَةُ**: ئەوەیە کەزەوی پتەو بێ وەکوو بەردە زڕوێ، رەقەڵان‌و سەخت بێ وشك‌و بێ ئاوبێ ٥ **الخُرْشُومُ**: دوندی کێو، لوتکەی کەژ.

**خَرَصَ** خرصاً: درۆی کرد.

**خَرَصَ** الشَّيْءَ: لەخۆیەوە شتەکەی مەزندە کرد ٥ **خُرّاص**: زۆر مەزندەکارو لێزان لەخەرساندنی باخە خورماو باخە مێودا.

**خَرَصَ** النَّهرَ: بەری چەمەکەی گرت.

**خَرَصَ** الشَّيْءَ خِراصةً: شتەکەی چاك کردەوە.

**خَرِصَ** خَرَصاً: برسیایەتی‌و سەرمای توش بوو ٥ **اختَرَصَ**: درۆی کرد ٥ **تَخَرَّصَ**: بەناڕەواو بەتاڵ درۆی هەڵبەست ٥ **تَخَرَّصَ القولَ**: بەمانا (اخترصه) دێ ٥ **الخِراصُ**: رمب ، سەرە رمب.

**الخَرْصُ**: بەمانا (الخِراص) دێ ٥ ئەڵقەی زێڕ یان هی زیو ٥ گوارەی یەك گۆ ٥ کوپەو کۆڵینە ٥ زەنبیلەی دوو قوڵفە.

**الخُرْصُ**: بەمانا (اَلْخِراص) دێ ٥ هۆرو جەواڵ‌و خەرار ٥ لقی درەخت ٥ ئەڵقەی زێڕو زیو ٥ **اَلْخُرْصَةُ**: خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەییستان ئامادە دەکرێ ٥ **اَلْخَرِيصُ**: بەمانا (الخِراص) دێ ٥ ئەستێرە ئاوێکە لەروبارەوە ئاوی تێ دێ‌و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو روبارەکە ٥ ئاوی سارد ٥ **اَلْمِخْرَصُ**: بەمانا (الخِراصُ) دێ، خەنجەر ٥ دارێکە هەنگوێنی پێ لەکۆڵەس دەر دەهێندرێ، (ك: مخارص)٥ ٥ **خَرَطَت الدابّةُ خِراطاً**: وڵاخەکە سەرکەش بوو ڕێشمەکەی لەدەست خاوەنەکەی ساندو رۆیی ٥ **خَرَطَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە سەرکەش بوو قسەی ناشیرین‌و جوێنی ئاڕاستەی بەرامبەرەکەی کردن.

**خَرَطَ** في حديثه: لەقسەکانی دا درۆی کرد.

**خَرَطَ** في الأمر: لە ئیشەکەدا پێکیشی لەراو بۆچونی خۆی کرد ٥ قسەی کەسی قبوڵ نەبوو ، هەر قسەی خۆی بەلاوە پەسەند بوو.

**خَرَط** الشَجر: گەڵای درەختەکەی رنی.

**خَرَط** العنقود: هێشوی میوەکەی خستە ناو چنگی خۆیەوە.

**خَرَط** الدَواءُ فلاناً: دەرمانەکە سکی فلانکەسی چواند.

**خَرَط** الإبل في المرعى: حوشترەکەی بەرەڵای ناو لەوەڕگاکە کرد.

**خَرَط** تابعه على الناس: رێگای بەهەوا خواهانی خۆی دا زیان بەخەڵك بگەیەنن.

**خَرَط** العود: دارەکەی سپی کرد توێکڵەکەی لێکردەوەو رێکی خست.

**خَرَط** الأشياء: شتەکانی هەموو لەخەریتەیەکدا کۆکردەوە.

**خَرَط** الحديد: ئاسنەکەی وەکوو تەڵە درێژ کردەوە ٥ **خَرِطَت اللبنُ خَرَطاً**: حوشترەکە شیری بەناخۆشی هاتەدەر یان شیرەکەی هاتە دەرو ئاوێکی زەردی لەگەڵدا بوو.

فلانکەس خواردنەکەی لەقورگ گیرا ٥ **اخْرَطت اللبنُ**: بەمانا (خرطت) دێ.

**خَرِطَ** خريطة: نەخشەکەی کێشا ٥ **خَرَّطَ الدواءُ فلانًا**: بەمانا (خَرَطَهُ) دێ ٥ **اخْتَرَطَ في البكاء**: کەوتە گریان‌و ژێر نەبووەوە.

اخْتَرَطَ العنقودَ هێشوە میوەکەی خستە دەمیەوەو لاسکەکەی بەروتی لەدەم هێنایە دەرو بۆڵەکانی لەناو دەمی دا مانەوە ٥ **إخْتَرَطَ السيفَ**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا ٥ **إنْخَرَطت الدابّةُ**: بەمانای (خَرَطَتْ) دێ ٥ **انْخَرَط الصقرُ**: بازەکە کەوتە خوار ٥ **انْخَرَط جسمُهُ**: جەستەی لاواز بوو ٥ **انْخَرَط الفرسُ وغيره في العدو**: ئەسپەکە یا وڵاخەکە لە غاردان تیژڕۆ بوو ٥ **انْخَرَط عليه بالقبيح**: بەقسەو ئوسلوبی ناشیرین روی تێکرد ٥ **تَخَرَّطَ في الأمر**: لەکارەکەدا هەر رای خۆی پێ پەسەند بوو گوێی نەدایە راوو بۆچوونی کەسانی تر ٥ **اسْتَخْرَطَ في البكاء**: دەستی دایە گریان‌و ژێر نەبووەوە ٥ **الاِخْرِيطُ**: روەکێکە لەخۆشترین گیا ترشۆکەکانە، حوشتر حەزی لێ دەکا ٥ **الخُرَاطَةُ**: ئەو وردەو پرژو پاڵەیە لەئاکامی برینەوەو تاشینی شت دەکەوێتە خوار ٥ ئاوێکی کەم لەگواندا ٥ **خراطة الامعاء**: ئەو شتەیە لەکاتی سکچونی بەردەوامدا لە ریخۆڵە دێتە دەر ٥ **الخَرَّاط**: کارتیخ؛ ئەو ئاسنە گرگرناوییە بە دارو ئاسن دەڕنێ ٥ **الخِرْطُ**: شیری مەیی‌و کە ئاوێکی زەردی بکەوێتە سەر ٥ **الخريطة**: تورەکێکە لە پێست دروست دەکرێ دەمەکەی دەبەسترێ ٥ **اَلْمِخْرَاطُ**: لەئاژەڵی شیردەردا بەوانە دەگوترێ شیرەکەی خەست بێ یان ئاوێکی زەردی تێکەڵاوبێ بەهۆی نەخۆشییەوە ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێری رنین وەکوو کارتێخ‌و برەمەند ٥ **اَلْمِخْرَطُ**: ئامێری رنین‌و هەڵکڕاندن وەکوو برەمەندو کارتێخ (ك: مخاريط) ٥ **المِخْرَطَة**: بەمانا (المِخْرَطُ) دێ ٥ **المَخرُوطُ**: شتێك وەکوو مزراح وابێ سەرەوەی پان بێ‌و وردە وردە باریك بێتەوە تا دەگاتە خاڵی سفر یان روبەرێکی بچوك تر ٥ **الخَرْطُوش**: ئاواخنی چەکی ئاگرین واتە: باروت ٥ **خَرْطَمَهُ**: لەلوتی دا ٥ لوتی خوارکرد ٥ **اِخْرَنْطَمَ**: لوتبەرزیی نواند ٥ خۆی بەزلزانی، لوتی خۆی وەرگێڕاو رق‌و کینەی خۆی خواردەوە ٥ **الخُراطِمُ**: لەئافرەتدا بەوانە دەگوترێ: بەساڵاچووبێ ٥ **الخُرْطومُ**: لوت، کەپو ٥ سەری لوت ٥ دەگوترێ: (خرطوم الفيل) (خرطوم الخنزير)، دەگوترێ: (وسَمَهُ على الخرطوم) زەلیل‌و ڕیسوای کرد ٥

خراطيم القوم: گەورەو پیاو ماقوڵانی خەڵك ٥ اَلْخُرْطُمــانيُّ: لــوت زل، کەسێــك کــەپوی زۆر گەورەبێ ٥ الخراطين: کرمی درێـژ لـەناو قـوڕو لیتەی روبارەکاندا.

خَرَعَ الشَّيْئَ خَرْعاً: شتەکەی شەقکرد.

خَرِعَ الشَّيْئُ: شتەکە نەرم بوو داچۆڕا بێ هێز بوو.

خَرِعَ فلان: فلانکەس دەهشەت گرتی.

خَرُعَ خراعة وخروعة: بەمانا (خَرِعَ) دێ.

خُرِعَ خُراعاً: ساغو سەلیم بوو کەوتو مرد ٥ شێت بوو ٥ خَـرَّعَ الثَـوبَ: کراسـەکەی بـەتۆو زەعفەران رەنگ کرد ٥ اخْتَرَعَهُ: بەمانا (خَرَعَهُ) دێ ٥ شتێـکی تـازە قـەڵای داهێنـا؛ دروسـتی کـرد ٥ بەسـەر بـێو گـۆزو گومـمـەتو بـێ لێوردبوونـەوە وتارەکـەیدا ٥ قەصیدەی دانا ٥ اخترع فلاناً: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند ماڵەکەی برد ٥ اخْتَرعَ الدابَّةَ: وڵاغەکەی هەوسارکرد ٥ دای بەیەکێـکی تـر سودی لێ وەربگرێ، دوایـی لێـی وەرگرتـەوە ٥ اَنْخَـرَعَ: دولـەت بـوو، قلیشا ٥ نەرم بوو داچۆڕا، شۆڕ بوومەوە ٥ انْخرَعُ الرجـلُ: پیاوەکـە زەلیـلو لاواز بـوو ٥ انْخَـرَعَ العضوُ: ئەندامێـکی جەسـتەی لـەجێ چـوو لەشوێنی خۆی خزا ٥ تَخَرَّعَ: بەمانا (إنْخَرَعَ) دێ ٥ الخُراعُ: دابڕانێـك لـە پشتی حوشـتردا پەیـدا دەبێ ٥ الخَرَاعَـةُ: بـێ حـەیایی و روتو قـوتیو سـفوری و بەدڕەوشـتی ٥ الخِرْيَـعُ: دەنکـە تـۆوی گیازەعفەران.

اَلخَرَعُ: نیشانەو داخێـکە لەگوێی مـەڕ دەکرێ، سەری گوێـچکەی دەکرێ بەسـێ تلیش، تلیشی ناوەڕاست بۆ دیوی ناوەوە خوار دەکرێتەوە.

الخِرْوَعُ: ئافرەتی بێ شەرمو حەیا تکاو ٥ ئافرەتی نەرمو نۆڵو شلك ٥ الخِروعَـةُ: دەگوترێ: (امرأة خِروعة) ئافرەتێـکی جوانو نـەرمو بارخۆشو رەت نەکەرەوەیە ٥ اَلْخَرِيعُ: بـەمانا (الخِرْيَع) دێ، ئـافرەتی بێحـەیا ٥ هەرشتێـك خێـرا بـشکێ، لیـچی حوشـتر کـە شـۆڕ بوبێتـەوە ٥ الخَرِيعَـةُ: بەمانا (الخَرُوعُ) دێ ٥ الخَرْعَبُ: تولە داری درێژو نـــەرمو تـــازە ڕواوو شـــوڕك ٥ تووڵـــە نەمام ٥ ئافرەتی جوانی رەوشت بەرزی نـەرمو نیـانو شـلك ٥ الخُرعُـوبُ: بـەمانا (الخَرْعَـبُ) دێ ٥ قاشە خەیارو ترۆزی ٥ پارچە بەز.

خَرَفَ في بستانه: لەوەرزی پایزدا لەناو باخەکەی مایەوە بۆ ئەوەی میوەکەی بچنێ.

خَــرَفَ التَّمـر خَرْفـاً وخِرافـاً: لـەوەرزی پـایزدا میوەکەی چنی، ڕنی.

خَرَفَ الماشيةَ: گیاو گژێکی بۆ ئاژەڵەکان رواند تا لەپایزدا بیخۆن.

خَرِفَ خَرَفاً: عـەقڵی تێکچوو ، شێت بوو لەبـەر پیری و کەنەفتی.

خَرُفَ الرجلُ: بەمانا (خَرِفَ) دێ.

خُرِفَ: بارانی پایزی لێباری ٥ أخْـرَفَ: چووە نـاو وەرزی پایزەوە، (أخرفت الدابةُ) وڵاخەکە یـان حەیوانەکە لە پایزدا بێچوی بوو ٥ أخْرَفَ النخلُ: کاتی ئەوە هـات خورماکە بەرەکەی لێبکرێتەوە ٥ أخرفت الذُّرَةُ: زوراتەکە زۆر درێـژ بوو ٥ أخرَفَ القومُ بمكان كذا: خەڵـکەکە وەرزی پایز لەو شوێنە مانەوە ٥ أخْـرَفَ الكِبَـرُ الرجلَ: پـیری و تەمەندرێـژی پیاوەکـەی تێـك داوە ٥ اخْرَفَ فلاناً نخلة: دارخورمایـەکی بـۆ فلانکـەس دیاری کرد تا لە وەرزی پایزدا میوەکەی بچنێ ٥ خارِفَـــةُ: ســـەراپای وەرزی پـــایز مامەڵـــەی

لەگەڵداکرد ٥ لەپایزدا بەکرێی گرت ٥ خُرْفَةُ: بەعەقڵ تێکچوو خەرەفاوی لەقەڵەم دا ٥ اخترف الثمر: بەمانا (خَرَفَهُ) دێ ٥ الخارِف: چاو دێری باخە خورما ٥ الخِراف: کاتی رنین و چنینی مێوە لەوەرزی پایزدا ٥ الخَرافَةُ: ئەو بەرو بومەی لەپایزدا دەچندرێ و دەرِندرێ ٥ اَلْخَرُوفُ: شەکە بەران ٥ خروفة: کاورِ ٥ الخروفَةُ: دارخورما پیاو هەڵیدەبژێرێ و هەڵی دەگرێ بۆ ئەوەی هەرکاتێ ویستی خورماکانی لێبکاتەوە بۆ خواردنی خۆی و ماڵ و منداڵی ٥ الخريف: وەرزی پایز ٥ بارانی وەرزی پایز ٥ (بارانی پەڵە) ٥ سەرەتای بارانی وەرزی زستان ٥ خورماو روتابی چندراوی وەرزی پایز ٥ اَلْخَرْف: شوێنی مانەوە لەکاتی وەرزی پایزدا ٥ باخ و کۆمەڵە درەختی مێوە.

اَلْمِخْرَفُ: زەمبیلەی بچوك کە مێوەی هەڵبژاردەی بەتامی لەوەرزی پایزدا تێدا دەچندرێ ٥ اَلْمَخْرَفَةُ: باخ و کۆمەڵە درەختە خورما ٥ رێگای ئاشکراو رون ٥ خَرْفَجَهُ: پان و فراوانی کرد ٥ دەگوترێ: (عَيْش مُخَرْفَجٌ) ژیانێکی خۆش و هەرزانی بەرفراوان و بێ تەنگ و چەڵەمە ٥ سراييل مُخرفَجَةٌ: (سراويل مخرفجة) دەرپێی پان و پۆرِ ٥ خرفج فلاناً: خۆراکی باشی بۆ فلانکەس دابین کرد ٥ خرفج الشَّيْءَ: شتەکەی زۆر وەرگرت زۆری لێ هەڵگرت.

الخُرافِجُ: ژیانی خۆش و نەرم و نۆڵ ٥ قەڵەوو گۆشتن ٥ الخِرْفاجُ: ژیانی خۆش و نەرم و نۆڵ ٥ الخُرْفُجُ: بەمانا (الخِرفاجُ) دێ، (خروف خُرْفُجُ) بەرخێکی قەڵەوە ٥ اَلْخِرفيجُ: بەمانا (الخِرْفاجُ) دێ.

الخُرْفُقُ: پەمو کە بەرِوەکی خۆیەوە بێ و کەڵکی نەمابێ ٥ الخَرْفَقُ: خەردەلی فارسی ٥ لەوڵاتی میصر بەحەشیشەی سوڵتان بەناو بانگە.

خَـرَقَ في البيت خروقاً: لەماڵەوە مایەوەو دەرنەچوو.

خَرَقَ الشَّيْءَ: شتەکەی قەڵشاند درِاندی.

خَرَقَ الأرضَ: زەوی دابرِی تا گەیشتە ئەو پەرِی.

خَرَقَ الكذبَ: درۆی هەڵبەست.

خَرِقَ خَرَقاً: ئەحمەق بوو ٥ لەکارەکەی دا نەرم و نیان نەبوو ٥ دەهشەت گرتی و سەرسام بوو (هو خَرِقٌ).

خَرِقَ الظَّبيُ وخرق الطائر: ئاسکەکە یان باڵندەکە راوکەرەکەی بینی سەری لێ شێوا لە شوێنی خۆی جوڵەی نەکرد ٥ ترساو هیچ پەلەقاژەی راکردن یان فرِینی نەکرد.

خَـرِقَ بالشَّيْ: شتەکەی نەزانی و نەیتوانی ئەنجامی بدا.

خَرِقَ في البيت: بەمانا (خَرَق) دێ ٥ (هو أخرق وهي خرقاء).

خَرُقَ خُرْقاً: ئەحمەق بوو.

خَرُقَ بالشَّيْءَ: شتەکەی نەزانی و بۆی ئەنجام نەدرا ٥ أخْرَقَهُ الفَزَعُ: ترس سەری لێ شێواند.

خَرَّقَ الثَّوْبَ وغَيْرَهُ: درِاوی قوماشەکەی زیادکرد ٥ خَرَّقَ الكَذِبَ: درۆی زۆری هەڵبەست ٥ اخْتَرَقَ الثوبَ ونحوه: قوماشەکەی درِاند ٥ اخْتَرَقَ القومَ: بەناو ناپورِای خەڵکەکەدا رۆیی ٥ اخترقَ دار فلان: ماڵی فلانکەسی کرد بەرِێگای خۆی بۆ پێداویستییەکانی ٥ اخترَقَ الأرضَ: قەد برِ بەناو ئەرزەکەدا رۆیی گوێی بەرِێگانەدا ٥ اخترَقَ الخيل ماَبين القرى والشجر: رەوە ئەسپەکە بەناو

گونـدو درەختەکانـدا بـڵاو بوونـەوە ٥ اَنْخَـرَقَ الشَّيْئُ: شتەکە قڵشا دادڕا.

اِنْخَرَقَـتِ الـرِيحَ فِي الأَرض: رەشـەباکە پێـچاو پـێـچ هاتو هەڵی کرد ٥ رەشەباکەی توند بوو چووە هـەموو کونو قوژبنێـکەوە ٥ تَخَـرَّقَ فِي الكَـرَمِ: لەبەخـشیندا زۆر زێـدە ڕەوی کـرد ٥ تَخَـرَّقَ فِي الكَذِبِ: درۆی هەڵبەست ٥ الخارق: (سیف خارق) شمـشێرێکی بڕنـدەیـە ٥ ڕوداوێـکە ٥ شتێـکە پێـچەوانەی یاسـای سروشـتە ئەگـەر بەشـێوەی تەحەددا بوو دەبێتە موعجیزە ٥ الخُرّيقُ: جۆرە چـۆلەکەیەکە ٥ الخِرِّيـقُ: جوانمـەردی سـەخی سروشتو بەهانا هاتووی لێقەوماوانەوە.

الخَرْقُ: کونی دیوارو شتی تـر ٥ دەشتو سارا ، سارای بەرفراوانو دورو درێـژ کەرەشـەبا پێیـدا بڕوا.

الْخُرقِ: نەزانیو نەفامی ٥ ئەحمەقی.

الخِرِق: بەمانا (الخريق) دێ.

الخَـرِقُ: تـەپو تـۆز ٥ الخَرْقـاءُ: زەوی پـانو بـۆر کەرەشــەبا تــەی بکــا ٥ رەشــەبای تێـــژڕۆ، کەمەردەم بەلایـەکا دەڕوا ٥ ئـافرەتی گێلۆکەی شت نەزان کە دەست رەنگین نەبێ ٥ أذن خَرْقاءُ: گوێـچکەیەك ئەمـدیو ئـەو دیـو کونبـێ ٥ شـاة خرقــاءُ: مەڕێــکە گوێـچکەی کونبــێ کونەکـە کەوانەیی بێ ٥ یـان لەناوەڕاستی گوێـچکەی دا کونەکە هاتبێ تا قەراخی گوێچکەکە.

الخِرْقَةُ: پارچە پـەڕۆی شـڕو وڕ ٥ الخُـرُوقُ: رەشـەبای سـارد ٥ الخَرِيـق: چـاڵو نزمـایی زەوی کـە گیـای لێراوبێو کەوتبێتە نێوان دوو پارچە زەوی بـێ گیـاو گـژ ٥ رەشـەبای سـارد ٥ بـای شـەماڵو هــەوای ســاردو فێنــك کــە کەمکــەم هــەڵبکاو بووەستێتەوە ٥ دەراوی دۆڵو شیو ٥ ڕێـڕەوی ئـاو، کـەمزۆر قـوڵ نـەبێ، بـێ دارو درەختـیش نـەبێ ٥ یـان منداڵـدانی ئـافرەت کـە بـەهۆی منداڵ هاتنە دەرەوە هەڵـدڕابێو گوشتەوەزونی نەهێنابێتەوە ٥ اَلْمُخْتَرَقُ: ڕێڕەوی هەوا شوێنی هەڵبوونیو ڕێڕەوی ڕۆیشتنی ٥ المِخْرَاقُ: پیاوی شۆخو شـەنگـو قـەدو بـاڵا جوانو بـەزن ڕێـکو پێـك ٥ کارو ئیشی ئەنجامـدراو ٥ کـارو ئـیش ئەنجامـدەر (ئـیش لەدەسـت هـاتوو) ٥ مِخْـراقُ حــــرب: شـــەڕەنگێزو تــــێ هــــەڵاتوو لەشــــــەڕاندا ٥ پیـــــاوی ســــــەخیو ڕێـزدار ٥ شمـشێر ٥ مێـزەرو پارچە پەڕۆیـەك لـول دەدرێو بـۆ ترسـاندن پێــی لەمنــداڵ دەدرێ ٥ کەڵـەکێوی ٥ اَلْمَخْـرَقُ: دەشـتی پـانو بـەرین کـە ڕەشـەبای تێـدا هـەڵبکا ٥ اَلْمَخْـرُوقُ: بێکەسو هەژارێـك شتێکی دەست ناکـەوێ بـێ ئاتـاجی بکـا ٥ دەگـوترێ: (هـو مخروق الكف بالنوال) بەهۆی سەخاوەتەوە هیچی بەدەستەوە نەما ٥ خَرْقَـلَ: تیرەکەی لەکەوانـەوە هاویـشت ٥ خَرْقَـلَ فِي رمیــه الــسهمَ: زۆر تفەنگـچییانە تیرەکەی هاویشت.

خَـرَمَ الـشَّيْئَ خَرْمـاً: شـتەکەی کـون کـرد ٥ لـەتی کرد ٥ قەڵاشتی، بڕیەوە.

خَـــرَمَ فلانــــاً: نیــوانی دوو کونــــەلوتی هەڵدڕی ٥ قەراخی لوتی دادڕی.

خَرَمَ الوبـاءُ القـومَ: تاعونەکـە خەڵـکەکەی لـەبێخ دەرهێناو لەناوی بردن.

خَـرَمَ الرامـي القرطـاسَ: هاوێژەرەکە کاغەزەکەی هەنگاوت بەڵام کونی نەکرد.

خَـــرِمَ خَرَمــاً: نیــوان دوو کونــە لــوتی شــەق بوو ٥ گوێچکەی قەڵشاو هەڵدڕا، (هو أخرم وهي خرماء).

**خَرُمَ** خرامةً: توندو پتەو بوو ٥ بێ شەرمو بێ حەیا بوو.

**خَـــرَمَ** الـــشَّيْءَ: شـــتەکەی شـــەق کـرد ٥ بڕییــەوە ٥ اخترمتــه المنیــةُ: مــردن تێکیەوە پێچا ٥ إخْتَرَمَهُ الوباء: تاعون لەناوی برد ٥ انْخَرَمَ: شەق بوو ، دابڕا گۆشە گیر بوو ٥ انْخَرَمَ العامُ: ساڵەکە تێپەڕیو ڕۆیی ٥ انْخَرَمَ القومُ: خەڵکەکە فەوتانو تێدا چون ٥ انْخَرَمَ الکتابُ: کتێبەکە کەمی هەبوو هەندێکی لێفەوتا.٥ تَخَرَّمَ: شەقار شەقار بوو، درزی برد قەڵشا ٥ تَخَرَّمَ فلانٌ: فلانکەس چووە سەر ڕێبازی خورەمییەکان ٥ تَخَرَّمَ زَنْدُ فلان أو زیدە: فلانکەس ڕقەکەی نیشتەوە ٥ یَتَخَرَّمُ زندە: دەیەوێ لەڕێی زۆرو ستەمەوە خۆی فەرزبکا خۆی بسەپێنێ ٥ تَخَرَّمَ الوباءُ القومَ: تاعونەکە خەڵکەکەی لەناو برد ٥ الأَخْرَمُ: گردۆڵکەی ناو بانوو دەشتایی ٥ زلکاوو گەراو ٥ أَخْرَمُ الرأي: کەسێک ڕاو بۆچونی زەعیف بێ ٥ الأخرمان: دوو ئێسقان لەم لاو لەولای مەلاشوی سەرو ٥ أخرما الکتفین: شەپیلکی هەردوشان ٥ هەروا لای خواروی شان ٥ الخرامة: نامێرێکە کاغەزی پێ کون دەکرێ ٥ الخُرَّمُ: بەناز پەروەردە ٥ ڕوەکێکە وەکوو لۆبیا ڕەنگی وەنەوشەیی هەیە ٥ الخُرَّمیــة: شوێنکەوتوانی بابەکی خورەمی ٥ الخَرْماءُ: گردۆڵکەیەکە لەناو دەشتایی یەک دا ٥ قەڵاو شورایەک نەتوانرێ لەم لاو ئەولای بچێتە ناوی ٥ بزن پانەوپان گوێچکەی بپردرێ ٥ درۆزن، (الخُرمانُ) بەمانا درۆزن دێ ٥ الخَرَمَةُ: شوێنی کونە لوت ٥ الخَوْرَمَةُ: پێشی لوت ٥ نێوان دوو کونە لوتی ٥ بەردێک کونکون بێ، ٥ المخرِمُ: ڕێگای ناو کێوو کەژ، یان ڕێگای ناولبەلان ٥ مَخْرَمَ الجبل: لوتکەی کێو ٥ مخارم اللیل: سەرەتای شەو.٥ خَرْمَدَ: لەماڵی خۆی دا مایەوە، سەری لەکۆشی خۆی ژەنیو بێدەنگ بوو ٥ أخْرَمَّسَ: بێدەنگ بوو، زەلیلو گەردن کەچ بوو ٥ الخِرْمِسُ: شەوی تاریک ٥ خَرْمَشَ العملَ أو الکتابَ: کارەکەی تێک دا، کتێبەکەی شێواند ٥ اخْرَمَّصَ: بەمانا (اخْرَمَّسَ) دێ ٥ خَرْمَلَ وَبَرُ البعیر: توکی حوشترەکە لەقەڵەویان بەری دا ٥ تَخَرْمَلَ الثوبُ: قوماشەکە ونجڕ ونجڕ بوو ٥ الخِرْمِلُ: خەڵکی زۆر ٥ ئافرەتی دەنگو دۆرە ناخۆش ٥ پیرێژنی پەککەوتە ٥ ئافرەتی بەدکارو ئەحمەق ٥ حوشتری پیر ٥ خَرْنَفَهُ بالسیف: بەشمشێر لێی دا ٥ الخرانفُ: درێژ داوەڵ ٥ الخِرنِفُ: حوشتری بەشیرو قەڵەو ٥ لۆکە ٥ الخِرْنِفَةُ: بەروبومی درەختی (غەضاء) ٥ خَرْنَفت الأرضُ: لەو دەڤەرە کەروێشک پەیدا بوو، کەروێشک زۆر بوو لەو زەویو زارەدا ٥ خَرْنَقَت الناقةُ: پیوو بەز لەسەنامی حوشترەکە لۆلو وەستا ٥ الخِرْنِقُ: بێچووە کەروێشک، کەروێشکی گەنج ٥ اَلْخَوَرْنَقُ: باڵە خانەیەک بوو لەعێراق موڵکی نوعمان بوو.

**خَزِبَ** الجلدُ خَزَباً: پێستەکە بەبێ ئەوەی ئازاری هەبێ هاوسا، قەڵەو بوو تاواتدەزانی هاوساوە ٥ خَزِبَت الناقةُ والشاةُ: گوانی حوشترەکە یان هی مەڕەکە هاوسا ٥ کونی گوانەکانی تەسک بونەوە ٥ گوانی وشک بوونو شیری کەم بوو ٥ تَخَزَّبَ الجلدُ: بەمانا (خَزِبَ) دێ ٥ الخَزَبُ: سوالەت ٥ الخِزباءُ: مێشێکە بەزۆری لەناو باغ دا دەژی ٥ الخُزَبَةُ: کانی زێڕ ٥ اَلْخَوزَبُ: هاوسانی گوانی ئاژەڵ (حوشترو مەڕ) ٥ اَلْخَیزَبَان: بەمانا (الخَیزَب) دێ ٥ بێچووە نوعامەی نێر ٥ اَلْمِخْزابُ: حوشترێک کەعادەتی وابێ پێستی ئەستور ببێ یان هێندە قەڵەو ببێ وابزانێ

هێساوه ٥ **تَخَزَّبَ علينا**: تەکەببوری بەسەرا کردین و لوتبەرزی نواند ٥ **اَلْخازباز**: مێشێکە بەزۆری لەباغ دا دەژی ٥ لاسایی کردنەوەی دەنگە دەنگ و وێزە وێزەکەیەتی ٥ **الخِزباز**: ەمانا (اَلْخازباز) دێ.

**خَزِجَ** خَزَجاً: زل بوو، جەستەی زەبەلاح بوو (هو خَزِجٌ) ٥ **المِخزاجُ**: حوشتری زۆر قەڵەو ٥ **الخُزاخِزُ**: پیاوی بەهێزو چوارپەل قەوی و شان و مل پان.

**خَـزَرَ** خَـزَراً: خۆی بەشارەزا دەرخست ٥ پیاو بەقولینچکی چاوی بەتیلەی چاوی بڕوانێ ٥ **خَزِرت العینُ خَزَراً**: چاوی بچوك بون و تەنگ بوونەوە ٥ خێل بوو.

**خَـزَرَ** فـلان: فلانکەس چاوێکی هەڵێناو لێکی نایەوە ٥ وای ڕوانی دەتگوت بەتیلەی چاوی شت دەبینێ ٥ **خَزَّرَ الشیخ عینیه**: پیرەمێردەکە پێڵوی چاوی بچوك بوونەوە هەتاوایان لێهات دەتگوت دوروا(و)ن ٥ دەگوترێ: (خَـزَّرَ الـشابُّ عینیـه) گەنجەکە پێڵوی چاوی خۆی بچوك کردنەوە بەمەبەستی فەنو لێزانی ٥ **خَـزَّرَ الشیئ**: شتەکەی تەنگەبەر کردەوە.

**تَخازَرَ**: چاوی خۆی بچوك کردنەوە بۆئەوەی چاوی تیژ ببن و باش شت ببینێ ٥ بەتیلەی چاوی ڕوانی.

**اَلْخَزَرُ**: شۆربای چەور ٥ **الخَزَرَةُ**: دەردێکە توشی باریکایی پشت دەبێ ٥ **الخُـزَرَةُ**: بەمانا (الخَـزْرة) دی ٥ **الخُزَرَةُ**: هەڵگەڕانەوەی بیلبیلەی چاو بۆلای پێڵوی چاو ٥ ئەم جۆرە خێلییە ناشیرین ترین شێوەی خێلییە ٥ **اَلْخَزیرُ**: گۆشتێکە دەکرێتە کوتکوتی بچوك ئەمجار بەناوو خوێی زۆر دەکوڵێندرێ، کەتەواو کوڵا ئاردی بەسەردا دەکرێو دەکوڵێندرێ، ئەمجار دەکرێتە پێخۆر ٥ شۆربای ئاوو ڕۆن و ئارد واتە: پەڵوی چەور ئەگەر شیرینی تێکەڵ بکرێ دەبێتە حەڵوا ٥ **الخَزیـرَةُ**: بـەمانا (الخَزیـرُ): دێ ٥ **اَلْخُـزورَی**: ڕۆیشتنی لارولەنجە ئامێز ٥ **الخَیْـزُرانُ**: هەرچڵەدارو شورکێك نەرم بێ ٥ دارێکە قەد لوس و بێ گرێو گۆڵ ٥ بەنموونەی ڕاستی و نەرمو شلی دەهێندرێتەوە ٥ قەفەزاز: دانیشتوانی ناوکەشتی کەدەکەوێتە بەشی دواوەی ٥ **خَزْرَبَ الکلامُ**: قسەکان تێکەڵاوو بێ سەروبەر بوون ٥ **خَزْرَجت الشاةُ**: مەڕەکە شەل بوو ٥ **اَلْخَزْرَجُ**: بای باشور (ریح الجنوب) بای سارد ٥ (شێر)؛ بەشێکی یاریدەدەرانی پێغەمبەر بوون کە هۆزێکی سەرەکی ناومەدینە بوون ٥ **الخَزْرَاقَةُ**: پیاوی زەعیف و بێ ورە ٥ کەسێك ئەتوانێ یان ئەزانێ بەرێکو پێکی لەکۆڕو مەجلیسدا دابنیشێ ٥ کەسێك زۆر قسەی سوکانەو نەفامانە بکا ٥ **خَزَّهُ بسهم خَزّاً**: تیرێکی پێوەناو هەنگاوتی ٥ دەگوترێ: (خَزَّهُ بصره): بەچاو هەنگاوتی.

**خَزَّ** الحائِطَ: لای سەروی دیوارەکەی بەتەلی دڕك گرت بۆ ئەوەی کەس سەردیوارەکە نەکەوێ ٥ دەگوترێ: (خَزَّ الحائط بالشوك).

**خَزَّ** التمرُ خزّاً: خورماکە هێشتا کەمێك مزری تێدا ماوەو بەتەواوی شیرین نەبووە ٥ **اختَزَّهُ بسهم**: بەمانا (خَزَّهُ به) دێ ٥ دەگوترێ: (اِختَزَّهُ بصره)، بەچاو هەنگاوتی ٥ **اختَزَّ فلاناً**: هاتە لای فلانکەس کە لەنێو کۆمەڵدا بوو شتێکی لێ وەرگرت.

**اَلْخَـزُّ**: قوماشێکە لەخوری و ئاوریشم پێك دەهێندرێ ٥ یان هەموو رایەڵو تێوەدانەکەی لەئاوریشم دەبێ.

**اَلْخُزَزُ**: کەروێشکە نێرینە ٥ بێچووە کەروێشك ٥ **اَلْخَزَّازُ**: ئاوریشم فرۆش ٥ ئاوریشم ڕێس ٥ **اَلْخَزِیزُ**: هەموو روەکێك چقڵاوی بێ بەرەکەی زۆر وشك بێ ٥ **اَلْمَخَزَّةُ**: زەوییەك کەروێشکی زۆر بێ.

**خَزَعَ** عن أصحابه خَزْعاً: لەرێگا لەگەڵ هاوەڵەکانی بوو لێیان دواکەوت.

**خَزَعَ** من فلان: فرسەتی لێ هێناو لەفلانکەسەوە شتی دەسکەوت.

**خَزَعَ** الشَّیْءَ: شتەکەی بڕیەوە.

**خَزَعَ** اللَّحْمَ: گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد.

**خَزَعَ** فلاناً: نەیهێشت فلانکەس بەئاسایی بڕوا، لەمپەری خستە بەردەم ٥ **اِخْتَزَعَه عن القوم**: شتەکەی لەخەڵکەکە بڕی ٥ **اِخْتَزَعَ فلاناً عِرقُ سوءٍ**: ڕەوشتە ناشیرینەکانی بەفلان تەرك کرد وازی پێ لێ هێنا ٥ **اِخْتَزَعَ منه شیئاً**: شتەکەی لەفلانکەس وەرگرت ٥ **اِنْخَزَعَ الشَّیْءُ**: شتەکە کۆتایی هات و نەما ٥ بڕایەوە ٥ **اِنْخَزَعَ الْحَبْلُ**: لەناوەڕاستدا حەبلەکە پچڕا ٥ **اِنْخَزَعَ متن الرجل**: پشتی پیاوەکە لەبەر پیری یان لاوازی چۆمایەوە ٥ **اِنْخَزَعَ العود**: دارەکە شکاو بوو بەدوو لەت ٥ **تَخَزَّعَ عن أصحابه**: لەهاوەڵانی دواکەوت ٥ **تَخَزَّعَ اللحمَ**: گۆشتەکەی کوتکوت کرد ٥ **تَخَزَّعَ منه شیئاً**: شتەکەی لێ وەرگرت.

**تَخَزَّعَ القومُ الشَّیْءَ**: خەڵکەکە شتەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد ٥ **اَلْخُزَاعُ**: مردن ٥ **اَلْخُزاعة**: پارچەی شتێك کە لێی جیا بوبێتەوە ٥ **اَلْخِزْعَةُ**: پارچەی گۆشت ٥ **اَلْخَزُوعُ**: بەکەسێك دەگوترێ کە لەماڵ و سامانی خەڵك بەشێك بۆ خۆی دابڕێ ٥ **اَلْمِخْزَاعُ**: بەمانا (الخَزُوعُ) دێ ٥ **اَلْمُخَزَّعُ**: کەسێك کێشەو نیزاعی زۆربێ ٥ بەسروشت گێچەڵاوی بێ ٥ **اَلْخَزْعَبَلُ**: قسەی خۆش و نەستەق کە ببێتە هۆی پێکەنین ٥ **اَلْخُزَعْبِلُ**: شتی بەتاڵ و پوچ ٥ **اَلْخُوزَعْبِلَةُ**: گاڵتەو گەپ ٥ قسەیەك ببێتە هۆی پێکەنین ٥ **خَزْعلت الضَّبُعُ**: کەمتیارەکە وا ڕۆیشت شەل پێوە دیاربوو ٥ **خَزْعَلَ الماشی**: ڕۆیشتوەکە قاچی خۆی ڕاتەکاند لەبەر زۆر ماندوو بوون ٥ **اَلْخُزَعالَةُ**: گاڵتەو گەپ ٥ **اَلْخَزْعَلُ**: کەمتیار.

**خَزَفَ** فی مشیه خَزفاً: لە ڕۆیشتندا دەستی بەرز کردنەوە ٥ **خَزَفَ الثوبَ**: قوماشەکەی دادڕی دڕاندی ٥ **اَلْخَزَّافُ**: گۆزەو کیتەڵە فرۆش، دروستکاری گۆزەو کیتەڵە.

**اَلْخَزَفُ**: هەر قاپ و قاچاخێك لە قوڕ دروست بکرێ و سور بکرێتەوە، بخرێتە ناو کڵەوەو ببێتە سواڵەت.

**خَزَقَ** السهمُ خَزْقاً وخُزُوقاً: تیرەکە لە کەوانەکەوە دەرچوو.

**خَزَقَ** الرجلُ أو الطائرُ: پیاوەکە یان باڵندەکە ئەوەی لە سکیدا بوو داینا، ئاوسکی خۆی دانا.

**خَزَقَ** السهمُ القرطاسَ: دڕێوشەکە، تیرەکە لە کاغەزەکەوە چووە ئەو دیو ئەمدیوو ئەودیوی کرد.

**خَزَقَ** فلاناً بالنبل: بەسەرە تیرەکە فلانکەسی هەنگاوت.

**خَزَقَ** فلاناً بالرمح: فلانکەسی بە ڕمب کەمێ بریندار کرد (برینەکەی سوکە).

**خَزَقَ** فلاناً بعینه: چاوی لە فلانکەس بڕی و هەنگاوتی، چاوەزاری لێکرد ٥ **اِنْخَزَقَ الشَّیْءُ**: شتەکە بە زەویدا ڕۆچوو ٥ **اَلْخازِقُ**: سوژن،

دریۆشه، سەرمتیر که شت کون بکا ◊ ئەمە بۆ کەسێك بەکار دەهێنـدرێ کـه ئیشەکانی بـاش بـروا هـەرگیز کێشه نەیەتـه ڕێگای ◊ **الحازوق**: عەمودێك کەسەرەکەی تیژ بێ ◊ له ڕۆژگاری کۆنـدا ئـەو جـۆره عـەمودەیان چـەقاندوەو زەلامیان لەسەر داناوه بۆئـەوەی عەمودەکه لـه کۆمیـەوه بـڕواو لـه تـەپلی سـەری دەرچـێ ◊ **الْخَزَقُ (أرض خُزُقٌ)**: زەوییـەك کـه ئـاوی تێدا نەوەسـتێ هـەڵۆڵ بـێ ◊ **المخـزَقُ**: دارێـکه سەرەکەی بزمارێکی تیژی پێوەیـه (نـەقیزه) ◊ **الْمِخْزَقَةُ**: حەربه.

**خَزَلَ** الشَّيْءَ: شتەکەی بڕی، بڕی دا، لێی کردەوه.

**خَزَلَ** فلاناً عن حاجته: فلاَنکەسی عـەوق کـردو نەیهێشت جووڵه بکا.

**خَزَلَ** الشَّيْءَ: ڕەخنەی له شتەکه گـرت، عەیبـداری کرد.

**خَـزِلَ** الرجـلُ خَـزَلاً: ناوقـەدی پـشتی هـەنگاوت، گازەرەی پشتی شکاند، (هو أخزل) ◊ **خَزِلَت المرأةُ في مـشيتها**: ئافرەتەکـه لـه ڕۆیـشتندا لارو لەنجـەی کـرد بـه عاسـتەم سـەری پەنجـەی دەخسته سەر زەوی ◊ **اخـتَزَلَ**: لەنگی، شەل بـوو ◊ **اخـتَزَلَ برأيـه**: تاکرەوانـه جولاّیـەوه هـەر ڕای خـۆی بـەلاوه پەسـەند بـوو، شـتەکەی دابـڕی، بڕیـدا ◊ **إنْخـزَلَ**: دابـڕا، گۆشـەگیربوو ◊ **إنْخَزَلَـت المرأة في مـشيتها**: بـەمانا (خَزِلَـت) دێ ◊ **إنْخـزَلَ فـلان عـن الأمـر**: فلاَنکـەس لـه کارەکـه هەڵگەڕایەوەو زەعیف بـوو ◊ **إنْخـزَلَ عـن جـواب ماقلت له**: گرنگی به وەڵامی قسەکەی من نـەدا ◊ **تَخزَلَ السحابُ**: هەورەکه وا دەرکـەوت وەکوو ئـەوەی بگەڕێتـەوه دواوه ◊ **تَخزَّلَـت الْمَـرْأَةُ مَشْيَتَهَا**: ئافرەتەکه له ڕۆیشتندا لارو لەنجەی نواند به عاستەم سەری پەنجەی دەخـسته سـەر زەوی ◊ **الأخـزَلُ**: شـەل، حوشترێـك دوگـی نەمابێ.

**الخَزْلُ**: زاراوەیەکی زانستی عوروزه.

**الخُزْلَةُ**: کەسرێکه شکاوییەکه له پشتدا، زاراوەیەکی عوروزیشه ◊ **الْخُزَلَةُ**: ئەوەی دەتەوێ لێت مـەنع دەکـا، کۆسـپو تەگـەره دەخاتـه پـێش کارەکەتەوەو ناهێڵێ به مراد بگەی ◊ **الْخَوْزَلَى**: ڕۆیشتنێکه لارو لەنجەی تێدایه دەگوترێ: (هو أو هي تمشي خَوْزلى) ◊ **الْخَيْزَلُ**: بـەمانا (الخـوزلى) دێ ◊ **خَزَلَـبَ الحَبْـلَ أو اللحـمَ**: بـه خێرایـی حەبلەکـەی پـساند هـەڵی بـڕی، گۆشـتەکەی پارچه پارچه کرد ◊ **خَزَمَهُ خَزْماً**: شتەکەی ڕیـز کرد، کونی کرد، بنکی کتێبەکەی کون کرد.

**خَزَمَ** شِراكَ النَّعْلِ: شیراکی نەعلەکەی کـون کـردو توند بەستی.

**خَزَمَ** البَعيرَ: لوتی حوشترەکەی کون کرد، کونی لـه لالوتی کردو لوتەوانەی تێکرد.

**خَزَمَ** أَنفَ فلان: فلاَنکەسی زەلیل کـردو ژێربـاری کرد.

**خَزَمَ** الجـراد في العـود: کوللەکانی بـه شیشەکەوه کرد بۆ برژاندن ◊ **خازِمَةُ الطريق**: هەریەکه لـەو دوو کەسه پێچەوانەی یـەکتر هـەڵسو کـەوتیان کرد، هەریەکەو ڕێبازێکی گرتـه بـەر بۆئـەوەی لـه ئاکامـدا لەیـەك شوێندا یـەکتر بگرنـەوه ◊ **خَزَمَـةُ**: بـەمانا (خَزَمَـهُ) دێ ◊ **تَخـازَمَ الجيـشان**: هـەردوو سـوپاکه ڕووبـەڕووی یـەکتر بوونـەوه ◊ **تَخزَّم الشوك في رجله**: چقڵ بەقاچیدا چوو.

**الأخزَم**: نێره مار ◊ **الخِزامُ**: لێـك چوون، دەگوترێ: (لقيتـه خِزامـاً) توشـی بـووم ڕووبـەڕوو ◊ **الْخـزام**: ڕوەکێـکی بۆنخۆشـه لـه پێـڕی (الـشفويات)

عەتری لێ دروست دەکرێ ٥ الخُزامَی: رەگەزی روەکێکە لە پێڕی (الفصیلة الشفویة) جۆرەکانی بۆندارو عەتر ئامێزن، وەکوو سمڵو مێخەك ٥ بەزۆری لە وڵاتی هۆڵندا زەرع دەکرێ ٥ الخِزامة: پەتێکی کەوانەییە، دەکرێتە ئەو کونە سماوەی لە لوتی حوشتردایە واتە: لوتی حوشتر دەسمرێ‌و ئەو پەتەی تێدەکەن وەکوو لوتەوانە بۆنەوەی زیاتر هەوسارو جڵەوی نەرم بێ ٥ خِزامة النعل: ئەو تیلمە چەرمەیە دەکرێتە نێوان دوو شیراکی نەعلەکەوە ٥ ألخَزّامُ: فرۆشیاری درەختی خەزمە درەختێکە لە توێکڵەکەی حەبل‌و گوش دروست دەکرێ.

**ألخَزْمُ**: لە زاراوەی شیعردا زیادەیەکە لە سەرەتای شیعرەکەوەیە لە تەفعیلەی عوروزیدا حیسابی بۆ ناکرێ، وا دەبێ یەك پیت دەبێ وا دەبێ تا چوار دەڕوا.

**ألخَزَمُ**: درەختێکە لە توێکڵەکەی حەبلی گۆش دروست دەکرێ، لە رۆژگاری کۆندا صندوق‌و بەغدانی کەل‌و پەلی تایبەتی ئافرەت لەو جۆرە دارە دروست کراوە ٥ ألخَزوَمةُ: لە زاراوەی هۆزی هوزەیلدا بە مانگا دەگوترێ، یان مانگای پیرو کورتە بنە، (ك: خَزائم، خُزم، خَزُوم) ٥ ألمُخَزَّمُ: باڵندەو نوعامە (چونکە ئەوانە لوتیان کونی تێدایە).

**خَـزَنَ** اللَّحْمُ والطعامُ: گۆشتەکە یان خۆراکە بۆگەنی کرد.

**خَزَنَ** ألشَّيءَ خَزْناً: شتەکەی خستە ناو گەنجینەوە.

**خَـزَنَ** عنـه العطـاءَ: بەخششی لێ گرتەوە هیچی نەدایە.

**خَزَنَ** لسانَه: زمانی خۆی پاراست.

**خَزَنَ** السرَّ: نهێنییەکەی شاردەوە بڵاوی نەکردەوە ٥ مَخزُون: لە گەنجینەدا هەڵگیراو ٥ أخزَنَ: دوای هەژاریی دەوڵەمەند بوو ٥ اختَزَنَ الشَّيءَ: شتەکەی خەزن کرد، هەڵیگرت ٥ اختَزَنَ الطريق: ڕێگاکەی کورت کردەوە ٥ اختَزَنَ السرَّ: نهێنییەکەی شاردەوە ٥ استَخزَنَهُ الشَّيءَ: داوای لێکرد شتەکە خەزن بکا، هەڵی بگرێ ٥ الخِزانةُ: گەنجینە، شوێنی شت تێدا هەڵگرتن ٥ پیشەی گەنجینە داریی ٥ خِزانة الانسان: دڵی ئادەمیزاد ٥ خِزانة الاحتراق: لە زاراوەی ئەندازیاری میکانیکی دا ئەو بەتاڵاییە کە سوتانی تێدا دروست دەبێ.

**ألخَـزّان**: زمان، خورما کە ناوەکەی بەهۆی نەخۆشییەوە رەش ببێ، شوێنی کۆبونەوەی ئاو (دەریاچە، ئەستێر، تەنکی، حەوز) ٥ ألمَخزَنُ: شوێنی شت تێدا هەڵگرتن.

**خزا** فلاناً: فلانکەسی ژێر بارکردو خۆی بەسەردا سەپاند.

**خَزَا** الدابةَ: وڵاخەکەی ژێربار کرد.

**خَزَا** النفسَ: نەفسی خۆی گرتەوە.

**خَزَا** ألشَّيءَ: شتەکەی کردە مڵکی خۆی.

**خَزَا** الفصيلَ: زمانی بێچوە ئاژەڵەکەی دەرهێناو قەڵاشتییەوە.

**خَـزِيَ** خِزيـةً: ریسوا بوو کەوتە تەنگژەو ناخۆشییەوە.

**خَزِي** فلان خَزَىً وخَزايةً: فلانکەس شەرمی کرد، بەخۆیدا شکایەوە، تەریق بۆوە ٥ أخـزاهُ: سوکایەتی پێکرد ٥ خازَىَ فلان فلاناً: فلانکەس بەسەر فلاندا سەرکەوتوو بوو ٥ الخِزيَةُ: بەڵاو کارەسات، رەوشتێك کە شەرم ئاوەر بێ

٥ **اَلمَخزَاةُ**: زەلیلیو ژێر دەستیو سوکایەتی ٥ **اَلمُخزِيَةُ**: دەگوترێ: (قصيدة مُخزِية) چامەیەکە لەوپەڕی جوانیو ڕەوانی دایە

**خَسَأَ** البَصَرُ خَسْأً وخُسُوءاً: چاو ماندوو بوو نەیتوانی درێژە بە ڕوانینەکەی بدا.

**خَسَأَ** الكلبَ وغيره: سەگەکە چەقەی لێکرا دوور خرایەوە.

**خاسَأَ** القومُ: خەڵکەکە بەردیان بۆیەکتر هاویشت، کەوتنە بەردە فڕکێی یەکتری.

**إنخَسَأَ البَصَرُ**: بەمانا (خَسَأَ) دێ ٥ **تَخاسَأَ القومُ**: خەڵکەکە شەڕە بەردیان کرد بە بەردە ٥ **الخاسِئُ من الكلاب**: سەگێك کە نەهێڵدرێ لە ئادەمیزاد نزیك بێتەوە ٥ زەلیلو ژێر دەستە ٥ **اَلخَسِيئُ**: خوری خراپو بێ کەڵك.

**خَسِرَ** التاجرُ في معاملته: بازرگانەکە لە مامەڵەکەیدا.

**خَسِرَ** التجارةَ: لە بازرگانیکردنەکەیدا زەرەرمەند بوو ماڵو سامانەکەی کەم بووە.

**خَسِرَ** فلان: فلانکەس فەوتا، لەناو چوو ٥ گومڕا بوو، سەری لێ شێوا.

**خَسَرَ** الشَّيْءَ: شتەکەی فەوتاندو لە کیس خۆی دا ٥ **أخسَرَ فلانٌ**: فلانکەس کەوتە ناو زیانو زەرەر مەندییەوە ٥ **أخسَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کەم کردووە ٥ **أخسَرَهُ في تجارته**: لە مامەڵەو بازرگانی کردنەکەیدا توشی زیانی کرد ٥ **خَسَّرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کەم کردووە ٥ خەسارەت مەندی وە پاڵدا ٥ **خَسَّرَ فلاناً**: فلانکەسی لە خێرو بێر دوور خستەوە ٥ فەوتاندی ٥ **خَسَّرَهُ سوءُ عمله**: کردارە خراپەکانی فەوتاندیان ٥ **اَلخَناسِيرُ**: گومڕایی، فەوتاندن، غەدر ٥ لۆمەو تانەو تەشەر ٥ **اَلخَنسَرَىٰ**: بەمانا (الخناسير) دێ ٥ **اَلخَيْسَرَىٰ**: گومڕایی ٥ فەوتانو تیێدا چوون ٥ لۆمە ٥ غەدر ٥ پیاوێك نەچێ بۆ دەعوەتو نانخواردن لە ترسی ئەوەی ئەویش دەعوەتی ئەوان بکاتەوە.

**خَسَّ** الرجلُ خَسّاً: پیاوەکە کاری پڕو پوچی ئەنجام دا.٥ **خَسَّ** النصيبُ: بەشەکە کەم بوو.

**خَسَّ** نصيبه: بەشەکەی کەم کردەوە.

**خَسَّ** الرجلُ خَسّاً: پیاوەکە بێ ڕێز بوو.

**خَسَّ** الشَّيْءُ خَساسةً: شتەکە کێشی کەم بوو، هاوکێشی بەرامبەری نەهاتەوە، ڕەزیلو بێ نرخ بوو ٥ **أخَسَّ فلانٌ**: فلانکەس کردەوەیەکی ناشیرینی ئەنجام دا ٥ **أخَسَّ فلاناً**: فلانکەسی بە هیچو پوچ هاتە پێش چاو ٥ **أخَسَّ نصيبَهُ**: بەشەکەی کەم کردووە ٥ **الخُساسُ**: بێ نرخو هیچو پوچ ٥ **خَسَّسَ نصيبَهُ**: بەشەکەی کەم کردووە ٥ **اِستَخَسَّهُ**: بە هیچو پوچی لە قەڵەم دا ٥ **اَلخَساسَةُ**: ئەو حاڵەتو بارو دۆخەی پیاوی پڕو پوچ تێیدایە ٥ **اَلخُساسَةُ**: ماڵو سامانی کەم، ماڵو سامانی بێ بایەخ ٥ پاڵی ئەسپ.

**اَلخَسُّ**: کاهو، ڕوەکێکی گەڵا پانە بە کاڵی دەخورێ ٥ زۆر جۆری هەیە ٥ **اَلخُسَّانُ**: ئەو ئەستێرانەن کە هەرگیز ئاوا نابن وەکوو ئەستێرەی جەدیو فیرقەدانو ئەو ئەستێرانەی ناویان (بنات النَّعش)ە بە دەوری قوتب دا سوڕ دەخۆن.

**اَلخَسِيسُ**: شتی کەم، شتی بێ نرخ ٥ **اَلخَسِيسَةُ**: نزمی قەدرو ڕێز دەگوترێ: (رفع من خَسِيسَتِهِ) لە نابودی خۆی کەم کردووە ٥ **خَسِيسَةُ الناقة**: ددانی حوشتر پاش ئەوەی شیلەکانی لە ساڵی شەشەمیدا دەکەون ٥ **اَلمُستَخِسُّ**: ڕوخسار

ناشيرين ◊ خَسَفَتِ الأَرْضُ خَسْفاً وخُسوفاً: زەوییەکە ڕۆچوو ئەوەی لەسەری بوون قوتی دان ◊ خَسَفَت عينُ الماءِ: سەرچاوەی ئاوە (کانیاوەکە) ڕۆچووە خوار ◊ خَسَفَتْ عينُ فلان: چاوی فلانکەس دەرهات.

خَسَفَ القمرُ: مانگ گیرا، روناکی نەما یان روناکییەکەی کەم بووە.

خَسَفَ الشَّيْءَ: شتەکە دڕا، (خَسَفَ الشَّيْءَ) شتەکەی دڕاند.

خَسَفَ الشَّيْءُ خَسْفاً: شتەکە کەم بۆوە.

خَسَفَ بَدَنُهُ: جەستەی لاواز بوو.

خَسَفَ فلان: فلانکەس برسی بووە، نەخۆشی چاك بووە.

خَسَفَ فلاناً: فلانکەسی ژێر بارکردو ناچاری کرد ئەوکارە بکا.

خَسَفَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڕیەوە.

خَسَفَ البِئرَ: بیرەکەی لە بەرد هەڵکەند شاخەکەی بڕی ئاوی زۆری لێ هەڵقوڵاو وشکی نەکرد.

خَسَفَ للشعراء عين الشعر: ڕێگەی بواری شیعر بۆ شاعیرەکان ئاسان بوو، شارەزایی فونونو مەبەستەکانی شیعر بوون ◊ أخْسَفَتِ العينُ: چاوەکە کوێر بوو ◊ انْخَسَفَتِ الأرض: بەمانا (خَسَفَتْ) دێ ◊ انْخَسَفَتِ العين: چاوەکە کوێر بوو ◊ الأخاسِيفُ: زەوی نەرمەڵان ◊ الخاسِفُ: منداڵی قالب سوکی بە جمو جوڵ.

الْخَسْفُ: زەلیلیو ژێر دەستەیی، برسیەتی، ستەم، کەمبونی ماڵو سامانو نەمانی خێرو بەرەکەت، ئەو شوێنەی ئاوی بیری لێوە دەردەهێندرێ.

خَسَقَ السهمُ: تیرەکە نیشانەکەی پێکاو تێیدا مایەوە، یان نەمدیوو ئەودیوی کرد ◊ الْخَسَّاقُ: درۆزن ◊ الْخَسْقَةُ: ژێوان بوونەوە لە مامەڵەو وادەو بەڵێندا ◊ الخَيْسَقُ: بیری قوڵ، گۆڕی قوڵ ◊ خَسَلَهُ خَسْلاً: دووری خستەوە، نەفی کرد ◊ الْخُسالَةُ: هەموو شتێکی خراپ ◊ الْخَسِيلُ: شتی پڕوپوچ لەهەر جۆرێك بێ ◊ الخَسِيلُ من القوم: کەسانی پڕوپوچ لەناو کۆمەڵگەدا ◊ الْخَسِيلَةُ: بەمانا (الْخَسِيلُ) دێ ◊ أخْسَاهُ: بە بەردە وردە یاری لەگەڵ کرد (هەڵماتێنی لەگەڵ کرد) ◊ تَخَاسَى اللاعبان: دوو یاری چییەکە یاریان کرد، بە بەردە وردە یارییان کرد ◊ تَخَاسَى القومُ: خەڵکەکە بە بەردوچکە یەکتریان بەرد باران کرد ◊ تَخَاسَت الدابَّةُ بالحصى: وڵاغەکە بەهۆی ڕۆیشتن بەسەر زیخو بەردە وردەدا قاچی هاوسا ◊ الْخَسِيُّ: پۆشاك، ڕەشماڵو خێمە کە لە خوری چنرابێ ◊ خَشَبَهُ خَشْباً: تێکەڵاوی کرد.

خَشَبَ السيف: شمشێرەکەی مشتو ماڵ کردو تیژی کردەوە.

خَشَبَ النَّبْلَ والقَوْسَ: بە ناشیەتی تیرو کەوانی دروست کرد چ کارامایيو دەست ڕەنگینیەکی تێدا نەبوو.

خَشَبَ الشعرَ أو الكلامَ او العملَ: چۆنی بۆ ڕێکەوت ئاوا شیعرەکەی نووسی یان پەخشانەکەی دانا یان کارەکەی کرد هیچ وردەکارییەکی تێدا نەبوو.

خَشِبَ خَشَباً: زبرو ئەستورو ڕەق بوو.

إخْتَشَبَ السيفُ: شمشێرەکە تیژ بوو.

إخْتَشَبَ الشعرَ: شیعری دانا بەبێ وردەکاری، کاڵو کرچ بوو ◊ تَخَشَّبَت الابلُ: حوشترەکە ئالفی

وشکی خوارد ◊ **اخْشَوْشَبَ**: وشك و رەق بوو لە دینداری و پۆشاك و خواردن و خۆراکیدا، لە هەموو هەڵس و کەوتێکیدا ◊ **اخْشَوْشَبَ في عیشه**: لە ژیانیدا زبر بوو، بە ئەنقەست ئەو جۆرە ژیانە زبرە پەیڕەو دەکا بۆئەوەی بەرامبەر روداوەکانی رۆژگار پشوو درێژ بێ ◊ **الخَشّابُ**: (أرض خشابٌ): زەوییەکە وشك و هەڵۆڵەو ئاو راناگرێ ◊ **الْخَشْبَاءُ**: (أرض خشباء) بەمانا (خَشاب) دێ.

**الْخَشَبُ**: دار، بەتایبەتی (بنك و قەدو لق و پەلەکانی) ◊ **الخَشّابُ**: دار فرۆش ◊ ئەو کەسەی بە بەرد شەڕ دەکا ◊ **الْخَشِيبُ**: لە هەموو شتێکدا رەق زبرو وشك، لە پیاوو حوشتردا: درێژ داوەڵی لەڕو ئێسقان دەرکەوتوو، بەهۆی ئیش کردن و ماندوبوونەوە ◊ **الْخَشِيبَةُ**: کۆکە کوك کەر، لێدراوو جەستە کوتراو ◊ **الْمُخَشَّبُ**: خانوی بە دار دروستکراو ◊ **خَشْخَشَ السلاحُ وغیره**: چەکەکە خڕو وڕی هات کە چەخماخەکانیان راکێشان خڕە خڕیان هات ◊ **خَشْخَشَ الثوبُ الجدید**: پۆشاکە تازەکە خشەی دێ ◊ **خَشْخَشَ في الشَّيْءِ**: چووە ناو شتەکەوەو تێیدا هون بوو ◊ **خَشْخَشَ السلاح وغیره**: چەکەکەی جولاندو خڕەی هات ◊ **خَشْخَشَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ**: شتەکەی خستە ناو شتەکەوە ◊ **تَخَشْخَشَ**: چووە ناویەوەو هون بوو ◊ **تَخَشْخَشَ في الشَّيْءِ**: چووە ناو شتەکەوەو هون بوو ◊ **الخَشْخاش**: کۆمەڵێك بە چەك و زرێوە ◊ کۆمەڵێکی زۆری ئادەمیزاد ◊ هەر شتێکی وشك کە لێکیان بخشێنی دەنگی لێوە بێ ◊ هەروا وشەی (الخشخاش) ناوە بۆ رووەکێك حەشیشەو ئەفیونی لێ بەرهەم دێ.

**خَشَرَ** فلانٌ: فلانکەس چڵێس بوو.

**خَشَرَ** الشَّيْءَ: مۆو خشت و خاڵەکەی لە شتەکە دوور خستەوە ◊ پاکی کرد.

**خَشِرَ** خَشَراً: چڵێس بوو ◊ لەترسا هەڵات و قاچاندی ◊ **الخُشارَةُ**: ئادەمیزادی خوێڕی و هەتیو مچە ◊ کەف و زبڵ و زاڵی سەر دەریا ◊ جۆی بێ ناوك کەمەر سۆیەکەی مابێ ◊ شتی خراپ و بێ کەڵك لەهەر جۆرێك بێ ◊ **الخُشارَةُ**: بەمانا (الْخُشارُ) دێ ◊ **خاشِر المِنْجَل**: دەمی داس، لا تیژەکەی ◊ **خَشْرَمَتِ الضَّبُعُ**: کەمتیارەکە لەکاتی شت خواردندا دەنگی لێوە هات ◊ **الْخَشْرَمُ**: کۆمەڵی هەنگ و زەردەواڵەو شامە ترینکە ◊ تاکەکەیان (خَشْرَمَةٌ) ◊ هەروا ناوە بۆ مەلیکی هەنگەکان (شاژن) ◊ کۆڵەس و هێلانەکەیان ◊ ئێسقانە نەرمەی لوت ◊ بەردە قسڵ ◊ یان ئەو بەردەی دەگرێ بە گەچ ◊ کێوی بچوك (گرد).

**خَشَّ** السحابُ خَشّاً: هەورەکە بارانێکی کەمی پێوە بوو باراندی.

**خَشَّ** الرجُلُ: پیاوەکە رۆیشت و کارەکەی جێبەجێ کرد.

**خَشَّ** في الشَّيْءِ: چووە ناو شتەکەوە.

**خَشَّ** في الدار: چووە ناو خانوەکەوە.

**خَشَّ** البَعیرَ: لوتەوانەی کردە لوتی حوشترەکەو مەهاری کرد.◊ **خَشَّ** فلاناً: فلانکەسی برینداری کرد، زەبرێکی کوشندەی لێدا.

**أخَشَّ البعیرَ**: بەمانا (خَشَّهُ) دێ ◊ **إخْتَشَّ من الأرض**: جڕو جانەوەری زەوی خوارد، کرم و کوللەی خوارد، گوێچکە نان و میوە رزیوی خوارد ◊ **انْخَشَّ في الشَّيْءِ**: چووە ناو شتەکەوە ◊ **الخَشاشُ**:

جـرِو جانـەوەری نـاو زەوی ◊ باڵنـدەو زیندەوەری پەلـەوەر ◊ تاکەکـەی (خَـشاشة) ◊ بوردەی تەنك (عەبای سوکەڵە) ◊ ئادەمیزادی روح سـوکی زیـرەك ◊ هـەر شتێـك ناسـكو جوانو دڵگیربێ ◊ الخِشَاشُ: دارێکە بە ئەندازەی دوو پەنجە درێژە دەکرێتە لوتی حوشترەوەو بە رێشمەکەیەوە دەبەسترێتەوە بۆئەوەی جڵەوی خـۆش بـێ ◊ مـاری کێـو ◊ ئـەژدیها ◊ جـرِو جانـەوەری نـاو زەوی ◊ باڵنـدەو پەلـەوەر ◊ پیاوی رۆح سوکی زیرەكو کار لەدەست هاتوو ◊ جەواڵ ◊ ألخُشَاشُ: باڵندەو پەلەوەر ◊ جرِو جانەوەری ناو زەوی ◊ پیاوی ئازاو وره بەرز ◊ شـتی خـراپ ◊ الخِـشَاشَةُ: لوتەوانـەی حوشـتر، مەهاری حوشتر.

أَلخَشُّ: پیادە، پیرۆ ◊ رەشمـاری گـەورە ◊ شتی زبر ◊ بارانی کەم.

أَلخُشُّ: گردۆڵکە، تەپۆڵکە ◊ أَلخُشَّاءُ: کۆڵـەس، هەنگـەڵان هیلانـەی هـەنگو زەنگـە سـورەو زەردەواڵە ◊ زەوییەك گڵو چەو بێ.

أَلخُشَّاءُ: ئـەو ئێسقانە باریکەی پشتی گوێـچکە کـە مـووی لێ نـاروێ ◊ الخُـشَيْشُ: ئاسـکی بـچوك ◊ گردۆڵکە ◊ أَلمِخَشُّ: پیاوی ئـازا، ئـیش لەدەسـت هاتوو ◊ کەسێـك زۆر تێـکەڵاوی خەڵـك بـبێو ئاخاوتنیان لەگەڵ بکا ◊ ئەسپی چاو نەترس.

خَشَعَ خشوعاً: گەردن کەچ بوو، زەلیلو داماو بـوو ◊ ترسـا ◊ دەنگـی نـزم کـردەوە ◊ چـاوی بـە دەورو بەردا گێڕاو ئەمجار چاوی لێـك نا.

خَشَعَ بصره: چاوی داخست، چاوی لێك نا.

خَـشَعَ لربـه: گـەردن کەچـی خـودا بـوو سـەری دانـەواند ◊ (هو خاشع) (ك: خُشَعٌ).

خَشَعَ صوتُهُ: دەنگی نزم بووە بە عاستەم سـرتەی هات.

خَشَعَ بَـصَرُهُ: چـاوی شکایـەوەو نـەیتوانی سـەیری بکا.

خَشَعَ ألشَّيُ: شتەکە ئارامی گرت.

خَشَعَ الوَرَقُ: گەڵاکە سیس بـوو ◊ خَـشَعَتِ الأرضُ: زەوییەکە وشکەڵ بوو لەبەر بێ بارانی.

خَشَعَ الكوكـبُ: ئەسـتێرەکە نزیـك بـە ئـاوابوون بـوّوە ◊ خَـشَعَتِ الـشمسُ: خـۆر گـیرا، خـۆر روناکییەکەی نەما.

خَشَعَ السنامُ: دوگەکـە بـچوك بـووە کەمێـکی پیـو پێوەمـا ◊ إِخْتَشَعَ: گـەردن کـەچ بـوو، چـاوی بـە زەویـدا گێـڕا، دەنگـی نـزم بـۆوە ◊ دەنگـی نـزم کردەوە ◊ تَخَشَّعَ: خۆی زەلیل کـرد ◊ پاڕایـەوەو لاڵایـەوە ◊ بـە زۆر خـشوعو گـەردن کەچـی بەسەر خۆیـدا هێنـا ◊ چـاوی بـە زەویـدا گێـڕاو چاوی نوقاند ◊ دەنگـی نـزم کـردەوە ◊ أَلخاشِعُ: ئـەو کەسـەی بـچێتە روکـوع ◊ ئـەو شـوێنەی خاکەکـەی لەبەڵانـە رەشـەبا لێـی هەڵـدەگرێو شوێنەوارەکەی کوێر دەکاتـەوە ◊ شوێنێـك کـە نادۆزرێتەوە ◊ شوێنی تەپو تۆزاوی کـە کەسـی تێـدا نـەبێ ◊ أَلخِـشْعَةُ: بێـچوێك سـکی دایکـی هەڵبـدڕێو بهێندرێتـەدەر بـە زینـدوییو دایکەکەی بمرێ ◊ الخُشعَةُ: پارچە زەوی پتەو ◊ گردۆڵکەی وەها بە زەوییەکەوە پان بوبێتەوە.

خَشَفَ: دەنگی هات، خشەی هات ◊ لە زەویدا هـون بوو، بەشەو گەڕا ◊ بەناو زەویدا هاتوو چوو.

خَشَفَ في ألشَّيِ: چووە ناو شتەکەوە.

خَشَفَ في السيرِ: بە خێرایی رۆیی.

خَشَفَ البـردُ: سـەرماکە تونـد بـوو پـەرەی سـەند.

**خَشَفَ** الماءُ: ئاوەكە بەستی، بوو بە سەهۆڵ.

**خَـشَفَ** الـثَّلجُ: لەكاتی بەناو رۆیشتنی بەفردا دەنگی لێوە هات خشەی هات ٥ وژەی هات.

**خَـشَفَ** الـدليل بـالقوم: چاو ساغەكە بە باشی خەڵكەكەی گەیانـدە شـوێنی مەبەسـت ٥ شارەزای كردن ٥ **خَشَفَتِ المرأةُ بالولد خَشْفاً**: ئافرەتەكە منداڵەكەی لەبارچوو.

**خَشَفَ** رأسه بالحجر: سەری بە بەرد بریندار كرد.

**خَشِفَ** البعيرُ: حوشترەكە هەموو جەستەی گرویێ بوو، لەبەر گرویی جەستەی پێستی وشكەڵ هەڵگەڕا.

**خَشِفَ** الشَّيءُ: شتەكە وشك بوو ٥ **أخْشَفَتِ الظبيةُ**: ئاسكەكە بێچووەكەی لە تەكدا بوو ٥ **خاشَفَ السهمُ**: تیرەكە لەكاتی هەنگاوتنی نیشانەكەدا دەنگی لێ هات ٥ **خاشَفَ الى كذا**: پەلەی كرد بۆلای ئەو شتە ٥ **خاشَفَ في ذمته**: خێرا وادەو بەڵێنەكەی هەڵوەشاندەوە ٥ **خَشَّفَ الدليل بالقوم**: چاو ساغەكە بە باشی شارەزایی خەڵكەكەی كردو رێگای نیشاندان ٥ **الخُشَاف**: شەربەتی تریێو مێوژ یان هی هەنجیر یان هی هەر میوەیەكی تر دوای ئەوەی دەپاڵێودرێ (بەكورتی خۆشاو) ٥ **الخَشْفُ**: جموجوڵ، دەنگ ٥ **الخُشْفُ**: بێچوی ئاسك لە سەرەتای لە دایكبوونیدا چ نێرو چ مێ

**الخَشَفُ**: بەفری زبر ٥ **الخَشْفَةُ**: جموجوڵ، دەنگەدەنگی كەمتیار، خشەی رۆیشتنی مار ورشەی مار ٥ **الخَشُوف**: كەسێك بچێتە ناو كارو پیشەوەو چاو نەترس بێ ٥ كەسێك ئازابێ بۆ شەو ڕەوی ٥ شمشێری بڕنـدە ٥ **الخَشِيفُ**: سەهۆڵ ٥ شتی فش‌و نەرم وەكوو ئیسفنج ٥ بەفری زبر كە بەهۆی ساردی كەش‌و هەوا زبر بووبێ كە بەناویدا دەڕۆی خشە خشی لێ دێ ٥ **المِخْشَفُ**: چاو ساغی شارەزاو كارا، بەڵگەی بەهێز ٥ شێر ٥ ئازا بۆ شەو ڕەوی ٥ كەسێك بچێتە ناوكارو پیشەوە بە چاو نەترسی.

**الخُشْكارُ**: نانی گەنمی پاك نەكراو ٥ **الخُشْكنان**: نانێكە لە ئاردی گەنمی پاك كراوی بێ سۆ دروست دەكرێ شەكرو بادام‌و گوێزو فستەقی تێ دەكرێ ئەمجار دەبرژێ، سور دەكرێتەوە ٥ **خَشَلَهُ خَشْلاً**: رەزیلی كرد.

**خَشَلَ** الشرابَ: شەرابەكەی پاڵفتە كردو پاڵاوتی.

**خَشِلَ** الثوبُ خَشَلاً: قوماشەكە ڕزی.

**خَشِلَ** الرجلُ: پیاوەكە لە شەڕدا لاواز بوو فاشیل بوو ٥ **خَشَّلَهُ**: رەزیلی كرد ٥ خشڵ داری كرد بە بازنەو خلخال ٥ **تَخَشَّلَ**: تەوازوعی نواند گەردن كەچ بوو.

**الخَشَلُ**: رەزیلی خراپ ٥ هێلكە كە زەردێنەكەی دەربهێنـدرێ ٥ ئەمـسەرو ئەوسـەری بازنـەو خرخـاڵ ٥ یـان ئـەوەی شـكاوە لـە ئەمـسەرو ئەوسەری بازنەو خرخاڵ ٥ **خَشَمَهُ خَشْماً**: لوتی شكاند.

**خَشِمَ** الانـسانُ خَشَماً: ئادەمیزادەكە دەردێك لە لوتیدا پەیدا بوو بۆنی بۆ ناكرێ ٥ بۆنی لوتی ناخۆش بوو، بۆنی ناخۆش دەكا ٥ لوت كە بەهۆی نەخۆشییەوە بۆگەن بكا.

**خَشِمَ** اللَّحْمُ وغيره: گۆشتەكە یان هەرشتێكی تر بۆنی گۆڕا. **خَشِمَ** فلانٌ: فلانكەس كەپووی گەورە بوو، خەیشومی داكەوت‌و كونی لوتی گیرا، هەناسەی لە لوتەوە بۆ نادرێ.

**خُشِمَ**: توشی دەردی لوت بوو ٥ **أخْشَمَ**: بۆنی گۆڕا.

**خَشَمَ** اللَّحمَ ونحوه: بەمانا (خَشِمَ) دێ.

**خَشَمَ** الشرابُ فلاناً: بۆنی شەرابەکە لە ڕێگەی لوتیەوە دای لە دەماغی‌و خێرا سەرخۆشی کرد ٥ **تَخَشَّمَ فلان**: فلانکەس بەهۆی هەڵچونی شەرابەکە لە قورگیدا دای لە دەماغی‌و سەرخۆشی کرد ٥ **تَخَشَّمَ اللحمُ**: گۆشتەکە بۆگەنی کرد ٥ **ألخُشامُ**: دەردێکە توشی لوت دەبێ هەستی بۆنکردنی نامێنێ ٥ لوتی گەورە، کێوی گەورە، پیاوی لوت زل ٥ شێر لەم رووەوە کە لوتی زلە.

**ألخَشَمُ**: دەردێکە توشی لوت دەبێ هەستی بۆنکردنی نامێنێ ٥ لوت ٥ چڵم کە لە لوتەوە دێتە دەر ٥ **ألخَيْشُومُ**: لای سەروی لوت.

**خَشُنَ**: زبرو گڕن گڕناوی بوو ٥ **خاشَنَهُ**: پڕی دایە ٥ قسەی زبرو ڕەقی لەگەڵدا کرد ٥ **خَشَّنَهُ**: زبری کرد ٥ **خَشَّنَ صَدْرَهُ**: دڵی تێکدا، دڵی ڕەنجاند شتێکی وای خستە دڵەوە هەڵوێستی گۆڕی ٥ **تَخاشَنوا**: لە قسەو کردەوەدا زبرو ڕەقیان نواند، قسەی ناشیرینیان بەیەکتر گوت ٥ **تَخَشَّنَ**: زبرییەکەی زۆر بوو ٥ زۆر زبرو گڕن گڕناوی بوو ٥ پۆشاکی زبری لەبەرکرد ٥ شتی زبری خوارد ٥ یان باری بە وتنی قسەی زبرەوە گرت ٥ یان ژیا بە ژیانێکی زبر ٥ **اِسْتَخْشَنَهُ**: بە زبری هاتە بەر چاو.

**اخشَوْشَنَ**: بەمانا (تَخَشَّنَ) دێ.

**ألخَشِنُ**: قورس‌و گرانە بە ئاسانی بەیدەست نابێ ٥ **ألخَشْناءُ**: پرچەك ٥ پەیکوڵ بەرە رومکێکی زبرو گڕن گڕناوییە.

**خَشَتِ النَّخلَةُ**: دار خورماکە بەرەکەی خورما وشکەڵە بوو.

**ألخَشَا**: کشت‌و کاڵ کە بە سەرما رەش ببێ ٥ **الخشاءُ**: زەوییەکی پتەو چەقەن کە گیای لێ نەڕوێ.

**ألخَشْوُ**: خورما وشکەڵ ٥ **ألخَشِيُّ**: گیاوو گژی رزیوو بۆگەن بوو ٥ **خشاء خَشْياً**: ئەو زیاتر دەترسا تا ئەم.

**خَشِيَ** خَشْيَةً: ترسا.٥ **خَشِيَ فلاناً ومنه خَشْيَةً**: لە فلانکەس ترسا ٥ لە روی ڕێزو هەیبەتەوە لێی ترسا ٥ **خاشاهُ**: وازی لێ هێنا ٥ لە لێ ترساندا کێ برکێی لەگەڵدا کرد ٥ **خَشَّاهُ**: ترساندی.٥ **تَخَشَّى فلان**: فلانکەس ترسا.

**خَصِبَ** خِصْباً: شوێنەکە گیاوو گژو لەوەڕی زۆر بوو ٥ (هو خَصِبٌ وخصيب هو أو هي مخصاب) ٥ **أخْصَبَ المكانُ**: بەمانا (خَصِبَ) دێ ٥ **أخْصَبَ جناب فلان**: فلانکەس خێرو بێری زۆرە ٥ **أخْصَبَ فلان**: فلانکەس هەرزانی روی تێکردو کەوتە خێرو خۆشی ژیانەوە ٥ **أخْصَبَ الله الموضعَ**: پەروەردگار لەو شوێنەدا گژوگیاو لەوەڕی زۆری رواند ٥ **الأخْصَابُ**: تێکەڵبوونی خانەی نێرینەو خانەی مێینە ٥ **الخِصَابُ**: دارخورمایەك زۆری بەر گرتبێ.

**ألخَصْبُ**: بەمانا (الخِصاب) دێ ٥ پرژی دار خورما ٥ تۆوی تەلقیح کردن.

**الخِصبُ**: گەشەو نماو خێرو بێر ٥ ژیانی نەرم‌و نۆڵ ٥ **ألخَصِيبُ**: خێرو بێر ٥ **ألمُخْصِبُ**: زبڵی کیمیاوی‌و هەرشتێکی تر کە بکرێتە ناو زەوییەوە بۆئەوەی بەهێز ببێ‌و کشت‌و کاڵەکەی باش پێبگا.

**ألمُخصِّبُ**: مادەیەکی سروشتییە یان دروست دەکرێ‌و تێکەڵ بەخاك دەکرێ بۆئەوەی هێز بداتە

خاكەكە بۆ گەشە پێدانی كشتوكاڵ ◊ خَصَرَةٌ: لە كەلەكەی دا.

**خَصِرَ** خصَراً: سەرمای بوو یان سەرماكەی زیادی كرد.

**خُصِرَ**: كەلەكەی توشی ئازار بوو ◊ أَخْصَرَةٌ: ساردی كردەوە ◊ خاصَرَهُ: دەستی لەسەر كەلەكەی دانا ◊ هەریەك لەو دوو كەسە رێبازێكیان گرتە بەر بۆئەوەی لە شوێنی تایبەتیدا بەیەك بگەنەوە ◊ خَصَّرَ الثوبَ أو النعلَ: ئەملاو ئەولای قوماشەكە یان نەعلەكەی باریك كردەوە.

**اختَصَرَ** فلان: فلانكەس دەستی خستە سەر كەلەكەی ◊ عەصای بەدەستەوە گرت و خۆی بەسەردا دا ◊ اختَصَرَ الِمخْصَرَةَ: عەصای وەرگرت و توند گرتی بەدەستەوە ◊ شتەكەی بڕییەوە بەلام دولەتی نەكرد ◊ اختَصَرَ الطريقَ: نزیكترین رێگای گرتە بەر ◊ اختَصَرَ الكتابَ: چەند باس و شتی زیادی لەكتێبەكە لابردن ◊ اختَصَرَ الشَّيْءَ: زێدەی شتەكەی لابرد ◊ تَخاصَرَ: هەریەكە لەو دوانە دەستی خستە كەلەكەی ◊ تَخاصَرَ الشخصان: ئەو دوو كەسە بە رێگادا رۆیشتن و دەستی هەریەكەیان لە ئاستی كەلەكەی ئەوی تریان بوو.

**تَخَصَّرَ**: دەستی خستە سەر كەلەكەی.

**تَخَصَّرَ** بالازار: دەرپێكەی خستە سەر كەلەكەی ◊ تَخَصَّرَ بالمِخصَرَةِ: عەصاكەی بەدەستەوە گرت ◊ الأَخْصَرُ: كورت تر ◊ الخاصِرةُ: كەلەكە (نێوان نێسقانی سەری ران و پەراسوی لای خوارو) ◊ الِخصارُ: دەرپێ یان هەر شتێك لە ناوكەوە بۆ خوارەوە جەستە داپۆشێ، پشتێن.

**الْخَصْرُ** مِن الانسان والحیوان: ناوقەد، ئاستی سێبەندەو ناوك ◊ باریكایی پشت كلۆت.

**خَصْرُ** القدم: بەری پێ (نێوان سینگی پێ و پاژنەی پێ).

**خَصْرُ** السهم: ناوەراستی تیر ◊ الخصیری: كورتكردنەوە ◊ لابردنی شتی زیادە ◊ المِخْصَرَةُ: عەصاو گۆچان هەر شتێك خۆی بەسەردا بدرێ ◊ دارێكە لە شێوەی شمشێردا وتار خوێن بە دەستییەوە دەگرێ ئاماژەی پێ دەكا لەكاتی وتارەكەیدا ◊ مخاصِر الطريق: نزیكترین رێگا ◊ الْمُخَصَّرَةُ: بەری پێ ئەو بەشەی دەكەوێتە سەر زەوی سنگی پێ و پاژنە پێ ◊ الْمُخَصَّرُ: قەد باریك، قاچ و قول پچوك.

**خَصَّ**: تایبەت پێچەوانەی گشت و رەها.

**خَصَّ** فلاناً: شتی زۆری دا بە فلانكەس ◊ ئەوی تایبەت كرد بەو شتەوە، شتەكەی دا بە ئەو.

**خَصَّ** خصاصاً وخصاصة: هەژار كەوت ◊ أخصَّهُ بە: بەمانا (خَصَّهُ) دێ ◊ اختصَّ الشَّيْءَ: بەمانا (خَصَّ) دێ ◊ اختَصَّ فلان: فلانكەس هەژار بوو ◊ اختَصَّ بە: تایبەت بوو بەو شتەوە، تاكە كەسە لەو بوارەدا ◊ اختَصَّ الشَّيْءَ: شتەكەی هەڵبژاردو پەسەندی كرد ◊ اختَصَّ فلاناً بكذا: فلانكەسی تایبەت كرد بەو شتەوە ◊ اختَصَّ الشَّيْءَ لنفسە: شتەكەی تایبەت كرد بەخۆیەوەو بۆ خۆی دانا ◊ تَخَصَّصَ: قاڵ بوو لەو شتەداو تایبەت بوو پێیەوە ◊ تَخَصَّصَ بە ولە: تایبەت بوو بەو شتەوەو پێی تایبەت بوو ◊ تَخَصَّصَ في علم كذا: لێكۆڵینەوەو خوێندنەوەو نووسینەكانی تایبەت كرد بەو بوارەوە ◊ استَخَصَّهُ: بە تایبەتی لەقەڵەم دا، هەڵی بژاردو پەسەندی كرد ◊ الاختِصَاصُ في القضاء: بریتییە لەو دەسەڵاتەی دادگا هەیەتی بە گوێرەی شوێن و جۆری رووداوەكە ◊ الخاصة:

تايبەت پێچەوانەی وشەی (عامّة)یە ◊ هەروا ئەو شتەی تایبەتی دەکەی بە خودی خۆتەوە ◊ **خاصة الشَّيْئ**: تایبەت مەندی شت، ئەوەیە تایبەت بێ بەو شتەوەو بۆ شتی تر نەبێ ◊ **خواص العقاقیر**: کاریگەریی دەرمان‌و تایبەت مەندییەکانی لەسەر جەستە.

**الخَصاصَةُ**: فەقیری‌و پێداویستی‌و حاڵ‌و وەزعی خراپ ◊ بۆشایی‌و خەلەل‌و درزو کون لە دەرگاو شتی وا ◊ **الخُصاصَةُ**: تولە مێو ئەگەر تێر ئاو نەبێ‌و هێشو ترییەکانی دەنک وردو بڵاوو لاوازبن ◊ ئەو تولە مێوەی دوای برین بە دار مێوەوە دەمێنێتەوە.

**الخُصُّ**: کەپر یان کوخ کە بە کەرستەی قەفەزاز دروست کرابێ ◊ خانوێك هەڵاشەکەی دارو شتی وا بێ ◊ دوکانی مەی فرۆش یا بەکەرستەی تریش دروست کرابێ ◊ **الخِصِّيصُ**: تایبەت مەندتر لە تایبەت ◊ **الخِصِّيَّةُ**: بەمانا (الخاصة) دێ ◊ **الخُصُوصُ**: پێچەوانەی (العموم) ◊ مانای (بە تایبەتی) دەگەیەنێ.

**الخُصُوصَة**: حاڵەتی تایبەت ◊ **الخُصُوصِيَّةُ**: (خُصُوصِيَّة الشَّيْئِ) تایبەت مەندییەکەی ◊ **الخَصِيصَةُ**: ئەو صیفەت‌و چۆنیەتییەیە کە شتەکە جیا دەکاتەوە ◊ **خَصَفَت الناقَةُ خَصْفاً وخِصافاً**: حوشترەکە بێچووەکەی دوای نۆ مانگ بوو، لە مانگی نۆیەمی سکەکەی دا زا، یان دوای تەواو بوونی ساڵ بەچەند مانگێك.

**خَصَفَ** النَّعْلَ: نەعلەکەی بە درێوشە دوورییەوە.

**خَصَفَ** العریانُ الورقَ علی بدنه: پیاوە روتەکە گەڵا داری بە جەستەی خۆیەوە نوساند.

**خَصَفَ** علی نفسه ثوباً: قوماشێکی لەخۆ هاڵاندو ئەمسەرو ئەوسەری بە چیلکەیەك یان بەهۆی درونەوە لیك بەستن.

**خَصَفَ** الشَّيْئَ الی الشَّيْئِ: شتەکەی خستە پاڵ شتەکەی ترەوە.

**خَصَفَ** الكتيبة: پەلە سەر بازەکەی قەرەباڵغ کردن.

**خَصِفَ** خَصَفاً: رەنگی لە رەنگی خۆڵ دەچێ ◊ **خَصِفَت الشاة والفرسُ**: لا کەلەکەی مەرەکە یان ئەسپەکە سپی بوو ◊ **أخصَفَ العریان الورق علی بدنه**: بەمانا (خَصَفَه) دێ ◊ **خَصَّفَ**: رەوشتی ناشیرین بوو، تەنگە تاو بوو ◊ جنێوی زۆری پێدا.

**خَصَّفَ** الشیبُ فلاناً: مووی رەش‌و مووی سپی فلانکەس بەرامبەر بوون ◊ **خَصَّفَ العریان الورقَ علی بدنه**: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ ◊ **اختَصَفَت الناقة**: حوشترەکە بە نۆ مانگی سکەکەی دانا ◊ **اختَصَفَ العریانُ بالورق علی بدنه**: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ.

**تَخَصَّفَ العریانُ** الورق علی بدنه: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ ◊ **خِصافٌ**: ناوی ئەسپێکی بەناو بانگە ◊ **الخَصَّاف**: پینەچی ◊ درۆزن ◊ لەم رووەوە قسەی درۆ دەخاتە سەر قسەی درۆ، قسەیەکی درۆی بە درۆیەکی تر پینەدەکا.

**الْخَصَفَةُ**: پارچەیەك کە دەکرێ بە پینە ◊ **الْخُصْفَةُ**: درزو کونی نەعل ◊ **الْخَصَفَةُ**: بەر چنەیەك، زەرفێکە لە لقی دار خورما دروست دەکرێ‌و خورمای تێدا هەڵدەگیرێ ◊ قوماشی ئەستورو زبر ◊ **الخَصِيفُ**: گڵ‌و خۆڵ ◊ رەنگێك وەکوو رەنگی خاك ◊ هەر شتێك دوو رەنگ‌و زیاتری هەبێ وەکوو تێکەڵاو بوونی رەنگی رەش‌و سپی

٥ **اَلْخَصِفَةُ**: هەرشتێك بەڵەك بێ دوو رەنگ بێ، هەموو توێیەکی نەعل ٥ شیری مەییو (فرۆ) ٥ **المِخْصَفُ**: درێوشە، سوژن ٥ هەر شتێك نەعلی پێ کون بکرێ.

**خَصَلَ** السَّهمُ: تیرەکە لە تەنیشت نیشانەکەی دا.

**خَصَلَ** الهدفَ أو الغَرَضَ أو القِرطاسَ: نیشانەکەی هەنگاوت.

**خَصَلَ** الشَّيْءَ: شتەکەی برییەوە، پارچە پارچەی کرد.

**خَصِلَ** غَيرهُ: لە تێکۆشان و بەرمنگاری کردندا بەسەر بەرامبەرەکەیدا زاڵ بوو ٥ **أخْصَلَ**: نیشانەکەی هەنگاوت ٥ دەگوترێ: (رمى فأخْصَلَ) دوو جار لەسەر یەك کاغەزەکەی هەنگاوت ٥ **خاصَلَهُ خِصالاً ومُخاصَلَةً**: بەرمنگاری بووە، روبەڕوی وەستا ٥ **خَصَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پارچە پارچە کرد.

**خَصَّلَ الشَّجَرَ**: لق و پۆپی درەختەکەی بڕی و ئەملاو ئەولای هەڵپاچی ٥ پڕژو پاڵی لێ کردنەوە ٥ **خَصَّلَ البعيرَ**: توکی حوشترەکەی لێکردەوە ٥ **تَخاصَلَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە پێشبڕکێ و کێ برکێ لە تفەنگ چییەتی و تێکۆشاندا.

**اَلْخَصْلُ**: ئەوەی گرەوی لەسەر دەکرێ.

**اَلْخَصْلَةُ**: رەوشتێکە لە ئادەمیزاددا وادەبێ رەوشتی بەرزە وا دەبێ رەوشتی ناشیرینە ٥ هێشوی میوە ٥ چڵە دارێکە درکی پێوەبێ ٥ سەرێکی شوڕکی تەڕو نەرم ٥ **اَلْخُصْلَةُ**: موی کۆمەڵ و پڕ بەسەر ناژەڵەوە ٥ هێشووی میوە ٥ چیلکە دارێکی چقڵاوی، هەموو شوڕکە دارێکی نەرم ٥ سەرو پرچی شۆڕەوەبووی درەخت، لق و پۆپی شۆڕەوە بوو ٥ پارچە گۆشت ٥ **اَلْخَصَلَةُ**: سەرێکی لقە داری تەڕ ٥ شوڕکە داری (عرفوط) ٥ چیلکە داری چقڵاوی ٥ **الخصيلُ**: تاوان و گوناه ٥ **الخصيلَةُ**: هەر پارچە گۆشتێك پچوك یا گەورە ٥ پرچی بادراوو هۆنراوە ٥ کوڵك و موی بادراو ٥ **خَصَمَهُ خَصْماً**: لە کێشەو نیزاعدا بەسەریدا زاڵ بوو.

**خَصِمَ** خَصَماً: کێشەو نیزاعەکەی توندکرد ٥ کێشەی لەگەڵدا کرد ٥ **أخْصَمَ فلاناً**: بەڵگەو نیشانەی فێری فلانکەس کرد بۆئەوەی لە کێشەکەیدا باڵا دەست بێ.

**خاصَمَهُ مُخاصَمَةً**: کێشەی لەگەڵدا کرد ٥ **اخْتَصَمَ القومُ**: خەڵکەکە کێشەو نیزاعیان لەگەڵ یەکتر کرد ٥ هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان کێشەیان بەرپا کرد ٥ **تَخاصَمُوا**: بەمانا (إخْتَصَمُوا) دێ ٥ **الأُخْصُومُ**: قوڵفەی جەواڵ و تێرەو هۆڕ ٥ یان تایەکی بار.

**اَلْخَصْمُ**: دژ ٥ بەرامبەر ٥ کێشەکار.

**اَلْخُصْمُ**: لایەن و دەڤەر ٥ قەراخی شت ٥ ئەمسەرو ئەوسەری شت ٥ قولینچکی هۆڕو شریف و تەغار ٥ درزو بەتاڵایی ٥ دەراوی شیوو دۆڵ ٥ کون و کەلەبەر ٥ **أخصام العين**: ئەوبەشەی برژانگ دایدەپۆشێ.

**اَلْخَصِمُ**: لێزان و کارامە لە کێشەو نیزاعدا وریاو زانا بۆ بردنەوەی کێشەکەی ٥ ئاشوب گێڕو کێشە دروستکار بەناحەق ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾ ٥ **اَلْخُصْيَنُ**: پاچە کۆڵە ٥ پاچی پچوك ٥ **خَصَاهُ خَصْياً وخِصَاءً**: خەساندی ٥ گونی دەرهێنان ٥ کێری بڕی.

**خَصِيَ**: گونی ئازاری لێ پەیدا بوو ٥ هەژار بوو ٥ اختصاه: بەمانا (خَصَاهُ) دێ ٥ **الخُصِيُّ**: هێلکە گون (هێلکەی کۆئەندامی زاوزێ) ٥ پێستی گون.

**ألخَصِي**: گون هێشاو، ئەو كەسەی گونی ئازاری هەبێ ◊ **ألخُصيَةُ**: هێلكەی گون ◊ (هێلكەی كۆئەندامی زاوزێ).

**خُصَي** الثعلب وخُصي الكلب: رەگەزی ئەو روەكە بەتەمەنانەن كە لە پێری (السَّحلبيه)ن‌و سەحلەب كە مادەیەكی سركەرە لەو بەرهەم دەهێندرێ ◊ **ألمَخْصَى**: شوێنی براوی گون.

**خَضَبَ**: رەنگاو رەنگ بوو، خەناوی بوو.

**خَضَبَ** الشجرُ: درەختەكە سەوز بوو، گەڵای دەركرد ◊ **خَضَبَت الأرض**: زەوی گژوگیای رواو سەوز بوو ◊ **خَضَبَت الماشيةُ**: ئاژەڵەكە گەڵای تازە پشكوتوی درەختەكەی خوارد.

**خَضَبَ** ألشَّئَ خَضباً وخِضاباً: رەنگی شتەكەی خەناوی كرد.

**خَضِبَ** الشَّجَرُ: بەمانا (خَضَبَ) دێ ◊ **أخضَبَتِ الأرض**: بەمانا (خَضَبَتْ) دێ ◊ **خَضَّبَهُ**: بەمانا (خَضَبَهُ) دێ ◊ **اخْتَضَبَ**: بە خەنە رەنگی كرد ◊ **تَخَضَّبَ**: بە خەنەو شتی لەو جۆرە رەنگی كرد ◊ **تَخَضَّبَ بالدماء**: بەخوێن رەنگی كرد ◊ **تَخَضَّبَتِ الأرض**: بەمانا (خَضَبَتْ) دێ ◊ **اخْضَوْضَبَ**: بەمانا (خَضَبَ) دێ ◊ **الخاضِبُ من البهائم**: ئەو ئاژەڵەیە گەڵای تازە پشكوتوی درەخت بخوا ◊ **الخِضاب**: خەنەو هەرشتێ لەو جۆرە بێ بۆ رەنگ كردن ◊ **ألخَضْبُ**: گەڵای درەخت كە تازە دەپشكوێ ◊ روەكی تازە شین بوو كە بە باران زۆر سەوز دەبێ ◊ **الخُضَبَةُ**: ئافرەتێك زۆر خەنە بەكاربێنێ‌و لەخۆی بدا ◊ **الخضيب**: دەستی خەناوی ◊ ئەستێرەیەكە ◊ **ألمِخْضَبُ**: ئینجانە، سوێنە، تەشت، كە جلی تێدا دەشۆرێ ◊ **المِخْضَبَةُ**: بەمانا (ألمِخْضَبُ) دێ ◊ پەرۆی خەناوی ◊ پەرۆێی كە ئافرەت لەكاتی عادەی مانگانەیدا بەخۆی هەڵدەگرێ ◊ **خَضْخَضَ ألشَّئَ**: شتەكەی جولاندو رای تەكاند ◊ **خَضْخَضَ الأرض**: زەوییەكەی كێڵاو هەڵەو گێری كرد بۆئەوەی نەرم بێ‌و كە ئاودرا بە باشی رووەكی لێ بڕوێ ◊ **تَخَضْخَضَ**: بۆ موطاوعەی (خَضْخَضَهُ) دێ ◊ **الخُضاخِضُ**: شوێنێك ئاوو درەختی زۆر بێ، ئاودارو چڕبێ ◊ قەڵەوی ورگن ◊ **ألخَضْخاض**: جۆرە قەترانێكی رەش‌و روونە حوشتری گروێی پێ چەور دەكرێ ◊ **ألخُضْخُضُ**: بایەكە لە نێوان شەماڵ‌و رەشەبا دایە ◊ **الخُضَخِضُ**: بەمانا (ألخُضْخُضُ) دێ.

**خَضَدَ** خَضْداً: شتێكی تەڕی خوارد وەكوو گێزەرو خەیار.

**خَضَدَ** ألشَّئَ: شتەكەی شكاند بەڵام لێكی جیا نەكردنەوە ◊ بڕیەوە ◊ خواری كرد.

**خَضَدَ** الشَّجَرَ: چڵ‌و چاڵی لە درەختەكە دەرهێناو پاكی كردەوە.

**خَضَدَ** الشوكَ: چقڵەكەی لە درەختەكە داماڵی لێی كردنەوە.

**خَضَدَ** شوكة فلان: توندو تیژی فلانكەسی شكاندو هێواشی كردەوە.

**خَضِدَ** خَضَداً: نەرم بوو.

**خَضِدَ** الثمرُ: میوەكە لاوازبوو سیس هەڵگەڕا.

**خَضِدَ** النَّبتُ: روەكەكە لاواز بوو سیس بوو ◊ **أخْضَدَ المُهْرُ**: جوانوەكە ئاسنی لغاوەكەی دەجوو لەبەر تەڕ دەماخی‌و سركی خۆی ◊ **خَضَّدَهُ**: بەمانا (خَضَدَهُ) دێ ◊ **اختَضَدَ ألشَّئَ**: شتەكە دولا هاتەوە، چەمایەوە ◊ **اختَضَدَ البَعيرَ**:

لوتەوانەی لە لوتی حوشترەکە کرد بۆئەوەی سەر نەرم بێ لغاوی خۆش بێ ٥ اَلْخَضَدَ: شکا، چەمایەوە ٥ اَنْخَضَدَ الثمرُ: میوەکە شکا، درزی تێ بوو ٥ تَخَضَّدَ: بەمانا (اَنْخَضَدَ) دێ ٥ اَلْخَضَادُ: درەختێکە نەرمو شلكو بێ چقڵو درکە ٥ ئازارێکە توشی ئەندامەکانی جەستە دەبێ بەلام ناگاتە ئازاری شکان.

**اَلْخَضَدُ**: ئەو لقو پۆپە براوو شکاوانەن کە بە درەختەکەوە دەشکێنەوە ٥ یان دەبڕێنەوە ٥ درەختێکی نەرمو شلكو بێ چقڵو درکە ٥ ئازارێکە تووشی ئەندامی جەستە دەبێو ناگاتە ئازاری شکان ٥ اَلْمِخْضَدُ: ئامێری گەلا بڕی، تەورداس، یان هەرشتێکی تر کە لقو پۆپی درەختی پێ ببڕدرێتەوە ٥ اَلْمَخْضُودُ: کەسێك نەتوانێ هەڵسێو رابەرێ ٥ یان کەسێك لە کێشەو دانوساندا بەڵگەی پێ نەبێو دۆش دابمێنێ.

**خَضَرَ** الرجلُ النخلَ خَضْراً: پیاوەکە دار خورماکەی بڕیەوە.

**خَضِرَ** خَضَراً وخُضْرةً: سەوز بوو.

**خَضِرَ** الزرعُ: کشتو کاڵەکە راساو پێگەییو سەوز بوو ٥ أَخْضَرَّهُ: سەوزی کرد ٥ اخْضَرَ الرِّيّ الزرعَ: ئاودێر کردنەکە کشتو کاڵەکەی وا لێکرد لەخۆ بکەوێو گەشە بکا ٥ خاضَرَهُ: بەروبومەکەی بە سەوزی فرۆشت (شین دروی کرد) ٥ خَضَّرَهُ: وای لێکرد سەوز بێ ٥ خَضَّرَ الأرضَ: گەنم یان زوراتی بەناو زەوییەکەدا چاند ٥ اخْتَضَرَهُ: بە سەوزیو نەکامڵی بڕیەوە ٥ دەگوترێ: (اخْتَضَرَ الشجرَ واخْتَضَرَ الکلأ) بۆیە ئەگەر گەنجێك بمرێ دەڵێن: (أُخْتُضِرَ) ٥ إخْتَضَرَ: بڕیەوە، لە بێخ هەڵی کەند ٥ بە سەوزیو کاڵی خواردی، دەگوترێ: (إخْتَضَرَ الفاكهة) میوەکەی خوارد پێش ئەوەی پێ بگا ٥ إخْتَضَرَ الحِمْلَ: بارەکەی هەڵگرتو تواني ٥ إخْضَرَّ الشَّيْءُ: بەمانا (خَضِرَ) دێ ٥ إخْضَرَّ الكلأُ: لەوەڕەکە دورایەوە ٥ إخْضَرَّ الليلُ: شەوەکە تاریك بوو دونیا رەش داگەڕا ٥ اخْضَارَّ: وردە وردە سەوز هەڵگەڕا ٥ إخْضَوْضَرَ: بەمانا (إخْضَرَّ) دێ ٥ الأخاضِرُ: زێڕ، گۆشت، بادە ٥ شاب أَخْضَرُ: گەنجێك كە مووی لا رووەتی سەریان دەرهێنابێ ٥ سەرەتای هاتنی ریشی دیاریدا ٥ أَخْضَرَ الجناحين: شەو ٥ فلان أَخْضَرُ: فلانكەس خێرو بێری زۆرە ٥ أَخْضَرُ القفا: بە كەسێك دەگوترێ دایكی قولە رەش بێ ٥ أَخْضَرَ البطن: نازناوی جۆلایە ٥ أَخْضَرَ النواجذ: نازناوی فەلاو وەرزێرە ٥ الأُخَيْضِرُ: مێشی رەنگ سەوز قەبارەی وەكوو مێشی رەش وایە ٥ دەردێكە تووشی چاو دەبێ ٥ اَلْخَضَار: سەرەتای سەوزەوات ٥ ماستاوێك ئاوی زۆری تێكرابێ رەنگی سەوز بووبێ ٥ خُضَارَة: بەبێ وشەی (أل) واتە دەریا لەو رووەوە كە سەوز دەنوێنێ ٥ اَلْخُضَارَةُ: گیاو گژی سەوز ٥ اَلْخُضَارِي: باڵندەیەكی رەنگ سەوزە بە عەرەبی ناوێی تریشی هەیە كە (القارِية)یە ٥ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەكی تر كە ناوی (الأخْيَل).

**اَلْخَضْرُ**: ئەو لقو پۆپەیە بە تەڕی بپڕدرێ.

**اَلْخِضْرُ**: بەفیڕۆ چون.

**اَلْخَضَرُ**: لقو پۆپی دار خورما بە سەوزو تەڕی.

**اَلْخَضِرُ**: زەرعاتی تەڕو تازەی سەوز ٥ شوێنێك سەوزایی زۆربێ ٥ درەختی خورما ٥ اَلْخَضْراءُ: سەوزە بەهەموو جۆرێكیەوە ٥ بنەچەو ئەصڵو فەسڵ ٥ هەرزانیو ژیانی خۆش ٥

ئافرەتی رەش پێست (قولە رەش) ٥ ئاسمانی شین ٥ دەستە سەربازی زۆر ٥ دۆڵچە کە زۆر ئاوی پێ هەڵێجینەدرێ قەوزە بکا ٥ خضراء الدمن: بە ئافرەتێک دەگوترێ روخساری جوان بێ‌و رەوشتی ناشیرین بێ ٥ ألْخُضْرَةُ: رەنگی سەوز (ك: خُضَرٌ وخُضَرٌ) ٥ نەرمو نیان‌و بەناز پەروەردە ٥ ئادەمیزادی گەنم رەنگ ٥ ئەسپی رەنگ خاکی بۆر (شێ) ٥ الخُضَّارُ: رەگەزی باڵندە لە پێری (الخضارية) ٥ ئەو باڵندانەی پەنجەیان پێکەوە نووساون ٥ الخُضَّارِي: زەرعات (کشت‌و کاڵ) لە کاتی سەوزیدا ٥ الخَضُورُ: بەمانا (الأخضَر) دێ ٥ الخَضِيُّ: بەمانا (الأخضر) دێ ٥ روەکی سەوز ٥ دەریا ٥ الخضِيَّةُ: دار خورمایەکە خورماکەی هێشتا سەوزە کەمی تامی شیرینی تێدەکەوێ ٥ ئافرەتێک کە سکی بۆڕانەگیرێ، هەر منداڵی لەسکی کەوت پێش کامڵ بوونی سکی لەبەر بچێ ٥ الخُضَيْرِي: باڵندەیەکە لە پێری (الشرشوريات) دەندوکی مەخروطییە، واتە: سەر دەندوکی تیژو بنەکەی ئەستور.

المِخْضَارُ: بەمانا (الخضرة) دێ ٥ المِخْضَرُ: چنگ‌و نینۆک، بۆ باڵندەو درندە ٥ المَخْضَرَةُ: شوێنێک سەوزایی زۆر بێ ٥ (أرض مخضرة) زەوی سەوز ٥ الْيَخْضُورُ: مادەی سەوزی گیاو گژ ٥ اللاخضور: ئەو روەکەی رەنگی سەوز نەبێ ٥ خَضَرَبَ الماءُ وغیرُه: ئاوەکە شڵەقا ٥ الخُضَارِبُ: ئاوێک شەپۆلەکانی تێکەوە بهاون ٥ المُخَضْرَبُ: زمان پاراوی قسە زان‌و کارامە لە وتاردانەدا ٥ الخِضْرِيجُ: شوێنێک کاڵەکی زۆر بێ ٥ خَضْرَعَ البخيلُ: پیاوە رژدو چروکەکە بە زۆر خۆی سەخی کرد رەوشتی دەستبڵاوی بەسەر خۆیدا هێنا ٥ خَضْرَفَ: پیری لێی دیاری داو پێستی چرچ‌و لۆچی تێکەوت‌و داچۆڕا ٥ خَضْرَمَ الأذنَ: قەراخی گوێچکەی بڕی یان نیوەی بڕی‌و لێی کردەوە، یان بە گوێچکەیەوە هێشتییەوەو لەوە لەرییەتی ٥ تَخَضْرَمَ الزُّبْدُ: رۆنەکە لەبەر ساردی دانار دانار بوو پرژا ٥ الْخُضَارِمُ: ئاوی زۆر ٥ پیاو ماقوڵی سەخی سروشت‌و بەخشندە ٥ الْخَضَارِمَةُ: خێڵێکن لە وڵاتی شام دەژین لە وڵاتی بێگانەوە هاتوونە ئەو دەڤەرە ٥ تاکەکەی (خَضْرَمِيّ)ە ٥ الخِضْرِمُ: هەر شتێک پان‌و پۆڕو گەورە بێ ٥ الْخُضْرُمُ: ئاوێک لەنێوان شیرینی‌و سوێریدا بێ ٥ سوسە مار یان بێچووەکەی ٥ الْمُخَضْرَمُ: کەسێک خەتەنە نەکرابێ ٥ کەسێک لەسەردەمی نەزانی‌و سەردەمی ئیسلامی دا ژیابێ ٥ بەزۆری بۆ ئەو شاعیرانە بەکاردێ کە لەسەردەمی نەزانی‌و ئیسلامیدا شیعری گوتبێ ٥ وەکوو (حسان)ی کوڕی ثابیت ٥ هەروا بە کەسێک دەگوترێ بۆ خۆی قولە رەش بێ‌و باوکی سپی پێست بێ ٥ کەسێک باوکی نەزانرێ کێیە ٥ گۆشت کە نەزانەدرێ گۆشتی ئاژەڵی نێرە یان هی مێیە ٥ خواردنێک نە شیرین نە تاڵ ٥ الْمُخَضْرِمُ: کەسێک سەردەمی نەزانی‌و ئیسلامی دیبێ ٥ هەروا کەسێک دوو سەردەمی دیبن وەکوو سەردەمی شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی گوڵان ٥ یان سەردەمی بەعس‌و سەردەمی فیدراڵی لە عێراق ٥ خاضَّهُ: کاڵا بە کاڵا مامەڵەی لەگەڵدا کرد ٥ خَضْخَضَ المرأةَ: ئافرەتەکەی بە مێروی سپی بچووک رازاندەوە ٥ الخَضَاضُ: ئادەمیزادی ئەحمەق ٥ خشڵی کەم‌و بچوک ٥ بۆ کەسێک: خشڵی پێوە نەبێ ٥ قلێتەی ملی ئاسک‌و پشیلە ٥ پێوەندی دیل‌و شێت ٥ الخَضَاضَةُ: ئادەمیزادی ئەحمەق.

**أَلخَضَضُ**: میروی سپی پچوك ◊ خواردنی جۆراو جۆر، قسەی پڕوپوچ ◊ **أَلْخَضِيضُ**: شوێنی قوڕاوی ◊ شوێنێك ئاوو درەختی زۆر بێ.

**خَضَعَ**: گەردن کەچ بوو، مەیلی کردو نەرم بوو بەقسەی کرد.◊ **خَضَعَ** لَه: قسەی نەرمی لەگەڵدا کرد ◊ بە ناسکیو نازەوە قسەی لەگەڵ کردو ئامازەی خۆ بەدەستەوەدانی تێدا بوو.

**خَضَعَ** فِي سَيْرِهِ: لە ڕۆیشتنەکەی کۆششی کردو ملی درێژ کردو بە وریاییەوە هەنگاوی هەڵدەهێنان ◊ **خَضَعَهُ الكِبَرُ**: پیری پشتی چەماندۆتەوە.

**خَضِعَ** خَضَعاً: مەیلی کرد، ژێر بار بوو، پشتی کۆمایەوە ◊ رازی بوو بە ژێر دەستەیی ◊ **اَخْضَعَ فلانٌ**: فلانکەس قسەی نەرمی لەگەڵ ئافرەتەکە کرد ◊ **أَخْضَعَ الشَّيْئَ**: بەمانا (خَضَعَهُ) دێ ◊ **خاضَعَهُ**: قسەی نەرمو نیانی لەگەڵ کرد ◊ **خَضَّعَ اللحمَ**: گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد ◊ **اخْتَضَعَ**: بەمانا (خَضَعَ) دێ ◊ **اخْتَضَعَ الصَّقْرُ** ولَهُ: سەری شۆڕکردەوە بۆئەوەی نێچیر بگرێ ◊ **تَخَضَّعَ**: بەزۆر گەردن کەچی بەسەر خۆیدا هێنا ◊ **أَلْخَضْعَةُ**: دەنگی لێدانی قامچیو کێبڵ ◊ **أَلْخُضَعَةُ**: کەسێك کە ژێر باری هەموو کەس ببێ ◊ کەسێك خەڵکانی تر ژێر بار بکاو بیانچەمێنێ ◊ درەختی خورما کە بەدەنك ڕوابێ نەك بە نەمام.

**اَلخُضُوعُ**: بەمانا (الخاضع) دێ ◊ کەسێك زۆر ژێر بار ببێو زەلیلی قبوڵ بکا ◊ **أَلْخَضِيعَةُ**: دەنگێکە لە گەدەی ئاژەڵ دەبیسرێ، قوڕەی سك، خوڕەی لافاوو شتی وەها ◊ **أَلْخَيْضَعَةُ**: ژاوە ژاوو غەڵبە غەڵب لە شەڕو شتی وادا ◊ شەڕو هەرا ◊ تەپو تۆز.

**خَضَفَ** الطعامَ خَضْفاً: خۆراکەی خوارد.

**أَلْخَضَفُ**: کاڵەك.

**خَضِلَ** خَضَلاً: شەی هێنایەوەو تەڕ بوو، نازو نیعمەتی دەست کەوت.

**أَلْخَضْلُ**: دوڕی صافو بێگەرد وەکوو دڵۆپە ئاوی ڕون ◊ **أَخْضَلَ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ ◊ **أَخْضَلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تەڕکرد ◊ **خَضَّلَهُ**: بەمانا (أَخْضَلَهُ) دێ ◊ لە حەدیثی سولەیمدا هاتووە: (خَضِّلِي قَنازِعَكِ): قژەکانت بە ئاوو ڕۆن نەرم بکە شەداریان بکە ◊ **إِخْضَلَّ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ ◊ **إِخْضَلَّ الليلُ**: شەوەکە زۆر تاریك بوو، هەوای فێنکی شەو هەڵیکرد ◊ **إِخْضَالَّ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ ◊ **إِخْضَالَّت الشجرُ**: درەختەکە لقو پۆپی زۆر بوون ◊ **إِخْضَالَّ**: بەمانا (إِخْضَالَّ) دێ ◊ **اخْضَوْضَلَ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ.

**أَلْخَضَلُ**: لوئلوئی باش ◊ دوڕی صافو ڕون وەکو قەترەی ئاوی صاف ◊ **أَلْخُضُلَّةُ**: هەرزانیو ئاو داری ◊ نازو نیعمەتو خۆشگوزەرانی ◊ ژنو هاوسەر ◊ شۆقە زێڕینە ◊ **خُضْلات**: شتی پڕو پوچ ◊ **أَلْخَضِيلَةُ**: باغچەی فێنكو شێدار ◊ **خَضَمَهُ خَضْماً**: بڕیەوە، پڕ بەدەمی خواردنەکەی خوارد یان بە خڕێیەکانی دواوەی ئاودەمی خواردنەکەی کەرت کرد.

**خَضَمَ** لَه من مالِه: لە ماڵو سامانی خۆی بەشی دا ◊ **خَضِمَهُ خَضْماً**: بەمانا (خَضَمَهُ) دێ ◊ **أَخْضَمَ الماءُ**: ئاوەکە شیرین نەبوو تاڵیش نەبوو ◊ **أَخْضَمَ لَه مِن العطاءِ**: بەشی زۆری پێدا ◊ **أَخْضَمَ فلاناً**: رزقو رۆزی زۆری دا بە فلان ◊ **اخْتَضَمَهُ**: بەمانا (خَضِمَهُ) دێ ◊ **أَلْخُضامُ**: شتی بڕدراوە لە گیاو گزو دارو دەوەن ◊ **أَلْخُضَامَةُ**: شتی دراوەو بڕدراو لە گیاو دارو درەخت ◊ **أَلْخُضَمَةُ**: لوش دەر، کەسێك خێرا شت بخوا، ئاژەڵێك خێرا

نالَّف بماشێتەوە ٥ اَلْخِضَمُّ: دەریای پان‌و پۆڕ ٥ كۆمەڵی زۆر ٥ شمشێری بڕندە ٥ ئەسپ‌و ماینی كەتەو ناوقەد ئەستور ٥ اَلْخُضُمَّةُ: زۆرینەی هەموو شتێك ٥ باسك‌و قۆڵ ئەستور ٥ ناوەندو میانە ٥ اَلْخَضِیمَةُ: چڵە گیای سەوزو تەڕ ٥ زەوییەك گیاو گژی نەرمی لیَ بڕویَ ٥ چێشتی گەنمە كوتاو، چەمسوتەكە.

**خَضَنَ** الْجَمَلَ ونحوه خَضْنًا: باری لە حوشترەكە نا ولاغەكەی باركرد ٥ ژێر باری كرد.

**خَضَنَ** الشَّيْءَ: شتەكەی صەرف كرد ٥ **خاضَنَ القومَ مُخاضنةً وخِضانًا**: خەڵكەكە جنێو‌و قسەی ناشیرینیان بەیەكتر گوتن ٥ **خاضَنَ المرأةَ**: مێ بازی لەگەڵ ئافرەتەكەدا كرد ٥ **اَلْمِخْضَنُ**: كەسێك ولاخ دەعاملێنیَ‌و ژێرباری دەكا.

**خَطِئَ** خطأ وخطْأً: تاوانی كرد ٥ یان بە ئەنقەست گوناهی ئەنجامدا.

**خَطِئَ** السهمُ الهدفَ: تیرەكە نیشانەكەی نەهەنگاوت ٥ **أخْطَأَ**: بەمانا (خَطِئَ) دیَ ٥ هەڵەی كرد، لە ڕێبازی ڕاست لایدا ٥ بە ئەنقەست یان بە سەهو تاوانی لیَ ڕودرا ٥ **أخْطَأَ الْهَدَفَ**: نیشانەكەی نەپێكا ٥ **خَطَّأَهُ تخطئةً**: بە هەڵەكارو تاوانباری لە قەڵەم دا ٥ یان بە قسە پێی گوت هەڵەت كرد ٥ **تَخاطَأَ لە**: بە ڕواڵەت خۆی بە هەڵەكار دانا ٥ **تَخاطَأَ الشَّيْءَ**: شتەكەی نەپێكا ٥ **تَخَطَّأَهُ**: بەمانا (أخْطَأَهُ) دیَ ٥ **اسْتَخْطَأَتِ الأُنثى**: مێیەكە ئاوس نەبوو، كەڵی نەگرت.

**اَلْخِطْءُ**: تاوان، یان تاوانی بە ئەنقەست ٥ **اَلْخَطَاءُ**: كردەوەیەك بە هەڵە نەكرابیَ ٥ پێچەوانەی (الصواب)ە.

**اَلْخَطَا**: بەمانا (اَلْخَطَاءُ) دیَ ٥ **اَلْخَطَّاءُ**: كەسێك زۆر هەڵەو تاوان بكا ٥ **اَلْخَطِیئَةُ**: تاوان‌و هەڵە.

**خَطَبَ** الناسَ وفیهم وعلیهم خطابةً وخُطبةً: وتاری بۆ خەڵكەكە دا ٥ **خَطَبْتُ فلانةً**: خوازبێنی ئافرەتەكەی كرد، داوای لە فلان ئافرەت كرد هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدا ٥ **خَطَبَها الى أهلها**: داوای لە كەس‌و كاری ئافرەتەكە كرد ڕازی بن بەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتەكەدا ئەنجام بدا ٥ دەشگوتریَ:

**خَطَبَ** وُدَّهُ: هەوڵی دا خۆشەویستی ئەو بەدەست بێنیَ.

**خَطِبَ** خطبًا وخُطبةً: ڕەنگی مەیلەو خۆڵاوی بوو.

**خَطُبَ** خطابةً: بوو بە وتاربێژ ٥ **أخْطَبَ**: بەمانا (خَطِبَ) دیَ ٥ **أخْطَبَ فلانًا**: وەڵامی خوازبێنی فلانی دایەوە ٥ **أخْطَبَ الشَّيْءَ فلانًا**: شتەكەی لە فلان كەس نزیك كردەوەو وای لێكرد دەستی بیگاتیَ ٥ **خاطَبَهُ**: قسەی لەگەڵدا كرد ٥ قسەی ئاراستە كرد لە بارەی شتێكەوە لەگەڵی دوا ٥ **خَطَّبَهُ**: بەمانا (اخْطَبَهُ) دیَ ٥ **اخْتَطَبَ المرأةَ**: خوازبێنی ئافرەتەكەی كرد ٥ **اخْتَطَبَ فلانًا**: داوای لە فلان كەس كرد ژن بهێنیَ (ژن مارە بكا) ٥ **تَخاطَبَا**: بەیەكەوە قسەیان كرد ٥ **الخِطابُ**: قسەی ڕێك‌و پێك ٥ بەڵگەو شارەزایی لە ئاخاوتندا ٥ نامەو تەوجیهات ٥ (فصل الخطاب) قسەی یەكالا كەرەوە، بڕیاردانی دادوەر لە ئاكامی سوێند یان شایەت ٥ تێگەیشتن‌و لێزانین لە قەزاوەت‌و دادوەریدا ٥ جیاكەرەوەی نێوان حەق‌و بەتاڵ ٥ دەقێك ئەوەندە كورت نەكرابێتەوە مانا نەگەیەنیَ، یان ئەوەندە درێژ بیَ بیَ تام‌و چێژبیَ ٥ **الخطابة**: لە زاراوەی

مەنتیقیەکانــدا قیــاس‌و بەراوردێــکە پێــک هاتبێ لەشتی ظەنی یان شتی مەقبول.

**ألخَطْبُ**: ئیش‌وکار ◊ بەڵاو کارەسات‌و کێشە کە پێویستی بە زۆر لەسەر گوتن هەبێ.

**الخِطْبُ**: دەسگیران، ئافرەتی خوازبێنی کراو ◊ یان پیاوێک کە خوازبێنی دەکا.

**خُطْبٌ**: وشەیەکە عەرەبەکان لەپێش هاتنی ئیسلام بۆ ژن مارەکردن بەکاریان هێناوە ◊ پیاوەکە وتویەتی: (خِطْبٌ) لە وەڵامدا پێیان گوتووە (نِکْحٌ) واتە: لە شوێنی نیکاح‌و تەزویج بەکاریان هێناوە ◊ ألخَطْبَاءُ: دەستێک خەنەی تێگیرابێ‌و رەنگەکەی نەمابێ ◊ ألخُطْبَةُ: بۆ رەنگ بوترێ: مەبەست رەنگێکە کە خاکی یان زەردێک بێ سەوز یان سوری تێکەڵ بێ ◊ پەخشانێک بە شێوەیەکی تایبەتی یەکێکی زمانڕەوان بۆ کۆمەڵی خەڵکی بخوێنێتەوە بە مەبەستی ئەوەی گوێگرەکان کار بە ناوەڕۆکی بکەن ◊ دیباچەی کتێب.

**ألخِطْبَةُ**: خوازبێنی ئافرەت بۆ هاوسەرگیری ◊ دەسگیران ◊ الخَطَّابُ: کەسێک زۆر خوتبە بداو وتار وەخوێنێ ◊ الخَطَّابِیَةُ: پێرێکن لە شیعەی رافزی شوێن رێبازو بیرو بۆچوونی ئەبولخەتابی ئەلئەسەدی کەوتوون ◊ الخَطِیبُ: ئەوکەسەی لێزان‌و کارامەیە لە خوتبە خوێندنەوەدا لە مزگەوت یان لە شوێنی تر ◊ وتە بێژی رەسمی گەل‌و هۆز ◊ خوازبێنی کەری ئافرەت (زاوا) ◊ الخَطِیبَةُ: دەسگیران ◊ ئافرەتی خوازبێنی کراو.

**خَطَرَ** فِي مشیه: خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.

**خَطَرَ** بذنبه: کلکی هەڵسوراند جارێک بەرزی دەکردەوەو دەمێک شۆڕی دەکردەوە ◊ یان بەملاو ئەولادا هەڵی دەسوڕاند.

**خَطَرَ** باله وفیه وعلیه: شتەکەی کەوتە دڵەوە، بە خەیاڵیدا هات.

**خَطَرَ** الشیطان بین الانسان وقلبه: شەیتان ختوکەو وەسوەسەی گەیاندە ناو دڵی ئادەمیزادەکە.

**خَطُرَ**: گەورەبوو رێزی زیادی کرد ◊ أخْطَرَ: خۆی کردە رەفیق هاوشانی فلان‌و بۆی چووە مەیدان‌و شەڕی لەگەڵدا کرد ◊ أخْطَرَ فلان لي وأخْطَرْتُ له: من‌و فلان گرەومان کرد.

أخْطَرَ فلاناً: ئەوەندەی باربەهادا بە فلان تا رازیی کرد ◊ أخْطَرَ المرض فلاناً: نەخۆشیەکە فلان کەسی خستۆتە حاڵەتی مان‌و نەمانەوە ◊ أخْطَرَ الشَّیْئَ: شتەکەی کردە گرەو لەسەر کراو ◊ خاطَرَ به: خۆی خستە گۆڵەمزێکەوە نزیکی لێواری مەرگ بۆوە ◊ خاطَرَ فلاناً: لەگەڵ فلان کەسدا گرەوی کرد ◊ (خاطَرَ علیه) گرەوی لەسەر کرد ◊ خَطَّرَ: بەشی وەرگرت ◊ خَطَّرَ الشَّعْرَ: مووەکەی تێکەڵ بە میزو قشپلی ئاژەڵەکان کرد ◊ تَخاطَرَ: گرەویان کرد ◊ تخاطر الفحولُ بأذنابها: ئەسپەکان گوێیان جوت کردن بە مەبەستی ئامادە بوون بۆ هەڵمەت‌و بازدان ◊ ألخاطِرُ: ئەوشتەی بە دڵدا هات، ئەو فکرەو بیرو بۆچونەی دێتە ناودڵ‌و مێشکەوە ◊ دڵ‌و دەروون ◊ ألخاطِرَةُ: بەمانا (ألخاطِرُ) دێ.

**ألخَطَرُ**: هەوری گەواڵ گەواڵ، هەوری باراناوی ◊ حوشتری زۆر ◊ کەمێڵ ئەو ریخ‌و قشپڵو گەمرەی بە قل‌و قاچی حوشترەوە تەبار دەبەستێ ◊ هەروا ناوە بۆ ئامێرێکی پێوانە

وەکوو تەغارو عەربە دانیشتوانی شام بەکاری دەهێنین.

**ألخِطرُ**: روەکێکە دەست و پەنجەی پێ خەناوی دەکرێ ٥ ماستاوێك ئاوی زۆر بێ ٥ لقەدار ٥ حوشتری زۆر ٥ ئەو کەمێڵو گەمرەیەی لەسەر دەست و پەلی حوشتر تەبار دەبەستێ، ئەو ریخ و پیسایە کە بە جەستەیەوە رەق دەبێ.

**ألخَطَرُ**: نزیك بوونەوە لە لێواری مردن ٥ گرەو ٥ باربەهاو بارتەقاو بەش‌وبار.

**ألخَطِرُ**: ئادەمیزادی بە فیزو ترزل ٥ **ألخَطْرَةُ**: ئەوەیە بە دڵو مێشکدا رادەبوورێ ٥ کات و سات ٥ **ألخطارُ**: ئەوشتەی شتی تری پێ هەڵدەکێشی ٥ گازو پلایس ٥ قۆچەقاینی ٥ زەمبەلەك ٥ شێر ٥ عەتارو بۆن فرۆش ٥ رمب ٥ زەبری رمب ٥ **ألخطارَةُ**: گەووری حوشتر ٥ ئاغەڵی حوشتر ٥ **ألخِطيرُ**: هاوشان لە شەرەف و وەجاخزادەیی دا ٥ لغاوو ریشمە ٥ حەبل و پەت ٥ هێڵەکانی خۆر لە جەنگەی گەرمادا ٥ تاریکایی شەو.

**خَطَّ** الوجهُ خطاً: دەمو چاوی چرچ و لۆچی تێدا پەیدا بوون ٥ لاجانگی مووی لێ دەرهات (ریشی هات).

**خَطَّ** على ألشَّيْ: نیشانەو ئارمی لەسەر شت وێنە کرد.

**خَطَّ** الخِطَّةَ: پلانەکەی دیاری کردو نیشانەی لەسەر دانا بۆئەوەی بزانرێ کە ئەوە هەڵبژاردەی خۆیەتی.

**خَطَّ** ألشَيْءَ: شتەکەی هەڵکۆڵی و شەقی کرد.

**خَطَّ** الکتابَ: کتێبەکەی نووسیەوە ٥ **خَطَّهُ**: بەمانا (خَطَّهُ) دێ، دەگوترێ: (خَطَّطَ الأرض والبلاد): زەوییەکە یان وڵاتیان سنوردار کرد سنوورەکانی دیاری کردن ٥ **خَطَّطَ المکانَ**: شوێنەکەی دابەشکردو ئامادەی کرد بۆ دروستکردنی تەلارو باڵە خانە لەسەری ٥ **خَطَّطَ الحواجِبَ**: بەقەڵەم بڕۆی خۆی کێشاو رێک خست ٥ **اختَطَّ الوَجْهُ**: دەمو چاوی چرچی تێکەوت ٥ **اختَطَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵکۆڵی و شەقی کرد ٥ **التخطيط**: پلان دانان و نەخشە کێشان.

**ألخَطُّ**: دێڕ ٥ نووسین ٥ هەرشوێنێك ئادەمیزاد سنووری بکێشێ و سنوورەکانی بە هەڵکەندنی کانگەو روشاندنی زەوییەکە ئەنجام بدرێ ٥ رێگای راستی درێژو لاکێشەیی.

**خط** الاستواء: لە زاراوەی جوگرافیدا ئەو کەوانەیە سفرەیە زەوی دەکاتە دوو بەش ٥ لە ناوەراستی مەسافەکەدا درێژ دەبێتەوە بۆ ناو جەمسەرەکان.

**خَطُّ** الرجعة: ئەو رێگایەیە سوپا دەبەستێتەوە بە مەرکەزەوە.

**ألخَطُّ** الامامی: هێڵی پێشەوەی گۆرەپانی شەر ٥ **فن الخط**: دەست رەنگینی لە خۆش نووسیدا ٥ **علمُ الخَطِّ**: زانیاری رەمڵ هاوێژی ٥ **ألخُطُوطُ البرِّيّة**: ئەو رێگاو بانانەی ترومبیل و شتی وایا پێدا دەروا ٥ **ألخُطُوطُ الجوية**: رێبازی تەیارە لە هەوادا ٥ **ألخُطُوطُ المائية**: رێگای کەشتی و گەمی لەناو ئاودا.

**ألخُطُّ**: رێگای درێژەوەبوو ٥ شوێنی گەرەك لەناو شاردا.

**ألخِطُّ**: ئەو شوێنەی ئادەمیزاد بۆخۆی بردەدا لە زەوی بۆ جێگای خانوو کردن یان بەکارهێنانی بۆ باغ و شتی تر ٥ **ألخَطاطُ**: خۆشنووس ٥

الْخُطَّـةُ: نەخـشەو پـلان، نـیش‌و کـار، بڕیارێـک لێـکۆڵینەوەی تێـداکرابێ‌و هەڵبـژێردرابێ بـۆ تەنفیز ٥ الْخِطَّةُ: بـەمانا (الْخِـطُّ) دێ ٥ الْخَطِّيُّ: شمشێرێک لـە وڵاتـی (الخَـطُّ) کـە شوێنێـکە لـە بەحرەین دروستکرابێ، یان لـەوێ دەفرۆشـرێ‌و ڕەواجـی هەیـە ٥ الْخَطُّـوطُ: ئەوکەسـەی بـە ڕۆیشتن بـە نـاوی زەویـدا هێڵ دروست دەکا ٥ مادەیەکە بڕۆی پـێ ڕێـک دەخـرێ ٥ الْخَطِيطَـةُ: لمبەلاّن ٥ زەوییەک هەندێکی بارانی لێ درابێ‌و هەندێـکی بـارانی لێ نـەباری بـێ ٥ المِخَـطَّاطُ: هەرشتێـک هێڵـی پـێ ڕێـک بخـرێ ٥ المِخَـطُّ: هەرشتێک شتی پێ بدورێتەوە ٥ وەکوو سوژن‌و دەرزی ٥ شیشی گۆرەوی چنین‌و شتی لـەوجۆرە ٥ المخطوط: هـەر شتێـک بەدەست نووسـرابێ ٥ کتێبـی دەسـتنووس ٥ الْمَخْـطُوطَةُ: ئـەو نوسخەیەی بەدەست نووسـراوە.٥ خَطَفَ خطفاً وخَطَفَانـاً: بـەخێرایی ڕۆیـی‌و تیـژ تێپـەڕی ٥ فڕاندی، هـەڵی گـرت‌و بـردی. ٥خَطِـفَ خَطْفـاً: بـەمانا (خَطَـفَ) دێ.٥ خَطُـفَ: گـڕو لاواز بوو.٥ خَطِفَ الشَّيْ: شتەکەی ڕفاند، فڕانـدی ٥ أَخْطَفَ: کەمێ نەخۆش کەوت‌و زوو چاکبۆوە ٥ أَخْطَفَ السهمُ: تیرەکە نەیپەنگاوت، هەڵەی کـرد ٥ أخـْطَفَ الحُمّـى المَريضَ وعنـه: نەخۆشـییەکە لەجەستەی نەخۆشەکە لاچوو نەما چاکبۆوە ٥ أخـْطَفَ المرضُ فلانـاً: نەخۆشـییەکەی لەسـەر سـووک بـوو بـۆی نەکـەوت ٥ أخـْطَفَ الـشَّيْءَ: شتەکەی هەڵە کرد بۆی نەچوو ٥ أخْطَفَ لي من حديثه شيئاً: کەمی لە قسەکەی بـۆ دەرخستم‌و بێدەنگ بـوو ٥ أخـْطَفَهُ: بـەمانا (خَطَفَـهُ) دێ ٥ تخطَّفَـهُ: بـەمانا (خَطَفَـهُ) دێ.٥ الأخـْطَفُ: قەدبارێک، کەسێک ورگ‌و ڕیخۆڵەی پچووک بێ

٥ الخَـاطِفُ: تیرێـک نیـشانەکە نەهـەنگێوێ ٥ خَـاطِف ظِلّـه: باڵندەیەکـە سـێبەری خـۆی لێ دەبێتـە نێـچیرو پـەلاماری دەدا ٥ الخـاطوف: ئـامێری شـت فڕانـدن ٥ الخُطَّـافُ: کەسێـک زۆر ڕفێنەر بێ ٥ الخُطّـاف: بـەمانا (الْخَـاطُوف) دێ ٥ هـەر ئاسنێـک سـەرەکەی چۆمابێتەوە وەکـوو قولاپ، دەنـدوکی باڵنـدە، باڵنـدەی سینونو کـە جۆرە باڵندەیەکە دەندوک یان باڵەکانی باریک‌و درێژ ٥ کلکی فشەڵۆک ٥ الْخَطَفَةُ: پارچەی بـڕاو لە ئاژەڵ بە زیندویی ٥ قومە شیرێک منداڵ لـە مـەمکی دایکـی دەیگـرێ‌و بـەرەڵای دەکـا ٥ الْخَطَفَى: ڕۆیـشتنی خێـراو بەپەلە ٥ الْخَطِيفَـةُ: بـەمانا (المخطوفـةُ) دێ ٥ پـەڵو، کاسـتەر ٥ شـیرو ئـاردی بەسـەردا دەکـرێ‌و دەکوڵێنـدرێ‌و بـە کەوچک دەخورێ ٥ المِخْطَفُ: بـەمانا (الْخَـاطِفُ) دێ ٥ هـەروا بـەمانا (الخـاطوف) دێ.٥ خَطِـلَ خَطَـلاً: جەسـتەی داهێـزاو بـاری تەندروسـتی خراپ بوو ٥ پەلەی کردو لە ڕێبازی ڕاست لایدا ٥ ئەحمەق بوو ٥ هەڵەی کردو قسەی ناشیرینی کردن.٥ خَطِلَ في مشيه: لـە ڕۆیشتنەکەیدا لارو لەنجەی کرد ٥ أخْطَلَ في كلامه: بـەمانا (خَطِـلَ) دێ ٥ تَخَطَّـلَ: خـۆی بـاداو لارو لەنجـەی کـرد ٥ الْخَطَّـالُ: جـوێن فـرۆش‌و قـسە تـڕن ٥ گوماناوی.٥ الْخَطَلُ: قسەی پڕوپوچ‌و خـراپ‌و ئاشوباوی ٥ قسەی بێ سەروبەرو وێ نەچوو ٥ الْخَطِـلُ: ئەحمـەق‌و ناکـەس بەچـە ٥ ڕمـب وەشـێنی گـورج‌و گـۆڵ ٥ خَطَمَـهُ خَطْمـاً: لـە لوتەوانەکـەی سـرەواند ٥ لوتەوانـەی لـە لـوتی کرد.

خَطَمَ أنفَ فلان: داخی عەیب‌و عـاری بـە لوتیـەوە نا، سەری لوتی ڕەش کرد.

**خَطَمَ** فلاناً بالكلامِ: بەقسەی کاریگەر دەمی فلانکەسی بەستو نەیهێشت دەم بکاتەوە.

**خَطَمَ** الجلدَ ونحوَه: دەوروبەری پێستەکەی دوریپەوە.

**خَطَمَ** القَوسَ بالوَتَرِ: قەوسەکەی بە ژێیەکە هەڵواسی، هەڵیواسی ◊ **خَطْمَةُ**: بەمانا (خَطْمَةُ) دێ ◊ **الأخطم**: لوت درێژ، رەش پێست ◊ **الخِطام**: هەوسار، رێشمە ◊ ئەو دارەی دەکرێتە لوتی حوشترەوە بۆئەوەی جڵەوی خۆش بێ ◊ منع **خِطامَهُ**: کابرا رازی نەبوو بە چەوسانەوەو ژێر بارکردن ◊ ژێی قەوس ◊ **الخُطّام**: دەگوترێ: (مسك خَطّامٌ) میسکێکە پڕ بە لووت، بۆنی ئەوەندە زۆرە لووت پڕدەکا.

**الخَطْمُ**: لووت، پێشی لووت ◊ دەندوک ◊ **الخِطْمِيُّ**: روەکێکە لە پێری (الخبازیة)یە سوودی زۆرە بۆ ئادەمیزاد گەڵاکەی وشك دەکرێ‌و دەکوترێ‌و دەکرێ بە شامپۆی سەر شتن باش پاکی دەکاتەوە ◊ **المُخَطَّمُ**: ئەو شوێنەی لووتی حوشتر کە دارەکەی تێدەکرێ ◊ ئەسپێك لمبۆزی تادەگاتە شەویلەی خوارووی نزیك قورگی سپی بێ ◊ **المَخْطِمُ**: بەمانا (ألخَطْمُ) دێ.

**خَطا** خطواً: رۆیی ◊ **اخْطاه**: وای لێکرد بڕوا ◊ هەڵی نا بۆئەوەی هەنگاو هەڵێنێ.

**خَطاهُ**: بەمانا (أخطاه) دێ ◊ **خَطَّى عنه الشَّيْءَ**: شتەکەی لێ دوور خستەوە، پاڵی پێوە نا ◊ **إخْتَطَى**: بەمانا (خَطا) دێ ◊ **إخْتَطَى الشَّيْءَ**: شتەکە بواردی لێی تێپەڕی ◊ **تَخَطّاهُ واليه**: بەمانا (إختطاه) دێ ◊ **الخَطْوَةُ الخُطْوَةُ**: هەنگاو، شەقاو مەسافەی نێوان دووقاچی لەکاتی رۆیشتندا ◊ **أخْطَأُ الرجلُ**: پیاوەکە سکی شل بوو، گەدەی داچۆڕا شۆڕەوە بوو.

**خَظا** لَحْمُهُ خُظواً: قەڵەو بوو، گۆشتی گرت ◊ **أخْظَى الرجلُ**: پیاوەکە قەڵەو بوو ◊ **أخْظَى الحَيَوانَ**: ئاژەڵەکەی قەڵەو کرد ◊ **خَظَّاهُ**: کەتەی کردو گەورەی کرد تا زەبەللاح بوو ◊ **الْخَاظِي**: ئەستورو پتەوو رەق ◊ **الخَظاةُ**: تێرو پڕ لەهەموو رویەکەوە ◊ **الخَظْوانُ**: (رجل خَظْوانٌ) پیاوێکی گۆشتن‌و قەڵەوە ◊ **الْخَظِيُّ**: تێکسمراو، گۆشتن، نەرم‌و شل.

**خَفَتَ** خفتاً وخفوتاً وخفاتاً: دامرکا، هێدی بوو، بێهێز بوو.

**خَفَتَ** المريضُ: نەخۆشەکە لە قسە کەوت، زمانی شکا ◊ لە ناکاو مرد، کتو پڕ مرد ◊ دەنگی نزم بۆوە.

**خَفَتَ** بصوتِهِ: دەنگی خۆی نزم کردەوە، بەسرتە قسەی کرد ◊ **خافَتَ بصوتِهِ**: دەنگی خۆی نزم کردەوە ◊ **تخافَتا**: ئەو دوو کەسە بەیەکەوە سرکەیان کرد ◊ **تخافَتَ فلان**: فلانکەس خوستی لەخۆی بڕی جوڵەی نەکرد.

**الخافِتُ**: هەوری بێ باران ◊ کشت‌و کاڵی تەمەن کورت ◊ **الْخَفُوتُ من النساء**: ئافرەتی رەقەڵەو کزو لاواز.

**خَفِجَ** خَفَجاً: نەخۆشێ قاچ لەرزینی توش بوبێ ◊ **تَخَفَّجَ**: خوار بوو.

**الْخَفَجُ**: دەردێکە توشی حوشتر دەبێ ◊ روەکێکی بەهارییە لە پێری (المركبة)یە ڕەنگاو رەنگە گەڵاکەی پانە ◊ **الْخَفِيجُ**: لاوازو باریك یان قاچ باریك ◊ ئاوێك نەگاتە ئاستی شیرینی‌و گوارایی ◊ **خَفْخَفَ**: قیژاندی، هاواری کرد (خَفْخَفَ الشَّيْءَ) شتەکەی جوڵاند دەنگی لێوە هات ◊ **الْخَفْخافُ**: گن، کەسێکە کە قسە دەکا دەنگی لە لوتیەوە

دێته دەر ٥ دەگوترێ: (هـو خفخـاف الـصوت) دەنگی گنە.
**خَفَدَ** خفْداً وخفداناً: خۆی سوك كردو لە ڕۆیشتندا پەلەی كرد ٥ **أخْفَدَت الناقةُ**: حوشترەكە وای لێ دەركەوت ئاوس بێ وەڵێ وانەبوو ئاوس نەبوو ٥ **أخـْفَدَت الْحَامِـلُ**: ئافرەتەكـە سكەكەی لـەبار چـوو پـێش ئـەوەی كـامڵ بـێ ٥ (هـي مَخـْفِد وخفود) ٥ **خَفَرَهُ** وبه وعليه **خَفْراً وخِفَارَةً**: پەنای داو پارێزگاری لێكرد.
**خَفَرَ** بالعهد: پابەندی بەڵێنەكەی خۆی بوو.
**خَفَرَ** العَهْدَ: پەیمانەكەی هەڵوەشاندەوە.
**خَفِرَت خَفَراً**: شەرمو حەیای زۆر بوو.
**أخْفَرَهُ**: پاسەوانی بۆ گرت ٥ حەرەسی لەگەڵ نارد ٥ پەیمانەكـەی هەڵوەشـاندەوە ٥ **أخـْفَرَ العهـدَ**: پەیمانەكـەی هەڵوەشـاندەوە ٥ **خَفَّـرَ**: بـەمانا (خَفَـرَهُ) دێ ٥ شـورای بـۆكرد ٥ **تَخَفَّـرَ**: بـەمانا (خَفِـرَ) دێ ٥ خـۆی خـستە پەنایـەوە، داوای پارێزگـاری لێـكرد ٥ **إسْتَخـْفَرَهُ**: داوای لێـكرد ببێتـە پاسـەوانو خەفـەری ٥ **اَلْخَفَـارةُ**: وادەو بەڵێن ٥ دڵنیایی ٥ پاسەوانی ٥ **اَلْخُفَـارَةُ**: بـەمانا (اَلْخَفَـارة) دێ ٥ كرێـی پاسـەوانی ٥ **اَلْخِفَـارَةُ**: بـەمانا (اَلْخَفَـارَةُ) دێ ٥ پیـشەی پاسـەوانی ٥ **الخَفِيرُ**: حـەرەسو پاسەوان ٥ **اَلْمَخـْفَرُ**: شـوێنی حەرەسیو خەفەر.
**خَفَسَ** خفْساً: قسەی ناشیرینی كرد.
**خَفَسَ** الشرابَ: زۆری ئاو كردە ناو شەرابەكەوە.
**خَفَسَ** البناءَ: خانوەكەی ڕوخاند.
**خَفَـسَ** فلانـاً: فلانكەسـی لـە عـەرزدا ٥ گاڵتـەی پێـكرد ٥ **أخْفَسَ**: بـەمانا (خَفَـسَ) دێ ٥ **أخـْفَسَ الـشرابُ**: شـەرابەكە خێـرا سەرخۆشـی كـرد ٥ **إنْخَفَـسَ**: بـۆ مطاوعـەی (خَفَـسَهُ) دێ ٥ ڕاكـشا، لەسەر پشت ڕاكشا ٥ **خَفَشَهُ وبه خَفْشاً**: هاویشتی.
**خَفَشَ** الانـسانَ وغيـرهُ: مرۆڤەكەی لـە عـەرز دا، خستی.
**خَفَشَ** خفشـاً: چاوی كزبوو.
**خَفَّـشَ**: زەعیـف بـوو ٥ (خَفَّـشَ بـالأرض) بـە زەویيەكـەوە نووسـا ٥ **خَفَّشَ البنـاءَ**: خانوەكـەی ڕوخاند ٥ **خَفَّشَ الانسانَ وغيـرَهُ**: ئادەمیزادەكـەی خست، شێرەكەی بەزاند.
**اَلْخَفَـشُ**: چاو كزی كەلـەكاتی ڕونـاكی زۆردا شت نابینێ ٥ **اَلْخُفَّاشُ**: شەمشەمە كوێرە.
**خَفَضَ** العيشُ: ژیـانی ئاسان بـوو، بـاری گوزەرانی سوك بوو.
**خَفَضَ** بالمكان: لەو شوێنەدا جێگیر بوو مایەوە.
**خَفَـضَ** الـشَّيءَ: شـتەكەی نـزم كـردەوە، دوای بەرزبوونـەوەی خـستیە خـوار، دایگـرت ٥ لێـی كەمكردەوە.
**خَفَـضَ** الطـائر جناحَـهُ: باڵندەكـە بـاڵی لێـكنان بۆئەوەی لە فڕین بكەوێ ٥ **خَفَضَتْ المرأةُ صَوْتَها**: ئافرەتەكە دەنگی خۆی نەرم كردو بـە سـرتەوە كەوتە ئاخاوتن.
**خَفَضَ** فلان جناحهُ للناس: فلانكەس خۆی تـەرخان كـرد بـۆ خزمـەتی خەڵـكو سـوك كردنـی كێشەكانیان.
**خَفَضَ** الصبيةَ: كچەكەی خەتەنە كرد.
**خَفُضَ** العيشُ: ژیانی فراوان بوو پێداویستی ژیانی بۆ دەستەبەر بوو، كەوتە خۆشیو ژیانی نەرمو نۆڵەوە ٥ **خَفَّضَ الشَّيْءَ**: شتەكەی كەم كردەوە ٥ ئاسـانی كـرد ٥ گـیرو گرفتـەكانی لابـردن ٥ دەگوترێ: (خَفِّضْ عليك أمـرَك) كارەكەی خـۆت

لەسەر خۆت ئاسان بکە ◊ اخْتَفَضَ الشَّيْءَ: شتەکە دوای ئەوەی بەرز بۆوە دابەزی ◊ اخْتُفِضَت الصَبِيَّةُ: کچەکە خەتەنە کرا ◊ انْخَفَضَ الشَّيْءُ: بەمانا (اخْتَفَضَ) دێ ◊ الخافِضُ (خافض الجناح): بە ئەدەبو بێدەنگە.

**الخافِضَةُ**: (أرض خافضة السُقْيا): زەوییەکە بەئاسانی ئاو دەدرێ ◊ ليلة خافضة: شەوێکە بۆ شەو ڕەوی خۆشە ◊ دەشتاییەکی پڕ بەرەکەت ◊ ئەو کەسەی خەتەنەی منداڵ دەکات.

**الخَفْضُ**: ژیانی خۆشو بەناز پەروەردەیی ◊ دەشتایی پڕ خێرو بێر.

**خَفَعَ** فلان: بەهۆی نەخۆشی یان برسییەتی لاواز بوو، یان بێ هۆش بوو لەخۆ بووە.

**خَفَعَ** مفاصِلُهُ: جومگەکانی جەستەی شلو بێ هێز بوون.◊ خَفِعَ خَفَعاً: لە برسا یان بەهۆی نەخۆشی سکی بە پشتییەوە نووسا ◊ أخْفَعَهُ المرضُ أو الجوعُ: نەخۆشی یان برسییایەتی برستی لێ بڕی ◊ انْخَفَعَتِ النخلةُ: دار خورماکە لە ڕیشەوە هەڵکەندرا ◊ انْخَفَعَ فلان: فلانکەس لاواز بوو تەندروستی تێک چوو ◊ انْخَفَعَ على فراشه: بەهۆی نەخۆشی یان برسییەتی لە جێگادا کەوتو توانای هەڵسانی نییە ◊ الخُفاعُ: نەخۆشییەکە تووشی سییەکان دەبێ لەتلەت دەبن.

**خَفَّ** الشَّيْءُ: شتەکە کێشی کەم بوو.

**خَفَّ** الميزانُ: تەرازووەکە سەری کرد.

**خَفَّ** المطرُ: بارانەکە کەم بوو هەڵی بروکاند.

**خَفَّ** القومُ خفوفاً: خەڵك کەم بوو.

**خَفَّ** فلان على القلوب: فلانکەس ڕوح سوکە لە دڵدا شیرینە ◊ خۆشەویستە.

**خَفَّ** عقلُهُ: بێ عەقڵو ئەحمەقە.

**خَفَّتْ** حالُهُ: باری ژیانی سوك بوو نارەحەتی نەما.

**خَفَّ** عن المكان: لەو شوێنە باری کردو بەپەلە ڕۆیی ◊ دەگوترێ: (فلان خِفٌّ): فلانکەس ئازاو بەجەرگە ◊ أخَفَّ الرجلُ: پیاوەکە لە سەفەردا کۆڵو باری سوك بوو ◊ یان لە ماڵەوە بار گران نییە لەهەموو شوێنێك جێی دەبێتەوە ◊ حاڵو گوزەرانی خۆش بوو ◊ وردە ئاژەڵی هەن ڕەشە وڵاخو حوشتری نییە ◊ أخَفَّ فلاناً: حیلەو لەسەرە خۆیی فلانی نەهێشتو وای لێکرد تورە بێ ◊ تَخافَّ: کۆڵی خۆی گران نەکرد ◊ کەمی لە شتەکەی هەڵگرت ◊ خَفَّفَ الشَّيْءَ: شتەکەی سوك کرد ◊ دەگوترێ: خَفَّفَ الثوبَ: قوماشەکەی شاشو تەنك چنی.

**خَفَّفَ** ما به: خەمو خەفەتی لە کۆڵ دامالی، قورسایی ژیانی لەسەر سوك کرد، ئازاری لەسەر سوك کرد ◊ تَخَفَّفَ الشَّيْءُ: شتەکە سوك بوو قورسایی نەما ◊ تَخَفَّفَ من الشَّيْءِ: لە شتەکەی کەم کردەوە بۆئەوەی کێشی سوك بێ ◊ تَخَفَّفَ خُفّاً: خوففی لەپێ کرد ◊ اسْتَخَفَّهُ: داوای سوکیو بێ کێشی کرد ◊ بە سوکی زانی ◊ جارزی کرد ◊ سوکایەتی پێکرد ◊ التَّخْفيفُ: لە زاراوەی سەرفییەکاندا بریتییە لە حەزفکردنی پیتی هەمزە لە وشەدا جا بنووسرێ یان نا ◊ یان بگۆڕدرێ بە پیتێکی تر ◊ الخُفّاف: زیرەكو وریا ◊ الخَفّاف: فرۆشیاری خوف، یان خوف دروستکەر ◊ الخُفُّ: سمی حوشتر، ئەو شوێنەی لە دەستو قاچی حوشتر کە نزیك زەوییەو توکی لێ ناروێ ◊ بەری پێی ئادەمیزاد ◊ گۆرەوییەك کە بتوانی ماوەیەك لەسەری بڕۆی ◊ کاڵە ◊ لە پەندیدا هاتووە: (رجع بخفي حنين) بە

کەسێـك دەگـوترێ: هـەوڵی بـۆ کارێـك دابـێ‌و بۆی نەکرابێ‌و ناهومێد بووبێ.

**اَلْخِفُّ**: هەر شتێك هەڵگرتنی خۆش بێ ٥ کۆمەڵی کەم ٥ **اَلْخَفيفُ**: دەگوترێ: (هـو خفيـف الـروح) ئەو کابرایە روح سوك‌و قسە خۆشە ٥ زیـرەك‌و رەزا سـوکە ٥ دەسـت کـورت‌و کـەم دەرامەتـە ٥ هـەژارو بـێ بەختـە ٥ جۆرێـکە لـە بـەحری عـروزی شـیعر ٥ **خَفَقَتِ النعـلُ خَفْقاً**: نەعلەکـە دەنگـی لێ هـات لـەکاتی لـەپێ کـردن‌و پـێ رۆیشتنیدا.

**خَفَقَ** اَلشَّيُ خفقاً وخفوقاً وخفقاناً: شتەکە کەوتـە پەلـە پـەل‌و جـەم‌و جـوڵ ٥ دەگـوترێ: (خَفَـقَ القلبُ) دڵی کەوتە پەلـە پەل‌و لێـدانی خێـرا ٥ (خَفَقَ الطائرُ) باڵندەکە لە شەقەی باڵیداو فڕی.

**خَفَـقَ**: مـەیلی کـرد، بـەلای ئـاوا بوونـدا رۆیـی، خەریکە ئاوابێ.

**خَفَقَ** فلان: فلانکەس نووست.

**خَفَقَ** الليلُ: شەوەکە زوربەی رۆیی.

**خَفَقَ** الحيوانُ: ئاژەڵەکە لاواز بوو.

**خَفَقَ** المكانُ: شوێنەکە خاڵی بوو.

**خَفَقَ** السهمُ: تیرەکە بە تیژی رۆیی.

**خَفَقَ** فلان في البلاد: فلانکەس بەناو ولاتدا رۆیی.

**خَفَـقَ** فلانـاً بالسـوط: بەهێواشـی بـە شـورك لـە فلانکەسی دا ٥ **اَخْفَقَ**: کەوتە جەم‌و جوڵ‌و پەلـە پەل ٥ **اَخْفَقَ الطائر**: باڵندەکـە لـە شـەقەی بـاڵی داو فـڕی ٥ **اَخـفَقَ النجـومُ**: ئەسـتێرەکە نزیـك ئـاوابوون بـۆوە ٥ **اَخـفَقَ القـومُ**: خەڵـکەکە خواردەمـەنی نـەما ٥ **اَخـفَقَ فـلان**: فلانکـەس ماڵ‌و دارایی کەم بوو ٥ هەوڵی کارێکی داو بۆی جێبەجێ نەکرا.

**اَخْفَقَ فلاناً**: فلانکەسی لە عەرزداو خستی ٥ **اَخـفَقَ نعليـه**: نەعلـەکانی بەیـەك کێـشان ٥ **اخـتَفَقَ الشَّيْئُ**: شتەکە کەوتە پەلە پەل‌و جەم‌و جوڵ ٥ **الخافِقُ**: ئالا ٥ ئاسو، ئاسۆی خۆرهەڵات‌و ئاسۆی خۆر ئاوا ٥ **خوافق السماء**: ئەو دەڤەرو لایەنـەی بای لێوە دێ ٥ **اَلْخَفّاقُ**: پیاوی پێ پان ٥ شتێـك زۆر جـەم‌و جـوڵ بکـا ٥ **الخافقـةُ**: ئـافرەتی ورگ بچکۆلە ٥ قەد باریك ٥ **الخَفَقَان**: زێدە لێدانی دڵ بـەهۆی مانـدو بـوونی زۆر یـان نەخۆشـی ٥ **اَلْمَخْفَقُ**: دەشتی کاکی بـەکاکی کە تراویلکەی تێدا بدرەوشێتەوە ٥ **اَلْمِخـفَقُ**: شمشێری پـان ٥ **اَلْمِخـفَقةُ**: قەمچی‌و شورکی لێدان.

**خَفَا** البرقُ: بروسکەی دا.

**خفا** اَلشَّيُ: شتەکە دەرکەوت.

**خَفِيَ** له: خِفوةً: خۆی حەشاردا.

**خَفَـيَ** البرق خَفْياً: بروسـکەکە بەکـەمی بروسـکەی دا.

**خَفَيَ** اَلشَّيُ: شتەکەی ئاشکرا کردو دەری هێنا.

**خَفِيَ** اَلشَّيُ خَفـاءً وخِفيـةً: خـۆی شـاردەوە، خـۆی حەشاردا.

**خَفِيَ** البطنُ: گەدەی بچوك بووە ٥ **اَخـفَى الـشَّيْئَ**: شـتەکەی شـاردەوەو پـەنهانی کـرد ٥ **اخـتَفَى الشَّيْئُ**: شتەکە خۆی شاردەوە، لەپێش چاو گوم بـوو ٥ **اخـتَفَى المَيِّـتَ**: گـۆڕی مردوەکـەی هەڵدایـەوەو کفنەکـەی دزی ٥ **اخـتَفَى البئـرَ**: بیرەکـەی هەڵـکەند ٥ **تخفَّـى**: خـۆی شـاردەوەو هـون بـوو ٥ **اسْتَخـفَى**: بـەمانا (تَخَفَّـى) دێ ٥ **اَلْخَافِي**: جندۆکە ٥ **الخافِية**: بـەمانا (الخـافي) دێ ٥ دەگوترێ: (أرض خافية) زەوییەکە جندۆکـەی لێیە ٥ یەکێ لەو چوار پەڕەی باڵی باڵندەیە کە

دەهاژوێ بۆ پاوان و چاودێرییان دەکاو ئەمجا لێیان دەگەڕێ بۆخۆیان بەویستی خۆیان بلەوەڕێن ◊ الرُّفاضُ: ئەوکەسەیە چاودێری ئەو شوێنانە دەکا کەناکرێنە مۆڵك ◊ الرَّفیض: عەرەقی لەش ◊ شوتی شکاو پکاو ◊ المَرْفِضُ: ڕێڕەوی ئاو، شوێنی هاتنە خوارەوەی ئاو (پلوسك).

**رَفَعَ** القومُ: خەڵکەکە بەکێوەکەدا هەڵگەڕا.

رَفَعَ البعیرُ: حوشترەکە خێرا ڕۆیی و پەلەی کرد.

رَفَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرزکردەوە بۆسەرەوە ◊ گواستیەوە.

رَفَعَ البناءَ: باڵەخانەکەی بەرز کردەوە، چین چین دیوارەکانی خستە سەریەك.

رَفَعَ یَدَهُ عن الشَّيْ: دەستی لەشتەکە هەڵگرت.

رَفَعَ فلاناً: ناوی فلانی بەرزکردەوە، ڕێزو حورمەتی بۆ زیاد کرد ◊ ناوی هێنا بەباشە، دەشگوترێ: (هذا أمر یرفع الرأس): ئەمە کارێکە سەربەرزی دەستە بەر دەکا، دەبێتە هۆکاری شکۆمەندی.

رَفَعَ اللهُ عَمَلَهُ: خودا خێرەکەی لێ وەرگرت.

رَفَعَ الشَّيْءَ في خزانته: شتەکەی لەناو قاسەکەی دا هەڵگرت.

رَفَعَ ذات اللبن لَبَنَها: شیردەرەکە شیرەکەی گرتەوەو نەیدا.

رَفَعَ فلاناً الی الحاکم: فلانکەسی خستە بەردەم دادوەر بۆئەوەی دادگایی بکا، دەشگوترێ: (رفع الی السلطان رفیعة): هەندێ ڕوداوی تایبەتی خۆی پێشکەش بەپاشا کرد.

رَفَعَ الیهم عینَهم: سەیریان کرد ◊ دەگوترێ: (دخلتُ علی فلان فلم یرفع لي رأساً): چومە لای فلان و هەرسەری بەرز نەکردەوە سەیرم بکا، ڕوی تێ نەکردم.

رَفَعَ فلان الی أصله: فلانکەسی بردەوە سەر ڕەگەزی خۆی.

رَفَعَ الحدیث الی قائله: قسەکەی بە زنجیرە بردەوە سەر بێژەرەکەی بۆیە حەدیثی مەرفوع ئەوەیە بەزنجیرە بگاتە سەر پێغەمبەر (د.خ).

رَفَعَ الخَبَرَ: هەواڵەکەی بڵاو کردەوە.

رَفَعَ البَعیرَ: حوشترەکەی تاودا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

رَفَعَ الکلمةَ: وشەکەی بەمەرفوع خوێندەوە واتە کۆتاییەکە نیشانەی ڕەفعەی خستە سەر.

رَفَعَ العقوبة أو الضریبةَ: سزاکە یان زەریبەکەی هەڵگرت، دەشگوترێ: (فلان مرفوع عنه التکلیف): فلانکەس ئەرکی لەسەر نییە، بەرپرسیار نییە.

رَفُعَ رفاعَةً: دەنگی گەورە بوو.

رَفُعَ الثوبُ أو الخیطُ: قوماشەکە تەنك بوو، دەزوەکە باریك بوو.

رَفُعَ فلانٌ: فلانکەس پلەو پایەی بەرز بۆوە ◊ رافَعَهُ: بەمانا (رَفَعَهُ) دێ ◊ رافَعَ إلی الحاکم وغیره: کێشەکەی گەیاندە دادوەرو شکایەتی لێ کرد ◊ رَفَّعَ: بازی هاویشتن هەندێکیان درێژتر بوون.

رَفَّعَ الشَّيْءَ: شتەکەی پێشکەش کرد پێشی خست ◊ اِرْتَفَعَ: بەرز بۆوە ◊ پێشکەوت ◊ گواستیەوە، لاچو نەما ◊ رَفَّعَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرزکردەوە ◊ ترافعا الی الحاکم: کێشەکەیان بردە لای دادوە ◊ ترافع المحامي عن المتهم أمام القضاء: پارێزەر لەبەردەم دادگادا داکۆکی لە تۆمەتبار کرد بەڵگەی بەهێزی خستنە ڕو لەسەر بێتاوانی تۆمەتبار ◊ تَرَفَّعَ: بەمانا (ارتَفَعَ) دێ ◊ پاك و بێگەردە، لەخەوش و لەککەداری دوورە ◊ تَرَفَّعَ الشَّيْ: بەمانا (رَفَعَهُ) دێ ◊ استَرفَعَ الشَّيْءُ: شتەکە کاتی لابردنی هات ◊ استَرفَعَ الشَّيْءَ: داوای لابردنی شتەکەی کرد ◊ الإرتفاع:

لەزاراوەی ئەندازیاریی دا بریتییە لە درێژی پایەو شتی بەرزەوە بوو ٥ الرَّافِع: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا، دەشگوترێ: (برق رافِع): بروسکەیەکی شوعلەدار، (ناقة رافِع): حوشترێکە شیرەکەی گرتۆتەوەو شیر نادا ٥ الرَّافِعَة: هەر کۆمەڵو تاقمێك هەواڵو نهێنی بڵاو بکەنەوە ٥ ئامێرێکە شت بەرزدەکاتەوە، شتی پێ بەرز دەکرێتەوە ٥ الرِّفَاعُ: گواستنەوەی کرشەی کشتوکاڵ بۆسەر خەرمان بۆ گێرەکردنو شەنکردنو پاککردن ٥ الرُّفَاعَةُ: توندی دەنگو بەرزیو کاریگەری لەسەر گوێچکە، دەگوترێ: (في صوته رُفاعة) ٥ الرَّفْعُ: لەزاراوەی نەحودا ضەممەیە (بۆرە) یان ئەو پیتەی لەشوێنی ئەو دێ ٥ هەروا بەدەست هەڵگرتن لەخواردنو خواردنیش دەگوترێ پێش کازیوە بۆکەسێك بەرۆژو بێ ٥ الرِّفْعَةُ: رێزو پلەو پایەو شکۆمەندی ٥ الرفیعة: ئەو شتەی بەهۆی پێشنیارو راپۆرتەوە بەرز دەکرێتەوە بۆلای دادوەر ٥ المُرَافَعَة: هەڵسو کەوتو چەندو چونێکە بەرچاو دەگیرێ بۆ راستکردنەوەی داواو پێوە رۆیشتنی کەوا بوو (قانون المرافعات): ئەو یاسایە هەڵسو کەوتو چۆنیەتی بەرێوە بردنی داواکەرێك دەخاتە بەردەم دادگا ٥ المِرْفَاع: ئامێرێکە بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی وەکوو (جەگ) ٥ المَرْفَعُ: کورسی ٥ وشەی (مَرَافِع): لای مەسیحیەکان چەند رۆژێکی دیارن پێش رۆژانی رۆژو گرتن دەکەون ٥ المِرْفَعُ: ئامێری بەرزکردنەوە.

المرفوع: لەحەدیثی پێغەمبەردا (د.خ) ئەوەیە پاڵ پێغەمبەر دەدرێ، جا قسە بێ یان کردەوە بێ یان رازی بون بێ.

**رَفُعَ** رَفْعاً: شوێنی پیسایی ناو جەستەی فراوان بوون گەدەی کشا ٥ دیوی ناوەوەی گۆشتی ئازاری پەیدا کرد.

رَفُعَ العیشُ رَفَاغَةً: ژیانی خۆش بوو ٥ أرْفَغَ: ژیانی خۆش بوو، گوزەرانی باش بۆ گونجا ٥ أرْفَغَ لە العَیْشُ: ژیانی بۆخۆشکرد ٥ تَرَفَّغَ: گوزەرانی خۆش بوو ٥ الأرفغُ من العیش: ژیانی خۆشو بەهیتو گوزەرانی خۆش ٥ الرَّفَاغَـةُ: گوزەرانخۆش ٥ الرَّفَاغِیَةُ: بەمانا (الرَّفاغة)دێ ٥ الرَّفْغُ: نەرمو نیانیو ئاسانکاریی ٥ ژیانخۆشیو گوزەرانی گونجاو ٥ شوێنی بەپیتو بەرەکەت ٥ گرانیو قاتو قڕی ٥ هەرشوێنێك لەجەستە چڵكو پیسایی تێدا کۆبێتەوە ٥ خوێڕیو هەتیو مچە ٥ الرُّفْغُ: هەرشوێنێکی جەستە، چڵکی تێدا کۆببێتەوە ٥ الرُّفَغْنِیَةُ: ژیانخۆشیو هەرزانی ٥ المَرَافِغُ: بن باڵو شانو شەپیلكو کۆتایی ران.

**رَفَّ** رَفّاً: باڵندەکە قونەی کرد، باڵی فش کردن بۆ هەڵفڕین ٥ (رفّت العین او الحاجب): چاوی فڕی یان بڕۆی فڕیو پەلەی کرد ٥ رَفَّت النباتُ: گیاو گژەکە لەتێر ئاویو تەڕدەماخی دا شنە شنی بوو.

رَفَّ البَرْقُ: بروسکەکە روناکایی داو شوعلە بەخش بوو.

رَفَّ فلان رَفّاً: فلانکەس زۆری خوارد.

رَفَّ له وإلیه: کەروێشکەی کردو شنایەوە، دەگوترێ: (رَفَّ فؤادي لحدیثه): دڵم بەوتەکانی گەشایەوەو شنایەوە.

رَفَّ القومُ بە: خەڵکەکە دەوریان داو لێی کۆبونەوە.

رَفَّ علیه النعمةَ او السعادة: نازو نیعمەتی بەسەردا رشت ٥ بەختەوەری کرد.

رَفَّ له: كردو كۆششى بۆكرد بەچاكە يان بەخراپە.

رَفَّ فلاناً: بەخششى دا بەفلان‌و شتى خۆشى دەرخوارد دا ٥ چاكەى لەگەڵ كردو رێزى لێ گرت، دەگوترێ: (ذَهَبَ من يَحُفُّهُ وَيَرُفُّهُ): رۆيى ئەوەى خزمەتى دەكردو پێداويستى ژيانى خۆشى بۆدابينكردو سۆزى بۆ دەنواند.

رَفَّ البَقْلَ ونحوه: گيايەكەى خوارد بەڵام پاروى پڕبەدەمى نەگرت.

رَفَّ الطعامَ: زۆرى خوارد ٥ رَفَّت الأمُ: دايكەكە شيرى دا بەمزارۆكەكەى.

رَفَّ اللبَنَ: هەموو رۆژێ شيرى خواردەوە.

رَفَّ الشَّيْءَ: شتەكەى مژى‌و هەڵى لوشى، دەگوترێ: (رَفَّ المرأةَ أو شَفَتَيْها): ئافرەتەكەى ماچ كرد لێوى مژى.

رَفَّ الدَّابَّةَ: كاى دا بەوڵاخەكە.

رَفَّ البيتَ: تاق‌و رەفەى بۆ خانوەكە دروست كرد.

رَفَّ الثوبَ: قوماشى ترى خستە سەرپانايى كراسەكە بۆئەوەى لەلاى خوارەوەى پانتربێ ٥ أَرَفَّت الدَّجاجةُ ولوها على بيضها: مريشكەكە باڵى خۆى بەسەر هێلكەكانى دا فش كردنەوە كڕ لەسەريان هەڵنيشت ٥ إرتَفَّ: بەمانا (رَفَّ يرفُّ) دێ، دەگوترێ: (إرتفَّ النَّباتُ وإرتفَّ البرقُ) ٥ الرُّفافُ: ئەو وردەو تەپ‌و تۆزەى لەكا هەڵدەوەرێ ٥ الرُّفافَةُ: ئەو شتەى لەخوار كەڵلە سەرەوە دەبەسترێ ٥ الرَّفُّ: وەكوو تاقەوايە لەديوار دا، شتى ناياب ناو ماڵى لەسەر دادەنرێ ٥ يان تەختە دارێكە بەپاڵ ديوارەوە دادەنرێ قاپ‌و قاچاغ يان كتێب‌و دەفتەرو شتى واى دەخرێتە سەر، دەگوترێ: (وَضَعَ الكتبَ على الرَّفِّ): كتێبەكانى لەسەر رەفەكە داناون ٥ تاقمێك مەل‌و باڵندەن ٥ كراسى نەرم‌و نيانە ٥ ئاوى زارە كە دەدرەوشێتەوەو هەڵدەمليسرێ ٥ الرَّفُّ: كا ٥ وردە كاو كوت ٥ الرُّفافُ: شتێك زۆر بدرەوشێتەوە، دەگوترێ: (ثغر رَفافٌ): پوك‌و ددانێكى درەوشاوەن ٥ (روضة رَفافة): باخێكە پڕشنگدارە ٥ الرِّفَّةُ: قومە ئاوێك ٥ خواردنێكى باش‌و رێك‌و پێك ٥ چاوفڕين، بڕۆ فڕين ٥ الرُّفَّةُ: بەمانا (الرُّفّ) دێ ٥ الرَّفيف: بريسكەو پرشنگ، دەگوترێ: (ثغرها رفيف) ٥ هەروا ناوە بۆ پۆشاكى تەنك ٥ درەختێك لق‌و پۆپەكانى شۆڕابەيان كردبێ ٥ زەوى بەپيت‌و بەرەكەت ٥ هەڵاشى رەشماڵ يان ئەو پرژو پەتكانەى لێيەوە شۆڕبونەوە ٥ (ذات الرفيف): ئەو باغچەو روەك‌و درەختەى لەبەر تێرئاوى‌و تەڕدەماخى بريسكەو ورشەى لێوەبێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو بەلەم‌و كەڵەكانەى لەناو روباردا ريزدەكرێن بۆ ئەوەى خەڵك بەسەريان دا بپەڕێتەوە.

رَفَقَ به وله وعليه رِفقاً ومرفِقاً: نەرم‌و نيان بوو لەگەڵى دا هەڵس‌و كەوتى جوانى لەگەڵ دا كرد.

رَفَقَ في السير: لەرۆيشتن دا هێدى‌و لەسەرە خۆ بوو.

رَفَقَ فلاناً: لەئانيشكى فلانى دا.

رَفَقَ البعيرَ: بە گوريس دەستى حوشترەكەى بەست.

رَفُقَ فلان رفاقةً: بوو بەهاورێ‌و برادەر، دەگوترێ: (كنت في رفاقة فلان): لەگەڵ فلانكەس بووم ٥ أرفَقَهُ: لەگەڵى دا هێدى‌و هێمن بوو ٥ سودى پێ گەياند ٥ رَافَقَهُ مُرافَقَةً ورِفاقاً: بوو بەهاوەڵ‌و هاورێى، دەگوترێ: (رافَقَهُ في السفر، ورافقته السلامة) ٥ إرتَفَقَ: سود بەخش بوو، داواى يارمەتى كرد ٥ إرتَفَقَ عليه: شانى لەسەر دادا ٥ ئانيشكى دادا، دەگوترێ: (بتّ مُرتَفِقاً): شەوم بەرۆژ كردەوە ئانيشكم دادابوو ٥ إرتَفَقَ القومُ: خەڵكە بوون بەهاورێى يەكترى ٥ ترافَقَا: بوون

بەدوو هاوەڵ ٥ بوون بەهاوڕێی یەکتر ٥ تَرَفَّقَ بە: بەمانا (رَفَقَ)دێ ٥ تَرَفَّقَ علیه: پشتی پێوەدا ئانیشکی لەسەر دادا ٥ تَرَفَّقَ بە: سودی گەیاند، داوای کۆمەکی کرد ٥ استرفَقَهُ: داوای کرد ببێتە هاوڕێی ٥ الأرفقُ: دەگوترێ: (هذا الأمر أرفق بك وعليك): ئەو کارە بۆ تۆ سود بەخشە ٥ الرافِقُ: سود بەخش ٥ الرافِقَةُ: هێدی‌و هێمن ٥ الرِّفاقُ: حەبلێکە دەستی حوشتری پێ دەبەسترێ، کاتی ترسی ئەوەی لێ کرا بەڵەسەببێ ٥ الرُّفاقَةُ: کۆمەڵی هاوڕێیان‌و دۆست‌و برادەر ٥ الرِّفْقُ: بەیدەست‌و خۆش لەمست، دەگوترێ: (ماءٌ رَفَقٌ ومرتَعٌ رفقٌ): ئاوێکە بەخۆشی دەستی دەگاتێ لەوەڕگایەکە بەئاسانی پێی دەگەی ٥ الرُّفْقَةُ: هاوڕێیەتی ٥ الرَّفیقُ: بەسۆزو نەرم‌و نیان‌و لەسەرە خۆ ٥ بەوکەسەش دەگوترێ کەلەتەك فەرمانڕەواو پاشادایەو بۆ هەموو شوێنێك لەخزمەتی دا دەبێ ٥ سود بەخش ٥ ژن، مێرد، هاوسەر ٥ الرفیقة: مێینەی (الرفیق)ە ٥ ژن ٥ المُرَافِق: هاودەم‌و هەمئاهەنگی مەلیك‌و پاشا ٥ المُرتَفَق: دام‌و دەزگای خزمەتگوزاریی ٥ المَرْفِق: ئەو دام‌و دەزگایانەی خزمەتگوزاری پێشکەشی کۆمەڵگا دەکەن، وەکوو دائیرەی ئاوو ئاوەڕۆو کارەباو خەستەخانە.. ٥ هەرشتێك لەسەری دابنیشی‌و پاڵی لەسەربدەیەوە ٥ ئانیشك؛ جومگەی نێوان دەست‌و قۆڵ ٥ المِرْفَقُ: بەمانا (المَرفِقُ) دێ، (مرْفق الدار ونحوها): ئەو شتانەی لەگەڵ خانوو حیساب دەکرێن، وەکوو حەمام‌و مەتبەخ‌و بەربێلا‌و حەوشەو تەنکی‌و بیری ئاو ٥ المِرْفَقَةَ: ئەوشتەی لەسەری پاڵ دەدەیەوە ٥ دۆشەك‌و سەرین‌و کورسی‌و کەرەوێتە.

**رَفَلَ** رَفْلاً ورفلاناً: لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی کردو داوێنی خۆی لەزەوی خشاندو بەدوخۆیدا رایکێشا.

**رَفَلَ ثَوْبَهُ**: کراسەکەی درێژکردو بەدوخۆی خشاندی.

**رَفَلَ البئرَ**: بیرەکەی لێڵ‌و قوڕاو کرد ٥ **أرْفَلَ**: بەمانا (رَفَلَ)دێ، دەگوترێ: (أرْفَلَ في ثیابە): لەناو پۆشاکەکەدا لارو لەنجەی کرد ٥ **أرفَلَ ثوبَهُ أو ازاره أو ذیله**: کراسەکەی یان دەرپێیەکەی یان لکی مێزەرەکەی درێژ کردو شلی کردو بەدوخۆیدا خشاندی ٥ **أرفَلَ القومُ فلاناً**: گەلەکە فلانیان کردە گەورەو پاشای خۆیان ٥ **رَفَّلَ**: دەگوترێ: (رَفَّلَ في ثیابە): بە پۆشاکەکەیەوە لارو لەنجەی کرد واتە: دەق بەمانا (رَفَلَ)دێ ٥ **أرفَلَ ثوبَهُ او إزارَه أو ذیلَه**: کراسەکەی یان دەرپێیەکەی یان لکی مێزەرەکەی درێژکردو بەدوخۆی دا دا لەعەرزی خشاند ٥ **أرفَلَ الملكُ فلاناً**: پاشا فلانکەسی کردە حاکم‌و لێپرسراو ٥ **تَرَفَّلَ فلان ترفلةً**: بەمانا (رَفَلَ)دێ ٥ **ترفَّلَ**: بەمانا (رَفَلَ)دێ ٥ **ترفَّلَ علیهم**: بوو بەحاکم‌و فەرمانڕەوا بەسەریانەوە ٥ **الترفیلُ**: لەزانستی عەروزدا زیادکردنێکی سەببە لەسەرەوای شیعرەکەدا، وەکوو زیادکردنی (تُنْ) لەسەر (مفاعِلن)و بگوترێ: (متفاعلتن) ٥ **الرِّفالُ**: درێژ، دەگوترێ: (شعرٌ رفال وثوب رفال) ٥ **الرِّفَلُ**: کلکی درێژ ٥ پۆشاکی درێژ ٥ پۆشاکی فش‌و فۆڵ ٥ ژیانی خۆش ٥ ئافرەتی گۆشتن ٥ **المِرْفالُ**: کەسێك زۆر لارو لەنجە بکا ٥ **المِرْفَلَةُ**: بەرمورو خشڵ‌و ملوانکەی درێژ، کە ئافرەت لارو لەنجەی پێوە بکا ٥ (ك: مرافِلَ) ٥ **رَفُهَ رفهاً ورفوهاً**: نازو نیعمەتی باش‌و بەرفراوانی تووش هات.

**رَفَّه** فلاناً وبه: بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە، سۆزی بۆی بوو.

**رَفُهَ**: بەمانا (رَفَهَ) دێ ٥ **أرْفَهَ**: بەمانا (رَفَهَ) دێ، دەگوترێ: (أرْفَهَ فلان): لەخواردنو خواردنەوەو پۆشاك لەبەرکردن دا زێدە ڕۆیی کرد ٥ خۆشی ڕابواردو ئیسراحەتی کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (أرْفِهْ عندي): لای من بمێنەوەو ئیسراحەت بکە ٥ **أرْفَهَ**: سەری بەشانەکردو ڕۆنی لێ دا ٥ **أرْفَهَ فلاناً**: فلان کەسی خستە ناو نازو نیعمەتەوە ٥ **رَفَّهَ**: بەمانا (أرْفَهَهُ) ٥ **رَفَّهَ نَفْسَهُ**: نازو نیعمەتی بۆ نەفسی خۆی دابین کرد، دەگوترێ: (رَفِّهْ عندي): لای من بمێنەوەو خۆش ڕابوێرە ٥ **رَفَّهَ عنه**: ناخۆشی دورخستەوەو ژیانی خۆشی پڕنازو نیعمەتی بۆ دەستە بەرکرد ٥ **رَفَّهَ عليه**: مۆڵەتی دا ٥ **تَرَفَّهَ**: بەمانا (رَفَهَ)دێ ٥ **اسْتَرْفَهَ**: بەمانا ((تَرَفَّهَ)دێ، دەگوترێ: (اسْتَرْفِهْ عندي) بەمانا (أرْفِهْ عندی)دێ ٥ **الرَّفاهَةُ**: ژیانی خۆشو پڕنازو نیعمەتو هەرزانی ٥ **الرَّفاهِيَةُ**: بەمانا (الرَّفاهَةُ)دێ ٥ **الرَّفَهَةُ**: سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی ٥ **الرُّفَهْنِيَةُ**: بەمانا (الرَّفاهةُ) دێ

**رَفا** رَفْواً: ژنی هێنا ٥ هاوسەرگیریی کرد.

**رَفا** الثوب ونحوه من كل منسوج: پۆشاکەکەی پینەکرد، دورییەوە، هەندێکی بەهەندێکی ترەوە نووساند، دەگوترێ: (رفا الخرق): کونەکەی پڕکردەوەو چاکی کردەوە.

**رفا فلاناً**: ترسو بیمی لەسەر فلانکەس لابرد ٥ **أرفَت السفينةُ**: کەشتیەکە لەبەندەر نزیك بۆوە ٥ **أرفأ اليه**: پەنای بۆ برد، چووە پاڵی ٥ **أرفأ السفينة**: کەشتیەکەی نزیك بەندەر کردەوە ٥ یان لەزەوی نزیك خستەوە ٥ **أرفأ فلاناً**: موداراتی لەگەڵ دا کرد ٥ **رافأهُ مرافأةً**: هاوڕای بوو، چووە سەر بیرو باوەڕی ئەو ٥ زەمانەسازی لەگەڵ دا کرد ٥ **رَفَّى المتزوِّجَ**: پیرۆزبایی لەو کەسەکرد کەژنی هێناوە پێی وت پیرۆزباییت لێدەکەم هیوادارم کوڕو کچی زۆرتان ببن ٥ **ترافَوا على الأمر**: کارەکەیان پەسەند کرد، بەلایانەوە باش بوو ٥ **الرِّفاءُ**: پیرۆزبایی کردنە لەو کەسەی هاوسەرگیری کردووە ٥ **الرُّفَةُ**: کاو پلوپوش ٥ **الرَّفّاءُ**: ئەوکەسەی پیشەی پینەسازی جلو بەرگ بێ ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (رفّاءة).

**رَقَأ** الدَّمْعُ والدَّمُ: فرمێسکەکە یان خوێنەکە گیرسایەوەو وشك بۆوە.

**رَقَأ** دَمُ القاتِلِ: بکوژەکە خوێنی بۆدرا، خوێنی دا، خوێنبەستی کرد.

**رَقَأ** بينهم: ئاشتەوایی لەنێوان دا کردن ٥ ڕێکی خستنەوە، دەگوترێ: (ارْقَأْ على ظَلْعِكَ): بەزەییت بەخۆتا بێ ٥ بەئەندازەی بەڕەی خۆت قاچ ڕاکێشە، هەروا دەگوترێ: (لا أرقَأ الله دمعَتَهُ): خودا فرمێسکت وشك نەکاتەوە ٥ **الرَّقُوءُ**: بەوکەسە دەگوترێ صوڵحی نێوان خەڵك دەکا ٥ ئاشتەوایی دەخاتە نێوان خەڵکەوە، دەگوترێ: (الدِّيَةُ رقوء الدم): خوێن دان بەکەسو کاری کوژراو خوێنی بکوژ دەپارێزێو لەکوشتنەوە ڕزگاری دەکات ٥.

**رَقَبَهُ**: چاوەڕوانی کرد ٥ سەرنجی ڕاکێشا ٥ پارێزگاری کرد.

**رَقَبَ** فلاناً: لەملی فلانی دا ٥ پەتی لەملی فلانکەس کرد.

**رَقِبَ** رَقَباً: ملی ئەستور بوو ٥ (هو أرْقَبُ وهي رَقْباءُ) ٥ **أرقَبَهُ داراً أو أرضاً**: خانوەکە یان زەوییەکەی کردە مڵكو سامان بۆ خۆیو بۆنەوەکانی ٥ **راقَبَهُ**: چاودێری کرد ٥ لێی ترسا ٥ **إرْتَقَبَ**:

بەرزبووە، ڕێزدار بوو ٥ **إرْتَقَبَ الشَّيْئَ:** چاوەڕوانی شتەکەی کرد ٥ **تَرَقَّبَهُ:** چاوەڕوانی کرد ٥ **الرِّقَابَةُ:** چاودێری کردن ٥ سانسورکردن لەسەر کتێبو نوسراوی تر پێش لەچاپدانو بڵاوکردنەوەیان ٥ یان دەست تێوەردانی حکومەت یان بانکی مەرکەزی بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر نرخو بەهای جۆرە پارەیەك ٥ **الرُّقبی:** ئەوەیە یەکێك بەیەکێ تر بڵێ ئەگەر من پێش تۆ مردم فلان خانوو یان فلان زەویم بۆ تۆ بێ، ئەوی تریش بەویان وابڵێ، هەریەکەیان چاوەڕێی مردنی ئەوی تربێ ٥ **الرُّقْبَةُ:** چاڵێکە هەڵدەکەندرێ بۆ گرتنی پڵینگ ٥ **الرَّقَبَةُ:** ئەستۆ، مل ٥ بەهەموو جەستەی ئادەمیزادیش دەگوترێ ٥ هەروا ناوە بۆ کۆیلەو بەندەو کەنیزەك ٥ هەروا ناوە بۆ بەشی ژووروی کەمان ٥ **الرِّقَابَةُ:** حەرەسی کالاو چاودێری شتو مەك.

**الرَّقُوبُ:** ئەو دایكو باوکەی منداڵیان بۆ نامێنێ ٥ کەسێك (پیاو بێ یا ژن) نەتوانێ کاربکاو بژێوو پێداویستی خۆی دابین بکا ٥ هەروا بەژنێك دەگوترێ چاوەڕوانی مردنی مێردەکەی بکا بۆئەوەی میراتی لێ بگرێ یان شوبکاتەوە بەیەکێکی تر ٥ (أم الرقوب): بەڵاو کارەسات ٥ **الرَّقِیب:** ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ چاودێرو حەرەس ٥ پێشەنگای سوپا ٥ کەسێك ئەرکی پێداچوونەوەو خوێندنەوەی کتێبو نووسراوی دەخرێتە ئەستۆ پێش چاپکردنیان بۆئەوەی سانسۆریان بکاو ڕستەو وشەگەلێك کەلەگەڵ بارو دۆخەکە نەگونجێ لایبەرێ ٥ **المُرَاقِبُ:** پیاو خراپێك کە پیاوانی ئاسایش دەیخەینە ژێر چاودێری خۆیانەوە بۆئەوەی بزانن هەڵسو کەوتی چۆنەو نەهێڵن خراپەکاری بکا ٥ **المُرَاقِبُ:** چاودێر ٥ ئەو کەسەی چاودێری کردن دەکاتە پیشەی خۆی ٥ **المَرْقَبُ:** شوێنی چاودێریی کردن ٥ **المَرْقَبَةُ:** بەمانا (اَلْمَرْقَبُ) دێ.

**رَقَحَ** رَقْحاً ورقاحة: کاسبی کرد، خێزانو منداڵی خۆی بەخێوکردن

**رَقَحَ الشَّيْئَ:** شتەکەی ڕێك خستو چاکی کردەوە.

**رَقَّحَ مالَهُ:** ماڵو سامانی خۆی ڕێك خست، سەروکاری کرد ٥ **ارْتَقَحَ رَأسُ المالِ:** پارەو پولەکەی بەهۆی چاودێری کردنەوە گەشەی کرد ٥ **تَرَقَّحَ:** کاسبی کرد، هەوڵی دا بۆ دابینکردنی بژێوی ماڵو خێزانی خۆی ٥ **الرَّقاحيُّ:** بازرگانێك زۆر بەخەم ماڵو سامانی خۆیەوە بێ.

**رَقَدَ** رَقْدا ورُقُوداً: نوست ٥ (رَقَدَ عن الأمر): وازی لەنیشەکە هێنا ٥ گوێی بەنیشەکە نەدا لێی غافڵ بوو.

**رَقَدَ عن الضيف:** گرنگی بەمیوانەکە نەدا.

**رَقَدَ الحَرُّ:** گەرما نەما.٥ **أرْقَدَهُ:** نواندی.٥ **رَقَدَ المكان:** لەو شوێنە مایەوە ٥ **رَقَّدَهُ:** بەمانا (أرقَدَهُ) دێ ٥ **ترقَّدَ:** خۆی بەنوستوو خست ٥ **أرْقَدَّ:** خێرا ڕۆیشت ٥ **اِسْتَرْقَدَ:** هەنەوز سواری بوو ٥ **الرَّاقُودُ:** کوڵینەو کوپەی گەورەو قوڵ ٥ **الرَّقْدَةُ:** گەرمای دوا سەرما ٥ **الرُّقُودُ:** ئافرەتێك ناز پەروەر بێو کێشتەنگاوان بخەوێ ٥ **المَرْقَدُ:** شوێنی نوستنو پاڵکەوتن ٥ گۆڕو ئارامگا ٥ **المُرْقِدُ:** دەرمانێکە ئادەمیزاد بێهۆش دەکا ٥ بێ ئاگای دەکا.

**رقرق الماءَ وغيره:** بەهێواشی ئاوەکەی ڕشتە ناو شتەکەوە.

**رقرق عينَهُ:** چاوی فرمێسکی ڕژاندن ٥ **رقرق الشَّرابَ:** شەرابەکەی تێکەڵ بەشلەمەنی تر

کرد ٥ رقرق الثريدَ بالدسم: تێـکوشاوی تێـکەڵ ڕۆنـاو کـرد ٥ رقـرق الطيـبَ فِي الثـوب: بـۆنی خۆشـی پۆشـاکەکەی کـرد ٥ تَرَقْـرَقَ المـاءُ وغـيـه: ئاوەکـە بەهێواشـی هەڵرژایـە خـوار، یـان بەهێواشی ڕۆیـی ٥ تَرَقْـرَقَ المـاءُ وغـيه: ئاوەکـە شڵەقاو شەپۆلی دا، یـان بەهێواشـی ڕەوان بـوو کـشا، دەگـوترێ: (ترقـرق الـدمع مـن العـين): فرمێـسك لەچاودا قـەتیس مـا ٥ تَرَقْـرَقَ عينـه: چـاوی فرمێـسکی رژانـد ٥ تَرَقْـرَقَ الـسرابُ: تراویلکەکە درەوشایەوە، بریـسکەی دا ٥ تَرَقْرَقَت الـشمسُ فِي طلوعهـا: خـۆر لـەکاتی هـەڵهاتنی دا واهاتـە بەرچـاو بـسوڕێتەوە ٥ تَرَقْـرَقَ الحيـوان لِلسِّمن أو الهزال: ئاژەڵەکە خەریکە قەڵەو بێ یـان بـەرەو لاواز بـوون بـچێ ٥ الرُّقـارِقُ: ئـەو شـتەی بدرەوشـێتەوە یـان تێـکەوە بهـاوێ ٥ الرُّقـارِقُ مـن المـاء: نـاوی کـەم ٥ جـۆرە ئـاو ٥ الرُّقارِقُ من الثياب: پۆشاکی تەنك ٥ الرُّقارِقُ من الشراب: شلەمەنی ڕون ٥ الرُّقارِقُ من الـسيوف: شمشێری بریسکەدار ٥ الرُّقراق: بەمانا (الرُّقارق) دێ ٥ هەرشتێـك بدرەوشـێتەوە ٥ الرُّقـراق مـن الـدّمع: فرمێـسکی قـەتیس مـاو یـان زەنگـۆڵ زەنگـۆڵ ٥ (جاريـة رقراقـة): کـچۆڵەیەکی تـەڕو تازەو دەمەو چاو تەڕو گەش ٥ (رقراقة البـشرة): پێست سپی درەوشاوە ٥ رَقَشَهُ: زەخرەفەی کردو نەخشاندی ٥ جوانی کردو ڕازاندییەوە.

**رَقَشَ** الكتابَ: کتێبەکەی نووسیەوەو خاڵی لەسە پیتەکان دانا.

رَقَشَ النَّمَّامُ كلامَهُ: فیتنە جویەکە قسەکانی خۆی ڕازاندنەوە بۆ ئەوەی مەبەستەکانی بپێکی.

رَقِشَ رَقَشاً ورقشةً: خاڵخاڵاوی و بەڵەك بـوو ٥ الرَّقشاءُ: بـەمانا (الرَّقاش) دێ ٥ جـۆرە کرمێـکە ڕەنگاو ڕەنگ خاڵی زەردو سوری تێدان جوانو سەرنج ڕاکێشە لەناو گژوگیادا دەژی ٥ الرُّقشة: ڕەنگێکی خاڵخاڵاوییە، یان تێکەڵە ڕەنگێکە لە لێڵ و ڕەش و بۆر.

**رَقَصَ** رَقْصاً: سـەمای کـرد، جەسـتەی خـۆی جوڵانـدەوە لەسـەر شێوەو هـەوای مۆسـیقا یـان گـۆرانی ٥ بەشـێوەی لارو لەنجـەو خۆبـادان ڕۆیشت.

رَقَصَ النَّبيذُ: سرکەکە هەڵچوو.

رَقَصَ فِي الكلام: خێرا خێرا قسەی کردن.

رَقَصَ الجملُ: حوشترەکە کەوتـە سـەر ڕەوتو جـوان ڕۆیـی ٥ أرقَـصَ فِي سـيره: بـەمانا (رَقَـصَ)دێ ٥ أرقَصَ فلاناً: فلانکەسـی هـەڵنا بـۆ سـەماکردن ٥ أرقَـصَت المـراةُ وَلَـدَها: ئافرەتەکـە منداڵەکـەی هەڵتەکاند ٥ هەڵی بەڕاند ٥ أرقَصَ فلانٌ الدَّابَّةَ: فلانکەس وڵاخەکەی هاندا بـۆ خێـرا ڕۆیـشتن ٥ رَقَّـصَهُ: بـەمانا (أرقَـصَهُ)دێ ٥ تـرقَّصَ: بـەمانا (رَقَصَ)دێ ٥ الراقِصَةُ: سـەماکەر ٥ (ليلة راقصة): شەوێـکە سـەمای تێـدا بکـرێ ٥ الـرَّقْصُ: جوڵانـدنی بەشێـکە لەجەسـتە یـان زۆربـەی لەسـەر شـێوەی مۆسـیقاو گـۆرانی، بـەزۆری بەهەڵتەکاندنی شان یـان سمت یـان دوو دەست ئـەنجام دەدرێ ٥ بـۆ دەربڕینـی جـۆرە مانایـەك لەماناکان ٥ چەند جۆری هەیە ٥ الرَّقصُ: قسەو قسەڵۆك، دەگـوترێ: (سمعت رَقْصَ الناسِ علينـا): گوێم لەقسەی ناشیرینی خەڵك بوو دژی ئێمە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (لـه رَقْـصٌ فِي كلامـه): لەقـسەکردن دا پەلـە پەلیـەتی ٥ الرَّقّـاصُ: کەسێك زۆر سەما بکا، پیشەی سەماکردن بێ ٥ بەندۆڵی کاتژمێر ٥ الرَّقّاصَةُ: ئافرەتێك پیشەی سەماکردن بێ ٥ زەوییەك ئاویش بدرێ هیچی لـێ نـەڕوێ ٥ المَـرْقَصُ: شـوێنی سـەماکردن ٥ المَرْقَـصَةُ: بـەمانا (المَـرْقَصُ) دێ.

رَقَطَهُ رَقْطاً: خاڵی تێدا دروست کردن.

**وَقِـطَ** رَقْطـاً: خـاڵی پێـوە بـوون ٥ **رَقَّطَـهُ**: بـەمانا (رقطه)دێ ٥ دەگوترێ: (رَقَّطَ علی ثوبـه): بۆیـەو ڕەنگـی بەسـەر پۆشـاکەکەی دا پژانـد ٥ **تَـرَقَّطَ**: پەڵـە پەڵـە بـوو ٥ دەگـوترێ: (تَـرَقَّط الـنسیجُ): قوماشـەکە گـوڵ گـوڵ بـوو ٥ **الأرْقَـطُ**: پڵـنگ ٥ هەرگیانلەبەرێـك ڕەنگی خاڵخاڵو بەڵەك بـێ ٥ **الـرَّقَطُ**: نوختــەو خــاڵ ٥ **الرَّقْطـاء**: مێینــەی (الأرقــط)ە ٥ جــۆرە مارێــکە ٥ تێکۆشاوێــکی چەوری وەها ڕۆنەکەی لەسەر ڕاوەستابێ پەڵە پەڵە ٥ **الرُّقْطَة**: ڕەنگێك لەسپیو ڕەش تێـکەڵاو بێ ٥ یان لەڕەنگی سورو زەردو هی تـر تێـکەڵ بوو بێ.

**وَقَـعَ** الـشیخُ رَقعـاً: پیرەمێردەکە یـان پیرەژنەکـە لەکاتی هەستان دا هەردوو دەستی دادان.

رَقَـعَ في سـيره: خێـرا ڕۆیـشت ٥ دەگـوترێ: (مـارقع فلان رقعاً): فلانکەس هیـچی بۆنـەکرا، هیچی نەکرد.

رَقَعَ الثَّوبَ والحذاءَ رقعاً ورقعةً: کراسەکەی پینەکرد ٥ پێڵاوەکانی پینەکردن.

رَقَعَ البناءَ: پاڵپشتی بۆ بیناکە دانا، دەیرەگی بەردا.

رَقَعَ أمورَهُ: کاروباری خۆی ڕێـك خست.

رَقَعَ فلاناً: لەفلانکەسی دا ٥ (رَقَعَهُ بکفّ أو بـسهم): شەپلاغەی لـێ دا، تیری پێوەنا.

رَقَعَ الأرض برجلـه: بـەقاچ زەوییەکەی کوتایـەوەو پێ پەستی کرد.٥ رَقُعَ رقاعَةً: نەحمەق بوو گێـل بـوو ٥ **أرْقَـعَ الثـوبُ وغـيره**: پۆشـاکەکە کـاتی پینەکردنی هاتووە ٥ **أرْقَعَ فـلان**: فلانکەس بـێ عەقڵییەکی زۆری کرد شتێکی ناشیرینی ئەنجام دا ٥ **رَاقَــعَ الخَمْــرَ**: بــەردەوام بــوو لەســەر خواردنەوەی مەی ٥ **رَقَّعَهُ**: بـەمانا (رَقَعَـهُ) دێ ٥ **رَقَّعَ البنـاءَ**: پاشکۆڵی بۆ بیناکە دانـا، دیرەگی بـەردا ٥ **رَقَّعَ أموالَـهُ أو معیشته**: مـاڵو سـامانی خۆی ڕێـك خست یان ژیانی خۆی ڕێـك خست ٥ **رَقَّعَ الحدیثَ**: لەقسەکەی زیـادکردو کـەمو کوڕی تێدا نەهێشت ٥ **إرْتَقَعَ**: دەگوترێ: (ما أرْتَقِعُ لـه أو به): گرنگی پێ نـەدا ٥ (ما ترتقع مني برقـاع): گوێ بەئامۆژگاری من نادا ٥ یـان هیچم بەقسە ناکا ٥ **تَرَقَّعَ**: کاسبی کرد ٥ **استرقَعَ**: کـاتی ئـەوەی هاتووە پینەی بکەی ٥ **الأرْقَعُ**: ئەحمەقو گێل ٥ ئاسمـانی دونیـا لـەم ڕووەوە کەبـە ئەسـتێرە ڕازاوەتەوە ٥ **الترقيع**: (ترقیـع الجـروح): ئەوەیـە برینەکـە پـاك بکرێتـەوە ئـەمجار بـە پارچـە پێستێکی شوێنێـکی تـری جەسـتەی دابپۆشـرێ ٥ **الرَّقاعَة**: گێلیو بـێ عـەقڵی ٥ بێ حەیاو بێ شەرم ٥ **الرَّقاعي**: کەسێـکە زۆر دەربەست ماڵو سامانی خـۆی بـێو هەمیـشە خـەریکی ڕێـكو پێـك کردنی بـێ ٥ **الرَّقيعُ**: ئاسمـانی حەوتـەم ٥ **الرَّقعاءُ**: ئـافرەتی گێـل ٥ شـتی ڕەنگـاو ڕەنـگ ٥ ئافرەتی قاچ باریك ٥ **الرُّقْعَةُ**: پینـە، پارچـەیەك پینـەی پـێ بکـرێ ٥ کوتـە کاغەزێـك پارچـە پێستێك شـتی لەسـەر بنوسـرێ ٥ پارچـە زەوی پەڵەگیاو گژو لەوەڕگا ٥ **رقعة الـشطرنج**: پارچـە تەختەیەك کە چوارگۆشـە چوارگۆشـە کـراوە ٥ **خطّ الرُّقعة**: جۆرە خەتو نوسینێکە نامەی پـێ دەنوســرێ ٥ **الرُّقَعَــةُ**: جــۆرە درەختێــکە زەبەلاحو گەورە گەڵاکەی وەکوو گەڵای کولەکە وایە، بەرەکەی وەکوو هەنجیر دەچـێ ٥ **الرَّقیـعُ**: گێلو ئەحمەق ٥ ئاسمان ٥ **المَرْقَعانُ**: گێلو نەفام ٥ (مَرْقَعانة): بۆ مێینە بەکاردێ ٥ **المَرْقَعُ**: شوێنی پینەکردن ٥ **المِرْقَعُ**: دەگوترێ: (خطیـب مِرقَـع): وتار بێژێـکە قسە دەخاتـە پـاڵ قسەو ڕێـکیان دەخاو وتارێـکی جوانی لـی پێـك دێ ٥ **المُرَقَّعُ**:

پیاوی قالبوو لەبۆتە دراوو خاوەن ئەزموون ٥ اَلْمُرَقَّعَةُ: پۆشاکی سۆفیان لەم ڕووەوە پینە پینە بێ ٥ رَقَّهُ رَقّاً ورَقَّةً: تەنکی کرد.

رَقَّ رَقّاً ورِقَّةً: باریك بوو کزو لاوزاو ناسكو لەتیف بوو.

رَقَّ عَظْمُهُ: ئێسقانی زەعیف بوو، پیر بوو، بەساڵا چوو.

رَقَّ عـددە: تەمـەنی کـەم بـوو ٥ پێستی داماڵدراو هێزی نەما.

رَقَّ حالُهُ: هەژار کەوتو ماڵو سامانی نەما ٥ ئاسان بوو، نەرم بوو.

رَقَّ لە: بەزەیی پێدا هات ٥ گەردنکەچ بوو، ملی دا ٥ شەرمی کرد ٥ دەگوترێ: (رقّ وجهُهُ): بەڕوان تەنك بوو.

رَقَّ الحُرُّ: ئازادەکە بوو بەکۆیلە ٥

أرَقَّ: بەمانا (رَقَّ) دێ.

رَقَّ الفَرَسُ ونحوه: ئەسپەکە سمی تەنك بوو.

رَقَّ فلاناً: فلانکەس بارو دۆخی نالەبار بوو، هەژار کەوت.

رَقَّ به أخلاقُهُ: چروك بوو خێرو بێری نەما.

رَقَّ الحُـرَّ: ئادەمیزادەکەی کـردە کۆیلـە ٥ هـەڵی گێڕایەوە، بە ئامۆژگاریو قسەی جوان نـەرمی کرد ٥ رَقَّقَ قَلْبَهُ: دڵی دایەوەو نەرمی کرد ٥ رَقَّقَ کلامَـهُ: قسەکانی نـەرمو نیـان کـردن، قسەی جوانی وتـن ٥ رَقَّـقَ مَـشْيَهُ: بەهێواشـی ڕۆیـی ٥ رَقَّقَ بينهما أو مابينهما: نێوانی ئـەو دوکەسـەی تێـك دا ٥ تَـرَاقَّ هَرَمُـهُ: ڕاوو بۆچـونی گەیـشتە کۆتـایی ٥ تَرَقَّـقَ: بـەمانا (رَقّ) دێ ٥ بەهێواشـی ڕۆییشت، زەلیلو مـل کەچـی کـرد ٥ دەگـوترێ: (ترقّقَـتِ الحـسناءُ فلانـاً): ئافرەتـە جوانەکـە فلانکەسـی ژێردەسـتە کـردو دڵـی لـێ سـتاندو کردویەتی بەکۆیلە ٥ اسْتَرَقَّ الماءُ ونحوه: ئاوەکە ڕۆچوو جگە لەکەمێکی ٥ اسْـتَرَقَّ الليـلُ وغيره: شەوەکە زوربەی ڕۆیشت ٥ اسْتَرَقَّ الأسيرَ: بەدیل گیراوەکەی کردە کۆیلە ٥ اسْتَرَقَّ الحُرَّ: مامەڵەی کۆیلـەی لەگـەڵ پیـاوە ئازادەکە کـرد ٥ الرِّقَـاقُ: زەوی دەشـــتو نەرمـــەڵان ٥ ئـــەو چـــاڵاییەی ماوەیەك ئـاوی تێـدا ڕاوەسـتاوەو دوایـی ئاوەکـە ڕۆچـووە، دەگـوترێ: (أرض رقـاق): زەوییـەکی نەرمەڵانە، گڵە وردەیە ٥ (يوم رقـاق): ڕۆژێـکی گەرمە ٥ الرُّقاقُ: کۆیلە ٥ نانی تیری ٥ ڕۆیشتنی لەسەرە خۆ ٥ الرَّقُّ: چەرمێـکە تـەنك بـۆ تێـدا نوسـین بـەکاردێ ٥ لاپـەڕەی سپی ٥ ئـاوی کـەم لەبنکی دەریـادا یـان لەشیوو دۆڵ دا ٥ کیسەڵی گـــەورە ٥ گیانلەبەرێـــکی ئاوییـــە وەکـــوو ٥ تیمساح وایە ٥ الرِّقّ: شتی تەنك ٥ بەندایەتی ٥ زەوی نەرمەڵانی پانو پۆڕ ٥ ئـەو چـرۆو سـەرە تەرزانـەی ئـاژەڵ بەئاسـانی دەمـی دەیگاتـێو بەلایـەوە خۆشـە ٥ الـرُّقُّ: ئـاوی تـەنکاو ٥ ئـاوی کەمی بنکی دەریاو ناو شیو ٥ زەوی نەرمـەڵانی پانو پۆڕ ٥ الرِّقَّـقُ: نـەرمیو سوکی ٥ تـەنکی ٥ زەوی نەرمەڵانو پانو پۆڕ ٥ لاوازیو بێ هێزی ٥ الرِّقَّـــةُ: بـــەمانا (الرِّقـــاقُ)دێ ٥ یـــان هـــەر زەوییـەکی دەم ڕوبـارە کـە لـەکاتی هەسـتانی ئاوەکـە دا ئـاوی بگاتـێو کەچـەمەکە نیـشتەوە ئاوەکـەی لەسـەر نامێنێو زەوییەکـە بـۆ ڕوەك تێدا ناشتن لەبارە ٥ الرَّقِيقُ: شتی باریكو تەنك ٥ کۆیلە ٥ اَلْمَرَقّ: هەرشتێـك باریـك یـان تـەنك بێ ٥ (مـرق الأنـف): نەرمـەی لـوت ٥ (مـراق الـبطن): نەرمـەی ورگ ٥ لای خـواروی ورگ ٥ المِرْقاقُ: تیرۆك؛ دارێکە نانی پێ پان دەکرێتەوە ٥ اَلْمُرَقَّقُ: نانی تەنك، نانی تـیری ٥ اَلْمُسْتَرَقُّ مـن الـشَّيْءِ: نەرمـەی شت ٥ أرْقَـلَ في سيره: پەلـەی کرد لەڕۆیشتنی دا ٥ أرْقَلَت النخلةُ: دارخورماکە

درێــژ بــوو، هەڵــچو ٥ الراقــول: حەبلێــکە بــەکاردێ بــۆ چــونە ســەر دارخورمــا ٥ الرُّقْلَةُ: دارخورمــای بــەرز ٥ اَلْمِرْقــالُ: تیــژڕۆ، یــان ڕۆیندەو زۆر ڕەو.

**رَقَمَ** الكتابَ وعليه وفيه رَقْماً: کتێبەکەی نووسی ٥ (هو يَرْقُمُ على الماء): بەکەسێـك دەگـوترێ کاری بێ سود بکا، بەنێیشی هیچو بوچەوە خەریك بێ.

رَقَمَ السِّلْعةَ کاڵاکەی نیشانەکرد، نرخی لەسەر دانا ٥ . ـِی لــێ دا، جۆرەکــەی دیــاریکرد ٥ رَقَّــمَ الكتابَ والثوبَ: بەمانا (رَقَمَ)دێ ٥ الأَرْقَمُ: نێـرە مــار یــان مــاری ژاراوی پــیس ٥ التَرقــيمُ: خاڵبەنــدی؛ دانــانی خــاڵو فــاریزەو داشو نیشانەی پرسیارو سەر سوڕمان ٥ الرَّقْمُ: خەتی گــەورە ٥ نیــشانەکردن ٥ مــۆر لــێ دان ٥ نــرخ لەســەر شــت دانــان ٥ نــاوزەدکردنی قوماش ٥ هەروا ناوە بۆ ژمارە سادەکان: (١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩) ٥ الرَّقم القياسي: ژمارەیەکە کە پێشبڕکێ کار لای زۆروی لــێ بەدەسـت دێنــێ، وەکــوو ئــەوە ڕاکەرێــك لــەماوەی دە چــرکەدا هــەزار مــەتر بــبڕێو کەســانی تــر بــە (١٥)چــرکە ئــەو مەودایەیان بڕیبێ ٥ الرُّقمةُ: باخچە ٥ قەراخی شیو، یان زۆنگاو، یان شوێنی کۆبونــەوەی ئــاو ٥ رومکێکە ناوی خوبازایە ٥ ئێسقانێکە لەشێوەی نینــۆك لەســەرو باریکــایی دەســتی وڵاخــەوە دەردەکەوێ ٥ خاڵێکی خڕە لەشێوەی دیرهــەم دا ٥ الرَّقيمُ: کتێب ٥ ئاسمان ٥ گوندی (أصحاب الكهــف)، یــان ئــەو کێــوەی بــۆی چــوون، یــان شــیوەکە یــان ئــەو بــەردو ئەشــکەوتەی چــونە ژێــری، یــان ئــەو ڕەصاصــە یــان ئــەو لەوحــەی زانیــاری دەربــارەی (أصــحاب الكهــف)ی پــێ نوسراوەو لەسەر نوسراوە ٥ المُرَقِّمُ: نووسەر ٥ اَلمِـرْقَمُ: قەڵــەمو پێنــووس، دەگــوترێ: (طــاح مِرْقَمُك): قەڵەمەکەت هەڵەی کرد، تیژ ڕۆیی کــرد ٥ نامێرێــکە نــانو کولێرەی پــێ نــەخش دەکرێ ٥ نوتــو ٥ رَقَنَتِ المراةُ رَقْنــاً: نافرەتەکە بەزەعفەران قژی خۆی ڕەنگ کرد.

**رَقَّــنَ** الــشعرَ: قژەکــەی ڕەنــگ کــرد ٥ أَرْقَــنَ: بەزەعفــەران خــۆی ڕەنــگ کــرد ٥ أَرْقَــنَ شَعرَهُ: بــەمانا (رَقَّــنَ) دێ ٥ أَرْقَــنَ الطعــامَ: ڕۆنــی تێکەڵاوی خواردنەکە کرد ٥ رَقَّنَتِ المراةُ: بەمانا (رَقَنَتْ)دێ ٥ رَقَّنَ الكتابَ: بەشێوەیەکی جوان کتێبەکەی نووسییەوە ٥ رَقَّنَ الثَّوبَ: کراسەکەی بەزەعفەران ڕەنگ کــردو ڕازاندییــەوە ٥ ارْتَقَنَ: بەمانا (أَرقَنَ)دا ٥ الأَرقان: خەنە ٥ زەعفــەران ٥ الرَّاقِنُ: ڕەنگی جوان ٥ الرِّقان: بــەمانا (الإرقــانُ) دێ ٥ الــرُّقَنُ: هێلکــەی داڵاشو داڵ ٥ الرُّقــون: خەنــەو وســمــەو زەعفــەران ٥ الــرُّقِينُ: بــەمانا (الرَّقيم) دێ ٥ دیرهەمو شتی لەو جۆرە.

**رَقَا** الطائرُ: باڵندەکە بەرز بووە.

**رَقَى** المريضَ: نوشتەو دوعای بۆ نەخۆشــەکە کــرد ٥ رَقَيْتُ فلانــاً: تەمــەلوقو سازشکاریم بۆ فلان کرد.

**رَقِيَ** رَقْياً ورُقِيّاً: سەرکەوت، بەرزبۆوە.

رَقِيَ الجبلَ: چووە سەرکێوەکە.

رَقِيَ الدَرَجَ: بەپەیژەکە دا سەرکەوت.

رَقِــيَ علــى الباطــلِ: شتە بەتاڵەکــەی بەســەرم دا تێپەڕانــد ٥ شتێــکی بــەدەم منــەوە هەڵبەســت کەنــەم گوتــووە ٥ ارْتَقَــى: بــەرز بۆوە ٥ (ارتقــى العــرشَ): چــووە سەرکورســی دەســەڵات، بــوو بەپاشا ٥ ارْتَقَى بطنه: ورگی پڕبوو، تێــر بــوو ٥ تراقــى: هەڵــکشا، بــەرز بــۆوە ٥ تَرَقّــى: بــەمانا (ارتقى) دێ، دەگوترێ: (تَرَقَّى فلان مــن حــال الى

حـال): لـەحالّو ومزعێـکەوە چووە نـاو بـارو دۆخێـکی تـرەوە ٥ **تَرَقّـی العامِـلُ**: کرێـکارەکە پلەی بەرز بۆوە لەپلەیەکەوە بۆ پلەیەکی بـەرز تر ٥ **تَرَقّی في العلم وغيه**: پلـە پلـە لەخوێنـدنو زانیـاریی دا بـەرز بـۆوە ٥ **اسـترقی فلانـاً**: داوای لەفلاّن کـرد دوعـاو نوشتەی بـۆ بکا ٥ **الراقي**: نوشـتەکار ٥ خـاوەن نووشـتەو دوعـا ٥ **الرُّقـاء**: بەمانا (الراقي) دێ، کەسێك چوبێتە سەر کێو ٥ **الرُّقُوّ**: کۆمەڵە گڵ یان کۆمەڵە لـب ٥ **الرُّقـوَةُ**: بـەمانا (الرقـوُ) دێ، پلـەو پلیکانـە ٥ **الرُّقيَـةُ**: نووشتەو دوعا بۆ نـەخۆش‌و شـتی وا ٥ **المَرْقی**: شوێنی بـەرز بوونـەوە ٥ **المِرْقـاةُ**: هۆکاری بـەرز بوونەوە ٥ پەیژەو پلیکانە ٥ یـان شوێنی بـەرز بوونـەوە ٥ **رَکّيَـةُ**: لەئـەژنۆی دا یـان بەئـەژنۆ لـێ‌ی دا.

**رَكِـبَ** رَكَبـاً: ئـەژنۆی گـەورە بـوو یـان یەکێـکیان گەورە بوو.

رکب الشَّئَ علیه وفیـه: سواری شتەکە بـوو، چووە سـەری، دەگـوترێ: (رکـب فِي الـسفينة)، هـەروا دەگوترێ: (رَکِبَ الشَحْمُ بعضُه بعضاً): بـەز قـات قات چووە سەریەك.

رَکِبَ الدینُ فلاناً: قەرز سواری شان‌و ملی فلان بوو.

رَکِبَ فلان رأسَهُ: بەنەشارەزایی ملی رێگای گرت.

رَکِبَ الذَّنبَ: تاوانی ئەنجام دا ٥ ئیشی خراپی کرد.

رَکِبَ فلاناً: شوێن فلانکەس کەوت ٥ لەحـەدیث دا هاتووە: (فإذا عُمر قـد رَکِبَنـي): روانـیم عومـەر بەشوێنم دا هات.

رُکِـبَ: ئـەژنۆی ئازاری پەیـدا کـرد ٥ **أرکَـبَ المهـرُ**: جوانووەکە کـاتی سـواربوونی هـات، دەگـوترێ: (دابة مُرْکِبةٌ): ولاّخێکە کـاتی سـواریی هـاتووە ٥ **أرکَـبَ فلانـاً**: فلانکەسـی سـوار کـرد ٥ لـەدوا خۆیـەوە سـواری کـرد یـان ولاّخـی سـواریی بـۆ دابین کرد ٥ **رَکَّبَهُ**: سواری کـرد ٥ **رَکَّـبَ الـشَّئَ**: شـتەکەی خـستە سـەریەك ٥ تێـکی خـستو شـتەکانی تێـکنان‌و کردنـی بەیـەك پارچـە ٥ **إرتَکَـبَ ذنبـاً أو قَبیحـاً**: تـاوانی کـرد، کـاری ناشـیرینی ئـەنجام دا ٥ **تراکَـبَ الـشَّئُ**: شتەکە هەندێـکی کەوتـە سـەر هەندێـکی ٥ **تَرَکَّـبَ**: دەگوترێ: (تَرَکَّبَ الـشَّئُ مـن کـذا): ئـەو شـتە لـەوە پێـك هـاتووە ٥ **إستَرکَبَهُ**: داوای لـی کـرد سواری بکـا ٥ **التَّراکُـبُ**: لەزانیاری رووەکناسـی دا زیـــادبوونی دیـــواری خانەیـــە لـــەبارەی ئەستورییەوە بەو جۆرە مادەی ئەستورەکە توێ تـوێ بـچنە سـەریەك ٥ **التَرکیـب**: لـەزانیاری فەلـسەفەدا پێـکهاتنی شـتە لەپێـکهاتە بەسیتەکانی ٥ پێچەوانەی (التحلیل)ە ٥ **الرّاکِب**: سەرە تەرزەی لقـە خورمـا کەبـەرەو زەوی شـۆڕ دەبنـەوەو ناگەنـە زەوی، یـان لـەبنکی درەختـی خورما دێنە دەرەوەو ڕەگی نییە ٥ تۆقە سەری کێو ٥ **الرّاکِبَـةُ**: مێینـەی (الرّاکـب) ٥ **الرّاکـوب**: بـەمانا (الرّاکـب) دێ ٥ **الرِّکـاب**: ئـاوزەنگی ٥ حوشتری سواریی ٥ یان حوشـتری بـار هەڵـگر ٥ **الرَّکَـبُ**: خـوار نـاوك، شـوێنی بـەر لـێ ڕوان ٥ کۆتایی ڕان ٥ سپیاییەکە لەئـەژنۆدا ٥ **الرُّکبـان**: (رُکبـان الـسنبل): ئـەو گوڵـە گەنمانـەی زوو دەردەکـەون دەبنـە نـۆ نەخـشەی ئـەوانی تـر ٥ **الرُّکبَةُ**: ئـەژنۆ ٥ **الرَّکیـبُ**: کەسێـك زۆر سواری ولاّخ بێ، یـان سوارچاك بـێ ٥ **الرَّکوبُ**: ولاّخـی سـواریی‌و شـتی لـەو جـۆرە ٥ (طریـق رکـوب): ڕێگایەکی خۆش‌و تەختە ٥ **الرَّکوبَةُ من الدواب**: بـەمانا (ألرّکـوب) دێ ٥ یـان بـەمانا ولاّخـی تایبەتە بۆ سواریی ٥ **الرَّکیب**: کەسێـکە لەگـەڵ یەکێـکی تـردا سـوار بـووبی، دەگـوترێ: (هـو رکیب فلان) ٥ **ألمُرَکَّبُ في الشَّئ**: وەکوو مـیروی

ناو ئەنگوستیلەو شتی وا ٥ باخو زەوی كشتوكاڵ ٥ ئەمامە خورما كەلەسەر جۆگا بەرێز چەقێندرابن ٥ پارچە زەوییەك قەراخەكانی هەڵدرابنەوەو بگونجێ بۆ كشتوكاڵ ٥ هەروا ناوە بۆ جۆگایەك بكەوێتە نێوان دوو پارچە زەوییەوە یان بكەوێتە نێوان دوو باخی دارخورماو ڕەز ٥ **المَرْكَبُ**: هەرشتێك بۆ سواری بشێ لەوشكانی یا لەناو دەریادا ٥ وەلێ بەزۆری بۆ كەشتی بەكاردێ ٥ **المُرَكَّبُ**: بنەماو شوێنی ڕوان ٥ بنەچەو نەژاد ٥ (هو كريم المُرَكَّب): ئەو وەجاخزادەیە ٥ (الجهل المُرَكَّب): ئەوەیە كابرا نەزانێو نەشزانێ كەنازانێ ٥ وشەی (مُرَكَّب): لەزانیاری مەنتیق دا ئەوەیە بەشێك لەوشەكە بەشێكی ماناكەی بگەیەنێ ٥ وەكوو (كاتب المقالة) ٥ **المَرْكُوبُ**: هەرشتێك بشێ بۆ سواریی.

**رَكَحَ** اليه رَكْحاً: پەنای بۆ برد، پشتی پێ بەست ٥ **أرْكَحَ اليه**: بەمانا (رَكَحَ)دێ ٥ **أرْكَحَ شيئاً اليه**: شتەكەی كردە پاشكۆڵو پشتیوان ٥ **إرْتَكَحَ الإناءُ**: قاپەكە پڕبوو لەشۆرباو ٥ **إرْتَكَحَ إلى الشَّيْ**: بەمانا (رَكَحَ)دێ ٥ **تَرَكَّحَ بالمكان**: لەو شوێنە مایەوە ٥ هەوڵی فراوانكردنی دا ٥ **الرُّكْحُ**: سوچو پەنا ٥ بەربێڵا ٥ بناغە ٥ ماڵی ڕەبەنو دەروێش ٥ **الرُّكْحَاءُ**: تەپۆڵكە زەوی سەخت ٥ **الرُّكْحَةُ**: ساحە ٥ بەربێڵا ٥ پارچە تێكوشاو كەلەبنكی قاپ دا مابێتەوە ٥ **المِرْكَاحُ**: ئەوكەسەی زۆر لەسەر پشتی وڵاخ بمێنێتەوە.

رَكَدَ رُكُوداً: هێواش بووەو ئارامی گرت.

رَكَدَ السوقُ: بازاڕ وەستاو مامەڵەی تێدا نەكرا.

رَكَدَ الميزانُ: تەرازووەكە هەردوو تاكەی بەرامبەر یەك وەستان.

رَكَدَ رِيحُهُمْ: بای بەختیان ڕۆیشت ٥ هێزو دەسەڵاتیان نەما ٥ **أرْكَدَهُ**: جێ نشینی كرد، دای نیشاند ٥ **الراكدة**: سێ كوچكە ٥ **الرَّكُود**: ئەو شیردەرەی ماوەی شیردانی درێژە بكێشێ ٥ كۆڵینەو كەندوی پڕ لەشت ٥ **رَكْرَكَ**: لاواز بوو ٥ ترسنۆك بوو ٥ **تَرَكْرَكَ السقاء**: مەشكەكە ژاو ڕۆنەكەی سەركەوت.

**رَكَزَ** شيئاً في شيء: شتەكەی چەقاند لەشتەكەدا، دەگوترێ: (ركز السهم في الأرض): تیرەكەی لەزەوی چەقاند ٥ (رَكَزَ اللهُ المعادن في الأرض): خودا كانی زۆری لەزەوی دا بەدیهێناون ٥ **أرْكَزَ المَنْجَمُ** وغيره: كانەكە مەعدەنی تێدا دۆزرایەوە ٥ **أرْكَزَ فلان**: فلانكەس كانی دۆزییەوە ٥ **أركزَ صاحب المعدن**: خاوەن كانەكە زێوی زۆری بۆ لێ دەرهێنا ٥ **رَكَّزَهُ**: بەمانا (رَكَزَهُ)دێ ٥ **أرْكَزَ اللَّبَنَ**: ماستەكەی خەست كردەوە ٥ **أرْكَزَ فِكرَهُ**: سەرنجی خۆی تێدا كۆكردەوەو دیقەتی دا ٥ **إرْتَكَزَ**: جێگیر بوو، وەستا ٥ **إرْتَكَزَ عليه**: پشتی پێ بەست ٥ **تَرَكَّزَ**: جێگیر بوو خۆی چەسپاند ٥ **الإرتكاز**: (نقطة الإرتكاز): ئەو شوێنە چەسپاوەی هاوسەنگی نێوان هێزی پاڵنەرو هێزی بەرگری دەكا ٥ (اتخذ الجيش مدينة كذا نقطة ارتكاز): واتە: سوپا فلانە شاری كردە بارەگا ٥ **الرِّكازُ**: ئەو مەعدەنە سروشتیانەن كە لەزەوی دا خودا بەدیهێناون ٥ گەنجو خەزێنە ٥ ماڵو سامانی شێردراوە لەژێر زەوی دا كە بكەرێتەوە بۆ پێش هاتنی ئیسلام ٥ **الرِّكْزُ**: چرپەو ورتە ٥ **الرِّكْزَةُ**: تاكی (الرِّكاز)ە ٥ ئەمامە خورما كەلەقەدی دارخورما بڕوێو دوایی هەڵبكەندرێو لەشوێنێكی تر بروێندرێ ٥ دامەزراوی عەقڵو ئاوەز ٥ **الرَّكيزة**: ئەو شتەی قورسایی دەخرێتە سەرو دەبێتە جەمسەر ٥

پارچە مەعدەنێکی بەنرخ کەلەژێر زەوی دا شار درابێتەوە ٥ پارچە ئامێرێکی مۆسیقایە ٥ **اَلْمُرْتَکزَة**: لاسکی ڕوەك کەگەڵاو پرژەکانی پێوە نەمابن.

**اَلْمَرْکَزُ**: مەڵبەندو بارەگای سەرەکی کە لقو پۆپی تری لێ ببنەوە ٥ **مرکز الجند**: مەڵبەندی سەربازو پێشمەرگە کە فەرمانیان پێ کرابێ تێیدا بمێننەوەو جێی نەهێڵن ٥ **مرکز الرَّجُلِ**: ماڵو حاڵو پلەو پایەی پیاو ٥ **مرکز الدائرة**: چەقی کەوانە، ناوەڕاستی کەوانە ٥ **المرکزیة**: یاساو نیزامێکە وڵات هەمووی پەیوەست دەبێ بەبارەگای سەرۆکەوەو هەموو کاروبارێك بەدەستی یەك کەسەوە دەبێو ئەو خاوەن بڕیار دەبێ ٥ **پێچەوانەکەی** (اللامرکزیة)یە، کەهەندێ دەسەڵات دەدرێ بە بەشەکانی وڵاتو کاربەدەستەکانی خوار تر هەندێ بڕیاریان بەدەستەوە دەبی ٥ **رَکَسَهُ رکساً**: گەڕاندییەوە، هەڵی گێڕایەوە.

**رَکَسَ** الرَّکَاس: حەبلەکەی لەلوتی حوشترەکە کردو بەزەندی قاچییەوە شەتەکی دا بۆئەوەی زۆر جمو جوڵ نەکا.

**أرْکَسَت الجاریة**: کچۆڵەکە مەمکی دەرکەوتن ٥ بناغەی مەمکی دانا ٥ **أرْکَسَ فلان**: دەگوترێ: (أرکسه في الشرّ): توشی شەڕی کردو بەقوڕا بردیە خوارێ ٥ **أرْکَسَ الثوبَ**: قوماشەکەی لەڕەنگ هەڵکێشایەوە جارێکی تر خەسی کردەوە ٥ **اِرْتَکَسَ**: تێشکا، پێوە بوو، ڕزگاری نەبوو ٥ پاڵەپەستۆی کردو هاتوو چو ٥ **اِرْتَکَسَت الجاریة**: بەمانا (أرکست) دێ ٥ **تراکس**: سواری یەك بوو کەوتنە سەر یەك ٥ **الرِّکَاسُ**: حەبلێکە لەلوتی حوشتر دەکرێو بەدەستییەوە دەبەسترێتەوە بۆ ئەوەی ژێر باربێ ٥ **الرِّکاسَةُ**: حەبل یان شتێکی لەو جۆرە هەردو سەری دەخرێنە زەوییەوە، ناوەڕاستەکەی وەکوو کەوانە دەردەکەوێ وڵاخی پێوە دەبەسترێتەوە ٥ **الرِّکْسُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ شتی پیسو قێزەون ٥ خانووی تەعمیر کراو ٥ **الرُّکُوسِیَّةُ**: تاقمێکن ئایینێکی تێکەڵ لەئایینی مەسیحیو صابیئەیان هەیە ٥ **الرکیس**: گەڕاوە، هەرشتێك قێزەون بێ ٥ لاوازی هەڵەو گێربوو بەگێچەڵو چورتم.

**رَکَضَ** رَکْضاً ورَکْضةً: بازی هاویشت، ڕای کرد، قاچی بەزەوی کێشا.

**رَکَضَ منه**: لەبەری هەڵات.

**رَکَضَ الطائر**: باڵندەکە پەلەی کرد ٥ **رَکَضَت النجومُ والکواکب**: ئەستێرەکان کشان.

**رَکَضَ الخیلُ**: ئەسپەکە سمکۆڵی کرد.

**رَکَضَ الدّابة**: لەلاکەلەکەی وڵاخەکەی دا بەقاچی، ئاوزەنگی لێ دا بۆئەوە خێرا بڕوا.

**رَکَضَ الطائر**: باڵندەکە لەشەقەی باڵی دا، باڵی لێك دان، دەگوترێ: (هو لایرکض المِخْجَنَ): کەمەند لەخۆی دوور ناخاتەوە.

**رَکَضَ القوسُ السهمَ**: کەوانەکە تیرەکەی هاویشت.

**رَکَضَ النارَ بالمِرْکَض**: بەمقاش ئاگرەکەی تێك وەردا ٥ **ارکضت الحامل**: ئافرەتە سك پڕەکە منداڵەکەی ناوسکی جوڵایەوە ٥ **راکَضَهُ**: لە ڕاکردنو پێشبڕکێ دا پێشی کەوت ٥ هەریەك لەسوارەکان ئەسپی خۆیان هەڵینگ دا بۆئەوەی بزانن کامیان پێش دەکەوێ

**ارتکض**: بەمانا (رکض)دێ ٥ کەوتە جمو جوڵ ٥ دەگوترێ: (ارتکض الجنین في بطن أمه) ٥ (ارتکض قلبه فزعاً): لەترسا دڵی کەوتە پەلە پەل ٥ **ارتکض فلان في شئونه**: فلانکەس بۆکارو باری فلان کەوتە جمو جوڵ ٥ **ارتکض الماءُ في**

البئر: ئاوەکە لەناو بیرەکە کۆبۆوەو شلەقا ٥
**ارتکض بعضهم الی بعض فرسَهُ:** هەریەکەیان
بۆلای ئەوی تر ئەسپی خۆی هەڵینگ دا ٥
**ارتکض الخیلَ:** ئەسپەکەی هەڵینگ دا ٥
**الرَّکوض:** بەهێزو پاڵنەر، هاوێژەر، دەگوترێ:
(قوس رکوض): کەوانێکی توندو هاوێژەرە ٥
**المَرْکَضُ:** شوێنی راکردنو جلیت بازی ٥
کەلەکەی ولاخ ئەو شوێنەی بە ئاوزەنگی لێی
دەدرێ ٥ لێوارو قەراخ ٥ **مراکض الحوض:** ئەو
شوێنەیە ئاوەکە لێی دەداو لێی ئادا ٥
**المِرکَضُ:** کۆڵەوەژ، هەرشتێک شتی پێ تێک
هەڵدرێ ٥ وەکوو ئەسکۆی، مەقاش ٥ **المِرکَضَةُ:**
پاڵنەر، هاوێژەر ٥ ئەسپی سکۆڵ کەر.

**رَكَعَ** رَکْعاً ورکوعاً: چۆمایەوە ٥ چوە روکوع،
دەگوترێ: (رَکَعَ الهَرِمُ): پیرەکە چۆمایەوە ٥
(رَکَعَ المصلی): نوێژکەرەکە چووە روکوع،
چۆمایەوە تادەستی گەیشتە ئەژنۆی ٥ هەروا
بەمانا مل کەچ بوونە ٥ هەروا دەگوترێ: (رکع
الی الله): دڵی بەخوداوە پەیوەست بوو ئارامی
گرت ٥ دوای دەوڵەمەندی هەژار کەوت ٥
**أرکَعَهُ:** وای لێ کرد بچۆمێنێتەوە ٥ مل کەچ بێ ٥
**تَرَکَّعَ:** نوێژی کرد ٥ **الرَّکعَةُ:** رکاتە نوێژێک ٥
چونە روکوع ٥ هەموو راوەستانێک بۆ
خوێندنی فاتیحەو چونە روکوعو چونە سوژدە
٥ **الرکوع فی الصلاة:** ئەوەیە نوێژکەر دوای
خوێندنی فاتیحە خۆی بچۆمێنێتەوە تا بەری
دەستی دەگاتە کەشکە ئەژنۆیو پشتی تەخت
بوەستێ ٥ **إرتَکَفَ الثلجُ:** بەفرباریو لەزەوی دا
مایەوە ٥ **الرَّکَفَةُ:** بنکی درەختی بخووری
مەریەم.

**رَكَّ** الشَّيءُ رکًّا ورکاکةً: شتەکە لاواز بوو باریک
بوو
**رکَّ** الغُلُّ في عنقه رَکًّا: چروکو دەست قوچاو بوو.
**رکَّ** الشَّيَ بیده: شتەکەی ئەمدیوو ئەو دیو کرد
بۆئەوەی بزانێ قەبارەی چەندە.
**رکَّ** الأمْرَ: شتەکانی سواری یەک کردن.
**رکَّ** السِّقاءَ: کوندە مەشکەکەی پینەکرد.
**أرَکَّت السماءُ:** ئاسمان بارانێکی کەمی باراند ٥
**أرَکَّتِ الأرضَ:** بارانێکی کەمی لە زەوی دا ٥
**رَکَّکت السماءُ:** بەمانا (أرَکَّتْ)دێ ٥ **إرتَکَّ:** کەم
بوو، لاواز بوو، کەوتە گومانەوە ٥ **اِستَرَکَّهُ:**
بەلاوازی لەقەڵەم دا ٥ **الأرَکُّ:** ئادەمیزادی
رەزیلو لاواز لەعەقڵو رادا ٥ **الرُّکَّاكُ:** بەمانا
(الأرَكّ)دێ ٥ **الرُّکَّاکَةُ:** پیاوێک ئافرەت شەرمی
لێ نەکەنو رێزی نەگرن ٥ پیاوی خوێڕیو بێ
غیرەتو خێزان بەرەڵلا ٥ ژنەکەی داوێن پیس
بێو لێی بێدەنگ بێ ٥ **الرِّكُّ:** بارانی کەم ٥
**الرُّکَّی:** دەگوترێ: (شحمة الرُّکّی): بەزێک زوو
بتوێتەوە ٥ **الرَّکیك:** لاواز ٥ کەم ٥ دەگوترێ:
(هو رکیك العلم): ئەو کەسە زانیاری کەمە ٥
(رکیك الأسلوب): ئوسلوبی ناڕێکو پێکە ٥
(رکیك العقل): کەم عەقڵە ٥ **الرَّکیکة:** مێینەی
(الرکیك).

**الرُّكُ:** زەوییەك بارانی کەمی لێ باریبێ ٥
**المُرتَكُّ:** کەسێك قسەزانو زمان ڕەوان بێ
بەتەنها بەلام لەکاتی بەرامبەریو موجادەلەدا
قسەی بۆنەکرێ ٥ (سکران مرتك):
سەرخۆشێکە دەمی تێکەڵو پێکەڵ دەبێ ٥

**رَکَلَهُ رَکْلاً:** لینگەژەنەی کرد ٥ **راکلە:** هەریەکە
لەودوکەسە قاچیان لێکەوەژنی ٥ **تراکلوا:**
هەرکەسە لەعاست خۆیەوە لینگە ژەنەی
لەگەڵ ئەوی ترکرد ٥ **ترکل بحرفته:** قاچی
بەپێمەرەکەدا دا بۆئەوەی لەزەوی بچەقێ ٥
**المَرکَلُ:** ڕێگا ٥ لەولاخیش بەو شوێنەی

دەگوترێ کە سوار لەکاتی هەڵێنگ دانی دا ئاوزەنگی لێ دەدا ٥ رَكَمَهُ رَكْماً: شتەکەی کۆکردەوە خستیە سەریەك ٥ إرْتَكَمَ: کۆ بۆوە هێندێکی کەوتە سەر هەندێکی ٥ تَراكَمَ: بەمانا (إرْتَكَمَ) دێ، دەگوترێ: (تراكمت الأشغال): کارەکان کەوتنە سەریەك‌و کۆبوونەوە ٥ الرُكامُ: شتی کۆبۆوەو بەسەریەکدا کەوتوو، کۆمەڵە شت ٥ الرُكَمُ: هەوری گەواڵ گەواڵ‌و بەسەریەکدا کەوتوو ٥ الرُكمَةُ: قوڕو گڵی کۆمەڵ بوو.

مُرْتَكَمُ الطريق: ناوەڕاستی ڕێگا.

**رَكَنَ** اليه: مەیلی بۆلاکردو خۆی پاڵداو جێگیر بوو پشتی پێ بەست.

رَكِنَ اليه ركنا و ركوناً: بەمانا (رَكَنَ)دێ.

رَكَنَ في المنزل ركناً: لەخانوەکەدا جێگیر بوو جێی نەهێشت.

رَكُنَ ركانةً وركانيةً وركونةً: عاقڵ بوو وێڵ‌و وسوڵی نواند ٥ تَرَكَّنَ: ڕەق بوو، پتەو بوو ٥ الأُرْكونُ: سەرۆکی گوند ٥ کوێخای دێ ٥ الرُكْنُ: پایەو سوچ ٥ بەشێك لەبەشەکانی حەقیقەتی شت ٥ کاری گەورە ٥ هەرشتێك ببێتە هۆی بەهێز بوونی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی ٥ دەشگوترێ: (فلان ركن من أركان قومه): فلانکەس یەکێکە لەپیاو ماقوڵانی تایەفەو هۆزەکەی ٥ لەپاسای عەسکەری دا بەئەفسەرێك دەگوترێ لەزانیاری سەربازی دا لێهاتوویی هەبێ ٥ هەروا ناوە بۆ جێگیری فەرمانڕەوای عەسکەر ٥ المِرْكَنُ: مەرکانەو سوێنەی جل تێدا شۆرین.

**رَكَا** على فلان رَكْواً: هەواڵی ناخۆشی بەگوێی فلان دا دا ٥ یان بە قسەی ناشیرین دەری کرد.

**ركا** بالمكان بقية يومه: لەوشوێنە مایەوە.

رَكَا فلان: حەوزێکی لاکێشەیی هەڵکەند.٥ رَكَا الأرض: زەوییەکەی هەڵکەند.٥ رَكَا الحوْض: حەوزەکەی پڕکردەوە.٥ رَكَا الأَمْرَ: کارەکەی چاك کردو پتەوی کرد.٥ رَكَا عليه الحِمال: بارەکەی لێ قورس کرد ٥ أركى على فلان: بەمانا (ركا)دێ ٥ أركى عليه الحِمْلَ: بەمانا (ركاه) دێ.٥ أركى اليه: پەنای بۆ برد ٥ أركى لهم جنداً: سەربازی بۆ ئامادەکردن ٥ أركى في الأمر: لەکارەکەدا دواکەوت ٥ أركى الأمرَ: کارەکەی دواخست ٥ إرْتَكى عليه: پشتی پێ بەست ٥ قورسایی خستە سەر ئەو ٥ الرُكْوَةُ: قاپێك یان دۆڵچەیەکی بچوکە لەپێست دروست دەکرێ ئاوی پێ دەخورێتەوە ٥ یان ئاوی پێ هەڵدەهێنجرێ ٥ الرَكِيَّةُ: بیرێك هەڵئەچندرابێ ٥ المَرْكُوُّ: حەوز.

**رَمَأَ** بالمكان رَمْوءً: لەو شوێنە مایەوە.٥ رَمَأَ الشيئ على كذا: ئەو شتە لە وەزیاد بوو ٥ رَمَأَ الخَبَرَ: گومانی بۆ هەواڵەکە چو، مەزندەی کرد ٥ مُرْمآت الأخبار: هەواڵی ئەفسانە ئامێز ٥ رَمَثَهُ رَمْثاً: بەدەستی مەسحی کرد، چاکی کردەوە.

**رَمَثَ** الشيئ بالشيئ: ئەوشتەی بەوشتە تێکەڵاو کرد.٥ رَمَثَ الشيئ رَمْثاً: شتەکەی دزی.٥ رَمِثَ أمرُهُمْ رمثاً: کارەکەیان تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو.٥ رَمِثَ الإبلُ: حوشترەکە گیای (رمثی)خوارد سکی ئێشا.٥ رَمَث: گیا ترشۆکەیە لەوڵاتی شام زۆر دەڕوێ ٥ أرْمَثَ في ماله: هەندێ لەماڵەکەی هێشتەوە ٥ أرْمَثَ الشيئ: شتەکەی زیاد کرد ٥ شلی کرد، نەرمی کرد ٥ رَمَّثَ على كذا: لەوەی زیادکرد ٥ دەگوترێ: (رَمَّث على الخمسين): لە پەنجا تێپەڕی ٥ رَمَّثت غنمه على المائة: مەڕەکەی لەسەد زیاد بوون ٥ رَمَّثَ الشيئ:

شتەکەی چاك کردەوە ٥ اسْتَرْمَتْ في مالـه: بەمانا (أرمث)دێ. ٥ الرِّمْث: پیاوی جل شڕو چڵکن ٥ پشت باریك ٥ گیایەکی کێوییە لەگیا ترشەکانە بەزۆری لە چۆڵەوانی شام دەڕوێ ٥ داری کەڵەکی سەرناوو بەلەم، یان کوندەی ژێر کەڵەکی سەرناو ٥ حەبلی ڕزیو ٥ پاشماوەی شیر لەگوانی حەیوانی شیر دەردا ٥ الْمَرْمَثَةُ: (أرض مرمَثَةٌ): زەوییەکە زۆر گیا ترشەی تێدا دەڕوێ.

**رَمَحَ** الطائر رَمْحاً: باڵندەکە چیقنەی کرد ٥ رَمَّحَ ما كتب من السطور: ئەو خەتانەی نوسیبوونی رەشی کردنەوە ٥ الرّامِحُ: کوندەبەبوو قاچی دەبەستنەوە لای تەڵەو فاقە بۆ ئەوەی حەیوان و باڵندەی زیندە خرۆی پێ بگرن ٥ الرُّمَاحُ: پشتی رەمبو لولەی رەمب.

**رَمَحَ** البرقُ رَمْحاً: بروسکەکە بەکزی دەرکەوت، شۆقی زۆر نەبوو.

رَمَحَ فلاناً: رەمبی لەفلان دا ٥ رَمَحَتْ الدَّابَةُ فلاناً رَمْحاً ورِماحاً: وڵاخەکە لوشکی لەفلان دا ٥ رَامَحَهُ: بەرەمب لێی دا.

تَرَامَحُوا: بەرەمب لێکیان دا ٥ الرَّامِحُ: خاوەن رەمب ٥ (ثور رامح): کەڵەگای دوشاخ ٥ (السماك الرامح): ئەستێرەیەکە لەپێشیەوە ئەستێرەیەکی تر هەیە روناکیەکەی درێژ دەنوێنێ ٥ الرِّماحُ: (رماح الجن): پەتاو تاعون ٥ (رماح العقرب): چزوی دووپشك ٥ الرِّماحَة: پیشەی رەمب دروستکردن (شیرگەر) ٥ الرُّمْحُ: ئاسنێکە لای سەروی تیژە بۆ بریندار کردن ٥ هەروا ناوە بۆ دەستە دوی ئامێری جوتیاریی ٥ هەروا دەگوترێ: (كَسَرُوا بينهم رمحاً): واتە شەڕو هەرا کەوتە ناویانەوە ٥ (وهم على بني فلان رمح واحد): ئەوانە لەناو خۆیان دا یەکیەتییان هەیە ٥ الرَّمَّاحُ: رەمب دروستکەر ٥ ئەو کەسەی رەمب بەدەستەوە دەگرێ ٥ الرُّمَاحَةُ: ئەو کەوانەیە زۆر توندبێ و هاویشتنی بەهێز بێ ٥ الرَّمُوحُ من الدّواب: ئەو حەیوانەیە کەشت دەگەزێ ٥ الـرُّمَيْحُ: عەصاو گۆچان کەپیاوی پیرو ژنی پیر خۆی بەسەردا دەدەن ٥ أرْمَـخَ النخلُ: دارخورماکە بەرسیلەی کرد ٥ أرْمَخَ فلان: فلانکەس نەرم بوو، ملکەچ بوو ٥ أرْمَخَتْ الدَّابَةُ: ئاژەڵەکە پیر بوو یان قەڵەو بوو ٥ الـرِّمْخُ: درەختی کۆبوەو تێکچرژاو ٥ الـرَّمَخُ: بەرسیلەی خورما ٥ خورمای کاڵ و نەگەییو.

**رَمَدَ** رَمْداً ورِمادةً: فەوتاو بوو بەخۆڵەمێش ٥ رَمَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەناو برد.

رَمِدَ رَمَداً ورُمْدَةً: رەنگی خاکی بوو ٥ رَمَدَتْ العَيْنُ رمـاداً: چاوەکە هێشا ژانی تێکەوت بەگرێ وەستا ٥ أرْمَـدَ: فەوتا ٥ هەژار کەوت ٥ أرْمَـدَ القومُ: خەڵکەکە توشی قات و قڕی و هەژاری هاتن ٥ أرْمَدَ البُكاءُ عينَهُ: گریان چاوی توشی چاو ئێشە کرد ٥ أرْمَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی وەکوو خوڵەمێش لێ کرد ٥ رَمَّدَ الشَّيْءَ: شتەکەی خستە ناو خۆڵەوە ٥ وەکوو خۆڵەمێشی لێکرد ٥ رَمَّدَ الشواءَ: برژاوەکەی خستە ناو پشکۆ ئاگرەکانەوە ٥ إرمَدَّ: وەکوو نوعامە بازی دا ٥ إرمَدَّ وَجْهُهُ: دەم و چاوی رەنگی خۆڵی گرت ٥ إرمَدَّت العينُ: چاوەکە هێشا ٥ الأرْمَدُ من الثياب: پۆشاکی تەپو تۆزاوی چڵکن ٥ الرامِدُ: شتی رزیوو بێ سود ٥ الرَّماد: خۆڵ ئەوەی دوا سوتان لەشتەکە دەمێنێتەوە ٥ (كثير الرماد): سەخی سروشت و دڵفراوان (کینایە یە) ٥ (سُقِيَ الرمادُ في وجهه): دەم و چاوی گۆڕا ٥ الرِّمادة: کۆمەڵە خۆڵ ٥ (عام الرِّمادة): ساڵێك بوو لەزەمانی ئیمامی عومەردا خەڵك توشی قات و

قرى هاتن، سالى ١٨ كۆچى بوو ٥ الرَّمَادِيّ: رەنگ خۆڵاوى (خاكى) ٥ الرَّمَدُ: نەخۆشييەكە توشى چاو دەبێ ٥ (علم الرَّمَد): زانيارى پزيشكى چاو ٥ الرِّمِدُ: رەنگ لێڵى كەوەكوو رەنگى خۆڵ بێ ٥ ناوى گەڕاو ٥ پۆشاكى چڵكن ٥ الرُّمْدُ: مێشووله ٥ الرَّمَدِيّ: پزيشكى چاو ٥ رَمْرَمَ الرجلُ وغيره: پياوەكە خۆراكى بەرماوەو پرت بلاوى داكەوتوو لەمێزو سفرەى كەسانى تر خوارد، بێزى لەپيس بوونى نەكردەوە ٥ لەحەديث دا هاتووە دەفەرموێ: (دخلت امرأة في هرة حَبَسَتْها فلا أطعمها ولا أرسلتها ترمرمُ من خشاش الأرض) ٥ تَرَمْرَمَ: دەمى جوڵاند قسە بكا قسەى نەكرد ٥ تَرَمْرَمَ الشَّيْءُ: شتەكە پرژو بلاو بۆوە ٥ الرُّمْرامُ: پوش‌و پالى بەهار.

**رَمَزَ** اليه رمزاً: لێوى لێ بادا، چاوى لێ داگرت برۆى لێ هەڵتەكاند ٥ بەلێو يان بەچاو يان برۆ ئيشارەتى بۆ كرد.

رَمَزَ الظَّبْيُ رمزاناً: ئاسكەكە بازى هاويشت.

رَمَزَ إلى الشَّيْءِ بكذا: بەوشتە شارەزاى كرد بۆى.

رَمَزَ فلاناً بكذا: فلانكەسى بەوشتە هەڵخەلاتاند.

رَمَزَ رمازة: وێك هاتەوە ٥ جمەوجۆڵى زۆر بوو، عاقڵ‌و ئاغر بوو، شكۆمەند بوو، رەسەن بوو.

رَمَزَ فؤاده: دڵى تەنگ بوو ٥ ترامزوا: هەريەكەيان ئيشارەى بۆ ئەوى تر كرد ٥ تَرَمَّزَ: جمەو جوڵى كردو كەوتە شەقەتۆڵە، دەگوترێ: (تَرَمَّزَ من الضربة): بەلێدانەكە كەوتە جمەو جوڵ ٥ ترمَّزُوا: خەڵكەكە لەكوڕەكەيان دا كەوتنە جمەو جوڵ‌و تێك خرۆشان ٥ خۆيان ئامادەكرد بۆ جمەو جوڵ‌و راپەڕين ٥ إرْتَمَزَ: بەمانا (تَرَمَّزَ)دێ ٥ الرَّامِزَةُ: بەزێكە لەئەژنۆدا دەبێ ٥ الرُّمْزُ: ئامازەو تيل نيشان ٥ نيشانەو ديارده ٥ لەزارەوەى (علم البيان)دا كينايەى شاردراوەيە ٥

الرُّمْزُ: ئامازەو تيل نيشان ٥ الرَّمْزُ: بەمانا (الرُّمْزُ)دێ ٥ الرَّمْزِيَّةُ: رێبازى رەمزى، رێبازێكى ئەدەبى‌و فەننييە لەشيعردا سەرى هەڵدا ٥ الرَّمَّازَةُ: ئافرەتى بەدرەوشت كە بەئيشارە پياوى بێگانە بۆلاى خۆى كێش دەكا ٥ (كتيبة رَمَّازة): پەلە پێشمەرگەو كۆمەڵە سەرباز كەلەبەر زۆرييان هەرتێكەوە دەهاون.

**رَمَسَ** الميتَ: مردوەكەى بەخاك سپار لەگۆڕى ناو گڵى بەسەردا كرد سەرقەبرەكەى كوتاييەوە.

رَمَسَ الشَّيْءَ: شوێنەوارى شتەكەى كوژاندەوە، دەگوترێ: (الريحُ ترمسُ الآثار): رەشەبايەكە شوێنەوارەكانى داپۆشين، گڵ‌و خۆڵى بەسەردا كردن.

رَمَسَ القَبْرَ: گۆڕەكەى لەگەڵ زەوى دا تەخت كرد.

رَمَسَ عليه الخَبَرَ: هەواڵەكەى لێ شاردەوە.

رَمَسَ فلاناً بحجر: بەردى گرتە فلانكەس ٥ أرْمَسَ الميت: بەمانا (رَمَسَهُ)دێ ٥ إرْتَمَسَ في الماء: خۆى لەناوەكەدا نقوم كرد تا سەرى چووە ژێر ناوەكە ٥ الرَّامُوسُ: گۆڕ ٥ الرَّمِيسُ: باڵندە پەلەوەر ٥ دەعباى شەوگەڕ وەكوو شەمشەمە كوێرە ٥ الرَّامِسَةُ: بايەكى بەهێز كەگڵ‌و خۆڵ هەڵبگرێ‌و شوێنەوار داپۆشى ٥ الرَّمْسُ: گۆڕێك لەگەڵ زەوى دا تەخت بووبێ ٥ ئەو گڵەى دەكرێتە ناو گۆڕەوەو مردوەكەى بێ دادەپۆشرێ ٥ المَرْمَسُ: شوێنى گۆڕ هەڵكەندن: گورستان ٥ المَرْمُوسَةُ: دەگوترێ: (وقعوا في مرموسة من أمرهم): خەڵكەكە كەوتنە مقۆ مقۆو تێكەڵ‌و پێكەڵيەوە لەنێشەكەيان دا.

**رَمَشَ** الشَّيْءَ رَمْشاً: بەسەرى پەنجەى شتەكەى گرت ٥ دەستى لێ دا.

رَمَشَ فلاناً بحجر: بەردى لەفلانكەس گرت ٥ رَمِشَتْ عَيْنَهُ رَمَشاً: پێڵوى چاوى سوربون‌و برژانگى

پێــكەوە نووســان‌و چــاوی ناویــان لــێ‌هات ٥ أرْمَشَ الشجرُ: درەختەكە پشكوت‌و گەڵای كرد ٥ أرمــش فــلان: بــەمانا (رَمَــشَ) دێ ٥ چاوی زۆر تــروكانــدن لەبــەر زەعیفــی چــاوی ٥ چــاوی تێكچون پێڵوەكانی چاك نەبوونــەوە ٥ الرُّمْشُ: سپیایەتیە كەلە نینۆكی منداڵ دا دەردەكەوێ ٥ المِرْمَــاشُ: ئەوكەســەی لــەكاتی روانــین دا زۆر چاوی بتروكێنــێ ٥ الْمُرَمَّشُ: ئەوكەسـەی پێڵوی چاوی توشی نەخۆشی بوبن‌و چاك نەبنــەوە ٥ رَمَــصَتِ الدُجاجــةُ رَمْــصاً: مریــشكەكە جیقنــەی كرد.

وَرَمَصَ فلان لأهله: فلان كاسبی بۆ خێزانــی خۆی كرد.

رَمَــصَ بــين القــوم: لــەناو خەڵــكەكەدا ئاشــتەوایی‌و چاكسازی بڵاو كردەوە.

رَمَصَ اللهُ مُصيبتَهُ: خودا پاداشتی كۆستەكەی دایــەوە ٥ خەساری بۆ پڕكردەوە.

رَمِصَ الشَّيَ: داوای شتەكەی كرد ٥ دەستی لــێ دا ٥ رَمِصَتِ العينُ رَمَــصاً: چڵــك‌و ڕیپۆقی سپی لــە قولینچكی چاوی دا كۆبــوەوە ٥ أرمَــصَهُ الرَّمَــدُ: چاوهێشە پێڵوی چاوەكانی تێــك دان ٥ الرَّمَصُ: چڵكێــكی ســپی ڕەقــە لــە قلیــنچكی چــاوی دا كۆدەبێتەوە.

وَرَمَضَ النَّصْلَ رمضاً: سەرە تیرەكەی تیژ كرد.

رَمَــضَ الــشَّاةَ: مەڕەكــەی كــەوڵ كــردو پێــستەكەی بەســەردا دایــەوە ٥ خــستیە ســەر بــەردی گــەرم بوو، ئــاگری لەســەر كــردەوە بۆنــەوەی پــێ بگاو بەكەڵكی خواردن بێ.

رَمِضَ الراعي مواشيَهُ: شوانەكە لــە لمبــەڵان‌و گەرمــە سێردا ئاژەڵەكانی لەوەڕاندن.

رَمِضَ فلانٌ: فلانكەس لمبی گەرم قاچی سوتاندن.

رَمِضَ رمضاً: بەلمبی گەرم دا رۆیشت.

رَمِضَ الشَّيْءَ: شتەكە گــەرمی زۆر بــوو، دەگــوترێ: (رَمِــــــضَتِ الأرضُ): زەوییەكــــە بــــەهۆی چڕبوونەوەی تیشكی خــۆر بۆســەری زۆر گــەرم بوو ٥ (رَمِضَ اليوم): رۆژەكە رۆژێكی گەرم بــوو ٥ (رمِضَ الـصائم): رۆژووەوانەكــە ناوسكی گەرم داهات لەتینوان ٥ (رمضت قدمه): قاچی بــەلمبی گەرم سوتان.

رَمِضَ الغَنَمُ: ئاژەڵەكان لەچرقەی گەرمادا لــەوەڕان‌و جەرگیان توشی نەخۆشی بوو.

رَمِضَ للأمر: لــەرقان جــەرگی بــۆ سوتا ٥ داخ لــەدڵ بوو بۆی ٥ أرْمَضَتْهُ الحَرُّ: گەرما هــەڵی پڕوكانــد ٥ أرْمَضَ الشَّيْئُ فلاناً: شتەكە فلانكەسی داخ كــرد ٥ أرْمَــضَ الــنصْلَ: ســەرەتیرەكەی تیــژ كــردن ٥ أرْمَضَ الراعي مواشِيَهُ: لەگەرمــە ســێرو لمبــەڵان دا شــوانەكە مــەڕەكانی لەوەڕانــدن ٥ رَمَّــضَهُ: كەمێــك چاوەڕوانی كردو دوایی رۆیشت ٥ رَمَّضَ الراعــي مواشــيه: بــەمانا (رَمَــضَها)دێ ٥ رَمَّــضَ الصَّوْمَ: نیــەتی رۆژوی هێنــا ٥ إرْتَمَضَ مــن كــذا: لەوشــتە جــارِز بــوو لەســەر شــانی گــران بــوو ٥ إرْتَمَــضَ لــەُ: پەرۆشــی بــوو ٥ جــەرگ دارزا ٥ أرْتَمَــضَ الفَــرَسُ بــەِ: ئەســپەكە بــازی پــێ دا ٥ تَرَمَّــضَتْ نفــسُهُ: دەروونــی تێــك چــوو، نەفــسی لاواز بــوو ٥ تَرَمَّضَ الــصَّيْدَ: نێچیرەكەی راوكــرد لــە لمبــەڵان‌و گــەرما دا، واتــە: رێــی كــەوت‌و لــەقاقۆزەی پێــچا تــا خزاندیــە نــاو لمبــەڵان‌و قاچی لە لمبەكە چەقین‌و برستی لی براو گرتی ٥ الرَّمْضَاءُ: گەرمای بەهێز ٥ جەنگەی گــەرما ٥ زەوییــەك كە راستەوخۆ خۆر لــێی بــداو ســوور بوبێتــەوە ٥ رەمــضان: مــانگی نۆیــەمی ســاڵی قەمەرییە ٥ الرَّمَضُ: بارانی پێش وەرزی پــاییز كەزەوی گەرم‌و سوتەمەڕۆیە ٥ الرَّمَضِيُّ: هەورو بارانی كۆتایی هــاوین‌و ســەرەتای وەرزی پــایز ٥

روون نەکردنەوە ◊ اَلزَّغزَغُ: ئادەمیزادی قاڵب سوکی چوستو چالاك ◊ ئادەمیزادی بنەچەو نەژاد نەناسراو ◊ الزُّغزُغُ: کورتە باڵای بچوك ◊ زَغَفَت البِئرُ زَغفاً: بیرەکە ئاوی زۆر بوو ◊ (زَغَفَت السماءُ): ئاسمان بارانی باراند ئاوی خۆی ڕشت.

**زَغَفَ** في حديثه: درۆو دەلەسەی بەقسەکانیەوە نا، دەگوترێ: (زَغَفَ کلامَهُ کثیراً): زۆری درۆ بەقسەکانەوە نان.

زَغَفَ لنا مالاً كثيراً: زۆری لەماڵو سامانی خۆی بۆ دابڕین.

زَغَفَ فلاناً: زەبری لەفلان داو برینداری کرد ◊ ازدغَفَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵگرتو پێچایەوە ◊ الزَّغفُ: هەورێك باران ببارێنێو هەموو ئاسمانی داگرتبێ ◊ زرێی پانو درێژ ◊ الزَّغَفُ: چیلکەو چەوێڵ وردە دارو سەرە کۆتەرە ◊ پرژوپاڵی درەختو گیاوگژی لاواز ◊ المِزغَفُ: چڵێسو تامەزرۆیی بۆشت ◊ هەنگاو درێژ.

**زَغَلَ** الشرابَ زَغلاً: شەرابەکەی بەیەکجار کردە پیاڵەکەوە ◊ شتەکەی لەناو دەمی خۆی دا هێناو برد.

زَغَلَ ببوله: میزەکەی بە پچڕ پچڕ کرد ◊ أَزغَلَتِ الطَّعْنَةُ بالدم: برینەکە خوێن لێیەوە فیچقەی کرد ◊ أَزغَلَ الشرابَ: شەرابەکەی بەیەکجار کردە پەرداخەکەوەو خواردیەوە ◊ أَزغَلَ الطائِرُ فَرْخَهُ: باڵندەکە بەدەندوك خواردنی کردە ناو دەندوکی بێچوەکانیەوە ◊ الزَّغَلُ: غەش ◊ الزُّغلَةُ مِنَ الشراب: قومە شەراب ئەندازەی ئەوەی دەم پڕبکا ◊ جۆرێك میز ◊ دڵۆپە میزێك ◊ الزُّغلول: ڕۆح سوك ◊ منداڵ ◊ بێچوەکۆتر ◊ جۆرێکە لەخورمای سوری دەنك گەورەو شیرین (لەمیصر هەیە) ◊ تَزَغَّمَ الجملُ: حوشترەکە باراندیو لەشەویلەکانی دا بارەبارەکەی دووبارە کردەوە ◊ تَزَغَّمَ الفصيلُ: بێچوەکە بەهێواشی باراندی ◊ تَزَغَّمَ فلانٌ: فلانکەس بەرق هەڵساوییەوە قسەی کرد ◊ الزُّغوم: زمان پیس.

**زَفَتَ** الإناءَ زَفتاً: قاپەکەی پڕکرد ◊ (زَفَتَ فلاناً): فلانکەسی ماندو کرد ◊ ڕقی هەڵساند ◊ دەری کرد ◊ پاڵی پێوەنا.

زَفَتَ الدّابّةَ: ولاغەکەی لێ خوڕی.

زَفَتَ الحديثَ في أذنه: قسەکانی بەگوێ دادا.

زَفَتَ الشَّيْءَ: بەقیرو زفت شتەکەی سواخ دا.

الزِّفْتُ: قیر ◊ (مادەیەکی ڕەشی ڕەقە بەئاگرو گەرمی دەتوێتەوە).

**زَفَرَ** زَفيراً وزَفْراً: هەناسەی قەتیس ماوی هەڵکێشا ◊ زَفرت النار: هەڵگیرسانی ئاگرەکە بیسترا.

زَفَرَ الشَّيْءَ زَفراً: شتەکەی هەڵگرت ◊ (زفر الماءَ): ئاوەکەی هەڵێنجاو پەزمەندەی کرد بۆ خواردنەوە ◊ الزّافِرَةُ: سوچی خانوو باڵەخانە ◊ شانو ناوشان ◊ کۆمەڵو پێڕ ◊ دەستەو تاقمو لقو سوپای شەڕ ◊ دیرەگو کۆڵەکەی کەپرە مێو ◊ پەراسوو، دەگوترێ: (فرس شديد الزوافر): ئەسپێکی پەراسو ئەستورو پتەوە ◊ تایەفەو کۆمەڵی یارمەتیدەر ◊ الزِّفْرُ: کۆڵو بار ◊ بارو بارگەنەی ڕێبوار ◊ جەماعەتو تاقم ◊ الزُّفَرُ: ئازاو چاو نەترس ◊ پیاو ماقوڵو ڕیش سپی هۆز ◊ دەریا ◊ ڕوباری گەورەو زۆر ئاو ◊ پیاوی سەخیو دەستو دڵفراوان ◊ بەخشش زۆر ◊ دەستەو تاقمی سوپا ◊ زَفْرَةُ الشَّيْءِ: ناوەڕاستی شت ◊ (زُفْرَةُ الشَّيْءِ): بەمانا (زَفْرَتە)دێ، دەگوترێ: (فرس عظيم الزُّفرَةِ): ئەسپێکی ورگ زلو فراوانە ◊ الزَّفيرُ: هەناسەدانی قوڵ، هەناسەدان دوای ◊

مـــانى ○ پێــچەوانەى (شـــهيق)ە كەبـــەمانا هەڵكێـشانى هەناســەيە ○ زَفْزَفَــتِ الـــريحُ: رەشـەبايەكە هـەڵيكرد وژەوزى لەدرەختــەكان هێنـا ○ زَفْـزَفَ المركـب: كاروانەكـە خرمـەخرمو تەقەتـەقى لــێ هـات ○ زَفْـزَف فـلان: فلانكەس هەڵ لەرزى ○ بەشێوەيەكى جوان ڕۆيى ○ زَفْزَفَ الطــائرُ: باڵندەكــە خــۆى هەڵــداو باڵــەكانى كردنەوە ○ زَفْزَفَت الريحُ الحَشيشَ وغيه: بايەكە گياو گژەكەى پرژانـد ○ تَزَفْـزَفَ: هـەڵ لـەرزى ○ الزَّفْزَافُ: ڕەشەباى بەهێزو بـەردەوام ○ الزَّفْزافَةُ: بــەمانا (الزَّفْـــزافُ)دێ ○ الزُّفْـــزَفُ: بـــەمانا (الزُّفْزافُ)دێ ○ شتى سوكو كەم نمود.

**زَفَّ** زفّاً وزفوفاً وزفيفاً: پەلـەى كـرد ○ زَفَّت الريح: بايەكە هەڵ بوو ڕۆيى.

زفّ الطــائرُ زفّــا: باڵندەكــە هــەڵفڕىو باڵــەكانى كردنەوە.

زفّ العروس زِفافا وزفّةً: بوكەكـەى لەماڵە باوانـەوە گواستەوە بۆماڵى مێردەكەى.

زفّ الطائرُ زفيفاً: باڵندەكە پەرەوردەى زۆرو پڕبـون ○ أزَفَّ: بـەمانا (زَفَّ)دێ ○ أزفَّ الظلـيم وغـيهُ: بێـچوە نوعامەكـەى تـاودا بـۆ خێـرا ڕۆيـشتن ○ أزَفَّ العروسَ: بەمانا (زَفَّها)دێ ○ اسْتَزَفَّهُ الـشَّيْئُ: شـتەكە كـەمى كـردەوە، سـوكى كـرد ○ اسـتَزَفَّ السيلُ الشَّيْئَ: لافاوەكە شتەكەى ڕادا ○ الزِّفَـافُ: (ليلة الزِّفاف): شەوى زاواو بوكێنى.

الــزفُّ: پــەرە وردەى باڵنــدە ○ الزُّفَّـــةُ: جارێــك، جەڵێك، دەگوترێ: (جِئتُكَ زَفَّةً أو زَفَّتين): هاتم بۆلات جارێك يان دوو جار ○ الزُّفَّةُ: تاقمو پێر ○ الزَّفُوفُ: نوعامـە ○ الزَّفيـفُ: خێـراو تێـژڕۆ ○ المِزَفَّةُ: كەژاوەيەكى سەر دانە پۆشراوە بوكى پێ دەگوێزرێتەوە.

**زَفَنَ** زفناً: سەماى كرد.

زَفَـــنَ فلانـــاً: پـــاڵى بەفلانكەســـەوەنا ○ هـــەروا دەگوترێ: (هم زَفّانَـةٌ حَفَّانـةٌ): ئەوانـە پێڕێـكن هەڵدەپـەڕنو خـۆراك لـەرف دەدەن ○ الــزَّفْنُ: كەپرێــكە لەســەر ســەربان دروســت دەكــرێ بۆئەوەى سەقفەكە لە گەرماو سەهۆڵ بەنـدان بپارێزێ.

**زَفَتِ** الرِّيحُ زَفْياً وزَفَياناً: بايەكە بەتەوژم هەڵبوو.

زفت القوسُ: قەوسەكە دەنگى لێوەهات.

زفّ فلان بنفسه: فلانكەس خۆى بەخت كرد.

زفّ الـــشَّيْئَ: شــتەكەى پــاڵ پێوەنـــاو هاويــشتى، دەگـوترێ: (زَفَـت الـريحُ الـسحابَ والغبـار): ڕەشـەبايەكە هەورەكـەى ڕادا تـۆزو خۆڵەكـەى ڕادا ○ (زَفَــتِ الأمــواج الــسفينةَ): شـەپۆلەكان كەشتييەكەيان لەرێڕەوى خۆى لادا ○

**زَفَى** الحادي المطِيَّ: حوديە خوێنەكە (حوشترەوانە گـۆرانى بێژەكـە) حوشـترەكەى لــێ خـوڕى ○ أزفاه: لەشوێنێـكەوە گواسـتييەوە بـۆ جێيـەكى تر، دەگوترێ: (أزفى العروسَ): بوكەكەى لەماڵە باوانيەوە گواستەوە بۆ ماڵى مێردەكەى.

**زَقَـبَ** الجُـرذَ في جُحْـرِه: جرجەكـە چـووە كـونى خۆيەوە.○ زَقَبَ فلان الجُرذَ في حجره: فلانكەس جرجەكـەى كـردە كونەكەيـەوە ○ زَقَـبَ المُكَـاءُ: هاواركەرەكـە هـاوارى كـرد ○ انْزَقَــبَ الجُــرَذُ: جرجەكـە چـووە نـاو كونەكەيـەوە ○ الزُّقْــبُ: ڕێگاى تەنگەبەر، دەگوترێ: (رَمِيَّةُ مـن زقـب): لەنزيكـەوە پێمـەوە نـا ○ زَقْـزَقَ الطـائرُ زَقْزَقَـةً وَزِقزاقاً: باڵندەكە زيقە زيقو جريوە جريوى كرد ○ زَقْزَقَ الطائر فَرْخَهُ: باڵندەكە بێـچوەكانى هێنانــە زاقــە زاق ○ زَقْــزَقَ فــلان: فلانكــەس لەسەرە خۆ پێكەنى ○ زَقْزَقَ الصَّبِيَّ: مندڵەكەى

هەڵپەڕاند ٥ **الزَّقْزَاقَةُ**: ئافرەتێك لەسەرە خۆ بڕوا ٥ **زَقَهُ زَقّاً**: بەخێرایی قوتی دا ٥ **تَزَقَّفَهُ**: بەخێرایی قوتی دا، واتە بەمانا (زَقِفَهُ)دێ ٥ بەگورجی‌و لەناکاو لێی فڕاند، لێی ڕفاند ٥ **الزُّقْفَةُ**: ئەوشتەی قوت دەدرێ.

**زَقَّ** الطائِرُ فَرْخَهُ: باڵندەکە بەدەندوکی خواردنی دا بەبێچووەکانی.

زَقَّ الذ بيحَةَ: کوشتییەکەی لەلای سەریەوە گروو دایماڵی بۆلای پاشوانی ٥ **زَقَّقَ الجِلْدَ**: پێستەکەی لەگردە ملەوە گرو تاگەیشتە قاچی دواوەی حەیوانەکە بۆئەوەی پێستەکە بکاتە کوندە ٥ **زَقَّقَ فلاناً**: مووی سەری فلانکەسی تاشی هیچی پێوەنەهێشتەوە ٥ **الزُّقَاقُ**: ڕێگەی تەنگەبەر دەربچێ یان داخراو بێ ٥ **الـزِّقُّ**: کوندە؛ زەرفێکە لەپێست مووەکانی دەبڕێنەوەو لەبنەوە هەڵناکەندرێن ئاوی تێدەکرێ بۆ خواردنەوەو شتی تر.

**زَقَمَ** الخُبزَ ونحوه زَقْماً: نانەکەی کردە پاروو قوتی دا ٥ **أَزْقَمَهُ الشَّيْءَ**: شتەکەی پێ قوت دا ٥ **إِزْدَقَمَهُ**: قوتی دا ٥ **تَزَقَّمَ فلان**: فلانکەس زەقوم، تاڵاوی خوارد ٥ **تَزَقَّمَ الخُبزَ ونحوه**: نانەکەی قوت دا ٥ **الزَّقُّومُ**: درەختێکی تاڵی بۆن ناخۆشە، خۆراکی دۆزەخیانە ٥ هەرخۆراکێك کوشندە بێ، بخۆرەکەی بکوژێ ٥ **الزُّقْمَةُ**: پەتاو تاعون، کولێرا.

**زَقَنَ** الحِمْلَ زَقْناً: کۆڵەکەی هەڵگرت ٥ **أَزْقَنَهُ**: یارمەتی دا بۆ کۆڵ هەڵگرتن.

**زَقَا** الطائِرُ والدیكُ زَقْواً وزُقاءً: باڵندەکە یا کەڵەشێرەکە خوێندی.

زَقَا الصبيُّ: منداڵەکە بەکوڵ گریاو گریانەکەی توند کرد.

**زَقِيَ** زَقْياً: بەمانا (زَقَا)دێ ٥ **أَزْقَاهُ**: وای لێکرد بخوێنێ، بگری ٥ **أَزْقَى هامة فلان**: فلانکەسی کوشت ٥ **الزَّاقِي**: کەڵەشێر ٥ **الزُّقْيَةُ**: کۆمەڵ‌و کۆ لەهەر شتێك بێ.

**زَكَأَ** إليه زَكْئاً: پشتی پێوەداو کردیە پشتیوانی خۆی ٥ **زَكَأَتِ المرأةُ بولدها**: ئافرەتەکە منداڵی بوو.

زَكَأَ فلاناً كذا سوطاً: ئەوەندە قەمچییەی لەفلانکەس دا.

زَكَأَ فلاناً درهماً: ئەوەندەی دیرهەمە زیو بۆ فلان ژمارد ٥ یان خێرا بۆی ژماردو پێی دا.

زَكَأَ حقَّهُ: مافی خۆی دایەوە پێی ٥ **أَزْكَأَ منه حقَّهُ**: مافی خۆی لێ ستاندەوە ٥ **الزُّكَاءُ**: دەگوترێ: (هو زُكَاء النقد): ئەو دەوڵەمەندەو بەحازرو بەنەقد شت دەکرێ قەرز ناکا ٥ **الْمَزْكَأُ**: پەناگە ٥ **زَكَبَتِ الأمُّ ولدها (وبولدها) زَكْباً**: ئافرەتەکە بەیەك ژان منداڵەکەی بوو.

**زَكَبَ** الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد.

الزُّكْبَةُ: نوتفە (دڵۆپە مەنی) ٥ منداڵ.

**زَكَرَ** الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد ٥ **زَكَّرَهُ**: بەمانا (زَكَرَهُ)دێ ٥ **تَزَكَّرَ**: پڕبوو، دەگوترێ: (تَزَكَّرَ بطنه): گەدەی پڕبوو وەکوو کوندە هەڵاخندرا ٥ **الزُّكْرَةُ**: کوندەیەکی بچوکە ئاوی خواردنەوەی تێدەکرێ ٥ **زَكْزَكَ**: ڕۆیشت لەبەر پیری یا نەخۆشی هەنگاوی کورتی هەڵێنان ٥ **تَزَكْزَكَ**: پێداویستی خۆی ئامادەکرد.

**زَكَّ** الرجلُ والفرخ: پیاوەکە یان بێچوەکە بەلۆزە لۆز هەنگاوی کورتی هەڵنان لەبەر لاوازی‌و بێ هێزی ٥ **زَكَّتِ الدُّرَّاجَةُ**: باڵندە کورکییەکە حەندڵحۆو هەڵبەزو دابەزی کرد.

زَكَّ الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد.

**زَكَ**: لاوازو بێ هێز بوو لەبەر نەخۆشی ٥ پیربوو ٥ **أزَكَّ علی الشَّيْءِ**: بەسەر شتەکەدا بالادەست بوو داگیری کرد ٥ **أزَكَّ علی رأیه**: سور بوو لەسەر ڕاوبۆچونی خۆی ٥ **أزَكَّ ببوله**: میزی خۆی کۆکردەوەو بەندی کرد ٥ **تَزَكَّكَ**: پێداویستی خۆی ئامادەکرد ٥ **الزُّكُّ**: کزو لاواز ٥ **الزُّكَّةُ**: خەم‌و پەژارە ٥ **زَكَمَتْ به أمُّهُ زَكماً**: دایکی بەوەلەدی هێنا.

**زَكَمَ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی توشی نەخۆشی کۆکەو هەلامەت کرد.

زكم القِربَةَ: مەشکەکەی پڕکرد.

زُكِمَ: توشی هەلامەت بوو ٥ **زُكِمَ** علیهم: شێواو گۆڕاو نەناسرا ٥ **الزُّكام**: ئیلتیهابێکی بەهێز توشی پەردەی لوت دەبێ پژمین‌و فرمێسك‌و ئاوێکی زۆرو رون لەلوتەوە دێتەخوار ٥ **الزُّكْمَةُ**: دوا منداڵی باوك‌و دایك.

**زَكَنَ** الیه زُكوناً: پەنای بۆبردو تێکەڵاوی بوو، لەگەڵی دا بوو.

زَكِنَ الأمرَ زَكَناً: پێی وابوو ئەوکارە وەهایە.

زَكِنَ الشَّيْءَ: شتەکەی زانی لێی حاڵی بوو ٥ **أزْكَنَ الشَّيْءَ**: بەمانا (زَكِنَهُ)دێ ٥ **أزكَنَ فلاناً الأمرَ**: کارەکەی فێری فلان کردو پێی زاناند ٥ **زَاكَنَهُ**: یەکتریان تێگەیاند ٥ شتێکی پێ ڕاگەیاند وەکوو لوغزو چەواشەکاریی دەچوو ٥ لێی نزیك بووەوە، دەگوترێ: (هذا جیش یُزَاكِنُ ألفاً): ئەوە سوپایەکە نزیکەی هەزار دەبن ٥ (بنو فلان یزاکنون بني فلان): خێڵی فلان لەخێڵی فلان نزیك دەبنەوەو هاموشۆیان دەکەن ٥ **تَزَكَّنَ**: چەواشەی کردو گۆڕاندی ٥ **الزُّكانَةُ**: فیراسەت‌و زیرەکی، وەکوو ئەوەگومان بۆ شتێك بەری‌و وادەربچێ ٥ **الزَّكِنُ**: کەسێك بۆچونەکەی راست دەربچێ‌و فیراسەتەکەی بێتەدی ٥ **الزُّكَنُ**: پارێزەرو ضابطو ئەفسەر.

**زَكَا** الشَّيءُ زُكُوّاً وزَكاةً وزَكاءً: شتەکە گەشەی کردو زیاد بوو.

**زكا** فلان: فلانکەس صالح بوو ٥ ناز پەروەردە بوو، کەوتە خۆشی‌و شادییەوە ٥ فلانکەس شیاوی ئەوە بوو ٥ ئەم کارە شیاوی فلان نەبوو.

**زَكِيَ** زَكِيَ وزَكاءً: گەشەی کردو زیاد بوو ٥ **أزكی الشَّيْءُ**: شتەکە گەشەی کردو زیاد بوو ٥ **أزكی الشَّيْءَ**: بەمانا (أزكاه)دێ ٥ چاکی کردەوە پاکی کردەوە ٥ **زَكّیَ نَفْسَهُ**: مەدح‌و ثەنای نەفسی خۆی کرد ٥ **زَكّیَ الشهودَ**: شایەتەکانی بەعادڵ‌و ئەهل دانان ٥ **زَكّیَ مالَهُ**: زەکاتی ماڵەکەی دا ٥ **تَزَكّیَ**: بۆ موطاوەعەی (زَكّيَ) هاتووە ٥ **تزكّی فلان**: فلانکەس صالح بوو باش بوو ٥ خێرو خێراتی کرد ٥ **الزَّكا**: جوت بەرامبەر تاك لەبواری ژمارەدا، دەگوترێ: (خَساً أو زَكاً): تاك یان جوت ٥ **الزَّكاةُ**: پیت‌و بەرەکەت‌و گەشەپێدان ٥ پاك‌و خاوێنی ٥ چاکسازی ٥ پاڵفتەی شت ٥ لەشەریعەت دا بریتییە لەبەشێك لەماڵی ساماندار دەدرێ بەهەژار بەچەند مەرجێك ٥ **الزَّكِیَّةُ**: أرض زَكِیَّةٌ: زەوییەکی پاك‌و بەپیت.

**زَلَبَ** الصَّبيّ بأمِهِ زَلباً: منداڵەکە وەگری دایکی بوو لێ دوور نەکەوتەوە ٥ **الزَّلابِیَةُ**: حەڵوایەکە لەهەویر دروست دەکرێ‌و زەیتی تێدەکرێ دەکوڵێندرێ‌و پاشان دۆشاوی تێکەڵ دەکرێ‌و ڕەق دەبێ وەکوو باسوق ٥ **الزُّلْبَةُ**: پارو.

**زَلَجَ** زَلْجاً وزَلَجاناً وزلیجاً: بەخێرایی ڕۆیشت‌و پاشان هێواش بووەوە.

زَلَجَ من فیه کلام: قسەیەکی لەدەم دەرچوو.

زَلَـج الـسَّهْمُ زلوجـاً: تیرەکـە لەعـەرز کـەوتو مەبەستی نەپێکا.

زلجَ من فیـه کلامـاً: قسەیەکی کـردو دوایـی ژێـوان بۆوە ٥ بەبێ وردبوونەوە قسەیەکی دەرپەڕاندو لـێی ژێوانە.

زلج الباب: دەرگاکەی بەکێلون داخست.

زلج المکان: شوێنەکە لوس و خلیسك بوو، قاچی لـێ هەڵخلیسکا ٥ أزْلَجَهُ: وای لـێ کرد هەڵ بخلیسکێ ٥ أزلَجَ البابَ: دەرگاکەی بەکێلون داخست ٥ زَلَّجَ البابَ: بەمانا (أزلَجَهُ)دێ ٥ زَلَّجَ کلامَهُ: قسەکەی دەرپەڕاند، بڵاوی کردەوە، دەگوترێ: (زَلَّجَ مـن فیه کلاماً لم ندم علیـه) ٥ زَلَّجَ عَیْشَهُ: بەبـژێوی خـۆی ژیـانی خـۆی بردەسـەر ٥ إنْـزَلَجَ: بـەمانا (زَلَـجَ)دێ ٥ تَـزَلَّجَ: بـەمانا (زَلَـج)دێ ٥ تَـزَلَّجَ الـشرابَ: زۆری شـەراب خـواردەوە ٥ ألـزَّالِجُ: کەسێـك لەبێهۆشـیو گیانـەڵاو ڕزگاری بوبـێ ٥ زۆری شەراب و شلەمەنی خواردبێتەوە ٥ المِزْلاجُ: کێلـون، سـورگی، (هەرشتێـك دەرگـای پـێ دابخرێ و بۆ کردنەوەی کلیلی نەوێ)، دەگوترێ: (امرأة مِـزْلاجٌ): ئافرەتێـك تـۆپی سمتـیو ڕانـی گۆشـتیان کـەم بـێ ٥ ألمُـزَلَّجُ: کەسێـك بێخێـرو بێربێ هیچ پیاوەتی تێدانـەبێ ٥ زۆڵ و ناکەس بەجە ٥ خراپ و بێ کەڵك لەهـەر شتێـك بـێ ٥ هەرشتێك ڕێك و پێك ئەنجام نەدرابێ ٥ زَلَحَهُ: تامی کرد ٥ (تَزَلَّحَهُ): بـەمانا (زَلَحَهُ)دێ ٥ ألزُّلْحُ: شتی پوچ و بـەتاڵ ٥ زَلْحَفَهُ: دووری خستەوە ٥ تَزَحْلَـفَ: دوور کەوتـەوە ٥ إزْلَحَـفَّ عنـه: لـێی دوور کەوتەوە.

**زَلَخَ** زَلْخاً وزلخاناً: ڕۆیشت و پەلەی کرد.

زلخ فلاناً: فلانکەسی هەڵپێچاو کردیە کونەوە.

زلخ رأسهُ: سەری شـکاند.٥ زلخ زَلَخاً: قەڵەو بـوو ٥ زَلَّخَهُ: سفت و لوسی کرد ٥ زَلَّخَهُ الله فلاناً: خودا فلانکەسی توشی نەخۆشی لومباجۆ کرد؛ جۆرە ڕۆماتیزمێکە توشی ڕەگی ماسولکە دەبێ ئازارو شەپلەی بەردەوامی لـێ دەکەوێتـەوە ٥ الزُّلْخَةُ: زوحلوقەی منداڵان حنـدلقۆو هەڵبـەزو دابـەزی پێ دەکەن ٥ هەروا ناوە بۆ نەخۆشی (لومباجۆ) کە جۆرە ڕۆماتیزمێکە.

**زَلِزَ** زَلَـزاً: ناڕەحـەت و نائـارام بـوو ٥ ألزَّلَـزُ: کاڵای ناومـاڵ و پێداویـستی ٥ الزَّلِـزُ: ئـادەمیزادی نائـارام و قەلـەق ٥ کاڵاو شـت و مـەك ٥ الزَّلِـزَةُ: مێینـەی (الزَّلِـز)ە ٥ ئـافرەتی گەڕیـدەو زۆر هاتوچۆکەر بـۆ ماڵـە هاوسێـکانی بـەبێ کـاری پێویست ٥ الزُّلْزَاءُ: دەگـوترێ: (جمعوا زَلْـزَاءَهُمْ): کـاری خۆیـان یەکخـست و بڕیاریـان دا ٥ زَلْزَلَـهُ زَلْزَلَـةً وزِلْـزالاً: ڕایتلەقانـدو بەتونـدی وەشەقەتۆڵەی هێنا ٥ زَلْزَلَ فلان الماءَ: فلانکەس ئاوەکەی خواردەوە یان لـەقورگی دا غەرغـەرەی پـێ کـرد ٥ تَزَلْـزَلَ: بـە ڕاتلەقاندنەکە وەلەرزە کـەوت و هـەژا ٥ تَزَلْـزَلَ نَفْـسُهُ: لەگیانـەڵاو دا هەناسـەی چـووە نـاو سـنگی ٥ الـزُّلازِلُ: ئـاوی زوڵاڵ و شـیرین و صـاف و گـوارا ٥ الزَّلْـزَالُ: بومەلـەرزە، زەوی هـەژێن ٥ بـەڵاو کارەسـات و چورتم ٥ الزُّلْـزُلُ: تـەپڵ لێدەری کارامـا ٥ ڕۆح سوك و قسەخۆش ٥ ألزُّلطُ: ڕۆیشتنی خێـرا ٥ ألزَّلْـطُ: بەردە وردەی لوس و پوس ٥ زَلَعَتِ النارُ زُلوعاً: ئاگرەکە بەرز بووە بڵێسەی سەند.

**زَلَعَ** له من ماله زَلعة: لەماڵەکەی خۆی پارچەیەکی بۆ دابڕی.

زَلَعَ الشَّيْءَ زَلْعاً: بەغافڵگیری شتەکەی لـێ ڕفاند.

زَلَعَ الماءَ من البئرِ: ئاوەکەی لەبیر دەرهێنا.

زَلَعَ فلاناً: بەگۆچان و دار عەصا لەفلانکەسی دا.

زَلَعَ رأسَهُ: سەری قەڵاشت.

زلع جلده بالنار: پێستی بەئاگر سوتاند، داخی کرد ◊ زَلِعَتْ الكف أو القدمُ زلعاً: لەپەدەستی یان قاچی قەڵشان ◊ زَلِعَتْ جراحَتُهُ: برینەکەی داوەشا، ڕزی، دەگوترێ: (شَفَةُ زَلْعاءُ): لێوی قەڵشاو ◊ أَزْلَعَ: تەماعی بەرنا ◊ تَزَلَّعَتْ يده ورِجْلُهُ: دەستو قاچی قەڵشتن ◊ سوتان ◊ تَزَلَّعَ رِيشُهُ: پەرو بۆڵی نەمان ◊ تَزَلَّعَ الشَّيْئُ: شتەکە شکا ◊ إِزْدَلَعَهُ: دایبڕی بۆی، جیای کردەوە ◊ ازْدَلَعَ الشجَرَةَ: درەختەکەی بڕییەوە ◊ ازْدَلَعَ حَقَّهُ: بەغافڵگیری مافی خۆی لێ ستاندەوە ◊ الزَّلْعَةُ: برینی داوەشاوو دارِزاو ◊ اَلزُّلَّعُ: جۆرە میرویەکە ئافرەت دەیکەنە دەستەوانەو ملیوانکەو شتی تر وەکوو خشڵ بەکاری دێنن ◊ المُزَلَّعُ: کەسێك پێستی قاچی قەڵشابێ.

زَلَفَ اليه زَلْفاً وزليفاً: نزیك بووەو پێشی کەوت چووە پێشەوە.

زلَف الشَّيْئ: شتەکەی نزیك کردەوە پێشی خست ◊ أَزْلَفَهُ: بەمانا (زَلَفَهُ)دێ ◊ کۆی کردەوە، دەگوترێ: (أَزْلَفتُ القومَ): خەڵکەکەم گرد کردنەوە ◊ زَلَّفَ في حديثه: لەقسەکەی زیاد کرد ◊ (زَلَّفَ الشَّيْئَ): بەمانا (زَلَفَهُ)دێ ◊ تَزَلَّفَ: نزیك بووە، چووە پێشەوە ◊ إِزْدَلَفَ: بەمانا (زَلَفَ)دێ، دەگوترێ: (إزدلف السهمُ الى كذا): تیرەکە نزیك بوەوە لێی ◊ الزُّلْفُ: نزیکی ◊ پلەو پایە ◊ الزَّلَفُ: باخ ◊ الزَّلَفُ: بەمانا (الزُّلْفُ)دێ ◊ حەوزی پڕ لەئاو ◊ الزُّلْفَةُ: بەمانا (الزُّلْفُ)دێ ◊ بەشێك لەسەرەتای شەو ◊ الزَّلَفَةُ: هەرشتێك پڕبێ لەئاو (بیر، حەوز، کوپە، کوندە، ◊...) ◊ باخ ◊ ئینجانەی سەوز ◊ ئاوێنە یان ڕوی ئاوێنە ◊ بەردی لوس ◊ زەوی ڕەقو پتەو ◊ الزُّلْفى: نزیکیو پلەو پایەی بەرز ◊ باخ ◊ المزدَلِفَةُ: شوێنێکە لەنێوان میناو عەرفات دایە لەکاتی حەج دا حاجی شەوێك لێی دەمێننەوە ◊ المِزْلَفُ: پەیژە ◊ ئامێری بەرزبوونەوە ◊ اَلْمَزْلَفَةُ: هەرگوندێك لەنێوان وشکانیو لادێ دا بێ ◊ مزالف: قۆناخ، ڕۆژە ڕێ ◊ زَلَقَتِ القدم زَلَقاً: قاچی خلیسکاو جێگیر نەبوو، دەگوترێ: (زَلَقَ فلان بمكانه): فلانکەس لەوشوێنە جارِز بوو لێی دوورکەوتەوە.

زَلَقَ فلاناً ببصره: بەحەسودیو قینەوە سەیری فلانکەسی کرد، دەیەویست لەشوێنی خۆی لەناوی بەرێ.

زَلَق رأسهُ: سەری تاشیو لووسو پووسی کرد ◊ زَلِقَتِ القَدَمُ: قاچی هەڵخلیسکا ◊ أَزْلَقَت الحامِلُ: ئافرەتە سکپڕکە منداڵەکەی لەبارچوو ◊ أَزْلَقَ فلاناً ببصره: بەچاو فلانکەسی هەنگاوتو هەڵیخلیسکاند ◊ زَلَّقَ المكانَ: شوێنەکەی سفتو لووس کرد، دەگوترێ: (زَلَّقَ الحديدةَ): ئاسنەکەی زۆر تیژکرد تاوای لێهات لوس بوو ◊ زَلَّقَ فلاناً ببصره: بەمانا (زَلَقَهُ)دێ ◊ إنْزَلَقَ: بەمانا (زَلِقَ)دێ ◊ تَزَلَّقَ: خۆی ئارایش داو خۆی جوان کرد تا ڕوخساری ڕەنگی دایەوەو بریقەی هات ◊ خۆی بەرِۆن چەور کرد ◊ الزَّلِقُ: شوێنی خلیسك، کەقاچ پێوەی بەند نەبێ لەبەر سفتو لووسی ◊ الزَّلِيقُ: قۆخی لوس ◊ الزَّلِيقُ من الأجنة: زارۆکی لەبارچوو ◊ الزَّيْلَقُ: دەگوترێ: (ريح زَيْلَقُ): ڕەشەبایەکە خێرا دەڕوا ◊ المِزْلاَقُ: کێلۆن، سورگی، هەرشتێك دەرگاو شتی وای پێ دابخرێتو بۆ کردنەوەی کلیل پێویست نەبێ ◊ ئافرەتێك زو زو سکی پڕ ببێو زۆر منداڵی لەباربچێ ◊ اَلْمَزْلَقُ: شوێنی خلیسك ◊ اَلْمَزْلَقَةُ: شوێنی خلیسك ◊ اَلْمَزْلَقان: ڕێگایەك نەمدیوو ئەو دیوی تەلان بن وەکوو خەتی شەمەندەفەر

٥ زَلَعَمَهُ: قوتى دا، هەڵیلووشى ٥ الزُّلْقُمُ: دەریا ٥
الزُّلْعَمَةُ: پانو پۆزی ٥ الزُّلْقُومُ: گەرو، لوتى فیل
(خرطوم)ى فیل ٥ زَلّتْ قَدَمُهُ زلاً وزُلُولاً: قاچى
هەڵخلیسکا، دەگوترێ: (زلّ في منطقة ورأيه):
هەڵەى کرد لەڕاو بۆچونى دا.

**زَلَّ** عن مکانه: لەشوێنەکەى دوور کەوتەوە ٥ زَلّتْ
منه الى فلان نعمة: لەوەوە نازو نیعمەتى پێ
گەیى.

زَلّ عُمرُهُ: تەمەنى بەخێرایى تێپەڕى.

زَلّ النّقودُ: پارەکە کێشى کەم بوو.

زَلَّ زَلَلاً (زَلَّ يَزَلُّ): گۆشتى سمتو ڕانى کەم بوو،
لاوازو لەڕبوو ٥ أزَلّهُ: هەڵیخلیسکاند ٥ پێشى
خست ٥ زَلّلَ اليه نعمة: نازو نیعمەتى پێدا،
دەگوترێ: (فلان مُزَلّلّ): فلانکەس نانبدەو
سەخى سروشتە ٥ زۆر دیارى بۆ خەڵك
دەنێرێ ٥ استَزَلّهُ: بەمانا (أزَلّهُ)دێ ٥ رایکێشا بۆ
تاوان کردن ٥ الأزَلُّ: خێراو تیژڕۆ ٥ (السمع
الأزَلّ): جۆرە گورگێکە لەنێوان کەمتیارو
گورگ دا دێتە دى ٥ الزُّلالُ: ئاوى شیرینو گواراو
ساردو صاف ٥ شتى رونو شەفاف لەهەر شتێك
بێ ٥ لەبوارى کیمیادا جۆرێکە لەپرۆتین
لەناودا دەتوێتەوە ٥ الزُّلالىُّ: دەگوترێ: (بول
زلالي): میزێکى رونە ٥ الزُّلُّ: دەگوترێ: (مقام
زُلّ): شوێنێکە خلیسکە ٥ الزَّلاّءُ: بۆ مێینەى
(الأزلّ) بەکاردێ، دەگوترێ: (قوس زلاّءُ):
قەوسێکە ڕێرەوى تیرەکەى زۆر لوسەو
بەخێرایى تیرەکەى لێ دەردەچێ ٥ الزَّلّةُ:
تاوان، هەڵە ٥ بوك ٥ زیافەتو داوەت ٥ دەست
ڕەنگینىو کارى باش ٥ بەخشش ٥ الزُّلّةُ: تەنگە
نەفەسى ٥ الزِّلّةُ: بەردى لوس ٥ الزِّلّيّةُ: جۆرە
ڕاخەرێکە ٥ الزَّلَوْلُ: دەگوترێ: (مکان زلول):
شوێنى خلیسك (ماء زُلُولُ): ئاوى زوڵاڵ ٥

الزَّليل: (ماء زليل): ئاوى زوڵال ٥ (مکان زليل):
شوێنى خلیسك ٥ المَزَلّةُ: شوێنى تاوانو
هەڵخلیسکان.

**زَلَمَ** زَلْماً: هەڵەى کرد.

زَلَمَ أنفهُ: لوتى بڕى.

زَلَمَ عَطاءَهُ: بەخششەکەى کەم کردەوە.

زَلَمَ السَّهمَ: تیرەکانى راستو ڕێكو پێك کردن،
باشى دروست کردن.

زَلَمَ الإناءَ: قاپەکەى پڕکرد.

زَلِمَ زَلَماً: گوێى بزنەکەى بڕىو لێى نەکردەوە،
پارچەکە پێوەى مایەوە ٥ زَلّمَهُ: بەمانا (زَلَمَ)دێ
٥ زَلّمَ غذاءَهُ: خواردەمەنى خراپى پێدا لاشەى
پێى لاواز بوو ٥ زَلّمَ الإبلَ: گوێچکەى
حوشترەکەى بڕىو پارچە براوەکەى پێوە
هێشتەوە ٥ زَلّمَ الرَّحَى: بەرداشەکەى
خولاندەوەو لەملاو لەولاى تاشى ٥ إزْدَلَمَ رأسَهُ:
سەرى بڕى ٥ إزْدَلَمَ أنفه: لوتى بڕى ٥ الأزْلَمُ:
کەڵەکێوى، نێرەى قەرەى کێوى ٥ ڕۆژگارى
ناخۆشو پڕکارەساتو بەڵاو جۆرتم ٥ الزَّلَمُ:
تیرى بێ پەڕ ٥ لەڕۆژگارى پێش ئیسلام دا
عەرەبەکان لەڕێگاى تیرەوە شتیان بەش دەکرد،
ئەوەبوو دەهاتن سەرە تیرەکانیان دەخستنە ناو
تورەکەیەوە تێکەڵاویان دەکردن ئەمجار
دەستیان دەبرد تیرێکیان دەردێنا ئەگەر
لەسەرى بنوسرایە بکە ئەو ئیشەکەى دەکرد،
ئەگەر لەسەرى بنووسرایە مەکە ئەوە وازى
لەئیشەکە دەهێنا.

الزَّلْماءُ: مێینەى (الأزْلَم) بزنە کێوى ٥ بازى مێ ٥
الزُّلْمَةُ: شێوەو هەندام، دەگوترێ: (هو العبد
زُلْمةً): دەق لەکۆیلە دەچێ، شێوە کۆیلەیە ٥
پارچەیەك لەگەردنى بزن دا شۆڕ دەبێتەوە ٥

**اَلْمُزَلَّمُ**: كورتە بالآى گورجو گۆلّو رۆح سوك ◊ كلك كورت ◊ **زَمَتَهُ زَمْتاً**: خنكاندى.

**زَمُتَ** زماتةً: عاقلّو سەنگين بوو ◊ كەم قسە بوو ◊ **تَزَمَّتَ**: خۆى قورس راگرت ◊ توند ڕەو بوو لەبارەى ئايينو ڕاو بۆچونى خۆيەوە ◊ **الزُّمَّتُ**: قەلە ڕەش؛ بالّندەيەكى تێكسمراوو بە پەڕو پۆلّى ڕەش جەستەى داپۆشراوە ◊ **الزِّمِّيتُ**: كەسێك زۆر پابەندى ڕاو بۆچونى خۆى بێ ◊ (هي زميتة) ◊ **اَلْمُتَزَمِّتُ**: بەويقارو عاقلّ ◊ توندڕەو دەربارەى ئايين.

**زَمَجَ** عليه زَمْجاً: بەبێ ئيزنو پرس كردن چووە ژوور، بێ ئەوەى بانگ بكرێ.

زَمَجَ بين الناس: ئاشوبى لەنێوان خەلّك دا نايەوە خەلّكى هەلّنا بۆ يەكتر.

زَمَجَ القِرْبةَ: كوندەكەى پڕكرد لەئاو.

زَمِجَ زَمَجاً: ڕقى هەلّسا ◊ (هو زَمِجٌ وهي زَمِجَةٌ) ◊ **إزْمَاجَّ**: بەمانا (زَمِجَ)دێ ◊ شتێكى تەڕ هەلّبهاوسێ لەبەر گەرمى يان شێ ◊ **الزِّمَّاجُ**: كەسێك قاچى بچكۆلەبێ ◊ **الزُّمَّجُ**: بەمانا (الزُّمَّاجُ) دێ ◊ بالّندەيەكە لەپێرى بازو هەلّۆو دالّاشەكانە، زۆر ڕەنگى هەن بەزۆرى سوورە، بالّندەيەكى گۆشت خۆرە، دەندوكى تيژو بەهێزى هەيە ◊ **زُمَّجُ الماءِ**: بالّندەى ئاوييە لەپێرى بالّندەى نەورەسييە دەندوكێكى درێژى كەوانەيى هەيە، ڕەنگى سەوزى مەيلەو سوورە، قاچەكانى وەكوو لەپەدەست وەهان، يارمەتيدەرنى بۆ مەلەكردن ◊ **زَمْجَرَ**: دەنگى خۆى لەرانەدەوە لەسنگى دا گەڕانديەوە، گريەكى تێدا بوو.

**زَمَخَ** زَمْخاً وزُموخاً: خۆى بەزل زانىو تەكەببورى نواند، دەگوترێ: (زَمَخَ بأنفه): لوتبەرزى نواند ◊ (تَزَمَّخَ): تەكە ببورى نواند ◊ **الزِّمِخُ**: بەرزو بلندو سەركەش ◊ **الزُّمَّخُ**: دەگوترێ: (عقبة زَمَخٌ) و(رحلة زَمَخٌ): كارێكى ئەستەمە، سەفەرێكى ناخۆشە ◊ **الزُّمُوخُ**: بەمانا (زَمَخَ)دێ ◊ **زَمْخَرَ الصوتُ**: دەنگى بەهێز بوو، دەگوترێ: (زَمْخَرَ النَّمِرُ وغيره): پلّينگەكە زيڕاندى لەكاتى ڕق هەلّسانى دا ◊ **زَمْخَرَ الشجرُ**: درەختەكە تێك چرژاو لقو پۆپى لێك هالّان ◊ **زَمْخَرَ العُشْبُ**: گياو گژەكە لەخۆ كەوتو درێژ بوو چرۆى كرد ◊ **تَزَمْخَرَ النِّمرُ وغيره**: بەمانا (زَمْخَرَ)دێ ◊ **اِزْمَخَرَّ الصوتُ**: دەنگەكە بەهێز بوو ◊ **الزَّماخِرُ والزماخِرِيّ**: ناوكلۆر ◊ **الزُّمْخُرُ**: كلۆر ◊ شتى وەكوو قەفەزاژ ئێسقان كەمۆخى نەبێ ◊ قەفەزاژى ميزمار بلوێر ◊ تيرى دروستكراو لەقەفەزاژ ◊ درەختى پرلقو پۆپو تێكچرژاو ◊ پياوى شكۆمەند، ڕێزدار.

**زَمَرَ** زَمْراً وزَميراً: بەميزمار بلوێرى لێ دا ◊ بەجوزەلە شمشالّى لێ دا.

زَمَرَ بالحديث: هەوالّەكەى بلّاوكردەوە ◊ **زَمَرَتِ النعامةُ زماراً**: نوعامەكە گارمگارى كرد.

زَمَرَ الظَّبيُ زمراناً: ئاسكەكە تەرە بوو هەلّ سلّەميەوە.

زَمَرَ فلاناً بفلان زَمْراً: فلّانكەسى بەفلّان لەخشتە برد.◊ زَمَرَ الوعاءَ: قاپەكەى پڕكرد.

زَمِرَ الشيءُ زَمَراً: شتەكە كەم بوو

زمر فلان: فلّان پياوەتى كەم بوو مەردايەتى زەعيف بوو ◊ (عطية زَمِرَةٌ): بەخششى كەم.

زَمر بالمِزْمار: فوى بەبلوێرەكەدا كردو بلوێرى لێ دا ◊ **زَمَّرَ الوعاءَ**: قاپەكەى پڕكرد ◊ **زَمَّرَ الكلبَ**: قلّيتەى لەملى سەگەكە كرد ◊ **استَزْمَرَ**: وێك هاتەوەو پوچايەوە ◊ **اَلزَّمِرُ**: زوڕنا ژەن ◊ بلوێر لێدەر ◊ **الزِّمار**: گارمگارى نوعامە ◊ ڕوانى موو

لەسەری منداڵی تازە لەدایك بوو ◊ الزُمْرَةُ: فەوج و تاقم و کۆمەڵ ◊ پێرو دەستە ◊ الزَمّار: بەمانا (الزّامِرُ)دێ ◊ الزّمارةُ: مێینەی (الزّمار)ە ◊ ئامێری گۆرانی گوتن و بلوێرلێدان ◊ زنجیر ◊ قلێتەی ملی سەگ ◊ الزّمیُ: جۆرە ماسییەکە مەیلەو درێژە جەستەی لوسە توێکڵ و شتی پولەکە ئاسا دای نەپۆشیوە، لەلاتەنیشتەکانی دا صەفیحەی ئێسقانی هەن کلکێکی درێژی هەیە، لەروبارەکانی ئەوروپادا دەژی ◊ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەکی جەستە بچوکی تێکسمراو، بەپەرو بۆڵی نەرم جەستەی داپۆشراوە رەنگی خاکیی و رەنگی مەیلەو سورە، حەزی لەشوێنی روتەن و سەرانسەری کێو کەژە، لەمیصرو هەندێ وڵاتی عەرەبی تر دەژیا ◊ الزُمَیْرُ: جۆرە روەکێکە لەپێری نەرجیلی ◊ الزُمُورُ: کورە لاوی جوان ◊ الزُّمیُّ: کورتە باڵا ◊ المِزْمارُ: ئامێرێکە لەدار یان لەمەعدەن بۆقێکی پانی بەلای سەریەوە هەیە ◊ بەکوردی (زورنا) ◊ المزمور: بەمانا (المِزمار)دێ ◊ مزامیر داود: ئەو ئامێرانەی حەزرەتی داوود سرودە ئاینییەکانی پێ دەخوێند ◊ کتێبێکە دوعاو سرودەکانی حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان و ئاصەفی بەرخیای تێدا کۆکراوەتەوە کەناونراوە (الزبور) ◊ الزُمُرُّدُ: بەردێکی بەنرخە، رەنگی سەوزە زۆر سەوزەو شەفافە هەتا سەوزتر بنوێنێ بەنرخترەو نیشانەی باشییەتی ◊ زَمْزَمَ: لەدوورەوە دەنگی هات دەنگێك کەلێ حاڵی نەدەبووی ◊ مۆنەمۆنی کرد، دەگوترێ: (زَمْزَمَ الحصانُ): ئەسپەکە حیلکە حیلکی کرد ◊ (زَمْزَمَ المُغنّیَ): گۆرانی بێژەکە دۆنە دونی بوو ◊ (زمزم المجوسي عند الأكل والشراب): بابای ئاگر پەرست لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا دۆنەدۆنی کرد دەمی وێکنابوو گمەگمی بوو، لەلوتی دا گوتەکانی دەگوتن زمانی و لێوی نەجولاند ◊ زَمْزَمَتِ النارُ: ئاگرەکە لەکاتی هەڵگیرسانی دا لرفەلرف و قرچە قرچی هات ◊ زَمْزَمَ شیئاً: شتەکەی کۆکردەوە ئەوەی لێ بڵاو بوبووەوە هەڵیدانەوە سەر کۆمەڵ ◊ الزُّمازِمُ من المیاه: ئاوی زۆر ◊ الزَمْزامُ من المیاه: ئاوێك لەنێوان شیرین و سوێری دا بێ، دەگوترێ: (سحاب زمزام): هەورێکە دەنگی زۆر ئاشکرا نییە ◊ الزَمْزَمُ من المیاه: بەمانا (الزُّمازم)و (الزَمزام)دێ ◊ بیرێکە لەمەککە لەپەنا کەعبە، ئاوەکەی پیرۆزو شیفایە، ئاوەکەی بەشێوەی موتفەرك دەبرێ بۆ هەموو جیهانی ئیسلامی ◊ الزَمْزَمَةُ: کۆمەڵ و تاقم ◊ الزَمْزَمیة: کوندە ئاو دێمکە ئاو، مەتارە ئاو، دەبە ئاو ◊ الزُمْزُومُ من الناس: پاڵفتەی ئادەمیزادو پیاوە باشەکانی، دەگوترێ: (فلان في زُمْزُوم قومه): فلانکەس لەپیاوە باشەکانی گەلەکەیەتی.

**زَمَعَ** زَمْعاً وزموعاً وزمعاناً: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد، دەگوترێ: (زَمَعَتِ الأرنبُ): کەروێشکەکە بەخێرایی رۆیی.

زَمِعَ زَمْعاً: تاسا، ترسا ◊ لەرزی، دەگوترێ: (زمِعَت أصابعُهُ): پەنجەکانی زیادەیان تێدا بوو.

زَمِعَ فلان: فلانکەس چوست و چالاك و ئازا بوو ◊ أزْمَعَ: پەلەی کرد، (أزمعت الأرنبُ): کەروێشکەکە بازی داو دوایی هێواش بووە ◊ أزمعت الكرمةُ: دار مێوەکە پۆخی کردو شوێنی تولەمێوی تازەی لێ دەرکەوت ◊ أزمع النبات: گژوگیاکە بەرزو نەرم دەرکەوت و هەندێکی لەهەندێکی باشتر رسکاوە ◊ أزمع الأمر وبه وعلیه: بریاری دا کارەکە ئەنجام بداو وازی لێ نەهێنێ ◊ زَمَعَ الزنبور ونحوه: زەردەواڵەکە،

ژەنگەسورەکەو شتیوا گیژەگیژو ویژەویژیان بوو ◊ **الزَّمَاعُ**: پەلەو خێرا ◊ سوربون لەسەرکارو ورەبەرزی ◊ **الزُّمَعُ**: کەسێك کەمترسا یان ڕقی هەڵسا میز بەخۆدا بکا یان فرمێسکی بڕژێ ◊ **الزُّمْعَةُ**: پەلەو کۆپلە لەگژوگیا ◊ **الزَّمَعَةُ**: ئەو هینەزیادەی دەستی ولاخو ئاژەڵ لەپشت سمیەوە یان بڵێ لەپشت زەندییەوە◊ هەروا دەگوترێ: (فلان زَمَعَةٌ): فلانکەس شوێنکەوتەو لاپەرسەنگەو کەس حیسابی بۆناکا ◊ ئەو گرییەی بەلاسکی هێشووی ترێوەیە یان تەرزەو تولی ئەملاو ئەولای مێو ◊ شوێنی نزمایی زەوی ◊ **الزَّمْعِيُّ**: هەتیو مچە، ناکەس بەچە ◊ تەمنگە تیزەو خێرا هەڵچوو ◊ پیاوی ئازاو کاراماو لێهاتوو ◊ **الزُّمَّعُ**: کەسێك زوو پێداویستی جێ بەجێ نەکا ◊ زەردەواڵەیەك چزوی نەبێو منداڵ یاری پێ دەکەن ◊ **الزُّموعُ**: گورجو گۆڵو عەجول ◊ کەروێشکی بەنیشات ◊ **الزَّميعُ**: خێراو عەجول ◊ پیاوی ئازاو سور لەسەر هەڵوێستی خۆی ◊ کۆڵنەدەرو تێکۆشەر ◊ ڕاپەسەندو چاونەترس ، دەگوترێ: (هو زميع الرأي) و(فلان قلبه زميع ماض غير هيّاب) ◊ **زَمَكَهُ زَمْكَاً**: پڕی کرد ◊ (زَمَكَ فلاناً): فلانکەسی جولاندو تیوەی ژەنی تا ڕقی هەڵساند ◊ **زَمِكَ زَمَكاً**: شتەکان تێك گیرانو چونە ناویەکەوە پەیوەستی یەکدی بوون.

**زَمَكَ** فلان: فلانکەس ڕقی هەڵسا ◊ **زَمَّكَهُ**: بەمانا (زَمَكَهُ)دێ ◊ **الزُّمَّكَةُ**: کەسێك زوو ڕقی هەڵسێ، دەگوترێ: (فلانٌ زُمَّكَةٌ): فلانکەس زوو ڕقی هەڵدەستێو هەڵدەچێ ◊ پیاوی نەحمەق ◊ کوڵمینەو کورتە بالا، دەشگوترێ: (هي زمكة): بۆ ئافرەت ◊ **الزِّمِكُ**: بنکی کلکی باڵندە ◊ شوێنی لێ ڕوانی پەڕی کلکی ◊ **الزِّمِكِّيُّ**: بەمانا (الزِّمِكُ) دێ.

**زَمَلَ**: بازی هاویشت لەسەریەك قاچ واتە بەهەنگڵە شەلە بازی دا ◊ **زَمَلَتِ الدَّابَةُ**: ولاخەکە بەهۆی تەردەماخیو نیشاتیەوە وا ڕۆیشت دەتگوت دەشەلێ ◊ ئاوگێڕی سەربڕ ◊ (زَمَلَ القوسُ): کەمەندەکە ڤینگەی لی هات ◊ (زَمَلَ فلاناً زَمْلاً): هاوشانی فلانی کرد ◊ بەشوێن فلانکەس دا هات ◊ شوێنی کەوت ◊ (زَمَلَ الشَّيْءَ): شتەکەی بەرزکردەوە هەڵی گرت ◊ (هو مزمول وزميل) ◊ **زَامَلَهُ**: هاوتایی کرد لەسەر پشتی حوشترەکە یان لەسەر هەرشتێکی تربێ، دەگوترێ: (زَامَلَهُ في العمل) ◊ **زَمَّلَهُ**: شاردیەوە، دایپۆشی ◊ (زَمَّلَهُ بثوبه وفيه): خۆی لەکراسەکەیەوە پێچا ◊ **تَزَمَّلَ**: خۆی پێچاوەو خۆی داپۆشی ◊ **اِزْدَمَلَ**: بەمانا (تزمّل)دێ ◊ (اِزْدَمَلَ شيئاً): شتەکەی بەیەکجار هەڵگرت ◊ **الأَزْمَلُ**: هەردەنگێك تێکەڵو پێکەڵ بێ، دەشگوترێ: (سمعت أَزْمَلَ القوس): گوێم لە گیڤەو ویژەی کەوانەکە بوو ◊ (أخذ الشَّيْءَ بأَزْمَلِهِ): هەموو شتەکەی وەرگرت ◊ (جاء بِأَزْمَلِهِ): بەماڵو بەمنداڵەوە هاتو کەسی جێ نەهێشت بوو ◊ (تَرَكَ أَزْمَلاً): ماڵو خێزانی جێ هێشت ◊ **الأَزْمَلَةُ**: زۆرو زەبەندە، دەگوترێ: (له عيال أَزْمَلَةٌ) ◊ هەروا بەمانا ماڵو خێزانو دەنگی کەوانو هەمووی دێ ◊ **الإِزْمِيلُ**: چەقۆی کلاش بڕین، چەقۆی پینەچی، دەگوترێ: (قطعت الجلد بالإزميل) ◊ هەروا ئاوە بۆ کێردێکی کەوانەیی وەکوو مانگی یەك شەوە بەسەری ڕمبەوە دەکرێ بۆ ڕاوکردنی کەڵەگا کێوی ◊ چەکوج ◊ ئامێرێکی ئاسنە لایەکی تیژە بەردو داری پێ کون دەکرێ یان وەکوو

برِمەند زیادەو گرێو گۆڵی داری پێ دەتاشرێ ٥ **الزَامِلُ**: ولاخی تەرِدەماخو بەنیشات کەدەرِوا وادەزانی دەشەلێ ٥ حوشتر ٥ **الزاملة**: مێینەی (الزامل) ٥ **الزَّمَالُ**: شەل ٥ **الزُّمالَـةُ**: پلەیەکی زانستییە ٥ **الزُّمَلُ**: بار، کۆڵ ٥ ترسنۆکی هیچو پوچ ٥ تەمبەڵ ٥ **الزُّمَّـلُ**: لاوازو ترسنۆکو پەستو پایین ٥ **الزُّمْلَةُ**: ئەوەی تێك هاڵاوە لە دارخورمای بەرز ٥ **الزُّمْلَـةُ**: هاورێو تاقمو کۆمەڵ ٥ **الزَّمَلَـةُ**: خێزانو عەیاڵ، دەگوترێ: (ترك زَمَلَـةً) ٥ **الزُّمَيـلُ**: بەمانا (الزُّمَّـلُ)دێ ٥ **الزَّمِيلُ**: هاورێی سەفەر یان خوێندن یان ئیش ٥ هاوشان ٥ ئەوکەسەی پلەی زەمالەی وەرگرتووە ٥ **الزُّمَيـلُ**: بەمانا (الزُّمَّـلُ)دێ ٥ **المُزَمَّلَةُ**: جەرِەیەکی گەورەی سەوزە هاوینان ئاوی تێدەکرێ بۆئەوەی ساردبێ.

**زَمَّ** زمًا: لەرِۆیشتن دا پێش کەوت ٥ قسەی کرد.

زَمّ بأنفه: لوتبەرزی نواند تەکەببوری کرد.

زَمّ البعيرُ بأنفه أو برأسه: حوشترەکە سەری هەڵبرِی یان لوتی هەڵبرِی چونکە ئازاری هەبوو.

زمّ القِرْبَةُ زُمُوماً: کوندەکە پرِ بوو.

زمّ الزنبـورُ أو العـصفورُ زميماً: زەردەواڵەکە یان چۆلەکەکە دەنگی لێ هات.

زم الشَّيئ زمًّا: شتەکەی شەتەك دا.

زَمّ البعيرَ: هەوسارو لغاوی بۆ حوشترەکە کرد.

زَمّ القـومَ: پێش خەڵکەکە کەوت وەکوو ئەوە رابەریان بێ.

زَمّ الشّيئَ: شتەکەی پرِکرد تا لەسەریەوە رێژەی کرد ٥ **زَامَّ فلاناً**: دژایەتی فلانکەسی کرد ٥ **زَمَّمَهُ**: بەمانا (زَمَّهُ)دێ ٥ **زَمَّمَ الجملَ**: هەوساری حوشترەکەی توند کرد ٥ **الإزميم**: مانگی یەك شەوە کە کەوانە دەبێتەوە وەکوو داسی لێ دێ ٥ **الزِّمام**: رێشمەو هەوسار ٥ (هو زِمامُ قومه): ئەو سەرۆكو رابەری گەلەکەیەتی ٥ (ألقى في يده زِمامُ أمـره): ئیشو کارەکانی بەئەو سپارد ٥ **الزَّمَمُ**: دەگوترێ: (أَمْرُهم زَمَمٌ): مەبەستێك بوو لە ئەندازەی خۆی تێنەپەرِی ٥ (داري من دراه زَمَمٌ): خانوەکەم نزیکی خانوەکەیەتی ٥ (داري زَمَمَ داره): خانوەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی.

**زَمِـنَ**: نەخۆشییەکی درێژخایەنی گرت ٥ یان بەهۆی پیرییەوە لاواز بوو ٥ **أزْمَـنَ بالمكـان**: لەوشوێنە چەند زەمانێك مایەوە ٥ **أزْمَـنَ الشَّيْئُ**: رۆژگاری درێژ بەسەر شتەکە دا رۆیشت ٥ **أزْمَـنَ عنـه عَطَـاؤهُ**: بەخششی درەنگ پێدا وەغرانـدی ٥ **أزمـن الله فلانـاً وغـيره**: خـودا فلانکەسی توشی نەخۆشی گۆجیو ئیفلیجی کردوە ٥ **زامَنَهُ**: مامەڵەی بەکات لەگەڵ دا کرد ٥ **الزّمانُ**: کات کەم بێ یا زۆر ٥ تەمەنی دونیا هەمووی ٥ وەرز ٥ دەگـوترێ: (السنة أربعـة أزمنـــة): ســاڵ چــوار وەرزە ٥ **الزَّمَانَـــةُ**: نەخۆشییەکی درێـژ خایەن ٥ **الـزَّمَنُ**: بەمانا (الزّمان)دێ، دەگوترێ: (زَمَنٌ زامِن): رۆژگارێکی زۆر نەستەمو ناخۆشە ٥ **الـزَّمِنُ**: دەگـوترێ: (زَمِن الرَّغْبَةِ): کەم ئارەزوو حەز لاوازە ٥ **الزَّمِينُ**: بەمانا (الزَّمِنُ)دێ ٥ **الزُّمَيْنُ**: دوای ماوەی زۆر ٥ **المُتَزَامِنُ**: هاوکاتو هاوزەمان.

**زَمِهَ** الحرُ زَمِهاً: گەرما ئاوی ستاند.

زَمِهَ الرَّجُلُ بالحرِ: پیاوەکە گەرمای لێ بەهێز بوو ٥ **زَمِهت الشمسُ**: خۆر تینو گەرمی بەهێز بوو ٥ **زَمْهَـرَت عيناه**: دووچاوی لێ سور هەڵگەرِان بەهۆی رِق هەڵسان ٥ **ازْمَهَـرَّ اليـومُ**: رۆژەکە سەرماکەی توند بوو ٥ **ازْمَهَـرَّ الوجه**: دەمو چاوەکە گرژو تەڵخ بوون ٥ **ازْمَهَـرَّ فـلان**: فلانکەس زۆر رِقی هەڵسا، دەشگوترێ:

(اِزْمَهَرَّ عليه): رقى لىٚ هەڵسا ٥ ازمَهَرَّت عيناه: چاوى لىٚ سور هەڵگەڕان ٥ اِزْمَهَرَّ الكواكبُ: ئەستێرەكان درەوشانەوە يان روناكييان زياد بوو ٥ اِزمَهَرَّت أسنانُهُ عند الضَّحك: لەكاتى پێكەنين دا ددانى بريقەيان هات ٥ الزَّمْهَرِيرُ: سەرماى بەشيدەت، جەنگەى سەرما ٥ الزُّماوَرْدُ: خواردەمەنييەكە لەهێلكەو گۆشت دروست دەكرێ، لوقمە قازى ٥ لوقمەى خەليفە.

**زَنَأَ** زُنوءً: تەنگە بەربوو ٥ (زَنَأَ بولُهُ): ميزى گيرا.

زَنَأَ الشَّيْءُ: شتەكە بەزەوييەوە نووسا.

زَنَــأَ الظِــلُّ: سێبەرەكە هەڵكشايەوە، هەندێكى لەهەندێكى نزيك بوونەوە.

زَنَأَ فيه: پێيدا سەركەوت.

زَنَأَ بَولُهُ: بۆ ميز گيرانەكەى حوقنەى بۆكرد ٥ أزْنَأَ: بەمانا (زَنَأَ)دێ ٥ زَنَّأَ عليه: تەنگى پىٚ هەڵچنى ٥ الزَّنَاءُ: تەنگى، تەنگەبەر ٥ خڕو خەپان‌و كوڵەبنە ٥ ئەوكەسەى حوقنە بۆ ميزى خۆى دەكا ٥ الزُّنَيءُ: تەنگ ٥ كوندەى بچكۆلە، جامى بچوكى ئاو خواردنەوە.

**زَنَبَ** زَنَباً: بەكورتە بالآيى قەڵەو بوو، بوو بە خەبەتۆڵە ٥ الزُّنابى: بەمانا (الزَّبانى) دێ واتە: دوشاخى دوپشك ٥ الزُّنابَةُ: بەمانا (الزُّنابى)دێ ٥ الزُّنبـار: حەشـەرەيەكە پێوەدانى بەئازارە لەپێڕى (الزنبـور)يە واتە: زەنگە سووره ٥ الزُّنْبُرُ: لاوى تازە رسكاوى قالب سوك ٥ الزِّنْبَرِيُّ مِن الرجال: پياوى قورس‌و قونگ گران ٥ كەشتى گەورەو زەبەللاح ٥ الزِّنْبَرِيَّةُ: جۆرە كەشتييەكى گەورەو زەبەللاح ٥ الزَّنبور: بەمانا (الزَّنبـار)دێ ٥ الزُّنبورِيَّـةُ: مەسـەلەيەكى قەواعيدى نەحوييە كيسائى‌و سێبويە تێيدا كەوتنە كێشەوە، ئاكامەكەى بەسەر سێبويەى دا شكايەوە ٥ الْمَزْبَرَةُ: زەوييەك زەنگە سورەى زۆربن ٥ الزُّنْبُرُكُ: زەنبەلەكى سەعات ٥ الزَّنْبَقُ: رووەكێكە لەپێڕى زەنبەقيە گوڵێكى بۆنخۆشى هەيە ٥ رۆنى ياسەمين ٥ الزُّنْبُلُكُ: لوغەتێكە لە (الزُّنْبُرُك) ٥ تَزَنْتَرَ: لارو لەنجەى كرد ٥ الزَّنْتَرَةُ: تەنگانەو ناخۆشى ٥ زَنِجَتِ الإِبِلُ زَنَجاً: حوشترەكە زۆرى تينوو بوو.

**زَنِجَ** الرَّجُلُ: پياوەكە لەتينوانا ريخۆڵەى وێك هاتنەوەو وشك بوونەوە ٥ ناتوانىٚ زۆر بخواو بخواتەوە ٥ زَانَجَهُ مزانجةً وزِناجاً: بەچاكە يان بەخراپە پاساوى دايەوە ٥ تَزَنَّجَ عليه: دەستدرێژى كردەسەر لىٚى دا لىٚى تووڕە بوو ٥ الزَّنْجُ: چينێك ئادەميزادن لەولاتى سودان پێستيان ڕەشە، قژيان تێك ئاڵاوو گشتە لێو ئەستورو كەپويان مەيلەو پانە، لەمديو ئەو ديوى هێڵى استواء نيشتەجێن هەرێمەكەيان لەولاتى مەغريبەوە دەست پێدەكات تادەگاتە ولآتى حەبەشە، هەندێكيشيان لەسەر روبارى نيل نيشتەجىٚ بوون، ئێستا وشەى (الزنج) بەهێندى هۆزو بنەماڵەى ئەفريقيش دەگوترىٚ جا لەهەر جێگايەك نيشتەجىٚ بووبن ٥ الزَّنْجَبِيلُ: رووەكێكە لەپێڕى (الزنجارية)يە رەگى ئەستورى هەن‌و بەزەوى دا دەڕواتە خوار، تامى تيژە ٥ هەروا ناوە بۆ شەراب ٥ زَنْجَبِيلُ الشام: رووەكێكە لەپێڕى (المركبة)يە رەگەكانى ئەستورن لەبوارى دەرمانسازى دا بەكاردەهێندرێت ٥ زَنْجَبِيلُ الكلاب: گيايەكە سەگ كوژە (سەگ بيخوا پێى دەتۆپىٚ)، لاسكەكەى سورە ٥ زَنْجَرَ: نينۆكى قامكە گەورەى بەنينۆكى قامكى شايەدومان كێشا ٥ چەقەنەى لىٚدا ٥ الزِّنْجارُ: زەنگى مس ٥ الزِّنْجَرُ: ئەو سپياتيەى بەسەر نينۆكى منداڵى ساواوە

هەیە ٥ الزَّنْجِيُّ: بەمانا (الزّنجر)دێ ٥ نینۆك كەر ٥ چـەقەنە لێـدان ٥ زنجـیر ٥ الزُّنْجُفْـرُ: مەعدەنێكە پێكهاتووە لەتێكەڵاوبوونی جیوە بـە گـۆگردەوە، وردكراوەكـەی زۆر سـورە، نووسەرو وێنەگر بەكاری دەهێنن.

**زَنِخَ** الدُّهْنُ زَنَخاً: رۆنەكە بۆنی گۆڕا ٥ (هو زَنِخٌ) ٥ **زَنَّخ**: بەمانا (زَنِخَ)دێ.

**زَنَدَ** النارَ زنداً: ئاگرەكەی هەڵـگیرساند، دەگـوترێ: (زَنَدَ نار الحـرب): شەڕی هەڵـگیرساند، بـەرپای كرد.

زند الإناءَ: قاپەكەی پڕكرد.

زَنِدَ زَنَداً: تینوی بوو ٥ (هو زَنِدٌ) ٥ أَزْنَدَ: زیادی كرد ٥ زَنَّـدَ: ئاگرەكە بڵێسەی سەند ٥ درۆی كـرد ٥ تەنگ بوو، تەنگی پێ هەڵچنی، دەگـوترێ: (زَنَّدَ علـى أهلـه): تـەنگی بـەماڵو منداڵەكـەی هەڵچنیو لەقاقۆزەی پێچاون ٥ زَنَّدَ فلاناً: زیاد لەپێویست سـزای فلانكەسی دا ٥ تَزَنَّـدَ: تەنگە بەر بوو ٥ تَزَنَّدَ في الأمر: لەكارەكەدا تـەنگی پـێ هەڵچنراو نارەحـەت بـوو ٥ الزِّنـاد: ئامێرێـكە چـەرخەكە دەكوتـێو ئاگرەكـە هەڵـدەبێو باروتەكە دەتەقێنێـەوە ٥ الزَّنْدُ: ئەو پارچەیەی لای سـەرو كـە دەكێـشرێ بەپارچـەی ژێـرەوە ئاگرەكە هەڵدەبێ هی سەرەوە پێـی دەگـوترێ: (الزَّنْدُ) هی ژێرەوە (الزَّنْدَة) واتە: بەردو ئەستێ، بەردەكە پێـی دەگوترێ: (الزَّنـدَة) ئەستێـكەش پێـی دەگـوترێ: (الزَّنْـدُ) ٥ هـەروا نـاوە بـۆ كتێبێـكی ئایینی مەجوسی ٥ ددانی مشارو شتی وا لەبـەردو لـەدار ٥ الزَّنْـدان: باسـكو قـۆڵ ٥ الزَّنْـدة: بـەردە ئەستـێ ٥ قوتولكەیەكـە مـادەی ئـاگراویو بـاروتی تێدایـە لای قونـداخی تۆپەكەوەیە گڕدەدرێو پاڵ بەگوللەكەوە دەنێ ٥ الزَّنْدِيـة: بازنەیەكـە لەدەسـتو قـۆڵ دەكـرێ پێی دەگوترێ: بازی بەند ٥ الْمُزَنَّـدُ: دەگـوترێ: (ثـوب مُزَنَّـدٌ): كراسـی تەسـك ٥ (رجـل مُزَنَّـدٌ): پیاوێـكی رژدو چروك، هەتیومچەو باوك نادیار ٥ پیاوی تورەو هەڵچوو ٥ تَزَنْدَقَ: بـوو بەزنـدیق ٥ الزَّنْـدَقُ: زۆر رژدو چـروك ٥ الزَّنْدَقَـةُ: بـیرو باوەڕێـكە پێـی وایـە كـە بوونـەوەر كـۆنو ئەزەلییـەو سـەرەتای نییـە، كاتێـك نییـە نـەبووبێ ٥ وشـەی (الزَّندقـة): بـۆ زەردەشـتییەكانو مانەوییـەكانو هـەموو ئەوانـەی بڕوایـان بەهـەبوونی دوو خـودا هەیـە بەكار هاتووە، دوایی مانای گشتی تریان بۆدانـاو هەركەسێـك گومـانی لـەتاكو تـەنهایی خـودا هـەبێ یـان گومڕابێ یـان هـیچ ئاینێـكی نـەبێ پێی گوتراوە زنـدیق ٥ الزِّنْـدِيق: كەسێـك بـیرو بـاوەڕی زەندەقـەی هـەبێ ٥ زَنَـرَهُ زَنْـراً: زونـاری لەپـشتی ئـەو بەسـت ٥ زَنَـرَ الإنـاءَ: قاپەكـەی پڕكـرد ٥ زَنَـرَت عینـه: چـاوی تەسـك بوونـەوە لەكاتی زۆر سـەیركردنو چاو تێبڕین دا ٥ زَنَـرَ الیه عینه: چاوی تێ بڕیو زۆری سەیركرد.

**زَنَر** القَسُّ: قەشەكە زوناری لەپشت كابرا بەست ٥ تَزَنَّرَ القَسُّ: قەشەكە زونـاری لەپشتێن بەست ٥ تَزَنَّرَ الشَّيْءُ: شـتەكە وردو بارێـك بـوو ٥ الزُّنَّـارُ: زونـار، پـشتێنێكە مەسـیحیەكان لەپـشتی دەبەسـتن ٥ الزُّنْزانَـةُ: ژوورێـكی بـچوكە لەبەندیخانەدا هەندێ بەندكراوی بەتەنها تێدا بەند دەكرێ.

**زَنِفَ** زَنَفاً: رقی هەڵسا ٥ تَزَنَّفَ: بەمانا (زَنِـفَ)دێ ٥ الزَّنُوف: نێرەموك ٥ زَنْفَلَ: سەمای ئەبەطی كرد ٥ وارۆیشت وەكوو ئەوە كۆڵێكی گرانی پێ بێ ٥ پەلەی كرد.

**زَنَقَ** على عياله زَنْقاً: چرۆکی لەگەڵ ماڵو منداڵی خۆی کرد باشو تێرو تەسەل بەخێوی نەکردن جایان لەبەر رژدی یان لەبەر هەژاریی.

**زَنَقَ** الدّابة: وڵاخەکەی هەوسار کرد.

**زَنَقَ** الشَّيْءَ: شتەکەی خڕهەڵداو تەنگی پێ هەڵچنی.

**زَنَقَ** الرأي: راو بۆچونەکەی پتەوو بەڵگەدار کرد ٥ (هو زنق) ٥ **أزْنَقَ على عياله**: باش ماڵو خێزانی بەخێو نەکرد ٥ **زَنَّقَ**: بەمانا (أزْنَقَهُ)دێ ٥ **الزِّناقُ**: هەر حەبلێك لەپێست دروستکرابێ بەدەوری لبۆزی وڵاخەکەدا هاتبێتەوەو ئەمجار بەرداربێتەوە بۆسەری ٥ واتە هەوسار، رێشمە ٥ جۆرە خشڵێکە وەکوو مێخەکبەند ٥ **الزَّنَقُ**: شوێنی هەوسار ٥ لایەکی تیر، سەرەباریکەکەی ٥ **الزَّنَقَةُ**: رێگای تەنگەبەری ناوگوند٥ **الزِّنْكُ**: زەنك، عونصورێکی فلزییە سپییە گەردیلە ژمارەکەی (٣٠)یە، کێشی گەردیلەکەی (٦٥,٣٨) لەپلەی (٤١٩م) دەتوێتەوە.

**زَنِمَ** زَنَماً: گوێی بڕاو بڕاوەکەی شۆڕبۆوە لێی نەبوەوە ٥ **زَنَّمَهُ**: بەمانا (زنِمَهُ) دێ، دەگوترێ: (بعير مزنَّمٌ): حوشتری گوێ بڕاوی وەها کەبڕاوەکەی لێ نەبوبێتەوە ٥ **الزَّنِيمُ**: زۆڵ، باوك نادیار خۆحسابکەر لەگەڵو نەتەوەیەكو لەوان نەبێ ٥ پیاوی خوێڕیو شەڕانیو چەقاوە سوو، بێوەفاو ناکەس بەچە.

**زَنَّ** عَصَبُهُ زَنَّاً: ڕەگەکەی وشك بوو، جومگەکانی شل بوونەوە.٥ **زَنَّ** فلاناً بخيرٍ أو شرٍّ: فلانکەسی پاڵ دا بۆ چاکە یان بەخراپکاری لەقەڵەم دا.

**زَنَّ** بَوْلَهُ: میزەکەی حوقنە کردو بەندی کرد ٥ **أزَنَّهُ**: بەمانا (زَنَّهُ) ٥ **الزَّنَنُ**: کەمو تەنگەبەر، دەگوترێ: (ماء زَنَنٌ): ئاوێکی کەم ٥ (بئرٌ زَنَنٌ): بیرێکە نازاندرێ ئایا ئاوی تێدایە یان نا ٥ **الزَّنَّةُ**: تۆمەت ٥ (أبو زَنَّة): نازناوو کونییەی مەیمونە ٥ **الزِّنِّينُ**: ئەو کەسەی میزی خۆی حەوق بکا ٥ **زَنْهَرَ اليه بعينه**: چاوی دەرپەڕاندو بەوردی سەیری کرد.

**زَنَى** زِنيً: زینای کرد، بەبێ مارەبڕینو عەقدی شەرعی چووە لای ئافرەت ٥ **أزناهُ**: هەڵی نا بۆ زیناکردن ٥ زیناکردنی پاڵ دا ٥ **زَنَّاه**: بەمانا (أزناه)دێ ٥ **الزَّنّاءُ**: کەسێك زۆر زینابکا ٥ **الزِّنْيَةُ**: دەگوترێ: (هو ابن زَنْيَةٍ): واتە: لە زیناوە پەیدا بووە.

**زِهْ**: وشەیەکی فارسییە کاتێك دەگوترێ شتێکی جوانی بەلاوە بکرێ.

**زَهِدَ** فيه وعنه زُهْداً وزهادةً: ڕوی لێ وەرگێڕا لەبەر بەکەم زانین یان لەبەر ناخۆشەویستی یان لەبەر کەمیو کەم بایەخی، دەگوترێ:(زهِدَ في الدنيا):وازی لەشتە حەڵاڵەکانی هێنا لەترسی لێ پرسینەوە، وازی لەشتە حەرامەکانیشی هێنا لەترسی سزادان ٥ **أزْهَدَ الرجُلُ**: پیاوەکە ماڵو سامانی کەم بوو ٥ **زَهَّدَهُ**: بەکەمی زانی، کەمی کرد ٥ (زَهَّدَه فيه وعنه): وای لێ کرد زاهیدو نەویست بێ ٥ وای لێ کرد رژدو چروك بێ ٥ **تَزَاهَدُوهُ**: بەهیچو پوچیان لەقەڵەم داو بەکەمیان زانی، لەحەدیثدا هاتووە: (كتب الى عمر: ان الناس قد اندفعوا في الخمر، وتزاهدوا الحدّ) ٥ **تَزَهَّدَ**: بوو بەدونیا نەویست، خودا پەرستی کرد ٥ **إزْدَهَدَ**: بەکەمی زانی، بەکەمی ژمارد ٥ **الزّاهِدُ**: خودا پەرست ٥ **الزّهادة في الشَّيْءِ**: پێچەوانەی حەز لێ بونو داخوازی شتە ٥ وەرگرتنی کەمترین پێداویستی، رازی بون بەکەم لەشتی حەڵاڵو ڕەواو وازهێنان

لەشتی زێدە لەبەرخاتری ڕەزامەندی خودا ٥ **الزُهْدُ**: بەمانا (الزّهادة)دێ ٥ **الزُهْدُ**: ئەندازەی کەم، دەگوترێ: (خُذْ زُهْدَ ما یکفیك): کەمترین پێداویستی خۆت وەربگرە ٥ **الزَهَدُ**: زەکات ٥ لەم ڕووەوە کەمترینی ئەو ماڵەیە زەکاتی لێ دەردەکرێ ٥ **الزُّهاد**: کەسێك زۆر زوهدی هەبێ ٥ **الزَهِیدُ**: کەم، دەگوترێ: (ثمن زهید): بەهای کەم ٥ (زهید الأکل): خواردنی کەم.

**زَهَـرَ** الوجهُ والسراج والقمر: دەمو چاو، چرا، مانگ، ڕوناکی داو درەوشایەوە.

**زَهَرَ** الشَیْئُ: شتەکە ڕەنگی صافو رون بوو.

**زَهَرَ** الزَّنْدُ: ئاگری چەرخەکە روناکی داو بڵێسەی سەند، دەگوترێ: (زهرت بك ناري): بەهۆی تۆوە بەهێز بووم، (زهرت بك زنادي): بەهۆی تۆوە کارەکەم ئەنجام درا.

**زَهَـرَ** النبات أو الشجرُ: ڕووەکەکە یان درەختەکە گوڵی کرد ٥ **زَهَرَت الشمسُ اللونَ**: خۆر ڕەنگی گۆڕی.

**زَهَرَ** زَهْراً: جوان بوو، سپی بوو، ڕەنگی صاف بوو ٥ **أزهَرَ النبات أو الشجرُ**: ڕووەکەکە یان درەختەکە گوڵی دەرکەوت ٥ **أزهَرَ النارَ وغیرها**: ئاگرەکەی هەڵگیرساند، دەگوترێ: (ازهَرْتَ زَندي): پلەو پایەت بەرزکردمەوە، ئیشەکەمت جێ بەجێ کرد ٥ **ازْدَهَرَ**: بەمانا (زَهَرَ)دێ ٥ کەیفخۆش بوو، ڕوخساری گەشایەوە ٥ شتەکەی هەزم کردو لێی حاڵی بوو، بەنیشەکە ڕازی نەبوو ڕەخنەی گرت ٥ شتەکەی خستە دڵیەوە ٥ **إزهَرَّ النبات أو الشجرُ**: بەمانا (أزهَرَ)دێ، گوڵەکانی زۆر بوون ٥ **ازهارّ النبات أو الشجرُ**: ڕووەکەکە یان درەختەکە وردە وردە گوڵی کردو گوڵەکانی دەرکەوتن ٥ **الأزهَر**: هەموو ڕەنگێکی سپی صافو ڕون ٥ مانگ ٥ ڕۆژی هەینی ٥ هەموو گیانلەبەرێك یان ڕووەکێك ڕەنگی بریقو باقی هەبێ ٥ **الزاهِرُ**: ڕوخسار جوان لەڕووەك بێ یان لەگیاندار بێ یان بێ گیان بێ ٥ ڕەنگی پرشنگدارو ڕوناك، دەگوترێ: (أحمر زاهر): سورێکی زۆر سور ٥ **الزاهِرِیة**: لارو لەنجە، دەگوترێ: (هو یمشي الزاهِریة): بە لارو لەنجە دەڕوا ٥ **الزَهَرُ**: خونچەو گوڵی ڕووەك یان هی درەخت ٥ تاکەکەی (زهرة) ٥ (زهرة البرد): پەڵەی سەر ئەردی تاوڵەو شتی وا ٥ **ماء الزهر**: ئەو ئاوەی لەگوڵی نارنج دەردێ ٥ **الزُهْرُ**: سێ شەوی سەرەتای مانگ ٥ **الزَهراء**: مێینەی (الأزهر) ٥ هەروا لەقەبو نازناوی فاطیمەی کچی پێغەمبەرە ٥ **الزَهراوان**: سورەتی (البقرة وآل عمران)نە لەقورئانی پیرۆز ٥ **الزُهرة**: تاکی (الزُهْر)ە ٥ (زهرة الدنیا): جوانیو خۆشی ژیانی جیهان ٥ **الزُهْرَةُ**: سپی پرشنگدار ٥ ڕەنگی ڕونو جوان ٥ **الزُهَرَةَ**: یەکێکە لەئەستێرە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆریی، کەنۆ ئەستێرەی گەڕۆکنو دووەم ئەستێرەیە لەڕووی دوریی لە خۆرەوە، دەکەوێتە نێوان ئەستێرەی عوطاریدو زەوییەوە، لەدوای خۆرو مانگ لەهەموو قەبارەکانی ئاسمان پرشنگدارترە ٥ هەروا وشەی (الزُهَرة): ناوی خودای جوانی ئیغریقییەکانە کە پێی دەڵێن (أفرودیت)، لای ڕۆمانەکانیش (ڤینۆس)ە ٥ **الزُهَرَةُ**: جێ بەجێکردنی حەزو ئارەزو، دەگوترێ: (قضیت منه زهرتي): کاری خۆم لێ ئەنجام دا ٥ **الزُّهرِيُّ**: نەخۆشییەکی کوشندەو چارنەکراوو گوازراوەیە توشی کۆئەندامی زاوو زێ دەبێ ٥ **الزُهْرِیة**: گۆزەو سوراحی لەسواڵەت دروستکراو، بۆ جوانی گوڵیان تێ دەکرێ (گوڵدان) ٥ **الزَهار**: گوڵفرۆش ٥ بۆ ئافرەتی گوڵفرۆش دەگوترێ:

(زَهَّارة) ٥ المِزْهَرُ: ئـەو دارەی پێـی لەکەمانەکە دەدرێ، یەکێکە لەئامێرەکانی شایی‌و زەماوەند، ئەوکەسەی ئاگر هەڵدەگیرسێنێ‌و میوان بانگ دەکا بۆ داوەت ٥ زَهْزَقَ: بەدەنگی بەرزو بەهێز پێکەنی، بەشێوە زاراوەیەك قسەی کرد کەس لێی حاڵی نەبوو ٥ زَهْزَقَ الصَّبِيُّ: منداڵەکەی هەڵپەڕاند ٥ الزُّهْزَاهُ: لارو لەنجەکەر، بۆ مێینە: (زَهْزاهَة).

**زَهَفَ** زهوفاً: زەلیل بوو، درۆی کرد.

زَهَفَ للموت: لەمردن نزیك بووەوە.

زَهفَ زَهَفاً: خێرا ڕۆیی، گورج‌و گۆڵ بوو.

زَهفَ للشَّيْ: بەخێرایی چوو بۆ شتەکەو گورج‌و گۆڵ‌و چوست‌و چالاك بوو ٥ أزهَفَ: درۆی کرد ٥ فیتنەیی کرد ٥ خێرا بەرەو شەڕ چوو ٥ أزهَفَ به: هەواڵێکی لەکابرا دا خەڵکەکە نازانن ڕاستە یان نا ٥ أزهَفَ بي: خیانەتی لێکردم لەکاتێك دا من بتمانەم پێی بوو ٥ أزهَفَ به: پێی موعجەب بوو ٥ أزهفت اليه فلانة: فلان ئافرەت فلانکەسی توشی سەرسام بوون کرد، وای لێ کرد پێی موعجەب بێ ٥ أزهَفَ عليه: پەلەی کرد لەکوشتنی‌و زوو گیان دەرچوونی ٥ أزهَفَ الشَّيْءَ: شتەکەی برد ٥ فەوتاندی ٥ أزهَفَ فلاناً: فلانکەسی زەلیل کرد، لەمەیدان دا خستی ٥ أزهفت الطعنة فلاناً: برینەکە فلانکەسی گەیاندە لێواری مەرگ ٥ أزهف له حديثاً: قسەی درۆی بۆ هێنا، قسەی خراپی پاڵ دا.

أزهف فلاناً بالشرّ: فلانکەسی هەڵنا بۆ شەڕکردن ٥ انْزَهَفَ: بازی دا ٥ دەستی گەیاندێ‌و لێی دا ٥ تَزَهَّفَ عنه: مەنعی کردو ڕوی لێ وەرگێڕا ٥ اِزْدَهَفَ: بەمانا (زَهَفَ)دێ ٥ إزدهف له بالسيف: بەشمشێر زەبری لێ دا برینداری کرد ٥ ازدهَفَ في كلامه: لەقسەکانی دا دەنگی هەڵبڕی ٥ درۆی کرد زیادەی بەقسەکانەوە نا.

ازدهف عنه: ڕوی لێ وەرگێڕاو مەنعی کرد گەڕاندیەوە ٥ ازدهف الشَّيْءَ وبه: شتەکەی برد ٥ ازدهف فلاناً بالقول: قسەی فلانکەسی پوچ کردەوە ٥ ازدهف له بالخبر: لەهەواڵەکەی زیاد کرد ٥ ازدهف اليه حديثاً: قسەی ناشیرینی پاڵ دا ٥ یان درۆی بۆ کرد ٥ ازدهف فلاناً: فلانکەسی بەسوك زانی‌و سوکایەتی پێکرد ٥ پەلەی کرد، دەشگوترێ: (ما ازدهف شيئاً): هیچی لێ وەرنەگرت.

**زَهَقَ** زهقاً وزهوقاً: پێش کەوت‌و چووە پێش، دەگوترێ: (زَهَقَت الفرسُ): ئەسپەکە پێش ئەسپەکانی تر کەوت.

زَهَقَ الباطلُ: بەتاڵ‌و ناحەق پوچ بۆوەو فەوتا ٥

زهق السَّهمُ: تیرەکە مەبەستی نەپێکاو سەری کرد ٥ زَهَقَت نفسه: گیانی دەرچوو ٥ الزُّهُوق: دەرچوونی شت لەشتێك بەنارەحەتی.

زهق مخ العظم: مۆخی ئێسقانی پڕبوو ٥ أزهق في السير: لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ أزْهَقَ الشَّيْءَ: وای کرد شتەکە لەشتێکی تر بێنێتەدەر یان وابکا شتەکە بفەوتێ‌و نەمێنێ وەکوو دەڵێ (أزهق اللهُ الباطلَ): خودا بەتاڵ‌و ناهەقی لەناوبرد ٥ أزهق السَّهْمُ من الهَدَف: تیرەکە لەهەدەفەکە تێپەڕی کرد ٥ زاهَقَهُ: بەمانا (أزهَقَه)دێ ٥ إنْزَهَقَ: پێشکەوت‌و بردیەوە ٥ الزّاهِقُ: ئاوێك بەتەوژم بڕوا ٥ تێشکاوو دۆڕاو ٥ پێشکەوتو لەکێ برکێ دا ٥ وشك ٥ دەگوترێ: (بئرٌ زاهِقٌ): بیرەکە بنکی قوڵە ٥ الزَّهُوقُ: زەوی تەختان‌و نزم ٥ الزَّهوق: دەگوترێ: (بئرٌ زهوق): بیرێك کەبنکی قوڵ بێ ٥ المَزْهَقَةُ: شوێنی فەوتان‌و لەناو چوونی بەتاڵ، شوێنی گیان

دەرچوونی یان هۆکاری فەوتانی بەتاڵو گیان دەرچون، دەگوترێ: (جَمَلٌ مُزْهِقَةٌ لأرواحِ المطي): حوشترێکە ڕۆح کێشەری ولاخە سوارییەکانە ٥ هەر هەوڵ دەدەنو نایگەنێ ٥ زَهَكَهُ: ترنجاندیە نێوان دوو بەردەوە.

**زَهَكَ** الريحُ الأرضَ (أو التراب عن الأرض): ڕەشەبایەکە زەوی ماڵی، یان گڵو خۆڵی لەڕوی زەوی دا ڕادا.

**زَهَلَ** زَهْلاً: دڵی ئارامی گرت ٥ (زهل عنه): لێی دورکەوتەوە.

زَهِلَ زَهَلاً: سپیو لوس بوو ٥ الزُهلُولُ: شتی لوس جا هەرچییەك بێ ٥ مار کە ملی توکی لی هاتبێ (باڵی هەبن).

**زَهَمَ** العظمُ زَهْماً: ئێسقانەکە مۆخی تێکەوت.

زَهَمَ فلاناً: زۆری قسە لەسەر فلان کرد ٥ لێی تورە بوو ٥ زَهِمَتْ يَدُهُ زَهَماً: دەستی چەور بوو ڕۆناوی بەدەستیەوە بوو، فەڵەو بوو گۆشتو بەزی سەریەك نا ٥ أزهَمَ العَظْمُ: بەمانا (زَهِمَ)دێ ٥ أزْهَمَ الشَّيْءَ: لەشتەکە نزیك بووەوە بەلام نەیگەیشتێ، دەگوترێ: (أزهَمَ الأربعين أو الخمسين): نزیك چل ساڵی بووەوە بەلام نەبوو بەچلی تەواو نزیك پەنجا بۆتەوەو پەنجای تەواو نەکردوە ٥ زاهَمَهُ: لێی نزیك بووەوە (زاهم في السير): لە ڕۆیشتن دا لێی نزیك بووەوە، یان دەگوترێ: (زاهم في البيع): لەمامەڵەکە دا لێی نزیك بۆوە، دیقە دیقەی دا ٥ دژایەتی کرد ٥ لێی جیابۆوە ٥ الزُّهْمُ: بای بۆگەن ٥ پیوی ئاژەڵی کێوی بێ ئەوەی بۆگەنی لێ بێ بۆنێکی خۆشی ناسراو بە (الزُّباد)ە ٥ ئاژەڵێکی کێوی هەیە پێی دەگوترێ: (سِنَوْر الزَّباد) لەژێر کلکی لەنێوان هەردوو کونی پیسایی دا کیسێکی هەیە مادەیەکی تێدایە میسك ئاسا بۆنی خۆشی هەیە ٥ الزَّهَمُ: بۆگەنی لاکە تۆپیو ٥ پێوی ئاژەڵی کێوی ٥ باقی ماندەی پیو لەلاشەی ئاژەڵ دا ٥ الزُّهْمَةُ: بای بۆگەن ٥ الزُّهُومَةُ: بەمانا (الزُّهْمَةُ) دێ.

**زَها** زَهْواً وزُهُواً: خۆی بەمزلزانیو تەکەببورو شانازی کرد.

زَها السراجُ وغيره: چراکە روناکی دا ٥ (زها اللون): ڕەنگەکە صافو درەوشاوە بوو ٥ (زها البُسْرُ): هێشوە خورماکە ئاڵو بوڵی تێکەوت دەنکی سورو زەردی تێکەوتن.

زها الزَّرعُ: کشتوکاڵەکە گەشەی کردو ڕاسا.

زها الغلامُ: کوڕەکە ڕەسیدە بوو گەیشتە تەمەنی گەنجی.

زها النباتُ: ڕوەکەکە درێژ بوو پێگەیی.

زها الشَّيْءُ فلاناً زهواً: شتەکە فلانکەسی سوك کرد.

زها الكِبرُ فلاناً: خۆ بەمزلزانی وای لەفلانکەس کرد بەخۆی موعجەب بێ.

زها السرجُ وغيره: چراکەی هەڵگیرساند، شۆقی دایە چراکە.

زها الطَّلُّ الزَّهرَ: بارانەکە ڕەونەقی دا بەگوڵەکەو گەشاندیەوە.

زها السَّرابُ الشَّيْءَ زهواً: تراویلکەکە شتەکەی بەرزرکردەوە.

زها الريحُ النباتَ والشجرَ: بایەکە ڕوەك یان درەختەکەی دوای بارانو شەونم ڕاوەشاندو هەژاندی.

زها السفينةَ: کەشتییەکەی لێخوڕی.

زها المُرْوِحُ المِرْوَحةَ: موشەدەمکەر موشەدەمەکەی خستەکار.

زها الشَّيْءَ: شتەکەی ئەندازە گرت.

**زَهِيَ** الشَّيْءُ: ڕوخساری شتەکە جوان بوو.

**زَهي** على الناس: شانازی بەسەر خەڵکدا کرد ◊ **أزهَى**: بەمانا (زَهِيَ)دێ ◊ **أزهى البُسْرَ**: بەمانا (زَهَا)دێ ◊ **أزهى النباتُ**: بەمانا (زَهَا)دێ ◊ **زهِيٌّ البُسْرُ**: هێشوە خورماکە ئاڵو بۆڵی تێکەوت ◊ **زَهِيٌّ المِرْوَحَة**: پانکەکەی خستە ئیش ◊ **ازْدَهَى**: کەمێك هەستی کرد بەخۆنازین، کەم شانازی کرد ◊ **الزُّهَاءُ**: (زُهَاءُ الشَّيْءِ): ئەندازەی شت یان نزیك لە ئەندازەی شت، دەگوترێ: (هو زُهاء ألف): ئەوانە بەئەندازەی هەزارکەسن یان نزیك بەو ژمارەیەن ◊ **الزَّهْوُ**: تەکەببور ◊ روخساری جوان ◊ ڕەوەکی تەڕو تازە ◊ هێشوە خورمای ئاڵو بۆڵ تێکەوتوو.

**زَابَ** الماءُ زوباً وزوباناً: ئاوەکە ڕەوان بوو.

زاب فلان: فلان خۆی دزییەوەو هەڵات ◊ **الميزابُ**: پلوسك ◊ ڕێڕەوی ئاوی سەربانی ماڵ ◊ **زَوَّبَرَ الثَّوْبُ** ونحوه: قوماشەکە پرزو پاڵو شتی وای لەسەر دیاریی دا ◊ **الزِّوبَرُ**: ئەو پرزوپاڵەی لەسەر قوماشی تازە دەردەکەوێ.

**زاجَ** بينهم زَوْجاً: دەمەدەمەی دانو هەڵێنان ◊ **أزوجَ بينهما**: بەرامبەری خستە نێوانیانو پێکی گرتن ◊ **زاوجَهُ مزاوجة وزواجاً**: تێکەڵاوی کردن ◊ **زاوج بينهما**: پێکی گرتنو بەراوردی کردن ◊ **زَوَّجَ الأشياءَ تزويجاً وزواجاً**: شتەکانی لێك نزیك کردنەوەو جوتی کردن ◊ **زَوَّجَ فلاناً امرأةً**: وای لەفلانکەس کرد ئافرەتەکە مارەبکا ◊ **ازْدَوَجا**: لێك نزیك بوونەوە، بونە هاوسەری یەکتری ◊ **ازدوج القوم**: هەندێ پیاوی گەلەکە هەندێ ئافرەتی گەلی خۆیان مارەکرد ◊ **ازدوَجَ الكلامُ**: قسەکان هەندێکیان لەهەندێکیان دەچوون لەبواری سەجعو کێش دا ◊ **ازدوج الشَّيْءُ**: شتەکە بوو بەدوو.

**تزاوجا**: یەکتریان مارەکرد ژنو پیاوەکە بوون بەهاوسەری یەکتر ◊ **تزاوجَ القومُ**: خەڵکەکە هاوسەرگیریان کرد ◊ **تَزَوَّجَ الكلامُ**: قسەکان لەبواری سەجعو کێش دا لێك چوون ◊ **تَزَوَّجَ امرأةً وبها**: ئافرەتەکەی مارەکرد کردی بەهاوسەری خۆی ◊ **الزَّاجُ**: کبریت ◊ **الزَّوَاجُ**: هاوسەرگیریی‌و جوتبوونی مێردو ژنە ◊ یان جوتبوونی نێرو مێ ◊ **الزَّوْجُ**: هاوسەر (مێرد بێ یان ژن بێ) ◊ بۆ هەردوکیان بەکاردێ ◊ شتو پێچەوانەی شت وەکوو (تەڕو وشك، نێرو مێ، شەوو ڕۆژ، تاڵو شیرین، ◊..هتد) ئەمانە بەشێوەی موثەننا وشەی (زوج) یان بۆ بەکاردێ ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ ◊ هەروا وشەی (زَوْج) بەمانا پێڕو تاقمو جۆردێ ◊ **الزَّوْجَةُ**: ژنی پیاو (ئافرەتی مێردار) ◊ **الزَّوجِيَّةُ**: بەمانا (الزّواج)دێ، دەگوترێ: (بينهما حق الزّوجية): لەنێوانیان دا مافی هاوسەرییەتی هەیە ◊ **المُزَاوَجَة**: قاعیدەیەکی عیلمی بەدیعە ◊ **المِزْوَاجُ**: پیاوێك زۆر ژن بهێنێ یان ئافرەتێك زۆری شو کردبن ◊ **المُزْدَوَجُ**: شتێك دولایەنی هەبن، دوجۆری تێدابن ◊ (مُزْدَوَجُ الثمر): لەزانستی ئەحیادا ڕوەکێکە دوو جۆر میوەی صیفات جیاجیا بگرێ یان لەدوو وەرزدا میوەی هەبێ ◊ (مزدوج اللون): ڕوەکێکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ بگرێ.

**زاحَ** عن المكان زوحاً وزواحاً: لەوشوێنە لاچوو نەما ◊ دوورکەوتەوە.

زاح الشَّيْءَ زَوْحاً: شتەکەی دوور خستەوە.

زاح الإبلَ وغيرها: حوشترەکانی لێك بڵاو کردن ◊ **أزاحَهُ**: دووری خستەوە.

**زاد** زوداً: تێشوی ئامادەکرد ٥ **أزادَهُ**: تێشوی پێ دا ٥ **زَوَّدَهُ**: تێشوی پێدا، دەشگوترێ: (زودتە کتاباً الى فلان): بەنوسراوێک بۆلای فلانکەس پشتگیریم لێ کرد ٥ **تَزَوَّدَ**: تێشوی هەڵگرت، دەشگوترێ: (تزوَدَ من الأمیر کتاباً الى عامله): لەپاشاوە نووسراوێکی وەرگرت بۆ کاربەدەستەکە تایارمەتی بداو ئیشی بڕوا ٥ **الزّاد**: خواردنو بژێوێکە بۆ سەفەرو کاروان دەبرێ ٥ ئەو کردەو گوفتارانەیە ئادەمیزاد لەژیانی دا دەیانکا ٥ **المِزوَدُ**: هەمبانە، تورەکەیەکە تێشوی تێ دەکرێ ٥ **زارَهُ زَوْراً وزیارةً ومزاراً**: دیدەنی کرد لەماڵەوە چوو بۆلای بۆ ڕابواردنو گفتو گۆ یان بۆ دابینکردنی پێداویستی.

**زَوِرَ** زَوَراً: سنگی خواربوو، لایەکی لەلایەکی بەرزتر بوو ٥ **أزارَ الشّیْءَ**: هەڵینا بۆ دیدەنی کردنی شتەکە، دەشگوترێ: (أزَرْتُهُ ثنائي وقصائدي): مەدحو شیعرەکانم ئاراستەی ئەو کردن ٥ **زَوَّرَ الطائرُ**: باڵندەکەی ئەوەندەی خوارد چڵێدانەی پڕ بوو بەرز بووە هاوسا ٥ **زَوَّرَ الشّیْءَ**: شتەکەی چاك کردو ڕاستی کردەوە بەباشی کردی ٥ جوانی کرد، ڕازاندییەوە ٥ **زَوَّرَ الشهادة ونحوها**: بڕیاری دا شایەتییەکە یان فلان شت تەزویرە، ناڕاستە ٥ **زَوَّرَ علیه**: قسەی ناڕاستی لەسەر کردن ٥ درۆی پاڵ دا ٥ **زَوَّرَ امضاءَهُ أو توقیعه**: لاسایی واژۆی ئەوی کرد ٥ **زَوَّرَ الزائرَ**: پاساوی دیدەنی کرنەکەی بەباشی دایەوەو ڕێزی لێ گرتو پێشوازی باشی لێ کرد ٥ **زَوَّرَ الأسیرَ ونحوه**: حەبلی تایبەتی لەمەچەکی دیلەکە کرد بۆئەوەی شەتەکی بداو برستی لێ ببڕێ ٥ **تَزاوَرَ الناسُ**: خەڵکەکە هەندێکیان دیدەنی هەندێکیانی کرد ٥ **تَزاوَرَ عنه**: لێی لا دا ٥ **تَزَوَّرَ**: قسەی درۆی گوتن ٥ **تَزَوَّرَ الکلامَ**: قسەی هەڵبەست ٥ **إسْتزاره**: داوای لێ کرد تەزویری بۆ بکا.

**إزْوَرَّ عنه**: لای دا، ڕێبازی خوارکرد ٥ **إزْوَرَّ عنه**: لای داو ڕێبازی خوار کرد ٥ **إزْوارَّ عنه**: بەمانا (إزْوَرَّ)دێ ٥ **الزّاکَرُ**: ئاهەنگێکی سەمایە ڕێك دەخرێ بۆ دەرکردنی گیانە پیسەکان کەبەبڕوای ئەوان مەسسی جەستەی هەندێ کەس دەکەن ٥ **الزّارَةُ**: کۆمەڵێ زۆری ئادەمیزاد ٥ چڵێدانەی باڵندە ٥ **الزاوِرَةُ**: حەبلێکە هەردوو دەستی دیلی بەسنگییەوە پێ شەتەك دەدرێ ٥ هەرشتێك چاکسازو ڕێکخەری شتێکی تربێو پارێزەری بێ ٥ **الزَّوْرُ**: چاوگی (زارَهُ)یە ٥ شوێنی بەیەکگەیشتنی ئێسقانی سنگە، ئەو ئێسقانەی لەسنگەوە بەرز بۆتەوە بۆ شان ٥ هەروا وشەی (ألزّور): بەمانا هێزو توانایە بەمانا عەقڵو ئاوەزە، بەمانا عەزیمەتو ورەبەرزییە ٥ **الزّورُ**: بەتاڵو پوچ، شایەتی درۆ ٥ درۆ ٥ کۆڕی لەهوو گۆرانیو سەما ٥ **الزُّورُ**: سەیرکردن بەقولینچکی چاو ٥ **الزَّوراءُ**: دوور، دەگوترێ: (فلاة زوراء): سارایەکی دوور ٥ (أرض زوراءُ): زەوییەکی دوور ٥ (وبئرٌ زوراء): بیرێکی قوڵە بنکی دیارنییە ٥ هەروا ناوێکی شاری بەغدایە، یەکەم ڕۆژنامەش کەلەبەغدا دەرچووە ناوی (الزَّوراء) بووە ٥ **ألزَّوْرَةُ**: یەکجار دیدەنی، دوریی ٥ **الزِّوَرُ**: بەهێزو توانا چ ئادەمیزاد بێ یان گیانلەبەری تر ٥ ڕۆیشتنی خێرا ٥ **الزُّوّارُ**: کەسێك زۆر دیدەنی کەسێك یا شوێنێك بکا ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (الزّوّارةُ) ٥ **الزَّیّارُ**: بەمانا (ألزّوّار) دێ ٥ **الزِّیرُ**: کەسێك زۆر بچێ بۆ دیدەنی ئافرەتو حەزی لێ بێ لەگەڵیان

دابنیشێو گفتو گۆیان لەگەڵ بکا، دەگوترێ: (فـلان زیـرُ نِـساءٍ): فلانکـەس مێبـازە ٥ داب‌و نـەریت ٥ وەتـەری بـاریکی کـەمان ٥ کـەتان ٥ مەرکانـەی ئـاو (جـەرەی ئـاو) ٥ کوپـەی ئـاو ٥ المَـزارُ: شـوێنی زییـارەتکردن ٥ هـەر گـۆڕو ئارامگایەك خەڵکی لەروی پیرۆزییەوە زیارەتی بکەن ٥ تَزَوْرَقَ: بروانە مـادەی (زَرَقَ) ٥ الزُّوْرَقُ: بروانـە مـادەی (زَرَقَ) ٥ زَوْزَكَ: بروانـە مـاددەی (زَزَكَ) ٥ زَوْزَى زَوْزاةً: پـشتی راسـت کـردەوەو پەلـەی کـرد لـەبازدان ٥ زَوْزَى فلاناً: فلانکەسی بەهیچ و پوچی لەقەڵەم داو دەری کرد.

**زاعَ** لحمُـــهُ زَوْعـــاً: گۆشـــتەکەی لـــەدەمارەکانی جیابووەوە.

زاعَ الشَّيءَ: شتەکەی پێش خست ٥ (زاعَ البعيرَ): حوشترەکەی راپەڕاندو دەنەدەنەی دا.

زاعَ الرِّيحَ وشِبْهَهُ: بەدەست ترێتەکەی کێشکرد بـۆ خـۆی.٥زاعَ الـشَّيءَ: شـتەکەی دولاهێنایـەوە ٥ مەنعی کردو گێڕایەوە.

زاعَ لفلانٍ زوعـةً مـن الطـبخ: قاشـە کاڵەکێـکی بـۆ فلان بڕی ٥ تَزَوَّعَ اللحمُ: گۆشتەکە لەدەمارەکە بۆوە ٥ لەسەر ڕەگەکە لاچوو ٥ الزَّاعةُ: یەکـەم دەسـتەی پێـشمەرگەو گیانبەختکـەری بـەرەی جـەنگ ٥ الزَّوْعَـةُ: قاشـە کاڵـەك‌و شـتی وا ٥ الزُّوْعَةُ: جوست‌و چالاك‌و خۆشڕۆ ٥ کۆمەڵێـك ئـادەمیزاد ٥ پارچـە گۆشـت ٥ دەسکێـك گیـا ٥ دەسکە گوڵ‌و ڕێحانە.

**زاغَ** زَوْغاً وزَوَغاناً: لەمەبەست لایدا.

زاغَ عن الطريقِ: لەرێگە لای دا.

زاغَ في منطقه: قسەی ناخۆشی کردن.

زاغَ الشَّيءَ زَوْغاً: شتەکەی خوارکردەوە.٥زاغَ الناقةَ: حوشترەکەی بەرێشمە ڕاکێشا ٥ أزاغَـهُ: وای لـێ کـرد لابـدا ٥ الـزَّاغُ: جـۆرە قەلەرەشـەیەکە پێـی دەگوترێ: (الغراب الزرعيّ) و(غـراب الزيتـون): چونکە زەیتون دەخوا، لە کۆتر بچوکترە رەشـە، سـەری خـاکی‌و مەیلـەو سپییە، گۆشـتی لاك‌و شـــتی وا نـــاخوا، لەخۆرهـــەڵاتی ئـــەوروپاو تورکستان‌و ئێران دەژێی‌و هەندێـکی ڕەودەکا بۆ وڵاتی فەلەستین‌و میصر.

**زافَ** الطـائِرُ في الهـواءِ زَوْفـاً وزُءوفـاً: باڵندەکـە بەهەوادا فڕی‌و هەڵەقی لێ دان.

زافَ الغلامُ: کوڕە گەنجەکە بازی داو خولایەوە.

زافَ الماءُ: ئاوەکە بڵقی لەسەر دەرکەوتن.

زافَ الحمامـةُ الـذكرُ عنـد الحمامـةِ الأنثـى: کـۆترە نێرەکـە لای کـۆترە مێیەکـە بـاڵی خـۆی فـش کـردن لەســەر زەوی خـشاندنی.٥زافَ فـلانٌ: فلانکـەس ڕۆیـی بـەلۆژە لۆژ هـەموو جەسـتەی داهێزرابـوو ٥ تَزاوَفَ الغِلمـانُ: منداڵـەکان یـاری (التـزاوف)یـان کـرد بـەم جـۆرە یەکێـکیان دێ دەسـت دەخاتـە سـەرگەناری سـەکۆکە، ئـەمجار زۆر بەگوڕ بازێك بەرەو حەوا دەداو بەحـەواوە خـۆ هەڵـەوگێڕ دەکـاو دێتـەوە شـوێنی خـۆی، بەمەش پراوەی ئەوە دەکەن خۆیان فێری خـۆ هەڵدانە سەرپشتی ولاخ بکەن.

الزُّوافُ: دەگوترێ: (موت زوّاف): مردنێـکی خێـرا ٥ الزُّوفـی: مادەیـەکی لیـنج‌و لەزگـە ئاسـایە دەنووسـێ بـەخوری مـەڕو مـوی بزنـەوە، بەتایبـەتی لـەوڵاتی ئەرمینیـەدا، بـەزۆری بـۆ چارەســەری شـێرپەنجە بەکاردەهێنــدرێ ٥ ڕوەکێـکی تەمـەن درێـژە لـەبواری پزیـشکی دا بەکاردەهێنـدرێت، گەڵاکـەی بۆنێـکی خۆشـی هەیەو تـامی تیـژەو دەخورێ ٥ زَوَّقَهُ: بـەجیوە (زیبـەق) زەرکـەفتی کـردو جـوانی کـرد، دەگوترێ: (زَوَّقَ العروسَ): بوکەکەی رازانـدەوە

٥ (زَوَّقَ كلامَهُ): قسەكانى ڕازاندنەوەو جوانى گوتن ٥ **زوّقَ المسجدَ**: مزگەوتەكەى ڕازاندەوە بەنەخشو نيگار ٥ **زوّقَ الكتابَ**: كتێبەكەى زەركەفت كرد ٥ **التزويقُ**: جوانكردنو ڕازاندنەوە، كارى سەرەكى لەم بوارەدا ئەوەيە جيوە لەگەڵ ئاڵتون تێكەڵاو بكرێو ئەمجار شتەكەى پێ زەركەفت بكرێ پاشان بخرێتە ناو ئاگرەوە جيوەكە دەبێتە هەڵمو دوكەڵو بەحەوادا دەچێو ئاڵتونەكە دەمێنێتەوە، بەڵام پاشان وشەى (تزويق) بەكارهێنراوە بۆ هەموو شتێك كە نەخشو نيگارى تێدا بكرێو هەركەس خەريكى نەخشو نيگار كردن بێ پێى گوتراوە (مُزَوِّق)، هەرچەندە جيوەش بەكارنەهێنن ٥ **الزّاووق**: جيوە، زئبەق ٥ **الزّواق**: جوانى ئافرەت، خشڵى ئافرەت ٥ **الزَّوَقَةُ**: ئەوانەى هەڵاشى خانوو زەخرەفەو نەخشو نيگار دەكەن ٥ **الْمُزَوَّقُ**: دەگوترێ: (شعر مُزَوَّق): قژى پاكو خاوێنو بەشانە كراو.

**زَاكَ** زَوْكاً وزَوَكاناً: شانى هەڵتەكاندنو سمتى بادانو لەراندنيەوە لەكاتى ڕۆيشتن دا قاچى لێك بڵاوكردن ٥ لارو لەنجەى كردو خۆى ڕاوەشاند ٥ **أزْوَكَ**: ڕۆيشت وەكوو ڕۆيشتنى كورتە باڵا ٥ **تزاوك**: شەرمى كرد.

**زَالَ** زوالاً وزولاناً: گواستيەوە لەشوێنى خۆيەوە چووە شوێنێكى تر، بجوك بۆوە پوچايەوە، نەما ٥ **زالت الشمسُ**: خۆر لەنێوە ڕاستى ئاسمان لاى دا ٥ **زال النهارُ**: ڕۆژ ڕابورد نزيكە شەو دابێ ٥ **زالَ** الخيلُ بركبانها: ئەسپەكان بەسوارەكانيانەوە بازيان دا.

**زال** السَّرابُ بالشخص: تراويلكەكە شتەكەى بەرز كردەوەو هاتوچۆى پێ كرد، دەگوترێ: (أرَى النجومَ تزول ولا تغيب): لەپێش چاوم ئەستێرەكان دەدرەوشێنەوەو جمو جوڵيانە كەچى ئاوانابن.

**زالَ** زوالَهُ: خودا لەناوى بەرێ، داوەشێ نەمێنێ (دوعا لێكردنە) ٥ **أزالَهُ**: دوورى خستەوە، دەگوترێ: (أزالَ الله زوالَهُ): دوعا كردنە لێى بەفەوتانو لەناوچوون ٥ **زاوَلَهُ مُزاولةً وزِوالاً**: دەستى دايەوە كارەكە دەست بەكاربوو ٥ **زَوَّلَهُ**: بەمانا (أزالَهُ)دێ ٥ **إنْزالَ**: بەمانا (زالَ)دێ. (إنزالَ عنه): لێى جيابۆوە ٥ **تَزَوَّلَ**: عاقڵ بوو ٥ ئازا بوو، چوستو چالاك بوو ٥ **اسْتَزالَهُ**: چاوە ڕوانى فەوتانو لاچونى كرد ٥ **الزّائِلُ**: جەنگەى نيوەڕۆ ٥ (ليل زائل النجوم): شەوى درێژ ٥ **الزائلة**: مێينەى (ألزّائل) ٥ هەرچى گيانى لەبەر بێ ٥ هەرچى بجوڵێتەوە، دەگوترێ: (زالت لە زائلة): كەسێكى بينى، شەخسێكى هاتە بەرچاو ٥ **الزّوائِلُ**: نێچير ٥ ئافرەت، دەگوترێ: (فلان يرمي الزوائل): فلانكەس چاك دەزانێ دڵى ئافرەت بۆلاى خۆى كێش بكاو نێچيرى خۆى بگرێ ٥ ئەستێرە، لەو ڕووەوە كەلەخۆر هەڵاتەوە بەرەو خۆر ئاوا دێ لە هەڵخولانو دەوەرانى خۆى دا.

**الزّوال**: جەنگەى نيوەڕۆ، ئەوكاتەى خۆر لەهێڵى ئيستيوا لادەدا ٥ **الزَّوْلُ**: چوستو چالاك ٥ زيرەك ٥ شەخص ٥ ئازاو نەبەردى وەها خەڵك قەلاچۆ بكا ٥ بازو هەڵۆ ٥ دەشگوترێ: (هذا زَوْلٌ من الأزوال): ئەمە عەجايبێكە لە عەجايەبەكان ٥ **الزَّوْلَةُ**: مێينەى (ألزّول)، دەگوترێ: (شَتْوَة زَوْلَةٌ): زستانێكى عەجايەبە لەساردو سەرمايى دا ٥ ئافرەتێك زۆر خۆنيشانى پياو بدا ٥ **المِزْوَلَةُ**: سەعاتى زەوالى كەكاتى پێ ديارى دەكرێ بەهۆى ئەو سێبەرەى كاتەكەى لەسەر ديارى دەكرێ.

**زَامَ** زَوْماً: مرد ٥ بەرقەوە تەماشای کرد ٥ دۆنە دۆن و مۆنە مۆنی بوو کەس نەیزانی دەڵێ چی ٥ **الزَّامُ**: چواریەکی شت، دەگوترێ: (مضى زام من النهار أو الليل): چواریەکی رۆژ یان شەو رۆیشت ٥ (مضى زامان منه): نیوەی رۆیی ٥ **الزَامة**: پێرو تاقم و گروپ ٥ **الزُّوِيمُ**: کۆبوەوە لەهەرشتێك بێ.

**زِينَ** البُرُّ: گەنمەکە مرۆراویی بوو مرۆری تێکەڵ بوو.٥ **الزَانُ**: هەلاّوسان و قەڵەوی، ٥ درەختێکە گەورەو بەرزە چل مەتر بەرز دەبێتەوە، دارەکەی پتەوە زۆربەی کاڵای ناوماڵ لەودارە دروست دەکرێ ٥ **الزَانَةُ**: شتێکە لەرمب کورترە ئامێری شەڕە، کاتی خۆی چەکی دەیلیمیەکان بووە ٥ **الزُوَانُ**: مرۆر، بڕوانە (الزُّءَان) ٥ **الزُوْن**: بت و صەنەم، هەرشتێك جگە لەخودا پەرستشی بۆ بکرێ، شوێنێك بتی تێدا کۆدەکرێنەوە تێیدا هەڵدە نرێن ٥ **أزْوِي**: هات و یەکێکی تریشی لەگەڵ دا بوو ٥ **الزَوُّ**: دوو هاوڕێ و هاوشان، دەگوترێ: (جاءَ زوًّا): ئەو دووە بەیەکەوە هاتن ٥ هەروا دەگوترێ: (كان تَوّاً فصار زَوّاً): تەنها بوو بوو بەجوت ٥ ئەندازە روداوو کارەساتی مردن، دیاردەی گیانەلاّو ٥ **زَوَاهُ زيّاً**: بردی، شتەکەی لەگەڵ خۆبرد، دەگوترێ: (زوى الدهرُ القومَ): رۆژگار ئەو نەتەوەیەی لەگەڵ خۆی ڕادا.

**زَوَى** المالَ: ماڵەکەی هەڵبژارد.

**زَوَى** السرّ: نهێنییەکەی شاردەوە.

**زَوَى** الشَيْ: شتەکەی کۆکردەوە، وەری گرت.

**زَوَى** مابين عينيه: نێوچاوانی بەیەکدا داو گرژ بوو.

**زَوَى** الشيءَ عنه: شتەکەی لێ لاداو دووری خستەوە ٥ **زَوِّي**: کەوتە سوچی خانوەکەوە ٥ **زَوِّي الشَيْءَ**: شتەکەی پێچایەوە، کۆی کردەوە وەری گرت ٥ **زَوِّى الكلامَ في نفسه**: لەدڵی خۆی دا قسەکەی گۆڕی ٥ **زَوِّى الحرف**: پیتەکەی بەدەنگی (زای) لەدەم هاتەدەر ٥ **زَوِّى الزّايَ**: نوسیەوە ٥ **إنْزَوَى**: کەوتە سوچی خانوەکە ٥ وێکهاتەوە، کۆبووەوە ٥ **إنْزَوَى القومُ بعضهم الى بعض**: خەڵکەکە لێك نزیك بوونەوە ٥ **تَزَوَّى**: بەمانا (إنْزَوَى)دێ ٥ **الزَاوِيةُ من البِناءِ**: سوچی خانوو، چونکە دولادیوار یەك دەخاتەوە ٥ گۆنیا ٥ **المِزْواةُ**: ئامێرێکی وردە وەستای بیناسازیی بەکاری دێنن بۆ ئەندازەگرتنی سوچ و قولینچکی خانوو ٥ **تَزَيَّبَ لَحْمُهُ**: گۆشتی کەوتە سەریەك و قەڵەو بوو ٥ **الأزْيَبُ**: کورتە باڵای گۆشتن و هەنگاو کورت ٥ بای باشور ٥ بایەك لەنێوان بای باشورو شەماڵ دایە، ڕەشەبا ٥ ترس ٥ دوژمنایەتی.

**زَاتَ** الطعامَ وغيره: زەیتی کردە ناو طەعامەکەوە.

**زَاتَ** الجِلْدَ وغيره: پێستەکەی بەزەیت هەنوو.

**زاتَ** فلاناً: زەیتی دەرخواردی فلانکەس دا ٥ **أزات فلانٌ**: فلان زەیتی لەلا زۆر بوو ٥ **زَيَّتهُ**: بەمانا (زاته)دێ ٥ **زَيَّتَ فلاناً**: زەیتی بۆ فلان نارد ٥ **زَيَّتَ الآلةَ**: زەیت یان بەزو جەوری تری کردە نێوان دوو قەبارەی لێك خشاو بۆئەوەی زەختی لێك خشانەکە کەم بکاتەوە ٥ **استزات**: داوای زەیتی کرد ٥ **الزَيتُ**: رۆنی زەیتون ٥ هەروا بەهەموو رۆنێك دەگوترێت زەیت، بەرهەمی ٥ **الزَيَّات**: زەیت فرۆش ٥ زەیت گوش ٥ **الزَيتون**: درەختێکە بەردارە، بەرەکەی دوای سوێرکردنی دەخورێ، زەیتیشی لێدەردەهێندرێ ٥ **الزَيْعُ**: هەرکتێبێك، جەدوەلی فەلەکی تێدابن و چۆنیەتی رۆیشتنی ئەستێرەکان دیاریی بکاو بەهۆیەوە ساڵنامەو

تەقویم دیاریی بکرێن ◊ تەنافی وەستای بینا سازیی.

**زَاحَ** زَيحاً: دوور کەوتەوە ڕۆیشت ◊ **أزاحَهُ**: لای برد، دەگوترێ: (أَزَاحَ اللهُ عِلَّتَهُ فزاحت): پەروەردگار نەخۆشییەکەی لابردو شیفای دا ◊ **إنـزَاحَ**: لاچوو.

**زَادَ** زيداً وزيادةً: زیادبوو گەشەی کرد.

زاد الشَّيَ: شتەکەی والێ کرد زیاد بێ.

زادَ فلاناً خيراً: خێرو بەرەکەتی دا بەفلان.

زَايَـدَهُ: بەر بەرەکانی کرد لەزیاد کردن دا، زەمو زەمکاریی کرد ◊ **زَيَّدَ**: بەمانا (زادَ)دێ ◊ **تَزَايَـدَ**: بەمانا (زادَ)دێ ◊ زاد مـن قوله أو فعله: زیاد لەپێویست قسەی کرد یان زیاد لەپێویست کاری کرد ◊ **تَزَايَدَ الناسُ في السلعة وعليها**: خەڵکەکە لەنرخەکەیان زیادکردو زەمیان بەسەر یەکترەوە کرد تا نرخەکەیان گەیاندە ئەوپەڕی، دەشگوترێ: (تَزَيَّدَ الجملَ في سيره): زیاد لەتوانای حوشترەکە هەلینگی داو زەختی لێ کرد ◊ **إزْدَادَ**: بەمانا (زَادَ)دێ، (إزداد شيئاً له): شتەکەی بۆ خۆی زیاد کرد ◊ **إزْدَادَ فلاناً**: داوای زێدەی لەفلانکەس کرد ◊ **الزَّائِـدُ**: دەگوترێ: (أخـذه بدرهم فزائداً) بەدیرهەمێك کڕیو زیاتریش ◊ **الزَّائِـدَةُ**: مێینەی (الزائـد)ە ◊ هەروا ناوە بۆ ڕیخۆڵە کوێرە ◊ لەقەبی شێرە، شتە زەوائیدەکانیشی چنگو نینۆكو هەڵمەتو نەرمیەتی ◊ **زوائد الأسنان**: ئەو ددانەیە لەتەنیشت ددانی ترەوە دەڕوێ ◊ **الزيـادة**: ئەوەی لەشتەکە زیادە ◊ (زيادة الكبد): زێدەکەیەتی ◊ (حروف الزيادة): پیتەکانی (سالتمونيها) یان (أليوم تنساها)ن ◊ **الزَّيْدِيَّة**: تاقمێکن لەشیعە پاڵ زەیدی کوڕی عەلی دەدرێنو لەوڵاتی یەمەن ڕێبازی ئەوان پەیڕەو دەکرێ، بڕوایان وایە ئیمامەت دەبێ لەوەچەو نەوەی عەلی کوڕی ئەبوطالبو فاطیمەی خێزانی بێ ◊ **اَلْمَـزَادُ**: مەزاتخانە؛ شوێنی فرۆشتنی کالا لەهەراجخانە بەشێوەی زەمو زەمکاریی بۆئەوەی لەمئاکام دا کالاکە لەسەریەکێك لەبەشدارانی مەزادەکەدا ڕاوەستێ ◊ (ثمن المزاد): ئەو نرخەیە کەلە مەزادەکەدا کالاکە لەسەری دەوەستێ ◊ **اَلْمَزَادَةُ**: هەمبانە، توێشودانی کاروانیو ڕێبوار.

**زَأَرَ** الدَّابَّـة زيـراً: حەبلو هەوساری لەسەری ولاخەکە بەست ◊ **زَيَّـرَ الدابَّـةَ**: بەحەبل ولاخەکەی بەستەوە ◊ **الزِّيـرُ**: بڕوانە مادەی (زَوَرَ) ◊ **الزِّيَارِيَّة**: پەلەکردنو خێرایی ◊ **الزِّيزاءُ**: زەوی ساغو پتەو ◊ تەپۆڵکە ◊ پەری باڵندە ◊ **الزَّيْزَفون**: حوشتری خۆشڕەوی چوستو چالاك ◊ درەختێکە خودی دارەکە سپییە بەتەڕی دەخورێ، گوڵێکی سپی هەیە بەری نییە، لەگوڵەکەی شەراب دروست دەکرێ ◊ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (كالزيزفون يزهر ولايثمر): وەکوو درەختی زەیزەفۆن وایە گوڵ دەردەداو بەرناگرێ، بەکەسێك دەگوترێ وادە بداو پابەندی وادەکەی نەبێ.

**زَاطَ** زيطاً وزياطاً: هاواری کردو قیراندی قیژاندی ◊ قیڕەو هەرای کرد.

زاطَ النـاسُ: خەڵکەکە غەڵبە غەڵبیان کرد ◊ **الزِّيَاط**: جەڕەسی بچوك، فیتفیتۆکە ◊ **الزِّيطَة**: یەکجار هاوارکردنو قیرە ◊ قیڕەو هەراو زاوەزاو.

**زَاغَ** عنه زيغاً: لای دا، مەیلی کرد خواربوو، دوورکەوتەوە، دەگوترێ: (زاغت الشمس): خۆر بەلای ئاوابون دا ڕۆیی.

زاغ عن الطريق: لەڕێگە لایدا.

زاغَ البصرُ: چاو حەبەساو شتەکەی لی تێکەڵو پێکەڵ بوو ٥ أزاغَهُ: وای لی کرد رێگەی لی گوم ببێو لەرێبازی راست لابدا ٥ زَيْغُهُ: خواری کردەوە ٥ خوارییەکەی ڕاست کردەوە ٥ الزَّيغُ: لادان لەحەقو ڕاستی ٥ زافت النقود زَيْفاً وزيوفاً: دراوەکە تەزویرو غەشی تێدابوو پارەکە پوچ بوو.

**زاف** في مشيته زيفاناً: پەلەی کردو لای دا ئەملاو ئەولای کرد ٥ خۆی باداو لەنجەو لاری کرد.

زاف الحمامة الذكرُ عند الحمامة الأنثى: کۆترە نێرەکە لای کۆترە مێیەکە باڵی فش کردنو لەزەوی خشاندن.

زافَ البناءُ زيفاً: باڵەخانەکە بەرز بۆوە.

زاف الغلامُ: کوڕە گەنجەکە بازی دا بۆ سەر سوچی سەکۆکەو خۆی بادایەوە بۆ شوێنی پێشوی بۆئەوەی رام ببێ بۆ سوارچاکی.

زاف النقودَ وغيرَها: پارەکەی پوچ کردو تەزویری کرد، وای لێکرد نرخی نەبێو پوچ بێ ٥ زَيَّفَ النقودَ: پارەکەی تەزویر کرد، پارەی تەزویرو بێ بەهای خستە ناو بازارەوە ٥ غەشو تەزویری پارەکەی دەرخست ٥ دەیشگوترێ: (زيَّفها عليه): شتەکەی بەسەردا تێپەڕاند، فێڵبییەی لێ کرد ٥ زَيَّفَ رَأيَهُ أو قولَه: ڕاو بۆچونەکەی پوچ کردەوەو قسەکەی ڕەتکردەوە پوچیو بەتاڵیەکەی دەرخست ٥ بەهیچو پوچو بێ بایەخی لەقەڵەم دا ٥ الزَّيْفُ: تەزویر، پوچ ٥ دەگوترێ: (دِرهم زيف): درەمێکی پوچە سکەی ئەصڵی نییە ٥ گویسەبانەی خانوو ٥ بارکۆنو دیکۆری باڵەخانەی گەورە ٥ زَيَّقَ القميصَ ونحوَهُ: یەخەو ملەوانەی بۆ کراسەکە کرد، دەگوترێ: (عملَ للجيب زيقاً): یەخەی بۆ گیرفانەکە دروو.

**زَاكَ** في مشيته زَيْكاً وزيكاناً: لە رۆیشتنیدا لارو لەنجەی کردو خۆی بادا.

**زَالَ** الشَّيءَ زيلاً: شتەکەی دوور خستەوە، لای دا ٥ هەڵی هاواردن، دەگوترێ: (زِل ضَأنَكَ من معزك): مەڕەکانت لەبزنەکانت هەڵاوێرە جیایان بکەوە.

زالَ يَزالُ: ئەم دوو فیعلە دەبێ لەپێشیانەوە پیتی نەفی هەبێ ئەوکاتە فیعلی ناقیص دەبن، دەگوترێ: (مازال محمد مدرساً) و(لايزال محمد مدرساً).

**زَيَلَ** زيلاً: لینگی لێک بڵاوکردنەوە، قاچی پان هاویشتن ٥ زَايَلَهُ مُزَايَلَةً وزيالاً: لێی جیابۆوە ٥ زَيَّلَهُ: بڵاوی کردەوە ٥ إنْزَالَ: جیابۆوە ٥ تَزايَلُوا: لێک جیابوونەوە، (تزايل فلان من جليسه): فلان خۆی لەهاوڕێو هاونیشینەکەی شاردەوە ٥ خۆی لێ داپۆشی بۆ ئەوەی نەی بینێ ٥ (امرأة متزايلة): ئافرەتێکە بەحەیاو شەرمە ڕوی خۆی دادەپۆشێ.

تَزَيَّلوا: لێک جیابونەوە دەست بەرداری یەکتری بوون ٥ المِزْيَلُ: عاقڵمەندی زانا کە دەتوانێ سەرەداوی شتەکە لێک بکاتەوە ٥ (رجل مِخْلَط مِزْيل): پیاوێکە شتەکان تێکەڵ دەکاو عاقڵانە لێکیان جیادەکاتەوەو بیری تیژە سەری لێ ناشێوێ.

**زام** لە زَيْماً فأسكتَهُ: کارێکی پێ کرد یان بۆکرد بێدەنگی کرد ٥ تَزَيَّمت الإبلُ والدوابُ: حوشترەکان یان وڵاخەکان بڵاو بوونەوە ٥ تَزَيَّمَ اللحمُ: گۆشتەکە توند بوو پاڵی لێک دا ٥ الزِّيَمَةُ: جەڵبە حوشتر کەلەدوو کەمتر نەبێو لەپێنج تێنەپەڕێ ٥ (ماشية زيم): ئاژەڵی بڵاوە بوو (غارة زَيَم): هێرشی بەربڵاو ٥ زانَهُ زَيْناً: جوانی

كـرد، رازانديـهوه ٥ أزْيَـنَ الـشَّيْئَ: شـتەكەی جوانكرد ٥ زَيَّنَـهُ: جوانی كـرد ٥ تَـزَيَّنَ: بـەمانا (إزْدَانَ)دێ ٥ إزْيَّـنَ: بـەمانا (إزدان)دێ ٥ الـزَّائِنُ: خۆ جوانكردو، دەگوترێ: (إمرأة زائنٌ): ئافرەتێـكە خۆی رازاندۆتـەوە ٥ الزِّيـانُ: هەرشتێـك خـۆی پـێ جوان بكرێ ٥ الزِّيْنُ: هەرشتێك شت جوان بكا ٥ الزِّيْنَةُ: بـەمانا (الزِّيـان)دێ ٥ يـوم الزِّينـة: رۆژی جەژن ٥ جەژنی نەورۆز.

الزِّيْنـون: لـەبواری كیمیـادا عونـصورێـكی (خامـل) لەهـەوادا بەكـەمی هەیـە بـۆ بـۆری رونـاكی بەكاردەهێنـدرێ ٥ زَيَّـاهُ تَزِيِّـةً: ئامـادەی كـردو پۆشـاكی لەبـەركرد ٥ تَزَيَّـا بكـذا: خـۆی حـازر كردو پۆشاكی لەبەركرد ٥ الزِّيُّ: شێوەو روخسار ٥ پۆشـاك، دەگـوترێ: (أقبـل بـزي العـرب): بەپۆشاكی عەرەبیەوە هات.



**السِّينُ:** پیتی دوانزەهەمی پیتەکانی هیجایە ٥ لەکەناری زمانو ددانی سەرەوەی پێشی دەم دێتە دەرەوە ٥ پیتی (سین) بە مەفتوحی دەچێتە سەر فیعلی موضاریعو تایبەتی دەکا بەزەمانی داهاتوو.

**سَأْ:** دەنگێکە، گوێدرێژی پێ هۆش دەکرێ، یان پێی بانگ دەکرێ بۆئەوەی ئاو بخواتەوە یان بڕوا ٥ لەکوردی دا لەجیاتی ئەو وشەیە (هەچە) یان (هەتتە) بەکار دەهێندرێ ٥ **سَأَبَهُ سَأْباً:** خنکاندی ٥ دەستی لە قوڕتەمەنا (قوڕگی جەڕاند).

**سَأَبَ** السقاءَ: مەشکەکەی هەڵاخنی، پانی کرد.

**سَئِبَ** من الشراب سَأْباً: تێری خواردەوە لەشەرابەکە ٥ **السَّأبُ:** کوندەی ئاو ٥ **السُّؤْبان:** دەگوترێ: (هو سُؤْبان مال) بەجوانیو ڕێكو پێکی ماڵو سامانەکەی سەرو بەر کرد ٥ **المِسْأبُ:** کوندەی ئاو ٥ **سَأَدَهُ سَأْداً:** خنکاندی، قورتەمەی گرتو جەڕاندی.

**سُئِدَ:** نەخۆشی (سونادی) توش بوو، توشی شۆری بوو.

**سَئِدَ** الجرحُ سَأْداً: برینەکە هەڵتەقیەوە ٥ **أسْأدَ السَّيرَ:** ڕۆیینی مام ناوەندی ئەنجام دا ٥ بەشەو ڕۆیی ٥ **السُّؤادُ:** نەخۆشییەکە توشی کەسانێك دەبێ کەئاوی سوێر دەخۆنەوە ٥ **السُّؤْدَةُ:** باقی ماندەی گەنجی، ئاخرو ئۆخری گەنجی ٥ **المِسْأدُ:** کوندە.

**سَأَرَ** من الطعام والشراب سَأْراً: هەندێکی لە طەعامو شەرابەکە هێشتەوە.

**سَئِرَ** سَأْراً: مایەوە (أسْأرَ) بەمانا (سَأرَ)دێ ٥ لە حەدیسدا هاتووە دەفەرموێ: (إذا شربتم فاسْئِروا): کەئاوتان خواردەوە کەمێکی لێ بهێڵنەوە ٥ **أسْأرَ من حسابه:** هەندێکی لەحیسابی خۆی هێشتەوەو سفری نەکرد ٥ **تَسَأرَ الشرابَ:** باقی ماندەی ئاوەکەی خواردەوە، بەرماوەکەی خواردەوە ٥ **السَّائِرُ:** باقی ماندە ٥ **السُّؤرُ:** بەرماوە، باقی ماندە ٥ **السُّؤرَةُ:** بەرماوە ٥ ئافرەتێك کە هەرچی گەنجی بڕواو کەمێ تەڕو تازەیی پێ مابێ ٥ **السُّؤْرَةُ من المال:** ماڵی چاكو باش ٥ **سَأْسَأ بالحمار سَأْسَأةً:** بەگوێدرێژەکەی گوت (سَأْسَأْ) بۆ ئەوەی ئاوەکە بخواتەوە ٥ یان بۆ ئەوەی هەڵسڵەمێتەوە بڕوا یان ڕابوەستێ ٥ **تَسَأْسَأتِ الأمورُ:** کارەکان گۆڕانکارییان تێکەوت ٥ **تَسَأْسَأ فلان بِحَقّي:** فلانکەس دانی نا بەمافی من دا پاش ئەوەی ئینکاری دەکرد ٥ **سَأَفَت يده سَأْفاً:** دەورو بەری نینۆکی دەستی قەڵشتن، نینۆکی قەڵشت قەڵشت بوون ٥ **سَئِفَتْ يَدُهُ:** بەمانا (سَأَفَتْ) دێ، دەشگوترێ: (سَئِفَتْ شَفَتُهُ): لێوی توێکڵی هەڵدا.

**سَئِفَ** ليفُ النخلة: توێکڵی دارخورماکە شەقار شەقار بوو لێك بڵاو بووە ٥ **سَؤُفَتْ ابِلُهُ سَأفَةً:** نەخۆشیو قڕان کەوتە نێو حوشترەکانەوە ٥ **إنْسَأفَ:** بەمانا (سَأفَ)دێ ٥ **السُّؤافُ:** دەردێکە

قران بەحوشتر دەکا ٥ اَلسَّأَفُ: مووی کلك ٥ مووە ئەستوورو درێژەکانی کلك ٥ **سَأَلَهُ عن کذا سُؤالاً**: پرسیاری لێ کرد دەربارەی فلان شت ٥ سواڵی کردو دەستی لەکەسانی دیکە پان کردەوە.

**سَأَلَ** فلاناً الشَّيْءَ: داوای شتی لەفلان کرد بیداتێ، دەگوترێ: (سَأَلْتُ محمداً دِرْهَماً): داوای درەمێکم لە موحەممەد کرد ٥ **أَسْأَلَهُ سُؤلَهُ**: ئیشەکەی جێ بەجێ کرد ٥ **سَاءَلَهُ**: بەمانا (سَأَلَهُ)دێ ٥ **تساءَلوا**: پرسیاریان لەیەك کرد ٥ **السَّائِلُ**: هەژارو سواڵکەر ٥ **السَّأَّلُ**: کەسێك زۆر پرسیار بکا ٥ **السُّؤالُ**: سواڵکردن، داوای خێر پێکردن ٥ پرسیاری بەتاقیکردنەوەی قوتابی ٥ **اَلسُّولُ والسُّؤْلَةُ**: ئەوشتەی دواکراوە یان داوای دەکەی ٥ **اَلسُّوَلَةُ**: کەسێك زۆر پرسیار بکا ٥ **السُّؤولُ**: بەمانا (السَّأَّلُ) دێ ٥ **اَلْمَسْأَلَةُ**: شتی داواکراو ٥ یان قەضییەو رووداوێك بەڵگەی لەسەر بهێندرێتەوە ٥ **اَلْمَسْئولُ**: بەرپرس ٥ لێپرسراوی دەوڵەت ٥ **اَلْمَسْئولِية**: بەرپرسیاریەتی لەگفتارو لەکردار.

**سَئِمَ** الشَّيْءَ ومنه: لەشتەکە وەرز بوو ٥ **أَسْأَمَهُ**: وەرزی کرد، جارزی کرد ٥ **السُّؤُوم**: کەسێك زۆر وەرزبێ‌و وەرزبوونی گەیشتبێتە ئەو پەڕی.

**سَأَى** سَأْواً: بازی دا، دوژمنایەتی کرد ٥ ئاشوبی خستە نێو جەماوەر ٥ **السَّأْوُ**: زێدو نیشتمان ٥ ورەو هیمەت، دەگوترێ: (فلان ذو سَأْوٍ): فلانکەس ورە بەرزو خۆگرە ٥ مەبەستو ئامانج.

**سَبَأَ** علی یمین کاذبة سَبْأً: سوێندی خواردو هیچ گوێی بە گرنگی سوێند پێ خوراوەکە نەدا.

**سَبَأَ** الخمر: شەرابەکەی کڕی بۆنەوەی بیخواتەوە ٥ **إِنْسَبَأَ الجِلْدُ**: پێستەکە کەوڵ کرا.٥ **سَبَأ**: ناوی پیاوێکە گوایە خێڵەکانی یەمەن هەموویان دەچنەوە سەر ئەو ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە: (تفرقوا أيدي سبا): بۆ نموونەی پەرتەوازەیی دەهێندرێتەوە، چونکە خەڵکی یان بلێ هۆزەکانی (سَبَأ) کە وڵاتەکەیان ئاو داگیری کردو وێرانی کردو باغو باغاتیان لەناو چوو هەریەکەیان رووبان کردە دەفەرو وڵاتێکو پەرتەوازە بوون ٥ **اَلسَّبَّاءُ**: شەراب ٥ **اَلسُّبْأَةُ**: سەفەری دوورو درێژ ٥ **السَّبَئيةُ**: پێرێکن لە شیعە توند ڕەوەکان کە پاڵ عەبدوڵڵای کوڕی (سَبَأ) دەدرێن ٥ **اَلسَّبَّاءُ**: مەی فرۆش ٥ **السَّبِيءُ**: (سبيء الحية): توێژی مار ٥ **السَّبِيئَةُ**: شەراب ٥ **اَلْمَسْبَأُ**: رێباز لەناو کێوو کەژدا ٥ **سَبَّهُ**: جنێوی پێ دا.

**سَبَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی بڕییەوە.٥ **سَبَّ** الدّابةَ: ئاژەڵەکەی سەربڕی ٥ **سَابَّهُ مُسَابَةً وسِبَاباً**: جنێوی پێ دا ٥ (جنێویان بەیەکتر دا) ٥ **سَبَّبَهُ**: زۆری جنێو پێ دا ٥ **سَبَّبَ الأسْبابَ**: هۆکارەکانی هێنانەدی ٥ **سَبَّبَ للماء مَجْرَى**: ئاوەڕۆی بۆ ئاوەکە دروست کرد ٥ **سَبَّبَ الحكمَ ونحوه**: هۆکاری حوکمدانەکەی دیاری کردن ٥ **إِسْتَبُّوا**: خەڵکەکە جنێویان بەیەکتر دا ٥ **تَسَبَّوا**: شەڕە جنێویان کرد ٥ **تَسَابُّوا**: جنێویان بەیەکتر دانو دەنگیان لێك دابڕی ٥ **تَسَبَّبَ اليه**: بەواسیتەو هۆکاری جۆراو جۆرەوە پێی گەیی ٥ **اسْتَسَبَّ** لە: وای لێ کرد جنێو ی پێ بدرێ، دەگوترێ: (اسْتَسَبَّ لأبيه): جنێوی بەباوکی خەڵکی تڕداو بەو هۆیەوە جنێو بەباوکی ئەویش درا ٥ رێگای خۆش کرد کەسانی دی جنێو بەباوکی بدەن ٥

الأُسْبُوبة: ئەو عەيبو لەككەیە جنێوی پێ دەدرێو دەكرێتە ئامرازی جنێو ◊ السُّبُّ: جنێو فرۆش ◊ كەسێك زۆر جوێن بدا ◊ سەرپۆش ◊ مێزەر ◊ حەبل ◊ سنگو گولمێخ ◊ قوماشی تەنك ◊ (سِبُّ الشخص): جنێو پێدەر ◊ السَّبَبُ: حەبل ◊ هەرشتێك ببێتە هۆكار بۆ گەیشتن بە شتێك ◊ خزمایەتیو خۆشەویستی ◊ لەزاراوەی عەروزدا (سَبَبٌ) بریتییە لە دو پیت یەكەمیان بزوێنی هەبێو ئەوی تر بێ بزوێن ◊ یەكەمیان سەبەبی سوكو دووەم سەبەبێ قورس ◊ لەزاراوەی شەرع دا هۆكارێكە كە بەهۆیەوە دەگەیە شتێكو بەلام تێیدا كاریگەر نییە ◊ وەكوو كات هۆكارە بۆ واجب بوونی نوێژ، بەلام تێیدا كاریگەرنیە ◊ (أسباب السماء): پەیژەو پلیكانە بۆ بەرزبوونەوە ◊ دەشگوترێ: (تَقَطَّعَتْ بهم الأسباب): هیچ بەهانەو فروفێڵیان نەماون ◊ (أسباب الحكم): بریتین لەو بەڵگەو شایەتانەی دادوەر دەیان بینێو دەیانكاتە بنەما بۆ حوكمە قانوونیەكەی ◊ السَّبَّابة: قامكی شایەتومان، قامكی نێوان قامكە گەورەو قامكە درێژ ◊ السُّبَّةُ: ماوەیەك لەزەمان، دەگوترێ: (مضت سُبَّةٌ من الدّهر): ماوەیەك لەرۆژگار تێپەڕی ◊ (أصابتنا سُبَّةٌ من الحرّ أو البرد): رۆژگارێكی گەرم یان ساردمان بە سەردا تێپەڕی، ماوەیەك گەرما یان سەرما لێی داین ئێستا مەوجەی بۆ بەكاردەهێنن ◊ دەڵێن: مەوجەی گەرما یان مەوجەی سەرما ◊ السُّبَّةُ: عەیبو عار ◊ كەسێك خەڵك زۆر جوێنی پێ بدا ◊ السُّبَبَة: كەسێك زۆر جنێو بەخەڵك بدا ◊ السَّببیّة: پەیوەندی نێوان سەبەبو موسەبەب ◊ السَّبیبُ: (سبیب الفرس): موی كلكو یاڵو ناوچاوانی ئەسپ ◊ السَّبیبةُ: قوماشی تەنكو سوك ◊ پارچەمو (گلۆلە مو) ◊ درزو دڕاوی كەم لەقوماشی كەتان ◊ نافرەتێكی زوڵف درێژە ◊ (سبائب الدم): رێڕەوەكانی خوێن ◊ المِسَبُّ: جوێن فرۆش؛ كەسێك زۆر جوێن بدا ◊ المِسَبَّةُ: پەنجەی شایەتومان.

سَبَتَ سَبْتاً: نوست ◊ پشوی دا ◊ دامركا.

سَبَتَ فلان سَبْتاً: رۆژی شەممە فلانكەس چووە ژورەوە.◊ سَبَتَ الیهود: جولەكە مەراسیمی شەممەیان پێكهێناو پشویان داو وازیان لەكاروكاسبی هێنا.◊ سَبَتَ الشَّیْ: شتەكەی شل كردەوە.◊ سَبَتَ شَعْرَهُ: قژەكانی كردنەوە ◊ بڕیەوە، دەگوترێ: (سَبَتَ عِلاوَتَهُ): لەملی دا ◊ (سَبَتَ رأسَهُ): سەری تاشی ◊ أسْبَتَتِ الحیة: مارەكە پاپۆكەی بەستو خۆی مات دا ◊ أسبَتَ فلان: فلانكەس رۆژی شەممە داخڵ بوو ◊ أسبتَ الیهودُ: جولەكە دابو نەریتی رۆژی شەممەیان پەیڕەوكرد ◊ سَبَّتَ الشَّیْئَ: شتەكەی بڕییەوە ◊ إنسَبَتَ الجِلْدُ: پێستەكە بەدەباغكردن نەرم بوو ◊ إنسَبَتَ الرُّطَبُ: خورماكە شیرین بوو هەمووی بوو بەروطاب ◊ إنسبت الشَّیْئُ: شتەكە درێژ بوو كشا لەگەڵ نەرم بوون دا ◊ السُّبَاتُ: راحەو پشودان ◊ هەروا وشەی (سُبات) بەمانا خەوی سوكو سەرەخەوە، وەكوو نوستنی تاوناتاوەی پیرەمێردو نەخۆش ◊ عەمری كوڕی مەسعود بەمعاویەی گوت: (ما تسأل عن شیخ نومه سبات ولیله هبات) ◊ لەبواری پزیشكی دا بریتییە لە حاڵەتێك كە نەخۆش تێیدا بێ ئاگا دەبێو لەخۆ دەبێتەوەو بەهیچ دەرمانێك بەئاگا نایەتەوە پێچەوانەی ئیغمایە كەشتێكی كاتییەو دوای ماوەیەك لەسەرخۆ چووەكە بەئاگا دێتەوە ◊ (ابنا سبات): شەوو

ڕۆژ ◊ السَّبْتُ: ڕۆژی شەممە ◊ ڕۆژگار یان ماوەییێک، دەگوترێ: (أقمنا في بغداد سبتاً): ماوەیەك لەبەغدا ماینەوە ◊ ڕاحەو پشودان ◊ نوستن ◊ کەسێك زۆر بنوێ ◊ گەنجی ئازاو چاو نەترس ◊ ئەسپی ڕەسەنی بەڕاپەرو تیژڕۆو بازهاوێژ ◊ السِّبْتُ: هەرپێستێك دەباغ بكرێ ◊ جۆرە نەعلێك هەیە پێی دەگوترێ: (نەعلی سیبتی): لەوجۆرە پێستانەیە ◊ السُّبْتَةُ: ماوەیەك لەرۆژگار ◊ اَلْمَسْبُوتُ: نەخۆشی بێ هۆش‌و بێ هاوارکردن‌و پەلەقاژە ◊ مردو ◊ سِبْتِمْبَر: مانگی نۆی زایینی ◊ تَسَبَّجَ: پێست و کەوڵی لەبەرکرد کەوڵی ئاژەڵی پۆشی ◊ السَّبَجُ: مێروی ڕەش ◊ السُّبْجَةُ: جۆرە پۆشاکێکە ئافرەت لەماڵەوە لەبەری دەکا ◊ اَلسُّبَيجَةُ: بەمانا (السُّبْجَةُ)دێ.◊ سَبَحَ بالنهر وفيه: لە ڕوبارەکە دا مەلەی کرد چووە ناو ئاوەکەو خۆی نقوم کرد.◊ سَبَحَ الفَرَسُ: ئەسپەکە لەڕۆیشتن دا دەستی هاویشتن.

سَبَحَ النجوم: ئەستێرەکان لەفەلەکی خۆیان لەهاتو چۆدا بوون.

سَبَحَ فلان في الأرض: فلانکەس لەزەوی دا دوور کەوتەوە ◊ چاڵی هەڵکەند ◊ باری ژیانی ئاڵ‌و گۆڕی بەسەردا هات بۆژیان‌و دابینکردنی پێویستیاتی تێکۆشا ◊ سَبَحَ في الكلام: زۆری قسەکردن ◊ أَسْبَحَهُ في الماء: مەلەی پێکرد، لەناوی هەڵکێشا ◊ سَبَّحَ: وتی (سبحان الله)، تەسبیحاتی کرد ◊ سَبَّحَ الله وله: پەروەردگاری بەتاك‌و تەنهاو بێ عەیب‌و لەککە وەصف کرد تەقدیس‌و تەنزیهی کرد ◊ السابحات: گەمێکانی ناو دەریا ◊ فریشتە ◊ ئەستێرە ◊ السِّبَاحَةُ: مەلەکردن؛ جۆرە وەرزشێکە لەناو ئاودا دەکرێت ◊ اَلسَّبَّاحُ: مەلەکەر ئەوکەسەی زۆر لەناو ئاودا دەبێ ◊ السَّبَّاحَةُ: قامکی شایەتومان؛ پەنجەی نێوان قامکە گەورەو قامکە درێژ ◊ اَلسُّبُّوح: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار؛ واتە لەهەموو عەیب‌و لەککەیەك دوورە هەرچی نەقص بێ تێیدا نییە ◊ سُبْحَانَ: دەگوترێت: (سبحان الله) وشەیەکە بۆ تەنزیهی زاتی پەروەردگار بەکاردێ ◊ لەکاتی سەرسوڕمان لە شتێك‌و عاجباتی لێ هاتن دەگوترێ ◊ السَّبْحُ: بەتاڵی‌و فەراغ ◊ اَلسُّبْحَةُ: دەنکە مێروی تەزبیح ◊ دوعاو پاڕانەوە ◊ نوێژی سوننەت ◊ (ك: سُبَحٌ) ◊ سُبُحات الله: نورو جەلال‌و شکۆمەندیی پەروەردگار ◊ السَّوَابِحُ: بەهێزو توانا، پتەوو قایم ◊ اَلْمُسْبِحَةُ: پەنجەی شایەتومان ◊ المِسْبَحَةُ: مێروی تەزبیح ◊ سَبْحَلَ فلان: فلانکەس وتی (سبحان الله).

سَبَخَ سَبْخاً: داسەکناو دامرکایەوە، دەگوترێ: (سَبَخَ الحَرُّ): گەرما ڕەویەوە.

سَبَخَ القُطْن: لۆکەکەی پێچایەوە، لولی دا ◊ سَبِخَت الأرضُ سَبْخاً: زەوییەکە شۆڕ بوو، سوێرە خاکە ◊ (أَسْبَخَتِ الأرض) بەمانا (سَبِخَتْ)دێ ◊ أَسْبَخَ في حفره: لە هەڵکەندنی چاڵەکەدا گەیشتە سوێرە خاك ◊ سَبَخَ: نوست ◊ سَبَخَ الشَّيْءُ: شتەکە سوك بوو دامرکاو داسەکنا، دەگوترێ: (سَبَّخَ العرق): دەمارەکە لە فرە فرکەوت‌و لێدان‌و ئازاری نەما ◊ (سَبَّخَ الحرُّ): گەرما دامرکایەوە ◊ (سَبَّخَ عنه الشدة): ناخۆشی‌و چورتمی لەسەر سوك بوون ◊ (سَبَّخَ القطنَ): لۆکەکەی شی کردەوە، پانی کردەوە ◊ (تَسَبَّخَ): سوك بوو، دامرکایەوە ◊ السِّبَاخُ: زەوییەکە نەکێڵدرابێ‌و ئاوەدان نەکرابێتەوە لەبەرئەوەی

سوێره خاكه ٥ هەروا ناوە بۆ زبڵی كیمیاوی ٥ **اَلسَّبَغُ**: شوێنێك سوێره خاك بێ قاچی لێ رۆبچن ٥ **اَلسَّبْخَةُ**: زەوییەك لەبەرئەوەی شۆره خاكە هیچی لێ نەڕوێ ٥ یان شوێنێك ئاوەكەی قەوزەی لەسەر بێ ٥ **اَلسَّبِخَةُ**: ئەرزی نەكێڵدراو ئاوەدان نەكراوە لەبەر شۆره خاكی ٥ **اَلسَّبِخَةُ**: پارچە لۆكە كە دەرمانی دەخرێتە سەرو ئامادە دەكرێ بخرێتە سەر برین ٥ یان لۆكەی شی كراوە ٥ یان ئەو لۆكەیەی لول دەكرێ بۆ ڕستن ٥ ئەو پرزۆپاڵەی لەباڵی باڵندە دەكەوێتە خوار.

**سَبَدَ** شَعْرَهُ سَبْداً: مووەكانی جەستەی‌و ریشی تاشین ٥ **اَسْبَدَ**: بەمانا (سَبَدَ)دێ ٥ **سَبَّدَ الشَّعرُ**: مووەكان دوای تاشین هاتنەوەو سەریان دەرهێنایەوەو ڕەشاییان دیارە ٥ **سَبَّدَ الفَرْخُ**: جوجكەكە (بێچووەكە) پەڕو پۆڵی لێ ڕوان ٥ **سَبَّدَ شَعْرَهُ**: مووەكانی تاشین‌و لەبێخ دەری هێنان ٥ **سَبَّدَ رَأسَهُ**: سەری نەشت‌و چەوری نەكرد، قژەكانی بەژاكاوی‌و چڵكنی هێشتنەوە ٥ **اَلسُّبَدُ**: دیمەنی ڕووەك‌و گژوگیا لەكاتی سەر دەرهێنانی لەزەوی پێش ئەوەی پەل‌و پۆ بكاو بڵاو بێتەوە ٥ پاشماوەی گیای دوراوە ٥ كەمێك لەقژ، دەگوترێ: (ماله سَبَدٌ ولا لَبَدٌ): ئەكەم نە زۆر هیچی نییە ٥ **اَلسُّبَدُ**: باڵندەیەكی پەڕ خاڵخاڵاوی‌و دەم پان‌و گەورەیە، پەڕو پۆڵی نەرمە كە ئاوی ڕێ دەكەوێ خێرا لێی دەچۆڕێتەوە، عەرەب ئەسپی عەرەق كردو بەو باڵندە دەشوبهێنن ٥ هەروا ناوە بۆ قوماشێك حەوزی پێ دەهاخندرێ‌و لەناو حەوزەكەدا ڕادەخرێ بۆ ئەوەی كە حوشترەكان هاتنە سەر ئاوەكە قوڕاوو لیل نەبێ ٥ **سَبَرَهُ سَبْراً**: مەزندەی كرد ٥ ئەندازەی گرت، دەگوترێ: (سَبَرَ الجُرْحَ): قوڵایی برینەكەی پێوا، مەزندەی كرد بەئامێری تایبەت.

**سَبَرَ** فلاناً: فلانكەسی هەڵپشكنی بۆئەوەی بزانێ چی لاهەیە ٥ **اَسْبَرَهُ**: بەمانا (سَبَرَهُ)دێ ٥ (اِسْتَبَرَهُ) بەمانا (سَبَرَهُ)دێ ٥ **اَلسَّابِرِيُّ مِن الثِّياب**: قوماشی تەنكی زۆر باش ٥ ئەگەر بۆ زرێ بەكارهات مەبەست زرێی چاك چندراوە ٥ **اَلسَّبَّارُ**: ئەو ئامێرەی قوڵایی برینی پێ دەپێورێ ٥ یان قوڵایی ئاوی پێ مەزەندە دەكرێ ٥ **اَلسُّبُورُ**: هەژار ٥ **اَلسُّبُورَةُ**: تەختە ڕەشەی قوتابخانە ٥ سەبورە ٥ **اَلسِّبْرُ**: ئەصڵ‌و ڕەسەن، بناغە ٥ ڕەنگ ٥ شێوەو ڕوخسار ٥ **السَّبْرُ والتَّقسيم**: لەزاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا بریتییە لە كۆكردنەوەی وەصفەكان لەئەصڵ‌و قیاس بۆسەر كراوەكەدا ئەمجار وەلانانی هەندێكیان بۆئەوەی باقی ماندەكە بكەینە عیلەت‌و بایسی قیاسەكە ٥ **اَلسَّبْرُ**: بەمانا ئەصڵ‌و ڕەنگ‌و شێوەو ڕوخسار دێ ٥ **اَلسُّبَرُ**: باڵندەیەكی درندەیە لەباشو گەورەترە باڵەكانی درێژن ٥ **اَلسَّبْرَةُ**: سبەینانی سارد ٥ **اَلمِسْبَارُ**: ئامێری برین مەزندەكردن ٥ **اَلمَسْبُرَةُ**: (مَسْبُرَة الجرح): كۆتایی برینەكە ٥ **اَلمَسْبُورُ**: ڕوخسار جوان ٥ **سَبَرْتُ**: بڕوای كردو ئیدی نەیپرسی.

**اَلسَّبْرَات**: هەژارو مسكین ٥ (وهي سبراةٌ) ٥ **اَلسُّبْرُوتُ**: شتی كەم‌و بێ نرخ ٥ هەژارو مسكین، كوڕی گەنج كەمووی لێ نەهاتبن ٥ زەوی چۆڵ‌و سوتەمەڕو ٥ (أرض ساريتٌ): زەوی سوتەمەڕو ٥ **اَلسِّبْرِيتُ**: بەمانا (اَلسَّبْرات)دێ ٥ (هي سبريتة).٥ **سَبْرَجَ على الأمر**: كارەكەی ئاڵۆز كرد ٥ **سَبْرَدَ شعرَهُ**: مووەكانی تاشین ٥ **سَبْسَبَ الرجلُ**: پیاوەكە بەهێواشی ڕۆیشت ٥ **سَبْسَبَ الماءَ**

والبولَ: ئاوەکە یان میزەکەی ڕژاند، ڕەوانی کرد ◊ تَسَبْسَبَ الماءُ: ئاوەکە جاری بوو ◊ **السَّبْسَبُ**: سارای کاکی بەکاکی.

**سَبَطَ** سَبْطاً: خاو بوو، نەرم بوو.

**سَبُطَ** الشعرُ: قژی خاوو نەرم بوو، دەشگوترێ: (هو سبط الجسم): قەدو بالای ڕێکو پێکو ئەندامی جوانن ◊ **أَسْبَطَ**: لەترسان بێدەنگ بوو ◊ سەری شۆڕ کردوو چاوی لەزەوی ژەنین ◊ لەشی داهێزاو گورجو گۆڵ نەبوو ◊ **أَسْبَطَ** بالأرض: بەزەوییەوە نووساو ڕاست نەبووەوە، بەهۆی نەخۆشی یان زەبر وێکەوتنەوە کەوتە سەر جێو هەڵنەستا ◊ أَسْبَطَ في النوم: چاوی لێکنان ◊ (أَسْبَطَ عنه): لێی بێ ئاگا بوو ◊ **سَبَّطَتْ بولدها**: پێش کامڵ بوون منداڵەکەی لەبارچوو ◊ **السَّابَاطُ**: هەڵاشێکە لەسەر دوو دیوارو بەژێر یا ڕێگای کراوە هەیە ◊ **سَبَاطِ**: لەرزو تا ◊ **السُّبَاطة**: ئەو گەندە موو پرژو پاڵەیە کە لەکاتی سەر شانەکردن دا دەکەوێتە خوار ◊ سەرانگوێلك ◊ هێشوی خورما کە دەنکە خورماکانی پێوەبن ◊ **السَّبِطُ**: پیاوێکە کە بالابەرز بێ، درێژ بێ ◊ قژی خاو ◊ بارانی بەردەوام.

**سَبُطَ** اليدين: سەخی سروشتە ◊ (سبط الأصابع): قامکی درێژن.

**سَبُطَ** الجسم: جەستە ڕێکو پێکە، دەشگوترێ: (امرأة سِبطة الخَلْق): ئافرەتێکی نەرمو نیانو ناسکە ◊ **السَّبَطُ**: درەختێکە لقو پۆپی زۆرنو یەك قەدی هەیە ◊ **السِّبْط**: کوڕەزاو کچەزا ◊ لەناو جولەکەش دا وەکوو پێکهاتەی خێڵو هۆزی ناو عەرەب وەهایە ◊ **السَّبْطَانَة**: تاپڕو ساچمەزەن ◊ تفەنگێك کەڕاوی باڵندەی پێ بکرێ ◊ **اسْبَطَرَّ**: ڕاکشا ◊ درێژبوو، دەگوترێ: (اسْبَطَرَّت الذبيحة): کوشتییەکە دوای سەربڕینی ڕاکشاو درێژ بوو ◊ **اسْبَطَرَّ البلادُ**: وڵات ئارام بوو ◊ **السِّبَطْرُ**: پیاوی زیرەکو کۆڵنەدەر لەکارو پیشەی خۆی ◊ درێژ، دەگوترێ: (شَعْرٌ سِبَطْرٌ): قژێکی درێژی خاو ◊ هەروا بەمانا تیژ ڕۆو گورجو گۆڵ دێ، دەگوترێ: (جمل سِبَطْرٌ) و (أسد سِبَطْرٌ): واتە لەکاتی بازدان دا جەستەی درێژ دەبێ ◊ **السِّبَطْرَةُ**: ئافرەتی جەستە گەورەو کەتە ◊ **السِّبَطْرَى**: ڕۆیشتنێکە لارو لەنجەی تێدایە ◊ **السَّبَيْطَرُ**: درێژ.

**سَبَعَ** القومَ سَبْعاً: بوو بەحەوتەم کەسی خەڵکەکە بەنەو ژمارەی خەڵکە کەبوو بە حەوت، دەگوترێ: (هو سابع ستة): ئەو ژمارە حەوتە حەوتی دوا شەش ◊ هەروا مانای ئەوەدەگەیەنێ کە حەوتیەکی ماڵەکەی لێ وەرگرتوون.

**سَبَعَ** الحبلَ: حەبلەکەی بەحەوت لۆ بادا.

**سَبَعَ** الذئبُ الغنمَ: گورگەکە حەوتی لەجەلەبە مەڕو بزنەکان خنکاند.

**سَبَعَ** فلاناً: فلانکەسی ترساند، ڕەخنەی لێگرتو جنێوی پێدا.

**سُبِعَ** المولود: منداڵەکە سەری تاشراو حەوتەمی بۆکرا ◊ **سُبِعَتِ** البقرةُ الوَحْشِيةُ: درندە بێچوی مانگا کێوییەکەی خوارد ◊ **أَسْبَعَ القومُ**: خەڵکەکە بوونە حەوت کەس ◊ درندە کەوتە ناو ئاژەڵەکانیانو لێی خواردن ◊ **أَسْبَعَتِ الحاملُ**: ئافرەتە سکپڕەکە بەحەوت مانگی منداڵی بوو ◊ **أَسْبَعَ الطريقُ**: ڕێگاکە درندەی زۆر بوو.

**أَسْبَعَ إِبْنَـهُ:** منداڵەکەی دا بەدایەن شیری بداتێو بەخێوی بکا ٥ **سَبَّعَ العَمَلَ:** حەوت جار کارەکەی ئـەنجام دا ٥ یـان دوچـەندانەی کـردوە، دەگوترێ: (سَبَّعَ الإناءَ): حەوت جار قاپەکەی شت ٥ (سَبَّعَ اللهُ لكَ الأجرَ): خودا حەوت هێنـدەی پاداش دایـەوە یـان پاداشی بـۆ دوچەندانە کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (سَبَّعَ عند إمرأته): حەوت شەو لای ژنەکەی مایەوە ٥ **سَبَّعَ الحامل:** ئافرەتەکە بەحەوت مانگی منداڵەکەی بـوو ٥ **سَبَّعَ القومُ:** خەڵـکەکە ژمارەیـان بـوو بەحـەوت سـەد کـەس، لـە حـەدیـثدا هـاتووە دەفەرموێ: (سَبَّعَتْ سـلیم یـوم الفـتح): هۆزی سولەیم رۆژی فەتح حەوت سەد کەسیان ئامادە بوون بۆ رزگار کردنی مەککە ٥ **إسْتَبَعُوا:** بوون بە حەوت ٥ **الأسبوع من الأيام:** هەفتە ٥ کە بۆ تەوافکردنی کەعبە، گوترا مەبەست حەوتجار سـوڕانەوەیە بـە دەوری کەعبـەدا ٥ **السَّابِعُ:** ژمارەی نێوان شەش‌و هەشت، دەگوترێ: (هو سابِعُ سبعة): یەکێکە لەژمارەکانی حەوت ٥ **السُّبَاعي:** حەوت سوچ، حەوت لا ٥ (رجل سُباعي البدن): پیاوێکە جەستە تەواو (ثوب سُباعِيٌّ): قوماشێکە حەوت مەترە، حەوت بستە ٥ **السَّبُعُ:** درندە، هەردەعبایەك چنگ‌و نینۆکی هەبن‌و پەلاماری ئادەمیزادو ئاژەڵ بداو نێچیری بکا وەکوو شێرو گورگ‌و پڵینگ ٥ **السُّبُعُ:** بەشێکە لەحەوت بەش ٥ **السُّبْعَةُ:** ژمارەیەکە بۆ نێرینە بەکاردێ ٥ **السُّبُعَةُ:** بێچوە شێر ٥ **السُّبُوعُ:** هەفتە ٥ **السَّبِيعُ:** بەمانا (السُّبُع)دێ ٥ **المُسَبَّعُ:** لەزاراوەی ئەندازیاری دا قەبارەیەکی حەوت سوچە ٥ **المَسْبَعُ:** شوێنێك درندەی لێ هەبێ ٥ **المُسْبَعُ:** بەناز پەروەردەو ژیان نەرم‌و نۆڵ ٥ منداڵە ساوایەك دایکی بمرێ‌و ئافرەتێکی تر شیری پێ بداو بەخێوی بکا ٥ منداڵی زۆڵ ٥ منداڵی باوك نەناسراو ٥ منداڵێك بەحەوت مانگی لەدایك ببێ ٥ **المَسْبَعَةُ:** زەوییەك درندەی زۆربن.

**سَبَغَ الشَّيْئُ:** شتەکە تەواو بوو ٥ درێژ بوو، بەرفراوان بوو، زۆر بوو ٥ **أسْبَغَ الفارسُ:** سوارەکە زرێی پان‌و پۆڕی لەبەرکرد، دەگوترێ: (أسْبَغَ ثوبَهُ): کراسەکەی پان‌و پۆڕ کرد ٥ (أسْبَغَ وضوءَهُ): بەرێك‌و پێکی دەستنوێژی گرت‌و ئەندامەکانی جوان شت ٥ (أسْبَغَ لـه في النفقة): بە تێرو پری نەفەقەی کێشا ٥ (أسْبَغَ اللهُ عليك في النعمة): پەروەردگار نازو نیعمەتی بەسەردا رشتی ٥ **التَّسْبِغَةُ:** (تسبغة الخوذة): ئەو قەیتان‌و قۆپـچەو ترەقـەو شـتانەیە کـە ئەڵقـەکانی زرێیەکەی پێ قایم دەکرێ لەمل دا ٥ **سَبَقَه الى الشَّيْئِ سَبْقاً:** پێشی کەوت، دەگوترێ: (سَبَقَ الفَرَسُ في الحلبة): ئەسپەکە لەمەیدانی غار غـارێن دا پـێش ئەسـپەکانی تـر گەیـشتە مەبەست.٥**سَبَقَ** على قومه: لەپیاوەتی‌و شکۆمەندیی دا پێش هۆزو ئەتەوەکەی کەوت ٥ (سُبِقَ على الأمر): لەکارەکەدا تێشکا ٥ **أسْبَقَ القَوْمُ الى الأمر:** خەڵـکەکە بەپەلەو لێبڕانـەوە بۆکارەکە چون ٥ **أسْبَقَ الرأيَ:** لەسەر ڕایەکەی سور بوو بەبێ لێ وردبونەوەو بێ سێ‌و دوو ٥ **سَابَقَ الى الشَّيْئِ مُسَابَقَةً وسِباقاً:** پەلەی کرد بۆلای شتەکە.٥**سَابَقَ بين الخيل:** ئەسپەکانی خستنە غارکردن‌و سوارەکانیان بەسەریانەوە بوون، سەیری کرد بزانێ کامیان پێش دەکەوێ ٥ **سَابَقَ فلاناً:** پێشبڕکێی لەگەڵ فلانکەس دا کرد ٥ **سَبَّقَ:** پێشکەوتنی بەدەست هێنا ٥ **سَبَّقَ بين الخيل:** بەمانا (سابق)دێ ٥ **سابقت الشاةُ**

**وەرها**: مەرەكە پێش وەخت بێچووەكەی بوو ٥ **سابق الطيّ الجارح**: حەبلێكی سیرمەی لەقاچی باڵندەكە كردو بەستیەوە ٥ **إستَبَقُوا الى كذا**: خەڵكەكە پێشبڕكێیان كرد بۆلای ئەو شتە ٥ **إستبقوا الطريق**: لەڕێگاكە لای دا ٥ **تسابقوا**: بەمانا (استبقوا) دێ ٥ كێبڕكێیان كرد ٥ **السَّابِقُ**: كەسێك دەست پێشخەر بێ بۆ كاری چاكە ٥ **السَّابِقَةُ**: پێشبڕكێ لە ڕۆیشتن‌و شتی تر دا ٥ دەست پێشخەری لەشت دا، دەگوترێ: (لَهُ في هذا الأمر سابقة): لەم ئیشەدا پێش كەسانی دی كەوتووەو تێیدا كارامایە ٥ لەیاسادا بریتییە لەتاوانێك كەسێك دەیكاو لەسەری تۆمار دەكرێ ٥ هەڵس‌و كەوتێكی ڕێكو پێكەو تازە قەڵلایەو دەكرێتە نموونەو سەرەمەشق ٥ **السَّابقات**: ئەسپ ٥ **السِّبَاقُ**: قەیدو حەبلی لەسیرمەو شتی قایم قاچی باڵندەی بەهێزو دڕندەی پێ دەبەسترێ ٥ **سِبَاقَ الخيل**: ئەنجامدانی پێشبڕكێ لەمەیدانی غار غارێن دا ٥ **السَّبَّاقُ**: كەسێك زۆر جار پێشكەوتن بەدەست بێنێ ٥ **ألسَّبَقُ**: ئەوشتەی گرەوی پێشبڕكێكەی لەسەردەكرێ یان شوێنی پێشبڕكێكە.

**سَبَكَ** المَعْدِنَ سَبْكاً: مەعدەنەكەی تواندەوەو پاڵفتەی كردو خشت‌و خاڵی لێ دوور خستەوەو لەقاڵبی دا، دەشگوترێ: (سَبَكَت التجارب فلاناً): ئەزموون‌و تاقیكردنەوە فلانكەسی لەبۆتە داوەو قاڵی كردوە ٥ **سَبَّكَ المَعْدِنَ**: بەمانا (سَبَكَهُ)دێ ٥ **إنْسَبَكَ**: لەقاڵب درا ٥ **السِّبَاكَةُ**: پیشەی ئاڵتوون‌و مس توانەوەو شتی واو لەقاڵب دان ٥ **السَّبَّاكُ**: ئەو كەسەی مەعدەنەكان دەتوێنێتەوەو لەبۆتەیان دەداو دەیانكاتەوە بەقاڵب ٥ هەروا ناوە بۆ ئەوكەسەی بۆری بەلوعە لەناو خانوو باڵەخانە لێك دەداو دەیانبەستێ ٥ **ألسُّبِيكَةُ**: قاڵبە ئاڵتوون قاڵبە زیو قاڵبە رەصاص‌و شتی وا ٥ هەرپارچە مەعدەنێكی مەیلەو درێژو لەقاڵب دراو ٥ **ألمَسْبَكُ**: ئەو شوێنەی مەعدەنەكانی تێدا لەقاڵب دەدرێ ٥ **ألمَسْبَكَةُ**: ئەو قاڵب‌و ئامێرانەی ئاڵتوون و زیوو مەعدەنە تواوەكانی تێدا لەقاڵب دەدرێ.٥**إسْبَكَرَّ الشَّيْءُ**: شتەكە درێژ بوو، دەگوترێ: (إسْبَكَرَّ النبتُ واسْبَكَرَّ الشَّعْرُ): ڕووەكەكە بەرز بۆوە، قژەكە درێژ بوو ٥ **اسْبَكَرَّ الشباب**: گەنجییەكەی كامڵ بوو چاك پێگەیی ٥ **إسْبَكَرَّ النَّهرُ**: چۆمەكە ڕەوان بوو، ئاوەكەی ڕۆیی ٥ **أسْبَلَت الطريق**: ڕێگاكە قەرەباڵغ بوو خەڵكی زۆر پێدا ڕۆیی ٥ **أسْبَلَ الزَّرْعُ**: كشتوكاڵەكە گوڵی دا (أسْبَلَ السماءُ): ئاسمان بارانی باراند (أسْبَلَتْ العين): چاو فرمێسكی ڕشت، (أسْبَلَ عليه): زۆری قسە لەسەر كرد ٥ (أسْبَلَ الشَّيَ): شتەكەی بەرەڵلا كردو شلی كردەوە، دایدایەوە ٥ **سَبَّلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی كردە موڵكی هەموانی، وەقفی گشتی لەڕێگەی خودادا ٥ **الأسْبَلُ**: سمێڵ درێژ یان ڕیش درێژ ٥ **ألسَّابِلُ**: (طريق سابِلُ): ڕێبازێكە خەڵكی پێدا تێپەڕ دەبێ.٥**الاسَّابِلَةُ**: ڕێگایەك خەڵكی پێدا دەڕوا، دەگوترێ: (سبيل سابلة): ڕێبازێكە خەڵكی پێدا دەڕوا ٥ **ألسَّبَلُ**: بارانی بەخوڕەم ٥ گوڵی ڕووەك ٥ دەردێكە توشی چاو دەبێ پەردەیەكی تەنكی وەكوو تەندراوی جاڵجاڵۆكە خەتخەتی سور لەناو چاو پەیدا دەبێ ٥ پۆشاكی درێژ ٥ كراسی ئاودامان ٥ **السُّبْلاءُ**: ئافرەتێكە لەژوور لێوی سەرەوەی مووی لێ ڕوابێ ٥ چاوێك برژانگی درێژ بێ ٥ **ألسُّبُلَةُ**: (سَبَلَة الزرع): گوڵی ڕووەك، گوڵە گەنم‌و جۆ ٥

(سَبَلَةُ الرجـل): ئـەو كەوانەيـەی لەناوەڕاستی لێوی سـەرەوە ٥ قـەراخی سمێڵ ٥ لای خـواروی ڕیش ٥ (سَبَلَةَ الإنـاء): سـەری قـاپ، دەگـوترێ: (مَلَأَهُ الى سَبَلَتِهِ): تـا سـەر قاپەكەی پـڕی كـرد ٥ (جَـرَّ فـلان سَـبَلَتَهُ): فلانـكـەس پۆشاكە زێـدەو شۆڕبووەكەی ڕاكێشا ٥ (جاء وقـد نـشر سَـبَلَتَهُ): هات هەڕەشەی كـرد ٥ (هو أصْهَبُ السَبَلَة): ئـەو دوژمنـە ٥ السَّبِيلُ: ڕێـگا ٥ هۆكـارو سـەبەب ٥ هـەروا بـەمانا فـێڵ‌و تەڵەكـە دێ ٥ سبيل الله: جیهـــادو تێـــكۆشان لەڕێـــگەی خـــودادا ٥ حـەجكردن ٥ هەوڵـدان بـۆ فێربـوونی عـیلم‌و زانیـــاری ٥ هەرشتێـــك خـــودا فـــەرمانی بەئەنجامـدانی كردبێ لـەكاری خێـرو چـاكە ٥ بـەزۆری بـەمانای جیهـاد بـەكاردێ ٥ هـەروا بەمانا حـەرەج‌و عەیبـە دێ، دەگـوترێ: (لـيس علي في كذا سبيل) ٥ بەمانا بەڵـگەو دەلیـل دێ، دەگوترێ: (ليس لك علي سبيل).

إبـن الـسبيل: كەسێـكە ڕێبواربـێ‌و پێداویـستی گەڕانەوەی بـۆ شـوێنی خـۆی دەسـت نەكـەوێ ٥ السَّبَنْجُونَةُ: فەروەو باڵتۆی دروستكراو لەكـەوڵی ڕێـوی ٥ ڕیوایـەتكراوە حەسـەنی كـوڕی عـەلی فەروەیـــەكی لـــەوجۆرەی هـــەبوو لـــەكاتی نوێـژكردن دا لەبـەری نـەدەكرد ٥ السَّبَنْـتَةُ: قارغۆنی دواوەی شەمەندەفەر.

سَبِهَ سَبَهاً: عـەقڵی نـەما، شێت‌و گێل بـوو لەبـەر پیری، دەگوترێ: (هو مَسْبوه).

سَبَّهُ: بەمانا (سَبِهَ)دێ ٥ زمانی كراوەیە ٥ السَّباهي: (رجـل سـباهٍ): پیاوێـكە لەبـەر پـیری عـەقڵی نەماوە ٥ السُّبَهُ: خۆ بـەزلزان ٥ السُّباهية: خـۆ بـەزلزان ٥ السَّبَهْلَلُ: پیـاوی بێعـەقڵ‌و هـیچ نەبوو، هیچ لەبارا نەبوو ٥ پیاوی تـەڕ دەمـاخ‌و لـەخۆ ڕازی‌و لوتبـەرز ٥ هەوڵـدەر بـۆ شـتی بێهودە، دەگـوترێ: (يمشي سَـبَهْلَلاً): دێ‌و دەچـێ بەبێ ئەوەی سودێـكی دەسـت بكـەوێ ٥ كارێـك كەهیچ سودێكی لـێ چاوەڕوان نەكرێ ٥ هـەروا دەگوترێ: (ذهب أمـره سَـبَهْلَلاً): هەوڵدانەكـەی بـێ سـوود بـوو ٥ السَّبَهْلَى: خـۆ بـەزلزان‌و لارو لەنجەكار.

سَـبَى عَـدُوَّهُ سَـبْياً وسِـباءً: دوژمنـی دیـل كـرد، دەشـگوترێ: (سَـبَتْه الغانيـــة): قـــەدبارێك‌و چاوجوان دیلی كرد.

سبى الخَمْرَ: لەوڵاتێكەوە شەرابی برد بۆ وڵاتێكی تر.٥ سَبَى الماءَ: زەوی هەڵكۆڵی تا گەیشتە ئـاو ٥ سَباهُ اللهُ وأبعدهُ: خودا نـەفرینی لـی كـرد ٥ خـودا نـەفرینی لـێ بكـا ٥ استباهُ: بـەمانا (سَباه)دێ ٥ تسابى القومُ: خەڵكەكە هەندێكیان هەندێـكیانیان دیـل كـرد ٥ تَـسَبَّى لـه: خـۆی لاخۆشەویـست كـردو مامەحەمـەی بـۆ كـرد ٥ السَّابِياءُ: پـزدان ٥ ئـاژەڵ‌و بـەرو بـوومی‌و زۆر بونیـان زۆر بـونی مـاڵ‌و پیـاوی تێـكۆشەرو جـەنگاوەر ٥ (ك: سـوابِيّ) ٥ السِّبَاءُ: ئـەو دارو جـیلكەو جـەوێڵەیە ئـاو لەوڵاتێـكەوە دەیبـا بـۆ وڵاتێـكی تـر ٥ ألـسَّبْيُ: دیـل كـراو ڕفێنـراو ٥ بەزۆری بۆ ئافرەت بـەكار دەهێنـدرێ لـەو ڕووەوە دڵ ڕفێـنن یـان خۆیـان بـێ دەسـەڵاتن‌و دەڕفێنـدرێن ٥ ألـسَّبِيُّ: دیـل كـراو، ڕفێنـدراو چ پیـاو بـێ چ ئـافرەت بـێ ٥ الـسِّبَاءُ: توێـژی مارپێـستی مـار ٥ الـسَّبِيَّةُ: دوڕو گەوهـەر كەمەلـەوان لـەدەریا دەری دێنـێ.٥ السَّاتُّ: شەشەم، دەگوترێ: (جاء فلان ساتّاً): فلانـكـەس بەپلەی شەشـەم هـات ٥ السِّتُّ: شـەش ژمـارەی نێـوان پێـنج‌و حـەوت ٥ بـۆ مێینـە بـەكاردێ دەشكرێتە وشەی ڕێزدانان بۆ ئافرەت دەگوترێ

(ســت فاطمــة، ســت رقيــة، ...هتــد) ٥ **السِتَة**: ژمارەی شـەش بـۆ نێرینـە بـەکاردێ ٥ **السِتُّون**: ژمارەی شەصت ٥ شەش جار دە ٥ بۆ نێـرو مـێ بـەکاردێ ٥ **سَـتَرَهُ سَـتْراً**: شـاردیەوە ٥ سـاتره العداوة: دوژمنایەتیەکەی بۆ ئەو دەرنەخست ٥ **إستَتَرَ**: داپۆشی ٥ **إنْـسَتَرَ**: بـەمانا (إسـتتر)دێ ٥ **تَسَتَّرَ**: خۆی شاردەوە، دەگوترێ: (تَـسَتَّرَ عليـه): لێی شاردەوە ٥ **الإسْتَارُ** (من العدد): ژمـارە چـوار دەگەیـەنێ ٥ هـەروا کێشی چـوار مثقـاڵو نیـو دەگەیەنێ ٥ **إسْتَارُ القوم**: چوارەمی قەومەکەیە ٥ هـەروا بـەمانا عـەقڵو شـەرمو حـەیا دێ ٥ **السِّتَارُ**: داپۆشـەر، پەردە ٥ پـەردەی پەنجـەرەو دەرگا ٥ **السِّتَارَةُ**: بـەمانا (السِتار)دێ ٥ **السِّتْـرُ**: بـەمانا (السِّـتار)دێ ٥ بـەمانا عـەقڵو شـەرمو حـەیا دێ ٥ **السُّـتْرَةُ**: بـەمانا (السِّـتَار)دێ ٥ **السِّتِّيُ**: کەسێـکە حـەزی لەشـتی نهێنـی بـێو سرپۆش بێ ٥ داوێنپاک ٥ درەختێك لقو پۆپی زۆربـێ ٥ **المُسَتَّرَةُ** (جاريـة مُـسَتَّرَةُ): کـچۆڵەیەکی کـەژاوە نـشینو پـارێزراوە وەکـوو دوڕی نـاو صـەدەف وایـە ٥ **المَسْتُور**: داوێنپـاکو خـاوێن ٥ کەسێك حاڵو وەزعـی لای خەڵـك دیارنـەبێ ٥ **السُّتُوق**: پارەی ستۆكو تـەزویر ٥ پـارەی قـەڵب ٥ **المُـسْتَقَةُ**: ئامێرێـکە پێـی لەسـازو سـەمتور دەدرێ.

**سَتَلَ** القومُ سَتْلاً: خەڵکەکە بەرێز یەك لەدوا یەك هاتنە دەرەوە.

**سَـتَلَ** اللؤلـؤةَ: دەنکـە لولوئـەکان یـەك یـەك لەبنەکـەیان کەوتنـە خـوارەوە ٥ **سَـتِلَهُ سَـتْلاً**: شوێنی کەوت ٥ **سَاتَلَ**: شوێنی کـەوت ٥ **تـسَاتَلَ**: بەمانا (سَـاتَلَ)دێ ٥ **سَـتَالَةُ الشَّيْئ**: جۆرە پـرو پوچەکانی شت ٥ **السُّتَلُ**: باڵندەیەکە لەپێری (الـصقريات) گـەورەترین باڵندەیـە لـەڕوی قـەبارەوە، چـونکە درێـژی باڵـەکانی لـەکاتی کردنــەوەیان نزیکــەی ســێ مــەتر دەبــن ٥ لەشوێنی چیاو شاخو کـەژدا دەژی ٥ **المَـسْتَلُ**: ڕێگەی تەنگەبەر ٥ **سَـتَهَهُ سَـتَهَا**: دوای کـەوتو لـێ نابێتەوە، هەمیشە بەدواوەیەتی.

**سَتِهَ** سَتَهاً: سمتی زل بوون ٥ (فهو أسته وهي ستهاء) ٥ **الإسْتُ**: سمت ٥ جارێکوایش دەبـێ مەبەسـت خــودی کــونی پاشــەوەیە ٥ (ك: أســـتاه) ٥ بەخەڵکانی خوێڕیو هەتیوەچە دەڵێن: (سْتَاه) ٥ **أسـت الـدهر**: ئـەوەڵی ڕۆژگـار ٥ ابـن استها: کوڕی کۆیلەو دایك نەمەتە ٥ منداڵی زینا.

**سَجَّ** بَطْنُهُ سَجّاً: گورونکەی توش بوو ٥ سکی چوو.

**سَجَّ** الطائرُ: باڵندەکە ناوسکی خۆی دانا.

**سَجَّ** بسَلْحِهِ: جیقنەی ڕونی کرد.

**سَجَّ** سَطْحَهُ: بەقوڕی شل سەربانەکەی سواخ دا.

**سَــجَّ** الحـائطَ: دیوارەکـەی سـواخ دا ٥ **الـسَّجَاجُ**: ماستاوی زۆر ڕون ٥ **السَّجُ**: دەگوترێ: (أخـذه في بطنه سَجُ): سـکی چـوو ٥ **المِسَجَّةُ**: مـالنج، ماڵە؛ ئامێرێــکە قــوڕو گــەچو شــتی وای پــێ بــڵاو دەکرێتەوە.

**سَجَعَ** له بشيئ مـن الكـلام سَـجْعاً: بەتـەعریـضو توانج مانایەکی ئاڕاستە کرد.

**سَـــجَاحِ**: نــاوی ژنێکــی تەمیمییـــە لافــی پێغەمبــەرێتی لــێ دە دا، هاوســەرو هــاوەڵی موسەیلیمە بوو.

**السُّجَاحُ**: بەرامبەر.

**السُّجُحُ** من الطريق: ناوەراستی ڕێگا ٥ ڕیزو تەناف ٥ دەگوترێ: (بنـوا بيـوتهم علـى سُـجُح واحـد): خانووەکانیـان لـەرێزی یـەك دروسـت کـردون.

**السُّجْحَةُ**: سروشتو رەوشت.

**السَّجِيحُ**: نەرمو شل، ئاسان ◊ دەگوترێ: (خُلُقٌ سَجِيح): رەوشتی نەرمو نیان.

**السَّجِيحَة**: بەمانا (السُّجْحَةُ)دێ.

**سَجَدَ** سُجوداً: چووە سوژدە ◊ ملکەچ بوو ناوچاوانی خستە سەرزەوی.

**سَجَدَتْ** السفينةُ للريح: کەشتییەکە بەگوێرەی بایەکە مەیەلانی کرد.

**سَجِدَتْ** رجلُهُ سَجَداً: قاچی هاوسا ◊ **أَسْجَدَ**: سەری دانەواند چووە رکوع ◊ (أَسْجَدَ الرَّجُلُ) پیاوەکە بە تێلەی چاو زۆری بۆ روانیو درێژەی بە تەماشاکردنەکە دا ◊ **السَّاجِدُ**: دەگوترێ: (فلان ساجد المنخر) فلانکەس ملکەچو زەلیلو فەرمانبەرداره ◊ **السَّاجِدَةُ**: مێینەی (السَّاجِدَ) دەگوترێ: (عين ساجدة) چاوەکە پرتە پرتیەتی، چاوەکە فرە فرپەتی ◊ دەشگوترێ: (نخلة ساجدة) دار خورمایەکی قەد خوارو خێچە ◊

**السَّجَّادُ**: کەسێك زۆر سوژدە بەرێ ◊ **السَّجَّادَة**: بەرماڵ، فەرشێکی بچوکە نوێژی لەسەر دەکرێ ◊ شوێنکەی سوژدە بردن بەناو چاوانەوە ◊ **الْمَسْجَدُ**: ناوچەوان ◊ (الْمَسَاجِدُ من بدن الانسان) ئەو ئەندامانەی لەکاتی سوژدە بردندا بکەونە سەر زەوی کە بریتین لە ناوچەوانو لوت دوو بەری دەستو هەر دوو کەشکە ئەژنۆو هەردوو چاوە قامکی قاچ ◊ **الْمَسْجِدُ**: مزگەوت ◊ شوێنی نوێژی موسوڵمانان ◊ **الْمَسْجِد الحرام**: مزگەوتی کەعبە ◊ **الْمَسْجِد الأقصى**: مزگەوتی قودس ◊ **الْمِسْجَدَة**: بەرماڵ.

**سَجَرَ** سَجْراً وسُجوراً: پربوو (سَجَرَ الاناءَ) قاپەکەی پرکرد ◊ (سَجَرَ الشِعرَ) شیعرەکەی بەتاك قافیەیی نەگوت.

**سَجَرَ** الماءَ في حلقه: ئاوی رژاندە قورگیەوە.

**سَجَرَ** التنور: تەندورەکەی پرکرد لە سوتەمەنیو گەرمی کرد.

**سَجَرَ** الرَّجُلُ الكلْبَ: پیاوەکە قلێتەی کردە ملی سەگەکە ◊ **سَجِرَتْ عَيْنُهُ سَجَراً وسُجْرَةً**: سپێنەی چاوی کەمێك سوری تێدایە ◊ (فهي سَجْراءُ) بە خاوەنی چاوەکەش دەگوترێ ◊ **سَاجَرَهُ**: هاورێیەتی کردو ئەمەکو وەفای لەگەڵدا نواند ◊ **سَجَّرَ الاناءَ ونحوه**: قاپەکەی پرکرد ◊ **سَجَّرَ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵقوڵاند فیچقەی کرد ◊ **سَجَّرَ الشِعْرَ**: شیعرەکەی تاك قافیەو قافیە جودا خوێندەوە یان بە هەردوو شێوەکە شیعری دانا ◊ **سَجَّرَ الكَلْبَ**: قلێتەی لە ملی سەگەکە کرد ◊ **إنْسَجَرَ**: پری کرد (إنْسَجَرَ الشِعرَ) شیعرەکەی بە قافیەی جیا جیا دانا، خوێندییەوە ◊ **إنْسَجَرَ في السَّيْرِ**: لە رۆیشتندا بەردەوام بوو ◊ **الأَسْجَرُ**: لێڵ ◊ دەگوترێ: (غدير أسْجَرُ) گۆلاوێکی لێڵە، ئاوەکەی قوراوێکی مەیلەو سورە ◊ **السَّاجِرُ**: لافاو ◊ الساجور: قلێتە دەکرێتە ملی سەگ ◊ **السَّجْرُ**: چاوگەو بەکاردەهێندرێ بۆ گرمەی هەور ◊ دەگوترێ: (بئرٌ سَجْرٌ) بیرێکە پرە لە ئاو ◊ **السُّجُورُ**: دارو چیلکەو چەوێڵ کە ئاگری پێ دەکرێتەوە ◊ **السَّجِيرُ**: دۆستی گیانی بەگیانی ◊ **الْمِسْجَرُ**: کۆڵەوەژ ئەو دارەی ئاگری تەندوری پێ خۆش دەکرێ ◊ **الْمِسْجَرَة**: بەمانا (الْمِسْجَرُ) دێ ◊ **الْمَسْجُورُ**: هەڵایساو هەڵگیرساو ◊ پر.

**سَجِسَ** سَجَساً: لێڵ بوو رەنگی گۆرا.

**سَجِسَ** الماءُ: ئاوەکە لێڵو قوراو بوو ◊ **سَجَّسَ الإبطُ والماءُ**: بن هەنگڵی بۆنی کرد، ئاوەکە بۆگەن بوو ◊ **سَجَّسَ الماءَ**: ئاوەکەی لێڵ کرد ◊ **السَّاجِسِيُّ**:

(كبش ساجسي) مەڕێکی سپی زۆر سپیو خوریەکەشی زۆرە.
اَلسَّجَسُ: لێڵو گۆڕاو ٥ السَّجِيسُ: هەرگیزاو هەرگیز ٥ دەگوترێ: (لا أفعله سجيس الليالي أو سجيس الليالي والأيام أو سجيس الدهر) مەبەست ئەوەیە قەت ئەوە ناکەم ٥ اَلسَّجْسَجُ: (يوم سَجْسَجٌ) ڕۆژێکی کەشو هەوا مام ناوەندییە نەساردەو نەگەرمە ٥ (ظل سَجْسَجٌ) (وأرض سَجْسَجٌ) زەوییەکە نە نەرمەڵانە نە ڕەقو پتەوە ٥ یان زەوییەکی پانو بۆرە ٥ سَجَعَت الحمامة والناقةُ سَجْعاً: کۆترەکە بەیەك شێوە خوێندی ٥ حوشترەکە بەیەك شێوە باڕاندی.
سَجَعَ فلان: فلانکەس بە شێوەیەك قسەی کردن ڕستە کانی وشەکانی سەرەوایان هەبوو وەکوو شیعر ٥ دەشگوترێ: (سَجَعَ الكلامَ وسَجَعَ به) قسەکانی سەرەوادار کردن.
سَجَعَ له: قەصدی ئەوی کرد.
سَجَعَ فلان في سيره: فلان مامناوەندیو ڕاستاڵ بوو لە مەبەست لای نەدا ٥ سَجَّعَ الكلامَ وسَجَّعَ فيه: قسەکانی بەشێوە سەجع کردن شێوازی سەجعی لە قسەکانیدا پەیڕەو کرد ٥ الأُسْجُوعَةُ: قسەی سەجع دار، ڕستەی سەرەوادار ٥ السَّاجِعُ: دەگوترێ: (ناقة ساجعة وساجع) حوشترێکی وەهایە لەیەك شێوە دەباڕێنێ ٥ دەمو چاوی ڕێكو پێك ؛ ڕوخسار جوانو قۆز ٥ السَّجْعُ: قسەکردن بەشێوەیەك ڕستەکان سەرەوایان هەبێ بەلام بێ کێش بن ٥ السَّجْعَةُ: پارچەیەك لە کەلامی سەرەوادار ٥ اَلْمَسْجَعُ: مەبەستو ڕێڕەو
سَجَفَ البيت سَجْفاً: حەصیرو شتی وای خستە سەر سەقفی خانوەکە ٥ أَسْجَفَ الليلُ: شەو تاریك بوو ٥ أَسْجَفَ البَيْتَ: حەصیرو تامانو قەفەزاژی خستە سەر سەقفی بانەکە ٥ أَسْجَفَ السِّتْرَ: پەردەکەی دادایەوە ٥ السِّجَافُ: پەردە ٥ ئەو نەخشو ئەتەمینو پەراوێزەیە بە دامێنی کراسەوە دەلکێندرێ ٥ السِّجَافَةُ: پەردە ٥ السِّجْفُ: دوو پەردە لێك نزیك بنو بەتاڵایی یەکیان لە نێواندا بێ ٥ السُّجْفَةُ: ساتێك لە شەو ٥ اَلسُّجُقُ: ڕیخۆڵە بە پارچە گۆشتو بەز داپۆشرێ.
سَجَلَ به سجلاً: لە بەرزییەوە فڕێی دایە خوار.
سَجَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی یەك لەدوای یەك نارد.
سَجَلَ الماءَ: ئاوەکەی لە بەرزییەوە بەسەردا هەڵڕژان.
سَجَلَ السورة أو القصيدة: سورەتە قورعانەکە یان چامە شیعرەکەی بێ پسانەوە خوێندەوە ٥ أَسْجَلَ فلان: فلانکەس خێرو بێری زۆر بوو ٥ أَسْجَلَ الحوض وغيره: حەوزەکەی پڕکرد ٥ أَسْجَلَ فلاناً: دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچەی دا بە فلانکەس ٥ یان زۆر عەتاو بەخششی پێدا ٥ أَسْجَلَ له: نامەیەکی بۆ نووسی ٥ أَسْجَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی نارد، دەگوترێ: (أسجل البهمة مع أمها): بەرخۆڵەکەی لەتەك دایکیدا نارد بۆ کێو ٥ أَسْجَلَ الكلامَ: قسەکانی بەرەوانیو بێ ڕاوەستان ئاراستە کردن ٥ ڕێگەی پێدا قسەکانی خۆی بڵێو ڕای خۆی دەربڕێ ٥ أَسْجَلَ الأمرَ: کارەکەی بۆ بەرەوا زانی ٥ (هذا أمر مُسْجَلٌ): کارێکە بۆ هەموو کەس ڕەوایە ٥ أَسْجَلَ الناسَ: وازی لە خەڵکەکە هێنا ٥ ساجَلَهُ: بەرامبەری وەستاو شانازی بەسەردا کرد ٥ سَجَّلَ: سیجلەکەی نووسی ٥ سَجَّلَ القاضي: قازی بڕیاری داو حوکمی کردو بڕیارەکەی

بالشَيْئ: بەمانای (شَبث) دێ ٥ تَشَبَّثَ برأيه: پابەنـدی ڕای خـۆی بـوو ٥ الشُّبَثُ: جـۆرە مەگەزێـکە بەئەنـدازەی جاڵجاڵۆکە گەورەیـە، ڕەشـە خەڵـك پێی دەڵێن (أبو شبث) ٥ الشَّبِثُ: (رَجُلٌ شَبِثٌ): پیاوێکە پابەندی ڕاوبۆچونی خۆیـەتی ٥ الشَّبَثَةُ: ئەوکەسەی هەمیشە لەگەڵ هاوشانی خۆی دایەو لـێ جیانابێتەوە.

شَبَحَ الشَيْئُ: تارمایی شتەکە دەرکەوت.

شَبَحَ الجِلدَ ونحوه: لـەنێوان سـینگ‌و گـوڵمیخ دا ڕایکێشا بۆ ئـەوەی لـێ بـدا، دەگـوترێ: (شَبَحَ الشَّخصَ): کەسەکەی ڕاکێشا بۆ ئەوەی جەڵدەی لـێ بـدا ٥ یـان وەکـوو لەسـێدارە دراو درێـژی کردەوە.

شَبَّحَ العـودَ: دارەکـەی ڕێکخسـت‌و پـانی کـرد ٥ دەسـتی هـەڵبڕی‌و درێـژی کـردن بـۆ پاڕانـەوەو دوعاکردن.

شَبُحَ الرجلُ شباحةً: پیاوەکە باسکی ئەستور بون‌و نێوشانی پان بوون ٥ (فهو مشبوح الذراعين) ٥ شَبَّحَ فلان: فلانکەس ئەوەندە پیر بوو چاوی کز بون بەجۆرێـك یـەك تارمـایی بـەدوو تارمـایی ببینێ ٥ بۆ موبالەغەی (شَبَحَ)دێ زۆری ئیلحاح کـرد لـەداوا کـردن دا ٥ شَبَّحَ الشَيْئَ: شـتەکەی لێـك کێشایەوەو هـەوڵی دا زیـاتر پـانی بکـا ٥ توێکڵەکەی لێ کردەوە ٥ الشَّبَحُ: تارمایی کەلە دورەوە دەبینرێ‌و نازانی چییە.

شَبَحَ الشَيْئَ: سێبەرو خەیاڵی شت

شَبَرَ الثوبَ: قوماشەکەی بەبست پێوا.

شَبَرَ شَبراً: تـەڕ دەمـاخ بـوو ٥ شَبَّرَ الثوبَ ونحوه: قوماشەکە یان شتی تری بەبست پێوا ٥ تشابر الفريقان: دوو تاقمەکە لەشـەڕدا لێـك نزیـك بونـەوە ٥ الشِّبْرُ: بـست؛ نێوانی سـەری پەنجە

گەورەو سەری پەنجە بچوکە ٥ المَشابِرُ: شوێنی بـەکارهێنانی ئـاو ٥ ئـاوی نزمـی ژێـر زەوی کەئاوی تری دێتە سەر ٥ الشُّبُورُ: کەرەنا، زوڕنا ٥ شتی دەنگ گەورە کەر ٥ الشُّبُورَةُ: تەم‌و مـژی بەیانی ٥ شَبْرَقَهُ شَبْرَقَةً وشِبْراقاً: بـڕی‌و پارچـە پارچەی کرد، دەگوترێ: (شَبْرَقَ الثوبَ، وَشَبْرَقَ اللحمَ وشَبْرَقَ البازي الصيدَ) ٥ شُبارِق: (ثوبٌ شُبارِق): قوماشێـکی دادڕ دادڕی ونجـڕ ونجرکراوە ٥ لحم شُبارِق: گۆشتێکی جۆراو جۆر کـوڵاوەو کـراوە بەچـەند جـۆر چێـشت ٥ الشَّبارِقُ: (ثوب شَباريق): قوماشی دڕاو ونجڕ ونجڕکراو.

الشِّبْرِقَةُ: پارچە قوماش ٥ گژوگیای تـەنك‌و بچکە بچکە ٥ الشُّبُوطُ: جۆرە ماسییەکە لـەڕوباری دیجلەدا بـەزۆری هەیـە، ناوقـەد ئەستورو کلك باریك‌و جستە نەرمە ٥.

شَبِعَ شِبَعاً: گەدەی پڕ بوو لەخواردەمـەنی، تێر بوو ٥ شَبِعَ الجِسْمُ: جستەی پڕ بووە، قەڵەو بوو تێکسمڕا.

شَبِعَ مِن الأمرِ: لەکارەکە وەڕزبـوو لێـی بێـزرا ٥ أشْبَعَهُ: تێـری کـرد ٥ خـواردنی دایـە تـا تێـری خوارد ٥ أشْبَعَ الثوبَ: قوماشەکەی ڕەنگ کرد ٥ أشـبَعَ السـائِلَ: شـلەمەنییەکە چـی تێـدابوو توانرایەوە ٥ ئەوەی کرا بتوێتەوە توانرایـەوە ٥ أشْبَعَ الشَيْئَ: شتەکەی بـەتێرو تەسـەل تـەواو کـرد، دەگـوترێ: (أشبَعَ البحثَ): باسـەکەی بەتێرو تەسەلی خستەڕو ٥ تَشَبَّعَ: خۆی بـەتێرو تەسەل نیشان دا، دەگوترێ: (تَشَبَّعَ الماءُ بالمِلحِ): ئاوەکە تێـر خوێ بـوو ٥ الشُّبَاعَةُ: وردە نـان‌و نێـسقانی کـراوەو بـەرماوەی خـۆراك لەسـەر سفرەو خوان دوای تێرلـێخواردن ٥ الشَّبِعُ مِن

الطعـام وغـيره: ئـەو خۆراكـەی دەبێتــە هـۆی تێربون.

اَلشُّبْعَةُ من الطعام: ژەمە نان ٥ اَلشَّبِيعُ: تێرکراو.

شَـبِقَ الـذكرُ مـن الحيـوان شَـبَقاً: نێرەکە زەوقـی لەمێیەکە بەهێز بوو.

شَبَكَ الشَّيْءَ شَـبْكاً: شـتەکە هەندێـکی چووە نـاو هەندێـکی ترەوە.

شَبَّكَ الشَّيْءَ: شتەکە هەندێکی چەقییە هەندێکی، چونە ناو یەکترەوە، دەگوترێ: (شَبَّكَ أصَـابِعَهُ): پەنجەکانی تێـک نان ٥ شُـبَّاكٌ: زێـدەڕۆیی مانـای (شَـبَكَ) دەگەیـەنێ ٥ شـتەکان زۆر چونە نـاو یەکەوەو چەمبەرەیان بەست ٥ تَشَابَكَ الـشَّيْءُ: بەمانا (شَبَكَ)دێ، دەگوترێ: (تَشَابَكَتِ الأمـور): کارەکان چونە نـاو یەکـەوەو ئـاڵۆزان ٥ اشْـتَبَكَ: بـەمانا (تَــشـابك)دێ، دەگــوترێ: (تَــشَابَكَتْ الأمــور): کارەگــان تێــکەڵاو بــوون ٥ اشْـتَبَكَ الجيشان: دوو سوپاکە تێکچرژان پێك وەربوون ٥ تَشَبَّكَ: بـەمانا (اشْتَبَكَ)دێ ٥ اَلـشَابِكَ: (طريـق شــابِكٌ): رێـگایەکی چەواشـەو ئـاڵۆزە ٥ (أمــر شَـابِكٌ): کارێـکی تێـکەڵو پێـکەڵە ٥ اَلـشَبَّاكُ: ئـەو کەســەی بــەتۆڕو داو نێــچیر دەگــرێ ٥ الـــشُبَّاكُ: پەنجــەرە لەناســنو دارو شــتی وا ٥ تاینــچەو رەشــکە ٥ ســیرمەو شــتی وا کــەوەکوو تاینجــە بــچەندرێو شــتی تێــدا بــاربکرێ ٥ اَلشُّبَكُ: ددانی شانە ٥ کۆی (شَبَكَة).

اَلشُّبْكُ: سەبیل؛ شتێکە تـوتنی تێـدەکرێو ئـاگری پێوە دەنرێ بۆ کێشان ٥ اَلشَّبَكَة: تـۆڕی ڕاوچـی ٥ بــەزۆری لەبــەنو بــەنی نــایلۆن دەچــندرێ وەکوو تاینجەو رەشکە ٥ هەرشتێـك بەیەکـەوە پەیوەست بـن ٥ اَلشَّبْكَةُ: دیـاری زاوا بـۆ بـوك ٥ دیاری بۆ دەزگیران بـۆ ئـەوەی بزانـرێ کـە ئـەو کوڕو کچە دەبنە هاوسەری یەکتری ٥ الـشُّبَكِيَّةُ: هـەر چنراوێــك کونکـون بـێ وەکـوو تاینـچەو ڕەشکەو تۆڕی ماسی گرتنو ڕاوکردنـی نێـچیر ٥ اَلْمُـشَبَّكُ: جـۆرە حـەڵواو شـیرینییەکە لەسـەر شێوەی بۆری تێـك خراوو لێـك بەستراو دروست دەکـرێ ٥ المِـشْبَكُ: ئـامێری چنینی شـەبەکەو تۆڕو تاینچەو شتی وا ٥ جۆرە خشڵێکە لە زێـڕ یــان لــە ئــەڵماس لەســەر ســینگو مــەمك هەڵدەواسرێ یان لەسەر قایم دەکرێ.

شَبَلَ الغلامُ شبولاً: منداڵەکە گەورە بوو، لەنازو نیعمەت دا پەروەردە بوو ٥ أشبَلت اللَّبُوَةُ: دێڵە شێرەکە بێچوی بوو ٥ اَشْبَلَت المرأةُ على أولادها: ئافرەتەکـە بەســەر منداڵەکانیــەوە دانیــشتو دوای مردنی مێردەکەی شـوی نـەکردەوە خـۆی کرد بە شێرەژن ٥ (فهي مُشبِلٌ) ٥ الشِّبْلُ: بێچوە شێر.

شَـبِمَ شَـبَماً: سـارد بـوو ٥ هەسـتی بەسـاردیو برسـیەتی کـرد ٥ (فهـو شَـبِمٌ)، دەگـوترێ: (مـاء شَبِمٌ): ئاوێـکی ساردە ٥ (غداة شَبِمٌ): بەیانیـەکی ساردە ٥ (قلب شَبِمٌ): دڵێـکی ساردو کەم هەستە ٥ الشِّبَامُ: مـەمك مـژە؛ دارێـکە یـان نایلۆنێـکە دەخرێتـە دەمـی منداڵـەوە بـۆ ئـەوەی بخافڵێو بـیری شـیرخواردنی نـەمێنێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ دەمبـێنو ئـەو دارەی دەخرێتــە دەمـی بێـچوە ئاژەڵــەوە تانــەتوانێ شــیری دایکـی بخـوا ٥ الـشِبَامَان: دو پـەتو حـەبلن لـەملاو لـەو لای دەسماڵو کوڵوانەو رۆبو شتی وا پێـکەوە گـرێ دەدرێن.

شَبَنَ الغلام شَبْناً: منداڵەکە گەورە بوو پێـگەییو خۆی دارشت ٥ شَبَنَ الشَّيْءُ: شتەکە نزیك بـۆوە ٥ (فهو شابن) ٥ الشَّبِينُ: لـەلای مەسیحییەکان بـەو کەسە دەگـوترێ کە هاورێیـەتی بوك یـان زاوا دەکا

لەرۆژانی گواستنەوەی بوك دا، بەکوردی خۆمان (بەربوكو برازاوا)یان پێ دەڵێن ٥ هەروا ناوە بۆ ئەوکەسەی بەفەرمانی قەشەی مەسیحی منداڵەکە دەخاتە ناوی مەعمودییەوە کە دابو نەریتێکی مەسیحیانە دەبێ قەشە ئایەتی تەنصیر بەسەر ئاوەکەدا بخوێنێو منداڵەکەی پێ بشۆرێ ٥ أَشْبَهَ الشَّيْئُ الشَّيْئَ: شتەکە لەشتەکە چوو ٥ شابَهَهُ: لەو چوو ٥ شُبِّهَ عليه الأمر: شتەکەی لێ تێکچوو نەیزانی کامەیەو لێی چەواشە بوو ٥ شَبَّهَ الشَّيْئَ بالشَّيْئِ: شتەکەی بەشتێکی تر شوبهاند ٥ لەشوێنی ئەو شتە شتێکی تری هاوشێوەی دانا چونکە لێك دەچوون ٥ شُبِّهَ عليه وله: لێی تێکچوو نەیزانی کامە کامەیە ٥ اِشْتبهَ في المسألة: گومانی لەراستی مەسەلەکەدا بۆ پەیدابوو ٥ تشابه الشَّيْئان: ئەو دوشتە لێك چون بەجۆرێك چەند سەرنجیان بدەیتێ نازانی کامەیان کامەیەو لێك ناکرێنەوە ٥ تشَبَّهَ بغيه: چاوی لەو کرد لاسایی کەسێکی تری کردەوە ٥ ألتشبيه: شوبهاندنو لێك چواندنی دوشت یا زیاتر بەیەکتر چونکە لەچەند دیاردەو رەوشتێك دا جۆرە هاوبەشییەکیان هەیە وەکوو شوبهاندنی پیاوی ئازا بەشێر یان شوبهاندنی ئافرەتی جوان بە گوڵ یان بەمانگو ئەستێرە ...هتد ٥ تشبيه المسجونين: وەرگرتنی پەنجە مۆری گیراوەکانو نووسینی شێوەو روخساریان لەسەر کارتێکی تایبەتی بۆ دیاریکردنی کەسایەتییان ٥ ألشُبْهُ: هاوشێوە ٥ ألشَّبَهُ: مسی زەرد ٥ ألشُّبْهَةُ: لێتێك چونو لێشێوان ٥ لەشەرع دا بەشتێك دەگوترێ نەزاندرێ ئاخۆ حەڵاڵە یان حەرامە، حەقە یان بەتاڵە ٥ الشَّبيهُ: هاو وێنەو هاوشێوە ٥ ألمُشابه: تەمو مژاویو مانا بەزەحمەت زانراو، شتی وا کەم کەس لێی تێ بگەن ٥ وشەی (متشابه) لەوشوێنەدا زۆر مانا هەڵدەگرێ ٥ ألمُشابِهُ: بەمانا (الأشباه)دێو کۆی (شَبَه) بەمانای هاو وێنە دێ ٥ ألمُشَبِّهة: پێرێکی ئایینین خودا دەشوبهێنن بەشتی دروستکراو.

شَبا الشَّيْئُ شَبواً: شتەکە بەرزبۆوە ٥ (شَبا الفرسُ): ئەسپەکە بۆوە بەجوانو.

شَبا وَجْهُهُ: دەموچاوی گەشاندەوەو دوای گرژیو مۆنی روخساری رون بۆوە.

شَبَّ النارَ: ئاگری کردەوە ٥ أَشبي الشَجَرُ: درەختەکە درێژ بوو تێکهاڵا، تێکچرژا ٥ أشبي على فلان: بەزمیی بەفلان دا هاتەوەو یارمەتی دا ٥ أشبي فلان: فلانکەس منداڵێکی زیرەكو ئاقڵی بوو ٥ أشبي فلاناً: رێزی فلانکەسی گرتو قەدرزانی بەرامبەر نواند ٥ أشبي الأولادَ آباهم: منداڵەکان چوونەوە سەر باوکیان لەو دەچن ٥ الشَّبا: قەوز ٥ تەرزە ٥ شَباه الشَّيْئِ: تیژایی قەراخی شتەکە ٥ (شَباة السيف): تیژایی دەمی شمشێر ٥ (شَباة العقرب): جزوی دوپشك ٥ شَبْوَةُ: ناوە بۆ دوپشك (اسم غير منصرف) ٥ جارية شَبْوَةٌ: کەنیزەکێکی گورجو گۆڵە ٥ شتت الأشياءُ شتاتاً: شتەکان لێك بڵاوبون ٥ شتت الديار بفلان: وڵات فلانی لەخۆی دورخستەوە لەوڵات دورکەوتەوە ٥ شَتَّ بقلبه الوَجْدُ: عەشقو دڵداری سۆزی فلانی هەڵساندو بیرو بۆچونی شێواند ٥ شَتَّ الأشياءُ: شتەکانی بڵاوە پێ کرد، دەگوترێ: (أَشَتَّ بي قومي): ئەتەوەکەم سەریان لێتێك دام نازانم چۆن هەڵسو کەوت دەکەم ٥ شَتَتَ الأشياءَ: شتەکانی بڵاوکردنەوە ٥ تَشَتَّتُوا: بڵاو بونەوەو هەریەکەیان بەلایەکدا رۆیی ٥ الشَّتاتُ: جیاجیا ٥ (أَمْرٌ شَتَاتٌ): کاری جیا جیا، دەگوترێ: (جاء القومُ شتاتَ شَتَاتَ): خەڵکەکە

بەجیا جیا هاتن ٥ **أَلشَتُّ**: (أمرٌ شَتٌّ): کارێکی پەرت‌و بڵاوە ٥ دەگوترێ: (اذهبوا أشتاتاً): بەجیا جیا ڕۆیشتن ٥ **شَتَّانَ**: دەگوترێ: (شَتَّانَ مابینهما): نێوان ئەو شتە زۆر جیاوازییان گەورەو بەرفراوانە ٥ **الشُتُوتُ من الناس**: کۆمەڵگایەك دانیشتوانەکەی هەریەکەیان سەر بەتیرەو هۆزێك بن‌و لەتیرەو خێڵی جیا جیا پێکهاتبن ٥ **الشَتیتُ**: لێك بڵاوە بوو ٥ (ثغر شتیت): ددانی نێوان کەل‌و یەك یەك، واتە ددان شاش‌و ڕێك ٥ **أشیاءٌ شَتّی**: چەند شتێك لەجۆری جیا جیا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾ هەوڵ‌و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرو جیاجیان ٥ **شَتَرَهُ شَتْراً**: بریەوە، دڕاندی، دەگوترێ: (شَتَر ثوبَهُ): قوماشەکەی دڕی ٥ (شتر فلاناً): فلانکەسی بریندار کرد ٥ **شَتَرَ الداءُ عَيْنَهُ**: نەخۆشییەکە پێڵوی چاوی هەڵگێڕایەوە.

**شَتِرَ شَتَراً**: دوو لەت بوو، دەگوترێ: (شَتِرَ فلان): فلانکەس لێوی خواروی قەڵشی ٥ **شَتَّرَ بفلان**: ڕەخنەی لەفلانکەس گرت‌و جوێنی پێدا ٥ **أَلشَتَرُ**: عەیبدارو ڕەوشت ناشیرین ٥ **الشُتْرَةُ**: بۆشایی نێوان پەنجەکان.

**شَتَلَ الزَرْعَ شَتْلاً**: تۆوەکەی لەشوێنێك چاند بۆئەوەی بڕوێن‌و دوایی شەتڵەکان هەڵکێشرێ‌و لەشوێنێکی تر بیان نێژرێ ٥ **الشَتْلَةُ**: ڕوەکی تازە ڕسکاوو سەوز بوو لەوشوێنەی لێی ڕواوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ **أَلمَشْتَلُ**: شەتڵگا ٥ شوێنی شەتڵ ٥ زەوییەك تۆوی لێ بچێندرێ دوای تێپەڕبوونی مانگێك یا زیاترو کەمتر شەتڵەکە هەڵبکێشرێ‌و لەشوێنێکی تر بچەقێندرێتەوە ٥ **شَتَمَهُ شتماً**: جوێنی پێدا.

**شَتُمَ شَتَامَةً**: ڕوخسار ناشیرین‌و نەکڵەوەت بوو ٥ **شاتَمَهُ**: جوێنی پێدا ٥ **الشُتَّامُ والشُتَّامَةُ**: دەموچاو ناشیرین‌و بەدڕەوشت ٥ **الشَتيمةُ**: جوێن.

**شَتَنَ الثوبَ شَتْناً**: قوماشەکەی چنی ٥ (فهو شاتِن وشتون) ٥ **شَتَّانَ**: بڕوانە (شَتَّ).

**شَتَا بالمکان شَتْواً**: بە زستان لەوشوێنە مایەوە.

**شَتَا الشَتاءُ**: زستان سارد بوو.

**شتا اليومُ**: سەرماکەی توند کرد.

**شتا السماءُ**: ئاسمان بارانی باراند ٥ **أشتی فلانٌ**: فلانکەس کەوتە زستانەوە ٥ **أشتی القومُ**: خەڵکەکە تووشی برسیەتی‌و قات‌و قڕی بوون ٥ **شاتاه مشاتاةً وشتاءً**: مامەڵەی لەگەڵ دا کرد لەماوەی زستان دا ٥ **شاهره مشاهرة**: لەماوەی مانگێك دا مامەڵەی لەگەڵ دا کرد ٥ **شَتّی بالمکان**: بەمانا (شتا)دێ ٥ **شتّی الشَیْئُ فلاناً**: شتەکە بەشی زستانی فلانکەسی کرد ٥ **الشِتاءُ**: زستان ٥ زەموستان وەرزێکە لەوەرزەکانی ساڵ، لەسەرەتای بیست‌و دووی مانگی دوانزە دەست پێدەکات‌و لەبیست‌و یەکی مانگی ئازاردا کۆتایی پێ دێ ٥ گرانی‌و قات‌و قڕی ٥ **أَلشَتْوَةُ**: زستان ٥ **الشَتْوِيُّ**: بارانی زستان ٥ **الشَتِيُّ**: بەمانا (الشَتوي)دێ ٥ **أَلمَشْتَی**: شوێنێك زستانی تێدا بەسەر بەرێ ٥ وەرزی زستان ٥ **أَلمَشْتَاةُ**: بەمانا (أَلمَشْتَی)دێ ٥ زستان ٥ **شَثِنَتْ كَفُّهُ شَثْناً**: دەستی زبر بون ڕەق‌و ئەستور بون ٥ **الشَثْنُ**: ئەستورو زبرو ڕەق، دەگوترێ: (رجل شَثْنُ الأصابع): پیاوێکە دەست‌و پەنجە زبرە.

**شَجَبَ فلانٌ شَجوباً**: فلانکەس بەهیلاك چوو، فەوتا ٥ غەمبار بوو.

**شَـجَبَ** الغـرابُ شَـجيباً: قەلەرەشـەكە قرانـدیو ناوانی خەڵكەكەی تێكدا.
**شَجَّبَ** فلاناً شجباً: فلانكەسی بەهیلاك برد.
**شَـجَبَ** الـصَّيْدَ: تیرێـكی بەنێـچیرەكەوەناو خـپـی كرد، جوڵەی لێ بڕی.
**شَجَبَ** فلاناً: فلانكەسی خەفەتبار كرد.
**شَجِبَ** الشَّيْءُ فلاناً: شتەكە فلانكەسی هەڵەو گیر كرد.
**شَـجَبَ** الـشَّيْءَ: شتەكەی كێش كـرد، دەگوترێ: (شَـجَبَ اللِجـامَ): ڕیـشمەكەی تونـد كـرد ٥ گرتیەوە.
**شَـجَبَ** القـارورةَ بالـشِجاب: بـە تۆپەوانـە دەمـی گۆزەكەی گرت.
**شَجَبَ** الرأيَ والموقفَ: نارەزایی خۆی بەرامبـەر راو هەڵوێستەكە دەربڕی.
**شَجِبَ** شَجْباً: فەوتا، تێدا چوو ٥ خەفـەتبار بـوو ٥ **أشْـجَبَهُ**: غـەمباری كـرد ٥ **تـشاجبت الامــور**: كارەكـان لێــك نـاڵۆزان و چەواشــە بــوون ٥ **الشَّاجِبُ**: زۆر بڵێ و چەقە چەناو ٥ قەلەرەشی نەگبـەت كـە دەقرێنـێ و شوم بـڵاو دەكاتـەوە ٥ **الشِجابُ**: عەلاگەی جل هەڵواسین ٥ سەدادە ٥ **الشَّجَبُ**: پێداویستیو غەمو خەفـەت ٥ **الشَّجَبُ**: نارەحـەتیو ئـازارو لـەش داهێـزان كەبـەهۆی نەخۆشییەوە توشی ئادەمیزاد دەبێ، دەگوترێ: (امـرأة شـجوب): ئافرەتێـكە توشـی خـەمو ناخۆشی بووە بەهۆی ئەوەی دڵـی بەكوڕێـكەوە یـە ٥ **الْمِـشْجَبُ**: عەلاگـەو سـینگو شـتی وا كەجلی پێدا بكرێ ٥ **شَجَّهُ شَجّاً**: سەری شكاند، برینـی لـەدەمو چـاوی كـرد ٥ **شَـجَّت الـسفينةُ البحرَ**: كەشتییەكە ناوەكەی دڕدا، شەقی كرد.

**شَجَّ** الشرابَ بالماء: شەرابەكەی تێكەڵی ئـاو كـرد ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان يَشُجُّ بيد ويأسو بأخرى): فلان بەدەستێكی بریندار دەكا بەوەكـەی تـری دەرمــانی دەكــا، ئەمــە پەنــدەو بەكەسێــك دەگوترێ خراپەو چاكە بكا.
**شَـجَّ** شَـجَجاً: شـوێنەواری بـرین بەروخـسارییەوە ماوە ٥ **شاجَّهُ شِجاجاً**: یـەكتریان برینـدار كـرد ٥ **الْشَّجَجُ**: شوێنەواری برین لەناو چاوان دا ٥ یـان لەشـوێنی تـردا ٥ **الـشَجَّةُ**: بـرین لەسـەر یـان لـەدەمو چـاو یـان لـەناو چـاوان ٥ **الـشَّجيجُ**: بریندار كراو، سەرشكاو، روخسار بریندار كراو.
**شَجَرَ** الأمـرُ بيـنهم شُجُوراً: كارەكە لـەنێوانیان دا ئـاڵۆز بـوو، كێـشەیان تێـكەوت، بـوو بـە مقـۆ مقۆیان ٥ **شَجَرَ الشَجَرَ والنبات**: لقە شۆڕ بۆوەی درەختو روەكەكەی بەرز كردەوە.
**شَجَرَ** الشَّيْءَ: شتەكەی بەستەوە ٥ شتەكەی خستە سەر عەلاگەكەو پێیدا هەڵواسی.
**شَجَرَ** فلانـاً عـن الأمر: فلانكەسـی لەكارەكە لادا، نەیهێـشت بیكـا ٥ **أشـجرت الأرضُ**: زەوییەكـە درەختی زۆر بوو ٥ **شاجَرَهُ**: كێشەی لەگەڵدا كرد ٥ **شَجَّرَ النباتُ**: روەكەكە بوو بەدرەخت ٥ **شَـجَّرَ الأرضَ**: درەختـی لەزەوییەكـەدا ڕوانـد ٥ **شَـجَّرَ النسب**: بنەچەو پەلو پۆی خێـزانو هۆزەكەی رونكردەوەو لەشێوەی درەخت دا وێنەی كـرد ٥ **اشْـتَجَرَ الـشَّيْءُ**: شـتەكە هەندێـكی چـووە نـاو هەندێكیەوەو تێكچڕژان، دەگوترێ: (إشتَجَرَت الأصـــابعُ): پەنجــەكان چــونە ناویەكــەوە ٥ **اشــتَجَرَت الرِمــاحُ**: شمـشێرەكان تێــك ڕژان ٥ **اشـتجر القـومُ**: خەڵكەكە كێشەیان تێـكەوت ٥ **اشــتَجَرَ فــلانٌ**: فلانكـەس دەسـتی خـستە بـن چـەناگەیو قورسـایی خـستە سـەر ئەنیـشكی ٥

**تَشاجَرَ الشَّيْءُ**: شتەکە هەندێکی چووە ناو هەندێکیەوە، دەگوترێ: (تَشاجرت الرِماحُ): ڕمبەکان تێکرژان ٥ **تَشاجَرَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە کێشەو نیزاعەوە ٥ **الشِّجَارُ**: کەژاوەی بچوك: دارێکە لەپاش دەرگاوە وەکوو کێلونو پاشکۆڵ دەرگاکەی پێ قایم دەکرێ ٥ دارێکە دەخرێتە دەمی بێچوە ئاژەڵەوە بۆ ئەوەی شیری پێ نەخورێ ٥ **الشُّجْرُ**: کاری سەر بەگێچەڵو کێشە ئامێز ٥ بۆشایی ناو دەم نێوان مەلاشوو پانایی زمان ٥ چەناگە ٥ **الشَّجَرُ**: درەخت؛ ڕوەکێکە یەك قەدی ڕەقی هەبێ، جاری واش دەبێ بە ڕوەکێك دەگوترێ کە ڕاست نەبێتەوەو بەڵکوو بەسەر زەوی دا پان بێتەوە وەکوو ڕوەکی کاڵەکو ترۆزیو کولەکە ٥ ئەوەتا ڕوەکی کولەکە قورئان بە درەخت ناوی بردووە، وەلێ زانایانی ڕوەك ناسی وشەی (شجر) بەدرەختی بەتەمەنی یەك قەدو قەد ڕەقو ڕوت دەڵێن ٥ تاکەکەی (شجرة) ٥ دەشگوترێ: (هو من شجرة طيبة): ئەو لەبنەماڵەو خێزانێکی ڕەسەنو وەجاخزادەیە ٥ **شَجَرَةُ النسب**: ڕونکردنەوەو وێنەکردنی بنەماڵەو لقو پۆپی خێزانو هۆزو تایەفە لەسەر شێوەی لقو پرژی درەخت کەلەباپیرە گەورەوە دەست پێدەکاو وەچەو نەوە دیاری دەکرێن ٥ **الشَّجْراءُ**: درەختی تێکچرژاوی پرو چر ٥ زەوی درەختاوی چڕو پڕ ٥ **الشَّجْرِيُّ**: پیتی شەجەری کە (ش.ض.ج.ي)ە ٥ **الشَّجِيرُ**: دەگوترێ: (واد شجير) شیوی پڕدارو درەخت ٥ (أرض شَجير): زەوی پڕ درەخت ٥ **الشَّواجِرُ**: بەربەستو لەمپەر، دەگوترێ: (قد شجرتني عنه الشواجر): بەربەستو لەمپەر منیان لەوشتە گێڕایەوە ٥ (رماح شواجِر): ڕمبی تێك ڕژاوو تێکەوە بوو ٥ **الْمُشْجَرُ**: هەرشتێك وێنەی درەختی تێدا بێ ج کاغەز بێ یان قوماش بێ یان هەرشتێکی تر بێ ٥ **الْمَشْجَرُ**: شوێنی رواندنی درەخت، شوێنێك درەختی لێ ڕوابێ ٥ هەرپانتاییەك درەخت دایپۆشیبێ کەم یا زۆر ٥ **الْمَشْجَرَةُ**: بەمانا (أَلْمَشْجَرُ) دێ ٥ **الْمِشْجَرُ**: عەلاگەی جل پێدا هەڵواسین.

**شَجُعَ شَجَاعَةً**: ئازاو وره بەرزو چاو نەترس بوو ٥ **شَاجَعَهُ**: پێشبرکێی لەگەڵ دا کرد لەئازایەتی دا ٥ **تَشَجَّعَ**: وره بەرز بوو ٥ وای خۆنیشان دا ئازایەو خۆی ئازا کرد ٥ **الأشْجَعُ**: تاکی (الأَشَاجِعُ)ە ٥ ناوە بۆ دەمارەکانی پشتی دەست ٥ **الشُّجَاعُ**: ئازاو چاونەترس ٥ ماری گەورە ٥ **الشَّجِيعُ**: (رجل شجيع) پیاوێکی ئازاو بەجەرگ ٥ **شَجَنَت الحَمَامَةُ شُجوناً**: کۆترەکە خوێندی ٥ ناڵاندی.

**شَجَنَ الأمرُ فلاناً شَجْناً**: کارەکە فلانکەسی هەڵەو گیرکرد، خەفەتباری کرد ٥ **شَجِنَ شَجْناً**: غەمبار بوو ٥ **أَشْجَنَ الكرمُ**: دار مێوەکە تولەکانی تێك هاڵان ٥ **أَشْجَنَ الأمرُ فلاناً**: کارەکە فلانکەسی غەمبار کرد ٥ **تَشَجَّنَ**: خەفەتبار بوو، یادی رابردوی کردەوەو کوڵی گریانی هەڵسا ٥ **تَشَجَّنَ الشجرُ**: درەختەکە تێك چرژا چرو پڕ بوو ٥ **الشَّاجِنُ**: شیوو دۆڵی پڕ دارو درەخت ٥ ڕێگای ناو شیو ٥ **الشُّجَنُ**: لقو پۆپی تێك چرژاو لێك هاڵاو ٥ لایەنو کونو کەلەبەر لەهەر شتێك بێ، دەگوترێ: (الحديث ذو شجون): قسەو باسی جۆرو شێوازو نهێنیو ئاشکرای هەیە ٥ هەروا بەمانا غەمو خەفەت دێ ٥ پێداویستی کات گرو هەڵەو گیر کەر ٥ **الشِّجْنَةُ**: لقو پۆپی تێکهاڵاوو تێکچرژاو ٥ درەختی چرو پڕ ٥

کونو کەلەبەری هەمووو شتێک ٥ شَجَاهُ الأمرُ شَجْواً: خەمباری کرد.

**شَجا الحدیثُ ونحوهِ فلاناً:** شیعرەکە یا چیرۆکەکە فلانی خستە هەڵپەڕینو سەما ٥ شَجَاه تَذَکرُ الإلفِ: یادی هاوەڵو دۆستو خۆشەویست خستیە سەر شەوقو یادەوەریو کوڵی گریانی هەڵساند.

**شَجِيَ شَجاً:** پاروی لەقورگ گیرا ٥ کوڵی گریان لەقورگی گیرا ٥ دەگوترێ: (شَجي بالهمّ): خەمو خەفەت دایگرتو هیچ ڕێگا چارەیەکی نەدۆزیەوە دەرەتانی نەبوو ٥ (شَجِيَ بقِرْنِه): هاوشانەکەی بەسەری دا زاڵ بوو ٥ هەروا وشەی (شَجِيَ): بەمانا گرنگی دان بەشتو غەمبار بوونە ٥ بیری رابردوی کردەوەو دڵی گەرم بوو، گریا ٥ أشجاه: بەمانا (شجاه)دێ ٥ بەسەری دا زاڵ بوو، ژێر باری کرد ٥ أشجاه بكذا: بەوشتە قورگی گیرا ٥ الشَّجَا: شتێک لەقورگ بگیرێ وەکوو ئێسکو شتی وا ٥ الشَّجْوُ: غەمو خەفەت ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (بكى فلان شَجْوَهُ): فلانکەس گریا غەمو خەفەتی خۆی بەبادا ٥ الشَّجِيُّ: کەسێک غەمو نارەحەتی کوڵی گریانی هەڵسێنێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (ويل للشَّجِيّ من الخَلي): هاوار بۆ عاشق لەدەست دۆستەکەی.

**شَحَبَ جِسْمُهُ شُحُوباً:** جەستەی گۆڕاو کزو لاواز بوو.

**شَحَبَ اللونُ:** ڕەنگی گۆڕا.

**شَحَّثَ:** پرسیاری کردو زۆر کڕوزایەوە ئیلحاحی کرد ٥ الشَّحَّاثُ: سواڵکەری درێژە دادڕو ئیلحاح کەر.

**شَحَجَ البغلُ والحمار شَحِيجاً:** هێسترەکە یان کەرەکە لوشکە لوشکی کرد، حنکە حنکی کرد، دەگوترێ: (شَحَجَ الغرابُ): قەلە ڕەشەکە قرانـدی ٥ تَشَحَّجَ صوته: دەنگی گر بوو، گڕیی تێدا دەرکەوت ٥ الشاحِجَ: هێسترو گوێدرێژ.

**شَحَّ الماءُ ونحوه:** ئاوەکە یان شتی تر کەم بوو بەناخۆشی دەست دەکەوت.

**شَحَّ الزِّنَادُ:** شقارتە یان بەردو ئەستێیەکە ئاگری نەکردەوە.

**شَحَّ فلان بالشيئ:** فلانکەس دەست قوچاوو بەخیل بوو.

**شَحَّ عليه:** سوور بوو لەسەری ٥ شاحَّ فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس نایەوەو بەڵگەو بیانووی لێ دۆزیەوە، زانایان دەفەرموون: (لامُشَاحَة في الإصطلاح): کێشەو نیزاع لە زاراوە دا نییە ٥ تَشَاحّوا في الأمر وعليه: پێشبڕکێیان بۆ ئیشەکە کرد ٥ تَشَاحّ الخصمان: دوو کێبڕکێکەرەکان هەریەکەیان لەلای خۆیەوە سور بوو لەسەر سەرکەوتنی خۆیو ژێر خستنی بەرامبەرەکەی ٥ الشُّحُّ: ڕژدیو چروکی ٥ الشَّحَّةُ: (نفس شَحَّةٌ): دەروونێکی زۆر ڕژدو چروک ٥ الشَّحِيحُ: بەخیلو چروک ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (شحيحة) ٥ (إبل شَحَائح): حوشتری کەم شیر.

**شَحَذَ السَّيْفَ ونحوه شَحْذاً:** نوکی شمشێرەکەی تیژ کرد، دەگوترێ: (السيف شحيذ ومشحوذ)، هەروا دەگوترێ: (شَحَذَ ذِهْنَهُ): زەینی خۆی مشتو ماڵ کرد ٥ (شَحَذَ النَّاسَ): بەهاڕانەوەی زۆرو بەئیلحاحەوە داوای لەخەڵک کرد ٥ دەق بەمانای (شَحَثَ) دێ ٥ أشْحَذَ السَّيْفَ ونحوه: بەمانا (شَحَذَ)دێ ٥ الشَّحَّاذُ: سواڵکەری نوزە درێژو ویرە ویرکەر ٥ المِشْحَذُ: هەسانو کارتیخو شتی

وا كە تیفی پێ تیژ بکرێ ٥ الْمِشْحَذَةُ: دەگوترێ: (هذا الكلام مَشْحَذَةٌ للفهم) ئەم قسەیە ڕێخۆشکەرەو داخوازە بۆ تێگەیشتن ٥ الشُّحْرُ: ئاوە وەی شیوو دۆڵ ٥ ڕێڕەوی ئاو ٥ الشُّحْرُورُ: باڵندەیەکە دەخوێنیو دەنگخۆشە لە پێری (الشحروریات)ە نێرەکەی ڕەشە، مێینەکەی لای سەری سەوزەیەو گەنم ڕەنگە سنگی مەیلەو سورە ٥ دەگیرێو دەخرێتە قەفەسەوە بۆ خوێندن.

**شَحَطَ المكانُ شُحُوطاً**: شوێنەکە دوور بوو.

**شَحَطَ في المساومة**: زێدە ڕۆیی کرد لەمامەڵەو چەلەحانێ داو لەسنووری تێپەڕاند ٥ **شَحَطَت الناقةُ**: حوشترەکە نەخۆشییەکی لەسنگ دا دروست بوو کوشندەو قەڵاچۆکەرە ٥ **شَحَطَت الآلَةُ**: ئامێرەکە سوتەمەنییەکەی کەمی کرد خەریکە لەکاربکەوێ.

**شَحَطَ القتيل في الدم**: کوژراوەکە لەخوێنی خۆیدا گەوزی.

**شَحَطَ فلاناً شَحْطاً**: لەراکردن دا پێش فلانکەس کەوت.

**شَحَطَ الكَرْمَةَ وغيرها**: تولە مێوە تەڕەکانی خستنە سەر کەپرو داری ڕاهێڵدراو.

**شَحَطَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕ کرد.

**شَحَطَ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ بەئاو کرد بۆ ئەوەی هەندێ کەسکونی نەمێنێو ڕون بێتەوەو خواردنەوەی ئاسان بێ.

**شَحَطَ اللَبَنَ**: زۆری ئاو لەشیرەکە کرد.

**اشْحَطَ**: دوری خستەوە ٥ **شَحَطَهُ في دمه ويدمه**: وای لێ کرد لەخوێناوی خۆیدا بگەوزێ ٥ **الشَّحْطُ**: ئەو دارە ڕاهێڵدراوەیە کە تولەمێوی دەخرێنە سەر بۆ ئەوەی شۆڕنەبنەوە ٥ **الشَّحْطَةُ**: شوێنەواری چڕنوکو ڕنینی پێست ٥ **الشُّوحَطُ**: جۆرە درەختێکە لەکێوەکانی (السُّرَاةُ) هەیە، تیری کەوانی لێ دروست دەکرێ، گەڵاکەی تەنکو درێژەو بەرەکەی وەکوو عەنبەی درێژ وایەو دەخورێ.

**شَحَمَ الطعامَ والخُبْزَ شَحْماً**: پیوی کردە ناو خواردنەکەوە.

**شَحَمَ القومُ**: بەزو پیوی دەرخواردی قەومەکە دا.

**شَحِمَ شَحَماً**: قەڵەو بوو، خۆی دارشت.

**شَحِمَ العِنَبُ**: ترێیەکە ئاوی کەمو توێکڵی ئەستور بوو ٥ **شَحِمَت الرُمّانَةُ**: هەنارەکە پەردەی نێوان دەنکەکانی ئەستور بوو.

**شَحِمَ الى الشحم**: حەزی لەپیو بوو ٥ **أشْحَمَ**: بەزو پیوی زۆر بوو ٥ **أشْحَمَ القومَ**: بەمانا (شَحَمَهُمْ) دێ ٥ **شَحَّمَ**: موبالەغەی (شَحَمَ)ە ٥ **شَحَّمَ الآلَةَ**: ئامێرەکەی بەبەزو پیو چەور کرد، نەرمی کرد ٥ **الشَّحْمُ**: بەزو پیو لەجەستەی ئادەمیزادو ئاژەڵ دا، مادەیەکی سپی چەورە لەگەڵ گۆشت دایەو بەجیاش لەجەستەدا کۆدەبێتەوە وەکوو دووگی مەڕو حوشتر، لەشتی تریش دا بەهۆی تەکنۆلۆژیاوە دەردەهێنرێ ٥ **الشَّحْمَةُ**: پارچە بەز ٥ (شَحْمَة العين): گلێنەی چاو ئەو شوێنەی ڕەشایی‌و سپیایی چاو بەیەك دەگەنو کۆدەبنەوە ٥ (شَحْمَة الأذن): نەرمایی گوێچکە؛ ئەوشوێنەی کون دەکرێو گوارەی پێدا هەڵدەواسرێ ٥ (شَحْمَة الرمانة): ئەو پەردەی نێوان دەنکە هەنارەکانە ٥ **الشَّحِيمُ**: گیاندارێك بەزو پیوی زۆربێ، دەگوترێ: (رجل شحيم لحيم): پیاوێکی قەڵەوو گۆشتنە.

**شَحَنَ** السفينة ونحوها شحناً: كەشتییەکە یا بارهەڵگرەکەی بارکرد، پڕی کرد لەکاڵا، دەگوترێ: (شَحَنَ البلدَ بالخيل): وڵاتەکەی پڕکرد لەئەسپ.

**شَحَنَ** فلاناً: فلانکەسی دوورخستەوە، دەری کرد.

**شَحِنَ** عليه شَحْناً: رقی لێ هەڵسا ٥ **أشْحَنَ**: دەگوترێ: (أشْحَنَ له بسهم): خۆی بۆ ئامادە کرد تیری پێوە بنێ ٥ **شاحَنَهُ**: رقی لێ هەڵسا ٥ دژایەتی کرد ٥ **تشاحَنوا**: یەکتریان دزاو ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوەو بوون بە دوژمنی یەکتر ٥ **الشَّاحِنُ**: پڕ، دەگوترێ: (مركب شاحِنٌ): بارهەڵگرێکی پڕ لەکاڵایە ٥ **الشَّحْناءُ**: حیقدو دوژمنایەتیو رقو کینە ٥ **الشِّحْنَةُ**: ئەو کاڵایەی کەشتی لێ پڕدەکرێ ٥ ئەو خۆراکو پێداویستییەی ژیانە کە کۆدەکرێتەوە بۆ ئەوەی بەشی یاساوڵو پۆلیسو کاربەدەست کە پاشا دیارییان دەکا لێی بدرێ، بۆ ئەوەی ئەمنو ئاسایشی وڵاتێک یان شارێک بپارێزن ٥ ڕەوە ئەسپ ٥ (الشحنة الكهربية): ئەو برە کارەبایەیە کە قەبارەیەك هەڵی دەگرێ.

**شَحَا** فلان شَحْواً: فلانکەس هەنگاوی پانی هاویشتنو پەلەی کرد، دەگوترێ: (شحا في الفتنة): لەفیتنەییو دووو زمانی دا ڕۆچوو.

**شَحَى** فَمَهُ شَحْياً: دەمی داچەقاند ٥ **تَشَحَّى في الشَّيْءِ**: فراوانخوازی لەشتەکەدا کرد ٥ **تَشَحَّى في السَّوْم**: زێدە ڕۆیی کرد لەبانگەوازی کردن بۆ فرۆشتنو هەڕاجکردن یان گرانکردنی کاڵا ٥ **تَشَحَّى على فلان**: زمانی لەفلانکەس بەرەڵا بوو چی خودا پێی ناخۆشە پێی کرد ٥ **الشَّحْوَةُ**: بازو هەنگاو، دەگوترێ: (فرس رغيب الشحوة): ئەسپێکی هەنگاو درێژە بازی درێژ دەهاوێ ٥ (فلان بعيد الشحوة في مقاصده): فلانکەس دووربینو پلانی ستراتیجی درێژخایەنی هەیە بۆ ژیانو مەبەستی دوورو درێژی هەن ٥ (إناء الشحوة): قاپێکە ناوەکەی فراوانە.

**شَخَبَ اللَّبَنُ شَخْباً**: شیرەکە لەگوان هاتە دەرو خوشەی هات، دەگوترێ: (شَخَبَ من الجُرْحِ): خوێنەکە لە برینەکە فیچقەی کرد، دەشگوترێ: (شَخَبَتْ أوداج القتيل دماً): ڕەگی لاملی کوژراوەکە فیچقەی خوێنییان کرد، بەفیچقە خوێنیان لی هاتە دەر ٥ **إنشَخَبَ اللبنُ**: خوێنەکە بەفیچقە هاتە دەر، دەگوترێ: (إنشَخَبَ العرقُ دماً): ڕەگەکە خوێنی بەفیچقە لێ هاتە دەر ٥ **الأشخوب**: خوشە خوشی شیر لەکاتی دۆشین دا ٥ **الشُّخْبُ والشَّخْب**: خوشەی شیر، فیچقەکردنی شیر لەکاتی دۆشین دا ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (شخبٌ في الإناء وشخبٌ في الأرض): خوشێك بۆناو قاپەکەو خوشێك بۆسەر زەوی، واتە جارێك دەیهەنگێوێو جارێك نا ٥ **الشُّخْبَةُ**: بەمانا (الشُّخب)دێ.

**شَخُتَ شُخوتَةً**: جەستەی لاوازو باریك بوو بەشێوەیەکی سروشتی ٥ **الشَّخْت**: هەر گیانلەبەرێك بەسروشت کزو کۆڵەوار بێ. دەگوترێ: (فلان شخت): فلانکەس لاوازو ق باریکە ٥ (هو شخت العطاء): ئەو دەست قوچاوو کەمبەخششە.

**شَخَّ** في نومه: لەخەودا پرخە پرخی هات ٥ (شَخَّ بوله): گیزە گیزی میز کردنی هات.

**شَخَرَ** شخراً وشخيراً: دەنگەکە لەقورگی دا هاتو چو بێ ئەوەی ببێتە قسە، دەگوترێ: (شَخَرَ الفرسُ): ئەسپەکە حیلاندی.

**شَخَرَ** الحمار: گوێدرێژەکە زەڕی.

**شَخَسَ** الأمرُ شَخْساً: کارەکە شێوا، چەواشەیی تێکەوت ٥ راستیو دروستی خۆی لەدەست دا ٥ **تشاخَسَتْ** أسنانه: ددانی ڕێكو پێكو ڕیز بەستوو نەبون ٥ **شَخْشَخَ القَشُّ**: کۆزەرو کاوکۆتەکە دەنگی خەشخەشەیان لێ هات.

**شَخَصَ** الشَّيْئُ شُخوصاً: شتەکە بەرز بۆوە ٥ لەدوورەوە دەرکەوت.

**شَخَصَ** السهمُ: تیرەکە مەبەستی نەپێکاو نەیهەنگاوت.

**شَخَصَ** من بلده وعنه: لەولاتی خۆی ڕۆیشتە دەرەوە.

**شَخَصَ** الى بلده: گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

**شَخَصَ** أمامه: لەبەردەمی دا خودی خۆی ئامادە بوو.

**شَخَصَ** فلان بصره وبِبَصَرِهِ: فلانکەس چاوی بەملۆق وەستاو نەیترووکاندن.

**شَخُصَ** فلان شخاصةً: قەبارەی فلان گەورە بوو جەستەی زەبەلاح بوو٥ **أَشْخَصَ** فلان: فلانکەس کاتی ڕۆیشتنی هات ٥ **أَشْخَصَ الرامي**: تیری تیرهاوێژەکە هەڵەی کردو نەیپێکا ٥ **أَشْخَصَ فلاناً من بلده**: فلانکەسی لەولاتی خۆی دەرکرد ٥ **أشخص فلاناً اليه**: فلانکەسی نارد ٥ **شَخَّصَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دیاری کردو لەشتی تر جیای کردەوە.

شَخَّصَ الداءَ: دەردەکەی دۆزییەوە ٥ **شَخَّصَ المشكلة**: کارەکە ئاشکرا بوو، ڕون بۆوە ٥ **الشَّاخِص**: شتی بەرچاوو بینراو ٥ بەنیشانەو عەلاماتی ڕێگاو بانو شتی لەو جۆرە دەگوترێ ٥ **الشَّخْصُ**: هەرقەبارەیەك بەپێوە بێو ببیندرێ، بەزۆری بۆ ئادەمیزاد بەکاردەهێندرێ ٥ لەزاراوەی فەلسەفەدا وشەی (شخص) بریتییە لە زاتو بونەوەرێك کەهۆشی هەبێو کیانی سەربەخۆی بزانێ ویستو ئیرادەی سەربەخۆیی هەبێ ٥ **الشَّخْصِيّ**: کاری تایبەتی کەسێك، شتی پەیوەندیدار بەکەسێکی تایبەتییەوە ٥ **الشَّخْصِيَّة**: چەند ڕەوشتو دیاردەیەکن کەسەکە لەکەسانی تر جیا دەکەنەوە، دەگوترێ: (فلان ذو شخصية قوية): فلانکەس چەند ڕەوشتو ئاکارێکی جیاکەرەوەی تێدانو ویستو ئیرادەو کیانو بونێکی سەربەخۆی هەیە ٥ (الأحوال الشخصية): باری کەسیەتی؛ هەوییەکی تایبەتییە ٥ هەروا چەند مەسەلەو قانونو یاساو ڕێسایەکن لەبواری خێزان دا وەکوو میرات گرتنو مارەکردنو لێك جیابوونەوەو پێکەوەژیانی ژنو مێردو منداڵو ئەو جۆرە شتانە.

**شَخِمَ** الطعامُ شَخَماً: خۆراکەکە خراپ بوو، گۆڕاو بۆگەنی کرد، دەگوترێ: (شَخِمَ فمُ فلان): دەمی فلانکەس بۆگەنی کرد ٥ **أَشْخَمَ**: بەمانا (شَخِمَ)دێ ٥ **الأَشْخَمُ**: دەگوترێ: (فلان أشخم الرأس): فلانکەس سەری بۆز بوو، سپیایەتی مووەکانی بەسەر ڕەشەکانی دا زاڵ بوون ٥ (شعر أشخم): مووی سپی بوو ٥ مووی ماشو برنج ٥ (عام أشخم): ساڵێکی بێ بارانی، وشکە ساڵیو بێ دانەوێڵەو لەوەڕ ٥ (روض أشخم): باخێکە بێ ڕووەکو درەخت ٥ **شَدَخَت الغُرَّةُ** شَدْخاً: شتەکەی بریندار کرد، دەگوترێ: (شَدَخَ الرأسَ والحنظَلَ): سەری شکاند ٥ کاڵەکە تاڵەکەی بریندار کرد.

**شَدَخَ** دمَ فلان: خوێنی فلانکەسی بەفیڕۆ دا، تۆڵەی نەساندەوە ٥ **شَدَّخَهُ**: بۆ زێدە ڕۆیی

لەمانای (شَدَخ)دا بەکاردێ ٥ إنشَدَخ: برینـدار بوو ڤرینجا ٥ تَشَدَّخ: شکا ٥ الشُّدْخَة: برینێـك، ڤرینجاوییەك ٥ رومەکێکی نەرمو تەڕو گەشە ٥ المِشْدَخ والمِشْدَخَة: ئامێری ڤرینجانـدنو برینـدار کردن.

**شَدَّ الشَّيْءُ شِدَّةً**: شتەکە بەهێز بوو، پتەو بوو ٥ ڤورس بوو.

**شَدَّ فلانٌ شَدّاً**: فلانکەس بازی دا.

**شَدَّ النهارُ**: ڕۆژەکە زوربەی بەسەر چوو، بەرز بۆوە.٥ **شَدَّ عليه في الحرب**: لەشەڕدا بەتوندی هێرشی بۆ برد.

**شَدَّ على قلبه شداً**: دڵی مۆر کرد.

**شَدَّ فلاناً**: فلانکەسی پێوەند کرد، دەشگوترێ: (شد على عضده) یان (شدّ على يده) دەستی گوشیو پشتگیری لێ کرد، پارمەتی دا.

**شَدَّ رِحالَهُ**: خۆی بۆ سەفەر کردن ساز دا.

**شَدَّ مِئزَرَهُ**: کۆششی کرد لەکارەکەدا، بە لێبڕاوانە پری دایە.

**شَدَّ الحَبْلَ ونحوه**: حەبلو پەتەکەی ڕاکێشاو توندی کرد ٥ **أشَدَّ الفتى**: کوڕەکە گەیشتە تەمەنی گەنجیو هەرەتی لاوەتیو لەعەقڵو تەمەن دا پێگەییو خۆی دارِشت ٥ **شادَّهُ مُشادَّةً وشِداداً**: بەسەری دا زاڵ بوو.

**شادَّ في الأمر**: زێدە ڕەوی لەکارەکەدا کردو ئاسانکاریی ڕەچاو نەکرد ٥ **شَدَّدَ**: بەمانا (شادَّ) دێ ٥ (شَدَّدَ الشَّيْءَ): شتەکەی پتەو کرد، هێزو توانای دایە ٥ **شَدَّدَ الحَرفَ**: پیتەکەی بەشێوەی دوبارە کراوەو تێکخراویی دەربڕی.

**إشتَدَّ**: بەهێز بوو، زیاد بوو، دەگوترێ: (إشتَدَّ مرضُهُ): نەخۆشییەکەی توند بوو ٥ **إشتَدَّ عليه الأمرَ**: کارەکەی لێ ڤورس کرد ٥ **إشْتَدَّ في عَدوِهِ**: پەلەی کرد لەبازدان دا ٥ **إشتَدَّ النهارُ**: ڕۆژەکە زۆری ڕۆیـیو خۆرەکـەی بـەرز بـۆوە ٥ **إشـتَدَّ السِّعرُ**: نرخەکـەی بەرز بۆوە ٥ کاڵاکان گـران بوون ٥ **إشتَدَّ اللبنُ ونحوه**: شیرەکە مەییو ڕەق بوو خەریکە دەبێتە پەنیر ٥ **تَشادّاً**: بەسەریەك دا زاڵبون ٥ **تَشَدَّدَ في الأمر**: زێدە ڕەوی لەئیشەکەدا کردو ئاسانکاریی نەکرد ٥ ڕژد بوو ٥ **الأشُدُّ**: تەواو بوون ٥ (بَلَغَ أشُدَّهُ): گەیشتە هەرەتی هێزو توانا ٥ **الشِّدادُ**: ئەوەی شتی پێ ڤایم دەکرێ ٥ **الشَّدُّ**: ڕاکێشانو کێشکردن، دەگوترێ: (لايقوى على شدٍّ ولا إرخاء): دەسە وەسانەو هیچی پێ ناکرێ ٥ (أتانا شَدَّ النهار): لەجەنگەی نیوەڕۆدا هاتە لامان ٥ (أتانا شَدَّ الضُّحَى): لەجەنگەی کێشتەنگاودا هاتە لامان ٥ **الشَّدَّةُ**: هێرشو پەلاماری شەڕ ٥ چوکڵەیەکە دەخرێتـە سـەر پیـت بـۆ ئـەوەی پیتەکـە بەدوبارەییو تێکخراویی دەربڕدرێ ٥ **الشِّدَّةُ**: تەنگژەو کاری گورچکبڕو بەڵاو کارەسات کەپیاو بەزەحمەت خۆی بۆ ڕادەگرێ ٥ **شِدَّةُ العيش**: تەنگو چەڵەمەی ژیان ٥ **الشَّديدُ**: بەهێزو توانا ٥ کاری ڤورسو ئەستەم ٥ **شديد القُوى**: دەسەڵاتداری بەتوانا ٥ خاوەن توانای ڕەها ٥ عەترێك بۆنەکەی کەسکون بێ ٥ پیاوی چاوتیژو ئازا بۆشەو بەخەبەریی ٥ **المِشَدُّ**: کەمبەرە؛ خشڵێکە ئافرەت لەقەدی خۆی دەبەستێ بۆ ئەوەی قەدی باریك بێ ٥ **شَدَفَهُ شَدْفاً**: پارچە پارچەی کرد، وردو هاڕی کرد.

**شَدِفَ شَدَفاً**: تەڕ دەماخ بوو ٥ لەڕوی خۆ بەزلزانیو بەخۆ نازینەوە ڕوی وەرگێڕا ٥ **تَشادَفَ**: لارو لەنجەی کرد، خۆی بادا ٥ **الأشْدَفُ**: کەسێك بەدەستی چەپ کارەکانی ئەنجام بدا ٥

الـشّادوف: دوشـی ئاوپرژانـدن؛ ئامێرێـکه ئـاودێری زەوی پـێ دەكـرێ ◊ الـشُّدْقَةُ: پارچـه لەهەرشتێك بێ.

**شَدِقَ** شَدَقاً: شەویلەی پان بوون ◊ (فهو أشدق وهي شدقاء) ◊ تَشَدَّقَ: بەمەبەستی شت جوین شەویلەی خۆی جولاندن ◊ شەویلەی خۆی بادا بۆئەوەی قسەی رەوان بکا ◊ الأشْدَقُ: (خطيب أشْدَقُ): وتاربێژێکی دەنگ گەورەی قسەزانە ◊ (وهي شَدْقاء): بۆ ئافرەت بەكاردێ، دەگوترێ: (شفة شدقاء): دەمی گەورەو شەویلە پانە ◊ الشِّدْقُ: لا روومەت لەخوار كولمەوە، لاشەویلە ◊ الشَّدْقَم: ئادەمیزادی شەویلە پان.

**شَدَنَ الظَّبْيُ** شدوناً: بێچوە ئاسكەكە بۆ خۆی لەوەڕاو پێگەیی پێویستی بەشیری دایکی نەبوو ◊ أشْدَنَت الظبيةُ ولدها: بەمانا (شَدَنَ ولدُها) دێ ◊ الشّادِنُ: بێچوە ئاسك ◊.

**شَدَهَ فلاناً** شَدْهاً: فلانكەسی سەرسام كرد، دەگوترێ: (شُدِهَ): بەكارەكە سەرسام كرا توشی سەراسیمە بوو ◊ أشْدَهَهُ: سەرسامی كرد ◊ إنْشَدَهَ: سەرسام بوو ◊ الشُّداهُ: سەرسامیو واق ورمانو سەراسیمە بوون ◊ الْمَشَادِهُ: ئەو شتانەی ئادەمیزاد هەڵەوگێر دەكەن ◊ تاكەكەی (مَشْدَهة).

**شدا** شَدْوا: گۆرانی گوت ◊ بولبولەكە خوێندی.

**شـدا** بالشِّعر: شیعرەكەی بەشێوەی گۆرانی خوێندەوە.

**شدا** شَدْو فلان: خۆی لەفلانكەس چواند، خۆی بەو شوبهاند.

الـشّادي: گۆرانی بێـژ ◊ قوتـابیو هەوڵـدەر بـۆ وەدەسـتهێنانی ئـەدەبو زانیـاری ◊ الـشَّدا: بەشێك لەهێزو توانا، دەگوترێ: (لم يَبْقَ من قوته إلاّ شَدًا): كەمێكی هێزو توانا ماوە ◊ ئەندازەی شت، سنوورو قەبارەی شت ◊ الشَّدْوُ: بەشی كەم لەزۆر ◊ دەگوترێ: (أخذ شدواً من المال): بەشێكی كەمی لەماڵە زۆرەكە وەرگرت.

**شَذَبَ اللحاءَ** شَذْباً: توێكڵەكەی هەڵاشتو لێی داماڵی.

**شَذَبَ العودَ**: لقو پۆپی لە دارەكە كردەوە تا وای لێ هات قەدەكەی روت بوو، دەگوترێ: (شَذَبَ عن فلان): داكۆكی لەفلان كردو شەڕو نەگبەتی لێ دوور خستەوە ◊ شَذَّبَ اللحاءَ والشجرَ والعودَ: بەمانا (شَذَبَهُ) دێ، واتە توێكڵەكەی سپی كرد، دارەكەی روت كرد، لقەكەی هەڵپاچی ◊ شَذَّبَ الشيءَ: شتەكەی بڵاوە پێ كردو ونجرِ ونجرِی كرد.

**شَذَّبَ المالَ**: ماڵو سامانەكەی پەرتو بڵاو كردەوە.

**شَذَّبَ فلاناً عن الشيء**: فلانكەسی لەشتەكە دوور خستەوە ◊ تَشَذَّبَ القومُ: خەڵكەكە بڵاوەیان كرد ◊ الشّاذِبُ: دووركەوتەی وڵاتو زێدو نیشتمان ◊ دەركراوی ناهومێد لەرزگار بوون ◊ الشَّذَبُ: ئەوەی دەبڕدرێو فڕێ دەدرێ لەشت ◊ پاشماوەی شت ◊ پاشەڕۆك ◊ الشَّذِبُ: (رجل شَذِبُ العُروق): پیاوێكە دەمارەكانی جەستەی دیارن ◊ المِشْذَبُ: داس؛ ئامێری گیا درون.

**شَذَّ** شُذُوذاً: تاك بووە لەكۆمەڵو تەرەبوو، هەڵسو كەوتی پێچەوانەی كۆمەڵ بوو، دەگوترێ: (شَذَّ عن الجماعة): لەرێڕەوی كۆمەڵ دەرچوو تاق بۆوە.

**شَذَّ الكلامُ**: قسەكە لە قیاسو یاسای ئاخاوتن دەرچوو ◊ أشَذَّ فلان: فلانكەس قسەو رایەكی شازو وێنەچوی هێنایە پێشەوە ◊ أشَذَّ الشيءَ:

شتەکەی دوور خستەوە ٥ (أشدَّ القول): قسەیەکی کەس نەگوتوی هێنایە پێشەوە ٥ **الشّاذُّ**: تاق بووە، دەرچوو لەکۆمەڵ ٥ پێچەوانەی قاعیدە ٥ دەرچوو لەیاساو ڕێسای کۆمەڵگە ٥ **شَذَّر العقد ونحوه**: میروو شتی خستە نێوان ریزی خشڵەکەوە یان دەنکە زێڕو زیوی خستە نێوان میرووە هۆنراوەکانەوە، دەگوترێ: (شذر الأدیب کلامه بالشعر): نووسەرەکە شیعری خستە نێو پەخشانە فەنییەکەیەوە ٥ **تشذَّر القومُ**: خەڵکەکە بڵاو بوونەوە ٥ ڕاو بیرو بۆچونیان جیاواز بوو هەریەکە لەهەوایەك لێ دەدا ٥ **تَشَذَّرَ فلان**: فلانکەس خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ ٥ **تشذَّرَ الرجلُ**: پیاوەکە هەڕەشەی کرد ٥ **الشَّذْرُ**: پارچە زێڕ کە لەکاڵانەکەی دەردەهێنرێ ٥ میرووبەکە دەخرێتە نێوان میروی جیاواز ٥ لولئوئی بچوك ٥ تاکەکەی (شذرةٌ).

**شَغَرَ مَذَرَ**: دەگوترێ: (تفرقوا شذر مذر): بڵاوبوونەوەو بوونە پارچە پارچەو گروپ گروپو کێشەو نیزاعیان تێکەوت.

**شذا المِسْكُ شذواً**: میسکەکە بۆنەکەی کەسکونەو بڵاو بۆوە.

**شذا فلانٌ**: فلان بەمیسك خۆی بۆنخۆش کرد ٥ **أشذاهُ عنه**: لێی دوور خستەوە ٥ **الشَّذْرُ**: میسك یان بۆنی میسك یان ڕەنگی میسك ٥ **الشّذا**: کەسکونی بۆنی خۆش یان ناخۆش ٥ پارچە پارچەی داری عود کە بۆ بۆنخۆشی بەکار دێ ٥ **الشَّذاةُ**: باقی ماندەی هێزو توانا ٥ **اشرأبَّ الیه وله إشرئباباً**: ملی بۆ درێژ کرد ٥ چووە بەرزایی بۆنەوەی بڕوانێ.

**شَرِبَ الماءَ ونحوه شُرْباً**: ئاوەکەی قوت دا.

**شَرِبَ السُنْبُلُ الدقیقَ**: گوڵە گەنمو جۆیەکە پێگەیشتووە دەنکەکانی ڕەق بوونو کاتی دروێنەی هاتووە.

**أشْرَبَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە حوشترەکانی یان کشتو کاڵەکەی وەختی ئاودانیان هات یان تێراو بوون ٥ **أشرب فلاناً**: ئاوی دا بەفلانکەس، دەگوترێ: (أشربني ما لم أشرب): کردمومیەکی پاڵداوم کەنەم کردووە ٥ **أشربَ اللّوْنَ**: ڕەنگەکەی تێرو تۆخ کرد ٥ **أشرَبَ اللونَ غیه**: شتی تری تێکەڵاوی ڕەنگەکە کرد، دەگوترێ: (أشرَبَ البیاضَ حمرةً): ڕەنگی سوری تێکەڵی ڕەنگە سپییەکە کرد ٥ (وأشرَبَ قلبُهُ حب الإیمان): خۆشەویستی ئیمانو خودا پەرستی تێکەڵ بەناخی دڵی بووە ٥ **شاربَهُ مشارَبةً وشراباً**: لەگەڵی دا خواردیەوە ٥ **شَرَّبَ قصب الزرع**: ئاو لەلاسکی گژو گیاکە زیا ٥ **شَرَّبَ فلاناً**: وایکرد فلانکەس بخواتەوە ٥ **تَشَرَّبَ الماءَ ونحوَهُ**: ئاوەکەی وردە وردە هەڵمژی، دەگوترێ: (تَشَرَّبَ الثوبُ العرقَ أو الصِّبْغَ): قوماشەکە عەرقەکەی هەڵمژی یان ڕەنگەکەی هەڵمژی ٥ **استشرَبَ اللّوْنُ**: ڕەنگەکە تۆخ بوو ٥ **إشرأبَّ الیه**: بڕوانە (اشرأبّ) ٥ **الشارِبُ**: بخۆرەوە ٥ سمێڵ؛ ئەو موانەی لەسەر لێوی سەرو دەڕوێن ٥ (الشاربان): جوت سمێڵ ٥ **الشارِبَةُ**: مێینەی (الشّارب) ٥ کۆمەڵێك خەڵك لەسەر کەناری ڕوبارێك نیشتە جێ بنو ئاوی تایبەتیان لەچەمەکەوە هێنابێ.

**الشَّرابُ**: هەرشتێك بخورێتەوە ٥ **الشَّرْبُ**: کۆمەڵە خەڵکێك بخۆنەوەو دانیشتبنو بۆ خواردنەوە کۆمەڵەیان کردبێ ٥ **الشِّرْبُ**: ئاوی خواردنەوە ٥ بەشە ئاوی تایبەتی ٥ دوێلاو: شوێنی ئاو خواردنەوە ٥ **الشَّرْبَةُ**: یەکجار ئاوخواردنەوە،

قومە ئاوێرپوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ◊ **الشُرْبَةُ**: سورایی سەر دەمو چاو ◊ ئەندازەی ئەو ئاوەی ئادەمیزادێك پێی تێراو دەبێ ◊ پەلۆی رون کە هەڵ لوشرێ ◊ **الشُرَبَةُ**: زۆر خواردنەوە ◊ تینوایەتی، دەگوترێ: (لم تزَلْ به شَرَبَةٌ هذا اليوم): بەردەوام ئەمڕۆ تینوی بوو ◊ (يوم ذو شَرَبَة): ڕۆژەکەی گەرم بوو ئاوی زۆر تێدا خورایەوە ◊ (طعام ذو شَرَبَة): خواردنێکی ئاوکێشە بخۆرەکەی پێویستی بە ئاو خواردنەوەی زۆر هەیە ◊ حەوزی بچکۆلە کەبەدەوری بنکی درەختو ڕوەك دا دروست دەکرێ بۆ ئەوەی ئاوی تێ بکرێو ماوەیەك گلی بنکی درەختەکە بەتەڕی بمێنێتەوە ◊ **الشُرَبَةُ**: ئەوەی زۆر ئاو دەخواتەوە ◊ **الشِرِّيبُ**: ئەو کەسەی زۆری حەز لەخواردنەوەیە ◊ **الشروبُ**: زۆر خۆرەوە ◊ ئاوێك گوارا نەبێ ◊ کەمێك تاڵو تفت بێ ◊ **الشَّريبُ**: بەمانا (الشَّروب) دێ ◊ ئەوەی ئاوی لەگەڵ دەخواتەوە یان لەگەڵی دا دەچێتە سەر دوێڵاوو کانی ئاو خواردنەوە ◊ **المَشْرَبُ**: ئەو شوێنەی لێی دەخورێتەوە، شوێنی ئاوخواردنەوە ◊ یان ناوە بۆ خودی ئەو شتەی دەخورێتەوە ◊ **مَشْرَبُ الرجل**: هەواو هەوەسو مەیلی پیاو، دەگوترێ: (هم قوم إختلفت مشاربهم): ئەوانە قەومێکن بیرو بۆچونو حەزو ئارەزووی جیاجیایان هەیە ◊ **المَشْرَبَةُ**: شوێنی خواردنەوە ◊ زەوی نەرمەڵانو هەمیشە سەوزو ڕودکاوی ◊ (طعام مشربة): خۆراکێکە ئاوکێشە زۆری ئاو لەسەر دەخورێتەوە ◊ **المِشْرَبَةُ**: جامی ئاو خواردنەوە، پیاڵەی ئاو خواردنەوە ◊ **شَرِبَتْ يَدُهُ أو رِجْلُهُ شَرَبًا**: پێستی قاچی یان دەستی ئەستور بوو بەهۆی سەرماوە قەڵشینو شەقار شەقار بوون.

**شَرِثَ النعلُ**: نەعلەکە دڕا ◊ **إنْشَرَثَتْ يَدُهُ**: دەستی قەڵشین ◊ **الشَرِثُ**: تیژایی دەمی شمشێر ◊ تیژایی چەقۆو شتی وا.

**شَرَجَ الشيءَ شَرْجاً**: پارچەو کەرتەکانی شتەکەی خستنە پاڵ یەك.

**شَرَجَ اللَّبِنَ ونحوه**: خشتەکانی ڕیز کردن.

**شَرَجَ العيبَةَ**: هەندێ قوڵفەو ئەڵقەی عەیبەکەی لێك بەستن ◊ (العَيْبَة): تاینچەو ڕەشکەو تیرەو قەرتاڵەو شتی وا کە بەروبومی دورواوەو چنراوی تێدا دەگوێزرێتەوە بۆ سەرخەرمان.

**شَرَجَ الشراب بالماء**: شەرابەکەی تێکەڵاوی ئاو کرد.

**شَرِجَ الجِسْمَ شَرجاً**: جەستەکە قەڵەوو گۆشتن بوو ◊ **أشرَجَ العيبَةَ**: بەمانا (شَرَجَ)دێ، دەشگوترێ: (أشْرَجَ صَدْرَهُ على كذا): سنگی خۆی بەوەوە جوت کرد ◊ **شَرَّجَ**: بۆ موبالەغەو زیادەڕۆیی لەمانای (شَرَجَ)دا دێ.

**شَرَجَ الثوبَ**: بەتەقەڵی درشت قوماشەکەی درو ◊ **إنْشَرَجَ**: شتەکە بوو بەدووو بەش ◊ **تَشَرَّجَ اللَّحْمُ بالشحم**: گۆشتو بەز تێکەڵاو بوون ◊ **الشَرْجُ**: ڕێڕەوی ئاو لەتەپۆڵکەو شتی وا دا کەدێتە خوار بۆ پێدەشتو بنارەکان ◊ کۆمەڵو تاقم، دەگوترێ: (أصبحوا في هذا الأمر شرجين): لەم کارەدا بوون بە دوو تاقمو پێڕ ◊ **الشَرَجُ**: ئەڵقەو قوڵفەی عەربەو ڕەشکەو خێمەو شتی وا ◊ دەوران دەوری کونی پاشەوە ◊ (شَرَجُ الوادي): دەراوی شیو ◊ **الشَّريجُ**: سەری چیلکە دار دوای شکاندنەوەی.

**الشريان**: دوو ڕەنگی جیا لەهەر شتێك ٥ **الشَّرِيعَة**: زەمبیلەیەکی گەورە لەپرزی دارخورما دەچندرێ کالەك‌و میوەی تێدا دەگوازرێتەوە ٥ کولانەو قەفەسێکە لەپرزی دارخورما دروست دەکرێ بۆ کۆتر ٥ **شَرْجَعَ الخَشَبَةَ المربعة**: ئەملاو ئەولای دارە چوار گۆشەیەکەی تاشی ٥ **الشَّرْجَعُ**: درێژ ٥ دارە مەیت ٥ (**المُشَرْجَعُ**): درێژ کراو.

**شَـرَحَ اللحـمَ**: گۆشـتەکەی کوتکـوت کـرد بـە شێوەیەك کوتەکانی درێژو تەنك بن.

**شرحَ الشيئَ**: شتەکەی رونکـردەوە شـی کردنـەوەو لێکۆڵینەوەی تێدا ئەنجام دا، دەگوترێ: (شـرح صـدره بـالأمر): دڵـی خـۆش کـرد بەکارەکـە ٥ نیـشەکەی لا خۆشەویـست کـرد ٥ **شَـرَّحَ اللحـمَ**: بـەمانا (شَـرَحه)ی ٥ **شَـرَّحَ الجُثَّـةَ**: لاشـەکەی پشکنی، هەندێکی لەهەندێـکی جیاکردەوە بۆ پـشکنینی زانیـاری ٥ **انْـشَرَحَ**: بـۆ مـوطاوعەی (شَـرَحَهُ) هـاتووە، دەگـوترێ: (إنْـشَرَحَ صـدرُهُ لکـذا): دڵـی پێـی خـۆش بـوو، هاتـە سـەر ئـەو ڕایەو بەڕاستی زانی ٥ **التَّشْرِيحُ**: (علم التَشريح): زانیارییەکـە دەربـارەی پێـکهاتەی جەسـتەی عوضـوی بەشـێوەی هەڵـدڕین‌و پـشکنین بـۆ مەبەستێکی تایبەتی ٥ **الشريحة**: پارچە گۆشتی تەنك یان پارچەی تـەنکی شـتی تـر ٥ **المَشْرَحَةُ**: ئـەو مێـزو تەختەیەیـە جەسـتەی لەسـەر دەپـشکندرێ هـەروا نـاوە بـۆ ژوورێـکی گـەورە ئامادە دەکرێ بۆ هەڵدڕین‌و پشکنینی جەستەی مردووەکان تێیدا.

**شَرَخَ الصَّبِيُّ شروخاً**: منداڵەکە گەیشتە سەرەتای گەنجی.

**شَـرَخَ نـاب الـبعير شَـرْخاً**: ددانـی حوشـترەکە دەرکەوتن گۆشتەکەیان دڕی‌و سەریان دەرهێنا ٥ **الشَّرْخُ**: ئەصڵ‌و بنەما ٥ ڕەگ‌و دەمار ٥ (شَرْخ الـشباب): سـەرەتای گـەنجی‌و تـەڕو تـازەیی‌و گەشـــەداریی گـــەنجی ٥ درزو کەلێنێـــکە لەئێـسقان‌و دیـوارو شـتی وا دا پەیـدا ببـێ‌و ئەگاتە ئاستی لێك جیابوونەوەو پچڕان.

**شَرَدَ البعيرُ وغيره**: حوشترەکە تەرەبوو، یاخی بوو.

**شَـرَدَ عـن الطريـق**: لەڕێـگە لای دا ٥ (فهـو شـارد وشرود).

**شُـرِدَ فـلانٌ**: فلانکـەس شاربەدەر کـرا، بەشـێوەی تڕۆکراوی شـوێنی خـۆی جـێ هێـشت ٥ **أشْرَدَهُ**: شاربەدەری کرد بەزۆر وەدەری ناو وای لـێ کرد بێ‌لانـەو مـاڵ‌و حـاڵ بـێ ٥ **شَـرَّدَهُ**: تـرۆی کـردو وەدەری نـاو بـێ شـوێن‌و جێـگا مایـەوە ٥ **شَـرَّدَ القـومَ**: خەڵـکەکەی پـەرت‌و بڵاو کـردو تـەفرو تونای کردن ٥ **تَشَرَّدُوا**: بڵاو بونـەوە، دەگوترێ: (تَشَرَّدُوا في الأرض): بەناو زەوی دا بڵاو بونەوە ٥ **الـشَّارِدُ**: دەگـوترێ: (رجـل شـارد العـين): پیاوێـکە چـاوی بڕیوەتـە شتێـك کـەهی ئـەو نییە، بۆ ئەو نابێ، بۆ ئافرەت دەگوترێ: (إمرأة شـاردة) ٥ (قـصيدة شـاردة): چامە شیعرێـکە دەستاو دەستی پـێ کـرا بـەناو خەڵـك دا بـڵاو بـۆوە ٥ (ك: شـوارد) ٥ **شـوارد اللغـة**: وشـەو ڕستەی ناوازەو کەم بیستراوی زمـان ٥ **الـشُّرود**: (شـرود الـذهن): لەزانـستی دەروونزانـی دا بـەوە دەگوترێ کابرا ئاگاداری شت نەبێ‌و بـێ ئاگابێ لـەبارو دۆخـی دەوروبـەرو ڕوداوی تـازە پەیـدا بوو ٥ **الشَّرِيدُ**: دەرکراوی بێ شوێن‌و جێـگاو لانە ٥ **المُتَشَرِّدُ**: تەمبـەڵ‌و بێکـارو ئـیش‌و هـیچ لـەبارا نـەبوو ٥ **الـشِّرْذِمَةُ**: بـەش‌و تـاقم‌و گـرۆهـ دەگوترێ: (شِرذمة من النـاس): کۆمەڵێـکی کـەم لەئادەمیزاد ٥ دەگـوترێ: (ثـوب شـراذم وثيـاب

شـــرادم): كراسێـكى دادڕاوو كۆنــه ٥ پۆشـاكى شڕو وڕكراو.

**شَرَّ فلان شراً:** فلانكەس حەزى لەشەڕو ئاژاوە بـوو ٥ بارى بەشەڕو هەراوە گرتووە.

**شَرَّ فلاناً شَرّاً:** ڕەخنەى لەفلانكەس گرت‌و عەيب‌و عـارى پـاڵ دا.٥ **شَـرَّ** الثوبَ أو اللحم ونحوهمـا: قوماشـەكە يـان گۆشـتەكەى بـڵاو كـردەوە بـۆ ئەوەى وشك بێتەوە ٥ **أشَرَّ الشيءَ:** بەمانا (شَرَّهُ) دێ، دەگوترێ: (أشَرَّ الثـوبَ واللحـم ونحوهمـا): قوماشەكە يان گۆشـتەكەى بـڵاو كـردەوە ٥ **أشَـرَّ فلانـاً:** كێـشەى لەگـەڵ فلانكـەس بـەرپاكرد ٥ **الإشـرارةُ:** ئـەو شـتەى گۆشـتى لەسـەر بـڵاو دەكرێتەوە بۆ ئەوەى وشك بێتـەوە يـان پـەنيرو شتى لـەو جۆرەى لەسـەر هەڵـدەخرێ ٥ هـەروا ناوە بۆ پارچە گۆشتى وشكەوە كـراو ٥ **الـشَّرارُ:** پريشك كەلەقەبارەى ئاگر تێبەربوو پەيدادەبن ٥ روناكايى پەيدا بوو لەخاڵى بوونى كارەباوە ٥ **الشَّرَرُ:** پريشك دەق بەمانا (الشَّرَارُ) دێ.

**الـشَّرُّ:** خراپـەو نەگبـەتى زيـان‌و زێنـەخرۆ ٥ دەگوترێ: (رجل شَـرٌّ): پياوێـكى خراپـەكارە ٥ **الشِرَّةُ:** توندو تيژى، دەگوترێ: (أعـوذ بـالله مـن شِرة الغضب): پەنادەگرم لەسەرڕێژكردنى ڕق‌و قـين ٥ چوسـت‌و چـالاك، دەگوترێ: (للـشباب شِـرَّةٌ): گەنجيـەتى چوسـت‌و چـالاكى هەيـە ٥ **الشِّرِيرُ:** پياو خراپ‌و شەڕ خواز.

**شَرَزَ الشَّيْءَ شرزاً:** شتەكەى پارچە پارچە كـرد ٥ بڕييەوە ٥ **أشرَزَهُ الله:** خودا خستيە ناو چورتم‌و ناخۆشـييەوە بـەهيچ شـێوەيەك ڕزگـار بـوونى نييـە ٥ **شـارَزَهُ:** دژايـەتى كـردو بەرهەڵـستكارى كـرد ٥ **شَـرَّزَهُ:** ئەشكنجەى دا ٥ جوێنى پـێ دا ٥ (شَـرَزَ الـشيء): شـتەكەى شـەتەك داو ئـەملاو ئەولاى بەست ٥ **الشَّرْزُ:** شەڕو نەگبەتى ٥ توندو گرژى ٥ هێزو توانا، دەگوترێ: (عَذَّبَـهُ الله عـذاباً شـــرزاً): خـــودا ســـزاى بەئێـــشى دا ٥ **المـــشارِزُ:** ڕەوشـت ناشـيرين ٥ شـەڕكەرى جەربـەزەو بـێ بەزەيى.

**شَرَسَ الجِلدَ:** پێستەكەى شێلا، دەستى پێدا هێنا.

**شَرَسَ صاحِبَهُ:** بەقسە هاوەڵەكەى تەنگەتاو كرد.

**شَرَسَ الدابَةَ:** وڵاخەكەى رام كرد.

**شَرِسَ شَرَساً وشراسَةً:** ڕەوشتى ناشيرين بوو توندو تيژيى نواند دژايەتييەكەى توندو بەهێز بوو

**شَــرُسَ شَراسَــةً:** بــەمانا (شَــرِسَ)دێ ٥ **شارَسَـهُ:** دژايــەتى كــرد ٥ **تَــشَارَسَ القــومُ:** خەڵــكەكە دژايـەتييان كـرد پێـچەوانەى ئـەو جوڵانـەوە ٥ **الإشراس:** سـرێش؛ مادەيەكە وەكوو كـەتيرە بـۆ شت بەيەكـەوە نوسـاندن بـەكاردێ ٥ **الـشِّرَاسُ:** بەمانا (الإشراسُ) دێ ٥ **الـشَّرِسُ:** بەدڕەوشـت ٥ توند ڕەو لەدژايەتيكردن دا ٥ **الشُّرْسُوفُ:** سـەرى پەراسو بەلاى گەدەوە ٥ **شَرْشَرَ الماءُ ونحوه:** ئاوەكە دڵۆپ دڵۆپ هاتـە خـوار ٥ تكـەى كـرد ٥ **شَرْشَـرَ الـسكينَ ونحـوه:** كێردەكـەى تيـژ كـرد ٥ دەمـى كێردەكەى وەكوو مشار دابڕ دابـڕ كـرد ٥ **شَرْشَـرَ الـشيءَ:** شـتەكەى گەسـت‌و دوايـى فڕێـى دا ٥ شتەكەى جوێ‌و دوايى تفى دايـەوە ٥ **الـشَّراشِرُ:** قـەراخى بـاڵ؛ سـەرە بـاڵ ٥ جەسـتەو قـەبارەو قورسـايى، دەگـوترێ: (ألقـى عليـه شراشِـرَهُ): خـەم‌و خەمـەتى خـۆى بەسـەردا دان، يـان لـە خۆشەويستى‌و بەخەمەوە بوونى خـۆى بەسـەر دا دا ٥ تاكەكـەى (شُرْشُـرَة) ٥ **الـشُّرْشُرُ:** (شِـواء شَرْشَرٌ): شـەوايەيەكە چەورى گۆشتەكەى تـك تـك دێتـە خـوار ٥ **الـشَّرْشَرَة:** داسـى بـچوك، داسـى دروێنەى بچوك.

**السِّرْشِرَة**: پارچەی شت ◊ **السَّرْشورُ**: باڵندەیەکی بچوکە وەکوو چۆلەکە وەهایە.

**شَـرَطَ الجِلـدَ ونحـوه شَـرْطاً**: پێستەکەی هەڵدڕی کونێکی بچوکی تێکرد.

**شَرَطَ له أمراً**: بۆی بەرعودەی کارێك بوو.

**شَرَطَ عليه أمراً**: کارێکی خستە ئەستۆی.

**شَـرِطَ فلانـا**: فلانکـەس کەوتـە نـاو کارێـکی ئەستەمو گەورەوە ◊ **أشْرَطَهُ**: نیشانەی بۆدانا، دەگوترێ: (أشْرَطَ نفسه بکذا): نەفسی خۆی بۆ ئەوشتە ئامادە کرد ◊ **أشْرَطَ الرسولَ الى فلان**: بەپەلە پیاوی نارد بۆلای فلانکەس ◊ **أشْرَطَ فلاناً لعمل کذا**: فلانکەسی ڕاسپارد بۆئەوەی بەسەر فلان کاردا رابگا ◊ **شارَطَه علی کذا**: مەرجی لەسەر دانا ◊ **اشْتَرَطَ عليه کذا**: بەمانا (شَرَطَ)دێ ◊ **اشْتَرَطَ القومُ کذا**: خەڵکەکە فلان شتیان کردە نیشانە بۆ خۆیان ◊ **تشارطا علی کذا**: ئەو دوووکەسە هەریەکەیان مەرجی خۆی لەسەر ئەوی تریان دانا ◊ **تَشَرَّطَ في عمله**: لەکارەکەی دا دەست ڕەنگینیو وردەکاری نواند ◊ **الشَّرْط**: مەرج؛ دوو کەس یا زیاتر لەمامەڵەو شتی وادا مەرج بۆیەکتری دادەنێن بۆئەوەی پێیەوە پابەند بن ◊ لەفیقهو قانون دا شەرت ئەوەیە شتەکە بێ ئەو تەواو نەبێ لەپێکهاتەی شتەکەش نەبێ ◊ بەلای نەحوییەکانەوە پەیدابوونی شتێکە بەهۆی شتێکی ترەوە، پەیوەست بووونی شتێکە بەشتێکی ترەوە بەهۆی ئامرازێکەوە ◊ ئامرازی شەرت وەکوو (إنْ، مَنْ، مهما، ...هتد).

**الشَّرَطُ**: نیشانە ◊ **الشَّرَطان**: دوو ئەستێرەن پێیان دەگوترێ (قرنا الحمل) لەسەرەتای بەهاردا دەردەکەون ◊ **الشُّرْطَة**: پۆلیس ◊ تاکەکەی (شُرْطِي وشُرَطِي)یە ◊ صاحِبُ الشرطة: سەرۆکی پۆلیس ◊ **الشَّريط**: حەبلی بادراو ◊ پلیتەی چرا ◊ تیلمە چەرمو تیلمە نایلۆن کە درێژو تەسك بن ◊ جانتاو تورەکەیەکی بچوکە ئافرەت عەترو پێداویستی مکیاجی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ◊ **الشريطة**: بەمانا (الشَّرْط)دێ ◊ **المِشْرَطُ**: چەقۆو گوێزانی پزیشك بۆ بەکارهێنانی لە نەشتەرگەریدا ◊ **المِشْرَطَة**: بەمانا (المِشْرَط)دێ.

**شَرَعَ الواردُ شَرْعاً**: دەمی خستە ناو ئاوەکەوەو خواردیەوە.

**شَرَعَ المَنزِلُ**: خانوەکە لەڕێگاکەوە نزیك بوو.

**شَرَعَ فلان يفعل کذا**: فلانکەس دەستی بەفلان کار کرد.

**شَرَعَ الشيئَ**: شتەکەی بەرز کردەوە، دەری خست.

**شَرَعَ الدينَ**: ئاینەکەی دانا روکنو مەرجەکانی رونکردنەوە.

**شَرَعَ الأمْرَ**: کارەکەی بەباش داناو پەسەندی کرد.

**شرع الطريقَ**: ڕێگاکەی خۆش کردو تەختی کرد.

**شَرَعَ المنزلَ**: خانوەکەی لەسەر ڕێگای دەرچوو کراوە بنیات نا .

**شَرَعَ البابَ**: دەرگاکەی خستە سەر ڕێگای دەرچوو کراوە ◊ **أشْرَعَ الشيْئَ**: شتەکەی دەرخست، بەرزی کردەوە ◊ **أشْرَعَ نحوه الرمْحَ**: رمبەکەی بۆ ڕاداشت، ڕوی ڕمبی تێکرد ◊ **أشْرَعَ الطريقَ**: ڕێگاکەی درێژکردەوەو تەختو خۆشی کرد ◊ **أشْرَعَ النافذة الى الطريق**: پەنجەرەی سەر ڕێگای کردەوە ◊ **أشْرَعَ الدابةَ**: وڵاخەکەی بردە سەرئاو ◊ **شَرَّعَ**: بۆ موبالەغەو زیدەڕۆیی مانای (شَرَعَ)دێ ◊ **شَرَّعَ البيت**: خانوەکەی بەرزکردەوە

٥ شَرَّعَ السفينةَ: شیراعی بۆ کەشتییەکە دروست کرد ٥ اشترعَ الشريعة: قانونو یاساو شەریعەتی دانا ٥ الشُّراعَة: سەر لاشیپانە، تاکێکە دەکەوێتە سەر دەرگا، بۆ هەوادانو روناکی ٥ الشَّرْعُ: رێگاو بان ٥ رێبازو یاسایەك خودا دایناین بۆ ئادەمیزاد هەروا دەگوترێ: (الناسُ في هذا شرع واحد): ئادەمیزاد لەم بوارەدا یەکسانن ٥ الشَّرْعُ: یەکسانی ٥ الشِّرْعُ: هاوشان، دەگوترێ: (هما شِرعان) ٥ هەروا ئاوە بۆ وەتەری عود ٥ الشِّرْعَةُ: کەپرو سابات ٥ الشِّرْعَةُ: رێبازو پەیڕەوو پرۆگرام ٥ مەزهەبو رێبازی راست ٥ الشَّريعة: ئەو بەرنامەیەی خودا بۆ بەندەکانی دایناوە لەبواری بیرو باوەڕو یاساو رێساوە ٥ رێبازو پرۆگرام ٥ دەراوی ئاو کەیەبێ جامولکەو پەرداخ دەتواندرێ دەمی پێومنێیو ئاوی لێ بخۆیەوە ٥ بەربێلاو هەیوان ٥ المَشْرَعَةُ: پلوسکی ئاو ٥ دەراوی ئاو ٥ المشروعُ: ئەوەی شەرع بەرەوای بزانێ ٥ کارێك بخرێتە بەرنامەوە بۆ ئەنجامدان ٥ شَرَفَت الدابّةُ شروفاً: ولاخەکە بەسەر شتەکەی دا روانی.

شَرَفَ الحائطَ: گوێسەبانەی بۆ دیوارەکە کرد.

شَرُفَ الرجلُ: پیاوەکە شەریفو مەردبوو پلەو پایەی بەرز بۆوە ٥ أشْرَفَ الشيءَ: شتەکە بەرز بۆوە، گران بوو.

أشْرَفَ عليه: لەبەرزاییەوە تێی روانی ٥ چاودێری کردو بەسەری دا راگەیی ٥ لێی نزیك بۆوە، دەگوترێ: (أشْرَفَ على الموت): هەروەها بەمانای بەزەیی پێداهاتنەوە دێ ٥ أشْرَفَ الشيءَ لە: شتەکەی بۆ جێگیر کرد، ئەوشتەی بۆ گونجاند ٥ أشْرَفَ المِرْقاةَ: چووە سەر پەیژەو بەرزەكو مەصعەد ٥ شارَفَهُ: لەبنەچەو باوكو باپیرەوە خۆی هەڵنایەوەو شانازی بەسەردا کرد ٥ شارَفَ الشيءَ: لەبەرزاییەوە پێیدا روانیو سەیری کرد ٥ شارَفَهُ: لێی نزیك بۆوە ٥ شَرَّفَ البناءَ: گوێسەبانەو دیکۆری بۆ خانوەکە دروست کرد ٥ شَرَّفَ فلاناً: رێزی لەفلان گرتو بەگەورەی دانا ٥ وەسپی دا ٥ تَشَرَّفَ الرَّجُلُ: پیاوەکە شەرەفیاب بوو پلەو پایەی بەرز بۆوە ٥ تَشَرَّفَ للشيْءِ: چاوەڕوانی شتەکەی کرد، بەهیوای بوو ٥ تَشَرَّفَ للفتنةَ: توشی فیتنەو ئاشوب بوو ٥ تَشَرَّفَ الشيءَ: دەستی خستە سەر برۆکانی بۆ ئەوەی تیشکی خۆر ئازاری چاوی نەداو بەئاسانی شتەکە لەبەرزیو دووری ببینێ.

تَشَرَّفَ المرقاةَ وعليها: چووە سەر پەیژەو بەرزەکەکە ٥ اِسْتَشرف: راست بۆوەو خۆی بەرز کردەوە ٥ اِسْتَشْرَفَ الشيءَ: چاوی هەڵبڕی بۆئەوەی لەبەرزییەوە ببینێ ٥ أشراف الوجه: دوگوێچکەو لوت ٥ الشّارِف من الدّواب: ولاخی پیر ٥ الشّارِف من الأشياء: شتی کۆنو عەنتیکە ٥ الشّارُوفُ: گەسکە ٥ الشُّرافَةُ: دیکۆرو زەوانیدی وەها کە شتەکەی پێ برازێنرێتەوە ٥ الشَّرَفَ: شوێنی بەرز کەلێیەوە بروانیتە ئەملاو ئەولا، دەگوترێ: (هو على شرف من كذا) ٥ بەسەری دا دەڕوانێو لێیەوە نزیکە ٥ بەرزیو شکۆمەندیو پەسنی ٥ الشُّرْفَةُ: ژوروی شت ٥ لای سەرووی شت ٥ ئەگەر بۆ بیناو باڵەخانە بەکاربێ بەو دیکۆرو زەخرەفەیە دەگوترێ کەلەسەروی بیناکەوە دروست دەکرێ بەمەبەستی رازاندنەوە ٥ یان هەورە بانە ٥ المشارِفُ: (مشارف الأرض): بەرزاییەکانی زەوی ٥ تاکەکەی (مَشْرَف) ٥ (مشارِف العراق): ئەو گوندە عەرەبانەی سەر سنوری رەشەخاکی عێراقن.

المَشْرَفِيّ: شمشێرێکە لەولاتی مشارف دروست دەکرێ یان لەوێوە دەهێندرێ ٥ شَرَقَت الشمسُ شَرْقاً: خۆر دەرکەوت، خۆر هەلات.
شَرِقَ المکانُ: شوێنەکە خۆر لێی دا، خۆری تێکەوت.
شَرِقَ الشيءُ: شتەکە تێکەڵ بوو.
شَرِقَ لونه: رەنگی سور بوو.
شَرِقَ البلحُ: خورما بەرسیلەکە سور هەڵگەڕا.
شَرِقَ وجهه: خەجاڵەت بوو، رەنگی سور هەڵگەڕا.
شَرِقَ الدمُ بجسده: خوێنەکە دەرکەوتو رەوان بوو.
شَرِقَ فلان بالماءِ: فلانکەس بەناو قورگی گیرا، دەگوترێ: (شَرِقَ بریقه وَشَرِقَ الموضعُ بأهله): دەمی پڕبوو لە تف ٥ شوێنەکە پڕبوو لەخەڵکو تەنگەبەر بوو ٥ شَرِقَت الآلة: ئامێرەکە (مەکینەکە) بەسوتەمەنییەکەی خنکا ٥ شَرِقَت الأرضُ: زەوییەکە بەهۆی ئاودێرنەکردنی بوو بەسوتەمەرۆ ٥ أشْرَقَت الشمسُ: خۆر لەئاسۆوە دەرکەوتو گزنگی خۆی بەزەوی دا بڵاو کردەوە، دەشگوترێ (أشرقت الأرضُ): زەوی بەتیشکی خۆر روناك بۆوە ٥
أشْرَقَ وجْهُهُ: روخساری درەوشایەوە جوانی لێ دەتکا ٥ أشْرَقَ البلحُ: بەرسیلە خورماکە سور هەڵگەڕا ٥ أشْرَقَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە کاتی خۆر هەڵاتنەوە ٥ أشْرَقَ فلاناً: قورگی فلانکەسی گیراند ٥ أشْرَقَ الثوب بالصبغ: زێدەرەوی کرد لەبۆیەکردنی قوماشەکەدا ٥ شَرَّقَ: لای خۆرهەڵاتی گرت ٥ شَرَّقَت وجْهُهُ: دەمو چاوی گەشایەوە جوانی لێ تکا ٥ أشْرَقَتْ الأرضُ: زەوییەکە بێ بەروبووم بوو، ئاوی لێ براو بوو بەسوتەمەرۆ ٥ أشرق اللحمَ: گۆشتەکەی توێ توێ کرد لەبەر خۆر هەڵی خست تا وشك بێتەوە ٥ إنشرق اللحمَ: گۆشتەکەی توێ توێ کرد لەبەر خۆرهەڵی خست تا وشك بێتەوە ٥ انشَرَقَت القوسُ: قەوسەکە دوو لەت بوو ٥ تَشَرَّقَ: خۆی بەرهەتاو دا، لەچێشتەنگاودا لەبەر بەرۆچك دانیشت بۆ ئەوەی گەرمی بێتەوە ٥ الإشراق: پەیدابوونی نورو روناکیە لەجیهانی هەست پێ نەکراوەوە بۆ ناو زەین، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی زانستو زانیاری ٥ التشريق: (أيام التشريق): سێ رۆژەی دوای جەژنی قوربان رۆژی (١٢-١٣-١٤)ی مانگی ذیلحجە ٥ هەروا بە نوێژی جەژنی قوربانیش دەگوترێ ٥ الشارِقُ: خۆر ٥ لای خۆرهەڵات ٥ دەشگوترێ: (أحمر شارق): سورێکی زۆر سورە ٥ الشّراقي: لەزاراوەی خەڵکی میصردا ئەو زەوییەیە ئاوی روباری نیل نەیگرێتەوە ٥ کە ئاو دراو بەرو بوومی باشی بوو پێی دەگوترێ: (ريّ الشراقي) ٥ الشَّرْقُ: خۆر ٥ لای خۆر هەڵات ٥ (شجرة شرقية): ئەو درەختەیە لەخۆرهەڵاتەوە خۆر لێی بدا تا نیوەڕۆ ٥ الشَّرَقُ: خۆر ٥ (لحم شَرَقٌ): گۆشتی بێ چەوری ٥ الشَّرِيقُ: خۆر هەڵات ٥ المشارقة: دانیشتوانی خۆرهەڵات ٥ تاکەکەی (مشرقي)یە ٥ المَشْرِقُ: لای خۆرهەڵات ٥ وڵاتە ئیسلامییەکانی خۆرهەڵاتی نیوە دورگەی عەرەبی ٥ المَشْرِقان: خۆرهەڵاتو خۆرئاوا (بەشێوەی تەغلیب) ٥ المِشْرقان: تیشکێکە لەدرزی دەرگاو پەنجەرەوە دەچێتە ژور ٥ یان ناوە بۆ خودی درزەکە ٥ شَرِكَت النعلُ شركاً: شیراکی نەعلەکە پچڕا.
شَرِكَ فلاناً في الأمر شِركاً وشَرِكةً وشِرْكةً: فلانکەس بوو بەهاوبەش لەکارەکەداو بۆ هەریەکێ لەهاوبەشەکان بەشێکی دیاریکراو هەیە ٥ أشْرَكَهُ

**في أمره**: خستیه ناو کارەکەیەوە ◊ کردی بەهاوبەش، دەگوترێ: (أشرك بالله): هاوەڵی بۆ خودا دانا، شتی تری کرد بەهاوبەشی خودا لەخودایەتیو دەسەڵات دا ◊ **أشرَكَ النعلَ**: شیراکی بۆ نەعلەکە دروست کرد ◊ **شارکه**: هاوبەشی کرد، بوو بە هاوبەشی، دەشگوترێ: (فلان یشارك في علم کذا): فلانکەس لەفلان زانست دا هاوبەشی هەیە شتێکی لێ دەزانێ ◊ **شَرَّكَ بینهم**: کردنی بەهاوبەش ◊ **شَرَّكَ النَّعْلَ**: شراکی بۆ نەعلەکە دروست کرد ◊ **اشترك الأمرُ**: کارەکە تێکەڵو پێکەڵ بوو ◊ **اشترك فلان في کذا**: فلانکەس لەفلان پرۆژەدا هاوبەشی کرد شتێکی پارە خستە ناو پرۆژەکەوە بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرێ، دەگوترێ: (اشترك في الصحیفة أو في السکة الحدیدیة) ◊ **اشترك الرجلان**: ئەو دوو پیاوە بوون بەهاوبەشی یەکتر ◊ **تشارکا**: هاوبەشی یەکتریان کرد ◊ **الإشتراکیة**: رێبازێکی سیاسیو ئابورییە پەیڕەوو پرۆگرامی ئەوەیە دەوڵەت ئامێرو کەرەسەی وەبەرهێنان کۆنترۆڵ بکاو سەروکاریان بکاو بەشێوەی عەدالەت بەرو بوومەکەیان بەسەر دانیشتوانەکان دا دابەش بکا یەکسانی بخاتە ناو کۆمەڵگاوە ◊ (لەڕاستیدا ئەوە هەر قسەیەو جەواشەکردنی جەماوەرەو لەواقیع دا شتێکی ترە) ◊ **الشِّرَاك**: شیراکی نەعل کەدەکەوێتە پشتەپێ ◊ **الشِّرْكُ**: بەشو بار ◊ بڕوای فرەخوایی.

**الشَّرَك**: داوی نێچیرەوان ◊ **الشِّرِكَةُ**: گرێبەستێکە لەنێوان دووکەس یان زیاتر بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی هاوبەش ◊ **المُشْتَرَك**: (رجل مشترك): پیاوێکی خەمۆکە، قسە لەگەڵ خۆی دەکا ◊ (لفظ مشترك): وشەیەکە زیاد لەمانایەکی هەیە ◊ (مال مشترك): ماڵێکی هاوبەشە زیاد لە خاوەنێکی هەیە.

**شَرَمَ الشيءَ شَرْماً**: لەلاوە شتەکەی دادڕی، دەگوترێ: (شرم أنفه وشرم أذنه): لەلای سەروی لێی بڕی کەمێکی لێ کردەوە.

**شَرَمَ** له من ماله. لەماڵو سامانی خۆی شتێکی کەمی دایە.

**شَرِمَ شَرَماً**: درزی برد، قەڵشا، دەگوترێ: (تشرَّمَ الجلدُ): پێستەکە قەڵشت ◊ (تشرَّمَ نواحي الکتاب): قەراخی کتێبەکە شەقار شەقار بوو ◊ **الشَّرْم**: هەر درزو دەلاقەیەك لەدیوار یان لەکێو دابێو داخراوبێ ئەم دیواو دیونەبێ ◊ **الشَّرْم في البحر**: بەمانا خلیجی دەریا (قوناو)دێ ◊ **شرَّقَهُ**: بڕیەوە ◊ **الشَّرانِقُ**: کاژ؛ توێژی مار کەساڵانە فڕێی دەدا ◊ **الشَّرْنَقَةُ**: قۆزاخە؛ پەردەیەکی چنراو لەهەودای بارێك بڕێ جڕو جانەوەر بەدەوری خۆی دا دەیچنێ بۆ پارێزگاری کردنی بۆ نموونە کرمی ئاوریشم.

**شَرِهَ** الی الطعام رغبه: حەزی لەخواردن کرد زۆر بۆی چڵێس بوو (فهو شره وشَرْهانُ وهي شرهة وشرهی) ◊ **شَرَاهُ شِرِیً**: فرۆشتی ◊ بەنرخو بەهای خۆی شتەکەی هەڵگرت.

**شَرَي** الله فلاناً: خودا فلانکەسی توشی نەخۆشی خرۆێلکە کرد.

**شَرِيَ** في الأمر: توند ڕەوی لەکارەکەدا کردو زۆری لێ کۆڵیەوە ◊ بەتوندی تێ نووساو خێرا هەنگاوی نا

**شَرِيَ** البرقُ: بروسکەکە روناکیو تیشکەکەی درێژەی کێشا ◊ **شَرِیَت العینُ بالدمع**: چاو بەرێز فرمێسکی رشتن.

**شَرِيَ الجلدُ**: پێستی خرۆیلکەی دەردا ◊ (فهو شَرٍ) ◊ **أشْرَتِ الشَّجَرَةُ**: درەختەکە پەلکە گەڵاکانی لەزەوی خشان بەناوی دا بڵاو بوونەوە ◊ **أشرى القومُ**: خەڵکەکە خۆیان شوبهاند بەکۆمەڵی شورات ◊ **أشرى بين القوم**: شەڕو ئاشوبی خستە ناو خەڵکەکەوە ◊ **أشرى الشيئَ**: شتەکەی خوار کردەوە ◊ **أشرى فلاناً بكذا**: بەفلان شت فلانکەسی هەڵنا بۆ کردنی شتێک ◊ **شاراه مشاراة وشراءً**: پێی فرۆشت مامەڵەی لەگەڵ کرد ◊ زۆر توند ڕەوی کرد لەکێشەو نیزاعەکەی دا ◊ **اشتراه**: بەبەهاو نرخی خۆی شتەکەی وەرگرت ◊ لێی کڕی ◊ **تَشَرّى القومُ**: خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد ◊ چوونە نێو پێرو تاقمی شوراتەکانەوە ◊ **استَشْرَى**: خرۆیلکە یان مێکوتەی جەستەی زۆر بوون ◊ **استَشرى الشرُّ أو الداءُ**: شەڕو ئاژاوەکە یان دەردەکە پەرەی ستاند لەوزە دەرچوو ◊ **الشاري**: کڕیار ◊ فرۆشیار ◊ کەسێک لەبەرخاتری خودا خۆی جانفیدا بکا، خۆبکاتە قوربانی ◊ **الشَّرى**: بلقی سورن وەکوو فلس و پەنجایی و شتی وا لەسەر جەستە پەیدا دەبن خرویان تێدایەو ئازاریشیان هەیە ◊ کێوو کەژ ◊ شوێنێک شێری زۆربێ، دەگوترێ: (هم أُسدُ الشرى): ئەوان ئازاو بەجەرگو مەردن ◊ ناوچە ◊ **شَرْوى الشيئِ**: وەکوو ئەوشتە ◊ هاوتاو هاوشێوەی شت، دەگوترێ: (هو لايملك شروى نقير) ◊ ئەوپیاوە دارای توێکڵە خورمایەک نییە، هەژارو لاکەوتەیە ◊ **الشَّرْيُ**: کاڵەکە مارانە ◊ ئەمامە خورما کە بەهۆی دەنکەکەیەوە بڕوێ ◊ تاکەکەی (شَرْيَةٌ) ◊ **الشِّرْيان**: ئەو ڕەگەیە خوێن لەدڵەوە دابەش دەکا بۆ جەستە ◊ **الشِّرية من النساء**: ئافرەتێکە هەرکچی ببن ◊ **المُشتَرى**:

گەورەترین هەسارەی گەڕۆکە ◊ لەچیرۆک و ئەفسانەکان دا بەگەورەی خوداکانیان داناوە.

**شَزَبَ الحيوانُ شَزِباً**: حەیوانەکە کزو لاواز بوو.

**شَزَبَ المكانُ**: شوێنەکە ڕەقەن و کڕێن بوو ◊ (فهو شازب) ◊ **شزَّبَ الحيوانَ**: حەیوانەکەی کزو لاواز کرد ◊ ژێر باری کرد ◊ **الشَّزيبُ**: پەلەدار پێش ئەوەی راستەو پاستە کرابێ.

**شَزَرَ الحَبْلَ شَزْراً**: حەبلەکەی بادا.

**شَزَرَ فلاناً واليه**: بەتیلەی چاو سەیری کرد، بەمزۆری لەکاتی رق هەڵسان و تورەبوون دا روودەدا.

**شَزَرَ بالسِّنان**: زەبری لێ دا لەراست و چەپ، بەسەرە رەب هەلا هەلای کرد ◊ **تَشازَروا**: بەتیلەی چاو سەیری یەکتریان کرد، خێسەیان لەیەکتر کرد.

**إستَشْزَرَ الحبلُ**: حەبلەکە گشت بوو زۆری باخوارد ◊ امرؤ القيس دەڵێ: (غدائرها مستشزرات الى العلا) ◊ **استَشْزَرَ الحَبْلَ**: حەبلەکەی زۆر بادا ◊ گشتی کرد ◊ **الشَّزْرُ**: سەرکردنی دڕدۆمیی و ئەویستی، تەماشاکردن و خێسە لێ کردن، بەچاوی تەماشاکردن.

**شَزِنَ شَزَناً**: نیشاتی پەیداکرد، بەردەوام بوو لەسەر ئیش و کار ◊ ماندو بوو لەئیش کردن ◊ **تَشَزَّنَت الأرضُ**: دەمارە رەق و بەردەمزڕوێنی زەوییەکە درێژ بووە ◊ **تشزَّنَ الشيئُ**: شتەکە پتەو بوو ◊ **تشزَّن الأمر عليه**: کارەکەی لێ قورس بوو، بۆی ئەنجام نادرێ ◊ **تَشَزَّن للأمر**: خۆی بۆکارەکە ئامادە کرد ◊ **تَشَزَّنَ قِرْنَه**: هاوشانەکەی خۆی بۆڕدا، بەسەری دا زاڵ بوو ◊ **تَشَزَّنَ الشاةَ**: مەڕەکەی خستە سەر زەوی بۆئەوەی سەری ببڕێ ◊ **الشَّزَن**: پارچە زەوی

ڕەق، دەماری پتەو توند ڕەوشت، تورەو تڕۆ، سەر ڕەق ٥ الشَّزَن من الشيئ: تەنیشتو ئەملاو ئەولای شت، دەورو بەری شت ٥ دووریی ٥ الشُّزُن: ناوچە ٥ لای شت ٥ نزیك شت.

**شَسَعَ الشيئُ شُسُوعاً**: شتەکە دوور کەوتەوە، دوور بوو، دەگوترێ: (شَسَعَ فلان عن بلده ووطنه): فلانکەس لەخاك و وڵاتی دوور کەوتەوە.

**شَسَعَ بفلان**: فلانکەسی دوورخستەوە.

**شَسَعَ النعلَ**: تیلمە چەرمی بۆ نەعلەکە دانا بۆ ئەوەی قامکی قاچی تێ بکا لەرۆیشتن دا نەعلەکە بەقاچییەوە هەڵبسێ ٥ شَسِعت النعلُ: نەعلەکە تیلمە چەرمەکەی پچڕا، ئەو تیلمە چەرمەی قامکی قاچی تێ دەکا پچڕا ٥ أشسَعَ النعلَ: تیلمە چەرمی بۆنەعلەکە دروست کرد ٥ أشسَعَ الشيئَ: شتەکەی دوور خستەوە.

**شَسَّعَ النعلَ**: تیلمە چەرمی بۆ نەعلەکە دروست کرد واتە دەق بەمانا (شَسَعَ النعلَ)ی ٥ الشِّسْعُ: تیلمە چەرمێکە بەدیوی سەرەوەی نەعلەوە چەسپ دەکرێ‌و شوێنی پەنجەی قاچی لێ دروست دەکرێ بۆئەوەی پەنجە گەورەی قاچی تێ بکرێ‌و لەرۆیشتن دا نەعلەکە بەقاچەوە هەڵسێ ٥ الشِّسْعُ: قەراخی شوێن، ئەمبەرەو بەری شوێن، دەگوترێ: (نزلوا بِشِسْعِ الوادي): لەلایەکی شیوەکە دابەزین ٥ (نزلوا بِشِسْعِ الصحراء): لەم سەرەو سەری سارایەکە هەڵیان داو نیشتە جێ بوون.

**الشِّسْعُ من الأرض**: شوێنی تەنگەبەری زەوی.

**شِسْعُ المال**: باقی ماندەی ماڵ، بەرماوە، دەگوترێ: (له شِسْعُ مال): پیاوێکی ماڵ خۆشەویستەو باش سەرو کاریی دەکا ٥ الشَّسَفُ: نانی وشك، کولێرەی ڕەق هەڵاتوو ٥ الشَّسِيفُ: خورمای نەگەیشتوی شەقار بوو ٥ گۆشتێك تەڕایی پێوە نەمێنێ‌و خەریك بێ وشك بێتەوە ٥ الشَّشَمُ: شتێکە دەهاڕدرێ‌و زۆر ورد دەکرێ بۆ دەرمانی چاو بەکار دەهێندرێ یان بۆ بەهێزکردنی بینایی چاو وەکوو کل لەچاو رادەدرێ.

**شَصَبَ العيشُ**: ژیان‌و گوزەران ناخۆش بوو، کەم‌و کوڕی تێکەوت ٥ (فهو شاصِبٌ).

**شَصِبَ المكانُ شَصَباً**: شوێنەکە بێ بەروبووم بوو.

**شَصِبَ الأمرُ**: کارەکە قورس بوو ناستەنگی هاتە پێش ٥ الشُّصْبُ: کەم‌و کوڕی‌و گرانی‌و ژیانی کوللە مەرگی ٥ الشَّصِيبةُ: بەمانا (الشُّصْبُ)ی.

**شَصَرَ الثورُ**: کەڵەگا کێوییەکە بەشاخەکانی شەڕە قۆچی کرد.

**شَصَرَ فلاناً بالرمح**: بەڕمب لەفلانکەسی دا ٥ شَصَرَت الشوكةُ فلاناً: چقڵەکە لەفلانکەس ڕاچوو.

**شَصَرَ الثوبَ**: قوماشەکەی بەتەقەڵی گەورە گەورە دروو ٥ تەقەڵەکانی لێك دوور بون ٥ الشَّاصِرُ من الظباء: ناسکێك بێ بگاو هێزو توانای بازدان‌و ڕاکردن پەیدا بکا، یان بگاتە ئەو ناستەی شەڕە قۆچ بکا ٥ الشَّاصِرة: مێینەی (الشاصر) ٥ داوێکە درەندەی پێ کەمەند دەکرێ ٥ الشِّصَار: تەختەدارێکە دەکرێتە لوتی حوشترەوە بۆئەوەی جڵەو خۆش بێ ٥ الشَّصَرُ من الظباء: بەمانا (الشاصر) دێ.

**شَصَّ فلان شَصّاً**: فلانکەس بەتوندی دەستی بەسەر شتەکەدا گرت ٥ ددانی خۆی لێ جیڕکردون‌و بەری نادا ٥ شَصَّت الناقةُ ونحوها: حوشترەکە شیری وشکی کرد یان شیری کەم بوو ٥ شَصَّت السنةُ: ساڵەکە بێ بارانی‌و گرانی‌و

قـاتو قـڕی بـوو ◊ شـصَّت المعيـشةُ: ژيـانو گوزەران ناخۆش بوو.

**شَـصَّ** فلانـاً عـن الـشيئ: فلانكەسـی لـە شتەكە دورخـستەوە لـێی مـەنع كـرد ◊ **أشَـصَّهُ** عـن الشيئ: بـەمانا (شَـصَّهُ)دێ ◊ **الشِّصّ**: ناسنێـكی سەر قولاپە ماسی پێ دەگیرێ ◊ **الشَّـصُوصُ** مـن النـوق: حوشـترى كـەم شيرە ◊ (الـشصوص مـن الـسنين): سالَی بێ بارانیو قاتو قڕییە.

**شصا** السَّحابُ شَصُواً: هەورەكە بەرز بۆوە ◊ **شصت** القِرية: كوندەكە پڕبوو لەناو هەنگڵەكانی بـەرز بوونەوە.

**شصا** بَصَرُهُ: چاوی بـەملۆق وەستا ◊ شـصت عينُـه: چـاوی تيـل ڕوان بـوو، خێـل بـوو، روی لەشوێنێكەو چاوی لەشوێنێكی تر.

**شـصا** الميـتُ شُـصُواً وشُـصِيّاً: مردوەكـە هاوسا ◊ دەستو قاچی بـەرز بوونـەوە ◊ **أشْصی بَصَرَهُ**: چاوی بەرز كردەوە ◊ **الشَّصْوُ**: جورتەمو ناخۆشی ◊ سيواك.

**شَطَأَ** الزَّرعُ شطئاً وشـطوءاً: كشتوكاڵەكە چـروزەی كرد درەختەكە چرۆی كرد ◊ **شطئت الأمُ بالولد**: دايكەكە منداڵی بوو.

**شَطَأَ** الزَّرْعُ: بەمانا (شَطَأَ)دێ، دەشگوترێ: (أشطَأت الـشجرةُ بغـصونها): درەختەكـە چـرۆی كـرد ◊ (أشـطأ الـوادي): دۆڵەكـە لافـاوی لـێ هەڵسا ◊ شـاطَأتُهُ: مـن لەمبـەر روبـارو ئـەو بەوبـەر روبـارەوە ڕۆيـشتين ◊ شـاطِئ النهـر والـوادي: قـەراخ چـۆم كـەناری شـيو ◊ الـشَطْءُ: ئـەمامی درەخـت ◊ چـرۆی درەخـت ◊ گـەڵای درەخـت لەسەرەتای دەركەوتنی دا.

**شَطْءُ** النهر والوادي: كەناری روبارو شيوو دۆڵ.

**شَطَبَ** عنه شَطْباً: لێی لا دا.

**شطب** الأديمَ: چەرمەكەی هەڵدڕی.

**شَـطَبَ** الكاتِـب الكلمـةَ: نووسـەرەكە وشـەكەی كوژاندەوە.

**شَـطَّبَ** القاضـي الـدعوی: قـازی داواكـەی چـەرت كـردو لەليـستی داواكـان دەری هێنـا لەبـەر هۆكارێـكی ياسايی ◊ **شَطَّبَ**: زێـدەڕۆيی لـەمانای (شَطَبَ)دەگەيەنێ، دەشگوترێ: (شَطَّبَ العمـلَ): كارەكـەی كۆتـايی پـێ هێنـا ◊ **شَـطَّبَ اللحـمَ**: گۆشتەكەی توێ توێ كرد، قەڵاشتييەوە ◊ **شَطَّبَ السيفُ جسمه**: شمشێرەكە شوێنكەی لەجەستەدا جێ هێشت ◊ **إنْشَطَبَ المـاءُ**: ئاوەكە ڕەوان بـوو ◊ **الشَّاطِب**: (طريق شاطب): ڕێـگای خـوارو پێـچاو پێچ ◊ (مكـان شـاطب): شـوێنی دوور ◊ (رميـة شاطبة): هاويشتنێـك ئامـانج نەپێـكێ، لەدەورو بەری نيشانەكە بدا ◊ **الـشُّطْبُ**: (شُطْبُ الـسيف): ئـەو خـەتو هێڵانـەن كـەوەكوو جەوهـەر لەشمشێرەكەدا دەبيندرێن ◊ تاكەكـەی (شُطْبَةٌ) ◊ **الـشُّطْبُ**: درێـژی ڕەوشـت جـوان ◊ لـەزاراوەی ژمێريـاریو دەفتـەر داران دا بريتييـە لـە ديـاريكردنو تۆمـاركردنی مەسـروفات لەدەفتـەری تايبـەتی داو داگرتنـی لـە بودجـەی بەسـەندكراو دا ◊ **الـشُّطْبَةُ مـن الـشَّيْئ**: پارچـەيەكە لەشـت بەدرێـژايی بـبڕدرێ وەكـوو تلیشە دار، تيتۆڵـە قومـاش ◊ هێڵێـكە بەسـەر نوسراوە هەڵەكەدا دەهێندرێ، وادەبێ دو هێڵی ڕاستو چەپ بەكاردەهێنـدرێن ◊ **الشَّطِيبَةُ**: ئـەو پارچـە تيلمـە چـەرمەيە بەدرێـژی دەبـڕدرێ ◊ يان هەرشتێكی لەوجۆرە.

**شَـطَحَ** في الـسير أو في القـول: زۆر دوور كەوتـەوە، زۆری گوت.

**الشَطْحَةَ**: قسەو کردەوەی ناقۆڵا

**شَطَرَ** الرجلُ على قومه شطوراً وشطارة: پیاوەکە بەشەڕو ناخۆشی قەومەکەی خۆی ناڕەحەت کرد.

**شَطَرَ** عن القوم: لەخەڵکەکە جیابووە بەڕق هەڵستاوی.

**شَطَرَ** الشيءَ شطراً: شتەکەی لەت کرد، دابەشی کرد، کردی بەدوو بەش.

**شَطَرَ** الحلوبة: گوانێکی ئاژەڵە شیردەرەکەی دۆشی و گوانەکەی تری نەدۆشی ٥ **شاطَرَهُ الشيءَ**: شتەکەی کرد بەنیوە ٥ **شَطَّرَ الشِعْرَ**: بۆ هەر نیوە دێڕە شیعرێك نیو دێر شیعری خۆی خستە سەر جامە شیعرەکە ٥ **الشاطِرُ**: بەدخوو دڵ پیس و خراپەکار ٥ بەلای صوفییەکانەوە کەسێك دەست پێشخەربێ و بۆلای خودا پەلەبکا ٥ زیرەك و لێهاتوو دەست ڕەنگین ٥ **الشَطْرُ**: نیوەی شت، بەبەشێکیشی دەگوترێ ٥ ناحیەو لای شت.

**شَطَّرَ** البيت من الشعر: نیوە دێڕی شیعرەکە ٥ **الشُطُورُ**: دەگوترێ: (ثوب شطور): قوماشەکە لایەکی پانیەکەی لەلاکەی تری زیاترە ٥ **الشَطِيرُ**: دوور، دەگوترێ: (منزل شطير وبلد شطير): مەنزڵگایەکی دوور ولاتێکی دوور ٥ غەریب و عەنتیکە ٥ **شطيا الشيء**: نیوەی شت ٥ **الشَطِيرة**: نانێکە دوو توێ دەکرێ و پێخۆری تێدەکرێ وەکوو شلکێنە، کەلانە، کوبەشامی ٥ **المشطور من الخبز**: بەمانا (الشطيرة)دێ ٥ پاسایەکی شیعرییە نیوەی شیعرەکە لەجۆری (السريع) یان (الرجز)بێ لەهەموو شیعرەکەدا ڕەچاوی یەك سەرەوا دەکرێ ٥ **الشَطْرَنج**: یارییەکە لەسەر پارچە تەختەیەك (کە شەصت و چوار چوارگۆشەی تێدایە) ئەنجام دەدرێ، لاسایی دوو دەوڵەتی بەشەڕهاتوو لەگەڵ یەکتردا دەکرێتەوە، سی و دوو پارچەی تێدا بەکاردەهێندرێ کە نمونەی دوو مەلیك و دوو وەزیرو ئەسپ سوارو قەڵاو فیل و سەربازەکانن، لەبنەڕەت دا یارییەکە هیندییە.

**شَطَّ** شُطُوطاً وشَطَطاً: دوور کەوتەوە، دەگوترێ: (شطت الدار): ماڵەکەی دوور بوو ٥ (شَطَّ في الأمر): زۆر لەکارەکە ورد بووەوە گەلێکی لەمدیو ئەو دیوکرد زیاد لە پێویست لێی کۆڵیەوە، دەگوترێ: (شَطَّ في المساومة): لەمامەڵەو دان و سان دا زۆری هێناو برد ٥ (شَطَّ عليه في حكمه): لەبڕیارەکەی دا ستەمی لێ کرد ٥ **أشَطَّ**: دوور کەوتەوە، دەگوترێ: (أشطَّ في الصحراء): لەسارادا زۆر دوور کەوتەوە ٥ (أشطَّ في الطلب): زۆری لەداواکە کۆڵیەوە یان زۆری داوا کرد ٥ (أشطَّ في حكمه): ستەمی لەبڕیارەکە دا کرد ٥ **شاطَّهُ**: لەستەم و زیان پێ گەیاندن دا بەسەری دا باڵا دەست بوو.

**شَطَّطَ**: زێدە ڕۆیی کرد لەدوور کەوتنەوەدا ٥ **إشتَطَّ**: دوور کەوتەوە ٥ (إشتَطَّ في حكمه): لەبڕیارەکەی دا ستەمی کرد ٥ **الشِطاطُ**: دووریی ٥ درێژی و هەندام ڕێك و پێکی.

**الشَطُّ**: کەناری ڕووبار.

**شَطَفَ** عن الشيء: وازی لەشتەکە هێنا لێی دوورکەوتەوە.

**شَطَفَ** الثوبَ: قوماشەکەی شت ٥ **الشُطُوف**: دەگوترێ (نية شطوف): نیازێکی دوورە ٥ **الشُطْفَةُ**: پارچە ٥ **المَشطُوفُ**: لەبواری ماتماتیك دا بریتییە لەوەی قەبارەیەك دووکەرت بکرێ بەئەندازەیەك بنکەکەی بەرامبەر یەکێك

لەقاعیدەکانی نەبێ واتە فەیزەن بێ ٥ **شَطَنَت الدارُ شُطوناً**: خانوەکە دوورکەوتەوە، دەگوترێ: (شَطَن عنه): لێی دوورکەوتەوە ٥ (شَطَنَ صاحِبَهُ شطناً): بەپێچەوانەی مەبەستی هاوەڵەکەیەوە جولایەوە.

**شَطَنَ** الدّابَةَ: وڵاخەکەی بەپەتێ درێژ بەستەوە، یان وڵاخەکەی بەحەبلی درێژ شەتەك دا ٥ **شَيْطَنَ**: وەکوو شەیتانی لێ هات، یان کرداری شەیتانی کرد ٥ **تَشَيْطَنَ**: بەمانا (شَيْطَنَ)دێ ٥ **أشْطَنَهُ**: دووری خستەوە ٥ **الشَّطَنُ**: حەبلی درێژ کە لەبیر ئاوی پێ هەڵدەهێنجندرێ، یان وڵاخی پێ شەتەك دەدرێ ٥ **الشّطون** (بئر شطون): بیری قوڵ ٥ (سِفَر شَطون): سەفەرێکی دورو نیازو مەبەست دوورە ٥ (رمح شَطون): رمبی درێژو خوار ٥ (حَرب شَطون): شەڕی ترسناکو خوێناویو ناخۆش ٥ **الشيطان**: گیانی شەڕو نەگبەتو گومراکەر ٥ هەرکەسێك بێ فەرمانی خودا بکاو فەساد بلاوبکاتەوە ٥ ماری ژەهراوی پیسو زێنەخرۆ ٥ بۆ ناشیرین کردنی شت دەگوترێ: (كأنه وجه شيطان): روخساری دەڵێی روخساری شەیتانە، یان دەگوترێ: (رأسه رأس شيطان): سەری دەڵێی سەرە شەیتانە ٥ هەروا دەگوترێ: (ركبه شيطانهُ): شەیتان سواری شانی بوو ٥ شەیتان چووە کەللەیەوە ٥ (نزع عنه شيطانه): شەیتانەکەی لەکەللەی دابەزی یان لەکەللەی شەیتان هاتە خوار رێبازی ئاشتیو بارقوڵیو هێمنی رەچاو کرد ٥ **شيطان الفلاة**: تینوایەتی ٥ **شيطان الشاعر**: جندۆکەی شاعیر ٥ لەسەردەمی نەزانی دا بروایان وابوو هەموو شاعیرێك جندۆکەی هەیەو فێری شیعری دەکا.

**شَظُفَ** الشجَرُ: درەختەکە بەهۆی کەم ئاودانیەوە وشك بوو.

**شَظُفَ** العيشُ: ژیانی ناخۆشو پرکەمو کوڕی بوو.

**شَظُفَ الخلق**: رەوشتی ناشیرین بوو ٥ (فهو شظيف) ٥ **الشَّظَفُ**: نانە سوتاو ٥ پارچە دارێکی بچوك وەکوو سنگ ٥ **الشَّظَفُ**: چورتەو ناخۆشی ٥ پڵ هەڵدانی گۆشت لەبنکی نینۆکو ئەملاو ئەولای.

**شَظِيَ** العودَ وغيرهُ شَظىً: عودەکە قلیشاو دوو کەرت بوو.

**شَظِيَ** القومُ: خەڵکەکە بلاومیان لێ کرد.

**شَظِيَ** الفرسُ: ئێسقانی خوار ئەژنۆی ئەسپەکە ئەخۆش کەوت ٥ **أشْظاهُ**: پریشکی ئەو شتەی رێ کەوت ٥ پارچەی ئەوی لێ درا ٥ **شَظّيَ الشيءَ**: شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ **شَظّيَ القومَ**: خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد ٥ **تَشَظّى العودُ**: عودەکە کەرت کەرت بوو، دەگوترێ: (تشَظّى الصَّدَفُ عن اللؤلؤ): توێکلی مرواریەکە قەڵشیو دەنکە مرواریەکە دەرکەوت ٥ **تَشَظّي القومَ**: خەڵکەکە بلاومیان لێ کرد ٥ **الشَّظى**: ئێسقانێکە بەئەژنۆی ئەسپەوە لکاوە ٥ دەستو پێوەندی هۆزو خێڵ لەبنەچەو نەژادا لەوان نینو بەغەوارە حسێب دەکرێن ٥ **الشَّظِيَة**: ئێسقانی بچوك کەبەدەو ئێسقانی ئاوزەنگی قاچەوەیە ٥ پارچەو پریشك کەلەقەبارەی رەقەوە بپەڕن ٥ بەزۆری بۆپارچەی تەقەمەنیو گوللەتۆپو شتی وا بەکاردەهێندرێ.

**شَعَبَ** الشيءَ شَعْباً: شتەکە لێك بۆودو پارچە پارچە بوو ٥ تەقییەوە.

**شَعَبَ** اليه: ئارزوی کردو حەزی لێ بوو.

**شَعَبَ** عنه: لێی دوور کەوتەوە.

**شَعَبَ الشيئَ:** شتەکەی پارچە پارچەکرد ٥ وادەبێ بۆمانای پێچەوانەی لێک بوونەوەو تەقینەوە بەکاردەهێندرێ، دەگوترێ: (شَعَبَ الصَّدْعَ): شتە تەقیوو درزبردوەکەی پێکەوە نووساندەوە.

**شَعَبَ الرجلُ:** پیاوەکە ناوشانی پان بوو.

**شَعِبَ الظبْيُ:** ئاسکەکە نێوان شاخەکانی پان بوون ٥ **أشعبَ الشيئَ:** قەڵشاوی شتەکەی چاك کردەوە ٥ **شَعَّبَ الزرعُ:** کشتو کاڵەکە پەڵەپەڵە بوو دێراو دێراو بوو ٥ **شَعَّبَ الأمرَ:** کارەکەی بەشبەش کرد ٥ **شَعَّبَ الإناءَ وغيره:** درزی زەرفو مەنجەڵو قاپەکەی چاك کردەوە ٥ **إنْشَعَبَ:** بڵاوو پەرتەوازە بوو، دەگوترێ: (إنشَعَبَتْ أغصان الشجرة): پەلو لقی درەختەکە بڵاو بوونەوە ٥ **إنشَعَبَ النهرُ:** روبارەکە بەشبەش بوو ٥ (إنشَعَبَ الطريق): رێگاکە دابەش بوو، رێ رێ بوو، بوو بە دوو رێیانو سێ رێیان ٥ **إنْشَعَبَ عنه:** دورکەوتەوە لێی، دەگوترێ: (إنشَعَبَ القولُ بصاحبه): قسەکە سەرنجی کابرای خاوەنی لەمانایەکەوە بۆ مانایەکی تر برد ٥ **تَشَعَّبَ:** پارچە پارچە بوو، بوو بە چەند بەش ٥ **تَشَعَّبَ الزَرْعُ وغيره:** کشتو کاڵەکە پەڵەپەڵە بوو ٥ **أشْعَبُ:** پیاوێکی ئازادکراوی حەزرەتی عوسمان بوو لەمەدینە، زۆر چاو چنۆكو بەتەماع بوو بۆ تە نمونەی تەماعکاریو لەپەندا دەگوترێ: (أطْمَعُ من أشعب): فلان لە ئەشعەب بەتەماع ترە، یان دەگوترێ: (طمع أشْعَبِيٌّ) ٥ **الشَّعْبُ:** نەتەوە، کۆمەڵی زۆر کەلەنەژادا بچنەوە سەرباوکێكو لەهۆزو خێڵ بەرفراوانترە، یان کۆمەڵێك ئادەمیزادی زۆرنو پەیڕەوی یەك یاساو رێسای تایبەتی دەکەن ٥ یان کۆمەڵێك ئادەمیزادی زۆر بەیەك زمان ئاخاوتن بکەن ٥ **الشِّعْبُ:** شیوو دۆڵ، نزمایی نێوان دوو کێو ٥ رێگا ٥ رێڕەوی ئاو لەژێر زەوی ٥ **شَعْبَانُ:** مانگی هەشتی ساڵی قەمەریی ٥ **الشُّعْبَةُ:** کۆمەڵەشت ٥ پارچە کە قاپو قۆریو شتی شکاوی لەوجۆرەی پێ چاك دەکرێ ٥ لقی درەخت ٥ **الشُّعَبُ:** پەنجەکانی دەستو قاچ ، یان پەلو نوکی ئامێری وەکوو سێلكو شەنەو شەو فلچەو شتی وا، دەگوترێ: (شُعَبُ السَّفود): شتێکە وەکوو مقاش دووسێ نووکی بەسەرەوەیە، لەکاتی گۆشت سورکردنەوەدا گۆشتەکەی پێ تێك هەڵدەدرێو ونجڕ ونجڕ دەکرێ ٥ (شُعَبَ الدهر): بارو دۆخەکانی رۆژگارو گۆڕانکارییەکانی ٥ (شُعَب الصدر): بۆریەکانی هەناسە لەناو سییەکان دا ٥ (النزلة الشُّعَبِيَّةُ): هەوکردنی پەردەی رێڕەوەکانی هەناسە ٥ **شَعُوبُ:** ناوێکە لەناوەکانی مردن، دەگوترێ: (شَعَبَتْهُ الشَّعوب): مردن تەفرو تونای کرد ٥ **الشُّعُوبِيةُ:** نەزعەو بیرو باوەڕێکی دەمارگیری نەتەوە پەرستییە لەسەردەمی عەباسییەکان دا پەرەی سەند دژی رێزلێنانو پاساو دانەوەی رەگەزی عەرەبە بەسەر نەتەوەکانی تردا ٥ هەروا ناوە بۆ هەڵگرانی ئەو بیرو باوەڕە ٥ تاکەکەی (شعوبي)یە ٥ **الشُّعَيْبَةُ:** لەبواری پزیشکی دا رێڕەوێکی هەواییە لەناو سییەکان دا ٥ هەروا ناوی شوێنێکە لەباشوری عێراق نزیك بەصرە، لەسەرەتای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ داگیرکردنی عێراق ١٩١٥م شەڕێکی بەناو بانگی تێدا کراوە شێخ مەحموودی حەفید بەلەشکرێکی پێکهاتوو لەجەنگاوەرانی کورد هاوبەشی ئەو شەڕەی کردوە ٥ **المِشْعَبُ:** ئامێرێکی کونکردنە بەکاردەهێندرێ بۆ چاککردنەوەی قاپو قاچاخ

٥ شَعْبَذَ شَعْبَذَةً: كاراما بوو لەفرتو فێڵو چاو بەستەکی دا توانایەکی تایبەتی هەبوو بۆ شاردنەوەی راستییەکانو دەرخستنی شتە بەتاڵو پوچەکان لەقاوغی راستییەکان دا بەپشت بەستن بەچاو بەستەکی.

شَعِثَ الشَّعْرُ شَعَثاً: قژی ژاکاو ئاڵۆزاو گری گری بوو، دەگوترێ: (شَعِثَ فلان و شَعِثَ رأسُهُ وبدنه): فلانکەس چڵکنو پڵکن بوو ٥ (فهو أشْعَثُ وهي شعثاء).

شَعَثَ الأمْرُ: کارەکە بڵاو بۆوە، پارچە پارچە بوو ٥ شَعَّثَ من الشيئ: شتێکی کەمی لەشتەکە هەڵگرت ٥ شَعَّثَ من فلان: بەچاوی سوکو بێ نرخ سەیری فلانی کرد ٥ شَعَّثَ الشَّاعِرُ: شاعیرەکە لەشیعرەکانی دا شێوەی (تەشعیث)ی عەروزی بەکارهێنا واتە لەجیاتی تەفعیلە (فاعلاتن) لەبەحری (المجتث)دا، تەفعیلەی (مفعولن)ی بەکارهێنا ٥ تَشَعَّثَ: لێک بڵاو بوو، دەگوترێ: (تَشَعَّثَ رأس الوتد): سەری سنگەکە پرژ پرژ بوو، قەڵشیو پارچە پارچە بوو.

تَشَعَّثَ رأس المسواك: سەری دارسیواکەکە پرژ پرژ بوو ٥ تَشَعَّثَ الشَّعْرُ: قژەکە ئاڵۆزکان، چڵکن بوو ٥ تَشَعَّثَ القومُ: خەڵکەکە بڵاو بوونەوەو پارچە پارچە بوون ٥ الأشْعَثُ: سنگ ٥ سیواک ٥ الشَّعَثُ: کاروباری بڵاوو هەمەچەشنو جۆراو جۆر، دەگوترێ: (لَمَّ اللهُ شَعَثَهُ): خودا ئیشو کارەکانی بۆ کۆکردنەوەو بەکالا بوونەوە ٥ التَّشْعيثُ: لەبواری عوروزدا ئەوەیە تەفعیلەی (فاعلاتن) لەسەرەوای بەحری خەفیفی موجتەث دا ببێتە (مفعولن) ٥ شَعْوَذَ شَعْوَذَةً: بەمانا (شَعْبَذَ)دێ ٥ (فهو مُشَعْوِذ) ٥ المُشَعْوَذ: ئەوکەسەی چاو بەستەکی لێ کرابێ.

شَعَرَ فلان: فلانکەس شیعری گوت.

شَعَرَ له: شیعری بۆ گوت.

شَعَرَ به شعوراً: هەستی پێکردو پێی زانی.

شَعَرَ فلاناً: لەشیعردا زاڵ بوو بەسەریدا، بۆری دا.

شَعَرَ الشيئَ شَعْراً: کوڵکو موی کردە ناوکەفی شتەکە، دەگوترێ: (شَعَرَ الخُفَّ): موی کردە ناواخنو ناوکەفی خوفەکە.

شَعِرَ شَعَراً: موی زۆرو درێژ بوون ٥ (فهو أشعر وهي شعراء).

شَعُرَ فلان شِعْراً: فلانکەس مەلەکەی شیعری لەلاپەیدا بوو، شیعری جوانو نایابی گوتن ٥ أشْعَرَ الغلام والجارية: کورو کچەکە لەکاتی پێگەیشتنو بالق بوون دا موویان لەسەر جەستە پەیدا بوو ٥ أشْعَرَ القومُ: خەڵکەکە دروشمێکیان بۆ خۆیان دانا ٥ أشْعَرَ الشيئُ الشيئَ: شتەکە بەشتەکەوە نووسا، یان تێکەڵاوی بوو ٥ أشْعَرَ الأمر: شتەکەی بڵاو کردەوە ٥ أشْعَرَ فلاناً: پۆشاکو شیعاری تایبەتی لەبەر فلانکەس کرد ٥ أشْعَرَ فلاناً الأمْرَ وبالأمر: کارەکەی بەفلان زانان ٥ شاعَرَهُ: شەرە شیعریان کرد، لەشیعر گوتن دا پێشبڕکێیان کرد، بەشیعر بەرهەڵستی شیعری ئەوی تری دایەوە٥ شَعَّرَ الشيئ: بەکوڵکو مو ناواخنی کرد ٥ تَشاعَرَ: لافی شاعیرێتی لێ دا، خۆی بەشاعیر دانا ٥ اسْتَشْعَرَ القوم: لەشەڕا خەڵکەکە بەدروشمی خۆیان بانگی یەکتریان کرد ٥ بەنهێنی تایبەتی خۆیان یەکتریان ئاگادارکرد ٥ اسْتَشْعَرَ الثوبَ: قوماشەکەی وەکوو دروشم لەبەر کرد.

اسْتَشْعَرَ الخوف: هەستی بەترس کرد ٥ الأشْعَرُ: گۆشتی ژێر نینۆک ٥ (هو أشْعَرُ الرقبة): ئازاو

بەجەرگـە (کینایـە لەشـێر، دەشـوبهێندرێ بەشێر باملی توکیشی پێومنـەبێ) ٥ الأشـعرية: تاقمێـکن لەعولـەمای کـەلام شـوێن ڕێبـازی ئەبولحەسەنی ئەشعەری کەوتوون لەزۆر شت دا بـیرو باوەڕیـان پێـچەوانەی موعتەزیلەکانـە ٥ الـشَّاعِرُ: شـاعیر، هەسـتیار، شـیعروێژ٥ (شـعر شـاعر): شـیعری چـاکو پەسـەند ٥ الـشَّعَار: درەختی تێکهاڵاو، درەختی چڕو پڕ ٥ شوێنی پـڕ دارو درەخـت ٥ الـشِّعَارُ: ژێرکـراس؛ ئـەو پارچە کراس‌و دەرپێیەی دەکەونە سەر گۆشت ٥ ئارمو دروشمی تایبـەتی کۆمەڵێـك، پارتێـك، دەوڵەتێك ٥ وشەو رستەو نهێنییەکە کۆمەڵێك لەسەفەردا یان لەشەڕدا بۆ یـەکتر ناسینـەوەی خۆیـان بـەکاری دەهێـنن ٥ الـشَّعْرُ: گەنـدە مـو؛ مـوی زیـادە کەلەسـەر جەسـتەی ئـادەمیزادو گیانلەبـەری تـردا دەردەکـەون ٥ گەنـدە گیـا ٥ الشِّعْرُ: کەلامێـکی کێشراوو هاوکێشەو خـاوەن سـەرەواو سـۆزو خـەیاڵی لـەخۆگرتووەو بەمەبەسـتەوە بگـوترێ ٥ لـەزارەوەی مەنتیقیەکان دا قسەو ئاخاوتنێـکە پێـکهاتووە لەشتی خەیاڵی‌و مەبەست لـێی حەز لێ کردنە یان قێز لـێ کردنە وەکوو دەڵێ: (الخمـر ياقوتـة سيالة): مەی دوڕو یاقوتێکی شلە ٥ (العَسَلُ قيئ النحل): هەنگوین ڕشوی هەنگە ٥ الشِّعْرُ المنثور: پەخـشانە شـیعر؛ کەلامێـکی بـەلیغ‌و سـەجع ئامێزە بەشێوەی شیعر خەیاڵ‌و سۆزی تێدایـەو بێ کێشی عوروزییـە ٥ الـشِّعْرَى: ئەسـتێرەیەکی روناکی زۆر گەورەیە لەکاتی گەرمەی هـاوین دا دەردەکەوێ ٥ الشَّعْرَاءُ: فەروە ٥ زەوی یان باخی درەختاوی کەدرەختی زۆر بـێ ٥ (داهية شَعراءُ): بـەڵای قـورس‌و سـامناك ٥ الـشُّعْرانِي: تـوکنی، توك درێـژ ٥ الشَّعْرَةُ: تاڵـە مـوو ٥ لـەبواری چاو

نێـشەدا بریتییـە لەهەڵـگەڕانەوەی بـرژانگ بـۆلای گلێنـە ٥ الـشُّعْرور: شـاعیرۆکە؛ کەسێـك هەسـتی شـیعری بـەهێز نـەبێ ٥ الـشَّعْرِية: شەعرییە؛ جۆرە خواردنێـکە لەهـەویری گـەنم دروست دەکرێ وشك دەکرێتەوە دەکوڵێندرێ.

الـشُّعُورُ: هەسـت، دەرك پێـکردن بـەبێ بەڵـگە ٥ لەکاتی زەم‌و رەخنەدا دەگوترێ: (فلان لايشعر) ٥ لەزاراوەی زانایانی دەروونناسـیدا بـەو زانینـە دەگوترێ کەلەنەفسی بەرامبـەردا هەسـتی پـێ دەکـرێ یـان لـە بـارو دۆخ‌و دەورو بـەردا پێـی دەزانـدرێ، یـان ئـەو دەرك کـردن‌و شـتە ویژدانیانەیـە کەعـەقڵ کۆیـان دەکاتـەوە ٥ الشَّعِيرُ: جۆ؛ زەوادو بـژێوە لـەخوار گەنمەوەیە بۆ بـەهێزی ٥ لەپەنـددا هـاتووە دەڵێ: (فـلان كالشعير يؤكل ويذم): فلانکەس وەکوو جۆ وایـە دەشـخورێ‌و زەمیـشی دەکـرێ ٥ الـشَّعِيرة: ئەوشتەی شـەرع‌و ئـایین بەپەسـەندی بـزانن‌و فـەرمانی بەئەنجامـدانیان کردبـێ ٥ قوربـانی‌و هـەدی بـۆ مـاڵی خـودا ٥ نیـشانەو دروشـم ٥ المشاعر: (مشاعر الحج): ئەنجامـدانی کاروبـاری حەج ٥ المَشْعَرُ: درەختی تێك چڕژاوو پڕگەڵاو لق‌و پۆپ ٥ هەست ٥ شوێنی ئەنجامـدانی حـەج ٥ المـشعر الحـرام: موزدەلیفـە ٥ شَعْـشَعَ الـضوءُ: روناکییەکە کەمێك بلاوبۆوە.

شَعْشَعَ الـشراب رغـو: ئـاوی تێـکەڵاوی شـەرابەکە کرد ٥ شَعْشَعَ الزبَدَ: رۆن‌و چـەوری زۆری کـردە ناو تێکوشاوییەکە ٥ تَشَعْشَعَ الضوء: روناکییەکە بلاو بۆوە ٥ تَشَعْشَعَ الشهرُ: زوربەی زۆری مانگ تێپەڕی ٥ الشَّعْشاعُ: بلاوە بوو، دەگوترێ: (ظـل شعـشاع): سێبەرێـکە لەهەنـدێ کـون‌و کەلەبەریەوە روناکی‌و تیشکی خۆر دێتە ناوەوە

٥ قسه خۆش‌و نیکته بازو دەم‌و لەفظ شیرین ٥ **الشَّعْشَعُ**: بەمانا (الشعشع)دێ.

**شَعَّ الشيئُ شعّاً**: شتەکە بڵاو بۆوە.

**شَعَّ فلان**: فلانکەس پەلەی کرد.

**شَعَّ الماءُ شعّاً**: ئاوەکەی هەڵڕشت ٥ **أشعّتِ الشمسُ**: خۆر تیشکی خۆی بڵاو کردەوە ٥ **أشعّتِ النار**: ئاگرەکە روناکایی‌و گەرمایی خۆی نارد ٥ **أشعَّ السنبلُ**: گوڵە دانەوێڵەکە پڕبوو، دەنکەکانی کامڵ بوون ٥ **أشعَّ الماءَ**: ئاوەکەی پچڕ پچڕ نارد چۆڕ چۆڕ ئاوی بۆنارد ٥ **الإشعاعُ**: بڵاو بوونەوەی روناکی‌و تیشکە لەفەزادا بە شێوەی شەپۆل شەپۆل ٥ **الأشعة الصّينية**: تیشکێکی موغنوکارەبییە لەلێک کەوتنی ئەلکترۆناتی تیژڕۆ پەیدا دەبن.

**الأشعة الكونية**: تیشکێکە لەبۆشایی دەرەوە دەگاتە زەوی زۆر کارایە بۆ چونە ناوەوەی شت‌و کونکردنی شت ٥ **الشَّعاعُ**: شتی بڵاوە بوی پرژاو، دەگوترێ: (دم شَعَاعٌ): خوێنی پرژاو، (قلب شعاع): دڵی ڕاڕاو پەرتەوازە ٥ (ذهبوا شَعَاعاً): بە پەرتەوازەیی ڕۆیشتن، دەگوترێ: (تطايرت العصا شَعَاعاً): گۆچانەکە شکاو بوو بەچەند پارچەیەکەوە ٥ (شَعَاع السنبل): پرژی گوڵەگەنم ٥ تەپ‌و تۆزو کاوکۆتی گوڵەگەنم کە وشك بۆوە ٥ **الشُّعَاعُ**: هێڵی روناکی کە لەدرزو کون‌و کەلەبەرەوە دێنە ژورەوە، وەکوو تیتۆڵ‌و داوە دەزو دێنە بەرچاو ٥ **الشُّعُ**: بەمانا (الشُّعَاع)دێ ٥ خانوی جاڵجاڵۆکە ٥ **المُشِعَّةُ**: (النظائر المُشِعَّة): ئەو شێوەو نمونانەن کەتایبەتمەندی تیشکدانەوەیان هەبێ.

**شَعَفَ الشيئَ شَعْفاً**: زۆر شتەکە کەوت.

**شَعَفَ الحُبُّ فلاناً**: دڵداری دڵی فلانکەسی داخ کردوە.

**شَعِفَ به وبحبه شَعَفاً**: خۆشی ویست، وەگری بوو، پێیەوە هەڵەو گیر بوو ٥ (شَعِفَ بالأمر): ترسا لەکارەکەو توشی شۆك بوو.٥ **الشُّعَاف**: شێتی ٥ **الشَّعَفَةُ**: لای سەروی هەرشتێك بێ، دەگوترێ: (شَعَفَةُ الجبل): دوندی کێو تۆپەڵاکی کەژ ٥ (شَعَفَةُ الرأس): تۆقە سەر ٥ پەڵە قژی سەر، کۆپلە مووی سەر ٥ خۆشەویستی لەسنور زیاد ٥ **الشُّعْفَةُ**: نمەباران؛ ئاوە بارانی کەم کە بەئاستەم روی زەوی تەڕبکا ٥ **المَشْعُوف**: دڵ سوتاوی عیشق‌و ئەوین، دڵ بریندارى خۆشەویستی، دڵ ترساو، شێت، **شَعَلَت النارُ شَعْلاً**: ئاگرەکە هەڵگیرساو کڵپەی کرد.

**شَعَلَ النارَ**: ئاگرەکەی داگیرساند، کڵپەی کرد.

**شَعِلَ شَعَلاً**: سپیایەتی تێکەڵی قژەکانی بوو، قژەکانی ماش‌و برنج بوون ٥ **أشْعَلَ النار**: ئاگرەکەی داگیرساند، دەشگوترێ: (اشْعَلَ النار): رقی فلانکەسی هەڵساند ٥ **أشْعَلَ الفتنة**: فیتنەو ئاشوبەکەی بەرفراوان کرد ٥ **أشْعَلَت الطعنةُ الدَّمَ**: زەبرو برینەکە خوێنی پرژاند ٥ **شَعَّلَ النارَ**: بۆ زێدە رەوی لەمانای (شَعَلَ)دا بەکاردێ ٥ **اشْتَعَلَت النار**: ئاگرەکە هەڵگیرساو بڵێسەی کرد ٥ **اشْتَعَلَ فلان غَضَباً**: فلانکەس رقی هەڵساو گڕی گرت.٥ **اشْتَعَلَ الرَّأسُ**: پیری بەناو قژی سەریدا بڵاو بۆوە ٥ قژی سەری ماش‌و برنج بوو ٥ **الأشْعَلُ من الخيل**: ئەسپێك کە تووکی سپی تێکەڵاوی تووکی بێ ٥ ئادەمیزاد کە رەگی سور لەچاوی دا بێ، یا سپێنی چاوی سور بێ ٥ **الشُّعْلَةُ**: بڵێسە ئاگر، ئاگری گڕدار، بڵێسەی ئاگردان‌و تەنور ٥ بڵێسەی چاوی تەباخ‌و

سەماوەرو شتی لەو جۆرە کەبەنەوت یان بەغاز ئیش دەکەن کە غازەکەیان دەکرێتەوە ئاگر بە شوێنی هاتنە دەرەوەی غازەکە دەنرێ‌و گڕدەگرێ ٥ یان پەڕۆیەك لەسەری دارێکەوە دەپێچرێ‌و لەنەوت‌و زەیت هەڵدەکێشرێ‌و ئاگری پێوە دەنرێ بۆ روناکی ٥ **الشَّعِيلُ**: هەڵگیرساو، بۆ مێینە (الشَّعيلة) بەکاردێ ٥ **المِشْعالُ**: ئامێری شت داگیرساندن وەکوو چەرخ‌و شقارتەو شتی لەو جۆرە ٥ **المِشْعَلُ**: بەمانا (المشاعل) دێ ٥ **المَشْعَلُ**: بەمانا (المشعال)دێ ٥ **المَشْعَلُ**: چراو فانۆس‌و شتی لەو جۆرە ٥ **المُشْعِلُ**: شتی پرژاوو بلاوە بوو بەچوار دەوری خۆی دا

**شَعِنَ شَعْنًا شَعَنًا**: قژی ژاکاو بژو تێکهالاو بوو.

**أَشْعَنَ فلان**: فلانکەس کاکۆڵی دوژمنەکەی گرت‌و بۆلای خۆی رایکێشا ٥ قژی ناوچەوانی گرت‌و کێشی کرد ٥ **اِشْعَنَّ شَعْرُهُ** وغیره: قژی زۆر ژاکاو بژبون ٥ **الشَّعانِين**: جەژنێکی مەسیحیانەیە دەکەوێتە رۆژی یەکشەممەی پێش جەژنی فیصح، ئاهەنگ‌و جەژنێکە بەبۆنەی یادەوەری چونی حەزرەتی عیسایە بۆ بەیتولمەقدیس ٥ **الشَّعْنُونُ**: (رجل شَعْنون): پیاوێکی قژ بژو ژاکاوە ٥ گێل‌و نەحمەق.

**شَعَا شَعْوًا**: بلاو بۆوە، پەرتەوازە بوو.

**شَعَا الشَّعْرُ** وغیره: قژەکە بژبوو زۆر ژاکا.

**شَعِيَ شَعًا**: بەمانا (شَعَا)دێ ٥ **أَشْعَى القومُ الغارَةَ**: خەڵکەکە هێرشیان بردو دەستیان بەشەڕ کرد ٥ شەڕیان هەڵگیرساند ٥ **الشَّاعِي**: بەشی ئاشکراو دیار ٥ دوور ٥ **الشَّعِي**: کۆپلە قژی بلاوە بوو ٥ **الشَّعْواءُ**: بەربلاو، پەرتەوازە ٥ شاش‌و پاش، دەگوترێ: (شجرة شعواء): درەختی لق‌و پۆپ بلاو ٥ (غارە شعواء): هەڵمەتی بەر بلاوو سەرانسەری ٥ **شَعْوَذَ**: بڕوانە مادەی (شَعَذَ).

**شَغَبَ القومَ** (عليهم وفيهم وبهم): شەڕی لەناو قەومەکەدا هەڵگیرساند ٥ فیتنەو ئاشوبی لەناویان دا بەرپاکرد، دەگوترێ: (شَغَبَ فلان): فلانکەس فیتنەیی نایەوە.

**شَغَبَ عن الطريق**: لەرێگە لای دا ٥ **شاغَبَهُ**: زۆری فیتنە جۆیی لەگەڵ دا کرد ٥ **تَشاغَبَ فلان**: فلانکەس شەغەب‌و فیتنەیی دروست کرد ٥ خۆی بەدەستەوەنەدا ٥ **تشاغب الرجلان**: هەریەك لەو دوو پیاوە ئاشوبی بۆ ئەوی تر نایەوە ٥ **الشَّغْبُ**: ئاگری فیتنە خۆشکردن‌و دنەدنەی خەڵك بۆ شەڕو بەگژ یەکدا چون ٥ ئاشوب نانەوەو فیتنە بەرپاکردن ٥ هێرش کردنە سەر یەکتر‌و کێشە بەرپاکردن ٥ **الشَّغِبُ**: شەڕانگێزو فیتنە جۆ ٥ ئاژاوە گێڕ ٥ شەڕانی ٥ **المَشْغَبُ**: بەمانا (الشَّغِبُ) دێ.

**شَغَرَ المكان** وغیره **شُغُورًا**: شوێنەکە خاڵی بوو، چۆڵ بوو٥ **شَغَرَ البلدُ**: وڵات لەپارێزگارو کاربەدەست خاڵی بوو، کەس نیەکاروباری بەڕێوە بەرێ ئەمن‌و ئاسایشی بپارێزێ، بەرفراوان بوو.

**شَغَرَ السِّعْرُ**: نرخ دابەزی.

**شَغَرَ الكلبُ**: سەگەکە قاچێکی هەڵبڕی بۆ ئەوەی میز بکا.

**شَغَرَ فلانًا عن البلد** وغیره **شَغْرًا وشِغارًا**: فلانکەسی لەوڵات دەرکردو تڕۆی کرد شاربەدەری کرد ٥ **أَشْغَرَ المَنْهَلُ**: سەرچاوەی ئاوەکە لەرێگا دوور بوو ٥ **شاغَرَهُ مُشاغرة**: ژن بەژنی لەگەڵدا کرد خزمێکی خۆی لەفلان مارەکرد بەمەرجێك ئەویش خزمێکی خۆی لی مارەبکا، واتە

بەشێوەی (نكاح الشغار) ژنیان مارەكرد بەبێ مارەیی كەلە ڕاستی دا ئەمە لەئایینی ئیسلام دا حەرامە ◊ **اشْتَغَرَ**: بەمانا (أشغر)دێ ◊ زۆرو تێكەڵو پێكەڵ بوو ◊ **اشتغر الدّوابُ**: جرو جانەوەرو ئاژەڵ زۆر بونو پەرەیان سەند ◊ **اشْتَغَرَ الأمر بفلان**: كاروباری فلان یان كێشەو نیزاعەكەی لەوزە دەرچوو بەرفراوان بوو ◊ **اشْتَغَرَ علیه الأمر**: كارەكەی تێكەڵو پێكەڵ بوو ◊ **اشْتَغَرَ الحسابُ علیه**: حیسابو مامەڵەكەی بەرفراوانو تێكەڵو پێكەڵ بوو سەرو دەری لێ ناكا ◊ **اشْتَغَرَ علی فلان**: دەست درێژی كردە سەر فلانو قسەی ناشیرینی پێ گوت، شانازیی بەسەردا كرد ◊ **شَاغَرَ**: هەریەك لەو دووكەسە خۆشكی خۆی یان خزمی خۆی لەوێ ترمارە كرد بەبێ مارەیی (ژن بەژنیان كرد) ◊ **تَشَغَّرَ فلان فی القبیح ونحوه**: فلانكەس لەشتی ناشیرینو كاری نابەجێ دا ڕۆچوو، سنور شكێنی كرد ◊ **الشَّاغِرُ**: خاڵیو بۆش، دەگوترێ: (مكان شاغر أو منصب شاغر أو كرسي شاغر): شوێنی چۆڵ، پلەو پایەی چۆڵ، كورسی چۆڵ ◊ **الشَّاغِران**: شوێنی بڕینی ناوك ◊ كۆتایی ڕەگی ناوك ◊ **الشُّغَّارُ**: بەتاڵو بۆش ◊ بیرێك ئاوی زۆری تێدابێ ◊ ڕەگێكە لەلاتەنیشتی حوشتر ◊ **الشِّغَارُ** (نكاح الشغار): ئەوەیە پیاوێك ئافرەتێكی خزمی خۆی لەپیاوێك مارە بكا بەبێ مارەیی بەمەرجێك پیاوەكەی تریش ئافرەتێكی خزمی خۆی لەئەو مارە بكا بەهەمان شێوە ◊ **الشَّغَرُ**: دەگوترێ: (تفرقوا شَغَرَ بَغَرَ): بەهەمو لایەك دا بڵاو بوونەوەو كونو قوژبنی وڵاتیان پڕكردەوە ◊ **الشُّغَارَةُ**: بەردە ئەستێ بەئاسن لێی دەدرێو پریشكی ئاگری لێ بەرز دەبنەوەو ئاگری پێ دەكرێتەوە ◊ **شَغْشَغَ اللجامَ فی فم الدابة**: لغاوی لەدەمی وڵاخەكەدا جوڵاندو توندی كرد بۆ ئەوەی وڵاخەكە سەرنەرم بێ، جڵەو كێش بێ ◊ **شَغْشَغَ السنانَ فی المطعون**: سەرە ڕمبەكەی لەبرینەكەدا لقاند بۆ ئەوەی برینەكە كاریگەر تر بێ ◊ **شَغَفَهُ شَغْفاً**: دڵی داگیر كرد، دڵی برد، وای لێ كرد عاشقی بێ.

**شَغِفَ** بـه وبـه: حەزی لێ كرد بەسۆزو خۆشەویستی ئەو هەڵەو گیر بوو، كەوتە داوی دڵداری ئەوەوە.

**شُغِفَ** به وبه شَغفاً: بەمانا (شَغِفَ)دێ ◊ (فهو مشغوف) ◊ **تَشَغَّفَهُ**: بەمانا (شَغَفَهُ)دێ ◊ **تَشَغَّفَ الحب فلاناً**: هەواڵەكە فلانكەسی خستە دڵەڕاوكێوەو پێیەوە هەڵەو گیر بوو ◊ **الشَّغَاف**: پەردەی دڵ، یان ناخی دڵ.

**شَغَلَ** الدارَ: لەخانوەكە دا جێگیر بوو، مایەوە.

**شَغَلَ** فلاناً عن الشيءِ: فلانكەسی لەشتەكە لادا، مەشغولی كرد.

**شُغِلَ** عنه بكذا: بەهۆی فلان شتەوە لێی بێ ئاگا بوو ◊ **شَغَّلَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (شَغَلَهُ)دا بەكاردێ، وای لێ كرد مەشغوڵ بێو ئاگای لەشتی تر نەبێ ◊ **اشْتَغَلَ الدواءُ فی جسمه**: دەرمانەكە بەجەستەی دا بڵاو بوو كاریگەر بوو تێیدا ◊ **اِنْشَغَلَ**: بۆ موطاوعەی (شَغَلَهُ)دێ ◊ **تَشَاغَلَ بِهِ**: پێوەی مەشغوڵ بوو ◊ **الأشغولةُ**: هەرشتێك ئادەمیزاد مەشغول بكاو لەشتی تر بێ ئاگای بكا ◊ **الشُّغَالُ**: ئەو كەسەی ئیشی زۆر بێ ◊ ئەوكەسەی هەمە كارە بێو هەرچی داوای لێ بكرێ جگە لەكاری پیشەسازیی ئەنجامی دەدا ◊ **الشُّغُلُ**: پێچەوانەی بەتاڵییە ◊ شتی پەیدا بوو كە ئادەمیزاد مەشغوڵ بكا بۆ زێدە ڕۆیی لەمەشغوڵ بون دا بەمانا خودی كارەكەش

دێ، دەگوترێ: (شُغل شاق): کارێکی قورس‌و گرانە، (شُغل جید): کارێکی باشەی ٥ **المشغول**: دەگوترێ: (فلان فارغ مشغول): فلانکەس بەکارێکی بێ سودەوە خەریکە ٥ (دار مشغولة): خانوێکە خێزانی تێدایە، ئادەمیزادی تێدا نیشتەجێیە ٥ (منصب مشغول): مەنصەبەکە پڕکراوەتەوە، کەسێك هەیە لەو پلەو پایەدا کاردەکا ٥ **شَغِيَتْ سِنُّهُ شَغىً**: ددانێکی لەددانەکانی تری درێژ ترە، گەورەترە ٥ یان لەڕیزی ددانەکانی تر دەرچووە.

**شَغِيَ مِنْسَرُ الطائر**: دەندوکی باڵندەکە کەوانەیی بوو، خوار بۆتەوە ٥ **شَغِيَت الأسنانُ**: ددانەکانی لەکورتی‌و درێژی دا جوداوازییان هەبوو ٥ **أشغَى الرجلُ**: پیاوەکە ڕاڕاو حولحولییە هەردەمەو ڕایەکی هەیە ٥ **أشغَى القوم بكنا**: خەڵکەکە بیرو بۆچونیان جوداواز بوو هەریەکەو ڕایەکی خۆی هەبوو ٥ **أشغى ببوله**: جۆڕ جۆڕو دڵۆپ دڵۆپ میزی کرد ٥ **شَغَرَهُ شَغْراً**: قەراخی هەنگاوت، لەکەناری دا.

**شَغَرَ الشيئ**: قەراخی شتەکەی هەنگاوت ٥ **شَغَرَتِ الشمسُ**: خۆر لەئاوا بوون نزیك بۆوە ٥ **شَغَرَ المالُ**: ماڵ‌و سامانەکە کەم بۆوە، لەناوچوو فەوتا ٥ **شَغَرَ على الأمر**: لەکارەکە نزیك بۆوە لێی چووە پێشەوە ٥ **الشُغْرَة**: قەراخی هەرشتێك ٥ (شُغْرُ الجُفنِ): قەراخی پێڵوی چاو ئەوەی کە برژانگی لێ دەڕوێن ٥ **الشُغْرَةُ**: دەمە شمشێرو دەمە چەقۆ، دەمە کێرد ئەوەی یان کراوەتەوەو تیژکراوە لەمادەی ئاسن ٥ موسو تەراش‌و گوێزان هەرشتێك موی پێ بتاشرێ ٥ ڕەمزو نهێنییەکە هەندێ کۆمەڵ‌و تاقم لەناوخۆیان دا بەکاری دەهێنن بۆ لێك حاڵی بون‌و لێك تێگەیشتن بە شێوەی نهێنی ٥ **الشَّفَّار**: وەستای شفرە، شفرە دروستکەر ٥ **الشَّفِيرُ**: لێوارو قەراخ ٥ (شَفِيرُ جهنم): لێواری دۆزەخ ٥ **المِشْفَرُ**: لیچی حوشتر ٥ لیچی خواروی ئەستورو پتەوە ٥ **شَفْشَفَ فلان**: پیاوەکە غیرە گرتی‌و تورە بوو لەسەر هەڵس‌و کەوتی بێگانە بەرامبەر مەحرەمەکانی ٥ **شَفْشَفَ الحَرُّ الشيئَ**: گەرماکە شتەکەی وشك کردەوە.

**شَفْشَفَ الصَّقيعُ النباتَ**: سەرماو سۆڵەکە گیاوو گژەکەی هەڵپروکاند ٥ **شَفْشَفَ الهمُّ فلاناً**: خەم‌و خەفەت فلانکەسی کزو کۆڵەوار کرد ٥ **شَفْشَفَ الماءَ ونحوه**: کەم کەم ئاوی ڕشاند ٥ **شَفْشَفَ الدواءَ على الجرح**: دەرمانەکەی بەبرینەکەدا پڕژاند پێیدا بڵاو کردەوە ٥ **الشُّفْشاف من الثياب**: قوماشی تەنك چنراوو شاش‌و پاش چنراو ٥ بای شەماڵ‌و فێنك کەرەوە ٥ نەرمەبای فێنك ٥ سروە بای فێنك ٥ **المُشَفْشَفُ**: کەسێك بەهۆی ڕق هەڵسان‌و توڕە بوونەوە بلەرزێ، غیرە بیگرێ‌و توڕە ببێ ٥ **المُشَفْشِفُ**: فشەکەرو بەد ڕەوشت.

**شَفَعَ الشيئَ شَفْعاً**: شتەکەی کرد بە جوت، دوهێندەی خۆی لێ کرد.

**شَفَعَ البَصَرُ الأشباحَ**: بیناییەکە شتەکەی بەدو دوو بینی، وەکوو چۆن خێل شتی تاك بە جوت دەبینێ ٥ **شَفَعَت الحامِلُ**: ژنە دوگیانەکە منداڵەکانی کردن بە جوت، بەدوو، واتە دووەم منداڵی بوو.٥ **شَفَعَ لفلان**: تکاو پاڕانەوەی بۆ فلانکەس کرد بۆئەوەی لەتاوانی خۆش ببن یان لێی کەم بکەنەوە.٥ **شَفَعَ الى فلان**: هانای بۆ فلانکەس بردو تکاکاری نارد بۆلای.

**شَفَعَ في الأمر**: شەفاعەت‌و تکای لەکارەکەدا کرد ٥ **شَفْعَ**: مانای (شَفَعَ) بەزێدە وە دەگەیەنێ ٥ **شَفَّعَ**

**فلاناً في كذا**: تكای فلانكەسی لەوشتەدا وەرگرت ◊ تكاكەی وەرگیرا، دەگوترێ: (هو **مُشَفَّعٌ**): تكاو شەفاعەت وەردەگرێو قبوڵیەتی ◊ (هو **مُشَفِّعٌ**): تكاو شەفاعەتی وەرگیراوە ◊ **تَشَفَّعَ لە**: بەمانا (شَفَعَ)دێ ◊ **تَشَفَّعَ لفلان الی فلان**: تكای لەفلان كرد بۆ فلان ◊ **تَشَفَّعَ**: چووە سەر ڕێبازی ئیمامی شافیعی، بوو بەشافیعی مەزهەب ◊ **اسْتَشْفَعَ**: داوای كۆمەكیو یارمەتی كرد ◊ **الشَّافِعُ**: خاوەن تكاو شەفاعەت ◊ (ناقة شافع): حوشترێك بێچوی لەگەڵ بێ ◊ (شاة شافع): مەڕ بەرخۆلەی لەگەڵ بێ ◊ **الشَّفَائِع**: شتی دوولایەنو دوو سەرە ◊ **شفائع النبت**: ڕوەكێك بەدوو جۆر بڕوێ ◊ **الشَّفَاعَة**: تكاكردنو پاڕانەوە بۆ لێخۆشبون لە تاوانبار ◊ **الشَّفْعُ**: ئەوەی شت دەكا بەجوتو دوو دوو ◊ پێچەوانەی تاكە ◊ **الشَّفْعُ**: بەمانا (الشَّفْعُ)دێ ◊ **الشُّفْعَةُ**: دوڕكات نوێژی چەشتەنگاو ◊ **الشُّفْعَةُ**: مافی جیران بۆ هەڵگرتنەوەی زەویو خانوی هاوسێی خۆیو نەهێشتنی كڕیاری تر كە ئەو مڵكە بكڕێ بەوەمەرجو یاسایەی شەریعەتی ئیسلام دیاریی كردون، هەروا وشەی (الشُّفْعَة) ناوە بۆ خودی موڵكە هەڵگیراوەكە بەو شێوەیە ◊ هەروا بەمانا (الشُّفْعَةُ)دێ ◊ چاوەزار، دەگوترێ: (أصابته شُفْعَةٌ): چاوی پیس كاری لێ كردوە ◊ **الشَّفُوعُ**: كەسێكە بتوانێ دوهێندەی هاوەڵەكەی كار بكا ◊ **الشَّفِيعُ**: خاوەن تكاو شەفاعەت ◊ ئەوكەسەی زەویو خانو بەشێوەی شوفعە هەڵبگرێتەوە ◊ ژمارەی جوت وەكوو (٢،٤،٦،٨.....هتد).

**شَفَّ الثَّوبَ ونحوه**: قوماشەكە ئەوەندە تەنكو شاشە ئەو دیوی دەبیندرێ.

**شَفَّ الشيءُ**: شتەكە هێندە تەنكە یان ئەوەندە ڕونو شەفافە ئەودیوی نەشاردەوە، دەگوترێ: (شَفَّ الإناءُ): مەنجەڵەكە سوراحییەكە شتی ئەودیوی تێدا دەبیندرێ ◊ (شَفَّ السائل): شلەمەنییەكە ئەوەندە ڕونە ئەودیوی خۆی نەشاردۆتەوە.

**شَفَّ**: بەهۆی نەخۆشیو غەمو خەفەتەوە كزو لاواز بوو ◊ لەبەر سوكیو بێ كێشی وەقەرە ناگرێ ◊ **شَفَّت الريحُ**: كزە با هەڵیكرد هەوای ساردو كزەبا هەڵبوو.

**شَفَّ الشيءَ شَفّاً**: شتەكەی لاوازكرد، خەوی لێ زڕاند، دەگوترێ: (شَفَّهُ الحب أو الهَمُّ): دڵداریی یان خەمو پەژارە خەوی لێ زڕاند.

**شَفَّ الهواءُ الماءَ وغيره**: هەواكە كەمێكی لەئاوەكە برد.

**شَفَّ الشاربُ الماءَ أو الشرابَ**: بخۆرەوەكە چۆڕی لەئاوو شەرابەكە بڕی هەمووی هەڵقوڕاندو هیچی نەهێشتەوە.

**شَفَّ الرسمَ**: وێنەكەی بەشتی ڕونو شەفاف دروست كرد ◊ **أَشَفَّ عليه**: بەسەری دا باڵا دەست بوو ◊ **أَشَفَّ الشيءَ**: شتەكەی ڕونو شەفاف دروست كرد ◊ **أَشَفَّ بعض أولاده على بعض**: زێدە ڕێزو خۆشەویستی دا بەهەندێ لەمناڵەكانیو بەهەندێكیانی نەدا ◊ **شَفَّفَ عليه**: بەسەری دا باڵا دەست بوو ◊ تەنكو باریكی كرد ◊ **اشْتَفَّ ما في الإناء**: ئەوی لەپەرداخو قاپەكە دا بوو هەمووی خواردەوە ◊ **اِشْتَفَّ الأمورَ**: لێكۆڵینەوەی لەكارەكان دا كرد ◊ **اِسْتَشَفَّ الشيءَ**: شتەكەی بینی بەهۆی چاویلكەو دووربینو شتی وەهاوە ◊ **اسْتَشَفَّ**

**الثَّوبَ**: قوماشەکەی هەڵپشکنی بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ عەیبی تێدانییە.

**اِسْتَشَفَّ الكتابَ والأمرَ**: لەکتێبەکە ورد بۆوە یان لەکارەکەی ڕوانی بۆئەوەی بزانێ چی تێدایە ٥ **اِسْتَشَفَّ الشرابَ**: شەرابەکەی هەموو هەڵقوڕاند جۆری لێ بڕی ٥ **الشُّفَافَةُ**: بەرماوەی شەراب ٥ **الشِّفُّ**: پەردەی تەنک کەئەودیوی تێڕا دیاربێ، دەگوترێ: (ثوبٌ شِفٌّ): قوماشێکە ئەو دیوی تێڕا دیارە ٥ **الشُّفُّ**: زێدە بەش ٥ خۆزگەو پیرۆزبایی، دەگوترێ: (شِفٌّ لك يافلان): خۆزگەم بەخۆت فلانکەس، ئەو شتەت پیرۆزبێ ٥ **الشَّفَفُ**: تەنکیو لاوازیی ٥ سوکیو بێ کێشی ٥ کەم گوزەرانیو دەست کورتی ٥ شتی کەمو بێ بەهاو ئاسان ٥ **الشَّفَّافُ**: ئەوەی ئەو دیوی خۆی نەشارێتەوە لەبەر ڕونیو تەنکی ٥ **الشَّفِيفُ**: بەمانا (الشَّفَّاف)دێ ٥ گەستنی سەرما، ئازاری سەرما.

**شَفِقَ منه وعليه شَفَقاً**: ترسا لێی ٥ لێی وریا بوو ٥ بەزەیی پێداهاتو سۆزی بۆ نواند ٥ **أشْفَقَ منه**: لێی ترسا، حەزەری لێ کرد ٥ **أشْفَقَ عليه**: بەزەیی پێداهاتەوە خەمی بوو توشی شتێك بێ ٥ **الشَّفَقُ**: سۆزو بەزەیی ٥ سوراییەکە دوای خۆر ئاوابون لەکەناری ئاسمان دیارەو دەمێنێتەوە تاکاتی نوێژی خەوتنان ٥ لای شت ٥ شتی خراپ لە هەرشتێك بێ ٥ **الشَّفَقَةُ**: ڕەحەمو سۆزو بەزەیی ٥ ترسو خۆف لەپەیدا بوونی بەڵاو کارەسات ٥ **الشَّفِيقُ**: خاوەن سۆزو بەزەیی ٥ **شَفَنَهُ وإليه شَفوناً**: بەتیلەی چاوو ڕق لێبوونەوە سەیری کرد، یان بە سەرسوڕمان لێی سەیری کرد، یان بەگاڵتە پێکردنو کەم نرخییەوە تەماشای کرد ٥ **شَفَهَهُ شَفْهاً**: لێوی هەنگاوت ٥ زۆر بە گیرە گیرەوە داوای لێ کردو شتی لێ وەرگرت تاهیچی پێوە نەهێشت.

**شَفَهَ المالَ ونحوه**: ماڵەکەی لەکیس دا تەفرو تونای کرد.

**شُفِهَ الشيءُ**: شتەکە داواکاریی زۆربون ٥ (فهو مَشفوه) ٥ **شَافَهَهُ مشافَهَةً وشِفاهاً**: ڕاستەو خۆو ڕو بەڕو قسەی لەگەڵ کرد ٥ **شَافَهَ البلدَ أو الأمرَ**: لەوڵاتو شارەکە نزیك بۆوە یان لەکارەکەی نزیك بۆوە ٥ **الشَّافِهُ**: تینو ئاوی دەست نەکەوێ ٥ **الشُّفَاهِيُّ**: لێو ئەستور یان هەردو لیچی ئەستورو خەپلە بن ٥ **الشَّفَةُ**: (شَفَةُ الشيء): کەناری شت، قەراخی شت، قەراخی لای سەروی شتەکە

**شَفَةُ الإنسان**: لێوی ئادەمیزاد؛ ئەو پارچە گۆشتەی ددان دادەپۆشێ مەبەست هەردو لێوە لێوی خوارو لێوی سەرو ٥ (بنت الشَّفَة): وشەو قسە، دەگوترێ: (لم ينبس ببنت شَفَةٍ): قسەیەکی نەکرد ورتەی لەدەم نەهاتەدەر ٥ **شَفَت الشمسُ شَفواً**: خۆر نزیك بەئاوا بون بوو.

**شَفا اللهُ العليلَ**: خودا شیفای نەخۆشەکەی دا، لەنەخۆشییەکەی چاك بۆوە ٥ **أشفى فلان**: فلانکەس کەوتە کۆتایی شەوەوە ٥ **أشفى على الشيءِ**: لەشتەکە نزیك بۆوە، دەگوترێ: (أشفت الشمس على الغروب): خۆر لەئاوابون نزیك بۆوە ٥ **أشفى الرجل على الموت**: فلانکەس لەمردن نزیك بۆوە ٥ **أشفى المريضَ**: داوای شیفای بۆ نەخۆشەکە کرد ٥ یان دەرمانی کاریگەریی بۆ دەست نیشان کرد ٥ **أشفى المريض الدَّوَاءَ**: دەرمانی چاککەرەوەی دا بەنەخۆشەکە ٥ **شافاه**: ڕاستەو خۆو ڕوبەڕو قسەی لەگەڵ کرد ٥ **اِشتَفى بكذا**: بەفلان دەرمان چاری سەری

نەخۆشیەکەی کرد ٥ اِشتَفَى من عدوِهِ: گەیشتە حاڵەتێک تۆڵەی لەدوژمنەکەی ستێندراو بیرۆشی هات ٥ تَشَفَّى: بەمانا (إستشفى)دێ ٥ اسْتَشْفَى المريضُ مِن علته: نەخۆشەکە هەوڵی چاکبونەوەی دا ٥ اسْتَشْفَى به: بەو دەرمانە تیماری دەردەکەی کرد ٥ الأَشْفَى: ئەو کەسەی زار قژبڕو لێوی بۆ لێک نەنرێن، بۆ مێینە دەگوترێ: (شَفواء) ٥ الشَّفَا من كل شيئ: لەهەموو شتێک دا بەکەنارەکەی دەگوترێ ٥ هەروا بەمانا کەم‌و بێ نمود دێ، دەگوترێ: (ما بقي منه إلا شفاً): شتێکی کەم نەبێ لەو شتە نەماوەتەوە ٥ الشِّفَاءُ: چاکبوونەوە لەنەخۆشی ٥ دەرمانی دەردو نەخۆشی ٥ هەروا بەمانا دەرمانی دەروون دێ، (قورئان دەفەرموێ: (وشفاء لما في الصدور) ٥ المستشفى: شوێنی دەرمانکردن‌و چارەسەرکردنی نەخۆش ٥ خەستەخانە کەپزیشك‌و پەرستیارو دەرمان‌و شوێنی حەوانەوەی تێدایە ٥ الشَّفَوي: هەرشتێک بەدەم ئەنجام بدرێ ٥ تاقیکردنەوەی شەفەوی، بڕیاری شەفەوی ٥ الشفوية: رووەکی شەفەویە ئەوەی گوڵەکەی بەرزبێتەوەو ببێتە دووفاق‌و یەکیان لەوی تریان بەرز تربێ ٥ (الحروف الشفوية): ئەو پیتانەی بەلێو دەردەبڕدرێن وەکوو (ف، م، ب، و).

**شَقَا** نابُه شُقوءاً: کەڵبەی دەرکەوت.

**شَقَاَ** شَعْرُهُ بالمشط شقئاً: قژی بەشانە بڵاو کردن.

**شَقَاَ** فلاناً بالعصا: گۆچانی ناڕاستەی تۆقە سەری فلان کرد ٥ الشَّقأ: پشت ناو چاوان لەپێشە سەر ٥ المِشقأ: شانە.

**شَقَحَ** الشيئَ شَقْحاً: شتەکەی دوور خستەوە ٥ شکاندی.

**شَقَحَ** الجوزَ ونحوها: کاکڵەی گوێزەکە یان بادامەکەی دەرهێنا.

**شَقِحَ** شَقَحاً وشُقْحَةً: سورو چاوشین بوو.

**شَقُحَ** شقاحة: ناشیرین بوو ٥ أَشْقَحَ البسرُ: خورما بەرسیلەکە سورایی تێکەوت ٥ ئاڵ‌و بۆڵی لێ پەیدا بوو، دەگوترێ: (أَشْقَحَ النخلُ): خورماکە ئاڵ‌و بۆڵی تێکەوت ٥ شَاقَحَهُ: جوێنی پێ دا ٥ تشاقَحَا: ئەو دووکەسە جوێنیان بەیەکتردا ٥ الأَشْقَحُ: سوری چاوشین ٥ سورفل ٥ بۆ مێینە (شقحاء) ٥ الشُّقْحَةُ: هێشوە خورمای ئاڵ‌و بۆڵ تێکەوتوو ٥ الشُّقْدَةُ: گیاو گژو ئالفێکە ئاژەڵ بیخوا شیری زۆر دەبێ پێشی دەگوترێ: (ألقِشدة) ٥ الشُّقْدُفُ: شتێکە لەکەژاوە گەورەترە، کاتی خۆی عەرەبەکان بەکاریان دەهێنا بۆ سەفەری حەج‌و عەمرە.

**شَقَذَ** شَقْذاً: دەرکراو، دوورکەوتەوە.

**شَقِذَ** شَقَذاً: بەمانا (شَقَذَ)دێ.

**شَقِذَ** فلان: فلانکەس خەوی لێ زڕاو نەیتوانی بخەوێ، یان بەسەر خەودا زاڵ بوو وەنەوزی نەهاتێ، یان چاو پیسەو بەچاو خەڵك دەهەنگێوێ ٥ (فهو شَقِذٌ) ٥ أَشْقَذَهُ: دەری کردو رۆیی ٥ شاقَذَهُ: دژایەتی کرد ٥ الشُّقْذُ: گورگ ٥ هەڵۆ ٥ حیرباء ٥ چاوپیس کە بەچاوەزار کار لەشت دەکا زیان دەگەیەنێ ٥ الشَّقَذُ: عەیب‌و لەککە، دەگوترێ: (مابه شَقَذٌ ولانَقَذٌ): هیچ عەیب‌و خەلەلێکی تێدانییە ٥ الشُّقَذان: بەمانا (الشقذ)دێ ٥ الشُّقَذَانَة: ئافرەتی رۆح سوك‌و خوێن شیرین، یان ئافرەتی دەمدرێژی جنێو

فرۆش ٥ **الشَّقِيذُ**: ئەوکەسەی خەو ناچێتە چاوی.

**شَقِرَ شَقَراً وشُقْرَةً**: سورو سپی بوو، ڕەنگە سپییەکەی سوریی تێکەڕاوە ٥ **إشقرَّ**: سوریو سپییەکەی زۆر بوو ٥ **الأشْقَرُ مِن الدماء**: خوێنپارە ٥ **الشُّقارى**: گوڵی شەقائق النعمان؛ ڕوەکێکە گوڵەکەی سورو پەڵە پەڵەیە بەخاڵی ڕەش، زۆر جۆری هەیە هەندێکی دەروێندرێ هەندێکی خۆڕسکە لەکۆتایی زستانو بەهاردا دەڕوێ ٥ **الشُّقْرُ**: کاری گرنگ ٥ نهێنی، دەگوترێ: (بَثَّهُ شُقُورَهُ): خەمو خەفەتی بۆ هەڵڕشتن ٥ **الشُّقْرُ**: کەڵەشێر.٥ الشِّقِري: جۆرە خورمایەکی باشە، لەیەمەن پێی دەڵێن: (المُشَقَّرُ) ٥ **الشُّقران**: نەخۆشییەکە توشی کشتو کاڵ دەبێ ٥ **الشُّقْرَةُ**: سورایییەکی ڕونو صافەو تۆزێك مەیلەو سپییە بەزۆری بۆ پێستی ئادەمیزاد بەکاردەهێندرێ ٥ **الشُّقَّارُ**: بەمانا (الشُّقَّارى): دێ ٥ جۆرە ماسییەکی سوری کلك درێژە ٥ **الشُّقَّارَى**: بەمانا (الشُّقارَى)دێ ٥ **الشُّقُورُ**: غەمو دڵتەنگییەك خەو بزڕێنێ ٥ **الشُّقَيْرُ**: جۆرە حەربایەکە، سیسڕەیە ٥ جۆرە کوللەیەکە ٥ **المَشْقَرُ مِن الرمل**: چەوو لمی تەمبارە بەستوی ڕەقو پتەو وەکوو شاخە زڕوی کەبەناو زەوی دا درێژ بۆتەوە ٥ **المُشَقَّرُ**: سوراحی ٥ پیاڵەی گەورە ٥ کوندەی ئاو ٥ قەڵایەکی کۆنو مێژوییە لەوڵاتی بەحرەین ٥ **الشَّقْراقُ والشِّقِرَّاقُ**: باڵندەیەکی بچوکی وەکوو پەپوسولەیمانکەیە ڕەنگی خاڵخاڵە بەسەوزو سورو سپی، پێشی دەگوترێ: (الأخيل) عەرەب کردوویانە بە نیشانەی ڕەشبینیو نەگبەتی ٥ **شَقْشَقَ الجملُ**: حوشترەکە دەنگی خۆی لەقوڕگی دا خواردەوە ٥ چۆلەکەکە جریواندی ٥ **الشِّقْشِقَةُ**: شتێکە وەکوو سی وایە حوشتر لەکاتی چەموشیو دەنگ خواردنەوەی لەدەمی دەری دەهێنێ ٥ هەروا دەگوترێ: (هدرت شِقْشِقَةُ فلان): ڕقی فلان هەڵسا، یان بەباشی ڕاو بۆچونی خۆی دەربڕی، هەروەها دەگوترێ: (شِقْشِقَةُ هدرت ثم قرّت): ئاشوبو فیتنەییەك بوو بەرپابوو پاشان دامرکایەوە، هەروا دەگوترێ: (فلان شِقْشِقَةُ قومه): فلانکەس گەورەو قسە ڕۆیشتوی گەلەکەیەتی ٥ **شَقَّصَ الذبيحة وغيرها**: گۆشتی کوشتییەکەی کەرتو پەرت کرد، بەیەکسانی بەسەر هاوبەشەکاندا دابەشی کرد ٥ **الشِّقْصُ**: پارچەی شت، بەش وبار، **الشَّقِيصُ**: بەمانا (الشِّقْصُ)دێ، شتی کەم، هاوبەش.٥ المِشْقَصُ مِن النصال: سەرە ڕمبی درێژو پان، دەگوترێ: (سهم ذو نصل عريض) ٥ **المُشَقِّصُ**: قەصاب ٥ گۆشت فرۆش ٥ **الشَّقَفُ**: سواڵەت یان لەتە سواڵەت ٥ تاکەکەی (شَقَفَةٌ) ٥ **الشَّقَّافُ**: سواڵەت دروستکەر، یان سواڵەت فرۆش.

**شَقَّ الأمرُ شَقّاً**: کارەکە گرانو زەحمەت بوو.

**شَقَّ على فلان**: ئەرکی گرانی خستە سەر شانی فلانکەس.٥ **شَقَّ النبتُ**: ڕوەکەکە ڕواو دەرکەوت، سەری لەزەوی دەرهێنا.

**شَقَّ النابُ**: کەڵبەکە (ددانەکە) دەرکەوت.

**شَقَّ البرقُ**: هەورە بروسکەکە بەدرێژی بیندرا لەناو هەوردا بەڵام بڵاو نەبۆوە.

**شَقَّ الشيءَ**: شتەکەی شەقو پەق کرد.

**شَقَّ نهراً**: جۆگای ڕاکێشا، جۆگاکەی هەڵکەند.

**شَقَّ الأرضَ**: زەوییەکەی کێڵا، دەشگوترێ: (شَقَّ عصا الطاعة): سەرپێچی کردو یاخی بوو ٥

(وَشَقَّ عصا الجماعة): یەکیەتی کۆمەڵی تێك داو ئاژاوەی خستە ناویانەوە، تەبایی لێ کردن بەدژایەتی.

**شَقَّ** الفرسُ ونحوه شَقَقاً: ئەسپەکە لەڕۆیشتن دا ئەملاو ئەولای ڕێگای گرتو بەڕاستە ڕێگادا نەڕۆیی ◦ **شاقَّهُ**: دژایەتی کردو بەپێچەوانەی ئەو جوڵایەوە ◦ **شَقَّقَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (شَقَّهُ)دی ◦ **شَقَّقَ الكلامَ**: قسەکەی درێژە پێداو ڕونی کردەوە لەقسە قسەی دەرهێناو قسەکەی وردکردەوە، دەگوترێ: (اشتق الفرسُ ونحوه في عدوه وفلان في الكلام أو الخصومة ونحوها): ئەسپەکە لەڕۆیشتنی مەبەست لای دا، یان فلانکەس لەمەبەستی سەرەکی باسەکە چووە دەرو شتی لاوەکی هێنانە ناو باسەکەوە یان کێشە سەرەکییەکەی واز لێ هێناو شتی تری هێنانە پێشەوە ◦ **اِشتَقَّ الطریقَ في الفلاة**: بەرێگای چۆڵو سارادا ڕۆیی ◦ **اِشتَقَّ طریقه في الأمر**: بەتواناو لێ هاتوییەوە چووە کارەکەوە ◦ **اِشتَقَّ الكلمة من غیرها**: وشەکەی لەوشەیەکی تر دەرهێنا، وەکوو بڵێی وشەی (یضرب، ضارب، مضروب)ی لەوشەی (ضَرَبَ)دەرهێنا ◦ **اِنشَقَّ**: شەقی برد، درزی گەورەی تێکەوت ◦ **اِنشَقَّ الفجرُ**: کازیوەی بەیانی دەرکەوت ◦ **اِنشَقَّ البرق**: بروسکەکە دەرکەوت ◦ **اِنشَقَّ الرأي**: ڕایەکە کێشەی تێکەوت بۆ بەچەند ڕایەکی جیاجیا، دەگوترێ: (اِنشَقَّت عصا الجماعة): کۆمەڵەکە پەرتەوازە بوون ◦ پێڕو تاقمەکە بڵاوەیان لێ کرد ◦ **تَشاقّاً**: لێك جیابوونەوەو دژایەتی کەوتە ناویانەوە ◦ **تشَقَّقَ**: شەق بوو، درزی گەورەی تێ بوو کەلەبەری دەرکەوت ◦ **تشَقَّقَ الفرسُ**: ئەسپەکە کزو لاواز بوو ◦ **اِستَشَقَّ الحامل بِحَمْلِهِ**: کۆڵبارەکە کۆڵەکەی خستە سەر لایەکی بۆئەوەی لەدەرگاکە یان لەشوێنی تەنگەبەر ئەودیو بکەوێ ◦ **الإِستشقاق**: لەزانیاری عەرەبی دا بریتییە لەدەرهێنانو دروستکردنی وشەیەك لەوشەیەکی تر بەگوێرەی یاسای زانیاری سەرف ◦ **الشّاقّ**: قورس، گرانو ناخۆش ◦ **الشقائق**: یان (شقائق النعمان): بەچەند جۆرە گوڵێك دەگوترێ وەکوو گوڵاڵە سورەو گوڵە نیسانو شلێرو گەڵاوك ◦ **الشُّقاق**: قەڵشانی پێستی دەستو قاچو دەمو لێو بەهۆی نەخۆشی یان ساردو سەرماوە ◦ **الشَّقُّ**: نارەحەتیو مەینەتی ◦ درزو کەلەبەرو قەڵشتو کون ◦ **الشَّقُّ الحیشومي**: کونی لوت بەلای سەردا ◦ **الشَّقُّ القیصري في الولادة**: هەڵدڕینی سکە بۆ دەرهێنانی زارۆك لەمنداڵدانی دایکی ◦ **الشِّقُّ**: (شِقّ الشيء): لای شت ◦ بەشێکی شت ◦ کەرتێکی نیوەی ◦ چورتمو نارەحەتی ئەرکی قورسو گران ◦ **الشَّقّاق**: دەگوترێ: (رجل شقّاق): پیاوێکی خۆبەزلزانو لەخۆباییو هیچ لەبارانەبووە ◦ **الشِّقَّة**: نیوەی شت کە بکرێ بەدوو کەرتەوە ◦ پارچەی لێکراوە یان هەڵدڕاو شەقبوو ◦ هەرپارچە قوماشێك بەدرێژی دڕابێ، یان عەصاو داری تر کە درزی بردبێ ◦ دوریی ◦ سەفەری درێژ ◦ یان مەسافەیەك کە بەناخۆشی ڕۆیشتنی پێدابکرێ ◦ **الشَّقیق**: برای باوكو دایکی ◦ هاو وێنەو هاوشان، هاوسەر ◦ **الشَّقیقة**: خوشکی باوكو دایکی ◦ بارانی زۆر ◦ ئازارێکە نیوەی سەردەگرێ یان نیوەی دەمو چاو دەهێشێ ◦ **المَشَقَّة**: نارەحەتیو مەینەتی ◦

**شَقَلَهُ شَقْلاً**: کێشای ◦ **الشاقول**: شاوڵ ◦ دارێکە بەلای سەرویەوە شتێکی پێوەیە وەکوو بزمار ◦ کشتیارەکان زەوی پێ مەزندە دەکەن یان سنووری زەوییەکانیانی پێ دیاریی دەکەن ◦

شَقَاهُ شَقْواً: خستیه نێو نەگبەتییەوە، توشی نەهامەتی کرد.

**شَقِيَ** شَقاً وشقاوةً: بەدبەختو نەگبەت بوو، وەزع حاڵی ناخۆش بوو ژیانی تاڵ بوو.

**شَقِيَ** في كذا: ماندوو بوو، ئەرکی گرانی کەوتە سەرشان ٥ توشی ناخۆشیو کارەسات بوو ٥ أشقاه: خستیە ناو نەگبەتیو چەورتەمەوە، توشی کێشەو کارەساتی کرد ٥ شَاقَى الشيءَ مُشاقاةً وشِقَاءً: لەشتەکە نارەحەتی چەشتو ناخۆشی بینی.٥ شاقاه في الحرب: لەشەردا بەسەریدا زاڵ بوو ٥ الشَّقَاء: تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی ٥ تەنگانەو دەردەسەری ٥ گومڕایی بەدبەختی ٥ الشَّقاوة: بەمانا (الشَّقَاءُ) دێ ٥ الشَّقْوَةُ: بەمانا (الشَّقَاءُ)دێ ٥ الشَّقِيُّ: نەگبەتو بەدبەخت ٥ گومڕاو ڕێگا لێ گوم بوو ٥ لاسارو هیدایەت وەرنەگر ٥ بۆ مێینە (شَقِيَّة) بەکاردێ.

**شَكِيَ** ظُفُرُهُ شَكاً: نینۆکی هەڵشتن ٥ دەگوترێ: (شَكِيَ فلان): فلانکەس نینۆکی هەڵشان ٥ قامکی شەقار شەقاربوو ٥ أشكَات الشَّجَرَةُ: درەختەکە چرۆی کرد، لقو پۆپەکانی بەکەمجار دەرکەوت ٥ الشَّكَاءُ: هەڵشینی دەورو بەری نینۆک ٥ هەڵشانی پێست ٥ الشُّكَبَانُ: تاپنچە، رەشکە، شریفی کون کون، شتێکە کونکونە کشتیارەکان کاو کۆتی تێدەکەنو دەیکوێژنەوە. شَكَدَهُ شَكداً: بەخشینی باشی دایەو چاوەڕوانی سوپاسیشی لێ نەکرد ٥ لەکاتی بەرێکەوتنی بۆسەفەر هەندێ خۆراکی پێدا ٥ الشُّكْدُ: بەخشینی بێ پاساوو سوپاس ٥ خەرمانانەو مشتاخانە ئەو شتەی کەلەکاتی چنینو درونەوەدا بەشێك دەدرێ بەهەژارو بێ نەوایان بەناوی خەرمانلۆغەو مشتخانە ٥ ئەو خواردنو تێشوەی بۆ ڕێبوار ئامادە دەکرێ لەکاتی سەفەرکردنی دا ٥ شَكَرَتِ الدَّابَّةُ شكراً وشكوراً وشكراناً: وڵاخەکە ئالفو ئالیکی کەم بەشی کرد ٥ وڵاخەکە چووە ناو پاوانەوەو لەوەڕاو قەڵەو بوو.

**شَكَرَ** فلاناً وله شكراً وشكراناً: باسی نازو نیعمەتی فلانی کردو سوپاسگوزاری بوو، باسی پیاوەتییەکانی فلانی کردو پێیدا هەڵگوت، دەگوترێ: (شَكَرَ اللهَ): سوپاسی خودای کرد ٥ (شَكَرَ للهِ): سوپاسگوزاری خودا بوو نیعمەتەکانی خودای هێنایە بەرچاوی خۆی سوپاسگوزار بوو.

**شَكَرَ** عَمَلَهُ: لەسەر کارەکەی پاداشی دایەوە ٥ شَكِرَتِ الشَّجَرَةُ شَكراً: درەختەکە پرژو پاڵی دەرکرد.

**شَكِرَ** الضَّرْعُ: گوانەکە پڕبوو لەشیر، دەشگوترێ: (شَكِرَت الناقةُ): حوشترەکە شیری زۆر بوو ٥ شَكِرَت السَّحَابَةُ: هەورەکە پڕبوو لەباران.

**شَكُرَ** فلان: فلانکەس دوای ڕژدیو چرۆکی دڵفراوان سەخی سروشت بوو، یان عەتاو بەخششی زۆر بوو ٥ (فهو شَكِرٌ وشكران وهي شَكِرَة وشَكْرَى).

أشْكَرَ الضَّرْعُ والشجرُ: بەمانا (شَكِرَ)دێ ٥ إشْتَكَرَ الجنينُ: منداڵەکە گەندەموی لێ ڕوان ٥ إشْتَكَرَ السَّماءُ: ئاسمان بارانی زۆری باراند، بارانی بەخوڕەمی باراند ٥ إشْتَكَرَ الرياحُ: بایەکە بارانی هێنا، بای پێش باران بوو ٥ إشْتَكَرَ الحرُّ أو البردُ: گەرما یان سەرما پەرەی سەند ٥ إشْتَكَرَ الرجلُ في عدوه: پیاوەکە هەنگاوی خێرای هەڵێنان ٥ تَشَكَّرَ لَهُ: سوپاسی کرد، سوپاسگوزاری بوو ٥ الشَّكَائِرُ: پێشە سەر، ناوچەوان ٥ الشِّكَارَةُ: کیسێکە لەکاغەز یان

حەزی لێ بکرێ ٥ اشتاق اليه: یان (إشتاقه)حەزی لێ کرد ٥ تَشَوَّقَ الى الشيئ: زۆری ئارەزۆ کرد حەزی لێ بوو ٥ خۆی وانیشان دا حەزی لەشتەکەیە ٥ الشائِقُ: بەمانا (المشتاق) دێ ٥ ئارەزۆمەند، ئەوشتەی وا لەنادەمیزاد بکا بەجوانیو رەنگینیەکەی شەیدای ببێ ٥ الشَّوْقُ: حەزو ئارەزو، مەیل کردنی نەفسە یان وەگری بونیەتی بەشتەکەوە ٥ الشَّيِّقُ: بەمانا (المشتاق)دێ ٥ شاكَتهُ الشوكَةُ شوكاً: چقڵ لێی دا، چقڵی تێرا چوو.

**شاكَ** فلان فلاناً: فلاّنکەس چقڵی لەفلاّنکەس رۆکرد، بەچقڵ لێی دا ٥ ئەزیەتی دا، دەگوترێ: (لا تشوكك مني شوكة): لەمنەوە هیچ زیانێکت پێ ناگا.

**شاكَ** الشجرُ وغيرُه شوكاً: درەختەکە چقڵی دەرکرد یان چقڵی زۆر بون.

**شاكَ** الرجلُ: پیاوەکە شکۆمەندیو پیاوەتی دەرکەوت.

**شاكَ** ثدي الفتاة: مەمکی کچەکە سەریان هەڵدا، کچەکە بناغەی مەمکی دانا.

**شاكَ** فلان الشوكَ: فلانکەس کەوتە ناو چقڵو چاڵەوە.

**شيكَ** الجَسَدُ: جەستەکە چقڵی تێدا رۆچوو، یان نوخاعی شەوکی توشی نەخۆشی بوو ٥ أشاكَ الشجرُ: درەختەکە چقڵی دەرکرد ٥ أشاك فلاناً: چقڵی لەفلان دا ٥ شَوَّكَ الزرعُ: کشتو کاڵەکە سەری دەرهێنا ٥ شَوَّكَ الفرخُ: بێچوە باڵندەکە پەرو پۆڵی لێ روا ٥ پەرەکانی سەریان دەرهێنا ٥ شَوَّكَ الرأسُ: سەری توکی لێ هات، یان دوای تاشین مووەکانی سەری هاتنەوە ٥ شَوَّكَ شارِب الغلام أو عذاره: سمێڵی گەنجەکە زبر بوو، یان لاجانگی زبر بوون ٥ شَوَّكَ فلاناً بالشوك ونحوه: چقڵی لەفلاّنکەس رۆکرد، بەچقڵ لەفلاّنکەسی دا ٥ شَوَّكَ الحائطَ: چقڵی بەدەوری دیوارەکەدا رایەڵ کرد یان بەسەر دیوارەکەدا چقڵی رایەڵ کرد ٥ الشائِكُ: چقڵاوی ٥ کارێک کێشەو ناخۆشی لەسەر بێ، دەگوترێ: (أمر شائك أو موضوع شائك): قورسو گرانو زیان بەخشە، دەشگوترێ: (رجل شائك السلاح): پیاوێکە پرچەکو سیلاحە، یان تەلی درکاوی بەدەوری ماڵو جێگەوپێگەی ٥ الشَّوْكُ: چقڵ کەلەدرەختو روەك دێتە دەر رەقو سەرتیژە ٥ الشَّوكاءُ: (حُلّة شوكاء وبردة شوكاء): کەواو عەباو پاڵتۆیەکی زبرە هەموو بەتازەیی دێتە بەرچاو ٥ شُوكَة العقرب: جزوی دوپشك ٥ هەروا وشەی (الشوكة)بەمانا چەكو هێزو تواناو زەبرو زەنگ دێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو ئامێرەی جۆلاو تەونکار رایەڵو پۆی چنراوو تەنراوەکەی پێ سفتو لوس دەکا ٥ هەروا ناوە بۆ چەتاڵی میوەو گۆشت خواردن شتێکە وەکوو کەوچك سەرەکەی وەکوو شانە پەل پەلە ٥ سوراییەکە لەسەردەمو چاوو جەستە پەیدا دەبێ ٥ الشَّوكي: هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای چقڵ ٥ (الحبل الشوكي او النخاع الشوكي): بەشێك لەکۆئەندامی دەماری کەلەناو بۆری فەقەراتو بربرەی پشت دایە ٥ (التين الشوكي): رومکێکی چقڵاوییە لەپێری (الشوكية)یە.

**شالَ** الشيئُ شولاً وشَوَلاناً: شتەکە بەرز بۆوە.

**شال** الميزانُ: تایەکی تەرازووەکە سەری کرد، بەرز بۆوە، دەشگوترێ: (شال ميزان فلان): لەخۆ هەڵئانەوەو شایی بەخۆبون دا فلان بالادەست بوو ٥ (شالت نعامة فلان): فلانکەس خێرا تورە

بوو پاشان رقەکەی نیشتەوە ۵ (شالت نعامة القـوم): یەکیـەتی‌و تـەبایی قەومەکـە نـەماو فەوتا.

**شال** الرجلُ یدیه: پیاوەکە دەستی هەڵبڕی ۵ شالت الناقة بذنبها: حوشترەکە کلکی هەڵبڕی ۵ شاولَ الشیئ: شتەکەی بەرز کردەوە ۵ شاوِل فلان قرنه: فلانکەس هاوشانەکەی خۆی تورەکرد، وای کرد دەماری بەرز ببنەوە رقی هەڵسێ ۵ شَوَّل الشائِلُ: شلەمەنییەکە کەم بوو، دەگوترێ: (شَوَّلَ لبن الناقة): شیری حوشترەکە کەم بوو ۵ شَوَّلَت الدوابُّ: ئاژەڵەکان لەبرسان سکیان بەپشتیانەوە نووسا ۵ شَوَّلَ فی المزادة: لەکوندەکەدا شتێکی کەمی ئاو هێشتەوە ۵ إنشال: بەرز بۆوە، بۆ موطاوعەی (شاله)دێ ۵ تشاولَ القوم عند القتال: خەڵکەکە بەرامبەر بەیەك چەکیان هەڵگرت ۵ هەرتاقمەو بەرامبەر بەیەك وەستان ۵ الشائِلُ: هەرشتێك بەرز بکرێتەوە ۵ حوشتری بەکەڵ کە کلکی بەرز دەکاتەوە بۆ حوشتری نێر ۵ الشائِلة: مێینەی (الشائِل)، دەگوترێ: (فرس شائلة) ۵ هەروا بەحوشترێك دەگوترێ: دوای بێچو بون گوانی هەڵکشێنەوەو شیری کەم بێ ۵ الشالُ: جۆرە پۆشاکێکە وەکوو دەسماڵی ئافرەت لەسەر شانەوە سنگ‌و بەرۆکی پێ دادەپۆشرێ، یان دەکرێ بەمێزەرو گودرەو لەچکە ۵ هەروا ناوە بۆ جۆرە ماسییەکی روباری نیل ۵ الشَوْلُ: باقی ماندەی شیر لەبنکی گوانی ئاژەڵ دا ۵ باقی ماندەی ئاو لەبنکی جام‌و پەرداخ دا ۵ ئاوی کەم ۵ الشَوِلُ: گورج‌و گۆڵ‌و چوست چالاك لەئیش‌و کاری خۆی دا ۵ الشَوْلَةُ: ئەو ئەندازە کلك‌و چزوەی کە دوپشك بەرزی دەکاتەوە ۵ فاریزەو کۆما کە لەنێوان رستەو وشەکان دەنوسرێ بۆ روون کردنەوەی مەبەست ۵ هەروا مەنزڵ‌و قۆناغێکە لەمەنزڵەکانی مانگ ۵ دوو ئەستێرەی بەرامبەر بەیەکن لە بورجی عەقرەب دا پێیان دەگوترێ: (حُمَةُ العقرب) چونکە بورجەکە هەمووی لەشێوەی دوپشك دایە ۵ الشَوَّالُ: کەسێك بەرماوەی زۆر بێ ۵ هەروا ناوە بۆ یەکێك لەمانگەکانی عەرەبی کەبەدوا مانگی رەمەزان دا دێ‌و پێی دەگوترێ شەشەڵان ۵ الشَوَّالَةُ: ئافرەتی فیتنەو دوو زمان ۵ باڵندەیەکە کەلەفرین دا راست دەبێ کلکی دەجوڵێنێ ۵ هەروا وشەی (شَوَّالة) عەلەمی جینسە بۆ دوپشك ۵ المِشْوَالُ: ئامێری بەرزکردنەوە ۵ المِشْوَلُ: ئامێری بەرزکردنەوە ۵ داسی بچوك ۵ المِشْوَلَةُ: بەمانا (المِشْوَلُ)دێ ۵ الشَوْلَمُ: بروانە مادەی (شَلَم) ۵ الشَوْمُ: دارێکی رەقە بەکاردەهێندرێ بۆ دەسك لێ دروست کردنی ئامێرو شتی وا ۵ شَوَّنَ الغَلَّةَ: دانەوێڵەکەی تاقەت کرد، خەزنی کرد ۵ الشَّونَةُ: کۆڵینەو کەندو عەمباری دانەوێڵە ۵ هەروا ناوە بۆ جۆرە کەشتیەکی شەڕ لەکۆن دا بەکارهێنراوە ۵ الشَوَّان: ئەوکەسەی لێ پرسراوی کەندو عەمباری دانەوێڵەیە ۵ الشونیز: رەشکە؛ دانەوێڵەیەکە بۆ زۆر نەخۆشی دەرمانەو پێی دەگوترێ (حبة البركة).

**شاهَ** الشیئُ: شتەکە ناشیرین بوو.

**شاهَ** نفسُهُ الی كذا: نەفسی ئارەزوی ئەوەی کرد ۵ شاهت عینه: بەتیژی ووردیی بۆی روانی.

**شاهَ** الإنسانَ: ئادەمیزادەکەی بەچاو هەنگاوت.

**شَوِهَ** الشیئُ شَوَهاً: شتەکە شێوا، زاکا ۵ بەنرخ بوو بەرز بووە ۵ چاوی پیس کاری لێ کرد، یان توشی چاو ئێشەی توند بوو ۵ شَوْهَةُ: ناشیرینی

كرد ◊ تشوه له واليه: چاوی تیَ بڕی، زۆری سەیر کرد ◊ خۆی لیَ نەناس کرد ◊ تَشَوَّهَ فلان شاةً: فلانکەس مەڕێکی نێچیر کرد ◊ الأشوَهُ: ناشیرین و نەگلەوت ◊ خۆ بەزلزان و لارو لەنجەکەر ◊ چاو پیس و هەنگێو بەچاو، بۆ مێینە دەگوترێ: (شوهاء) هەروا ناوە بۆ تاقانە لەمەڕو بزن و ئاسک و ڕەشە ولاخ و کەرە کێوی ◊ الشّاةُ: پاشاو مەلیک ◊ هەروا ئەو شاوەلیکەی لەیاری شەترنج دا بەکاری دەهێنن ◊ شابَلّوط: شابەڕو جۆرە درەختێکە لەپێری داربەڕوو میصرییەکان پێی دەڵێن (أبو فَرْوَة) ◊ شاهنشاه: پاشای پاشایان، یان شای گەورە ◊ الشَّوْهَاءُ: ناشیرین و نەگلەوت ◊ ڕەزاگران ◊ الشُّوهَةُ: ناشیرین ◊ المَشَاهَةُ: زەوییەک مەڕو بزنی زۆر بیَ.

**شَوَى** اللحمَ وغيره شَيّاً: گۆشتەکەی برژاند بەئاگر.

**شَوَى** الماءَ: ئاوەکەی گەرم کرد.

**شَوَى** الشيءَ: لەشوێنی کاریگەری شتەکەی دا ◊ أشوى اللمحَ: گوڵەگەنمەکەی هەڵپروزاند، وای لیَ کرد بەکەڵکی برژاندن بیَ ◊ أشوى السَّعَفُ: لقە دار خورماکە زەرد بوو بەرەو وشک بوون دەچیَ ◊ أشْوَى فلان: فلانکەس شتی سوتاوو خراپی بۆ خۆی پەزمەندە کرد ◊ أشوى من الشيءِ: لەشتەکە هەندێکی هێشتەوە ◊ أشْوَى فلاناً: برژاوی دەرخواردی فلان دا ◊ أشْوَى الصَّيدَ وغيره: نێچیرەکەی نەهەنگاوت بۆی ڕاونەکرا ◊ شَوَّى فلاناً: شتی برژاوی دەرخواردی فلانکەس دا ◊ اشْتَوَى: بۆ موطاوعەی (شَوَّاهُ)دێ ◊ اشتوى اللحمَ: گۆشتەکەی بەبرژاوی هەڵگرت ◊ إشْتَوَى: بۆ موطاوعەی (شواه)دێ ◊ الشَّوَى: قەراخ و تەنیشتی جەستە، دەگوترێ: (فرس عبل الشَّوى): ئەسپێکی دەست و پەل قەوییە ◊ سەرگەورەیە ◊ پێستی بەدەرەوەیە ◊ تاکەکەی (شَواةٌ) ◊ باقی ماندەی شت و بەرماوە ◊ کاری ئاسان و بیَ ئەمودو کەمبایەخ ◊ گوتویانە (کل شيئ شوى ماسلم دينك وعرضك): هەموو شتێک ئاسان و کەم ئەمودە بەمەرجیَ ئایین و ناموست پارێزراو بیَ ◊ الشِّواءُ: برژاو ◊ الشَّواةُ: تاکی وشەی (الشَّوَى)یە ◊ الشُّوايَةُ: بەشێکی کەم لەزۆر، پارچەیەک لەشت ◊ پارچە گۆشتێک لەلاکە مەڕێک ◊ کوتە گۆشتێک لەحەیوانێکی سەر بڕوا ◊ الشِّوَايَةُ: پیشەی برژاندن، وەستای کەباب و شتی وا ◊ الشَّوَّاءُ: گۆشت برژێن و شت برژێن ◊ الشَّوِيُّ: برژاو ◊ الشُّوَايَةُ: ئامێری برژاندن، تاوەو شتی لەو جۆرە کە گۆشت و شتی وای تێدا ببرژێندرێ ◊ الشُّوَيَّةُ: پارچەی برژاو کوتە گۆشتی برژاو ◊ باقی ماندەی شت، بەرماوەی شت ◊ الشُّوَيَّةُ: بەشی کەم لەزۆر ◊ المَشوى: شوێنی برژاندن ◊ شاءَهُ شيئاً: ویستی، ئیرادەی کرد ◊ شاءَهُ الى كذا: ناچاری کرد بۆ ئەو شتە ◊ شيّأهُ على الأمر: بەمانا (شاءَهُ)دێ ◊ تَشَيَّأَ فلان: فلانکەس ڕقەکەی نیشتەوە ◊ الشَّيْئُ: شت، هەبوو، هەرشتێک کەمەندکێشی خەیاڵ ببیَ و بتوانی هەواڵی لیَ بدەی ◊ المَشِيئة: ویست و ئیرادە ◊ المُشَيَّأُ: ناچار کراو بۆ کار، بێگار پێکراو ◊ المُشَوَّهُ: جەستە نارێک و پێک بەزگماکی ◊ جەستە شێواو بە خۆرسک.

**شابَ** فلان شيباً وشَيْبَةً: فلانکەس سەرو ریشی سپی بوو◊ بەزۆری بۆ پیاو دەگوترێ: (أشْيَبُ) بۆ ژن (شَمطاء)دەگوترێ، هەروا دەگوترێ: (شابت رؤوس الآكام وغيرها): سەری کێوەکان بەفر دایپۆشین.

(کوێستانان خاڵخاڵ بەفری ناچێتۆ
ڤیبلەم تۆراوە ئاشتی نابێتۆ)

**أشابَ الرّجلُ**: پیاوەکە کوڕەکەی پیر بوو ٥ **أشابَ الكِبَرُ أو الحزنُ او الخوفُ فلاناً**: پیری، غەمو خەفەت، ترسو بیم فلانکەسی پۆڵکاندو موی سپی بوو ٥ **شَيّبَهُ**: بەمانا (أشابَهُ)دێ ٥ هەر لەم مانایەدایە کە (عبدالملك)ی کوڕی مەروان وتویەتی (شَيَّبني اعتلاء المنابر): چوونە سەر مینبەرو وتار خوێندنەوە پیری کردم ٥ **الأشيَبُ**: پیرو کەنەفت، دەگوترێ: (جبل أشيب): کێوی سەر بەبەفر ٥ (يوم أشيب): رۆژێکی هەورو هەلاواوی‌و ساردو سەرما ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (شيباء) ٥ **الليلة الشّيباءُ**: شەوی کۆتایی مانگ ٥ **الشَّيْبُ**: موی سپی، سپیایەتی موو ٥ **المَشيبُ**: تەمەنی پیری ٥ **الشّيتُ**: جۆرێکە لەقوماشی تەنك‌و شاش‌و گوڵگوڵاوی دروستکراو لە لۆکە، بەکوردی خۆمان پێی دەڵێن (چیت).

**شاحَ في الأمر شيحاً**: دڵسۆزیی لەکارەکەی دا نواند.

**شاحَ على حاجته**: بۆ ئیشی خۆی لێبڕاو، سووربوو لەسەر ئەنجامدانی ٥ **أشاحَ المكانُ**: زەوییەکە رووەکی (شيح)ی رواند ٥ **أشاحَ وجْهَهُ أو بوجهه**: روی خۆی لێ وەرگێڕاو نارازیبوونی خۆی دەرخست‌و بەهیچ‌و پوچی لەقەڵەم دا ٥ **الشائحُ**: پیاوی ئازاو چاونەترس، وریاو ئاگادار ٥ **الشّيْحُ**: روەکێکی هەمەجۆری دەشتەکییەو بۆنێکی خۆشی کەسکونی هەیە، ئاژەڵ حەزی لێیەتی‌و دەیخوا.

**شاخَ الإنسانُ شيخاً وشيوخة وشيخوخة**: ئادەمیزادە کە پیربوو کەوتە ساڵەوە.

**شاخَ النّباتُ**: روەکەکە ناوەوەی وشك‌و گەندەڵ بوو ٥ **شَيَّخَ**: بەمانا (شاخ)دێ ٥ **شيّخ فلاناً**: بەوشەی شێخ بانگی فلانکەسی کرد ٥ **شَيَّخَ عليه**: رەخنەی لێ گرت، ناوی زڕاندو ئابڕوی برد ٥ **تَشَيَّخَ**: خۆی بەپیرو پەککەوتە نیشان دا ٥ **الشُّيّاخ**: ئەوکەسەی زوو پیریی لێ دیاریی دەدا، پێگەیشتن‌و کامڵ بوونی ئاسایی نەبێ ٥ **الشّيَّاخة**: پلەو پایەی شێخ‌و ریش سپی عەشیرەت، سنووری فەڵەمڕەوی‌و دەست رۆیشتنی سەرەك هۆز ٥ **الشَّيْخُ**: پیرەمێرد، بەزۆریی لەتەمەنی پەنجا ساڵییەوە پیریی دەست پێدەکا ٥ پلەو پایەیەکە دەدرێ بەکەسێك لەناو هۆزو دەڤەردا رۆڵێکی کاریگەریی هەبێ‌و خاوەنی رەوشت‌و ئاکاری پەسند بێ‌و خزمەتی گەل‌و هۆزی بکا، خەڵکەکەش پابەندی فەرمان‌و ئامۆژگارییەکانی بن.

**شيخ البلد**: کوێخای گوند، ریش سپی شارو دەڤەر.

**شادَ البناءَ شيداً**: باڵەخانەکەی گەچکاریی کرد، بۆیەی کرد، لەبغی کرد، بەرزی کردەوە، هەڵی چنی ٥ **أشادَ البناءَ**: باڵەخانەکەی بەرزکردەوە ٥ **أشادَ بالشيءِ**: بەدەنگی بەرز وەسپی شتەکەی داو پێی دا هەڵگوت‌و لێ رازیبوونی خۆی دەربڕی ٥ ئاماژەی بۆکرد ٥ **أشادَ عليه**: ناوی زڕاند، بەخراپ باسی کرد ٥ **شَيَّدَهُ**: بەمانا (شادَهُ)دێ، بیناکەی قایم‌و قوڵ دروست کرد ٥ **الشِّيدُ**: هەرشتێك دیواری خانووی پێ لەبغ‌و گەچکاریی‌و بۆیەبکرێ ٥ **الشّيْرَجُ**: زەیتی کونجی ٥ **شَيَّزَ البُردَ أو الثوب ونحوه**: قوماشەکەی بەهێڵی سور خاڵخاڵ کرد ٥ **الشّيزُ**: دارێکی رەشی پتەوە، شانەو کاسەو قاپ‌و قاچاغی لێ دروست دەکرێ، وادەبێ خودی شانەو کاسەو شتەکانی تری کەلەو دارە دروست دەکرێن پێیان دەگوترێ (شيز) ٥ **أشاشت النخلة**: دارخورماکە

بەرەکەی هەڵ نەپێچاو دەنکی ناوەوەی خورماکانیان رەق نەبوو بوونە خورما وشکەڵو بەکەڵکی خواردن نەهاتن ٥ الـشّيشُ: دار خورمایەکە دەنکەکانی هەڵ نەپێچێ، یان بەرەکەی کزو لاوازبێ کەوشك ببێتەوە ببنە خورما وشکەڵ ٥ جۆرێکە لەیاری ریازە شمشێری کولو نەبڕی تێدابەکار دەهێندرێ بۆ پەراوەبێکردن‌و فێربوونی شەڕە شمشێر ٥ ناوە بۆ خودی ئەو شمشێرەی کولو نەبڕەو یارییەکەی پێ دەکرێ ٥ هەروەها ناوە بۆ شوشەی پەنجەرە، خودی پەنجەرەکە بەشێوەیەکی فەننی لەجیاتی پەردە کونکونی چوار گۆشەیان پاڵاوەیی تێدابێ کەسێبەر لەژورەکە بکاو نەهێڵێ هەتاو لەناوەوە بداو هەواش بەرێتە ژوور ٥ الشّيشاءُ: خورمایەك کاڵو کرچ‌و بیزۆك بێ ٥ الشيشَةُ: نێرگەلە کە بە کاربێ بۆ کێشانی توتن ٥ یان ناوە بۆ خودی شوشەی نێرگەلەکە ٥ أشاصت النخلةُ: دارخورماکە خورمای بیزۆکی بەرهەم هێنا، بەهۆی تەلقیح نەکردنەوە یان بەهۆی خراپ بەخێو کردن ٥ شایَصَ مُشايَصَةً وشياصاً: شەڕەنگێزو بەد رەوشت بوو ٥ شايَصَ فلاناً: قیزی لەفلان کرد ترۆی کرد ٥ شَيَّصَت النخلةُ: دارخورما بەری بیزۆك‌و وشکەڵی بەرهەم هێنا ٥ شَيَّصَ فلان الناسَ: فلانکەس نەزیەتی خەڵکی دا ٥ الشِّيصُ: خورمای بیزۆك‌و وشکەڵ بەهۆی باش تەلقیح نەکردن‌و خراپ بەخێوکردنەوە ٥ الشِّيصَاءُ: دەق بەمانا (الشِّيشاء)دێ.

**شـاط شَيطاً وشِياطَةً**: خەریك بوو بسوتێ، هەندێکی یان هەمووی نزیك بوو گڕبگرێ، دەگوترێ: (شاط الطعام): خۆراکەکە هەندێکی سوتا ٥ شاطَت القِدرُ ونحوها: مەنجەڵەکە هەندێ لەوخواردنەی تێدا لێ نرا بوو بەبنکیەوە نووسا، گەمڕەی کرد.

**شاطَ فلان**: فلانکەس فەوتا، تێدا چوو، خوێنی بەفیڕۆ رۆیی، دەگوترێ: (شاط دم القتيل): خوێنی کوژراوەکە بەفیڕۆ چوو ٥ أشاطَ الشيءَ: شتەکەی والێ کرد بسوتێ، خواردنەکەی والێ کرد بسوتێ ٥ أشاطَ فلاناً: فلانکەسی بەهیلاك برد ٥ أشاطَ دَمَ النبيحة: خوێنی کوشتییەکەی رژاند ٥ أشاطَ الحاكمُ دَمَ القتيل: دادوەر خوێنی کوژراوەکەی بەفیڕۆ دا ٥ أشاطَ اللحمَ على القوم: گۆشتەکەی پارچە پارچە کردو بەسەر خەڵکەکەدا دابەشی کرد.

**شَيَّطَ الشيءَ**: شتەکەی والێ کرد هەندێکی یان هەمووی بسوتێ.

**شَيَّطَ الجِلدَ**: پێستەکەی هەڵپرووزاند جی تووك‌و گمندەموی پێوە بوو هەمووی هەڵکرووزاند.

**شَيَّطَ اللحمَ**: گۆشتەکەی بەئاگر راداشت‌و چاك نەیبرژاند ٥ اشتاط عليه: زۆر رقی هەڵسا ٥ تَشيَّطَ: سوتا، هەڵپروزا ٥ تشَيَّط دم الرجل: خوێنی پیاوەکە لەرقا دەکولا، دەشگوترێ: (تَشيَّط به دمُهُ): خوێنی گەرم بوو، رقی هەڵسا ٥ استَشاطَ: بەمانا (إشتاط)دێ ٥ استَشاطَ الحمامُ: کۆترەکە بەجوست‌و چالاکی هەڵفڕی ٥ استَشاطَ في الحرب: لەشەڕدا گورج‌و گۆڵ بوو جانفیدایی نواند ٥ استَشاطَ في الضّحك: زۆر پێکەنی‌و خەریك بوو هەناسەی لێ بڕێ ٥ الشِّياط: بۆسۆ، بۆنی سوتاوی پەڕۆو لۆکەو شتی وا ٥ تَشَيْطَنَ: بڕوانە مادەی (شطن) ٥ الشيطان: بڕوانە مادەی (شطن) ٥ تَشَيْظَمَ عليه بالكلام: خێرا قسەی لەگەڵ کردو توند بوو ٥ الشَّيْظَمُ: شێر ٥ درێژ ٥ روگوشاد.

**شاعَ** الشيئُ شيوعاً وشيعاناً ومشاعاً: شتەكە بلاو بوومەوە دەركەوت.٥ **شاع** بالشيئ: شتەكەی بلاو كردەوە.٥ **شاع** الدارُ: خانوەكە هاوبەش بوو جیا نەكرابۆوە ٥ دەگوترێ: (اشترى داره على الشيوع): خانوی تێكەڵو نیفراز نەكراوی كڕی.٥ **شاعَ** الإناءَ: قاپەكەی پڕكرد ٥ لەدوعا كردن دا دەگوترێ: (شاعَكَ الخَيْرُ) خێرو خۆشی داتپۆشێ ٥ أشاعَ الشيئَ وبە: شتەكەی بلاو كردەوە دەری خست ٥ أشاع الدار ولحوها: خانوەكەی والێ كرد تێكەڵ بێو بەشەكانی لێك جیانەكرێتەوە نیفراز نەكرابێ ٥ أشاع بالقوم: بانگی خەڵكەكەی كردو هاواری لێ كردن، لێیان تورە بوو ٥ أشاع الله القوم بالسلام: پەروەردگار ئەمنو ئاسایشی بەسەر ئەو قەومەدا رژاند گشتگیری كرد بۆیان ٥ شايَعَهُ مشايعة وشياعاً: شوێنی كەوت، پشتگیری كردو هاوڕاو هاوبیری بوو ٥ شَيَّعَ: بەمانا (شاعَ)دێ ٥ شَيَّعَ فلان: فلانكەس بوو بە شوێنكەوتەی خەڵكی تر ٥ بوو بە شیعە مەزەب ٥ شَيَّعَ الزامرُ: زوڕنا ژەنەكە فوی بەزوڕناكەدا كردو لێی دا ٥ شَيَّعَتْ فلاناً نفسه: فلانكەس نەفسی تەمی خواردو بوو ٥ شَيَّعَ النارَ في الحطب: ئاگری خستە ناو دارەكانەوەو بلاوی كردەوەو خۆشی كرد ٥ شَيَّعَ الغَضَبَ فلاناً: رق هەڵسانو توڕەیی فلانكەسی كەمبایەخو بێ نمود كرد ٥ شَيَّعَ فلاناً: لەگەڵ فلانكەس چووە دەرو بەڕێی كرد، خودا حافیزی لێ كرد ٥ ویستی بیگەیەنێتەوە شوێنی خۆی، دەشگوترێ: (شَيَّعَ الجنازة): تەرمی مردوەكەی بەڕێ كرد، لەگەڵی رۆیشت بۆ سەر گۆڕستانو بەخاكی سپارد ٥ اشتاعا في كذا: لەوشتەدا هاوبەش بوون ٥ تَشايَعَ الأمرُ: كارەكە بلاو بۆوە ٥ تشايَعَ القومُ: هەندێ لەخەڵكەكە پشتگیری هەندێكیانیان كرد، یان بوونە چەند گروپو تاقمێك ٥ تَشَيَّعَ في الشيئ: لەحەزو ئارەزووەكانی خۆی دا سەری تێداچوو ٥ تَشَيَّعَ الغَضَبُ فلاناً: رق هەڵسانو توڕەیی فلانكەسی سوكو سەلیم كرد، لەپێش چاوی خەڵك رێزی دابەزی ٥ الإشاعة: بلاو بوونەوەی هەواڵی بێ بنەما ٥ الشائع: بلاوە بوو ٥ الشائعة: هەواڵی بلاوە بووی بێ بنەما ٥ الشَّاعُ: بەمانا (الشائع)دێ ٥ الشِّيَاعُ: بانگدان، بانگ لێ كردن ٥ ئامێری دەنگ گەورە كردن ٥ الشِّيْعُ: هاوشێوەو هاوشانو نزیك لەشێوەی ئەو، دەگوترێ: (آتيك غداً أو شيعه) یان دەگوترێ: (ثمنه شيع عشرين درهماً): نرخەكەی نزیكی بیست دیرهەمە ٥ الشِّيعُ: كەسێك ژنانی بێو زۆر تێكەڵی پێڕی ئافرەتان بێ، دەگوترێ: (هو شيع نساء) ٥ الشِّيْعَةُ: جۆرە درەختێكە لەبالای ئادەمیزاد كورت ترەو پەلەكانی گرێو گوڵیان زۆرەو گوڵەكەی لەگوڵی یاسەمین بچوكترە، رەنگی گوڵەكەی سورێكی تۆخەو بۆنی زۆر خۆشە پۆشاكی پێ پاك دەكرێتەوە ٥ هەنگوینی ئەم جۆرە گوڵە زۆر بەتامەو هەنگ هەلاڵەی لێ وەردەگری ٥ الشِّيعَةُ: فیرقەو كۆمەڵ، پێرو تاقم ٥ شوێنكەوتەو یارمەتیدەر ٥ هەروا دەگوترێ: (هم من شيعة فلان) ٥ شیعە جەماوەرێكی زۆری موسوڵمانانو رێزو خۆشەویستییان بۆ عەلی كوڕی ئەبو طالبو وەچەو نەوەكانی هەیەو پێیان وایە هەر كەسێك لەنەژادی عەلی بێ ئەو شیاوە بۆ خەلیفایەتی موسوڵمانان ٥ الشِّيعي: تاكی (الشيعة)یە ٥ بەیەكێك دەگوترێ لەپێڕی ئیمامی عەلی بێ ٥ الشِّيَعُ: هاوبەش لەشتی

موشـاع دا ٥ **الـشيوعية**: مەزهـەبو بـیرو بۆچونێـكە داوادەكـەن خاوەنـدارێتی مڵـكو سـامان هـەموانی بـێ مڵـكدارییەتی تایبـەتی نـەمێنێو هـەموو كـەس بەئەنـدازەی توانـای خـۆی ئـیش بكـاو بـەگوێرەی پێویـستی شـت وەربگرێ ٥ **الشیوعي**: كەسێـك نیـسبەت بـدرێ بۆ شوسیالیسی ٥ **المُشاعُ**: هەمە جۆرو هەموانیو بەرەڵا بـۆ هـەموو كـەس ٥ **المَشاعُ**: بـڵاوە بـوو، مڵـكی هاوبـەشو جیانـەكراوە ٥ **المِشْیاعُ**: بـۆ زیادە ڕەوی لەمانای بڵاو كردنەوەو دەرخستنی شت دا هاتووە ٥ **المِشْیَعَةُ**: تورەكە، سندوقێـكی بچوك یـان جانتایـەكی بـچوكە ئـافرەت هەنـدێ پێداویـستی خـۆی تێـدا هەڵـدەگرێ ٥ **المُشَیِّعُ**: كەسێـك زۆر لایـەنگرو شوێنكەوتووی هـەبن ٥ ئـازاو بەجـەرگو دلێـرو دڵ قـایم ٥ **الـشِّیقُ**: كەلەبەری نێوان دوو بـەرد ٥ ڕێـگای تەنگەبـەر ٥ **الـشیك**: چەكێـكی فـەرمی پـارە وەرگرتنـە كابرای خـاوەن پـارە كەلـەبانك داینـاوە فـەرمان دەكا بەبانكەكە بڕێـك لەپارەكەی بدەن بـەفلان ٥ **شَالَهُ بِهِ شَیلاً وَمَشالاً**: بـەرزی كـردەوە ٥ **الشَّیّالُ**: ئەسپێـكە بـاوكی ڕەسـەن بێو دایكی نارەسەن ٥ **الشَّیالَة**: پیشەی شت بەرزكردنـەوەو لابـردن ٥ كرێـی بـەرز كردنـەوەو لابـردن ٥ **الـشَّیَّالُ**: حـەماڵ ٥ كـوڵ هەڵـگر ٥ **الـشَّیَّالَة**: ئـامێری شت بەرزكردنـەوە ٥ كـرێن ٥ **المِشْیَالُ**: كەسێك جەستەی نارێكو پێك بێ ٥ ناقۆڵابێ ٥ **الشِّلْمُ**: بڕوانە (شَلَم).

**شام فـلان شـیماً**: فلانكـەس خـاڵ لەسـەر پێـستی دەركـەوت.٥ **شـامَ الـسحاب والـبرق**: تەماشـای هـەورو بروسكەكەی كـرد ئـاخۆ لـە كوێ بـاران دەبارێنێ.٥ **شام مخایل الشيء**: بـەوردی ڕوانـی بۆ شوێنی گوماناوی شتەكە .

**شامَ الشيءَ**: شتەكەی ئامادەكردو مەزندەی كرد.

**شَیِمَ شَیماً**: خاڵ لەسەر جەستەی دەركەوت ٥ خاڵ بەجەسـتەیەوە بـوو ٥ زۆری خـاڵ پێـوە بـوو، موحەممەدی ماملێ دەڵێ:

دەبارێ هەی دەبارێ دەبارێو كرێوەی دەكـــا
لەسەر سینگی كەژاڵێ خاڵەو بانگی خاڵ دەكا

**شَیَّمَ یدیه في رأس فـلان أو ثوبـه**: بەهـەردوو دەسـتی سـەری فلانـی گـرت یـان یەخـەی گـرت شـەڕی لەگەڵ كرد ٥ **تَشَیَّمَ الـشيءَ غـیه**: شـتەكە بـەناو غـەیری خـۆی دا بـڵاو بـۆوە، دەگـوترێ: (تَـشَیَّمَ الحریـق القـصب): ئـاگر بـەناو پـەرێزو پوشـو پەلاشەكەدا بڵاو بۆوە ٥ (تَشَیَّمَ الشَّیْبُ الرجـلَ): پیری بەناو جەستەی فلان دا بڵاو بۆوە ٥ **تَـشَیَّمَ فـلان أبـاه**: فلانكـەس سـەری لـەبابی خـۆی دا لەئـەخلاقو ڕەوشـت دا ٥ **الـشَّامَةُ**: خـاڵ؛ نیـشانەیەكە لەجەسـتەدا ڕەنگـی جودایـە لـەڕەنگی پێـستی، هـەتا خاڵەكـە ڕەش تربـێ جوانترە، دەگـوترێ: (كـأنهم شـامة في النـاس): ئەوانـە ئاشـكراو دیـارن لەناوكەسـانی تـردا ٥ (شامة القمر): ئەوتـەڵخیو ڕەشـییەیە لـەڕوی دا دەبینـدرێ ٥ **الـشَّیَمُ**: زەوییـەك لەبـەر ڕەقـیو توندی هەڵكەندنی زەحمەت بێ ٥ **المَشِیمَةُ**: ئـەو پـەردە دەرەكییەیـە كـە زارۆك لەمنداڵـدانی دایكـی دا تێیدایـە لەگـەڵ لـەدایكبوونی دێتـە دەرەوە ٥ **شَانَهُ شَیْناً**: ناشـیرینی كـرد، ڕەخنـەی لـێ گـرت ٥ **الـشَّیْنُ**: عـەیبو ناشـیرینی، پێـچەوانەی جوانییـە ٥ **المـشاین**: عـەیبو ناشیرینی جۆراو جۆر ٥ **الشَّاي**: چا؛ ڕوەكێـكە بـەزۆری لـەولاتی سیلانو ولاتـانی تـری ئاسیا دەروێنـدرێ گەلاكـەی وشـك دەكـرێو دەكوڵێنـدرێو شـەكری تێـكەڵ دەكـرێو دەخورێتەوە.



**الــصَّادُ**: پیتــی چــواردەهەمی پیتــەکانی هیجایــە، شــوێنی هاتنــە دەرەوەی کــەناری زوبــانو لای ژوروی ددانــی پێــشەوەی ســەرو وە، بەتــەواوەتی پێــشەوەی مەلاشــو دادەگــرێ ٥ نــاوی سورەتێــکی قورئانیشە.

**صَــئِبَ صَــأباً**: زۆری نــاوخواردەوە ٥ شــەرابی زۆری خواردەوە ٥ بەتەواویی تێراو بوو.

**صَئِبَ الرأسُ**: سەری رشکی زۆری هەڵ هێنا ٥ سەری رشکاویی بوو ٥ **أصأبَ الرأسُ**: بەمانا (صَئِبَ) دێ ٥ **صَأصَــأ الجــروُ**: توتکــە ســەگەکە هــەوڵی چــاو هــەڵێنانی داو هێــشتا چــاوی بــۆ هەڵنــەهاتوون ٥ **صَأصَأ الرجلُ**: پیاوەکــە ترسنۆك بــوو دەگــوترێ: (صَأصَأ من فلان) لەفلاَنکەس ترساو گەردنکەچی بوو ٥ **تصَأصَأ منه**: بەمانا (صَأصَأ) دێ.

**صَئِكَ الــشَيئ صــأكاً**: شــتەکە بۆگــەنی کــرد بــەهۆی عــەرەق کردنــەوە یــان بــەهۆی تەرەشــوح و تەڕبوونەوە.

**صَئِكَ الدمُ**: خوێنەکە خەست بۆوە.

**صَئِكَ الشَّيئ بغيره**: شتەکە بەغەیری خۆیەوە نووسا ٥ **صَــأكَة**: شــەتەکی دا ٥ **الــصَّأكَة**: بــۆنی کــەروی دارە کە بە هۆی تەڕبوونەوە برزێ و کەڕو بێنێ ٥ بۆگەنی عەرەق.

**صَــؤُلَ الــبَعيرُ صــآلةً**: حوشــترەکە جــەو جــۆڵ و رەوینەوەو راپەڕینی زۆر بوو (فهو صَؤُول).

**صَأَي الفرخُ ونحوه صَئِياً**: بێچووەکە هاواری کرد ٥ بەکەسێــك کــە ســتەمیش بکــاو شــکوای هــەبێ، دەگــوترێ (تلــدغ العَقــربُ وتــصأى) دووپــشك پێوەش دەداو دەش قیژێنێ ٥ **تصَأَى**: زێدە رەوی کرد لە هاوارکردن و دادو فیغان دا ٥ **الصّأَةُ**: ئەو ناوەی لەگەڵ منداڵبون دا دێتە دەرەوەو هەندێکی دەمێنێتەوە.

**صَبَأَ النابُ ونحوهُ صُبوءاً**: ددانەکە سەری دەرهێنا ٥ کەڵبەکە دەرکەوت.

**صَبَأَ من شيئ الى شيئ**: لە شتێکەوە گواستیەوە بۆ شتێکی تر ٥ دەگوترێ: (صَبَأَ الرجُلُ) پیاوەکە لە ئایینی خۆی وەرگەڕاو چووە سەر ئایینێکی تر.

**صَبَأَ عليــه**: لــە فــەرمان و کۆنتڕۆڵی ئــەو دەرچوو ٥ هێرشی کردە سەری، لێی ڕاپەڕی ٥ **أصــبَأَ النــابُ ونحــوهُ**: ددانەکــە ســەری دەرهێنــا ٥ کەڵبەکــە دەرکەوت ٥ **أصبَأَ على القوم**: هێرشی کــردە ســەر خەڵکەکەو پەلاماری دان و بەباشی شوێنەکەیان نازانــێ ٥ **الــصابئون**: کەسانێــکن واز لــە ئــایینی خۆیان دێنن و ئایینێکی تــر وەردەگرن ٥ تــاقمو پێرێکن ئەستێرە دەپەرستن و پێیان وایە ئــەوان لەســـەر ئـــایینی حـــەزرەتی (نـــوح)ن، رۆگـــەو قیبلەیان شوێنی هەڵکردنی بای شەماڵە لەکاتی نیوەڕۆدا.

**صَــبَّ الرجــلُ في الــوادي صــبيباً**: پیاوەکــە بــە دۆڵ و شیوەکەدا سەرو ژێر بۆوە.

**صَبَّ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا.

**صَــبَّ المــاءَ ونحوه**: ئاوەکــەی هەڵڕژانــد ٥ دەگــوترێ: (صَبّ عليه العذاب) سزای بەسەردا باراند.

**صَبَّ الرَّجُلَ**: في القيد: پیاوەکــەی لــەزنجیردا پێوەنــد کرد.

**صَبَّ عليه درعَهُ**: زرییەکەی لەبەرکرد.

**صَبَّ فلاناً على الأمر**: فلانکەسی بۆ کارەکە هەڵنا.

**صَبَّ الكلبَ على اللّصِّ**: سەگەکەی لە دزەکان بەردا.

**صَبَّ رَأسَهُ**: سەری دانەواند، سەری شۆڕکردەوە.

**صَبَّ اليه صَبابَةً**: حەزی لێ کرد عاشقی بوو ٥ **أصَبَّ القومُ**: خەڵکەکە سەرەو ژێر بوونەوە ٥ **إنصَبَّ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا ٥ دەشگوترێ (إنصَبَّ الناس على الماء): خەڵکەکە هەڵڕژانە سەرئاوەکە، لەوێ کۆبوونەوە ٥ **إنصَبَّ البازي على الصيد**: هەڵۆکە پەلاماری نێچیرەکەی دا ٥ **إصطَبَّ**: هەڵڕژا ٥ **إصطَبَّ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵڕژاند ٥ **إصطَبَّ الصبابة**: بەرماوەی بنکی پەرداخەکەی خواردەوە ٥ بنکڕی پیاڵەکەی هەڵقوڕاند ٥ **تَصابَّ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵڕشت ٥ دەگوترێ: (تصابَبتُ الشيء): کەم کەم شتەکەم وەدەست هێنا ٥ **تَصَبَّب الماء من فوق**: ئاوەکە لەسەرەوە هەڵڕژایە خوار ٥ **تَصَبَّب وجهُهُ عرقاً**: روخساری چین چین ئارەقی ڕشت ٥ دەمو چاوی ئارەقی زۆریان دەردا ٥ **تَصَبَّب الصبابَةَ**: جۆری بنکی پیاڵەکەی خواردەوە ٥ هەڵی چۆڕاند ٥ **الصَّبابَة**: شەوق و ئارەزوو ٥ دڵنەرمی و سۆزو بەزەیی ٥ عیشقی گەرم کە عاشق بتوێنێتەوە ٥ **الصُّبابَة**: بەرماوەی کەم لە بنکی پیاڵەدا جا ئاو بێ یان شلەمەنی تر ٥ **الصَّبُّ (ماءٌ صَبٌّ)**: ئاوێکە ڕژاو، هەڵڕژاو ٥ دەشگوترێ (أخذ مائةً فصاعداً): سەدو کەمتری هەڵگرت.

**صُبَّ عليه**: بەڵاو کارەساتی بەسەردا بارین ٥ **الصَّبَبُ**: زەوی سەرەوخوار ٥ **الصُّبَّةُ**: عەشق و خۆشەویستی ٥ کۆمەڵ و پێرو تاقم ٥ خۆراک و تێشوی ڕێبوار ٥ **صُبَّةٌ من الناس**: کۆمەڵێک لە ئادەمیزاد ٥ **صُبَّةٌ من الليل**: بە شێک لە شەو.

**الصَّبيبُ**: هەر شتێک هەڵڕژێندرێ ٥ **صَبيب السيف**: کەناری شمشێر ٥ **المَصَبُّ**: شوێنی لێ هەڵڕژان ٥ **مَصَبَّ النهر**: ئەو شوێنەی ئاوی ڕوبار تێکەڵ بە ئاوی دەریا دەبێ.

**صَبَحَ صَبحاً**: بەیانی هات بۆلای ٥ بەیانی پەلاماری دا ٥ پیاڵەکەی بەیانی پێشکەش کرد ٥ **صَبَّحَ القومَ**: دەمەو بەیان هێرشی کردە سەر گەلەکە ٥ بەیانی بردنی بۆ سەرئاو خواردنەوە ٥ **صَبَّحَهُم**: بەیانی توشی خێری کردن یان توشی شەڕ.

**صَبِحَ الشَّعرُ صَبحاً وصُبحةً**: سورایی تێکەڵ سپیایی قژەکانی بوو ٥ قژی ماش و برنج بوون.

**صَبِحَ الحديدُ**: ئاسنەکە بریسکەی لێوەهات ٥ (فهو أصبح وهي صبحاء)

**صَبُحَ الوجه صباحة**: روخساری گەشایەوە، جوان بوو ٥ **أصبَحَ**: کەوتە بەیانییەوە ٥ **أصبحَ الحَقُّ**: حەق و راستی دەرکەوت ٥ گۆڕا لە حاڵەتێکەوە چووە سەر حاڵەتێکی تر ٥ **أصبح المِصباحُ**: چراکەی هەڵکرد ٥ **صَبَّحَ القومُ**: لەبەرەبەیان دا هێرشی کردە سەر قەومەکە ٥ **صَبَّحَ فلاناً**: بەیانی باشی لە فلانکەس کرد ٥ **إصطَبَحَ فلان**: پیاڵەمەی بەیانی خواردەوە پیاڵە شەرابی بەشەو ئامادەکراو بۆ بەیانی ٥ چراکەی خۆش کردو روناکی خستە ناو ماڵەکەوە ٥ **تَصَابَحَ**: روخۆشی بەسەرخۆیدا هێناو خۆی وا نیشان دا کەیفخۆش و بێ خەمو خەیاڵە ٥ **تَصَبَّحَ**: بەیانی نوست ٥ بەرکوڵی ژەمە خواردنی خوارد واتە: زەڵاتەو تەوابیل و شتی لەو جۆرە ٥ **إستَصبَحَ**: چراکەی خۆشکرد، روناکی بڵاوکردەوە ٥ **إستَصبَحَ بالزيت ونحوه**: بەهۆی زەیتەوە رووناکی چراکەی درێژە پێدا ٥ **الإصبَاحُ**: سەرەتای رۆژ ٥ بەیانی و کازیوە ٥ **الصَّابِحُ** ٥ دەگوترێ:

(حقٌ صابحٌ) حەقو مافێکی ئاشکرایە ٥ ألصابح من الطعام: خواردنی تازە ٥ الصَّباحُ: سەرەتای رۆژ، بەیانیو کازیوە ٥ دەشگوترێ: (أتاه صَباحَ مَساءَ) هەمیشە دەهاتە لای ٥ الصُّباحُ: گڕی چراو قەندیل ٥ الصُّباحي من الدم: خوێنی زۆر سوور ٥ الصُّباحية: بەیانی شەوی یەکەمی بووکو زاوایی ٥ الصُّبحُ: سەرەتای رۆژ، کازیوەی بەیانی ٥ الصُّبحانُ: روکراوەو رووخۆشو روناك ٥ مەیخۆرەوەی بەیانیان ئەو کەسەی بەیانی پیاڵەی شلەمەنی دەخواتەوە ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ (صَبحي) ٥ (فعلان، فعلی) ٥ الصُّبحة: نووستنی بەیانیان، بەرکوڵو خواردنی ئەو شتانەی پێش نان خواردن ئیشتیها دەکەنەوە ٥ الصَّبوحُ: شەرابی بەیانی ٥ مەیخواردنەوەی بەیانیان ٥ ئەو شلەمەنیو خواردنەی بەیانیان دەخورێ ٥ ژەمی ئێواران پێی دەگوترێ (غَبوق) ٥ ألصَّبیحة: بەیانی، کازیوە ٥ المِصباحُ: چراو گڵۆپو هەرشتێك لەو جۆرە ٥ مصابیح السماء: ئەستێرەی ئاسمان ٥ المِصبَحُ: بەمانا (المصابیح) دێ ٥ (ك: مصابح).

صَبَرَ صبراً: دانی بەخۆی داگرتو ورەبەرزو دڵ قایم بوو ٥ پشوو درێژ بوو، بەئارامی چاوەڕوانی کرد ٥ دەگوترێ

صَبَرَ علی الامر: لەسەر ئیشەکە خۆی گرتو پشوو درێژ بوو ٥ هاتو هاواری نەکرد.

صَبَرَ عنه نفسه: خۆی لێ ممنع کرد، نەفسی خۆی لێ گرتەوە ٥ نەفسی خۆی کۆنترۆڵ کرد.

صَبَرَ البُرَّ: گەنمەکەی کۆمەڵ کرد، خڕی هەڵدا.

صَبَرَ فلاناً: فلانکەسی حەبس کرد، لەگەڵی کەوت ٥ أصبَرَ الطعام: خواردنەکە تاڵ بوو ٥ أصبَرَ فلاناً: فلانکەسی وا لێ کرد خۆگرو بەغیرەت بێ ٥ ورە بەرزو لەسەر خۆبێ ٥ صابَرَهُ مُصابَرةً وصِباراً: لە خۆڕاگرتنو پشوو درێژیدا بەسەریدا بالادەست بوو ٥ صَبَّرَهُ: داوای لێ کرد خۆڕاگرو پشوودرێژ بێ ٥ صَبَّرَ البُرَّ: گەنمەکەی کۆمەڵ کۆمەڵ کرد ٥ صَبَّرَ الجُثَّةَ: جەستەکەی مۆمیاکرد بۆئەوەی بۆماوەیەك نەرزێ ٥ لەکۆن دا ئادەمیزاد بەهۆی جەوتو تاڵو تفتەوە کاری مۆمیاو دەباغو شتی وایان ئەنجام داوە ٥ إصطَبَرَ: بەمانا (صَبَرَ) دێ ٥ تَصَبَّرَ: نەفسی خۆی هەڵنا بۆ خۆڕاگریو پشو درێژی ٥ خۆڕاگریو ئارامگرتنی بەسەر خۆیدا هێنا ٥ إستَصبَرَ: گەنمی کۆمەڵ کۆمەڵ کرد ٥ دەگوترێ (استصبر الطعام) خۆراکەکە گرد بۆوە ٥ تاڵ بوو ٥ التَّصبیرةُ: بەرکوڵو ئەو جۆرە خواردنەیە کە کابرای برسی خۆی پێوە دەخافڵێنێ تا خواردنە سەرەکییەکەی بۆ ئامادە دەبێ ٥ الصَّابورة: ئەو قورساییەیە دەخرێتە ناو کەشتییەوە بۆ ئەوەی لەرە لەر نەکات ٥ الصُّبارة: قفڵو بەلوعەو سەرقاپو تۆپەوانەی گۆزەو کەندوو تەنکی و شتی وەها ٥ الصَّبارة: سەرمای کوشندە ٥ ألصَّبَّار: کەسێك زۆر خۆگرو ورە بەرزو پشوو درێژ بێ ٥ هەرواناوە بۆ روەکێکی دەشتەکی، گوشراوەکەی زۆر تاڵەو گەڵاکەی پانو ئەستوورە، هەمیشە سەوزو ئاودارەو چقڵی هەیە ٥ ألصَّبُورُ: ورە بەرزیو دامەزراویو خۆگر لەبەرامبەر کارەسات دا ٥ خۆگریی لەسەر دوورکەوتنەوەی خۆشەویستو لەدەست دانی، یان خۆگریی لەسەر ئەزیەت دانو ئازار بەبێ ئاخو ئۆف کردن ٥ دەگوترێ: (قتله صبراً) بەندی کرد تا مرد ٥ (شهر الصبر) مانگی رۆژوو، مانگی رەمەزان ٥ ألصُّبرُ من الشيء: لای ژووروی شت ٥ بەمانا شتەکە ٥ دەگوترێ (ملأ الكأس الى أصبارها) پیاڵەکەی تا

لای سەروی پڕکردووە ٥ لێوان لێوی کردووە ٥ (أخذ الشيء بأصباره) شتەکەی هەموو هەڵگرت ٥ الصِّبْرُ: گوشراوی درەختی تاڵ ٥ الصُّبَرَةُ: بەمانا (الصُّبَارة) دێ ٥ الصُّبْرَةُ: کۆمەڵە دانەوێڵە ٥ کۆمەڵە خواردەمەنی ٥ دەگوترێ: (اشترى الطعام صُبْرَةً) خواردەمەنییەکەی بە کۆترەو بە کۆمەڵ کڕی ٥ بەبێ پێوان و کێشان خۆراکەکەی کڕی ٥ الصَّبور: کەسێك بەسروشت خۆڕاگرو ورە بەرزو دامەزراو بێ ٥ ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ ماناکەشی ئەوەیە: پەلە ناکا لە تۆڵەسەندنەوە لە تاوانبار ٥ الصَّبِيرُ: هەوری سپی و پڕ ٥ کێو ٥ (ك: صُبُرٌ) ٥ بەمانا گەورەو سەرکردەی گەل و نەتەوەش دێ ٥ المَصْبُور: کەسێك بەهۆی تاوانی کوشتنەوە بەندکرابێ.

صَبْصَبَ الشيءَ: شتەکەی بڵاو کردەوە، لێکی جیاکردەوە ٥ تَصَبْصَبَ الشيءُ: شتەکە بڵاو بۆوە ٥ کەمێکی لێ مایەوە ٥ دەگوترێ: (تَصَبْصَبَ ما في السقاء) کەمێك ئاو لە کوندەو کوپەو شتی وا ماوە ٥ (تَصَبْصَبَ الليلُ) شەو کەمێکی ماوە ٥ الصُّبْصابُ: مانەوەی کەمێك لە ئاو و شەراب لە بنکی پیاڵەدا.

صَبَغَ بە و صَبَغَ عليه صَبغاً: بەقامك و بەشێوەی گاڵتە پێکردن ئاماژەی بۆ کرد ٥ بەشێوەی گاڵتە ئامێز قامکی بۆڕا داشت.

صَبَغَ في الشيء: قامکی خستە ناو شتەکەوە ٥ دەشگوترێ: (ما صَبَغَ في الطعام): قامکی نەخستۆتە ناو خواردنەکەوە.

صَبَغَ فلاناً: قامکی فلانکەسی هەنگاوت.

صَبَغَ فلاناً على الشيء: بەقامك فلانکەسی شارەزا کرد بۆ شتەکە، قامکی بۆ ڕاداشت بۆلای شتەکە.

صَبَغَ الاناءَ: ئەوەی لەناو قاپەکەدا بوو لەنێوان دوو پەنجەوە ڕژاندی بۆ شوێنی پێویست بۆ ئەوەی نە پڕژێ و بڵاو نەبێتەوە.

الإصبَعُ و الأُصبُعُ: یەکێك لە پەنجەی دەست یان پەنجەی قاچ ٥ هەروا ناوە بۆ شوێن دەست و ئاسار ٥ لەبواری کیمادا بەمادەیەك دەگوترێ بە شێوەی کۆڵەکەو ستوون قەبارە ببەستێ ٥ الأُصبوعُ: بەمانا (الإصبَع) دێ.

صَبَغَ الثوبَ ونحوه صَبغاً: قوماشەکەی ڕەنگ کرد.

صَبَغَ الشيءَ: شتەکەی نوقم کرد ٥ لە شلەمەنیەکەی هەڵکێشا ٥ دەگوترێ: (صَبَغَ يده في الماء) دەستی خستە ناو ئاوەکەوە نوقمی کرد (صَبَغَ اللقمة في الإدام) پاروەکەی لە پێخۆرەکەدا نقوم کرد.

صَبَغَ الحديث: قسەکەی تێکەڵ بە درۆو دەلەسە کرد ٥ دەگوترێ (صَبغوني في عينك) سەرنج و رای تۆیان بەرامبەر بە من بەشێوەی خراپ گۆڕی.

صَبَغَ النصراني ولده: کابرای نەصرانی منداڵەکەی خۆی لە ئاودا نقوم کرد لە ناو ئاوی (معمودیة)دا ٥ أصبغت النخلةُ: خورماکە ئاڵ و بۆڵی تێ کەوت، گەیینی لێ دیاری دا ٥ صَبَّغَت البُسرَةُ: پێگەیین و گەیشتنی خورماکە دەرکەوت ٥ دەشگوترێ (صَبَّغَت النخلة) بەهەمان مانا ٥ صَبَّغَ الثوبَ: قوماشەکەی بۆیە کرد ٥ إصطبَغَ بكذا: بەوشتە ڕەنگی کرد ٥ إصطبغ بالأدام: بە پێخۆرەکە نانەکەی چەور کرد ٥ پێخۆرەکەی لە نانەکە هەڵسوو ٥ تَصَبَّغَ في دينه وبدينه: لە ئایینی خۆیدا دامەزراو بوو ٥ الصَّبَاغ: ئەو شتەی قوماشی پێ بۆیە دەکرێ یان شتی تر ٥ هەروا ناوە بۆ پێخۆری شل ٥ صِباغ الدم: لەبواری پزیشکی دا مادەیەکە دەبێتە هۆکاری پەیدابوونی

رەنگــی خــوێن ◊ الـصِّباغة: بۆیەچـییەتی، خەمچیەتی ◊ الصَّبّاغ: کەسێـك نیشی بۆیـەکردن بێ پیشەی بۆیە چییەتیو رەنگ کردنی قوماش ◊ دروژن ◊ الـصِّبْغُ: بۆیــەو رەنــگ ◊ پێخــۆر ◊ هەروا ناوە بۆ شتی رەنگ کراو ◊ الصِّبغة: ئەوەی شتی پی رەنگ دەکرێ ◊ شێوەی شت دوای رەنگ کردنـی ◊ صِبغَةَ الله: ئـەو فـیترەتو سروشتەی خودا ئادەمیزادی لەسەر دروست کردووە ◊ ئـەو ئایینەی خـودا دایـناوە بـۆ ئـادەمیزاد ◊ المَصبَغَةُ: خمخانــە ◊ شــوێنی بۆیــە کــردن ◊ الــصِّبغي: شێوەیەك لەمادە لەناوکی خانەدا لەکاتی دابـەش بوونی دا وەری دەگرێ ◊ واتە: (کرۆموسوم).

صَبَنَ عنه الهدية: دیارییەکەی نەدایـە، لەوی بـوارد بۆ یەکێکی تر.

صَــبَنَ المقــامرُ الكعــبين: قومارکەرەکـە هـەر دوو کەعبەکـەی خـستە نـاو دەسـتییەوە بـۆ ئـەوەی بەرامبەرەکەی هەڵخەڵەتێنێ ◊ هاوەڵەکەی پێی دەڵێ: (لا تَصبن) فێڵم لێ مەکەو ئاگام لێیە چی دەکەی.

الــصّابون: صـابون، پێــکهاتەیەکە لـە ترشـەڵۆکە چــەورییەکانو بــرێ قەلــەویات ◊ الــصَّبّان: صابونکەر، صابون فرۆش ◊ الصَّبّانة: نامێرێـکە، دەفرێــکە صـابونەکەی تــێ دەخـرێ بۆئـەوەی لەناوەکەدا نەتوێتەوە ◊ المَصبَنة: کارگەی صابون.

صَــبَا فــلان صَــبواً، وصــبوةً: فلانکـەس روی کـردە رابـواردنو لـەهو لـەعب حـەزی لـە مێبـازیو رابواردن بوو ◊ صبت الريح: بایەکە هەڵی کـرد ◊ بای صەبا هەڵبوو.

الـصَّبا: تەمــەنی منـداڵیو پێگەیـشتن ◊ عەشـقو سۆزو خۆشەویستی ◊ الـصَّبِيُّ: منـداڵ تادەگاتـە تەمەنی لاوی ◊ یان منداڵی شیرە خۆر ◊ تیژایی شمشێر ◊ بیلبیلـەی چـاو ◊ لاشـەویلە ◊ صِـبیان المطر: دڵۆپە بارانی بچوك ◊ صبيان الجليد: دەنکە تــەرزە ◊ شـاگرد کـە فێـری پیـشەو خوێنـدن دەکـرێو وردە وردە و بــە قۆنــاغ ◊ الــصَّبِيّة: مێینەی (الصبي)یە.

صَبِيَ صباً: کاری منداڵانەی کرد.

صَبِيَ اليها: بۆی کورکاندو حەزی لێ کرد، مەیلی لێ بوو ◊ أصبَتِ المرأة: ئافرەتەکە منداڵی بوو چ نێر چ مێ ◊ منداڵی زۆر بوون ◊ أصبَتِ الفتـاةُ فلانـاً: کـچەکە دڵـی فلانــی بـردو سەراسـیمەی کـرد ◊ صَابی الشيئ: شتەکەی خوارکردەوە، لاری کرد ◊ وای لێ کـرد ناراسـت بـێ ◊ صــابی سـیفه: بـە پێـچەوانەوە شمـشێرەکەی خـستە کالانــەوە ◊ صـابی الـسكينَ: کێردەکـەی سـەرەو بـن کـرد ◊ دەگـوترێ: (صـابِ الـسكينَ) دەسکی شمشێرەکە بخـەرە لای مـن ◊ صــابی الکـلام: قـسەکەی بـە شـێوەی ڕاسـتو درووسـت نەگێڕایـەوە ◊ صَـبّی رأسـه: سـەری خـۆی دانەوانـد بـۆلای زەوی ◊ تَصابی: خۆی منداڵ کردەوە ◊ تَصابی المرأةَ: دڵـی ئافرەتەکــەی بــۆ لای خــۆی کــێش کــرد، ئافرەتەکەی هێنایە سەر ڕێبازی دڵداریو کەوی کـرد ◊ الـصَّبا: کـزە بایەکـە لـە خۆرهەڵاتـەوە هەڵدەبێ لەکاتی یەکسان بـوونی شـەو و رۆژدا ◊ صَـحِبَهُ صَـحابَةً وصُـحبَة: هاوڕێیـەتی کـرد ◊ لـە دوعـاو پاڕانـەوەدا دەگـوترێ (صَـحِبَك الله) خـودا بتپارێزێ ◊ چاودێری خودات بەسەرەوە بێ.

أصحَبَ فلانٌ: فلان کەس هاوڕێی بۆ خۆی پەیدا کــردن ◊ منداڵــەکانی گــەورە بــوون لەگــەڵی کەوتونو هاوڕێیەتی دەکەن ◊ شێوە شێتییەکی بەسەردا هاتووە لەبەر خۆیەوە ویتە ویتیـەتی ◊ أصحَبَ له: ملکەچی بوو شوێنی کەوت ◊ أصـحَبَ

فلاناً: فلانكەسى كردە هاوڕێى خۆى ٥ أصحَبَ فلاناً الشيئ: فلانكەسى كردە هاوشانى فلان شت ٥ صَاحَبَه مُصاحبةً وصِحاباً: هاوڕێيەتى كرد ٥ إصطَحَبَ فلاناً: فلانكەسى كردە هاوڕێى خۆى ٥ دەگوترێ: (إصطَحَبَ القوم): خەڵكەكە هەندێكيان بوون بە هاوڕێى يەكترى ٥ تصاحَبا: بوون بە هاوڕێى يەكترى ٥ استَصحَبَ الشيئ: هۆگرى بوو پێوەى گيرۆدە بوو پێوەى نووسا ٥ استَصحَبَه الشيئ: داواى لێ كرد ئەو شتە لەگەڵى بكەوێ ٥ استَصحَبَ فلاناً: بانگى فلانكەسى كرد داواى لێ كرد ببێتە هاوڕێى ٥ الصاحِبُ: هاوڕێى و لەگەڵبوو (مرافق) ٥ خاوەن شت ٥ چاودێرى شت ٥ هەروا ناوە بۆ كەسانێك پەيڕەوى ڕێبازو پرۆگرامێك دەكەن ٥ وەكوو دەگوترێ: (أصحاب ابي حنيفة وأصحاب الشافعي) ٥ الصَّاحبة: هاوسەر (ژن) ٥ الصَّحابي: كەسێكە پێغەمبەرى ديبێ و بەخزمەتى گەيشتبێ و ئيمانى پێ هێنابێ و بە موسوڵمانيش مردبێ ٥ المِصحَابُ: ملكەچ و ژێربار ٥ دەگوترێ: (هو مصحاب لنا بما نحب) ئەو ژێربارو ملكەچ و پابەندى فەرمانى ئێمەيە ٥ المُصحَب: لقە دار كە توێكڵەكەى لێ نەكرابێتەوە ٥ چەرم تووكەكەى لێ نەكرابێتەوە ٥ دەنكە خورما بە ناوكەوە.

**صَحَّ** الشيئ صُحّاً و صِحة وصِحاحاً: شتەكە بێ عەيب و لەكەيە.٥ صَحَّ المريض: نەخۆشەكە چاك بۆوە.٥ صَحَّ الخبرُ: هەواڵەكە ڕاست بوو.

**صَحَّ** له على فلان كذا: ئەوەى لەسەر فلانكەس بۆ جەسپا ٧ اصَحَّ الرجلُ: پياوەكە ئەو عەيب و نەخۆشى و كەم و كوڕييەى هەيبوو نەماو بارى خوارى ڕاست بۆوە ٥ أصَحَّ الله فلاناً: خودا نەخۆشى و نارەحەتى فلانكەسى لابرد ٥ صَحَّحَه: هەڵە برى كرد لەكەو عەيب و خەوشى لێ لابرد ٥ تَصَحَّحَ: چاك بۆوە ٥ دەگوترێ: (تَصَحَّحَ بالدواء) بە دەرمانەكە چاك بۆوە، بە دەرمانەكە چاكسازى لە خۆى دا كرد ٥ إستَصَحَّ من علته: لە نەخۆشييەكەى چاك بۆوە.٥ إستَصَحَّ الشيئ: شتەكەى بە ساغى كەوتە دەست ٥ الصِّحاح: بەمانا (ألصَّحيحُ) دێ ٥ الصِّحة في البدن: لەش ساغى ٥ حاڵەتێكى سروشتييە لە جەستەدا ئەندامەكانى هەريەكەو بەڕێك و پێكى ڕۆڵى خۆى ببينێ ٥ لەشەرعدا بريتيە لەوەى ئەو عيبادەتەى ئەنجامى دەدا پەسەند بێ و قەزاكردنەوەى نەوێ ٥ يان هۆكارو سەبەب بێ بۆ ئەوەى ئاكام و ئامانجى پێويستى لەسەر پەيدا ببن وەكو لە مامەڵەدا ئەگەر مامەڵەكە پلەى (صيحەتى)ى هەبوو ئەوە ئەنجام و ئاكامەكەى لێ پەيدا دەبن ٥ وەكو موڵكيەت و تەصەروف و ئەو شتانە ٥ ألصَّحيحُ: ساغ و بێ عەيب ٥ قسەى پشت پێ بەستراو ٥ فەرموودەى پێغەمبەر (د.خ) كە بگاتەوە سەر پێغەمبەرو هاوەڵەكانى لێيەوە ڕيوايەت بكەن و ڕاويەكانى عادل و بەئاگاو زيرەك و وردبين و هۆشيار بن ٥ المَصَحَّةُ: ئەو شتەى دەبێتە سەبەبى بوونى شت ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنێك چارەسەرى نەخۆشى تێدا دەكرێ (نەخۆشخانە).

**صَحَرَ** الطعام صَحراً: خواردنەكەى لێنا، كوڵاندى ٥ صَحَرَت الشمسُ فلاناً: خۆر ئازارى دەماغى فلانكەسى دا.

**صَحِرَ** صَحراً وصُحرةً: ڕەنگى سوورايەكى كەمى تێ كەوت ٥ أصحَرَ القومُ: قەومەكە لە سارادا دەركەوتن ٥ أصحَرَ المكانُ: شوێنەكە فراوان بوو ٥ أصحَرَ الامر بالأمر: نيشەكەى ئاشكرا كرد ٥ صاحَرَ قِرنَهُ: فێڵ و تەڵەكەى لە بەرامبەرو

ڕقەبەرەکەی نەکرد ◊ إصحَرَ: بە مانا (صَحِرَ)دێ ◊ الصَّحارُ: دەگوترێ: (أبرز لە الأمر صحاراً) کارەکەی بە ئاشکرا ڕووبەڕوو کردەوە ◊ الصَّحراء: ساراو دەشت کەفراوان بێ، کەم ئاوبێ ◊ الصَّحِيرةُ: خۆراکێکە لە شیرو ڕۆن دروست دەکرێ، وا دەبێ ئاردیشی پێ وەردەگرێ ◊ صَحصَحَ الأمر: کارەکە ئاشکرا بوو ◊ الصَّحصاحُ و الصَّحصَحُ: زەوی دەشتو فراوان ◊ الصُّحصُحُ و الصُّحصوحُ: لێکۆڵەوەیەکی وەها کە وردەکاری کارو ڕوداوەکان بکاو هەژماریان بکاو بیانزانێ ◊ أصحَفَ الکتاب: کتێبەکەی پەڕە پەڕە کۆکردەوە ◊ صَحَّفَ الکلمة: وشەکەی نووسی یان خوێندیەوە بەهەڵە ◊ وەکو پێویست نەیخوێندەوە یان نەینووسی، بەهۆی لێ تێکچوونی پیتەکان لێی ◊ تَصَحَّفَت الکلمة أو الصَّحیفة: وشەکە یان لاپەڕەکە لە ڕاستییەوە بوو بە هەڵە ◊ الصَّحافة: ڕۆژنامەوانی، ئەو کەسەی هەواڵو ڕاو بۆچوون کۆدەکاتەوەو لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا بڵاوی دەکاتەوە ◊ الصَّحاف: ئەوکەسەی صەحافی دەکا ◊ یان خەریکی فرۆشتنی ڕۆژنامەو شتی وایە ◊ الصَّحفةُ: قاپێکە لەقاپی خواردەمەنی وەکو دەوریو لەگەنو کاشیو ئەو جۆرە شتانە ◊ الصَّحفي: ئەو کەسەیە زانیاری لە ڕۆژنامە وەربگرێ ◊ کەسێک کاری ڕۆژنامەوانی ئەنجام بدا ئەوەی کردبێتە پیشەی خۆی ◊ الصحیفة: لاپەڕەی نووسراو یان ئەوەی تێیدا نووسراوە ◊ لاپەڕەیەکی تایبەتیە لە ڕۆژنامەیەک ڕۆژانە یان لەکاتێکی دیاریکراودا دەردەچێو تایبەت دەبێ بەلایەنی سیاسی یان کۆمەڵایەتی، یان ئابوری یان ڕۆشنبیری ◊ صحیفة الوجە: پێستی دەمو چاو ◊ المُصحَفُ: کۆمەڵە لاپەڕەیەک کە پێکەوە لکێنراوبنو تەجلید کرابن ◊ بەزۆری ئەم وشەیە بۆ قورئانی پیرۆز بەکاردەهێنرێ.

**صَحِلَ** فلان صحلاً: لەدەنگی دا گرییەک هەبوو ◊ صَحَنَهُ صَحناً: لێی دا ◊ دەگوترێ: (صَحَنَه برجله) قاچی پیانا ◊ الصَّحنُ: پیاڵە شەرابی گەورە ◊ قاپێکی گەورە کە خۆراکی تێ بکرێ ◊ وەکوو لەگەنو سەعەندو ئەو جۆرە دەفرانە ◊ گۆڕەپانێکە لەناو مزگەوت یان لەماڵدا ◊ زەوی دەشتو فراوان کە درەختی تێدا نەبێ.

**صَحنُ** الأذن: ناو گوێچکە ◊ الصَّحنان: دوو تەشتی بچوکن بە یەکتر دەکێشرێن بۆ وەدیهێنانی دەنگێکی تایبەتی لە بواری مۆسیقاو گۆرانیدا ◊ الصَّحناء: جۆرە پێخۆرێکە لە گۆشتی ماسی بچوک دروست دەکرێ ◊ الصَّحونُ: ئەسپی ڕاهێنراو و ڕام کراو ◊ المِصحَنة: قاپێکە وەکو لەگەن خواردنی تێدەکرێ.

**صحا** النائم صَحواً: نووستووەکە بە خەبەر هات.

**صحا** السکران: سەرخۆشەکە بەری دا، ئاسایی بۆوە.

**صحا** القلب: دڵ وەئاگا هاتەوە لە خەوی غەفڵەتو عیشقبازی بەخەبەر هات.

صحت السماء: ئاسمان ساو بوو هەوری پێوە نەما.

**صحا** الیوم: ئەمڕۆ خۆرەتاو فێنک بوو، ئەمڕۆ خۆرەتاو بوو، سەرمای کەم بوو.◊ أصحی: بەمانا (صحا) دێ ◊ کەوتە ناو حاڵەتی بەخەبەریو بە ئاگاییەوە ◊ کەوتە ناو وڵاتێکەوە هەساو و خۆرەتاوە ◊ أصحی فلاناً: فلانکەسی بەخەبەر هێنا ◊ وای لێ کرد خەو یان بێهۆشی یان سەرخۆشی بەری بدا ◊ الصَّحوُ: دەگوترێ: (سماء صحو ویوم صحو) واتە بێ هەورەو سافو بێ گەردە ◊ المِصحاة: پیاڵەو سوراحی شەراب کە

لەزیو دروست کرابن ٥ اَلْمِصحَاةُ: هەر شتێك خەم برەوێنێ، سەرخۆشی لابەرێ.

**صَخِبَ** الجمع صَخَباً: کۆمەڵەکە بوو بە زاوە زاو و قیژەو هەرایان.

**صَخِبَ** فلان: فلانکەس هاواری کرد قیژاندی.

**صَخِبَ** البحرُ: دەریا کەوتە جونبوشو شەپۆل هاویشتن ٥ صَاخِبَةُ: لە قیژەو هەراو هۆریادا پێشبڕکێیان کرد ٥ إصطَخَبَ القومُ: خەڵکەکە کردیانە هەراو هۆریاو لێکدانو پێکدادان ٥ (إصطَخَبَ الموجُ) شەپۆلەکان پێکیاندادا ٥ تَصاخَبَ: بەمانا (إصطَخَبَ)دێ.

**صَخَّ** الحجر صخّاً و صخيخاً: بەردەکان لەکاتی پێك کێشاندا دەنگیان لێوەهات.

**صَخَّ** فلاناً صخّاً: لە گوێچکەی فلانکەسی داو کەڕی کرد ٥ دەشگوترێ: (صَخَّ سَمعَهُ) و (صَخَّ الصوت أذنَهُ) دەنگەکە گوێچکەی کەڕکرد.

**صَخَّ** الصُلب على الصُلب: رەقی بە رەق کێشا دەنگی لێ هات.

أصَخَّ سمعه: گوێچکەی کەڕ کرد ٥ الصَّاخة: گرمەو دەنگی گەورە کە ئەوەندە بە هێزبێ گوێچکە کەڕ بکا ٥ دەنگی کەڕەنای هاتنی قیامەتو دونیا وێرانبوون ٥ الصَّخَّةُ: دەنگی بەرد کەبەر شتێك بکەوێ.

**صَخَدَ** اليوم صَخَداناً: رۆژەکە گەرماکەی بەهێز بوو ٥ صَخَدَت الشمسُ الشيئَ والأنسان صَخَداً: خۆر لەشتەکەی داو نەخۆشی خست هەڵی پروکاند ٥ دەشگوترێ: (صَخَدَهُ الحرُّ) گەرمابردی نەخۆشی خست.

**صَخِدَ** اليوم صَخَداً: ئەمرۆ گەرماکەی بەهێز بوو ٥ أصْخَدَ فلان: فلانکەس گەرمای لێ هات، کەوتە جەنگەی گەرما ٥ إصطَخَدَ الحِرباءُ: حیرباو جروجانەوەر بە گەرمای خۆر بووژانەوە گەرم بوونەوە ٥ الصَّاخِدَةُ: گەرمای نیوەڕۆ ٥ اَلْمَصْخَدَةُ: گەرمای نیوەڕۆ ٥ الصَّيْخُودُ: بەردی زۆر رەق ٥ دەگوترێ: (صَخدٌ وصَيخودٌ) شاخو رەقەنێکە قولینگو پاچ کاری لێ ناکەن.

**صَخِرَ** المكان صَخراً: شوێنەکە بەردەلانەو شاخو رەقەنی زۆرە ٥ أصخَرَ المكان: شوێنەکە شاخو بەردی زۆر بوو ٥ الصَّاخِرُ: زرینگەی ئاسن کە بەیەك دەکەون.

**الصَّاخِرَةُ**: قاپی ئاو تێدا خواردنە کە لە سواڵەت دروست کرابێ ٥ گۆزیلکەی ئاو ٥ الصَّخْرَةُ: بەردی گەورەو رەق ٥ لە زاراوەی جیۆلۆجیادا بریتییە لە مادەیەکی سروشتی زەوی بە زۆری لە یەك گرتنو تێکەڵ بوونی دو (مەعدەن) کانو زیاتر پێك دێ ٥ (علم الصّخر): زانیارییەکە لە شاخو بەرد دەکۆڵێتەوە لەچی درووست بووەو تایبەت مەندی چییەو چ جۆرێکە.

**صَدِئَ** الحديد: ئاسنەکە ژەنگ دایپۆشی ٥ دەشگوترێ: صَدِأت يده من الحديد: دەستی بە ئاسنەکە ژەنگاوی بوو.

**صَدِئَ** فلان: فلانکەس خەمۆكو سیس بوو ٥ دەشگوترێ:

**صَدِئَ** القلب: دڵ ژەنگی گرت.

**صَدِئَ** اللونُ: رەنگەکە رەشی تێکەڕا ٥ أصدأ الحديدَ: ئاسنەکەی واڵێ کرد ژەنگ بێنێ ٥ الصَّدأ: ژەنگ ٥ هەروا (الصَّدأ) ئاوە بۆ تەڵخو بەڵخێك دەکەوێتە سەر رووی شت.

**صَدَحَ** الطائرُ صَدحاً و صِداحاً: مەلەکە خوێندیو دەنگی بەرز کردەوە ٥ دەگوترێ: (صَدَحت المُغنيةُ) ئافرەتە گۆرانی بێژەکە دەنگی لێ هەڵبڕیو کەوتە گۆرانی وتن ٥
**اَلصَّدحُ**: تەپۆڵکەی بچوکو رەقەڵان ٥ درکە شاخ ٥
**الصَّيداحُ**: خاوەنی دەنگی بەهێزو ئاوازی گۆرانی ٥ **الصَّيدحُ**: بەمانا (الصَّيداحُ)دێ.

**صَدَّ** عنه صَداً وصُدوداً: روی لێ وەرگێرا.

**صَدَّ** صداً: ئارەحەت بوو رِوی وەرگێرا ٥ **أصَدَّ الجرح**: برینەکە کێمو زوخاوی کرد ٥ **أصدَّ فلاناً عن كذا**: فلآنکەسی لەو شتە مەنع کرد ٥ **صَدَّدَ الجرح**: برینەکە کێمی کرد ٥ **الصَّدُّ**: واز لێ هێنانو خۆ گومکردنی دولبەر لە عاشقەکەی ٥ لایەنی شت ٥ رێرەوی ئاو لەناو شیو و دۆڵدا ٥ **الصَّدَدُ**: لایەنو نزیک ٥ ئامانجو مەبەست ٥ بەرامبەر ٥ دەگوترێ (هذا الدار صَدَدَ هذه) ٥ (بصددها) بەرامبەری ٥ لە میانەی قسەکردندا دەگوترێ (لاحدد لي دونه ولا صَدَدَ) هیچ مانیعێکم نییە ٥ (هو بصَدَد كذا) ئەو خەریکی ئەو شتەیە سەرگەرمی ئەو شتەیە ٥ **اَلصَّديد**: کێمو زوخاو.

**صَدَرَ** الأمر: ئەمرەکە مۆرکراو دەرچوو.

**صَدَرَ** الشيئ عن غيرِه: شتەکە وەدی هات، پەیدا بوو ٥ دەگوترێ (فلان يصدر عن كذا) فلآنکەس هێزو دەسەڵات لە فلآن شتەوە وەردەگرێ.

**صَدَرَ** عن المكان والورد: لەشوێنەکە گەڕایەوە، پاشگەزبۆوە.

**صدر** الى المكان: گەیشتە ئەو شوێنە.

**صَدَرَ** فلاناً: فلآنکەسی گێرایەوە ٥ سنگی فلآنکەسی هەنگاوت ٥ **صُدِرَ صَدراً**: سنگی ئازاری پەیداکرد ٥ **أصدَرَ الأمر**: فەرمانەکەی بلآوکردەوەو جێ بەجێی کرد ٥ **أصدَرَ فلاناً عن الشيئ**: فلآنکەسی لەو شتە گێرایەوە، مەنعی کرد ٥ **أصدَرَ القومَ**: خەڵکەکەی تێرکرد ٥ دەگوترێ: (أطعَمَهم حتى أصدَرَهم) ٥ **أصدَرَ الرُّعاء**. دوابەم: شوانەکان ئاژەڵەکانی خۆیان ئاوداو لەسەرئاوەکە گێرایاننەوە دواوە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان يُردُ ولا يُصدِرُ) دەست بە کارەکە دەکا بەڵام تەواوی ناکا ٥ **صَادَرَهُ على كذا**: بە جەختو ئیلحاحەوە داوای لێ کرد ٥ **صادرت الدولة الأموال**: حوکومەت ماڵو سامانەکەی داگیر کرد ٥ دەستی بەسەردا گرت بەمەبەستی سزادانی خاوەنەکەی ٥ **صَدَّرَ الفرسُ**: ئەسپەکە لە غاردانو پێشبڕکێدا پێش ئەوانی تر کەوت ٥ **صَدَّر فلاناً**: فلآنکەسی گێرایەوە ٥ خستییە پێشەوەی مەجلیسەکە ٥ لە پێشەوەی مەجلیسدا دایئیشاند ٥ **صَدَّرَ الكتابَ**: پێشەکی بۆ کتێبەکە نووسی ٥ **صَدَّرَ البضاعة**: کاڵاکەی لە وڵاتێکەوە نارد بۆ وڵاتێکی تر ٥ **تَصَدَّرَ الفرسُ**: بەمانا (صَدَّرَ) دێ ٥ **تَصَدَّرَ فلان**: فلآنکەس لە پێشەوەی مەجلیس دانیشت ٥ پێش ئەتەوەکەی کەوت ٥ **أستَصدَرَ الأمرُ**: داوای دەرچوونی فەرمانەکەی کرد ٥ **الأصدَرُ**: سنگ پانو گەورە ٥ **الصَّادِرُ**: دەگوترێ: (ما له صادر ولا وارد) نە درەچوو نەهاتوو هیچی نییە ٥ (طريق صادر وارد): رێگای فەرمبالغو ئاوەدار **الصادرات**: کاڵای وڵات کە رەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێ ٥ **اَلصِّدار**: پۆشاکێکە سنگ دادەپۆشێ (سوخمەی پەخە داخراو) ٥ **اَلصَّدارة**: پێشکەوتن، پێشەنگو پێشەوا، دەگوترێ: (فلان له الصَّدارة في القوم) ٥ لەلای زانایانی (نەحو) تایبەتمەندی وشەیەکە بەوەی کە لەسەرەتای رستەوە بێ ٥ وەکو (أسماء الإستفهام) ٥ **اَلصَّدرُ**: پێشەوەی شت ٥ دەگوترێ: (صَدرُ الكتاب)

پێشەکی کتێب ٥ (صدر النهار) سەرەتای ڕۆژ ٥ (صدر الأمر): سەرەتای کار.

**صدر** القوم: سەرۆکی نەتەوە.

**صدر** الأنسان: سنگی ئادەمیزاد.

(ذات الصدر) نەخۆشی سنگ (سیل).

(ذات الصدور) نهێنی ناودڵو دەروون ٥ **الصَّدَرُ**: گەڕانەوە لە ئاو خواردنەوە ٥ یان گەڕانەوە لەکاری تر ٥ (یوم الصَّدَرِ) ڕۆژی چوارەمی جەژنی قوربان ٥ چونکە حاجییەکان لە مەککەوە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتو شوێنی خۆیان ٥ **الصُّدْرَةُ**: بەمانا (الصَّدر)دێ ٥ سوخمە ٥ چاکەتی بێ قۆڵ کە سنگ داپۆشێ ٥ زرێی کورت ٥ **الصَّدِیرةُ**: لای سەرووی شیو ٥ پێشەوەی دۆڵو شیو ٥ **المصدر**: چاوگو کانی شت ٥ ئەوەی شتی لێ وەدی دێ ٥ لەلای زانا زمانەوانییەکان بریتییە لە ئیسمێك ماناکەی زەمانی لەخۆ نەگرتبێ ٥ **المُصَدَّرُ**: دەگوترێ: (رجل مُصَدَّر) پیاوێکی سنگ پتەوی قایمو قۆڵە ٥ **صَدصَدَ النخلَ**: بێژنێكو کەوگیرو گڵگیرەکەی بەدەست هێناو بردو لەرزاندی بۆ بەکارهێنانی.

**صَدَعَ** النباتُ الأرض: ڕووەکەکە سەری لە زەوی دەرهێناو دەرکەوت.

**صَدَعَ** الزُّجاج ونحوه: شووشەکەی شکاند.

**صَدَعَ** المسافر الفلاة: ڕێبوارەکە چۆڵەوانییەکەی بڕی.

**صَدَعَ** القومَ: خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد.

**صَدَعَ** الأمر وبه: کارەکەی ئاشکراکردو ڕونی کردەوە

**صُدِعَ**: سەرئێشەی تووش بوو ٥ **صَدَّعَه**: زێدە ڕەوی کرد لە گەیاندنو ڕونکردنەوەدا لە شکاندنو سارا برین دا ٥ توشی سەرئێشەی کرد ٥ **صُدِّعَ**: بەمانا (صُدِعَ)دێ ٥ **تَصَدَّعَ**: شەق بوو قەڵشا ٥ درزی برد ٥ دەگوترێ: **تَصَدَّعت الأرض بالنبات**: زەوی شەق بوو بەسەر دەرهێنانی ڕووەك لێی ٥ **تَصَدَّعَ القومُ**: خەڵکەکە پەرتەوازە بوون ٥ **إنصَدَعَ**: شەق بوو ٥ درزی برد ٥ **إنْصَدَعَ الصُّبحُ**: بەیانی شەبەقی دا ٥ کازیوەی بەیان دەرکەوت ٥ **التَّصَدُّع**: لە (جیۆلۆجی)دا بریتییە لە تێکشکانی شاخو بەرد بەهۆی هێزی زۆرەوە ٥ **الصَّادِعُ**: دادوەر لەنێوان قەوم دا ٥ **الصُّداعُ**: سەرئێشە، ئازاری سەر کە هۆکارەکانی زۆرن ٥ **الصَّدعُ**: درزو شەق بوون لە شتی ڕەقدا ٥ **الصَّدعَةُ**: نیوەی شتی شەق بوو، درز تێ بوو بۆ دووکەرت ٥ جەڵەبە ئاژەڵ ٥ **الصَّدِیعُ**: شەق کراو ٥ نیوەی شتی دوولەت کراو.

**صَدَغَ** الی الشیئ صُدوغاً: مەیلی بۆلای شتەکە کرد.

**صَدَغَ** عن طریقه: لە ڕێبازی خۆی لایدا.

**صَدَغَ** فلاناً صَدغاً: لە لاجانگی فلانکەسی دا ٥ خواریەکەی ڕاست کردەوە.

**صَدَغَ** البَعیرَ ونحوه: لاجانگی حوشترەکەی داغ کرد ٥ نیشانەی کرد.

**صَدَغَ** فلاناً عن الأمر: فلانکەسی لە کارەکە لادا.

**صَدَغَ** صَداغَةً: لاواز بوو ٥ **صادغَهُ**: بەرامبەری کرد شان بەشانی یەکتر ڕۆیشتن ٥ **تَصَدَّغَ**: سەرینی بۆ لاجانگی خۆی دانا ٥ **الأصدَغان**: دوو ڕەگن لەخوار لاجانگەوەن ٥ **الصَّداغُ**: نیشانەیەکە بە درێژی لەسەر لاجانگ دروست دەکرێ ٥ **الصُّدغُ**: نێوان قولینچکی چاو و گوێچکە ٥ زوڵفو لاجانگ ٥ **المِصدَغَةُ**: سەرین.

**صَدَفَ** عنهُ صَدفاً وصُدوفاً: ڕوی وەرگێڕا مەیلی کرد.

**صَدَفَ** فلاناً عن الشيئ صَدفاً: فلاّنكەسی لە شتەكە لادا.

**صَدَفَ** صَدفاً: لە رۆیشتن دا ئەژنۆكانی رویان لەیەك بوو لێك دەدران ◊ **أصدَفَهُ عن الشیئ**: لە شتەكەی لادا، لە شتەكەی گێڕایەوە ◊ **صادَفَهُ مصادفةً**: روبەروی بۆوە بە رێكەوت تووشی یەكتر بوون بەبێ ئەوەی هیچ وادەیەكیان لە بەینا هەبێ ◊ **تصادفا**: بە رێكەوت بەیەكتر گەیشتن ◊ **تَصَدَّفَ لە**: پێشی پێ گرت ◊ بەربەرچی دایەوە ◊ **تَصَدَّفَ عنە**: روی لێ وەرگێڕا ◊ **الصُّدَف**: روتێكردنی ئەژنۆكانە بۆلای یەكتر لەكاتی رۆیشتندا ◊ هەرشتێك گەورەو بەرزو مەبەست بێ، وەكوو نیشانە، دیوار، كێو ◊ لایەنو بەناو قەراخ ◊ **صَدفا الجَبَلَ**: ئەملاو ئەولای كێوە بەرامبەر بە یەكتر بن ◊ بەردەو توێكڵو صەدەفی مرواری ◊ تاكەكەی (صدفة) ◊ **الصَّدَفَةُ**: كركراگەی گوێ ◊ **الصُّدفتان**: دوو حەوزی كلۆت كەسەری ئێسقانی رانی تێدایە ◊ **الصَّدوفُ**: ئافرەتێك روی خۆی نیشان بینەر بداو خێرا روی وەرگێڕێ ◊ دەم بۆگەن.

**صَدَقَ** فلان في الحدیث: فلاّنكەس راستی وت ◊ راستگۆ بوو ◊ واقیعی روون كردەوە.

**صَدَقَ** في القتال ونحوە: بە هێزو تواناو ورەبەرزییەوە روی كردە گۆڕەپانی شەڕ.

**صَدَقَ** فلاناً: هەواڵی راستی بە فلاّن گوت ◊ دەشگوترێ (صَدَقە الحدیثَ) بۆ هەمان مانا ◊ **صَدَق فلاناً النصیحة والأخاءَ**: بەڕاستیو دڵسۆزی ئامۆژگاری فلاّنی كردو برادرایەتیو دۆستایەتی راستەقینەی لەگەڵدا بەست ◊ **صدَق فلاناً الوعدَ**: پابەندی وادەو بەڵێنی خۆی بوو بۆ فلاّنكەس ◊ (فهو صادِق) ئەو راستگۆیە (فهو صَدوق) زۆر راستگۆیە ◊ **أصدق فلاناً**: فلاّنكەسی بە راستگۆ لە قەڵەم دا ◊ **أصدَقَ المرأةَ**: مارەیی دا بەئافرەتەكە ◊ مارەیی بۆ بڕیار دا ◊ **صادَقَه مصادقةً وصِداقاً**: كردیە دۆستو برادەری خۆی ◊ **صادق فلاناً المودة والنصیحة**: بە دڵسۆزی خۆشەویستیو ئامۆژگاری خۆی بۆ فلاّنكەس دەربڕی ◊ **صَدَّقَه وصدّق بە تَصدیقاً وتِصداقاً**: دانی نا بەڕاستگۆیی ئەو ◊ قسەی خۆی بردە سەرو ئاواتی خۆی هێنایە دی ◊ **صَدَّق على الأمر**: فەرمانەكەی تەصدیق كرد، واژوی كرد ◊ **تَصادَقَا**: بوون بە هاوڕێی یەكتریو یەكتریان خۆش ویست ◊ **تَصادَقَا الحدیثَ**: هەریەك لەو دوانە قسەی راستیان بۆ یەكتر كردو راستگۆ بوون لەگەڵ یەكتر ◊ **تصادقا على الأمر**: هەردوكیان فەرمانەكەیان پەسەند كردو پێی رازی بوون ◊ دانیان نا بە واقیعەكەدا ◊ **تَصَدَّق علیە**: خێری پێ كرد، یارمەتی دا بە ماڵو سامان، زەكاتی دایە ◊ **التَّصدیق**: لەلای مەنطیقیەكان بریتییە لە دەرك كردنی حوكمو نیسبەت لەنێوان دوولایەی قضیەدا ◊ لەبواری یاسای نێودەوڵەتیدا بریتییە لە رازی بوونو واژو كردنی سەرۆكی دەوڵەت بۆ پەیمان نامەیەك كە لە نێوان وڵاتەكەیو وڵاتێكی تردا بەستراوە یان هەرشتێكی لەو جۆرە ◊ **الصّادِقُ**: دەگوترێ: (تمر صادق الحلاوة) خورمایەكی شیرینە ◊ (هو صادق الحكم) ئەو دڵسۆزە لە بڕیارەكەی داو هیچ شتێك راستیی پێ ناگۆڕێ ◊ دەگوترێ: (فجر صادق) سپیایی كەناری ئاسمان كە بڵاو دەبێتەوەو سەرەتای رۆژێكی تری تازە دەست پێ دەكا، لە پێش ئەوە فەجری كازیب هەیە كە بەدرێژی بەرەو خۆرئاوا ستونی دیاریی دەدا ◊ **الصّادقة**: مێینەی (الصادق) ◊

**الصَّداق**: مارەیی ژن ◊ **الصَّداقة**: دۆستایەتیو پەیوەندی نێوان برادەرو خۆشەویستان ◊ **الصِّدِّیق**: ئەوکەسەی هەمیشە پشتگیریی حەقو راستی دەکا ◊ زێدە ڕەوی دەکا لە ڕاستگۆییدا ◊ ئەو کەسەی کردەوەکانی پشتگیریی لە قسەکانی دەکا ◊ قسەو کردەوەی وەکو یەك وان ◊ هەروا وشەی (الصّدیق) نازناوی حەزرەتی ئەبوبەکرە (رەزای خودای لێ بێ) ◊ **الصِّدْقُ**: تەواو لە هەموو شتێك دا ◊ دەگوترێ: (رمح صدق) ڕمێکی ڕاستو ڕەقە ◊ (رجلٌ صَدقٌ اللقاء) پیاوێکی خۆڕاگرە لەکاتی ڕوو بە ڕووبوونەوەی دوژمن ◊ **الصِّدْقُ**: ڕاستگۆیی، ڕێکهاتنەوەی قسە بۆ واقیع، خۆڕاگریو ورە بەرزی ◊ دەگوترێ: (رجل صِدقٌ) (وإمرأة صِدقٍ) ◊ کاروباری ڕاستو بێ عەیبو دوور لە کەمو کوڕیو درۆو پێچو پەنا ◊ **الصُّدُقَةُ**: مارەیی ئافرەت ◊ **الصَّدَقَةُ**: خێرو خێرات، ئەوەی کە خاوەنی دارایی دەیدا بە هەژاران بۆ ڕەزامەندی خوداو بەنیازی خێر ◊ **الصَّدِیقُ**: هاوەڵی دڵسۆزی ڕاستەقینە ◊ جاری وا هەیە بەو شێوە بۆ تاكو کۆو بۆ نێرو بۆ مێ بەکاردەهێندرێ دەگوترێ: (هو صدیق وهم صدیق وهي صدیق وهن صدیق) ◊ **الماصَدَق**: لە زاراوەی مەنتیقیەکان دا ئەو تاکانەن کە مانای کولییەکەیان تێدا بەرجەستە دەبێ وەکوو (ئازادو وریاو حسنو حسین رسول و مامەند....) دەبنە (ماصَدَق)ی ئادەمیزاد کە مەفهومێی کولییە ◊ **مِصداق الأمر**: بەڵگە لەسەر راستی شتەکە ◊ (صَدَمَ الشيءُ الشيءَ صَدماً) شتەکە لە شتەکەی دا پێکیان کێشا ◊ پاڵی پێوەنا ◊ دەگوترێ: (صَدَمَ الرجل غیره) پیاوەکە پاڵەپەستۆی غەیری خۆی دا ◊ **صَدَمت النازلة فلاناً**: بەڵاو کارەسات ناگەهان یەخەی فلانکەسی گرت ◊ **صَدَمَهُ بالقول**: بەقسە بۆڕی داو بێ دەنگی کرد ◊ **صادَمَهُ مُصادَمَةً وصِداماً**: بەرگری کردو پاڵی پێوەناو بەرەنگاری بووە ◊ **إصطَدَما**: ئەو دوانە هەریەکەیان بەرەنگاری ئەوی تریان بۆوە ◊ **تصادما**: بەمانا (اصطدما) دێ ◊ دەشگوترێ: **تصادمت الآراء**: بیرو ڕایەکان جوداوازو دژبەیەك بوون ◊ **الصَّدمَةُ**: پاڵنانی لەناکاو بە شێوەی تەکان ◊ دەگوترێ: (صَرَعَهُ بصدمة) بە راتەکاندن و پاڵنانی گوزوگومەت خستی.

**صَدِيَ** صَدیً: تینوایەتی پەرەی سەند ◊ **أصدی الجبلُ**: کێوەکە دەنگەکەی دووبارە کردەوە ◊ **صاداه**: بەرهەڵستی کرد، لەگەڵیدا هەڵی کردو مەدارای کرد ◊ **صدّی فلان بیدیه تصدیة**: فلانکەس بەهەردوو دەستی چەپڵەی لێ دا ◊ **تَصَدَّی للأمر**: سەری بەرزکردەوەو بۆکارەکەی ڕوانی بزانێ چیەو چۆنە ◊ **تصدّی لفلان**: بەرپەرچی فلانکەسی دایەوە ◊ ڕوی لە فلانکەس کردو ویستی قسەی لەگەڵ بکا ◊ **الصَّدی**: تینوایەتی زۆرو کوشندە ◊ گێڕانەوەی دەنگ کە شاخ دووبارەی دەکاتەوە، دەگوترێ: (صمَّ صَداه) خپ بوو دەنگی نەما فەوتا ◊ (أصَمَّ الله صداه) خودا لەناوی برد ◊ هەروا وشەی (الصَّدی) بەمانا پاش بەڕێوەبردنو پەروەردەکردنی ماڵو سامانە ◊ دەگوترێ: (هو صَدی مال) ◊ باڵندەیەکی ئەفسانەییە لە کۆندا پێیان وابووە لەسەری کوژراو دێتە دەرەوە هەر هاوار دەکا تینوومەو ئاوم بدەنێ هەتا تۆڵەی کوژراوەکە دەکرێتەوە ئەوجا بێدەنگ دەبێ.

**صَرَبَ اللَّبَنَ صَرباً**: ماستەکەی کردە ناو مەشکەوە بۆ ئەوەی ترش بێ بترشێ.

**صَـرَبَ اللـبن في الـضرع**: شیرەکەی لـە گوانەکـەدا هێشتەوەو نەیدۆشی.

**صَرِبَ اللبنُ صَرَباً**: شیرەکەی لە گوانەکەدا کۆبۆوە ◊ **إصطَرَبَ اللبَنَ**: ماستەکەی لە مەشکەدا وردە وردە کۆکردەوەو لێی گەڕا ترشاو بوو بە تۆراخ ◊ **الصَّرَبُ**: شیری ترشاو ماستی ترش ◊ **الصَّرِيبُ**: صەمغی سوور ◊ ماستی تـرش ◊ **المِصرَبُ**: قاپی گـەورە، مەنجـەڵ دیـزەی گـەورە، ماسـتیان تـێ بکرێو وازی لێ بێنن تا دەترشێ ◊

**صَرَّجَ البناءَ**: باڵە خانەکەی بە صاروج بۆیـە کـرد ◊ **الـصّاروج**: تێـکەڵەیەکە بەکاردەهێنـدرێ بـۆ بۆیـەکردنی دیـواری باڵەخانـەو شـتی وا ◊ **صَرَّحَ الأمـرَ صَـرحاً**: کارەکـەی ئاشـکراکردو روونـی کردەوە.

**صَرُحَ الشيءُ**: شتەکە لە خـەوشو توێـکڵو پوشو پەلاش پاك بۆوە ◊ **صَارَحَ بما في نفسه**: ئـەوەی لـە دەروونیا بوو دەری خست ◊ **صارحَ فلاناً بـالأمر**: راستەوخۆ دەربارەی کارەکە قسەی لەگەڵ فلاندا کردو بەرەو روی ئەوی کردەوە ◊ **صَـرَّحَ الـشيءُ**: شتەکە دەرکەوتو ئاشکرا بوو ◊ دەگوترێ: **صَرَّحَ الحقُ**: حـەقو ڕاسـتی دەرکـەوتو ئاشکرا بـوو ◊ **صَرَّحَت الخمر**: شەرابەکە کەفەکەی هەڵداو خاڵص بـوو هیچی پێـوە نـەماو صافو بێـگەرد بـوو ◊ **صَرَّحَ النهارُ**: ڕۆژەکەی خۆش کرد هـەوری نـەماو خـۆر دەرکـەوتو دونیـا گـەرمی بـووە ◊ **صَـرَّحَ الأمـرَ**: کارەکـەی دەرخـست ◊ (صَـرَّحَ بـالأمر) لـەبارەی کارەکـەوە دواو قـسەی لەسـەر کـرد ◊ **تَصَرَّحَ**: بەمانا (إنصَرَحَ) دێ ◊ دەشگوترێ (تَصَرَّحَ الزَّبد عن الخمر) کەفو بەڵغەکە لـە شـەرابەکە جیا بۆوە ◊ **التَّصريح**: ڕونکردنەوەو ڕا دەربڕینی حوکوومەت یان وتە بێژی فـەرمی حوکوومـەتو دامـەزراوەو پـرۆژەو شـتی وا بـە بەیاننامەیـەك دەربـارەی کارێـکی ئیـداری یـان سیاسـی یـان سەربازی ...هتد ◊ یان ئیزن وەرگرتن بەکارێـك لـە کەسێـك خـاوەنی دەسـەڵاتی ئیـزن دان بێ ◊ **الصَّراحُ**: پاكو بێ خەوش لە کەفو بـەڵغو پڵو پـوش ◊ دەگـوترێ: (نـسب صِـراح) نـژادو بنـیچەیەکی خـاوێن ◊ (خمـر صُـراح) شـەرابی خاڵصو بێ غەش ◊ (تکلم به صُراحاً) بـە ئاشـکرا قسەی دەربـارەی کـردو رونـی کـردەوەو پـەردەی لەسـەر لادا ◊ **الـصَّراحة في الحـق**: ئاشـکراو بـێ چـەندو چـوونو بـێ پـێچو پـەنا ◊ **الـصَّرحُ**: باڵەخانـەی بـەرز، بینـای هەڵچوو بەئاسمانـدا ◊ بەزاراوەی تازە (ناطحة السحاب) ئەو باڵەخانـەی ئەوەنـدە بـەرزە شـەڕ لەگـەڵ هـەور دەکـا ◊ **الـصَّرحَةُ**: گۆڕەپـانی خـانوو حەوشـەی مـاڵ ◊ **الصَّرِيحُ**: خاڵصو پاڵفتە لە تڵپو کەفو بـەڵغو پڵو پوش ◊ ئاشکراو نمایان.

**صَرَخَ صُراخاً وصرِيخاً**: نەڕانـدی، بـە هـەموو هێـزی هـاواری کـرد ◊ داوای یارمەتیـدانو بـە هانـەوە چـوونی کـرد ◊ **أصـرَخَهُ**: بـە هانەیـەوە چـوو ◊ **تَـصَرَّخَ**: لـە هاوارکردنەکەیـدا تەکـەللوفی بـەکار هێنا، بە نابەدڵی هاواری کرد.

**إصطَرَخَ**: هـاواری کـرد، داوای یارمـەتیو بـە هانـاوە چـوونی کـرد ◊ **تَـصارخوا**: هاواریـان کـرد ◊ دەق بـەمانا (إصـطرخوا)دێ ◊ **إستَـصرَخَهُ**: هـاواری بـۆ بـردو داوای یارمـەتی لێ کـرد ◊ **الـصَّارِخُ**: هـاوار کـەرو پـەنا هـێن ◊ بـە هاناهـاتوو یارمەتیـدەر ◊ **الـصَّارِخَةُ**: دەنگـی هـاوار کـەرو پەناهێنـەر ◊ **الـصّاروخ**: صـاروخ: هاوێژراوێـکی ئاگراوییـە درێـژو لای سـەرەوەی باریـك، هەڵـدەدرێ بـۆ

شوێنی دوورو بۆشایی دوور برپیەکەی بەهۆی تەقینەوەی ئەو گازانەیە کە لە بنکی صاروخەکەدا بۆ قۆناغەکانی رۆیشتنەکەو بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو دادەنرێ ٥ الصَّرِيخُ: هاوارکردن بۆ ئەوەی فریای بکەون ٥ ئەو کەسەی کەوتۆتە تەنگانەو هاواری فریاکەوتن دەکا ٥ ئەوکەسەی فریای دەکەوێ و بە هانایەوە دێ ٥

**صَرِدَ** صَرَداً: سارد بوو ٥ دەگوترێ: (صَرِدَ اليوم) ئەمڕۆ ساردبوو (وصَرِدَت الرِيح) بایەکە (هەواکە) سارد بوو.

**صَرِدَ السَّهم**: تیرەکە هەڵەی کرد نەی پێکا.

**صَرِدَ** عن الشيئ: لێی لاداو بۆی نەچوو، نەی ویست ٥ **أصرَدَ السَّهمُ**: تیرەکە نەی پێکا ٥ **صَرَّدَ الشيئ**: شتەکەی کەم کردەوە ٥ دەگوترێ: (صَرَّدَ عطاءه) بەخشینەکەی کەم کردەوە ٥ **صَرَّدَ الأناء**: ئەوەندەی ئاو کردە سوراحیەکەوە کە بەشی تێر ئاو بوون نەکا ٥ **صَرَّدَ فلاناً**: ئەوەندەی ئاودا بە فلانکەس کە تینوایەتی نەشکێ ٥ **صَرَّدَ شربه**: قوم قوم ئاوی دایە، چۆڕ چۆڕ ئاوی دایە ٥ **الصَّارِدة**: هەوای ساردو سەرما ٥ **الصَّرْدُ**: پالفتە کراوو کاکڵەی شت ٥ دەگوترێ: (ذهب صَرِدٌ) زێڕی خاڵص و پوخت (نَبِيذٌ صَرِدٌ) سرکەی پاڵفتە ٥ (حُبٌّ صَرْدٌ) خۆشەویستی بێ غەل و غەش ٥ (جاء معه جيش صُرِدٌ) هێزێکی لەگەڵ هات هەموویان خزم و کەس و کاری یەکتر بوون، کەسی بێگانەیان لەگەڵ نەبوو ٥ هەروا وشەی (الصَّرد) بەمانا سەرمای زۆرە ٥ ساردییەکی زۆر بەهێز ٥ **الصُّرَد**: باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە، سەر گەورەو دەندووک گەورەیە جۆرو جانەوەری بچووک ڕاو دەکا ٥ وادەبێ چۆلەکەش نێچیر دەکا ٥ عەرەبەکان بە باڵندەیەکی شومیان داناوە ٥ **الصُّردان**: دوو ڕەگن لەناو زماندان ٥ **الصُّرَادُ**: بای سارد کە تەڕایی لەگەڵدا بێ ٥ **الصَّرِيدة**: مەڕێک سەرما کاری لێ کردبێ (ك: صَرائد) ٥ **المِصرادُ** (أرض مِصراد): زەوییەکی بێ بەرو بووم بەهۆی ساردو سەرماوە ٥ (رجل مِصراد) پیاوێکی سەرما بردە کە زوو سەرمای ببێ ٥ (ريح مِصراد) بای زۆر سارد.

**صَرَّ** صريراً: دەنگی لێ هات ٥ سیڕەی لێ هات، جریوەی هات ٥ جیڕەی هات ٥ **وصَرَّت الأذنُ**: گوێچکەی کڕە کڕی لێ هات.

**صَرَّ الناقةَ صراً**: گوانی حوشترەکەی بەست بۆ ئەوەی بێچووەکەی شیری بۆ لێ نەخورێ.

**صَرَّ الدراهم**: دیرهەمەکانی خستنە ناو کیسەی تایبەتییەوەو دەمی کیسەکەی بەست.

**صرَّ الصُّرَّةَ**: کیسە پارەکەی توند بەست.

**صَرَّ** وجهه: ناوچەوانی لێك ناو ڕوی گرژ کرد.

**صَرَّ الفرسُ أو الحمارُ أو الكلبُ**: ئەسپەکە یان گوێدرێژەکە یان سەگەکە گوێچکەی جووت کردن ٥ گوێی قوڵاغ بوو.

**صُرَّ النبات**: ڕووەکەکە سەرما لێی دا.

**صُرَّ فلان**: فلانکەس ڕژدو چرۆك بوو.

**أصَرَّ على الأمر**: لەسەر کارەکە سوور بوو وازی لێ نەهێنا ٥ بەزۆری بۆ تاوان بەکاردەهێنرێ ٥ **أصَرَّ السنبلُ**: گوڵە دانەوێڵەکە نە کامڵ بوو دەنکەکەی هەڵنەپێچابوو ٥ **أصَرَّ الناقةَ**: حوشترەکە شیری تێدا نەماو وشکی کرد ٥ **صارَّهُ على الشيئ**: تۆپزی لێ کرد بۆ کردنی کارەکەی ٥ **صَرَّرَ الناقةَ**: زۆر توند گوانی حوشترەکەی شەتەك دا بۆ ئەوەی بێچووەکە نەتوانێ شیری لێ بخوا ٥ **إصطَرَّ الحافرُ**: سمەکە ڕەق و پتەو بوو ٥

دەگوترێ: (جاء فلان يَصطَرُّ) فلانكەس هات بە تورەییو هاوار هاوارەوە ٥ الصَّارُّ: درەختی پڕ گەڵاو لقو پۆپو چڕو پڕو سێبەرخۆش ٥ الصَّارَة: پێویستی ٥ الصَّارور: ئەو کەسەی ژنی نەهێنابێ ٥ حەجی نەکردبێ ٥ الصَّارورة: بەمانا (الصَّارور)دێ ٥ الصِّرارُ: دەزوو بەنێکە لە بنی گوان دەبەسترێ بۆ ئەوەی بێچووەکە شیر نەخوا ٥ پەردەو لەمپەرو بەربەست ٥ الصِّرُّ: سەرمای کوشندە، هەوای زۆر سارد ٥ الصِّرَرُ: گوڵی دانەوێڵە کە دانەوێڵەکەی هەڵنەپێچابێ کامڵ نەبووبێ ٥ الصَّرّاء: بەردی لووس.

الصَّرَّة: کۆمەڵو تاقم ٥ هاتو هاوارو قیژو هوڕ ٥ کوشندەی بەڵاو ناخۆشییو شەڕو گەرما ٥ دەمو چاو گرژ بوون بەهۆی نارەزامەندییو پێ ناخۆش بوونەوە ٥ الصَّرَّةُ: نەرمو هاواری بەهێز ٥ کوشندەی سەرما ٥ الصُّرَّةُ: ئەوەی شتی تێ دەکرێو دەمی دەبەسترێ وەکو کیسەو تورەکەو هەمبانەو جانتا ٥ الصَّرِيدة: دیرهەمو پارەی نیکڵ کە بەسترابن ٥ المَصارُ: ریخۆڵە، دەگوترێ: (شَرِب حتى ملأ مَصارّه) ئەوەندەی خواردەوە تا ریخۆڵەکانی پڕ بوون ٥ صَرصَرَ: بە دەنگی گەورەو پچڕ پچڕ هاواری کرد ٥ صَرصَرَ الدّوابَ: ئاژەڵەکانی خڕ کردەوە ئەملاو ئەو لای مەڕو بزنە زۆرەکانی بەسەریەکدا دادایەوەو ئاژەڵە تەرەبوو و بڵاوەکانی خستەوە گەڵ جەڵەبەکە ٥ هەروا بەمانا: سەرمای کوشندەو دەنگی گەورەش دێ ٥ الصُّرصور: سیسرە، حەشەرەیەکی زیانبەخشەو بە زۆری لە تەوالێتو شوێنی ئاوادا دەژی، شاخی درێژی لە تاڵە موو هەمن ٥ زۆربەی کات دەنگی سیرە سیری هەیە

الصِّراط: رێگا ٥ صَرَعَهُ صَرعاً ومَصرعاً: خستییە سەر زەوی، خێی کرد ٥ دەگوترێ: (صرعته المنية) مردن فلانکەسی خێپ کرد ٥ تارومار کرد ٥ صَرَعت الريح الزرع: رەشەباکە کشتوکاڵەکەی لاڵو پاڵ خست.

صَرَّعَ الباب: دەرگاکەی کردە دوو تاکی.

صُرِعَ فلان: فلانکە تووشی پەرکەمو فێ لێ هاتن بوو ٥ شەپڵەی لێ هات ٥ صارعَه مُصارعةً وصِراعاً: لە زۆرانبازیو پاڵەوانێتیدا بەسەریدا زاڵ بوو، بۆری دا ٥ صَرَّعَهُ: زۆر بەهێز بە زەویدا دا ٥ صَرَّعَ البابَ: دەرگاکەی کرد بە دوو تاکی ٥ صَرَّعَ البيتَ: هەردوو تاکی شیعرەکەی واڵ کردن سەرەوایان یەك بێ ٥ إصطَرَعَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە کێشەو زۆرانبازیو یەکتر هێنانو بردن ٥ تصارع الرجلان: ئەو دوو پیاوە هەریەکەیان هەوڵی دا ئەوی تر بە زەویدا بدا ٥ خێی بکا ٥ الصَّرْعُ: نەخۆشییەکە لە کۆئەندامی دەمارردا پەیدا دەبێ لەگەڵیدا بێ هۆشیو گرژبوونی ماسولکە پەیدا دەبن بەکوردی پێی دەگوترێ فێ، پەرکەم ٥ الصَّرعان: دوو لایەنی شت ٥ دەگوترێ: (للأمر صرعان) ئیشەکە دووسەرەو دوولایەنە ٥ (جئتە صَرعَي النهار) بەیانیو ئێوارە هاتم بۆ لای ٥ (هو ذو صرعين) ئەو دوو ڕەنگە ٥ الصِّرْعُ: هاوشێوە ٥ جۆرو فەنی شت ٥ دەگوترێ (ما أدرى على أي صِرعي أمره هو) نازانم ئەو لەسەر چ ڕێو شوێنو بابەتێکە ٥ هەروا بەمانا (المصارع)دێ ٥ دەگوترێ: (هما صِرعان) ئەو دوانە دوو پاڵەوانی زۆرانبازی گۆڕەپانن ٥ الصُّرعةُ: پاڵەوانێکە زۆر کەس بیخەنو بەزویدا بدەن ٥ الصُّرَعَةُ: پاڵەوانی سەرکەوتوو لە زۆرانبازیدا ٥ الصَّرِيعُ: تێشکاو و بۆڕدراو لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا ٥ لاڵو پاڵ کەوتو، خێپ بوو، داهێزاو شپرێو ٥ شێتو وێت

٥ المُصارعَة: وەرزشێکی جەستەییە هێزو توانای تێدا بەکار دەهێنرێ، لە نێوان دوو پاڵەواندا ئەنجام دەدرێ‌و لە گۆرەپانداو لە ژێر چاودێری حەکەم‌و بە پێی برِی یاسای تایبەت بەو وەرزشە ئەنجام دەدرێ ٥ هەریەکە لە دوو پاڵەوانەکە هەوڵ دەدا بەرامبەرەکەی بۆرِ بدا ٥ المِصراع: تاکی دەرگا ٥ یەکێ لە دوو تاکی دەرگا کە یەکیان بەلای چەپ‌و ئەوی تریان بەلای راستدا دەکرێنەوە ٥ هەروا ناوە بۆ نیو دێرِ شیعر ٥ شیعریش دوو تاکی هەیە یەکیان پێی دەگوترێ (صدر) ئەوی تریان (عجز).

**صَرِفَ البابُ أو القلمُ**: دەرگاکە جیرەی کرد، قەڵەمەکە سیرەی هات.

**صَرَفَ نابُهُ وصرَفَ بنابه**: ددانی جیرەیان هات ددانی لە جیرەوە بردن.

**صَرَفَ الشيئَ صَرفاً**: شتەکەی لە رێرەوی خۆی گێرایەوە، دەگوترێ: (صَرَفَ الأجيرَ مِن العمل) کرێکارەکەی لە ئیشەکە گێرایەوە نەیهێشت بیکا ٥ (صرف الغلام عن المكتب) منداڵەکەی لە مەکتەب گەراندەوە.

**صَرَفَ المالَ**: ماڵەکەی بەخشی بەسەر ئاتاجاندا.

**صَرَفَ النقدَ**: پارەکەی گۆرِییەوە بە پارەی تر یان بەپارەی وردە.

**صَرَفَ الكلامَ**: قسەکانی رازاندەوە.

**صَرَفَ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ شتی تر نەکرد ٥ **اصـرَفَ الـشَّراب**: بەخالـصی شـەرابەکەی پێشکەش کرد، هیچی تری تێکەڵ نەکرد ٥ **صارَفَ نفسه عن الشيئ**: بە زۆر لە خۆکردن نەفسی خۆی لە شتەکە گێرایەوە ٥ **صَرَّفَ الأمرَ**: کارەکەی جێبەجێ کردو خستیە سەر رێرەوی خۆی ٥ دەشگوترێ: (صرف الله الرياحَ) خودا بایەکەی لادا بۆ شوێنێکی تر ٥ هەروا وشەی (صَرَّفَ) بەمانا رونکردنەوەش دێ ٥ **صَرَّفَ الألفاظَ**: هەندێ وشە لە هەندێکی تریان دەرهێنراون ٥ **صَرَّفَ الشرابَ**: شەرابەکەی بە خالصی هێشتەوە هیچی تری تێکەڵ نەکرد ٥ زێدە رِۆیی کرد لە گێرانەوەی شتەکە لە شوێنی خۆی ٥ **إصطَرَفَ**: گەرِا بەشوێن کاسبی دا، هەوڵی کاسبی کردنی دا ٥ **إنصَرَفَ عنه**: لێی لاداو وازی لێ هێنا، بەجێی هێشت ٥ **تَصَرَّفَ فلان في الأمر**: فلانکەس لە کارەکەدا فرت‌و فێڵ‌و پلانی ئەنجامدان بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێ، یان لە شتێك رزگاری بێ ٥ **تَصَرَّفَ لعياله**: کاسبی بۆ ماڵ‌و منداڵەکەی کرد ٥ **تَصَرَّفَ به الأحوال**: حاڵ‌و وەزعی جۆراو جۆری بەسەردا هاتن ٥ بارو دۆخی ژیانی گۆرِان ٥ **إستَصرَفَ الله المكاره**: داوای لە خودا کرد ناخۆشییەکانی لەسەر لابەرێ ٥ **تصاريف الأمور**: گۆرِانکاریی رِوداوەکانی ژیانی کە بەسەریدا هاتوون ٥ **تصاريف الرياح**: هەڵکردنی با لەچەند لایەکەوە ٥ **الصّارِف**: کەڵبە، ددان ٥ **الصَّرّافُ**: پارە گۆرِەرەوە ٥ ئەو کەسەی پارە دەگۆرِێتەوە بە پارەی وردە یان بە پارەی تر ٥ ژمێریارو بەرپرس لەسەر قاصەو خەزێنە بۆ وەرگرتن‌و صەرف کردنی پارە ٥ **الصِّرافة**: پیشەی پارە گۆرِینەوە ٥ **الصَّرف** (صَرف الدهر): بەڵاو کارەساتی رِۆژگار ٥ لە بواری ئابووریدا بریتییە لە گۆرِینەوەی پارەی وڵات بە پارەی وڵاتێکی تر ٥ هەروا بە نرخی گۆرِینەوەکەش دەگوترێ ٥ لە بواری زمانەوانیدا زانیارییەکە بە هۆیەوە چۆنیەتی بینای کەلیمەو شێوەی دروستکردنی دەزاندرێ، واتە: (زانیاری صەرف) لە زاراوەی نەحوییاندا بریتییە لە لکانی تەنوین (دوو سەر یان دوو بۆر

یان دوو زێر) له كۆتایی وشەوەو دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە كە ئەو وشەیە لە جۆری (اسم)ە و تێیدا ڤاڵبۆتەوە ٥ الصَّرَفان: رەصاص ٥ الصَّرفان: شەو و رۆژ ٥ الصَّرف: شتی خاڵصو پوختەو بێ خەوش ٥ دەگوترێ: (شراب صِرف) شەرابێكی خاڵصو بێ خەوشە هیچی لەگەڵ تێكەڵاو نەكراوە ٥ الصَّريف: زیوی خالص ٥ شەرابی خالصو بێ خەوش ٥ شیر كە تازە دۆشرابێ ٥ الصَّيْرَف: ئەو كەسەی دیرهەمی زیو ئاڵوگۆڕ دەكا ٥ كاروبار رێكخەرو خاوەن ئەزموون لە ئیشدا ٥ الصَّيْرَفِيُّ: بەمانا (الصَّيْرَفُ)دێ ٥ الْمَصرِفُ: گەڕانەوەو ئینصیراف ٥ شوێنی پارە گۆڕینەوە ٥ جۆگاو ڕێڕەوی ئاوە بۆ ڕەوانبوونی ئاوی زیادە لە زەوی ئاو دراوو تێر ئاو كراو ٥ صَرَمَهُ صرماً: بڕییەوە ٥ دەگوترێ: (صَرَمَ الحَبلَ) حەبلەكەی بڕی ٥ (صَرَمَ النَّخل والشجر) دار خورماكە یان درەختەكەی بڕییەوە.

صَرَمَ فلاناً: دەنگی لە فلانكەس دابڕیو هامو شۆی ناكا ٥ دەشگوترێ: (صَرَمَ وصلَه) سیلەی ڕەحمی بڕی ٥ صَرُمَ السَّيفُ صَرامَةً وصَرُمَةً: شمشێرەكە بڕندەو تیژ بوو ٥ صَرُمَ فلان: فلانكەس ئازاو بەجەرگو ورە بەرز بوو، سوور بوو لەسەر گەیشتن بە ئامانجو تەواوكردنی كارەكانی (هو صارم وصروم) ٥ اصرَمَ النخل والشجر: دارخورماكە یان درەختەكە كاتی ئەوەیان هاتووە ببڕدرێنەوە ٥ صارَمَهُ: بڕییەوە ٥ صَرَّمَهُ: پارچە پارچەی كرد ٥ إنصَرَمَ: بڕایەوە، دابڕا ٥ ڕۆیشتو تەواو بوو ٥ دەگوترێ: (إنصَرَمَ الليلُ) شەو ڕۆیشت، (إنصَرَمَ الشتاءُ) زستان تەواو بوو ٥ تَصارمَا: یەكتریان بڕیەوە ٥ بڕانەوە ٥ تَصَرَّمَ: پارچە پارچە بوو ڕۆیی بەسەرچوو ٥ دەگوترێ: (تَصَرَّم الليلُ) شەو ڕۆیشت ٥ تَصَرَّمَ الرجلُ: فلانكەس ئازاو بەجەرگو خۆڕاگر بوو ٥ الصَّارِمُ: دەگوترێ: (سيف صارم) شمشێری بڕندە ٥ (رجل صارم): پیاوی ئازاو بەجەرگ ٥ یان سوورە لەسەر كارەكانی دەیەوێ ئەنجامیان بدا ٥ الصُّرَّامُ: پێست فرۆش: پێڵاو فرۆش خوف فرۆش ٥ الصَّرْمُ: پێست ٥ الصِّرْمُ: پارچە لەهەر شتێك بێ ٥ تاقمێ خەڵكی گۆشەگیر ٥ خوففی شێوە نەعل ٥ الصِّرْمَةُ: كۆمەڵە دارخورما ٥ یان جەڵەبە حوشتر ٥ پەڵە هەور ٥ الصَّرِيم: ئەوەی بەرو بوومەكەی كۆكرابێتەوە ٥ میوەی بەسەر یەكدا كەوتوو ٥ بەشێك لە شەو یان لە ڕۆژ ٥ كۆمەڵە لمی تاقەوە بوو لە لیەلان ٥ الصَّرِيمَة: بەمانا (الصَّرِيم) دێ ٥ كار قایم كردنو ڕێكخستنو ورە بەرزی تێیدا ٥ دابڕان ٥ جەڵەبو پۆل.

صَرِيَ الرجل صَرياً: نەیهێشت پیاوەكە بە ویستی خۆی بكا ٥ مەنعی كرد لەوەی دەیەویست.

صَرِيَ الماء واللبن والدمع: ئاوەكە یان شیرەكە یان فرمێسكەكەی لە شوێنی خۆیدا قەتیس كرد ٥ صَرَتِ الناقةُ عُنُقَها: حوشترەكە لەبەر گرانی بارەكەی ملی بەرز كردەوە.

صَرِيَتِ الناقة صَرياً: حوشترەكە گوانی پڕ بوو لە شیر.

صَرِيَ الماء، واللَّبَنُ: ئاوەكە یان شیرەكە لە شوێنی خۆی مایەوە و بۆگەن بوو، گۆڕا.

صَرِيَ الدمعُ: فرمێسكەكە لە چاودا قەتیس ماو نەهاتە خوار.

صَرِيَ فلان في يد فلان: فلانكەس لای فلانكەس مایەوە بە حەبس كراویی ٥ أصرَتِ النَّاقةُ: حوشترەكە شیرەكەی لە گواندا مایەوە.

**صري** **الناقة**: شیری حوشترەكەی لە گوانیدا حەبس كرد ٥ **الصّاري**: كۆڵەكەیەكە لە كەشتیدا حەبلەكانی پێوە دەبەسترێ ٥ هەروا ناوە بۆ كەشتییەوانەكە ٥ **ألصّارية**: بیری ئاو ٥ كۆڵەكەیەكە حەبلەكانی دۆڵچەی پێوە دەبەسترێ ٥ **ألصَّري**: هەرشتێ زۆر بمێنێتەوەو بۆگەن بكا ٥ دەگوترێ: (لبن صَرًى) شیرێكە تامو بۆنی گۆڕاوە ٥ **المُصراة**: ئاژەڵێك شیردەربێ‌و شیری لە گواندا هێڵدرابێتەوە ٥ **الأُصطُبَّةُ**: (مشاقە الكتان) واتە ئەو وردەو خشتو خۆڵەی لە كەتان هەڵدەوەرێ لەكاتی گێرەكردن‌و پاككردن دا ٥ **المِصطَبُ**: سندانی ئاسنگەر ٥ **المِصطَبَة**: سەكۆی لەسەر دانیشتن.

**صَعُبَ** **صُعوبَةً**: قورس‌و گران بوو ٥ **أصعَبَ الأمرَ**: بەمانا (صَعُبَ)دێ ٥ **اصعَبَ الرجلُ**: پیاوەكە تووشی كاری قورس بوو ٥ **أصعبَ الشيءَ**: شتەكەی بە قورس هاتە بەردەست ٥ **صَعَّبَهُ**: شتەكەی قورس كرد ٥ **تَصَعَّبَ**: بەمانا (صَعُبَ)دێ ٥ **تَصَعَّبَ الأمر**: كارەكەی بە قورس‌و گران لە قەڵەم دا ٥ **إستَصعُبَ الأمرُ**: بەمانا (صَعُبَ)دێ ٥ **استَصعَبَ الأمرَ**: كارەكەی بە گران بینی پێی وابوو قورسە ٥ **ألصَّعبُ**: ناخۆش‌و گران ٥ داكۆكیكار ٥ دەگوترێ: (عقبة صعبة) و(حیاة صَعبة) ٥ **الصُّعبَةُ**: پارەی گرانبەها ٥ وەكوو زێڕو زیو و دۆلارو پۆڕۆ ٥ **ألمُصعَبُ من الرجال**: (پیاوی كراو بەگەورە) ٥ لە حوشتریشدا بە حوشترێك دەگوترێ بۆ تۆو بەكاربێ‌و كەس بۆی نەبێ سواری بێ‌و باری لێ بنێ.

**صَعدَ** **صُعُداً**: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (صَعِدَ الجبلَ) چووە سەر كێوەكە ٥ (وصَعِدَ السُّلَّمَ) چووە سەر پەیژەكە ٥ دەشگوترێ: (صَعِدَ فيه وعليه وإليه) ٥ بۆلای خودا وشەی خاوێن‌و پیرۆز بەرزدەبێتەوە ٥ **أصعَدَ**: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (أصعَدَ في الأرض) بەرزبۆوە بۆسەر بەرزایی یەك ٥ **اصعَدَ في العدو**: بەهێزو خێرایی بازی دا ٥ **اصعَدَ في الوادي**: بە شیوەكەدا سەرەو ژێر بۆوە ٥ **اصعَدَتِ السّفينة**: شیراع‌و حەبلی كەشتییەكە درێژ كرایەوەو ڕەشەبا بردی ٥ **صَعَّدَ في الجبل وعليه وعلى الدرجة**: چووە سەر كێوەكە ٥ **وصَعَّدَ فيه النظر**: بە وردی لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەیری كرد ٥ **صَعَّدَ الشّراب**: شەرابەكەی بەئاگر كوڵاند بۆئەوەی ڕەنگ‌و تامەكەی بگۆڕێ ٥ **صَعَّدَ السائلَ**: شلەمەنییەكەی گۆڕی بۆ بوخار بەهۆی كاریگەریی گەرمی ٥ **صَعَّدَ الحَربَ**: توندو تیژیی شەڕەكەی پەرەپێ داو وای لێ كرد زیاتر توندو تیژ ببێ ٥ **تَصَاعَدَ، يَتَصَاعَدُ ويَصَّاعَدُ**: بەمانا (صَعِدَ)دێ ٥ **تصاعَدَهُ الأمرُ**: كارەكەی لەسەر شان قورس بوو ٥ **تَصَعَّدَ يَتَصَعَّدُ يَصَّعَّدُ**: بەمانا (تصاعَدَ)دێ ٥ **تَصَعَّدَ في الشيءِ**: بەناخۆشی‌و زەحمەت لەگەڵ كارەكە ڕۆیشت بەئەركێكی زۆر شتەكەی جێ بەجێ كرد ٥ **تَصَعَّدَ النَّفَسُ**: بەناخۆشی هەناسەی هەڵێنا ٥ **تَصَعَّدَ الشيءُ الرجلَ**: شتەكە پیاوەكەی ماندو كردو تینی بۆ هێنا.

**الصَّعدُ**: دەگوترێ: (بلَغَ كذا فصاعِداً): گەیشتە ئەوەو زیاتریش ٥ **الصَّعَدُ**: نارەحەتی‌و شەكەتی ٥ (عذاب صَعَدٌ): سزای زۆرو توند ٥ **الصُّعُدُ**: كشمەكردن بەرەو بەرزی، دەگوترێ: (هذا النبات ينمو صُعُداً): ئەم ڕووەكە لەباری درێژی‌و بەرزی زیاد دەكا ٥ **الصُّعَداءُ**: نارەحەتی‌و شەكەتی ٥ (تنفس الصُّعَداء): هەناسەی قوڵ‌و ئازاراوی ٥ **الصَّعُودُ**: نارەحەتی‌و مەینەتی ٥ كۆسپو

تەگەری ناخۆش ٥ **الصَّعِيدُ**: روی زەوی ٥ گڵو خۆڵ ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنی بەرز لەزەوی وەکوو بانی مقان یان صەعیدی میصر ٥ شوێنی بەرفراوان ٥ **المِصْعَادُ**: ئامێری بەرزکردنەوە ٥ مەصعەد کەبەهۆی هێزی کارەباوە بەرز دەبێتەوەو دێتەوە خوار بۆ باڵەخانەی بەرز بەکاردەهێندرێ ٥ **المِصْعَدُ**: بەمانا (المِصْعَاد)دێ.

**صَعِرَ صَعَراً**: ملی یان دەمو چاوی بەلایەك دا خواركردەوە ٥ جاری وادەبێ بەهۆی نەخۆشییەوە دەمو چاوی یان ملی خواردەبێ.

**صَعِرَ فلان**: فلانکەس بەهۆی لوتبەرزیو خۆبەزلزانییەوە روی وەرگێڕا.

**صَعَّرَ رأسَهُ**: سەری بچوك بوو ٥ **أصْعَرَ خَدَّهُ**: روی خۆی بەهۆی خۆ بەزلزانیو بەخۆ نازینەوە وەرگێڕا ٥ صاعَرَ: بەمانا (أصْعَرَ)دێ ٥ **صَعَّرَ خَدَّهُ**: روی خۆی وەرگێڕا لەبەر تەکەببورو خۆ بەزلزانی ٥ **تَصَاعَرَ**: بەمانا (صَعَّرَ)دێ ٥ **تَصَعَّرَ**: بەمانا (تصاعَرَ)دێ ٥ **إصْعَرَّت الدابة**: وڵاخەکەی رۆیشتنی خۆی خێرا کردو کەوتە مەیەلانو خۆبادان ٥ **الصَّعَرُ**: دەردێکە توشی مل دەبێ (ملە رەقە) ٥ **صَعْصَعَ الرجلُ صَعْصَعَةً وصَعْصَاعاً**: پیاوەکە ترساو کەوتە لەرزینو شەقەتۆڵەی پێ کەوت، کەوتە هاتوو چۆو هاواری کرد ٥ **صَعْصَعَ القومَ**: قەومەکەی ترساندنو لێکی بڵاو کردن پەرتەوازەی کردن ٥ **صَعْصَعَ رأسَهُ بالدهن**: رۆنی لەسەری دا، بەتەواویی چەوری کرد ٥ **تَصَعْصَعَ القومُ**: قەومەکە ترسانو پەرتەوازە بوون، دەشگوترێ: (تَصَعْصَعَتْ صفوفهم): ریزەکانیان پەرتەوازە بوونو لەشوێنی خۆیان هەڵکەندران ٥ **تَصَعْصَعَ بهم الدَّهرُ**: رۆژگار گەلو هۆزەکەی تەفرو توناکرد ٥ **الصَّعْصَعُ**: پەرتەوازەو بڵاوە بوو ٥ **صَعْفَقَ**: جەستەی لاوازو سیس بوو ٥ **الصَّعْفَقَ**: کەسێك بچێتە بازاڕ بۆ مامەڵەو پارەی پێ نەبێ، کە بازرگانێك بێ شتێك بکڕێ خۆی پێوە هەڵواسێو خۆی بخاتە گەڵی بۆنەوەی شتێکی دەست بکەوێ ٥ **الصَّعْفُوقُ**: بەمانا (الصَّعْفَقُ)دێ ٥ **صَعَقَتهم السماءُ صَعْقاً**: ئاسمان بروسکەی لێ دان ٥ **صَعَقَت الصَّاعِقَةُ القومَ**: هەورە بروسکە لەوقەومەی دا، سوتاندنی لەناوی بردن.

**صَعَقَ التيار الكهربي الرجلَ**: کارەبا لەوپیاوەی دا، کارەبا گرتی.

**صَعِقَ الحيوانُ**: گیانلەبەرەکە دەنگی بەهێز بوو، زیڕاندی باڕاندی نەڕاندی زەڕاندی، دەگوترێ: (صَعَقَ الحمارُ وصَعَقَ الثور).

**صَعِقَ الرجلُ**: پیاوەکە هەورە بروسکە لێی دا، بێ هۆش بوو، خپ بوو، گیانی دەرچوو.

**صُعِقَ**: هەورە بروسکە لێی دا ٥ (فهو مَصْعوق) ٥ **أصْعَقَهُ**: بەمانا (صَعَقَهُ)دێ ٥ **الصَّاعِقَةُ**: هەورە بروسکە؛ ئاگرێکە لەئاسمانەوە دێتە خوار ٥ بەڵاو کارەساتی کوشندەو فەوتێنەر (مانِعَة الصواعق): کۆڵەکەو عەمودی ئاسنو شتی وایە لەسەر باڵەخانەی بەرز دەچەقێندرێن بۆ پارێزگاری لەبروسکە ٥ **الصَّعِقُ**: دەنگی بەشیدەتو بەهێز ٥ کەسێك لەهۆش خۆ چووبێ ٥ پیاوێك چاوەڕوانی هەورە بروسکە بکا.

**صَعِلَ صَعَلاً**: سەرباریكو مل باریك بوو ٥ **إصْعَالَّ**: بەمانا (صَعِلَ)دێ.٥ **الصَّعْلُ**: درێژ ٥ مل باریكو سەرباریك ٥ **الصَّعْلَةُ**: باریکیو لاوازیو کێش سوکی لەجەستەدا ٥ درەختی دارخورما کە قەدی خوارو لقو پرژی روتبن ٥ **صَعْلَكَ فلاناً**: فلانکەسی هەژار خست ٥ **صَعْلَكَ البقلُ الدوابَ**:

گیاو گژەکە ئاژەڵەکەی قەڵەو کرد ◊ **تَصَعْلَكَت الإبلُ**: حوشترەکە کوڵکەکەی روتایەوە، بەربوو ◊ **تَصَعْلَك الرجلُ**: پیاوەکە هەژار بوو ◊ **الصُّعْلُوك**: هەژار ◊ **المُصَعْلَك**: (رأس مصعلك): سەری خڕی بچوک ◊ **صَغُرَ صَغراً**: تەمەنی لەتەمەنی ئەو کەمتر بوو

**صَغُرَ صِغراً**: قەبارەی بچوک بوو یان تەمەنی کەم بوو.

**صَغُرَ صَغاراً**: بەژێر دەستەیی‌و زەلیلی رازییە ◊ **اصْغَرَ**: کاری بچوکی ئەنجام دا ◊ **أصْغَرَت الأرضُ**: زەوییەکە روەکەکەی درێژ نەبوو ◊ **أصْغَرَ فلاناً**: فلانکەسی زەلیل‌و ریسوا کرد ◊ **صَغَّرَهُ**: بچوکی کردەوە، زەلیل‌و ریسوای کرد ◊ **تَصَاغَرَ فلان**: فلانکەس لاسایی منداڵی کردەوە، هەڵس‌و کەوتی منداڵانەی نواند ◊ **تَصَاغَرَ الیه نفسُهُ**: لەپێش چاوی خۆی خۆی بەکەم زانی‌و بەچاوی سوک سەیری خۆی کرد.

**اسْتَصْغَرَ**: داوای شتی بچوکی کردو پێی رازی بوو ◊ **اسْتَصْغَرَ الشيءَ**: شتەکەی بەبچوک دانا، بەبچوکی لەقەڵەم دا ◊ **الأصْغَرُ**: بچوکتر ◊ **الأصْغَران**: دڵ‌و زوبان ◊ **التَّصْغيرُ**: لەزاراوەی عیلمی صەرف دا بریتییە لەوەی یایەکی ساکن لەدوای دووەم پیتی ئیسمەکەوە زیاد بکرێ‌و شێوەی وشەکەش گۆڕانکاری تێدا بکرێ، بۆمەبەستی بەدیهێنانی مانای بچوککردنەوەو پرو پوچ کردنی شتەکە وەکوو (حَسَن حُسَيْن، قمر قُمَيْر، کتاب کُتَيب) ◊ **الصُّغَّارُ**: بەمانا (الصَّغير)دێ ◊ **الصُّغَيْرة**: تاوانی بچوک.

**صَغَا صَغواً**: مەیلی کرد.

**صَغَت الشمسُ والنجومُ**: خۆر یان ئەستێرە بەلای خۆرئاوادا مەیلی کرد خەریک بوو ئاوابێ.

**صَغَا فلان**: فلانکەس بەلایەك دا خوار بۆوە کەوتە سەر لاتەنیشتی.

**صَغَا الی القوم**: بەدڵ لەگەڵ قەومەکە بوو مەیلی ئەوانی هەبوو.

**صَغَا علی القوم**: بەدڵ لەگەڵ غەیری قەومەکە بوو ◊ لاخوار بوو.

**صَغِيَ**: مەیلی کرد ◊ **أصْغَى الی فلان**: جوان گوێی لەفلانکەس گرت ◊ **أصْغَى الإناءَ**: قاپەکەی خوارکردەوە بۆئەوەی ئەوەی تێیدایە بیرێژێ ◊ **صاغِيَة الرَّجُل**: دارو دەستەو دەربار، ئەوانەی حەزیان لەرێبازی ئەوە ◊ **الصَّغْوُ**: ناوەوەی لوێچ.

**صَفَحَ عنه صَفحاً**: روی وەرگێڕا.

**صَفَحَ عن ذنبه**: لێی خۆش بوو لەتاوانی بوری.

**صَفَحَ فلاناً عن حاجته**: فلانکەسی لەئیشەکەی گێڕایەوە، نەیهێشت بگاتە مەبەستی خۆی.

**صَفَحَ القومَ**: خەڵکەکەی یەك یەك رانواند.

**صَفَحَ ورق الکتاب**: پەڕە پەڕە کتێبەکەی هەڵدایەوە.

**صَفَحَ الشيءَ**: شتەکەی پان کرد.

**صَفَحَ فلاناً بالسیف**: شمشێرەکەی لەباری پانی بەفلانکەس کێشا، شمێرەکەی پانەو پان لەفلان کەس دا ◊ **صَفِحَتْ جبهته صَفحاً**: ناوچاوانی زۆر گوشاد بوو ◊ **أصْفَحَ الشيءَ**: شتەکەی هەڵگێڕایەوە ◊ **أصْفَحَ فلاناً عن الحاجة**: فلانکەسی لەپێویست‌و مەبەستی خۆی گێڕایەوە ◊ **صافَحَهُ**: تۆقەی لەگەڵ دا کرد، دەستی خستە ناو دەستیەوە ◊ **صَفَّحَ الشيءَ**: شتەکەی پان کرد ◊ **صَفَّحَ بیدیه**: بەهەردوو دەستی چەپڵەی لی دا ◊ **صَفَّحَ الشيءَ**: شتەکەی بەپارچە لەوح‌و پارچە

تەنەکە داپۆشی، یان بە پۆلا داپۆشی ٥ تَصَفَّحَ الشیئَ: لەشتەکە ورد بۆوە، زۆر سەیری کرد، دەگوتری: (تَصَفَّحَ الکتابَ): کتێبەکەی پەڕە پەڕە کردو لێی روانی ٥ تَصَفَّحَ القومَ: لەخەڵکەکە ورد بۆوە بۆئەوەی بزانێ چی دەکەن و کێن و بەتەمای چین، یان بۆئەوەی یەکێکیان لێ بناسێ ٥ اسْتَصْفَحَ فلاناً: داوای لێبوردنی لەفلانکەس کرد ٥ اسْتَصْفَحَ فلاناً ذنبه: داوای لەفلانکەس کرد لەتاوانی خۆش ببێ ٥ الصِّفاحُ: دەگوترێ: (لَقِيه صِفاحاً): روبەڕو توشی بوو یان لەناکاوو گۆزو گوممەت توشی بوو ٥ الصَّفْحُ: عەفوو لێبوردن ٥ تەنیشت و لا، دەگوترێ: (صَفْحُ الجبل): پانتایی کێو، بناری کێو ٥ (صَفْحُ السیف): پانایی شمشێر ٥ (صَفْحُ الوجه): پانتایی روخسار ٥ ضَرَبَ عنه صَفْحاً: روی لێ وەرگێڕا ٥ صَفْحَةُ الشیئ: روی شت و لای شت ٥ (صَفْحَةُ الورقة): رویەکی لاپەڕە ٥ صَفْحَةُ الرجل: تەختی سنگی پیاوەکە، پەنای سنگی، دەگوترێ: (أبدی صَفْحَتَهُ): نهێنییەکانی ئاشکرا کرد، یان بەئاشکرا تاوانی ئەنجام داو سنوری شەرع و یاسای بەزاند ٥ الصَّفحتان: دوو کوڵم، دوو لاڕومەت ٥ الصُّفَّاحُ: بەردی پان و تەنك ٥ الصَّفُوحُ: دڵفراوان و لێبوردە ٥ (امرأة صَفوح): ئافرەتێکی رو وەرگێڕو چەموش و کەللە رەقە ٥ الصَّفیحُ: تەختی روی هەرشتێك پان بێ ٥ لە پلێتی ئاسن و تەنەکەو شتی لەو جۆرە کەلەبواری پیشەسازیی دا بەکاردێن ٥ الصَّفیحةُ: هەرشتێك پان بێ لەبەردو لەوحەو شتی لەوجۆرە ٥ روبەری هەرشتێك پان بێ ٥ وەکوو پانایی شمشێر، پانایی لەوحەی ئاسن و تەنەکەو بەرد ٥ صَفیحة الوجه: پێستی روخسار ٥ دەبەیەکە لەئاسن و تەنەکەو شتی لەو جۆرە بەنزین و زەیتی تێدەکرێ ٥ صَفائح الباب: لەوحەی دەرگا ٥ المُصَفَّحُ: (ألفٌ مُصَفَّحٌ): لوتێك کونەکانی رێك بن، هەرشتێك بەلەوحەو شتی وا داپۆشرابێ ٥ المُصَفَّحَةُ: دەگوترێ: (سیارة مُصَفَّحَةٌ): سەیارەیەکە بە لەوحەی پۆلا داپۆشراوە بۆئەوەی ببێتە دیرع و پارێزەر بۆی ٥ صَفَدَهُ صَفْداً: بەستی و شەتەکی دا پێوەندی کرد ٥ أصْفَدَهُ: بەمانا (صَفَدَهُ)دێ ٥ ئەوەندەی پێ بەخشی و دەسنەخۆری کرد تا بەبەخشین پێوەندی کرد ٥ صَفَدٌ: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (صَفَدَهُ)دێ ٥ الصِّفادُ: پێوەندو کەلەبچە ٥ الصَّفَدُ: بەمانا (الصِّفادُ)دێ ٥ هەروا بەمانا بەخشش دێ.

**صَفَرَ** صفیراً: فیتوی لێ دا ٥ بەدەم و لێوی فیتە فیتی کرد.

**صَفَرَ** به: بەدەنگی فیتو بانگی لێ کرد.

**صُفِرَ**: برسی بوو ٥ توشی نەخۆشی زەردویی بوو ٥ کرمی گەدەی تێدا پەیدا بوو.

**صَفِرَ** صَفَراً وصُفُوراً: خاڵی بوو، هیچی تێدا نەما، دەگوترێ: (صَفِرَ البیتُ من المتاع): ماڵەکە لەکاڵاو شت و مەك خاڵی بوو.

**صَفِرَ** الإناءُ من الشرابِ: پەرداخ و سوراحییەکە شەرابی تێدا نەما ٥ صَفِرَت یده من المال: هیچ پارەو ماڵ و سامانی لەدەست دا نەما ٥ (فهو صَفِرٌ).

**أصْفَرَ** الشیئُ: بەمانا (صَفِرَ)دێ ٥ أصْفَرَ فلانٌ: فلانکەس هەژار کەوت ٥ أصْفَرَ الشيءَ: شتەکەی خاڵی کرد لەوەی تێیدا بوو ٥ صَفَّرَ: بەمانا (صَفَرَ)دێ، دەگوترێ: (صَفَّر له): بەفیتو بانگی کرد، فیتوی بۆ لێ دا ٥ صَفَّرَ الشیئَ: شتەکەی زەرد کرد ٥ بەرەنگی زەرد رەنگی کرد.

**صَفَّرَ الثوبَ**: قوماشەکەی بەڕەنگی زەرد ڕەنگ کرد ٥ یان ئەو شتانەی لەقوماشەکە دا بوون دەری هێنان، دەگوترێ: (صَفَّرَ البیتَ من المتاع): خانوەکەی لەناو ماڵ خاڵی کردو هیچی تێدا نەهێشت ٥ **إصْفَرَّ**: ڕەنگی زەرد بوو ٥ **إصْفَرَّ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە وشك بوو، کاتی دروێنەو بەرو بوم کۆکردنەوەی هات ٥ (هو أصفر وهي صفراء) ٥ **الأصْفَرُ**: زێڕ ٥ (بنو الأصفر): نازناوی ڕۆمەکانی دانیشتوی کیشوەری ئاسیای بچوکە لەگەڵ قوستەنتینیەو دەورو بەری ٥ **الأصفران**: زێڕو زەعفەران ٥ **الصِّفَارُ**: ئەو پاشماوە خۆراكو ئالفەی لە ددانی ئاژەڵ دا دەمێنێتەوە ٥ **الصُّفَارُ**: فیتو، دەشگوترێ: (في كلامه صُفَارٌ): لەقسەکانی دا جۆرە دەنگێکی فیتو ئاسا هەیە ٥ هەروا ناوە بۆ کرمی ناوسك ٥ ئاوێکی زەردە لەورگا کۆدەبێتەوە ٥ نەخۆشی زەردویی، جۆرە زەردییەکە لەسەر پێست پەیدا دەبێ بەهۆی کزی یان نەخۆشییەوە ٥ **الصُّفَارَةُ**: روەکی پەڕیوو زەرد هەڵگەڕاو.

**صَفَرٌ**: مانگی دووەمی ساڵی قەمەرییە ٥ **الصُّفْرُ**: مسی زەرد ٥ زەرفی خاڵیو بەتاڵ ٥ **الصِّفْرُ**: برسێتی ٥ کرمی ناو ریخۆڵەو گەدە ٥ نەخۆشییەکە روخسار پێی زەرد دەبێ ٥ **الصَّفْرَاءُ**: زێڕ، پێکهاتەو تێکەڵەیەکە لەپێکهاتەکانی جەستە ٥ شلەمەنییەکی زۆر تاڵە لەزراودا خەزن دەبێ ڕەنگی زەردی مەیلەو سوورە ٥ **الصَّفَّارُ**: مس دروستکەر، مزگەر، دروستکەری مسی زەرد ٥ **الصَّفَّارَةُ**: فیتفیتۆکە (شاور) ئامێرێکە فوی پێدا دەکرێو دەنگی دێ ٥ **الصُّفْرِیَّةُ**: پێڕێکن لەخەواریجە سەرەتاییەکان لەعێراق بوون لەسەردەمی ئەمەوییەکان دا مابوون ٥ **الصَّفِیرُ**: دەنگێکە زۆر خاویی تێدایە

وەکوو (س.ز.ص) ٥ **صَفْصَفَ**: بەتەنیا کەوتە چۆڵەوانیو سارا ٥ **صَفْصَفَ العُصفور**: چۆلەکەکە جریواندی ٥ **الصَّفْصَافُ**: درەختێکە درەختی خیلافی ناوە ٥ **الصَّفْصَفُ**: زەوی دەشتی روتەنو هیچ لێ نەڕواو ٥ دەشتی کاکی بەکاکیو چۆڵەوانی ٥ **الصُّفْصُفُ**: چۆلەکە ٥ **صَفَعَهُ صَفْعاً**: شەپلاغەی لێ دا.

**صَفَّ القومُ صفّاً**: خەڵکەکە ریزبوون ٥ بەیەك ڕیز وەستان.

**صَفَّ الطيرُ في السَّماءِ**: باڵندەکە لەحەوا باڵەکانی راست کردنو جوڵە جوڵی پێ نەکردن.

**صَفَّ الشيءَ**: شتەکەی ریز کرد.

**صَفَّ القومَ**: خەڵکەکەی لە شەڕو شتی تردا ریز کردن.

**صَفَّ اللحمَ**: گۆشتەکەی توێ توێ کردو بەرخۆری دا یان لەسەر بەردی گەرم برژاندی ٥ (فهو صفیف) ٥ **أصَفَّهُ**: سێبەری بۆ دروست کرد، دەگوترێ: (أصَفَّ الأریکة): بەرگی بۆ کورسیو قەنەفەکە کرد ٥ **أصَفَّ السَّرْجَ**: زینەکەی داپۆشی ٥ (أصَفَّ البیت): خانوەکەی سەرگرت ٥ **صَافَّ الجیشُ عَدوهُ**: سوپا لەگەڵ دوژمن دا ریز ریز شەڕی کرد، دەگوترێ: (صَافَّ القائدُ جندَه): سەرکردەکە سەربازەکانی ریزکردن بۆ شەڕ ٥ **صَفَّفَهُ**: زۆر ڕێکی خستن، دەگوترێ: (صَفَّفَتِ المرأة شعرها): ئافرەتەکە زۆر بەڕێکوپێکی قژەکانی داهێناو ڕێکی کردن ٥ **إصْطَفَّ**: بۆ موطاوعەی (صَفَّهُ)دێ ٥ **تَصَافُّوا**: ریز ریز وەستان بەرامبەر بەیەك ٥ **تَصَافُّوا على كذا**: لەسەر ئەو شتە یەك راو هەڵوێست بوون ٥ **الصَّفُّ**: هێڵی راست لە هەرشتێك ٥ خەڵکی ریز

بەستو ٥ پۆلی قوتابخانە، بەشێك لەقوتابیانی
قوتابخانە ٥ (ك: صفوف).

**الصَّفَفُ:** پۆشاكێكە لەژێر زرێوە لەبەر دەكرێ ٥
**الصُّفَّةُ:** سێبەر بەربێلا ٥ هۆلی بەرزو بەرفراوان
٥ شوێنێكی سێبەرو سەرگیراو لەمزگەوتی
مەدینە، لەسەردەمی پێغەمبەردا هەژارەكان
تێیدا دەحەوانەوەو پێغەمبەر (د.خ) چاودێری
دەكردن پێیان دەگوتن (أصحاب الصفّة) ٥
**الصَّفِيفُ:** گۆشتی تەنكو توێ توێ كراو، كوتكوت
كراو.

**صَفَقَ الشيءَ صَفْقاً وصفقةً:** وای لێ دا دەنگی
لێدانەكەی بیسترا ٥ **صَفَقَتِ الريحُ الثوبَ والشجر
والماءَ:** رەشەباكە لەقوماشەكەی داو جولاندیەوە،
لەدرەختەكەی داو لقەكانی هەژاندن، لەئاوەكەی
داو شەپۆلی پێ پەیدا كردن.

**صَفَقَ الطائر جناحيه وبهما:** باڵندەكە باڵەكانی لێك
دانو فڕی، لەشەقەی باڵی دا.

**صَفَقَ العُودَ:** لەوەتەری كەمانەكەی دا، لەژێی
كەمانەكەی دا.

**صَفَقَ البابَ:** دەرگاكەی پێوەدایەوە ٥ (صَفَقَ
الشرابَ): شەرابەكەی تێكەڵاو كرد.

**صَفَقَ القدحَ:** پیاڵەكەی پڕكرد.

**صَفَقَ البَيْعَ:** مامەڵەكەی مۆركردو رۆیاندی ٥
دەستی خستە ناو دەستییەوەو لەقەبەڵی
یەكتریان كرد ٥ دابو نەریتی عەرەب وابوو كە
بیانویستایە مامەڵەیەك برۆینن یەكێكیان
دەستی دەخستە ناو دەستی ئەوی تریانەوە، واتە
دەستیان بەیەكتر دەكێشا وەكوو چەپڵە لێدان،
ئیتر لەم رووەوە ئەم مانایە هاتووە.

**صَفُقَ الثوبُ صَفَاقَةً:** كراسەكە تێوەدانو چنینەكەی
ئەستور بوو.

**صَفُقَ الوجهُ:** روخساری ناشیرین بوو ٥ (فهو صفيق)
٥ **أصْفَقَ القومُ على كذا:** خەڵكەكە لەسەر
ئەوشتەی یەكیان گرتو بڕیاریان دا لەسەری ٥
كۆك بوون لەسەری ٥ **أصْفَقَ عنه:** ڕووی لێ
وەرگێڕا ٥ **أصْفَقَ فلان الشيءَ والبابَ والقدحَ
والشرابَ:** فلانكەس لەشتەكەی دا دەنگی لێ
هات ٥ دەرگاكەی پێوەدایەوە ٥ پیاڵەكەی پڕكرد
٥ شەرابەكەی تێكەڵاو كرد ٥ **أصْفَقَ النَّاسِجُ
الثوبَ:** جۆلاكە قوماشەكەی ئەستور چنی ٥
**صَافَقَ:** لەسەر تەنیشت نووست ٥ **صَفَّقَ:** بۆ
زێدەڕەوی لەمانای (صَفَقَ)دا هاتووە ٥ **صَفَّقَ
بيديه:** بەهەردوو دەستی چەپڵەی لێ دا، بەری
دەستی ڕاستی بەبەری دەستی چەپی كێشا ٥
هەردو بەری دەستی بەیەكتر كێشان ٥ **إصْطَفَقَ:**
بۆ موطاوعەی (صَفَقَه)دێ ٥ **إصْطَفَقَ الشيءُ:**
شتەكە كەوتە جولەو پەلە پەل، دەگوترێ:
(إصْطَفَقَت الأشجارُ وإصْطَفَقَ العود): درەختەكان
جولانەوە، ژێی كەوانەكەی لەرییەوە ٥ **إصْطَفَقَ
البحرُ:** دەریا كەوتە جونبوشو شەپۆلدان ٥
**إصْطَفَقَ الناسُ:** خەڵكەكە كەوتنە هاتو چوو
جمو جۆڵ ٥ **إصْطَفَقَ المجلسُ بالقوم:**
مەجلیسەكە جمەی هات ٥ **إنْصَفَقَ:** بۆ
موطاوعەی (صَفَقَهُ)دێ ٥ **إنْصَفَقَ القومُ:**
خەڵكەكە هاتنو ڕویان تێ كرد ٥ **تصافق البائع
والمشتري:** كڕیارو فرۆشیارەكە مامەڵەكەیان
ڕویاندو رەزامەندییان لەسەر ئەنجامدانی دا ٥
**تَصَفَّقَ:** تلاوتلی كرد، ئەمدیواو دیوی كرد ٥
**تَصَفَّقَت الدابةُ:** ئاژەڵەكە سەر پشت گەڕا ٥ **تَصَفَّقَ
للأمر:** خۆی لەكارەكە داو چووە ناو ئیشەكەوە ٥
**الصِّفَاقُ:** پێستی ژێر پێستی سەرەوە ٥
پەردەیەكە لە نێوان پێستو ڕیخۆڵەدا ٥ **الصِّفَاقُ:**

بۆماناى زێدە هاتووە لەمادەی (صفق)دا ٥ الدِّيك الصَّفَّاق: ئەو كەڵەشێرەیە لەكاتی خوێندن دا باڵی لێك دەدا ٥ هەروا ناوە بۆ كەسێك زۆر مامەڵە بكاو هەمیشە خەریكی سەوداو مامەڵەبێ ٥ الصَّفْقُ: كڕین و فرۆشتن ٥ تەنیشت، دەگوترێ: (صَفْقا الإنسان): دوو تەنیشت و دوولای ئادەمیزاد ٥ صَفْقا الفرس: دوو لاچاوی ئەسپ ٥ (صَفقا الباب): دوو تاكی دەرگا ٥ الصِّفْقُ: (صِفْقُ الباب): تاكی دەرگا ٥ الصِّفْقَةُ: تۆقەكردن و دەست خستنە ناو دەستی یەك لەكاتی مامەڵەدا وەكوو ئاماژەكردن بەڕەزامەندیی و دامەزرانی مامەڵەو سەوداكە ٥ هەروا ناوە بۆ خودی سەوداكە ٥ فرۆشتن ٥ المَصْفَقُ: بازاڕ كەمامەڵەی زۆری تێدا بكرێ ٥ (بۆرصە).

**صَفَنَ الفرسُ صُفُوناً**: ئەسپەكە لەسەر سێ قاچ وەستاو نوكی سمی قاچی چوارەمی لەزەوی چەقاند.

**صَفَنَ الرجلُ**: پیاوەكە قاچی جووت كردن.

**صَفَنَ الطائرُ**: باڵندەكە هێلانەی خۆش كرد بۆ بێچووەكانی، پوش و پەلاشی بۆ ڕاخستن.

**صَفَنَ به الأرضَ**: بەزەوی دادا، خستیە سەر زەوی.

**صَفَنَ فلاناً**: بەردەی گونی فلانكەسی دڕی ٥ صافَنَ القومَ: هاوڕای خەڵكەكە بوو ٥ پشتگیری كردن ٥ دەستەو نەزەر لەبەر دەمیان ڕاوەستا ٥ صَفَّنَ الطائرُ: باڵندەكە هێلانەی خۆش كرد بۆ بێچووەكانی، پوش و پەلاشی بۆ تێدا ڕاخستن ٥ تَصافَنَ القومُ: خەڵكەكە ئاو یان بەش بەش كرد لەناو خۆیان دا ٥ الصَّافِنُ: ڕەگێكی گەورەیە لەقاچ دایە ئەم شادەمارە لەبەری قاچەوە درێژ دەبێتەوە تادەگاتە شادەماری ڕان ٥ الصُّفُنُ: هەمبانە، تورەكەیەكە لەپێست دروست دەكرێ، گوند نشینەكان تێشووی تێ دەكەن، زۆر جاری وادەبێ دەیكەنە دۆڵچەو ئاوی پێ هەڵدەهێنجن ٥ الصَّفَنُ: پەردەی گون ٥ زەمبیلەی پوشین ٥ ئەو پوش و پەلاشەیە كە باڵندە بۆ بێچووەكانی ڕادەخا بۆ تێدا بەخێوكردن.

**صَفَا صَفواً صَفاءً**: صاف بوو ڕون بوو لێڵی نەما، دەگوترێ: (صفا الماءُ ونحوهُ): ئاوەكە ڕون و جوان بوو.٥ صفا الجَوُّ واليومُ: هەوا صاف بوو، ڕۆژەكە ڕۆژێكی صاف و ڕون بوو، هەورو هەڵای نەبوو.

**صفا اليومُ**: ئەمڕۆ ڕۆژێكی خۆش بوو ناخۆشی تێدا نەبوو ٥ أصْفَى الحافِرُ: بیر هەڵكەنەكە گەیشتە بەردو شاخ و شوێنی ڕەق و نەیتوانی چی دی بیرەكە هەڵكەنێ ٥ أصفى الشاعرُ: شاعیرەكە شیعری نەما، شیعری دوایی هات ٥ أصفت الدجاجةُ: مریشكەكە لەهێلكە چۆوە ٥ أصفى فلاناً: بەڕاستی دۆستایەتی فلانی كردو دڵسۆزانە برایەتی لەگەڵ دا بردەسەر، دەگوترێ: (أصفاه الودَّ): دڵسۆزانە خۆشەویستی لەگەڵ كرد ٥ أصْفى فلاناً بكذا: فلانكەسی تایبەت كرد بەوشتەو بۆئەوی دانا ٥ أصفى الحاكم رفوه دار فلان ومالَه: دادوەر ماڵ و سامانی فلانكەسی هەموو دەست بەسەراگرت و تەصفیەی كرد ٥ صافاه: ڕاستاڵانە برادەری و دۆستایەتی لەگەڵ كرد ٥ صَفّاهُ: چڵك و پیس و پۆخڵەواتی لێ داماڵی و پاكی كردەوە ٥ پاكی كردەوە لەوشتانەی تێكەڵاوی بوو بون، هەموو پڵ و پوش و مرۆرو زیزانەو شتی تری لێ هەڵاواردو پاكی كردەوە ٥ صَفّى ماینهما: هەموو گرژی و ناخۆشی نێوانیانی لابردو ئاشتی كردنەوە ٥ صَفَّا الحِسابَ: كۆتایی بەحیسابەكە هێناو تەصفیەی كرد ٥

صَفَّا الشَّرِكَةَ: حيسابی کۆمپانیاکەی تەصفیە کردو کۆتایی پێ هێنا ◊ إصْطَفَاهُ: هەڵی بژاردو بەچاکی لەقەڵەم دا ◊ تصافيا: لەخۆشویستنی یەکتر دا دڵسۆزو راستاڵ بوون ◊ استَصْفَاهُ: بەمانا (إصطفاه)دێ ◊ بەدۆستو خۆشەویستی خۆی لەقەڵەم دا ◊ استَصْفَى الشيئَ: پوختەی شتەکەی برد ◊ استَصْفَى مالَ فلان: ماڵی فلانکەسی هەموو برد ◊ الصَّفَاةُ: بەردی لووس رەقو پان، دەگوترێ: (ماتقرع لە صَفاةٌ): کەس بەخراپە دەستی بۆ درێژ ناکا، دەشگوترێ: (ما تندى صَفاتُهُ): رژدو چروکەو هیچی لەدەست هەڵناوەرێ ◊ الصَّفْوُ: صافیو لووسی ◊ رونیو ئاشکرایی ◊ بێ گەردی ◊ الصَّفْوان: بەردی گەورەی لوس ◊ الصَّفْوَةُ من كل شيئ: کاکڵەو پوختەی هەموو شتێک ◊ الصَّفِيُّ من كل شيئ: کاکڵەو پوختەی شتەکە لەهەرشتێک بێ دۆستو برادەری هەڵبژاردەن ◊ هەروا ئاوە بۆ ئەو غەنیمەتو دەسکەوتەی فەرمانڕەوای موسوڵمان جیای دەکاتەوە بۆ خۆی پێش دابەشکردن ◊ الصوافي: مڵکو زەویو سامان خاوەنی مردبێو کەس میراتگری نەبێ ◊ ئەو زەویو زارەی پاشاو فەرمانڕەوا دایدەنێ بۆ دەستو پێوەندەکانی خۆی ◊ تاکەکەی (صافية)یە ◊ المِصْفَاةُ: شت پاڵێو، هەرشتێک شتی پێ تەصفیە بکرێ ◊ هەرئامێرێک شیرو شەرابو شلەمەنی تری پێ بپاڵێورێ.◊ صَقَبَ الطائرُ صَقْباً: باڵندەکە قیرانـدی، جریواندی، سیزاندی، خوێندی، گارمگاری کرد.◊ صَقَبَ الجسمَ المُصمَتَ: بەبەری دەستی لەقەباره بێ دەنگەکەی داو تەپە تەپی لی هێنا.◊ صَقَّبَ الشيئَ: شتەکەی کۆکردەوە.

صَقَّبَ البناءَ: بیناکەی بەرز کردەوە.

صَقِبَ صَقَباً: نزیک بوو ◊ أصْقَبَ الشيئَ: شتەکەی نزیک کردەوە ◊ صاقَبَهُ مُصَاقَبَةً وصِقاباً: نزیکی بۆوە، بەرامبەری بوو، دەگوترێ: (جار مصاقب): جیرانی بەرامبەر ◊ تصاقبت البيوت: خانوەکان لێک نزیک بوون ◊ الصَّقْبُ: کۆڵەکەی هەرە بەرز لەناو کۆڵەکەکانی ژێر رەشماڵ دا ◊ مستە کۆڵە ◊ کۆڵە مستە ◊ الصَّقَبُ: تەنیشت ◊ ماڵ بەماڵەوە، جیرانی پەناو ماڵ بە ماڵەوە ◊ صَقَرَت الشمس صَقْراً: خۆر گەرماییەکەی توند بوو ◊ صَقَرَت الشمسُ فلاناً: خۆر گەرمیەکەی ئازاری فلانکەسی دا.

صَقَّرَ فلان النار: فلانکەس ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

صَقَّرَ فلاناً: بەناحەق جنێوی بەفلانکەس دا.

صَقَّرَ فلاناً بالعصا: بەگۆچان لەسەری فلانکەسی دا.

صَقَّرَ بە الأرضَ: بەزەوی کێشا، لەعەردی دا ◊ خستیە سەرزەوی.◊ صَقَّرَ الحجرَ: بەپاچی دووسەر بەردەکەی شکاند ◊ صَقَّرَ: بەهەڵۆو باز راوی کرد، باڵندەی تری پێگرتن ◊ تَصَقَّرَ: بەبازو هەڵۆ راوی کرد ◊ الصَّاقِرُ: چاو تیژ، دەگوترێ: (صَقْرٌ صاقِرٌ): بازێکی چاو تیژە ◊ الصَّاقِرَةُ: بەڵاو کارەسات ◊ الصَّاقُورُ: پاچی دووسەرو نوک تیژ بەردی پێ بشکێندرێ ◊ دیوی ناوەوەی ئێسقانی سەر کە دەورەی مێشکو داوە ◊ الصَّقْرُ: بازو هەڵۆ ◊ الصَّقْرَة: لێدانی خۆرو گەرمایی تیشکی ◊ الصَّقْرَةُ: ئاوی کەمی راوەستاو ◊ الصَّقَّار: بازو هەڵۆ بەخێو کەر، ئەوکەسەی خەریکی راهێنانی بازو هەڵۆیە بۆ راو پێکردن ◊ ئەوکەسەی راو بە بازو هەڵۆ دەکا.

صَعَقَ في البلاد صَعْقاً: بەناو وڵات دا رۆیی، دەشگوترێ: (صَعَقَ في القول): لەقسەکردن دا

فەننی نواندو بارو شێوازی گۆڕینو جۆرەکانی ڕەوانبێژی بەتاقی کردنەوە.

**صَقَعَ** صُقْعَ كذا: چو بۆی قەصدی ئەوی کرد

**صَقَعَ** الديكُ: کەڵەشێرەکە خوێندی.

**صَقَعَ** فلاناً وغيره صَقْعاً: لەفلانکەسی دا یان لەفلان شتی دا.

**صَقَعَ** به الأرض: بەزەوی دادا، خستی بەزەوی کێشا.

**صَقَعَ** فلاناً بكيٍّ: فلانکەسی بەداخکردن نیشانە کرد.

**صَقِعَ** صَقَعاً: سەرمای سیخوارو سەهۆڵبەندان لێی دا ◊ **صَقِعَتِ الأرضُ**: زەوی سیخواری لەسەر باری ◊ **أصْقَعَ**: چووە ناو سیخوارو سەهۆڵبەندانەوە ◊ **الصِّقَاع**: حەبلێکە بەسەر ڕەشماڵو خێمەدا رایەڵ دەکرێو هەردو سەری لەمەیوەو دیوی خێمەو ڕەشماڵەکە بەسنگی داکوتراو بەزەوی دا قایم دەکرێن بۆ ئەوەی ڕەشەبا نەیبا ◊ ئاسنێکە دەکرێتە دەمی ئەسپو وڵاخی تروە بۆ لغاو کردنی ◊ **الصُّقْعُ**: لایەنو لای شت ◊ **الصَّقَعُ**: ئازاری سەرماو سەهۆڵبەندان ◊ **الصَّقْعَةُ**: کوشندەی ساردو سەرماو سەهۆڵبەندان ◊ **الصَّقِيعُ**: سیخوارو سەهۆڵبەندان (سیخوار شەونمێکە لەئاسمانەوە دەبارێتە سەر زەویو دەبێتە سەهۆڵ) ◊ **المِصْقَعُ**: زمانپاراوو ڕەوان بێژ، دەگوترێ: (خطيب مِصْقَعٌ) ◊ **صَقَلَهُ صَقْلاً وصِقالاً**: مشتو ماڵی کرد، دەگوترێ: (صَقَلَ السيفَ والمرآة ونحوهما): شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد ◊ ئاوێنەکەی پاك کردەوە، سڕیەوە.

**صَقَّلَ** كلامَهُ: قسەکانی خۆی هەڵبژاردن پاڵفتەو پوختەی کردن.◊ **صَقَّلَ الدَّابَّةَ**: وڵاخەکەی گرتە ئەستۆی خۆی بۆ بەخێوکردن.

**صَقِلَ** صَقَلاً: شتەکە مشتو ماڵ کراو بوو ژەنگو چڵکی لی کرابووەوە.

**صَقِلَ** الفرسُ: ئەسپەکە قەدباریك بوو ◊ **الصِّقَالُ**: مشتو ماڵ کردن ◊ **الصَّقَّالُ**: کەسێك پیشەی مشتو ماڵ کردن بێ ◊ **الصُّقْلُ**: لاکەلەکە ◊ (صِقلان): هەردو کەلەکە ◊ **الصُّقْلَةُ**: کزو لاوازیی ◊ **الصَّقِيلُ**: مشتو ماڵ کراو ◊ دەگوترێ: (سيف صقيل ومعدن صقيلٌ) ◊ (ك: صِقالٌ) ◊ **الصَّيْقَلُ**: بەمانا (الصِّقَالُ)دێ ◊ **المِصْقَلَةُ**: ئامێری مشتو ماڵ کردن ◊ (ك: مَصاقِلَ) ◊ **الصَّقالِبَةُ**: بێرێکن لەئادەمیزاد زێدو نیشتمانیان لەبنەڕەتا باکوری وڵاتی بولغارياو دەورو بەری بوو، ئێستا لە زۆر وڵاتی خۆرهەلاتی ئەوروپا نیشتەجێ بوونو بلاو بوونەوەو پێیان دەگوترێ ڕەگەزی سلاڤ یان سولاف ◊ **صَكَّهُ صَكّاً**: بەتەوژم پالی پێوەنا، یان بەهەموو هێزی خۆی شەپلاخەی لی دا.

**صَكَّ** البابَ: دەرگاکەی داخست ◊ **إصْطَكَّ الشيئان**: ئەو دووشتە پێك کێشران لێکیان دا، دەگوترێ: (إصْطَكَت ركبتاه وقدماه): فەیزەن بوو ئەژنۆی لێك دەدران، یان قاچی لێك دەدران ◊ **الأصَكُّ**: ئەو کەسە ددانی پڕو جوت بن بۆشاییان تێدانەبێ ◊ **الصَّكُّ**: شێك، چەکی پارە وەرگرتن لەبانق ◊ **المِصَكُّ**: ئامێری پێکەوە نوساندن ◊ قفڵو کێلون ◊ ددانی پڕو بێ بۆشایی.

**صَكَمَ** الفرسُ: ئەسپەکە لغاوەکەی جوو.

**صَكَمَ** الشيئَ: شتەکەی پاڵ پێوەنا، بەرانبەری کردو لەگەڵی داکەوتە زۆرانبازیو هێنانو بردن ◊ **صَلَبَتِ الحُمّى على فلان صُلْباً**: لەرزو تاکە لەسەر فلانکەس درێژەی کێشاو تاوی سەند ◊ **صَلَبَه الحَرُّ**: گەرما سووری کردەوە کوڵاندی تینی

بۆهێنا ٥ **صَلَبَته الشمس**: خۆرەتاو گەستیو هەتاو بردی.

**صَلَبَ الجِسْمَ**: ئەملاو ئەولای جەستەی شەتەك داو هەڵیواسی، دەگوترێ: (صَلَبَ الجاني): تاوانبارەكەی هەڵواسی.

**صَلَبَ اللحمَ**: گۆشتەكەی برژاندو چەورییەكەی لی تكاند.

**صَلُبَ صلابةً**: توندو پتەو بوو، خۆی گرتو رەق بوو.

**صَلُبَ على المال وغيره**: دەستی بەسەر ماڵەكەوە گرتو رژدو چروك بوو دڵی نەهات لێی ببەخشێ ٥ **صَلُبَ الشيءُ**: زۆر توندو پتەو بوو، دەگوترێ: (صَلُبَ فَرْعُ الشجرة): لقەدارەكە پتەو بوو خۆی گرت ٥ **صَلَّبَ النصرانيّ**: مەسیحییەكە صەلیبی هەڵگرت ٥ لەسەر سینگو روخساری وێنەی صەلیبی دروست كرد ٥ **صَلَّبَ الجسمَ**: جەستەكەی شەتەك داو هەڵیواسی ٥ **صَلَّبَ الشيءَ**: شتەكەی پتەو كرد ٥ **صَلَّبَ السلاحَ**: چەكەكەی تیژكردو مشتو ماڵی كرد ٥ **اصطلب العظمَ او اللحمَ**: بەمناگر چەورایی گۆشتو ئێسقانەكەی چۆڕاندەوە، دەری هێنا ٥ **تَصَلَّبَ**: گرژو رەق بوو، نەرمی تێدانەما، دەگوترێ: (تصلب العودُ): لقەدارەكە پتەوو رەق بوو ٥ **تَصَلَّبَ الشريانُ**: دەمارە خوێنبەرەكانی دڵ گرژ بوون ٥ **تَصَلَّبَ في الرأي**: لەراو بۆچونەكانی دا توندو تیژ بوو، سور بوو لەسەر رای خۆی ٥ **الصَّالِبُ**: لەرزو تای بەشیدەت ٥ كەپلەی گەرمی زۆر بێ.

**الصَّلابَةُ**: روقایمی، چاو قایمی، دەگوترێ: (في وجهه صلابة): لەروخساری دا خۆگریو پتەوییەك هەیە ٥ بۆ جەستەیەك بەكاردێ لەسەر شێوەو شێوازی خۆی زۆر بمێنێتەوە ٥ زۆر گۆڕانكاری بەسەردا نەیە ٥ **الصُّلْبُ**: پتەوو رەقو بەهێز ٥ زەوی رەقو وشكو پتەو ٥ هەرمادەیەك شكڵو قەبارەو شێوازی لەحاڵەتی ئاسایی دا گۆڕانكاریی بەسەر دا نەیە ٥ بەپێچەوانەی غازو شلەمەنی ترەوە ٥ قاڵبە ئاسنێكە یان لەعونصوری تری وەكوو سلیكۆنو مەنگەنیزو شتی وا ٥ هەروا مادەی (الصُّلْبُ): بەمانا قەفەرەی پشت دێ ٥ دەگوترێ: (هو من صلب فلان): واتە لەوەچەو زورییەتی ئەوە ٥ **الصُّلْبُ**: بەهێزو بەشیدەت ٥ سورێنچك ٥ (ك: أصلاب) ٥ **الصُّلْبُ**: بەهێزو بەشیدەت ٥ بەردی هەسان ٥ تێغی تیژكراوی مشتو ماڵ كراو ٥ **الصَّلِيبُ**: بەهێزو توانا ٥ نەژاد خاوێنو رەسەن، دەگوترێ: (هو عربي صليب): ئەو عەرەبێكی پاك نەژادو رەسەنە ٥ هەروا وشەی (الصَّليب): ناوە بۆ سورێنچك ٥ هەرشتێك لەسەر شێوەی دو هێڵی یەكتر بڕ دروستكرابێ جا ئاسن بێ یان لەدارو شتی تربێ ٥ قەنارە ئەوەی لەسەری لەخاچ دەدرێ ٥ ئەو دارەی بەلای مەسیحیەكانەوە حەزرەتی عیسای لەسەر لەخاچ دراوە ٥ **الصَّليب الأحمرُ**: دامەزراوەیەكی نێو دەوڵەتیە، كاری سەرەكی پێشكەش كردنی خزمەتگوزاری مرۆییە لەكاتی رودانی بومەلەرزەو لافاوو شتی وا، ئا لەم كاتانەدا خزمەتگوزارییەكانی پێشكەشی لێقەوماوان دەكا ٥ **الصَّلِيبيُّون**: سوپای مەسیحیەكانی ئەوروپایە چەند جارێك پەلاماری جیهانی ئیسلامییان داوە لە چاخەكانی یانزەو دوانزەو سیانزەی زایین بەبیانووی رزگار كردنی بەیتولوقەدیس لەچنگی موسوڵمانەكان.

**صَلَتَ اللبنُ ونحوه صَلْتاً**: شیرەكە چەوری كەم بوو.

**صَلَتَ فلاناً وغيره**: غاری بەنەسپەكە دا.

**صَلَتَ** ماني القدح: ئەوەی لەپیاڵەکەدا بوو ڕشتی.

**صَلُتَ الجَبينُ صُلُوتةً**: ناوچەوانی دەرکەوت و بریسکەی دا ٥ **أصْلَتَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دەرخست ٥ دەگوترێ: (أصْلَتَ السَّيْفَ): شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا ٥ **إنْصَلَتَ**: دەرکەوت و ئاشکرا بوو ٥ **إنْصَلَتَ في سيره أو أمره**: لە ڕۆیشتن و ئیش و کاری خۆی دا دڵسۆزو بەخەمەوە بوو، جیدی بو ٥ پێش کەوت ٥ **الإصْلِيتُ**: ئیش لەدەست هاتوو ٥ **الصَّلْتُ**: دەرچوو بەدەرەوە ٥ لوس و پوس ٥ **جَبِينٌ صَلْتٌ**: ناوچەوانی پان و گوشادو نورانی ٥ (سيف صَلت): شمشێری بریقەدار ٥ (سكين صَلْت): کێردی تیژو بڕندە ٥ **الصَّلَتان**: بەهێزو تواناو چوست و چالاك.

**صَلِجَ صَلَجاً**: کەڕ بوو ٥ **تَصَالَجَ فلان**: فلانکەس خۆی بەکەڕ نیشان دا ٥ **الصَّلَّجَةُ**: پەردەیەکی پارێزەری ئاوریشمییە ٥ **الصَّلِيجَةُ**: قاڵبە زیوی پوختە کراو ٥ **الصَّوْلَجُ**: صاف و بێ غەل و غەش ٥ عەصایەکە لایەکی وەکوو گۆچان چەمێندراوەتەوە، سوارچاك پێی لەگۆیەکە دەدا ٥ **الصَّوْلَجَةُ**: بەمانا (الصَّوْلَجُ)دێ ٥ **الصَّوْلَجانُ**: بەمانا (الصَّوْلَجُ)دێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو گۆچان و عەصایەی پاشا بەدەستییەوە دەگرێ وەکوو نیشانەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ٥ **الصَّوْلَجانَةُ**: بەمانا (الصَّوْلَجانُ)دێ.

**صَلَحَ صَلاحاً وصُلُوحاً**: گەندەڵی و پیسی تێدا نەماو پاك بۆوە.

**صَلَحَ الشَّيْئُ**: شتەکە گونجاو بوو، بەسود بوو ٥ دەگوترێ: (هذا الشَّيْئُ يصلح لك): ئەم شتە بۆ تۆ گونجاوە سودی هەیە.

**صَلُحَ صَلاَحاً وصُلُوحاً**: بەمانا (صَلَحَ)دێ ٥ **أصْلَحَ الشَّيْئَ**: گەندەڵی و خراپی شتەکەی نەهێشت لای برد ٥ **أصْلَحَ بينهما**: دوژمنایەتی و دژایەتی نێوانی لابردن ٥ **أصْلَحَ اللهُ لفلان في ذريته أو ماله**: خودا ماڵ و منداڵی فلانکەسی صاڵح و گونجاوو بەخۆچاراوکردن ٥ **صَالَحَهُ مُصَالَحَةً وصِلاحاً**: ئاشتەوایی لەگەڵ دا کرد ٥ لەگەڵی ڕێك کەوت ٥ **إصْطَلَحَ القومُ**: خەڵکەکە کێشەو ناخۆشییان لەناودا نەما ٥ **اصْلَحُوا على الأمر**: لەسەر کارەکە ڕێك کەوتن و ڕازی بوون ٥ **تَصَالَحوا**: بەمانا (إصْطَلَحوا)دێ ٥ **اسْتَصْلَحَ الشَّيْئُ**: شتەکە خەریکی چاکسازی و باشبون بوو ٥ **استَصْلَحَ الشَّيْئَ**: شتەکەی چاك کردەوە ٥ داوای چاکبون و چاکسازی تێدا کرد بەباش و گونجاوی دانا ٥ **الإصطلاح**: چاوگی (إصْطلح)ە ٥ یەکدیگیربوونی کۆمەڵێك خەڵکە لەسەر شتێکی تایبەتی و هەموو زانست و زانیارییەکیش زاراوەی ئیصطلاحی خۆی هەیە ٥ **الصَّالِحُ**: ڕاستاڵ و گوێ ڕادێرو پابەند بەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی ٥ واش دەبێ بەکاردێ بۆ شتی زۆرو گونجاو ٥ **الصَّلاحُ**: بەردەوامبوون لەسەر کاری چاکە ٥ بێ عەیب و خەوش ٥ **الصَّلاحِية**: دەست ڕۆیشتوی و کارئەنجامدەر بەرپێك و پێکی ٥ **الصّلاحية للعمل**: باش خۆئامادەکردن بۆ ئیش ٥ **الصّلاحية لذي السلطان**: ئەو دەسەڵاتەی قانون دەیدا بە کەسێك بۆ ڕەهاکردنی ئیش و کار ٥ **الصُّلْحُ**: ئاشتەوایی ٥ کۆتایی هێنان بەکێشەو نیزاع ٥ کۆتایی هێنان بەشەڕو کوشتار ٥ **الصَّلِح**: گونجاوو لەبار ٥ **المَصْلَحَة**: بەمانا (الصّلاح) دێ ٥ سوودو بەرژەوەندی ٥ دەستەیەکی کارگێڕییە لەبوارێکی گشتی دا کاردەکەن بۆ بەرژەوەندیی گشتی.

**صَلِغَ صَلَغاً**: بیستنی نەما، کەڕ بوو ٥ **تَصَالَغَ**: خۆی بەکەڕو گوێ گران لەقەڵەم دا.

**صَـلَدَ** صَـلْداً وصُـلوداً: ڕەق و پتـەو بـوو ٥ **صَـلَدَت الأرض**: زەوییەکە هیچی لێ نەڕوا، ڕوتەن بوو. **صَـلَدَ** فـلان: فلانکـەس ڕژدو چـروك بـوو دەستـی ناچـێتە مـاڵی خـۆی ٥ دڵ ڕەق بـوو ٥ **صَـلَدَتِ الدّابّةُ**: وڵاخەکە لەڕاکردن و غاردان دا بەتوندی قاچی بەزەوی کێشان.

**صَلَدَ الزّندُ**: بەردو ئەستێکە دەنگی هات و ئاگری لێ نەبۆوە.

**صَلَدَ** فلان بیدیه: فلانکەس چەپڵەی لێ دا ٥ **صَلَدَت أنیابه**: ددانەکانی (کەڵبەکانی) سیڕە سیڕو جیڕە جیڕیان هات.

**صَلَدَ الشّيْئُ**: بروسکەی لێ دا.

**صَلُدَ** صُلُوداً وصلادةً: ڕەق و پتەو بوو، ڕژدو چروك بوو ٥ **أصْلَدَ**: ڕەق و پتـەو بـوو ٥ **أصْلَدَ الشّيْئَ**: توشی شتی ڕەق و پتەو بوو ٥ **الأصْلَدُ**: شتی زۆر ڕەق و پتەو ٥ پیاوی زۆر ڕژدو چروك ٥ **الصَّلْدُ**: ڕەق و لـووس ٥ بـەردی زۆر لـووس ٥ زەوی ڕەقـەن و چەقەن کـە هیـچی لـێ نـەڕوێ ٥ رأس **صَلْدٌ**: سەری لوس و بێ تـوك ٥ (جلـد صَـلْدٌ) ٥ پێستی لوس و بێ تـوك ٥ هـەروا وشـەی (صَـلْد) نـاوە بـۆ چـەرخ و شـخارتەیەك دەنگـی لـێ بـێ و ئاگری لێ پەیدا نەبێ ٥ **الصّلودُ**: بـۆ زێـدە ڕەوی لەمانای (صَلَدَ)دێ ٥ مەنجەڵ و دیـزە کـە درەنـگ شتیان تێدا بکوڵێ ٥ **المِصْلادُ**: دەگـوترێ: (ناقـة مِصلاد): حوشترێکە بێچوی بووەو شیری تێدا نییە ٥ **المِصْلادَةُ**: بـەمانا (المِصْلادُ)دێ ٥ **الصِّلْدِمُ**: ڕەق و قایم و پتەو ٥ وڵاخی سم گەورە ٥ **صَلْصَلَ الشّيْئُ**: شتەکە زرینگەی لێ هات، دەنگی دایـەوە ٥ **صَلْـصَلَ** فـلان: فلانکـەس هەڕەشـەی کـرد ٥ **صَلْصَلَ** بکلامه: قسەکانی پچڕ پچڕ دەرپەڕانـدن ٥ **تَصَلْـصَلَ الغـدیرُ**: زەلکاوەکـەی وشـك بـوو ٥ **الصُّلاَصِلُ**: شتێك دەنگ بداتەوە ٥ ترینگـەی لـێ بـێ ٥ **الصُّلْصُلُ**: ناوچـەوانی ئەسـپ ٥ **الصُّلْصُلُ**: باقی ماندەی ئاو لـەبنکی زەلکاو دا یـان لـەبنکی تـەنکی و بـەرمیل و شـتی وا دا ٥ ئـەو شـوێنەی لەپـشتی ئەسـپ سپی دەبێ بـەهۆی ڕوتانـەوەی توکەکەی ٥ **صَلْطَحَهُ**: بڵاوی کـردەوەو ڕایخـست ٥ **الصَّلْطَحُ**: پان و پۆڕ ٥ کەتەو زەبەلاح ٥ **المُصَلْطَحُ**: ڕاخراوی پان.

**صَلِعَ** فلان صَلَعاً: قژی پێشە سەری یـان تۆقەسـەری ڕوتانـەوە ٥ مـوی پێـوە نـەما ٥ **صَـلِعَتِ الـشجرةُ** ونحوها: بـرژو سـەرە لقی درەختەکە هـەڵوەرین یـان ئـاژەڵ خـواردنی ٥ **صَـلِعت الـشمسُ**: خـۆر لـەژێر هـەور هاتـە دەرو دەرکـەوت ٥ **تَـصَلَّعت الشمسُ**: بـەمانا (صَـلِعت)دێ ٥ **الأصْـلَعُ**: کەسـێك سـەری ڕوتابێتـەوە، پێشەسەری یـان تۆقەسـەری ڕوتابێتـەوە ٥ بـۆ ئـافرەت دەگـوترێ: (صَـلْعاءُ) ٥ نۆکە شمشێری مـشت و مـاڵ کـراو، نووکە ڕەبی مـشت و مـاڵ کـراو ٥ هەرشـتێك بدرەوشـێتەوەو لووس بێ ٥ **الصِّلاعِ** (صِلاع الـشمس): گـەرمایی خۆر ٥ **الصَّلَعُ**: ڕوتانـەوەی مـووی پێشەسـەر یـان تۆقـە سـەر ٥ **الـصُّلْعَةُ**: پێـستی سـەر کـە تـووکی پێـوە نـەمابێ ٥ **الـصَّلَعَةُ**: بـەمانا (الـصُّلْعَةُ)دێ ٥ **الـصُّلاعَةُ**: بـەردی ڕەقـی پتـەوو پـان ٥ **الـصَّلِیعُ**: بـــەمانا (الأصْـــلَعُ) دێ ٥ شـــتێك لـــەزەوی جیابووبێتەوە ٥ بـۆ مێینـە (صـلیعة) بـەکاردێ ٥ **صَلَفَهُ صَلْفاً**: ڕقی لێ بوو، ناخۆشی ویست.

**صَـلِفَ الـشّيْئُ صَـلَفاً**: خێـرو بێـری کـەم بـوو ٥ دەگوترێ: (صَلِفَ النبات): ڕوەکەکە قـەدو بـاڵای کەم بوو، دانەوێڵەی کەم بوو ٥ (صَـلِفَ الطعـامُ): خۆراکەکـە ڤیتامینـاتی کـەم بـوو ٥ (صَـلِفَ

السحابُ): هەورەکە بارانی کەم بوو، بروسکەی کەم بوو.

**صَلِفَ** فلان: فلانکەس بێ بەختو چارە ڕەشە خەڵك خۆشیان ناوێ ٥ **أصْلَفَ**: بەمانا (صَلِفَ)دێ ٥ ڕەزاگران بوو، چارە قورس بوو ٥ **أصْلَفَ فلاناً** وغيره: رقی لەفلان بۆوە ٥ **أصْلَفَه الله**: خودا وای لێ کردوە خەڵکی رقیان لێ بێ ٥ **تَصَلَّفَ**: چارە ڕەشیو بێ خێری دیارکەوت ٥ چووە ناو زەوییەکی ڕەقەنو پتەو ٥ **الأصلف من الأرض**: زەوی ڕەقو پتەو کە هیچی لێ نەڕوێ ٥ **الصَّلِفُ**: دەگوترێ: (سحاب صَلِفٌ): هەورێکە بروسکەو گۆڵە گۆڵی زۆرە بەڵام بارانی نییە ٥ هەروا ناوە بۆ خۆراکێك تامی کەم بێ یان هەر بێ تام بێ ٥ **الصَّلْفاءُ**: بەردی لەگەڵ زەوی تەخت بوو ٥ **الصَّلِفُ**: بەمانا (الصَّلِفُ)دێ ٥ لامل، خوار گوێچکە بۆسەر شان ٥ **الصَّليفان**: هەردو لامل ٥ دو دارن لەم دیوو ئەو دیوی کورتانی وڵاخ دەبەسترێن باریان پێ قایم دەکرێ.

**صَلَقَ** القومَ: زەرەرو زیانی زۆری لەقەومەکە داو کارەساتی بەسەر هێنان.

**صَلَقَ** اللَّحْمَ ونحوه: گۆشتەکەی کوڵاندو کردی بە چێشت.

**صَلَقَ** الشاةَ ونحوها: مەڕەکەی ئەم دیو ئەو دیو برژاند ٥ **صَلَقَتِ الشَّمْسُ فلاناً** وغيره: خۆر بەگەرمییەکەی زیانی بەفلانکەس گەیاند.

**صَلَقَ** فلاناً بالعَصَا: بەگۆچان لەفلانکەسی دا ٥ **أصْلَقَ النابُ**: ددانەکە (کەڵبەکە) سیرەی هات چونکە لەددانێکی دەخشا ٥ **تَصَلَّقَ**: تلاوتلی کرد، نەمدیواو دیوی کرد ٥ **تَصَلَّقَتِ الدّابَّةُ**: وڵاخەکە خۆی گەوزاند، تلاوتلی کرد ٥ **إصْطَلَقَ**: بەمانا (أصْلَقَ)دێ ٥ **الصَّلاقة**: ناوێك زۆر مابێتەوەو بۆگەنی کردبێ ٥ ناوی گەڕاوە ٥ **الصَّلْقُ**: هاوارو لۆرە لۆر ٥ دەنگو جیڕەی ددانی حوشتر کە لێکیان دەدا ٥ **الصَّلْقُ**: دەشتی کاکی بەکاکی ٥ **الصَّلّاقُ**: بۆ موبالەغەو زێدە ڕەوی لەمانای (صَلَقَ)دا دێ ٥ هەروا بەوتار بێژی زمانڕەوانو دەنگ گەورە دەگوترێ ٥ **الصَّليق**: گۆشتی کوڵاو ٥ گۆشتی برژاو ٥ نانی تیری ٥ **المِصْلَقُ**: بەمانا (الصَّلّاق)دێ.

**صَلَّ** الشَّيْءُ صَليلاً: شتەکە دەنگی شێوە لەرینەوەو زرینگانەوەی لێ هات.

**صَلَّ** بيضُ الحديد: ئاسنەکە دەنگی لێ هات بەهۆی پێك کێشانەوە. ٥ **صَلَّ** المِسْمارُ: بزمارەکە لەکاتی داکوتان دا دەنگی لێ هات.

**صَلَّ** الإناءُ الفارغ: قاپە بەتاڵەکە لەکاتی پێکێشانی شتێکی تر پێی دەنگی لێ هات زرینگەی لێ هات.

**صَلَّ** اللَّحْمُ صلولاً: گۆشتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد.

**صَلَّ** الشَّرابَ صَلاً: شەرابەکەی تەصفیە کرد.

**صَلَّ** الحبُّ المختلط بالتراب: ناوی پێداکردو قوڕەکەی لەدانەوێڵەکە کردەوەو دای شۆرد ٥ **أصَلَّ اللَّحْمَ أو الماءَ** ونحوه: گۆشتەکە بۆگەنی کردو تامو ڕەنگی گۆڕا ٥ **صَلَّلَ**: بۆ زێدە لەمانای (صَلَّ)دێ ٥ **الصّالُّ**: کەرمکێوی زەرە تیژڕ ناخۆش ٥ **الصّالَّةُ**: بۆ مێینەی (الصّال)دێ ٥ بەڵاو کارەسات ٥ **الصُّلُّ**: گۆشتی بۆگەن کردو گۆڕاو یان هەرشتێکی تر کە گۆڕابێو بۆنی کردبێ ٥ **الصِّلُّ**: ماری پیسو ژەهراوی پیسترین ماری ژەهراوی ٥ دەگوترێ: (صِلُّ أصلال): بەڵاو نەخۆشی پیس ٥ **الصُّلَّةُ**: پێستی وشکەوە بووی بۆگەن ٥ **الصُّلَّةُ**: بای بۆگەن ٥ **صَلَمَهُ صَلماً**: بڕیەوە ٥ لەڕیشە دەری

هێنا ٥ بەزۆری بۆ گوێچکەو لووت بەکاردەهێندرێ ٥ **صَلَّمَهُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕۆیی لەماناى (صَلَمَ)دا بەکار دێ ٥ **إصْطَلَمَهُ**: بەمانا (صَلَمَهُ)دێ ٥ دەگوترێ: (إصْطَلَمهم الدَّهْرُ أو الموتُ أو العدوّ): زمانە یان مەرگ یان دوژمن لە بێخی دەرهێنان و لەناوی بردن ٥ **الأصْلَمُ**: گوێ بڕاو ٥ گوێ بچوك كە بەسروشت گوێی بچوك بن ٥ **الصَّلْماءُ**: مێینەی (الأصلم) ٥ **الصُّلْمَةُ**: زرێیە دەچندرێ بەئەندازەی کڵاو لەژێر کڵاوو قەڵەنسوە لەسەر دەکرێ ٥ **الصَّيْلَمُ**: بەڵاو کارەساتی وا شت لەبێخ بێنێ ٥ شمشێر ٥ **المُصَلَّمُ**: بەمانا (الأصلَمُ)دێ ٥ بۆ تەعبیر دانەوە لەزەلیلی و بێ دەسەڵاتی دەگوترێ: (مَشوا بآذان النعام المُصَلَّم) ٥ **صَلِيت الناقة أو الحامِلُ**: حوشترەکە یان ئافرەتە دووگیانەکە وانێکی شل بوو چونکە نزیکە بزێ ٥ **أصْلَت الحامِلُ**: بەمانا (صليت)دێ ٥ نزیکە منداڵەکەی ببێ ٥ **صَلَّيَ الفَرسُ**: ئەسپەکە لە پێشبڕکێ دا بەدووەم گەیشت ٥ **صَلَّى فلان**: فلانکەس نزاو پاڕانەوەی کرد ٥ دەگوترێ: (صَلَّى عليه): دوعای خێری بۆکرد ٥ نوێژی کرد ٥ **صَلَّى الله على رسوله**: خودا ڕەحمەت و سۆزی خۆی ڕژاند بەسەر پێغەمبەر دا ٥ **الصَّلاَ**: ئەم لاو ئەولای کلك، ڕاست و چەپی کلك ٥ بۆشایی نێوان قنگ و کلك ٥ ناوقەدی پشت بۆ ئادەمیزادو ئاژەڵ ٥ **الصَّلاةُ**: دوعاو پاڕانەوە ٥ دەگوترێ: (صَلَّى صلاةً): دوعای کرد ٥ نوێژ عیبادەتێکی تایبەتییەو کاتی دیاریکراوی هەیەو لەشەریعەت دا بەدوورو درێژی باسی لێوە کراوە ٥ ڕەحمەت و بەزەیی ٥ خانەی خودا پەرستی لای جولەکە ٥ مەبەست بەوشەی (صلوات) لەئایەتەکەدا شوێنەکانی عیبادەتکردنی جولەکەکانە ٥ **المُصَلَّى من خيل السباق**: ئەو ئەسپەیە کە لە دوا ئەسپی یەکەم دێ لە گۆڕەپانی پێشبڕکێ دا ٥ بۆ ئادەمیزایش بەکاردەهێندرێ کەلەدوا یەکەمەوە بێ لەهەر ئیش و کارێك دا بێ ٥ **المُصَلَّى**: شوێنی نوێژکردن، بەرماڵ و تاتەبەردی نوێژکردن ٥ **صَلَّى الشَّيْءَ صَلْياً**: شتەکەی خستە ناو ئاگرەوە ٥ **صَلَّى اللَّحْمَ**: گۆشتەکەی برژاند ٥ دەگوترێ: (صَلَّى الصيدَ): داوی بۆ نێچیرەکە نایەوە ٥ (صَلَّى فلاناً): فلانکەسی خستە ناو چورتم و ئەگبەتییەوە.

**صَلِيَ في النار وبها صَلىً وصِلِياً**: لەئاگردا سوتا ٥ **صَلِيَ الأمْرَ وبه**: چورتم و ناخۆشی لەکارەکە توش هات ٥ دەگوترێ: (صَلِيَ بفلان وصَلِيَ بشر فلان): گرفتاری فلانکەس بوو، گرفتاری شەڕی فلان بوو ٥ (فهو صالٍ).

**أصْلاهُ النار وبها وعليها**: خستییە ناو ئاگرەوە ٥ **أصْلَى اللحمَ**: گۆشتەکەی برژاند.

**صَلاّ النارَ**: خستیە ناو ئاگرەوە ٥ **صَلَّى الماءَ**: ئاوەکەی گەرم کرد ٥ **صَلَّى القَناةَ أو العصا بالنار**: ڕمبەکە یان عەصاکەی بەسەر ئاگردا ڕاداشت بۆئەوەی گەرم ببێ و نەرم ببێ ڕاستی بکاتەوە ٥ **إصْطَلَى النارَ وبها**: خۆی بەئاگر گەرم کردەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان لايصطلى بناره): فلانکەس کەس خۆ بەئاگری گەرم ناکاتەوە، واتە: ئەوەندە ئازاو چاو نەترسە ٥ **تَصَلَّى النار وبها**: خۆی بەئاگر گەرم کردەوە ٥ **تَصَلَّى القناة**: ڕمبەکەی بەئاگر ڕاداشت بۆئەوەی گەرم و نەرم بێ و ڕاستی بکاتەوە ٥ **الصِّلَى**: ئاگر ٥ سوتەمەنی ٥ **الصِّلاَيَةُ الصَّلاءةُ**: دەسکەوانی کوتانی ئەوشتانەی بۆنی خۆشیان لێ دروست دەکرێ ٥ **الصَّلِيُّ**: چوونە ناو ئاگر ٥ **المِصْلاةُ**: داوێکە دەنرێتەوە بۆ نێچیرکردن ٥ فرت و فێڵ و

تەڵەکەبازیی ٥ **إصْمَأَلَّ**: پتەو بوو ٥ (إصْمَأَلَّ النباتُ): رووەکەکە راساو تێك چرژاو گەشەی کرد ٥ **إصْمَأَلَّ فلان**: فلانکەس رقی هەڵساو رەگی لاملی فش بوون ٥ (فهو مُصْمَئِلٌ).

**صَمَتَ صَمْتاً**: بێدەنگ بوو قسەی نەکرد ٥ بۆ جگە لەمنادەمیزاد دەگوترێ: (صامت) ناگوترێ (ساکت) ٥ **أصْمَتَ العليلَ**: نەخۆشەکە زمانی شکاو لەقسەکردن کەوت ٥ **أصْمَتَ فلاناً**: فلانکەسی بێدەنگ کرد ٥ **صَمَّتَ**: بەمانا (صَمَتَ)دا ٥ **صَمَّتَ فلاناً**: فلانکەسی بێدەنگ کرد ٥ **صَمَّتَ الشَّيْءَ**: شتەکەی والێ کرد بۆشایی تێدا نەما ٥ **الصَّامِتُ**: بێدەنگ ٥ هەرشتێك نوتقی نەبێ ٥ **الصَّامِتُ من المال**: زێرو زیو ٥ دەگوترێ: (ما له صامِت ولا ناطق): خاوەنی هیچ نییە ٥ هیچی نییە ٥ **الصُّمَات**: بێدەنگی ٥ لەبواری مارەکردنی کچ دا گوتراوە (إذنها صُماتها): بێدەنگی کچ نیشانەی رازیبوونییەتی ٥ هەروا دەگوترێ: (رماه الله بصُماتها): خودا زەبرێکی ناڕاستە کرد بێدەنگی کرد ٥ **الصُّمَاتُ**: شت ٥ چت ٥ هەردەبێ لەگەڵ ئامرازی نەفی دا بەکار بهێندرێ ٥ دەگوترێ: (ما ذقت صُماتاً): هیچم نەچەشتووە ٥ **الصِّمات**: مەبەست ٥ دەگوترێ: (بات على صِمات أمره): وازی نەهێناو سوور بوو لەسەر کارەکەی‌و دەیەوێ ئەنجامی بدا ٥ **الصُّمْتَةُ**: ئەو شەقشەقەو حەتحەتۆکەو گەڵوازەو شتی تر کەمنداڵی بچوك دەخافڵێنێ‌و خواردن‌و گریانی لەبیردەباتەوە ٥ **الصَّمُوتُ**: بێدەنگ ٥ دەگوترێ: (ضَرْبَة صَمُوت): زەبرێکی خەپ کەر بەبێ ئەوەی دەنگی لێ بێ ٥ (مُسَدَّسٌ صموت): دەمانچەی بێدەنگ ٥ هەروا ناوە بۆ شمشێر ٥ زرێی مشت‌و ماڵ کراوی نەرمەلیقە ٥ هەروا دەگوترێ: (خلخال صموت وجارية صموت الخلخال): دەنگی خەڵخاڵی لێ نایە چونکە قاچی گۆشتنەو پڕی کردوە ٥ **المُصْمَتُ**: شتی بێ گیان‌و گەشەو نما کەمناوی کلۆر نەبێ وەکوو بەردو شتی وا ٥ قفڵێك کە بەنارەحەتی بکرێتەوەو شوێنی کلیلەکەی چەواشەکاریی تێدابێ ٥ رەنگی خاڵص‌و بێ غەش کەهیچی تری تێکەڵ نەکرابێ ٥ نووستنی قوڵ‌و گران کەبەئاسانی بەخەبەر نەیە ٥ **المُصْمِتُ**: دەگوترێ: (هو يشكو الى غير مُصْمِتٍ): دادو فیغانی لەلای کەسێك دەکا کەهیچ شلوێ نابێ ٥ شکاتەکە هەستی ناجوڵێنێ.

**صَمَحَ اليومُ صَمْحاً**: گەرماکەی بەهێز بوو.

**صَمَحَ الحَرُّ فلاناً**: گەرما مێشکی فلانی ئازار دا.

**صَمَخَ فلاناً بالسوط**: بەقەمچی لەفلانکەسی دا.

**صَمَخَ في المسألة**: زۆر لەباسەکەی کۆڵییەوەو وردبینی تێدا کرد ٥ **الصُّمَاخُ**: داخکردن ٥ بۆگەن ٥ **صَمَخَهُ صَمْخاً**: لەکرکراگەی گوێچکەی دا ئازاری زەبری گەیاندە پەردەی گوێی ٥ **الأُصْمُوخ**: بەمانا (الصِّماخ)دێ ٥ **الصِّمَاخُ**: بۆری ناوگوێچکەکە دەگاتە کرکراگەی گوێ ٥ (ضرب الله على صماخه): خودا خەوی لێ خست ٥ **الصَّمِخَةُ من النساء**: ئافرەتی ناسك‌و تازە پێگەیشتوو ٥ **الصِّمَاخَةُ**: ئەو کەلوو لوانەی لەورگی ئاژەڵی کاوێژکاردایە.٥ **صَمَدَ صَمْداً وصُموداً**: خۆگرو دامەزراو بوو.٥ **صَمَدَ الشَّيْءَ وله واليه صمداً**: قەصدی شتەکەی کرد ٥ **صَمَدَتْ الشمسُ وجْهَهُ**: گرمی گەرمای خۆر دەم‌و چاوی داخ کرد.

**صَمَدَ القارورةَ ونحوها**: تۆپەوانەی خستە دەمی دیزەکەوە ٥ **أصْمَدَ الأمْرَ اليه**: ئیشەکەی خستە

ئەستۆی ئەو ٥ **أصْمَدَ فلاناً الى كذا**: فلآنكەسی ناچار كرد بۆ ئەو شتە ٥ **صَامَدَهُ مُصَامدةً وصِماداً**: بەسەری دا زاڵ بوو لەخۆراگری‌و بەرگری كردن دا ٥ **صَمَّدَهُ**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای (صَمَدَ) دا دێ ٥ **صَمَّدَ رأسَهُ**: چەفتەیەكی بچوكی لەسەر بەست ٥ **تَصامَدا**: كێ بركێیان لەگەڵ یەكتر كرد لەبواری بەرگری‌و خۆگری دا ٥ **الصِّمَادُ**: دەگوترێ: (بات على صماد الماء): شەوی بەڕۆژ كردەوە بەتەما ئاوو هەوڵدان بۆ ئاو ٥ ئەو چەفتەو دەسرە بچوكەیە كەپێش مێزەر لەسەر دەبەسترێ ٥ تۆپەوانەی گۆزەو دیزە ٥ **الصِّمادَةُ**: تۆپەوانەی دیزەو گۆزە ٥ **الصَّمْدُ**: شوێنی بەرز، تەپۆڵكەی بەرز ٥ **الصَّمَدُ**: ئەوكەسەی بۆ بەهانا هاتن‌و جێ بەجێ كردنی پێویستیات قەصد دەكرێ‌و لەوداوا دەكرێ پێویستیاتی مەخلوقات دابین بكا ٥ هەروا ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا ٥ هەروا بەشتێك دەگوترێ كە كلۆر نەبێ ٥ دەگوترێ: (شيءٌ صَمَدٌ): شتێكی پتەوو پڕو بێ كلۆرایە ٥ **الصَّمْدَةُ**: بەردی چەقیوو دامەزراوو ڕۆچوو بەزەوی داو كەمێكی بەدەرەوەبێ ٥ **المِصْمادُ**: دەگوترا: (ناقةٌ مِصْمادٌ): حوشترێكە خۆگرە لەسەر برسییەتی‌و تینوایەتی ٥ **المُصَمَّدُ**: مەقصودو مەبەست ٥ شتێكی ڕەق‌و پتەو كە كلۆرایی تێدا نەبێ.

**صَمَرَ الماءُ**: ئاوەكە لەبەرزاییەوە هەڵڕژایە شوێنی تێدا ڕاوەستانی خۆی ٥ **صَمَرَت الريحُ**: ڕەشەباكە كەوت‌و نەما.

**صَمَرَ الرجلُ**: پیاوەكە ڕژدو چروك بوو.

**صَمَرَ الشيءَ**: شتەكەی مەنع كرد.

**صَمِرَ اللَّبَنُ صَمَراً**: ماستەكە مزر بوو.

**صَمِرَ الماءُ**: ئاوەكە بۆگەن بوو، بۆنی ناخۆشی لێ پەیدا بوو ٥ دەشگوترێ: (يدي صَمِرَةٌ مِن السَّمَك): دەستم بەماسی بۆنی ناخۆشی لێ پەیدا بوو ٥ **أصْمَرَ اللَّبَنُ**: ماستەكە زۆر مزر بوو ٥ **أصْمَرَ فلان**: فلآنكەس كەوتە كاتی خۆرئاوابوون ٥ **أصْمَرَ المتاعَ**: كاڵاو شتو مەكەكەی كۆكردەوە ٥ **صَمَّرَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (صَمَرَ)دا دێ ٥ **صَمَّرَ المتاعَ**: كاڵاو شتو مەكەكانی كۆكردەوە ٥ **الصّامورة**: ماستی زۆر مزرو ترش ٥ **الصَّيْمَرُ**: زەلكاوو شوێنی ئاوی بۆگەن ٥ **الصَّمَرُ**: بۆگەن ٥ دەگوترێ: (أصابه صَمَرُ البحر): بۆگەنی ئاوی دەریا كاری لێ كردووە ٥ **الصَّمِيرُ**: گۆشتی وشكەوە بوو بەسەر ئێسقانەوە كەبۆگەنی عەرەقی لێ دێ ٥ بۆنافرەت ٥ **الصُّمَيْرُ**: كاتی ئاوا بوونی خۆر ٥ دەگوترێ: (دخلنا المدينة في الصُّمَيْر) ٥

**صَمْصَمَ في كذا**: بەمانا سووربوون لەسەر شت، پێگیری كردن لەداوا ٥ **صَمْصَمَت العُنْفُذَةُ**: زیشكەكە دەنگی لێوەهات ٥ قیژاندی ٥ **الصَّمْصَامُ**: سوور بوو لەسەر داوا ٥ شمشێری برندەو تیژ كە نەنوشتێتەوە ٥ **الصَّمْصَامَةُ**: بەمانا (الصَّمْصَامُ)دێ ٥ **الصَّمْصَمُ**: زۆر ڕژدو چروك ٥ **الصَّمْصِمَةُ**: كۆمەڵ‌و تاقم ٥ تەپۆڵكەی پتەو بەردەلآن ٥ **الصِّمْصِمُ**: زۆر ڕژدو چروك ٥ **الصِّمْصِمَةُ**: كۆمەڵ‌و تاقم ٥ تەپۆڵكەی پتەوو بەردەلآن.

**صَمِعَ صَمَعاً**: گوێچكەی بچوك بوو، پاژنە پێی بچوك‌و باریك بوو ٥ **صَمِعت القناةُ**: ڕمبەكە گرێكەی بچوك بوو ٥ **صَمِعَ فلان**: فلآنكەس ئازاو بەجەرگ بوو، ملی لێ نابۆ ناو كارەسات‌و گوێی بەهیچ نەدا ٥ **صَمَّعَ الشيءَ**: شتەكەی تیژ كرد ٥

صَمَّعَ الحيوانَ: گیانلەبەرەکەی کزو کۆڵەوار کرد ٥ صَمَّعَ اللهُ الظَّبيَ: خودا شاخی پچوكو تیژی بۆ ناسکەکە خولقاند ٥ إنْصَمَعَ في غضبه: لەرق هەڵسانەکەی دا بەردەوام بوو ٥ تَصَمَّعَ: رقی لەگەڵ رق تێکەڵاو کرد ٥ رقی سوار رق بوو ٥ تَصَمَّعَ ريش السَّهْم: پەرو پۆڵی پێکەوە نووسا چونکە خوێناوی بوو ٥ الأَصْمَعُ: بێچوو ٥ ئەم ناوەی لەوەوە بۆ هاتووە کە گوێچکەی بچوکن و بەسەریەوە نووساون ٥ پێشی دەگوترێ: (الأَصْلَمُ) ٥ هەروا بەمانا سەرباریك و تیژ دێ ٥ دەگوترێ: (نبات أصمعُ): رووەکێکە چرووەکەی دەرکەوت و هێشتا نەگەشاوەتەوە ٥ (قلب أصمع) دڵێکی زیرەك و قایم و پتەو ٥ الصَّمِعُ: دڵ قاییم ٥ ئازاو ورە بەرز ٥ الصَّمْعَاءُ: دەگوترێ: (أذن صَمْعَاءُ): گوێچکەی پچوك و نوساو بەسەرەوە ٥ (قدم صَمْعَاءُ): قاچێکە پاژنەی ڕێك و پێك و ناسکە ٥ (برعومة صَمْعَاءُ): چوزەرەیەکە هێشتا نەگەشاوەتەوەو نەکراوەتەوە ٥ (قناة صَمْعَاءُ): سەر رمبێکە ناسنەکەی پتەوو بێ کلۆراییە ٥ صَوْمَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی گرد کردەوە ٥ صَوْمَعَ البناءَ: باڵەخانەکەی بەرز کردەوە ٥ الصَّوْمَعُ: کەنیشتە، خانووی خودا پەرستی مەسیحییەکان ٥ خەڵوەی خودا پەرستی و گۆشەگیری ٥ الصَّوْمِعة: بەمانا (الصَّوْمَعُ) دێ ٥ سایلۆی دانەوێڵە ٥ کەندوو عەمباری دانەوێڵە تێدا هەڵگرتن ٥ أصْمَغت الشجرةُ: درەختەکە صەمغی تازەی دەردا ٥ أصْمَغَ شِدْقُهُ: لاشەویلەی کەفی پێوە بوو ٥ صَمَّغَهُ: صەمغی لێ دا، صەمغی تێ کرد ٥ بەصەمغ پێکیەوە نووساند ٥ اسْتَصْمَغَ الشجرَ: صەمغی لەدرەختەکە دەرهێنا ٥ التَّصَمُّغُ: نەخۆشییەکە توشی برێ شتی سوێرو شیرین دەبێ ٥ الصَّامِغان: ئەملاو ئەولای دەم بۆلای شەویلە ٥ الصَّمْغُ: مادەیەکی لینجە وەکوو غەرە وایە لەبرێ درەخت دەردەهێندرێ و وشك دەکرێتەوەو ئامادەی توانەوەی تێدایە دەکرێتە کەرەسەی شت پێکەوە نووسان ٥ الصَّمْغانُ: بەکەسێك دەگوترێ کە شتێکی وەکوو صەمغ لەگوێچکەی یان لە لوتییەوە بێتە دەر ٥ الصَّمْغَةُ: لەبواری پزیشکی دا هەوکردن و هاوسانێکە لەقۆناغی سێیەمی نەخۆشی زوهری بۆماوەیی پەیدا دەبێ و کێم دەکا ئەگەر لەپێست دا بێ ٥ الصَّمَّاغَةُ: سەتڵەو قاپێکە صەمغی تێدایە، کاغەزو شتی وای پێ بەیەکەوە دەنوسێنرێ.

صَمَلَ صَمْلاً وصُمُولاً: خۆی دارشت و خۆی پرکردەوەو پتەو بوو.

صَمَلَ عن الطعام: وازی لەخواردن هێنا.

صَمَلَ للعمل وفيه: خۆی بۆ کارەکە ڕاگرت و پشوو درێژ بوو ٥ (فهو صامِلٌ وصميل) ٥ أصْمَلَهُ: وای لێ کرد پشوو درێژو خۆگر بێ ٥ دەگوترێ: (أصْمَلَهُ الصِّيامُ): ڕۆژو لاوازی کرد کزو کۆڵەواری کرد ٥ أصْمَلَ الشَّجَرَةَ العَطَشُ: تینوایەتی و بێ ئاوی درەختەکەی لاوازو زەرد کرد ٥ الصُّمْلَةُ: پارچە ئاسنێکە بازنەیی یان سوچدارە برغوو بزماری پێ قایم دەکرێ ٥ الصِّملاخ (صِمْلاخ الأذن): کرکراگەی گوێ ٥ یان ئەو مادە زەردەی گوێچکە ئیفرازی دەکا وەکوو صەمغ وایە ٥ الصُّمْلوخ: بەمانا (الصِّملاخ)دا.

صَمَّ القارورةَ ونحوها صَمًّا: دەمی گۆزەکەی گرت، تۆپەوانەی تێ هاخنی.

صَمَّ الجُرْحَ: برینەکەی دەرمانکردو دەمەکەی بەست.

صَمَّ الحديث: فەرمودەکەی لەبەرکرد، خستییە مێشکی خۆیەوە.

صَمَّ فلاناً: بەشیدەت و هێز لەفلانکەسی دا.

صَمَّ صَمّاً وصَمَماً: کەڕبوو ٥ دەگوترێ: (صَمَّتْ أذنهُ): گوێچکەی گیرا ٥ کەڕبوو.

صَمَّ عن حديثه: ڕوی لەقسەکانی وەرگێرا، گوێی خۆی لە قسەکانی کەڕکرد نەی ویست گوێی لێ بێ.

صَمَّ الجِسْمُ: قەبارەکە پتەوو بێ کلۆرایی بوو.

صَمَّ الأمْرُ: کارەکە گیربوو، کێشەی تێکەوت ٥ (فهو أصَمُّ وهي صمّاء) ٥ أصَمَّ: کەڕبوو ٥ أصَمَّ فلاناً: فلانکەسی کەڕکرد ٥ أصَمَّ القارورةَ: تۆپەوانەی بۆ گۆزەکە دروست کرد ٥ صَمَّمَ في كذا أو عليه: سوور بوو لەسەر ئەوشتەو دەستبەرداری نەبوو ٥ صَمَّمَ السيفُ: شمشێرەکە تاسەر ئێسقانی بڕی ٥ صَمَّمَ فلاناً: فلانکەسی کەڕکرد ٥ صَمَّمَ صاحِبَهُ الحديث: فەرموودەکەی بەهاوەڵەکەی لەبەرکرد ٥ تَصَامَّ الحديث وعنه: وای خۆنیشان دا کە کەڕەو قسە نابیستێ ٥ الأصَمُّ: کەڕ ٥ گوێ گران ٥ کەسێك هیچ هیوایەکی لێ نەکرێ ٥ کەسێك ئامۆژگاری کاری تێ نەکا ٥ دەشگوترێ: (حِلْمٌ أصَمٌّ): لەسەرەخۆیی و بارقوڵی زۆرو بێ ئەندازە ٥ (خَطْبٌ أصَمُّ): بەڵای بەهێزو کوشندە ٥ (مكان أصَمُّ): شوێنی ڕوتەن و سوتەمەڕۆ کەهیچی لێ نەڕوێ ٥ (الشّهر الأصَمُّ): مانگی ڕەجەب، عارەبەکان دابو نەریتییان وا بوو لەم مانگەدا بانگەوازییان نەدەکرد بۆ شەڕ ٥ الصَّمّاءُ: (الفُدْرَةُ الصَّمّاءُ): لوێکە، غودەیەکە بۆ ئیفرازاتەکەی مەنفەزی نەبێ بۆدەرەوەی جەستە، وەکوو غودەی دەرەقی ٥ صَمَامِ: ناوە بۆ بەڵاو کارەساتی ناخۆش ٥ هەروا بەمانا فەرمانکردنە بەبێ دەنگ بوون ٥ (صَمَامِ): واتە بێدەنگ بە.

الصِّمَامُ: بەربەست و تۆپەوانە ٥ قفڵێکە ئۆتۆماتیکی لەکاتی زەخت لێ کردن دا بۆخۆی دەکرێتەوە ٥ الصِّمَامَةُ: بەمانا (الصِّمَام)ە ٥ الصَّمَمُ: نەمانی هەستی بیستن ٥ کەڕبوون ٥ دەگوتری: (بە صَمَمٌ): بەکەسێك دەگوترێ ببیسێ بەڵام هیدایەت نەدرێ بەگوێرەی ئەوەی دەیبیستێ ٥ الصِّمَّةُ: ئازاو بەجەرگ ٥ دەگوترێ: (رجل صِمَّةٌ): پیاوێکی ئازایە ٥ الصِّمَامُ: ژیشکی مێ ٥ الصَّميم: ناوەڕۆك و پوختەو کاکڵە ٥ ناوەڕاستی دڵ ٥ گەرماو سەرمای بەشیدەت ٥ صميم العضو: ئەو ئێسقانەی جەستە ڕادەگرێ ٥ دەگوترێ: (ضربه فأصاب منه صميمه): لێی داو شوێنی کاریگەری گرت ٥ المُصَمِّمُ: ئەوکەسەی سوورە لەسەر کاروباری خۆی و نایەوێ کۆڵ بدا ٥ شمشێری تیژی بڕندە کە ئێسقانیش دەبڕێ ٥ کەسێك بەردەوام بێ لەسەر ڕۆیشتن و شتی وا ٥ الصَّمَّانُ: زەوی پتەوو بەردەڵان کەلەگەڵ لم دا تێکەڵ بێ ٥ الصَّمَّانَةُ: بەمانا (الصَّمَّانُ)ە.

صَمَى الصيدُ ولهوه صمياً وصَمَياناً: نێچیرەکە پێکراو لەبەردەستی نێچیرەوانەکەی دا گیانی لەدەست دا.

صَمَى الرجلُ: پیاوەکە بازی داو پەلەی کرد ٥ أصْمَى الصَّيْدُ والرجلُ: بەمانا (صَمَى)ە ٥ أصْمَى الصَّيْدُ: نێچیرەکەی پێکاو کەوتە ژێر دەستی ٥ لەحەدیس دا هاتووە: (كل ما أصْمَيْت ودع ما أنميت): گۆشتی ئەو نێچیرە بخۆ کەلەبەر دەستت دا گیان لەدەست دەدا ٥ ئەو نێچیرە مەخۆ بریندار دەکەی و دوور لەتۆ مندار دەبێتەوە ٥ أصمى الرَّمِيَّةَ: باش نیشانەکەی پێکاو تیرەکەی تێ چەقاند ٥ الصِّنَاب: خۆراکێکە دەکرێتە پێخۆر لەخەردەل و مێوژ دروست دەکرێ ٥ الصِّنابِي: ئەوەی ڕەنگی لەنێوان سوورو زەرد دا

بـیّ ◊ صَـنْبَرَتِ النَّخلـةُ: نـەمامی درەختـی خورماکە لەسەر قەدی درەختە خورمایەکی تـر ڕوا بۆخـۆی سـەربەخۆ لـەزەوی دا نـەڕوا ◊ دەشگوترێ: (صَنْبَرَ أسفل النخلة): لای خـواروی قەدە دارخورماکە باریك بوو ◊ الصَّنْبَرُ: باریـكو تـەنك لەهەرشـتێك بـێ ◊ الـصُّنْبُورُ: لقـە دارخورمایەکە لەقەدی درەختە خورمایەکی تـر سەرهەڵدەداو دەڕوێ، بەبێ ئەوەی خۆی بەنەمام لـەزەوی بـڕوێ ◊ هـەروا نـاوە بـۆ بنکـی دارخورمایـەك لای خـواروی قەدەکـەی باریـكو بنکی لقەکانی ڕوتو بەری کەم بێ ◊ درەختە خورمـای بەتـەنیاو دوور لـەدارخورمای تـر ◊ بەلوعـەی ئـاو ◊ کونی بەلوعـەی ئـاو ◊ الـصِّنَّبْرُ: بای سارد کاتێ دونیا هـەورو هـەڵابێ ◊ صَنَابِر الشتاء: کاتە زۆر ساردەکانی زستان ◊ الـصَّنَوبَرُ: درەختـی سـنەوبەر، زۆر جـۆری هەیـە بـڕێ لەجۆرەکانی بەرێکی بچوکی تام خۆشی هەیە.

صَنَجَ صَنْجاً وصنوجاً: سازی لـێ دا، سازو سەمتوری لـێ دا.

صَـنَّجَ النـاسَ: خەڵکەکەی بـردەوە سەر بنەچەی خۆیـان ◊ الـصَّنْجُ: پلێتێکـی بازنەییـە لـەمسو مەعدەنی تـر بەیەك دەکێشرێنو دەنگیان لـێ دێ بـۆ شـاییو سـەماکردن بـەکاردێن ◊ هـەروا چەند پارچە صەفیحەیەکی زەردن بەقـەراخی دەفـەوە دا دەکـوترێن یـان لەپەنجەی ڕاقیـصەدا دەبـن لـەکاتی شـاییو زەماوەنـد دا پێکیـان دەکێشنو دەنگیـان لـێ دێ ◊ الـصَّنَّاجُ: خـاوەنی سەنج یان ئەوکەسەی یاری پێ دەکا ◊ الـصَّنَّاجَةُ: بۆمانـای زێـدە ڕۆیـی لـەمادەی (الـصَّناج)دا دێ ◊ صنَّاجَة العرب: نـاز نـاوی شاعیر (أعـشی قـیس)ە چونکە شیعرەکانی بـۆ گـۆرانی زۆر لـەباربوون ◊ الـصِّنْدِدُ: شـەریفو نـازا ◊ الـصَّنَدید مـن النـاس: ئـادەمیزادی ئـازا ◊ دەشگـوترێ: (بـرد صِـندید): سەرمای بەتەوژم ◊ (ریح صِندید): بـای بـەهێز ◊ (یوم حامي الصناديد): ڕۆژی زۆر گەرم ◊ صـناديد القـدر: بـەڵای ڕۆژگـار ◊ الـصَّندوق: سـندوق بـۆ تێداهـەڵگرتنی کتێـبو پۆشـاكو شـتی تـر ◊ صـندوق البريـد: صـندوقی پۆستە؛ صندوقێکە لەبڕێ شوێنی تایبەت لەسەرشەقام دادەنرێ بـۆ تێکردنـی نامـەو شـتی وا ڕۆژانـە یـان هەفتانـە کارمەنـدی پۆسـتە دەیانکاتـەوەو نامـەکان کۆدەکاتەوە بۆئەوەی بگەیەنرێنە شوێنی خۆیان ◊ صندوق التوفير: بەشێکە لەفەرمانگەی بەریـد موچـەخۆرو خـاوەن پـارەو پـول هەڵـدەنێ بـۆ پەزمەندەکردنی ماڵو سامانو وەبـەرهێنانی بـۆ سـودو قـازانج ◊ صـندوق الطـرد: ئـەو تەنکییـە ئاوەیە کەلەتەوالێت دا دادەمەزرێنـدرێ بۆئـەوەی کاتی پێویست بۆ پاکردنەوەی سیفۆنی ئاودەست بەکاربهێنرێت ◊ تَصَنْدَلَ الرجلُ: پیاوەکە بـەبۆنی صەندەل خۆی بۆنخۆش کرد ◊ صەندەلی پۆشی ◊ الصَّنَادِلُ من الدَّوَاب: ئاژەڵی سەرگەورە ◊ جەستە گـەورەو تۆکمـەو بـەهێز ◊ الـصَّنْدَلُ: درەختـی صـەندەل، دارەکـەی بـۆنێکی خۆشـی لـێ دێ بۆنەکـەی بەدەست پێـداهێنانو سـوتاندن بـڵاو دەبێتـەوە ◊ دارەکـەی چـەند جـۆرێکی هەیـە (سـورو سـپیو زەرد) ◊ خوفێکـە ژێرەکـەی نەعلێکی پتەوەو بەتیلمە چەرمی باریك لەقاچ شەتەك دەدرێ ◊ بەلەمێکە ژێرەکەی کەوانەییە لەڕوبارو شتی وادا بەکاردەهێنرێ ◊ الـصَّندلاني: صـەیدەلانی ◊ عـەترفرۆشو ئەوانـەی دەرمـانی پزیشکی دروست دەکەن ◊ الصَّنَّارَةُ: شیشە ئاسنی باریـكو سەرگۆچـانی لەکـەو گـۆرەوی پـێ دەچندرێ ◊ ئاسنێکی سەرگۆچانی قولاپە پێیە پـەتێك لەسـەرێکی دەخـرێو هەڵدەدرێتـە نـاو

ئاوەوە بۆماسی گرتن ٥ پێشی دەگوترێ: (الشَّصُّ).

**صَنَعَ الشَّيْءَ صُنعاً:** شتەکەی دروست کرد.

**صَنَعَ بە صُنعاً قبیحاً:** خراپەی لەگەڵ کرد، ئازاری دا. ٥ **صَنَعَ لە أو الیە معروفاً:** بەخششی خۆی بەسەردا رشت.

**صَنَعَ فَرَسَهُ:** جوان ئەسپەکەی بۆ ڕام کردو چاودێری بوو، دەگوترێ: (صَنَعَهُ علی عینە): لەژێر چاودێری ئەودا ئەوشتەی هێنایە دی ٥ هەروا دەگوترێ: (صنعە بعین فلان): لەژێر چاودێری فلان دا ئەوشتەی هێنایە دی.

**صَنِعَ صَنَعاً:** لەدروستکردن دا دەست ڕەنگین بوو ٥ **أصْنَعَ الأخْرَقُ:** حوشترەکەی باش رام بوو ٥ **أصْنَعَ الفَرَسَ وغیرە:** جوان ئەسپەکەی پەروەردە کردو رای هێنا بۆ سواریی ٥ **صانَعَهُ:** لەگەڵی دا هەڵی کرد، لەگەڵی گونجا ٥ **صانَعَ عن الشَّيْءِ:** لەشتەکەدا فێڵی لێ کرد ٥ **صَنَّعَهُ:** بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (صَنَعَهُ)دێ ٥ **صَنَّعَ الجاریة:** کیژەکەی باش پەروەردە کردو قەڵەوی کرد ٥ **صَنَّعَ الأُمَّةَ:** گەلەکەی کردە گەلێکی پیشەوەرو دەست ڕەنگین ٥ **إصْطَنَعَ:** بۆ زێدەڕەوی لەمانای (صَنَعَ)دێ ٥ **إصْطَنَعَ فلانٌ:** فلانکەس خواردنی ئامادەکرد بۆخێر بەهاناوە چوونی ئاتاجان ٥ **إصْطَنَعَ عند فلان صَنیعَةً:** چاکەی لەگەڵ فلانکەس کرد ٥ **إصْطَنَعَ فلاناً لنفسە:** فلانکەسی بۆخۆی هەڵبژارد ٥ **تَصَنَّعَ:** لافی شتێکی لێ دا کەنەیبوو ٥ **إستَصْنَعَ فلاناً کذا:** داوای لەفلان کرد ئەوشتەی بۆ دروست بکا ٥ **التصنیع:** پیشەسازی ڕەچاو کردن ٥ گۆڕینی گەل بۆ گەلێکی پیشەوەرو شت دروستکەر ٥ بڵاوکردنەوەی گیانی پیشەسازی لەناو گەل دا ٥ **الصَّانِعُ:** وەستاو دەست ڕەنگین ٥ پیشەوەر ٥ دەگوترێ: (امرأة صانعة الیدین): ئافرەتێکە دەست ڕەنگین‌و کارامەو کەیبانوو ٥ **الصِّناعة:** پیشەسازی ٥ هەرکارو کردەوەیەك ئادەمیزاد بیکاو تێیدا دەست ڕەنگین بێ ٥ **الصِّناعیة:** دەگوترێ: (قوم صناعیة): نەتەوەیەکن باش دەزانن ماڵ‌و سامان بخەنە گەڕ ٥ **الصِّناعي:** کەسێك بەخوێندن‌و فێربوون فێری پیشەسازیی ببێ ٥ هەروا ناوە بۆ شتێك خۆڕسك‌و سروشتی نەبێ دروست کرابێ ٥ وەکوو دەڵێن: (حریر صناعي) ٥ هەروا بەچاوگی صەناعیش دەگوترێ وەکوو (الخصوصیة، الفروسیة والطفولیة) ٥ **الصُّنْعُ:** کردەوەی ئادەمیزاد ٥ هەروا ناوە بۆ تاوەو ئامێری گۆشت برژاندن ٥ شیشی گۆشت برژاندن ٥ تەنکی‌و عەمباراو کەنداوی بارانی تێدا بەزمەندە بکرێ‌و کاتی پێویست لێی بەکاربێ ٥ دەشگوترێ: (رجل صِنع الیدین): پیاوی دەست ڕەنگین ٥ **الصَّنَعُ:** زمانڕەوان‌و پاراو، دەگوترێ: (لسان صَنَعُ ورجل صنع اللسان): قسەڕەوان‌و کارامە ٥ (صِنْعَ الیدین): دەست ڕەنگین‌و شارەزا لەپیشەوەریی دا ٥ **الصِّنْعَةُ:** کردەوەی پیشەساز، دروستکراوو بەرهەمی پیشەساز ٥ پیشەی پیشەوەر ٥ لەزاراوەی فەلسەفەدا ڕێبازی ڕێك‌و پێك‌و تایبەتی بۆ ئەنجامدانی کاری دەستی یان زیهنی ٥ **الصَّنیعُ:** کردارو بەرهەم ٥ **المُصانَعَةُ:** بەرتیل ٥ شتێك بۆیەکێك ئەنجام بدەی بۆئەوەی ئەویش شتێکت بۆ بکا ٥ **المَصْنَعُ:** کارگە ٥ شوێنی دروست کردن‌و بەرهەمهێنانی شت‌و مەك ٥ عەمباراو کەنداوی باران‌و شتی وای تێدا کۆدەکرێتەوە بۆئەوەی لەکاتی پێویست بەکاری بێنی ٥ **المَصانِعُ:** باڵەخانە بۆ نیشتەجێبوون‌و قەڵاو ئەو جۆرە شتانە ٥ **المَصْنَعة:** کارگە ٥ نان دروستکردن‌و زیپافەت کە دۆست‌و ئاسیاوی بۆ بانگ بکرێن ٥ هەنگەلان (شوێنی هەنگ بەخێو

کردن لەدووری گوندو شوێنی نیشتەجێ بوون) ٥ المصنوع: پێچەوانەی شتی خۆرسك ٥ بەدی هێنراو بەدەستی ئادەمیزاد ٥ هەروا ناوە بۆ شیعرێك عاتیفەو خەیاڵ رۆڵی نەبووبێ لە لەدایکبوونی دا ٥ صَنَّفَ الشَّجَرُ: درەختەکە چەند جۆرێك بوو ٥ یان گەڵای کردو گەڵاکانی جۆر جۆر بوون ٥ یان گەڵای دەرکرد ٥ صَنَّفَ الثمرُ: میوەکە هەندێکی پێگەیی‌و هەندێکی نا ٥ صَنَّفَ الأشياء: کاڵاکانی لێك هەڵاواردن‌و هەرجۆرەی بەجیا ریزکردن ٥ صَنَّفَ الكتابَ: کتێبەکەی تەئلیف کرد (دای نا) ٥ تَصَنَّفَ الشَّجَرُ: درەختەکە گەڵای کردو گەڵاکانی جۆراو جۆر بوون ٥ تَصَنَّفَ الأشياءُ: شتەکانی لێك بونەوە هەرجۆرەی بەجیا ریز بەندو کۆبەند بوون ٥ تَصَنَّفَت شَفَتُهُ: لێوی قەڵشی، باری گرت، قەتماغە لەسەری دروست بوو ٥ الصِّنْفُ مِن الشَّيْئِ: جۆری شت کە بەرواڵەت لەشتی تر جیابێ ٥ الصُّنْفُرَةُ: جۆرە وەرەقێکی زبرە داری پێ سفت دەکرێ ٥ أصْنَقَ: لەبەر خەفەت‌و توڕەیی هیچی نەخواردو نەخواردەوە ٥ صَنِمت الرائحَةُ صَنماً: بۆنەکە ناخۆش بوو، دەگوترێ: (صَنَمَ الجسم): بۆگەنی جەستە ٥ صَنَّمَ فلان: فلانکەس بتێکی دروست کرد ٥ صَنَّمَ الشَّيْئَ: شتەکەی هێنایە سەر شێوەی بت ٥ الصَّنَمُ: پەیکەرێکە لەبەرد یان لەدار یان لەکانزای تر پەرستشی بۆکراوە لای عەرەب باو بووە پێیان وابووە پەرستنیان لەخودایان نزیك دەکاتەوە ٥ (ك: أصنام) ٥ الصَّنَمَةُ: بەمانا (الصَّنَم)دێ.

**صَنَّ** صَنّاً وصُنوناً: بۆگەنی کرد، بۆنی ناخۆشی لێ پەیدا بوو، دەگوترێ: (صَنَّ اللحمُ وصَنَّ الماءُ) ٥ أصَنَّ: بەمانا (صَنَّ)دێ ٥ أصَنَّ فلان: فلانکەس بێ دەنگ بوو ٥ لوتبەرزیی نواندو ترو فیزی کرد جا یان لەبەر رقو توڕەیی یان بەهۆی تەکەببورو خۆ بەزلزانی ٥ الصُّنَانُ: بۆگەن، بۆنی ناخۆش ٥ أصْنَى فلانٌ: فلانکەس خۆڵەکەوە پیسی کرد ٥ أصْنَتِ الشَّجَرَةُ: درەختەکە پەلێکی لێ جیا بۆوە، درەختەکە بەدوو پەل یان زیاتر روا ٥ تَصَنَّى فلانٌ: بەمانا (أصنى)دێ ٥ الصِّنَاءُ: خۆڵەکەوە ٥ ئەوەی دەکەوێتە سەرجەستە لە خۆڵەمێش‌و دوکەڵ ٥ الصِّنْوُ: هاوشان‌و بەرامبەر ٥ نەمام‌و شلکە دار کەلەسەربنکی درەختێکی تر دەروێ ٥ برای باوك‌و دایکی ٥ الصِّنْوَةُ: مێینەی (الصِّنو) ٥ الصُّنَوْبَرُ: سنەوبەر؛ درەختێکە دەروێندرێ یان بۆ جوانی‌و رازاندنەوەی شوێن یان بۆ سود وەرگرتن لەدارەکەی هەندێ جۆری هەیە بەردەگرێ تامێکی خۆشی هەیە.

**صَهِبَ** اللون صَهَباً وصُهْبَةً: رەنگی زەردی سورباوی سپی واشە.

**صَهُبَ** صُهُوبَةً وَصَهَباً: بەمانا (صَهِبَ)دێ ٥ صَهَّبَهُ: وای لێ کرد رەنگێکی زەردی سورباوی سپی واشەی هەبێ ٥ إصْهَبَّ الشَّعْرُ: قژی زەردی سورباوی سپی واشە بوو ٥ الأصْهَبُ: رەنگی زەردی سورباوی سپی واشە ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (الصَّهْبَاء) ٥ الصَّهْبَاءُ: شەراب ٥ الصُّهْبَةُ: زەردییەکی سورباوی مەیلەو سپی ٥ صَهَدَهُ الحَرُّ صَهْدةً وَصَهَداناً: گەرماکە بەهێز بوو ٥ الصَّيْهَدُ: گەرمای بەهێزو تەوژم.

**صَهَرَ** الشَّيْئَ بالنار ونحوها صَهْراً: شتەکەی تواندەوە ٥ صَهَرَه الحَرُّ: گەرمی تینی بۆهێناو تەنگی پێ هەڵچنی ٥ صَهَرَ الخبز ونحوه: پیوی تواوە یان مۆخی کردە پێخۆر.

**صَهَرَ** شَعْرَهُ: قژی خۆی بەپیو چەور کرد.

**صَهَرَ جِسْمَهُ**: جەستەی خۆی هەنو، چەوری کرد.

**صَهَرَ الشَيْئَ اليه**: شتەکەی لەخۆی نزیك کردەوە ○ **أصْهَرَ اليه**: لێی نزیك بۆوە ○ **أصْهَرَ الی القوم وبهم**: بوو بەزاوای قەومەکە، ئافرەتی لێ خواستن ○ **صَاهَرَ القومَ وفيهم واليهم**: بەمانا (أصْهَرَ)دێ ○ **إصْطَهَرَ الشَحْمَ**: پیوەکەی تواندەوەو خواردی.○ **إنْصَهَرَ**: توایەوە ○ **تصاهَرَا**: ئەو بنەماڵە ژن‌و ژنخوازییان بەیەکەوە کرد ○ بوون بەزاواو خەزوری یەکتری ○ **الإنصِهَارُ**: گۆڕانی مادەی ڕەق‌و پتەو بۆ حاڵەتی شلەمەنی ○ **الصُهَارَةُ**: تواوە ○ پیوو بەز ○ مۆخ ○ **الصَهْرُ**: گۆڕاندنی مادە لەحاڵەتی ڕەقی پتەوییەوە بۆ حاڵەتی شلەمەنی ○ **الصِهْرُ**: خەزور، خزمایەتی بەهۆی ژن خواستنەوە ○ **الصُهُورُ**: گۆشت برژێن ○ بەزو پیو توێنەرەوە ○ **الصُهيُ**: تواوە ○ هەرشتێك لەحاڵەتی ڕەقییەوە گۆڕابێ بۆ شلەمەنی ○ **المَصْهَرُ**: شوێنی توانەوە ○ **صَهْرَجَ صِهريجاً**: حەوزی ئاوی دروست کرد ○ عەمباراوی بنیات نا ○ **صَهْرَجَ الحَوْضَ**: حەوزەکەی بەقیرو زفت کونبڕ کرد، قیرو زفتی لەحەوزەکە هەڵسو ○ **الصِهرِيجُ**: حەوزێکی گەورەی ئاوە، عەمباراو، تەنکی ئاو.

**صَهْ**: بێ دەنگ بە، قسە مەکە ○ **صَهْصَهَ بالقوم**: لەخەڵکەکە توڕەبوو بۆئەوەی بێدەنگیان بکا ○ بێدەنگ بن.

**صَهَلَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە حیلاندی ○ **تصاهلت الخيلُ**: ئەسپەکان بۆیەکتریان حیلکاند.○ **الصَاهِلُ**: ئەسپ.

**صَهِيَ صهاً**: بریندار بوو، دوایی برینەکەی تەڕ بوو (ئاوی کرد) ○ **أصْهى الفَرَسُ ولحوه**: ئەسپەکە جدەوی یان ناوقەدی موراغەی پشتی نازاری بوو ○ **أصْهى المريضَ**: نەخۆشەکەی بەڕۆن هەنوو خستییە بەرخۆر ○ **صاهَى الفَرَسَ**: چووە سەر قەپوچکی زین سواری پشتی ئەسپەکە بوو ○ **الصَهْوَةُ**: شوێنی زین لەسەر پشتی ئەسپ ○ هەروا ناوە بۆ تۆپەڵاك‌و لای ژورووی هەموو شتێك ○ بورج‌و باڵەخانە کە لەسەر تەپۆلکە دروست بکرێن ○ شوێنی پەناو پاسار کە حوشتری تەڕەبوو تێیدا دەحەوێنەوە ○ سەرچاوەی ئاو لەکێودا ○ **الصِهيونية**: جم‌و جوڵ‌و تێکۆشانێکە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگاو قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ بۆ نەتەوەی جولەکە لەفەلەستین دا ○ ئەم ناوە لەوەوە دانراوە کەلەنزیك شاری ئورشەلیم کێوێك هەیە پێی دەگوترێ: (صِهيون)و پاڵ ئەو دراوە.

**صابَ المَطَرُ صَوْباً وصَيْبوبةً**: بارانەکە هەڵڕژا.

**صابَ السَحابُ بالمطر**: هەورەکە لەکاتی پێویست دا بارانی پێویستی باراند.

**صَابَ المَطَرُ الأرضَ**: بارانەکە زەوییەکەی ئاوداو تێراوی کرد ○ لەکاتی پێویست دا بارانەکە باری.

**صابَ السَهْمُ**: تیرەکە نیشانەکەی پێکاو هەنگاوتی.

**صابَ بە**: کەوتە شوێنی خۆی، شوێنی خۆی گرت ○ **أصَابَ الشَيْئَ**: گەیشتە شتەکە ○ **أصابَ الخَطْبُ فلاناً**: بەڵاکە سواری شانی فلان بوو ○ **أصابَ بعينه**: حەسوودی پێ برد، چاوی حەسودی بڕیە ماڵ‌و سامانی‌و بەخیلی پێ برد ○ **أصابَ السَهْمُ الرَمْيةَ**: تیرەکە لەنیشانەکەی دا، نیشانەکەی پێکا ○ دەشگوترێ: (أصاب الرامي): تیرهاوێژەکە تفەنگچییەکە نیشانەکەی هەنگاوت ○ **أصاب من المال**: لەماڵ‌و سامانەکەی برد ○ **صَوَّبَ السَهمَ**: تیرەکەی ناڕاستەکردو لێی دا، هەنگاوتی ○ **صَوَّبَ الفَرَسَ**: ئەسپەکەی هەلینگ دا بەرەو ئامانجی

تایبەتی لەپێشبڕکێکەدا ٥ صَوَّبَ فعلە أو قولَە: کردارەکەی یان گوفتارەکەی بەڕاست داناو پەسەندی کرد ٥ صَوَّبَ الخطأ: هەڵەکەی ڕاست کردەوە ٥ صَوَّبَ فلاناً: بەفلانکەسی گوت باشت کرد، دەست خۆش ٥ صَوَّبَ الشَّیْئَ: شتەکەی شۆڕکردەوە، خواری کردەوە ٥ صَوَّبَ الطعامَ أو الحب: خۆراکە یان دانەوێڵەکەی کردە کۆمەڵ ٥ إنصاب الماءُ: ئاوەکە هەڵڕژا ٥ تَصَوَّبَ: بۆ موطاوەعەی (صَوَبَ) هاتووە ٥ هەروا بەمانا سەرەو ژێر بوونەوەیە ٥ استصَابَ رأیە او قولە أو فعلە: ڕاوو بۆچونەکەی بەڕاست دانا پەسەندی کرد پشتگیری قسەو کردەوەکەی کرد ٥ إسْتَصْوَبَهُ: بەمانا (استصاب)دێ ٥ الصَّابُ: درەختێکە تاڵ، گوشراوێکی سپی هەیە وەکوو شیر وایە زۆر تاڵە، بەرچاو بکەوێ یەکسەر لەناوی دەبا ٥ الصَّوابُ: بەربەست ٥ حەق‌و ڕاستی ٥ الصَّوْبُ: لای شت ٥ دەگوترێ: (إتَّجهَ صَوْبَهُ) ڕوی کردە لای ئەو ٥ مەبەست‌و ئامانج ٥ دەگوترێ: (فلان مستقیم الصَّوْب): فلانکەس لەمەبەست‌و ئامانجی خۆی لاناداو بەرەو هەدەف هەنگاو دەنێ ٥ هەروا ئاوە بۆ بارانێك کەبەئەندازەی پێویست ببارێ‌و زیان نەگەیەنێ ٥ الصَّوْبَةُ: خواردەمەنی کۆبۆوە یان دانەوێڵەی خرکراوە ٥ هەروا ئاوە بۆ ژوورێکی لەشوشە دروستکراوو پلەی گەرمی تێدا ڕەچاوبکرێ‌و برێ جۆری ڕوەکی تێدا پەروەردە دەکرێ ٥ الصُّوابَة (صُوَابَة القوم): هەڵبژاردەی گەل‌و هۆز ٥ الصَّوِیبُ: هەنگێو، ئامانج پێك، ڕا دروست ٥ الصَّیِّبُ: هەوری باراناوی کە بەئەندازەی پێویست باران ببارێنێ ٥ خودی باران ٥ الصَّیُّوبُ: بەمانا (الصَّیِّب)دێ ٥ المُصَابُ: هەنگاوتن‌و پێکان ٥ بەلای گەورەو سامناك ٥ هەنگێوراو؛ کەسێك زیانێکی پێ بکەوێ ٥ المُصِیبَةُ: بەڵاو کارەسات، کەتوشی ئادەمیزاد دەبێ ٥ الصَّوَبَّعُ: تیرۆك ٥ نەوشتەی هەویری پێ پان دەکرێتەوە ٥ الصُّوَیَّعُ: بەمانا (الصَّوَبَّعُ)دێ.

صَاتَ صَوْتاً وصُواتاً: دەنگی لێ هات، قیڕاندی، قیژاندی ٥ أصَاتَ: بەمانا (صَات)دێ ٥ أصات بفلان: ناوی فلانکەسی زڕاند ٥ أصات فلاناً: وای لەفلانکەس کرد هاوار بکا دەنگی لێ بێ ٥ صَوَّتَ: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (صات) دا دێ ٥ صَوَّتَ بە: بانگی کرد ٥ صَوَّتَ لە: لەهەڵبژاردن دا دەنگی بۆدا ٥ صَوَّتَ الطَّسْتَ: وای لەتەشتەکە کرد دەنگی لێ بێ ٥ إنْصَاتَ: وەڵامی دایەوە ٥ دەگوترێ: (إنصات فلان للأمر): فلانکەس گوێ ڕادێری فەرمانەکە بوو ٥ دوای خواروخێچی ڕاست بۆوە ٥ إنصات بە الزمان: ڕۆژگار ناوبانگی دایە ٥ الصَّاتُ: ناوبانگی باش کە بەناو خەڵك دا بڵاو بێتەوە ٥ دەنگ تیژو گەورە دەنگ زڕ ٥ الصَّوْت: دەنگ ٥ دەنگدان بەنووسین یان بەئاماژەو دەست هەڵبڕین یان بەقسە بۆ پەسەند کردنی شتێك ٥ الصِّیْتُ: ناوبانگی باش ٥ دەگوترێ: (ذهب صیتە بین الناس): ناوبانگی باشی بەناو خەڵك دا بڵاو بۆوە ٥ الصِّیْتَةُ: بەمانا (الصِّیْت)دێ ٥ الصَّیِّتُ: دەنگ گڕو دەنگ تیژ ٥ دەنگی گەورە ٥ صاحَ صَوْحاً: قەڵاشتی ٥ صَوَّحَ النَّبْتُ ونحوە: ڕوەکە وشك بوو شەقار شەقار بوو ٥ صَوَّحَ النخلُ: خورماکە باش‌و خراپی لێك جیابوونەوە ٥ صَوَّحَ الریحُ الشَّیْئَ: ڕەشەبایەکە شتەکەی وشك کردەوە هەتا شەقار شەقار بوو وردو هاڕبوو ٥ إنْصَاحَ: شەق بوو ٥ قەڵشا ٥ دوو لەت بوو ٥ إنْصَاحَ النَّبْتُ ونحوە: بەمانا (صَوَّح)دێ ٥ هەروا بەمانا ئەوە دێ گوڵەکەی دەرکەوت ٥ إنْصاحَ الفَجْرُ أو البرقُ أو القمرُ: بەیانی یان

بروسكه يان مانگ روناكى دا ٥ تَصَوَّحَ النبت: بەمانا (صَـوَّحَ)دێ ٥ دەگوترێ: (تصوحت الأرضُ): زەوییەكە وشك بۆومو شەقار شەقار بوو ٥ تَصَوَّحَ الشَّعْرُ: قژى پرژو بلاو بوو ٥ الصَّاحَة: زەوى سوتەمەرۆو هيچ لێ نەڕواو ٥ الصَّوَاحُ: سەرە تەرزى دارخورماو پرژو پالى كە وشك دەبێو بلاو دەبێتەوە ٥ كەچ ٥ الصُّوحَانُ: وشكو برينگ ٥ الصُّوحَةُ: ئەو تيسكە خورييانەى بەر دەبنەوەو بلاو دەبنەوە ٥ أصاخ له واليه: گوێى بۆگرت ٥ أصاخ عن الأمر: لەكارەكە زێوان بۆوە، گەڕايەوە ٥ أصَاخَ على حق فلان: لەمافى فلان بێدەنگ بوو ٥ چاوى لێ پۆشى ٥ الصَّاخَةُ: بەلاو كارەسات ٥ لەبوارى پزيشكى دا هەوكردنو ئەستوربوونى ئێسقانە بەهۆى لێكدانو ئازار پێگەيشتنەوە ٥ الصوديوم: كانزايەكى فلزى ورشە دارى سپى زيوييە، زۆر بەپێزو چاپوكەو زوو لەهەوادا بلاو دەبێتەوە.

**صَارَ صَوْراً**: دەنگى هات.

**صار الشَّيْئَ اليه**: شتەكەى بۆلاى خۆى كێش كردو نزيكى كردەوە.

**صَوِرَ صَوَراً**: خوار بۆوە، مەيلى ئەوى كرد ٥ أصَارَه اليه: مەيلى پێ كرد، بۆلاى ئەوى خوار كردەوە ٥ صَوَّرَهُ: وێنەى كێشا.

**صَوَّرَ الشَّيْئَ أو الشَّخْصَ**: بەقەڵەم وێنەى شتەكەى يان فلانكەسى لەسەر كاغەز يان لەسەر شتى تر كێشا يان بەئامێرى وێنەگرتن وێنەى گرتووە ٥ صَوَّرَ الأمْرَ: وەصفێكى كرد، كە هەموو پێكهاتەكانى رون بكاتەوە ٥ تَصَوَّرَ: وێنەو شكلى بۆ پەيدا بوو ٥ تَصَوَّرَ: لەزانستى دەرونزانى دا ئامادەكردنى وێنەى شتێكى هەست پێكراوە لەعەقڵ دا بەبێ ئەوەى كاريگەرى تێدا بكا ٥ لەلاى زانايانى مەنتيق ئامادەكردنى تاكە يان ماهييەتى شتە لەزەين دا بەبێ ئەوەى حوكمى نەبوون يان بوونى بەسەر دا بدرێ ٥ التَّصَوُّرِيَة: لەفەلسەفەدا بريتييە لەو ڕێبازو بيرو بۆچونەى كەدەڵێ: كولليات هەر لەزەين دا هەيەو لەدەرەوەى زەين دا وجوديان نييە ٥ التَّصْوِير: وێنەگرتن، وێنە كێشان ٥ وێنەكێشانى شت يان شەخص لەسەر ديوار يان لەسەر شتى تر بەقەڵەم يان بەشتى تر ٥ التَّصْوِيرُ الشمسي: وێنەگرتنى شت بەكامێراى شەمسى ٥ الصَّارَةُ من الجبل وغيره: تۆقەسەرو تۆپەلاك ٥ الصُّوارُ: جەڵەبە رەشە ولاخ (گاگەل) ٥ الصَّوْرَ: لامل ٥ لێوارى روبار ٥ الصُّورُ: كەرەنا ٥ شتێكە وەكوو شاخەگا وايە فوى پێدا دەكرێو دەنگى لێ دێ ٥ الصُّورَةُ: وێنە، سەرو شكڵو روخسار ٥ جۆرى شت ٥ دەگوترێ: (هذا الأمر على ثلاث صور): ئەو شتە سێ جۆرى هەيە ٥ ماهييەتو وێنەى شت لەزەين دا ٥ سێبەرى شت لە زەين دا يان لەعەقڵ دا ٥ صورة الحكم التنفيذية: وێنەى فەرمى بڕيار كەبەپێى ئەو نوسخە بڕيارەكە جێبەجێ دەكرێ، كەبەمۆرى دادگا مۆركرابێو واژۆ كرابێو شێوازى جێ بەجێكردنى تێدا رون كرابێتەوە ٥ الصَّيِّرُ: جوان روخسار ٥ المُصَوِّرُ: وێنەگر، كەسێك پيشەى وێنەگرتن بێ. المُصَوِّرَةُ: مێينەى (المُصَوِّر) كامێراى وێنە گرتن.

**صَاعَت النَّحْلُ صَوْعاً**: هەنگەكان هەلايژانو پەرتو بلاو بوونەوە هەندێكيان شوێن هەندێكيان كەوتن ٥ صَوَّعَ الأشياءَ: بەمانا (صَاعَهَا)دێ ٥ صَوَّعَ الموضعَ: شوێنەكەى تەخت كردو ئامادەى كرد بۆ پێدا رۆيشتن ٥ إنْصَاعَ: بۆ موطاوعەى (صاعَه)دێ ٥ گەڕايەوە، يان بەخێرايى رۆيشت ٥ تَصَوَّعَ القومُ: خەڵكەكە

بڵاوەیان لێ کردو پەرتەوازە بوون ٥ **الصّاعُ**: ربەو قسناغی دانەوێڵە پێوان ٥ دانیشتوانی حیجاز ئامێری (صاع)یان بەچوار مود مەزندە کردوە ٥ دانیشتوانی عێراق بەهەشت (ربطل) مەزندەیان کردوە ٥ هەروا ناوە بۆ جامیلکەی ناوخواردنەوە ٥ گۆچان و عەصا ٥ عەصای پاشا ٥ **الصّاعة**: زەوی تەخت کراو، ئامادەکراو بۆ پێداروێشتن ٥ شوێنێك ئامادەبکرێ بۆشیکردنەوەی لۆکە تێیدا ٥ **الصُّواعُ**: بەمانا (الصّاعُ) دێ واتە: ربە قسناغی دانەوێڵە پێوان ٥ یان جامیلکەی ناو تێدا خواردنەوە ٥ **صاغَهَ صَوْغاً وصیاغةً**: بەشێوەیەکی جوان و رێك و پێك دروستی کرد.

**صاغَ المعدَنَ**: کانزایەکی کردە قاڵب و شتی وا.

**صاغَ الکلمةَ**: وشەکەی لەسەر شێوەی قیاس و یاسا دروست کرد.

**صَاغَ الکلامَ**: رستەکەی ئامادەکردو رێکی خست ٥ **إنصاغَ الشّيْئُ**: بۆ موطاوعەی (صَاغَهُ)دێ ٥ **الصّائغ**: ئاڵتونچی؛ کەسێك پیشەی ئەوە بێ ئاڵتون و زیوو شتی وا بکاتە خشڵ ٥ دەگوترێ: (فلان من صاغة الکلام) فلانکەس قسەزان و داڕێژەری رستەیە ٥ لەوکەسانەیە باش قسەکەرێك دەخەن ٥ بۆ کۆێ مێینە دەگوترێ (صَوائغ) ٥ **الصّوّاغ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (الصائغ)دێ ٥ بەزۆری بۆ ئەوکەسە بەکاردێ کە قسەکانی بڕازێنێتەوەو رێکیان بخاو هەڵیان بەستێ ٥ **الصِّیاغَةُ**: ئاڵتونچیەتی ٥ پیشەی بەخشڵ کردنی زێڕو زیو ٥ دەشگوترێ: (کلام حسن الصِّیاغة): رستەو وتارێکە زۆر بەپێزەو جوان داڕێژراوە ٥ **الصِّیغَة**: خشڵ ٥ کانزای داڕێژراوو بەخشڵ کراو ٥ ئەصڵ و بنەما ٥ دەگوترێ: (هو من صیغة کریمة): ئەو وەجاخزادەیەو لەئەصڵ و بنەمایەکی ڕەسەنە ٥ **صیغة الامر**: ئەو شێوەیەی وشەکەی لەسەر بنیات نراوە ٥ **صیغة الکلمة**: شێوەی وشەکەو ریزکردنی پیتەکانی و بزوێنەکانی ٥ گوتراوە (اختلفت صِیَغ الکلام): واتە لێکدان و شێوازی رستەکان جوداوازییان هەیە ٥ **الصّیغة التنفیذیة**: رستەیەکی تایبەتیە کارمەندی تایبەتی لەسەر روپەڕی بڕیارەکە دەینوسێ بۆئەوەی بەزۆرە ملێ بڕیارەکە جێبەجێ بکرێ ٥ **الصَّیّاغ**: بەمانا (الصَّوّاغ)دێ ٥ **الصَّیِّغُ**: قسە رازێنەرەوە ٥ قسە زان ٥ (صیفەتی موشەبەهە) ٥ یان بەمانا قسە هەڵبەست و درۆزن دێ ٥ **الصَّیِّغَةُ**: مێینەی (الصَّیِّغ) ٥ بەهێزو توانا ٥ **المَصَاغُ**: داڕشتن ٥ خشڵی داڕێژراو لەزێڕو زیو یان لەشتی تر ٥ **المَصُوغ**: خشڵی دروستکراو.

**صافَ الکبشُ صَوْفاً**: خوری لەسەر پشتی مەڕو بەرانەکە دەرکەوتەوە، توکیان هاتەوە ٥ یان خوری سەر پشتیان زۆر بوو ٥ **صَوَّفَ النباتُ**: لەسەر روەکەکە شتێك پەیدا بوو وەکوو گەندەموو وابوو، وەکوو خوری دەچوو ٥ **صَوَّفَ فلاناً**: فلانکەس بوو بەصوّفی ٥ **تَصَوَّفَ فلان**: فلانکەس بوو بەصوّفی ٥ **التَّصَوُّفُ**: رێبازێکی ئەخلاقییە بنەماکەی دونیانەویستی و خۆ ئارایشت دانە بەرەو شتی بەرز بۆ پاککردنەوەی دەروون و بەرز کردنەوەی گیان ٥ **علم التصوّف**: کۆمەڵێك یاساو رێسان کە صوّفییەکان پابەندی دەبن و جێ بەجێیان دەکەن لەناو کۆڕو کۆبونەوەو گۆشەگیرییەکانیان دا ٥ **الصُّوفُ**: خوری کەپێستی مەڕو بەران دادەپۆشێ.

**صوف البحر**: شتێکە لەسەر شێوەی خوری مەڕ، سەرئاو دەکەوێ ٥ **الصُّوفان**: روەکێکە پرزو

پاڵێك دەردەدا دەشوبهێته خوری ٥ الصُّوفاني: شتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (صوف - خوری) بەشێوەی ناقیاس و قاعیده ٥ الصُّوفَةُ: پارچه خوری، تیسکه خوری ٥ الصُّوفيُّ: کەسێك صۆفی بێو پابەندی رێبازی صوفینزمی بێ ٥ شارەزا لەزانیاری صوفیەتی دا ٥ ناوەکەش لەوەوه هاتووه گوایه بەهۆی دونیا نەویستیانەوه پۆشاکی خوری دەپۆشن ٥ الصُّفیة: بەمانا (التَّصوّف)دێ ٥ الصَّوّاف: خوری فرۆش ٥ الصَّیِّفُ: هەر قوماشێك زۆری پێکهاتەکەی خوری بێ.

صَاكَ بِهِ المِسْكُ: میسکەکەی پێوه نوسا.

صَاكَ الطیبُ: بۆ نەخۆشەکه بڵاو بۆوه ٥ تَصَوَّكَ المِسكَ ونحوه: خۆی بەمیسك بۆنخۆش کرد.

صَالَ علیه صَوْلاً وصَوَلاناً: هەڵمەتی بۆبرد ٥ پەلاماری دا بۆئەوەی تێکی بشکێنێ.

صَالَ الجملُ: حوشترەکه کەستی ٥ صَاوَلَهُ مُصاوَلةً وصِیالاً: بەسەری دا زاڵ بوو، بەرانبەری کرد لەهەڵمەت بردن دا ٥ صَوَّلَ البیدر ونحوه: دەوروپشتی خەرمانەکەی ماڵی ٥ صَوَّلَ الحنطةَ ونحوها: گەنمەکەی بەئاو پاك کردەوه هیچی پێوه نەهێشت ٥ تَصَاوَلا: کێ برکێیان کرد لەهەڵمەت بردن دا ٥ الصَّوَّلُ: هەڵمەت بەری بەزەبرو زەنگ ٥ جەربەزە لەهەڵمەت بردن دا ٥ الصَّوْلَةَ: پەلاماردان، پرکێش کردن ٥ الصُّولَةُ: ئەو گەنمەی پاك کرابێ و شۆرابێتەوه بەئاو ٥ المِصْوَلُ: شەنەی خەرمان سورکردن ٥ خەرمان دوای گێرەکردنی بەشەنه بەهۆی بای شەماڵەوه گەنم و کاکەی لێك جیادەکرێتەوه ٥ مەولەوی دەڵێ:

خەرمانی خەمان هاوەبەر باوه
شەنکەر یەکێکەو دووشەن وەڵاوه

ئەو بێژینگ و ئامێرەی مرۆڕو زیزانەی پێ لەگەنمەکە جیادەکرێتەوه ٥ المِصْوَلَةُ: کەسك کەدەورو بەری خەرمانی پێ دەماڵدرێ ٥ الصَّوْلَجُ والصَّوْلَجَةُ، الصولجان والصولجانة: بڕوانه مادەی (صَلَجَ).

صَامَ صَوْماً وصِیاماً: بەرۆژو بوو، نیەتی هێناو خۆی لەخواردن و خواردنەوه گرتەوه لەسەرەتای رۆژەوه تا خۆرئاوا بوون.

صَامَ الفرسُ: ئەسپەکه راست بۆوەو ئالیکی نەخوارد.

صَامَ الماءُ والریحُ: ئاوەکه یان بایەکه بۆگەن بوو ٥ صامَتْ الشمسُ: خۆر گەیشته ناو قەدی ئاسمان.

صَامَ النَّعامُ: نوعامەکه چیقنەی خۆی فرێ دا.

صَوَّمَهُ: وای لێ کرد بەرۆژو بێ ٥ إصْطامَ: بۆ زێدەرۆیی لەمانای (صام)دێ ٥ الصَّائمُ: رۆژووەوان ٥ کەسێك بەرۆژوو بێ ٥ الصَّوّامُ من الأرض: زەوی بیرون و بێ ئاو ٥ الصَّوْمُ: خۆگرتنەوه لەکردارو گوفتار ٥ لەشەرع دا خۆگرتنەوه لەهەرشتێك رۆژوی پێ بشکێ، لەبەرەبەیانەوه هەتا خۆرئاوابوون ٥ قسەنەکردن ٥ الصَّوّامُ: کەسێك زۆر بەرۆژو بێ ٥ الصِّیّامُ: بەمانا (الصَّوْم)دێ ٥ هەروا کۆی وشەی (صائم)یشه ٥ المُصَامُ: (مَصَامِ الفرس): شوێنی راوەستانی ئەسپ ٥ مَصَام النجم: شوێنی ئەستێره، رێڕەوی ئەستێره ٥ دەگوترێ: (جِئتُهُ والشمس في مَصَامِها): هاتم بۆلای لەکاتێك دا خۆر له ناوەڕاستی ئاسمان دا بوو ٥ (الصَّوْمَع والصَّوْمَعة): بڕوانه مادەی (صَمَعَ).

صَانَ الفرسُ صوناً: ئەسپەکه راوەستاو نوکی سمی لەزەوی چەقاند بوو ٥ حەزی لەرۆیشتن نەبوو

لەبەرئەوەی سمی نالّی پێوە نەمابوو ٥ سوابوو ٥ یان سمی دەهێشا.

**صَانَ** الشَّيْئَ صَوناً وصِيانةً: شتەکەی لەشوێنێکی باش‌و ئەمین دا پاراست ٥ دەگوترێ: (صانَ عِرضَهُ): ناموس‌و حەیای خۆی پاراست‌و نەیهێشت لەکەدار بێ ٥ **إصْطانَهُ**: بۆزێدەڕەوی لەمانای (صان)دێ ٥ **تَصَاوَنَ**: خۆپارێزی کرد ٥ **تَصَاوَنَ من المعايب**: خۆی لەعەیب‌و عار پاراست ٥ **تَصَوَّنَ**: بەمانا (تَصَاوَنَ)دێ ٥ **الصِّوَانُ**: هەرشتێك کتێبی تێدا بپارێزرێ، یان پۆشاکی تێدا هەڵبگیرێ ٥ **الصَّوّانُ**: بەردەستێ، جۆرە بەردێکە زۆر ڕەقە کە بەئەستێ‌و ئاسن لێی دەدرێ پزیشکی ئاگری لێ دەبنەوە ٥ **الصَّوَّانَةُ**: ناوە بۆ پارچەیەك لەبەردەستێ ٥ **الصِّينَةَ**: بەمانا (الصَّوْنُ) دێ ٥ دەگوترێ: (هذا ثوب صينة) ئەوە پۆشاکی هەراج نیە بەڵکوو پۆشاکێکە لەناو صندوق دا هەڵدەگیرێ.

**صَوِيَ** صَرِيَ: وشك بوو کزو لاواز بوو ٥ دەگوترێ: (صَوِيَ الضَرْعُ): گوانەکە شیری تێدانەما وشکی کرد ٥ **أصْوَى القَومُ**: خەڵکەکە دابەزینە سەر تەپۆڵکەی بەردەڵان‌و پتەو لەوێ جێی خۆیان خۆش کرد ٥ **أصْوى فلان**: فلانکەس ئاژەڵەکانی کزو لاواز بوون ٥ **صَوّى الصُّوى في الطريق**: لەسەر ڕێگاو بۆ شارەزایی نەشارەزایان بەردی خستنە سەریەك تا بزانرێ ڕێگاکە چۆن دەڕوا ٥ **صَوّى النّاقةَ**: حوشترەکەی نەدۆشی بۆئەوەی شیر وشك بکاو قەڵەو بێ ٥ **صَوّى الدابَةَ**: وڵاخەکەی بەرەڵاکرد بۆئەوەی قەڵەوبێ‌و نیشات پەیدا بکا ٥ **الصُّوَّةُ**: تەپۆڵکەی ڕەق‌و پتەو ٥ کۆمەڵە بەردی سەر یەك نراو بۆ نیشانەی کوێرە ڕێگا ٥ **صَيَّا النَّخْلَ**: خورماکە ڕەنگی خورما نەگەیوییەکانی دەرکەوت ٥ **صَيَّا رأسه**: سەری خۆی شت‌و چاك پاکی نەکردەوە ٥ **الصَّاءُ**: ئەو ئاوەیە لەناو پزدان دایە ٥ ئەو خوێن‌و خوڕەیە دوای مندالّ بوون دێتە دەر ٥ **الصَّيَاةُ**: بەمانا (الصَّاءُ)دێ ٥ **الصَّيُوبُ**: هەنگێو ٥ دەست ڕاست ٥ یان زۆر هەنگێو ٥ **الصُّيَابَةُ**: بەمانا (الصُّوابَة)دێ ٥ دەشگوترێ: (هو صُيابَةُ قومه): ئەو پیاوە ڕیش سپی‌و پیاو ماقوڵی قەومەکەیەتی.

**صَاحَ**: هاواری کرد، بەهەموو هێزی قیراندی ٥ قیژاندی، نەڕاندی....٥ **صَاحَ** به: بانگی کرد.

**صَاحَ** عليه: بەسەریا هەڵشاخی، لێی توڕە بوو ٥ **صَاحَتْ الشَجَرَةُ**: درەختەکە درێژ بوو.

**صَاحَ** العنقود: هێشووەکە یان گوڵەکە دەرکەوت‌و درێژ بوو، لەتوێکڵی خۆی هاتەدەر.

**صِيحَ** به: ترسا.٥ **صِيحَ** بهم: فەوتان تێدا چوون، خەب بوون دەتگوت بومەلەرزەو گرمەو ناڵەی فەوتێنەر لێی داون ٥ **صَايَحَ القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان بانگی هەندێکیانیان کرد.

**صَاحَ** فلاناً: بانگی فلانکەسی کرد ٥ **صَيَّحَ**: بۆ موبالەغە لە مانای (صاح)دا دێ ٥ **صَيَّحَ الشَّيْئَ**: شتەکەی قەڵاشت‌و دەنگی لێوەهات ٥ **إنصاحَ**: قەڵشاو دەنگی لێ هات ٥ **إنصاحت الأرضُ**: زەوییەکە هەندێکی بەرووەك داپۆشراو هەندێکی بەروتەنی مایەوە هیچی لێ نەڕوا ٥ **الصَّائحةُ**: گریان‌و هاواری کۆستکەوتوو مردو لێ مردو ٥ ترسان‌و خوڕپە پێکەوتن ٥ **الصَّيْحَةُ**: هاوارو دەنگی تۆقێنەر ٥ فوکردن بە کەڕەنای دونیا وێرانبوونا ٥ هەڵمەتی لەناکاو غافڵگیرو زەندەقبەر کە خەڵکەکە بتاسێنێ ٥ سزاو عەزابی فەوتێنەر ٥ **الصَّيَّاحُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕەوی لەمانای (الصائح)دا دێ ٥ **صَادَ الطيرَ**

والوحش صَيْداً: باڵندەکە یان ئاژەڵە کێوییەکەی بەداوو تەڵە گرت ◊ هەروا بەمانا کێش کردن‌و وەگری کردنیش دێ ◊ دەگوترێ: (صادَ الناسَ بالمعروف): بەچاکەو پیاوەتی خەڵکی بۆلای خۆی کێش کرد وەگری خۆیی کرد.

صَادَ فلاناً طيراً: باڵندەکەی بۆ فلانکەس گرت.

صَيِدَ صَيْداً: ملی خوارە یان ملی خوار بوو ناتوانی ملی بادا ◊ أصَادَ فلاناً ونحوه: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند بەنێچیر بۆگرتن ◊ داخی کرد بۆ ئەوەی ملە خرەو نەخۆشی مل خواربوونی نەمێنێ ◊ إصْطَادَهُ: زۆر بە ناخۆشی راوی کرد ◊ تابۆی گیرا تەواو شەپرزە بوو ◊ تَصَيَّدَهُ: فێڵ‌و پیلانی بەکارهێنا بۆ نێچیر کردنی ◊ دەشگوترێ: (خرج يتصيد) چووە دەرەوە بەهیوای ئەوەی نێچیر بگرێ ◊ إصْيَدَّ: ملی خوار بوو ملە خرەی توش بوو ◊ الأصْيَدُ: ملخوار کەنەتوانێ بەهۆی نەخۆشی ملیەوە ئاوڕ بداتەوە ◊ لوتبەرزو فیزکەر ◊ هەرکەسێك لەپاشاو فەرمانڕەواوە دەسەڵاتێکی پێ درابێ ◊ بۆ ئافرەتیش دەگوترێ: (صَيْداء) ◊ الصَّاد: پیتێکە لەپیتەکانی هیجا ◊ دەردەمل، ملە خرە، مل خوار بوون ◊ الصَّيْدُ: ئەو ئاژەڵەی راو بکرێ ◊ گیانلەبەری دەریا وەکوو ماسی‌و شتی وا ◊ الصَّيَدُ: نەخۆشییەکە توشی مل دەبێ ناتوانێ مل بسوڕێنێ ◊ خۆبەزلزان‌و لوتبەرز ◊ الصَّيُودُ: راوچی کاراماو لێزان لەبواری راوکردن دا ◊ الصَّيَّادُ: راوچی؛ ئەوکەسەی پیشەی راوکردن بێ ◊ الصَّيُودُ: تیری پێکاو، تیرێك باش هەدەفی پێکا بێ ◊ المَصَادُ: شوێنی راوکردن ◊ تۆقەسەری کێو ◊ المُصْطَادُ: نێچیرەوان، راوکەر ◊ راوکراو، نێچیر ◊ المِصْيَدُ والمِصْيَدَةُ: تەڵەو داوو ئامێری راورکردن ◊ صَيْدَلَ: دەرمانسازیی کردە پیشەی خۆی ◊ الصَّيْدَلُ: بەردە زیو ◊ بەردە سیخرو ◊ الصَّيْدَلَةُ: پیشەی دەرمانسازیی ◊ علم الصَّيْدَلَة: زانیارییەکە تێیدا باسی داوو دەرمان‌و تایبەتمەندی‌و شێوەی تێکەڵ کردن‌و گرتنەوەی دەرمانەکانی تێدا دەکرێ ◊ الصيدلي: بەمانا (الصيدلاني)دێ ◊ الصَّيدلِيَّة: دەرمانخانە ◊ شوێنی دەرمانسازی‌و فرۆشتنی ◊ الصَّيدلاني: دەرمانساز ئەوکەسەی دەرمان دروست دەکاو دەیفرۆشێ ◊ زاناو کاراما لەبواری دەرمانسازی دا ◊ الصَّيْدان: بەردێکە دیزەو گلێنەی لێ دروست دەکرێن ◊ مس ◊ الصَّيْدانة: دێوو درنج ◊ بەدڕەوشت ◊ زۆر بلێ ◊ الصَّيْدَن: بەمانا (الصَّيْدَلُ)دێ ◊ دەعبایەکە لە ژێر زەوی دا شوێن بۆخۆی دروست دەکا ◊ چەند ڕێگایەکی چەواشەکاری‌و دەرباز بوونی دروست دەکا بۆئەوەی راوکەر نەتوانێ نێچیری بکا ◊ باڵەخانەی تۆکمەو قایم ◊ پۆشاکی خزو ئەستور چندراو.

صارَ الشَّيْئُ كذا: لەحاڵێکەوە چووە سەر حاڵێکی تر.◊ صارَ اليه: بۆی گەڕایەوە ◊ هاتەوە ◊ أصاره كذا أو الى كذا: گۆڕی، گۆڕانی بەسەردا هێنا، کردی بەئەو شتە ◊ صَيَّرَهُ كذا أو الى كذا: بەمانا (أصاره)دێ ◊ تَصَيَّرَ أباه: وەکوو باوکی چو، لەشێوەو روخساردا لەباوکی چوو ◊ الصَّائِرة: لەوەڕی وشکەوە بوو کەدوای قۆناغی سەوزبوونی زۆر مابێتەوە ◊ الصَّيَّارَةُ: تەویلەو ئاغەڵ‌و گەوڕی ئاژەڵ‌و وڵاخ ◊ الصَّيِّرُ: کۆتایی کارو سەرەنجامی ◊ لایەن‌و ئەملاو ئەولای شت ◊ دەگوترێ: (هو على صيرِ حاجة أخيه) ئەو کابرایە زۆر گرنگی دەدا بەئیش‌و کاری براکەی‌و دەیەوێ بەباشی ئەنجامی بدا ◊ ئاوێك خەڵك لەدەوری کۆببنەوەو بیکەنە شوێن هەواری خۆیان ◊ درزی دەرگاو کونی دەرگا لای ئەڵقەو

شوێنی کلیل‌و کێلون ◊ هەروا ناوە بۆ کەشیشی مەسیحییەکان ◊ **الصَّیِّرَةُ**: بەمانا (الصِّیارة)دێ ◊ **الـصُّیُورُ**: کۆتـایی‌و سـەرەنجامی شـت ◊ رای پەسەندو دروست ◊ **المَصِیر**: سەرەنجام‌و دوا قۆناغ ◊ دەگوترێ: (مصير المياه): کۆتایی ڕێڕەوی ئاو ◊ (مصير الخلق): گەڕانەوەو دوا قۆناغی ئادەمیزادو سەرەنجامیان ◊ **صَاصَت النخلةُ صَیْصاً**: درەختە خورماکە خورماکانی بیژۆك‌و خراپ بوون، باش دەنکە خورماکانی هەڵنەپێچان بەهۆی خراپ بەخێوکردنەوە یان بەهۆی دەردی تر ◊ **أَصَاصت النخلةُ**: بەمانا (صَاصَتْ)دێ ◊ **صَیَّصَت النخلة**: بەمانا (صَاصَتْ)دێ ◊ **الصَّیِّصُ**: بەمانا خورمایەکە باش هەڵی نەپێچابێ‌و دەنکەکانی بیژۆك‌و وشکەڵ بن ◊ دەق بەمانا (الشِّیص)دێ ◊ **الصِّیصَاءُ**: لۆغەتێکە لە (الشِّیصاء) ◊ **الصِّیصَةُ**: ئەو تەڵەخوارەوەبووەی بەسەری سەرەتەشییەوەیە داوە بەنەکەی تێ دەکرێ ◊ مەکۆك‌و شانەو جۆکی جۆلا کە رایەڵ‌و پۆیەکەی پێ ڕێك دەخا ◊ شاخە گا ◊ **الصِّیصِیَةُ**: بەمانا (الصِّیصة)دێ ◊ چنگ‌و نینۆکی کەڵەشێر کە بەقاچیەوەن ◊ شوانێك بەباشی ئاژەڵەکانی چاودێری بکاو بەخێویان بکا ◊ قەڵاو دژو سەنگەری قایم.

**صَاعَ الغَنَمَ وغيرها صَیْعاً**: مەڕو بزنەکانی بڵاو کردنەوە ◊ پەرتەوازەی کردن.

**صَاعَ القَومَ**: خەڵکەکەی پێکەوە نان‌و پێکی هەڵپژاندن بۆ ئەوەی دژی یەك بن‌و ئاژاوە بکەوێتە ناویانەوەو پەرتەوازە بن ◊ **أَصَاعَهُ**: بەمانا (صَاعَهُ)دێ ◊ **انصاع فلان**: فلانکەس خێرا گەڕایەوە ◊ **صَیَّعَ الطعامَ**: خواردنەکەی لەپێخۆرەکە هەڵکێشا تا بەتەواوی پێخۆرەکەی هەڵمژی.

**صَافَ اليومُ صَیْفاً**: ڕۆژەکە زۆر گەرم بوو، پلەی گەرمای بەرز بۆوە.

**صَافَ بالمكان**: هاوین لەوشوێنە مایەوە.

**صَافَ عنه**: لای دا، وازی لێ هێنا.

**صَافَ السَّهمُ عن الهدفِ**: تیرەکە لەنیشانەکە لای دا نەیپەنگاوت.

**صَافَ المطرُ الأرضَ أو النـاسَ**: زەوییەکە یان خەڵکەکە بەهاوین بارانیان لێ باری ◊ **أَصَافَ**: کەوتە هاوینەوە ◊ بەپیری منداڵی بوو ◊ **أَصَافت الناقةُ**: حوشترەکە بەهاوین بێچوی بوو ◊ **أَصَافَ الرجلُ النساءَ**: پیاوەکە بەگەنجی ئافرەتەکەی مارنەکرد، کەپیر بوو ئەمجار مارەی کرد ◊ **أَصَافَ الشَّيْءَ عنه**: شتەکەی خوار کردەوە ◊ **أَصَافَ اللهُ الشَّرَّ عنه**: خودا شەڕەکەی لێ لادا ◊ **صَایَفَهُ مُصَایفةً وصِیافاً**: مامەڵەی لەگەڵ کرد هاوین بۆ هاوین ◊ **صَیَّفَ بالمكان**: بەهاوین لەوشوێنە مایەوە ◊ **صَیَّفَ الشَّيْءُ فلاناً**: شتەکە بەشی ماوەی هاوینی فلانکەسی کرد ◊ **صَیَّفَ المطرُ الأرضَ أو النـاسَ**: بارانەکە بەهاوین لەزەوییەکە یان لەخەڵکەکە باری ◊ **اصطاف بالمكان**: بەهاوین لەوشوێنە مایەوە ◊ **تَصَیَّفَ بالمكان**: بەهاوین لەوشوێنە مایەوە ◊ **الصَّائف**: گەرم ◊ **الصَّائفة**: کاتی هاوین ◊ غەزاکردن لەوەرزی هاوین دا بۆیە غەزاکردنی موسوڵمانەکان بۆ وڵاتی ڕوم بەو ناوە ناونراوە ◊ **صائفة القوم**: بژێوی خەڵك لەهاوین دا ◊ **الصَّافُ**: گەرم ◊ دەگوترێ: (يوم صاف) ڕۆژێکی گەرمە ◊ **الصَّیْفُ**: هاوین؛ یەکێکە لەچوار وەرزەکانی ساڵ ◊ **الصَّیْفيّ**: هاوین؛ شتی هاوینی جلی هاوینی، میوەی هاوینی هەرشتێك لەهاوین دا پەیدا ببێ ◊ دەگوترێ: (مطر صيفي ونبت صيفي): ڕووەکێك

لەهاوین دا بڕوێ ٥ **الصَّيِّفُ**: هەرشتێك لەهاوین دابێ ٥ **المِصْيَافُ** مِن النَاس: پیاوێکە تا تەواو کامڵ نەبێ ژن نەهێنێ ٥ هەروا وشەی (المِصْيَاف) ناوە بۆ حوشترێك هاوینان بێچوی ببێ ٥ زەوییەك تەنها لەهاوین دا شتی لێ بڕوێ ٥ **المُصْطَاف**: هاوینە هەوار ٥ **المَصِيفُ**: شوێنی مانەوەی هاوین، هاوینە هەوار.

**صَاقَ** بە كذا: بێوەی نووسا ٥ **الصَّيِّق**: تەپو تۆزی چڕو پڕی بەرزەوە بوو لەحەوادا ٥ عەرەق.

**صَاكَ** بە كذا صَيْكاً: بێوەی نووسا.

**صَـاكَ** الـدَّمُ ونحـوُه: خوێنەکە وشك بـۆوە، ڕەق هەڵهات.

**صَالَ** عليه: بروانە مادەی (صَوَلَ).

**صَيِلَ** لە كذا: ئەوەی بۆڕێکەوت، بۆی گونجا ٥ بۆی ڕەخسا ٥ **الصِّينيّ**: شتو مەكو كاڵای صینی ٥ **الصِّينية**: دەوری قاپو بەلەمی چینی کە بەکاردەهێمدرێن بۆنان تێداخواردن.




**الـضَادُ**: پیتـی پانزەهەمــە لـە پیتـەکانی هیجـا ٥ هەنــدێ عــەرەب ئەوەنــدە بەگوشــراوی‌و گۆکراوەیی دەیلێن وەکوو دالی قەڵەوی لێ دێ ٥ (پیتـی (ضـاد) تایبەتمەندییـەکی تـەواوی هەیـە لـەزمانی عــەرەبی دا تەنانــەت هەنــدێ جـار لـەجیاتی (لغـة العـرب) دەگـوترێ (لغـة الـضاد) کەم کەسیش وەکوو عەرەب دەتـوانن ئـەو پیتـە وەکـوو خـۆی دەربـبڕن، هەنـدێ گـەل‌و نەتـەوە هەر ناتوانن تەلەفوظی پێ بکەن، وەنـدەی مـن بزانم دوا عەرەب کەس بەئەندازەی کورد لێزان نییە بۆ وتنی ئەو پیتەو تەلەفوظ پێـکردنی ٥ **الـضِّنْبُ**: گیانلەبەرێـکی دەریاییـەو لـەناو ئـاودا دەژی ٥ دەنکی مـرواری ٥ **الـضُّوْبان مـن الجمال**: حوشترێ قەڵەوی بەهێز ٥ **ضَأَزَهُ ضَأزاً**: ستەمی لێ کرد، دەگوترێ: (ضَأَزَهُ حَقَّهُ): مافی زۆر پێ دا، کەمی کردەوە، مافی خۆی نەدایە ٥ **الـضِّئْزَى** (قـسمة ضِـئزى): دابەشـکردنی سـتەمکارانەو ناعەدالەت ٥ **ضَأضَأ**: غاڵ‌و بوغڵی کـرد، هاواری کـرد ٥ **الضَّأضاءُ**: دەنگە دەنگ‌و هـاوار هـاوار ٥ **الضِّئْضِئُ**: ئەصڵ‌و بنـەما، دەگوترێ: (هـو مـن ضِئضِئِ كريم).

**ضَئِطَ** ضَأطاً: لەڕۆیشتن دا شان‌و جەستەی هەڵدە تەکێنێ.

**ضَؤُلَ** الرجـلُ ضَـآلَةً وضُـؤولَةً: جەسـتەو قـەبارەی بچوک بوو، کزو لاواز بوو، هیچ‌و پوچ‌و بێ نمود بوو، دەگوترێ: (ضَـؤُلَ رأيـه): راوو بۆچوونێـکی هیچ‌و پوچی هەبوو ٥ دەگوترێ: (مـا علیـك في ذلك ضُؤولة): لەوەدا تـۆ هـیچ کـەم‌و کوڕیـەکت نییە ٥ **ضاءَلَ شخصهُ**: کەسایەتی ئـەوی بچوک کـردەوە ٥ **تـضَاءَلَ**: بـەمانا (ضَـؤُلَ)دێ ٥ وێـك هاتـەوەو هەندێـکی کەوتـە سـەر هەندێـکی‌و پاڵیـان لێـك دا ٥ کەسـایەتی خـۆی شـاردەوەو خۆی بچوك کردەوە ٥ **الـضُّؤلان**: مانـدوو بـون‌و بـارگرانی، دەگـوترێ: (هـو علیـه ضُـؤلانٌ): ئـەو لەسـەر فلان بـارگرانی‌و ئەرکە ٥ **أضْـأنَ فـلان**: فلانکەس مەڕی زۆر بوو ٥ **الضَّأن**: مەڕ ٥ کـەم شیر ٥ جەسـتە جوان‌و رێـك‌و پێـك ٥ **الـضَّأنُ**: مـەڕ، مـەڕە سپی، مـەڕی خوریـدار، دەگـوترێ: (لحم ضَأن): گۆشـتی مـەڕ ٥ **الـضِّئْنِيُّ**: مەشکەی دۆ تێدا ژاندن.

**ضَـاي** ضَـأياً: بـەمانا (ضَـؤُلَ)دێ ٥ جەسـتەی زەعیف‌و لاواز بوو.

**ضَبَأ** بـالأرض رفيهـا ضُبُوءاً: بەزەوییـەوە نووسـا، خـۆی شـاردەوە، دەگـوترێ: (ضَـبَأ الـصائد): نێچیرەوان خۆی مـەڵاس دا بۆئـەوەی نێچیرەکە بخاتە داوی خۆیەوە.

**ضَبَأ** منه: شەرمی لێ کرد.

**ضَبَأ** علیه: پەنای بۆ برد.

**ضَبَأ** بـه الأرض: بەزەوییـەوەی نوسـاندو ناهێڵێ هەڵسێتەوە ٥ (فهو ضابِئٌ وضَبِيءٌ) ٥ **أضبأ على الـشيء**: لەشـتەکە بـێ دەنـگ بـوو لێـی نـەدوا، دەگوترێ: (أضبأ على ما في نفسه): ئەوەی لەدڵی دا بوو شاردیەوە نەی درکانـد ٥ (أضبأ على ما في یدیه): ئـەوەی لەدەستی دا بـوو بـەفیڕۆی نـەداو دەستی بەسەرا گرت‌و پاراستی ٥ **الضَّابِئُ**: خۆڵ،

خۆڵە پەتە ٥ **الضَّابِئَةُ**: کۆڵی قورس، باری گران، کە کۆڵبەرەکە نەتوانێ لەزەوی بەرزی بکاتەوە، دەگوترێ: (غِرارة ضابئة): کۆڵێکی قورس و گرانە کۆڵبەرەکە لەژێریا دیار نییە ٥ **المَضْبَأ**: حەشارگە.

**ضَبَّ الماء ونحوه ضَبّاً وضُبوباً**: ئاوەکە بەکەمی داچۆڕا کەمی لێ ڕەوان بوو، دەگوترێ: (ضَبَّ الدَّمُ والعَرَقُ والرِّيقُ): خوێنی کەم لێ ڕۆیی، عەرەقی کەم کرد، تفو لیکی کەم بوو.

**ضَبَّ بكذا أو عليه**: هەوڵی بۆدا ویستی بەدەستی بێنێ.

**ضَبَّ**: ڕق و کینەی پەیدا کرد ٥ ڕقی لێ هەڵسا.

**ضَبَّ على ما في نفسه**: ئەوەی لەناخی دا بوو نەی درکاند، شاردیەوە ٥ **أَضَبَّ اليومُ**: ڕۆژەکە ڕۆژێکی تەم و مژاوی بوو ٥ **أَضَبَّ المكان**: شوێنەکە تەم و مژی هەبوو ٥ **أَضَبَّتِ الأرض**: گژوگیا زەوییەکەی داپۆشی ٥ زەوییەکە تەم و مژی زۆر بوو ٥ **أَضَبَّ القومُ**: خەڵکەکە تێکڕا بەکارەکە هەڵسان و خەریکی بوون ٥ **أَضَبَّ فلان**: فلانکەس زانیاری خۆی شاردەوە نەیویست، سود لەقسەکانی ببیندرێ ٥ **أَضَبَّ على ما في نفسه**: ئەوەی لەدڵی دا بوو بەرق و قینەوە شاردیەوە ٥ **أَضَبَّ على ما في يديه**: ئەوەی لەدەستی دا بوو بەتوندی پارێزگاری کرد و گرنگی پێ دا ٥ **ضَبَّبَ الخشبَ**: پارچە ئاسنی لەدارەکە شەتەك دا، تەختە دارەکەی بەپینەی لەوحە ئاسا قایم و پتەو کرد ٥ **ضَبَّبَ الباب**: پینەی ئاسنی لەدەرگاکە قایم کرد بەمەبەستی ڕەختە کردن و پتەو کردنی ٥ دەرگاکەی وا دروست کرد بەسەر یەك دا بشکێتەوە، بچێتە ناو یەکەوە ٥ **ضَبَّبَ الضَّبُّ**: سوسەمارەکە (بزن مژەکە)ی دەنە دەنە دا بۆئەوەی لەکونەکەی بێتە دەرێ و نێچیری بکا.

**ضَبَّ الشيءَ**: توند شتەکەی گرت بۆئەوەی لەکیسی نەچێ ٥ **تَضَبَّبَ**: دەستی کرد بەقەڵەو بوون ٥ **الضَّبَابُ**: تەم و مژ، وەکوو هەور وایە زەوی دادەپۆشێ ٥ **الضَّبُّ**: بزن مژە، سوسەمار، قۆڕی ٥ گیانلەبەرێکی خشۆکە، پێستی زبرە کلکی درێژە ٥ لەدەشت و بیابانەکانی وڵاتی عەرەب زۆرە ٥ ڕق و کینە کەلە ناخ دا شاراوە بێ، دەگوترێ: (رجل خَبٌّ ضَبٌّ): پیاوێکی فێڵاوی و تەڵەکە بازە ٥ **الضَّبيب**: شوێنی تەم و مژاوی ٥ **الضَّبَّةُ**: سوسەماری مێینە، دەشگوترێ: (إمرأة خَبَّة ضَبَّةٌ): ئافرەتێکی مەکر بازو فێڵاوی و بەچاوو ڕاوە ٥ پێستی سوسەمار دەباغ بکرێ و ڕۆنی تێ بکرێ ٥ پارچە ئاسنێکە دەرگای پێ پتەو دەکرێ ٥ سورگی دەرگا ٥ شمشێرو کلیل دارینە دەرگای پێ دادەخرێ ٥ **الضُّبُوبُ**: وڵاغێك لەکاتی بازدان و ڕۆیشتن میز بکا ٥ **الضَّبيب من السيف**: تیژایی و تیژیی شمشێر ٥ **الضَّبِيبة**: خۆراکێکە لەڕۆن و خورما دروست دەکرێ لەتورەکەو زەرفی چەرمین دا هەڵدەگیرێ بۆئەوەی وردە وردە بدرێ بەمناڵ بیخوا ٥ **ضَبَّثَ الشيءَ وبه وعليه ضبثاً**: شتەکەی لەناو قوله مشتی دا بە توندی گرت و گوشی ٥ (ضَبَثَ بە): هەڵمەتی بۆ برد، (ضَبَثَ فلاناً): لەفلانکەسی دا ٥ **الضُّبَاثُ**: شێر ٥ چنگی شێر.

**ضَبَجَ ضَبْجاً**: خۆی دا بەزەوی دا بەهۆی ماندو بون و نارەحەتی.

**ضَبَجَ الثعلبُ**: ڕێوییەکە واقاندی، دەشگوترێ: (ضَبَجَ الإنسانُ والبومُ والخيلُ): ئادەمیزاد کوندەبو ئەسپ هانکە هانکی کرد لەکاتی

